محمود مەلا عیززەت

# کاروانی بێ کۆتایی

## گۆشەیەك لە یاداشت و بیرەوەریەکان

نێوە بۆ ئەوە ئەگیران کە لێرەدا بتانبینینەوە و ئێستا لە
ژیاندا بن ئێوە وا گیران کە بێ لێکۆڵینەوە و بێ دادگا بکوژێن
العقيد طارق العزاوي
معاون مدير الأمن العام للشؤون السياسية

چاپی دووەم
سلێمانی ـ ٢٠٠٠
چاپی دووەم لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپ کراوە
بەرەزامەندی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

- ناوی کتێب : کاروانی بێ کۆتایی
- بابەت : یاداشت و بیرەوەری
- نووسینی : محمود مەلا عیززەت
- چاپی دووەم : ٢٠٠٠
- تیراژ : ٥٠٠
- ژمارەی سپاردن : ( ٢٧ )ی ٢٠٠٠

سوپاس و پێزانینمان بۆ مامۆستای بەڕێز
( قادر میرخان ) کە ئەرکی بەرگەکەی گرتە ئەستۆ

محمود مەلا عیززەت

# کاروانی بێ کۆتایی

## گۆشەیەك لە یاداشت و بیرەوەریەکان

> ئێوە بۆ ئەوە نەگیران کە لێرەدا بتانبینینەوە و ئێستا لە ژیاندا بن ئێوە وا گیران کە بێ لێکۆڵینەوە و بێ دادگا بکوژێن
>
> العقيد طارق العزاوي
>
> معاون مدير الأمن العام للشؤون السياسية

چاپی دووەم

سلێمانی ـ ٢٠٠٠

چاپی دووەم لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپ کراوە

بەرەزامەندی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

• ناوی کتێب : کاروانی بێ کۆتایی
• بابەت : یاداشت و بیرەوەری
• نووسینی : محمود مەلا عیززەت
• چاپی دووەم : ٢٠٠٠
• تیراژ : ٥٠٠
• ژمارەی سپاردن : ( ٢٧ )ی ٢٠٠٠

سوپاس و پێزانینمان بۆ مامۆستای بەڕێز
( قادر میرخان ) کە ئەرکی بەرگەکەی گرتە ئەستۆ

# سۆزی خۆشەویستیو گیانی نیشتمانپەروەریی
# و
# کاروانی بێکۆتایی

سەرەتای منداڵییەکی ئاسودەو تامەزرۆی یاریو تاڕادەیەك بزێوم لەناو بنەماڵەیەکی ئایینپەرستو نوێژو ڕۆژووگری شاری سلێمانیدا بەسەر دەبرد. خواپەرستیی باوکم تا ئەو رادەیە بوو کە سەرجەمی یاساو پرنسیپو ڕێساکانی ئیسلامی بە ئەنجام دەگەیاندو بەموو لە بچووکترینو سادەترین لایەنی لای نەدەدا. لەگەڵیشیاندا نیشتمانو میللەتەکەی خۆی خۆش دەویست.

سەرکەوتنیشی لە کارەکەیدا، بە گەچفرۆشییو خاوەنی کورەو کارگەی گەچ، باری ئابووریو دەرامەتەکەی چاوێنیی کردبوو، بۆیە گوزەرانێکی باشو لەزانکۆش خۆشحالم هەبوو.

زۆر جار باوکم باسی سەردەمەکەی شێخ مەحمودی نەمرو کاکە ئەحمەدیشم باسی شۆڕشەکەی بەرزان (١٩٤٥)یان بۆ دەکردین، هەستم پێدەکردو دەمزانیی کاکە حەمەشم پارتییەو کوردایەتیی دەکات.

لە قوتابخانەش خوێندنی وانەکانی مێژوو جوگرافیاو خوێندنی زۆرەملێ بە زمانی عەرەبی بەرە بەرە مافخوراوییو زوڵمو زۆرو چەوساندنەوەی کوردیان لام روونو ئاشکرا دەکردو دەبوونە هۆی چەکەرەکردنو گەشانەوەی هەستو گیانی نیشتمانپەروەریم.

ئەو هەلو مەرجانە ئەو زەمینەیەیان خولْقاند، کە نیشتمانو نەتەوەکەمم خۆش بوێت، تا ئەو ئاستەی کە لە سەرەتای پێگەیشتنمدا، کاتێك ئامادەییم تەواو کرد (جولای١٩٥٨) بیر لە چوونە زانستگای سەربازیی بکەمەوە، چونکە وابیرم دەکردەوە

که سوپای چەکدار تەنها ڕێگەیە بۆ سەرفرازیی لەو بارودۆخ‌و چەوساندنەوەیە. لەگەڵ جەلال عەزیزو هیوا موفتیدا داواو بەڵگەنامەمان پێشکەش بە زانستگای سەربازیی کرد. تەنها هیوا وەرگیرا. دواییتر من لەزانکۆی بەغدا- زانستگەی پەروەردە بەشی مێژوو وەرگیرام.

هەرچەندە لە سەرەتای قۆناغی ئامادەییەوە تێکەڵ بە ڕێکخستنی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ببووم، بەڵام نۆبەرەی کاری سیاسیی‌و پارتایەتیم لەسەرەتای ساڵی یەکەمی زانکۆوە بوو. بەو مەبەستەی کە ئەوە ڕێگەیەکی گونجاوە بۆ گەیشتنە ئامانجەکانی کورد.. لەبەر ئەوانەو بەردەوام:

ئەو سەرزەمینەی تێیدا چاوم بە روناکیی کەوت، بۆ من هەمیشە دڵفڕێن‌و پڕ لەئەوین‌و سۆزی خۆشەویستیی بووە، بەردەوام لەناو بیرەوەرییەکانیدا ژیاوم، بەتایبەتی: سەردەمی منداڵی‌و قوتابخانەو پێش لاویی، ژینگەو دەوروبەرو ئەو ناوەندەی تێیدا پەروەردە بووم، ڕاهاتن‌و گونجان‌و هۆگری دیمەن و ئاوو هەواو سروشت‌و گیانلەبەری ئەو دەشت‌و دۆڵ‌و چیاو هەردە، خۆشەویستیی کەس‌و کارو هەڤاڵ‌و هاوڕێ، پەرۆشی نەتەوەو نیشتمان‌و خەوی ئازادیی‌و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتیی، یادو بیرەوەریی ئەوین‌و ژوانی سەردەمی هەرەتی لاوێتیی‌و سەرگەرمیی ڕۆژانی دڵداریی. ئەوانە بۆ من وەك هەموو مرۆڤێکی دڵپاکی ئەم مەڵبەندە، بنەماو ریشەی ئەو سۆزو خۆشەویستییە بێ سنوورە بوون. زیاتر لەوانە رابوردوی درەوشاوەی سەربەخۆیی‌و نیمچە سەربەخۆیی سەردەمەکانی میرنشینی بابان‌و مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمودی نەمر و خوڵقاندنی زەمینە روناکبیرییە درەوشاوەکەو بە وەڵەدبوونی دەیان شاعیری گەورەو نیشتمانپەروەرو زانای ئایینی ناودارو خاوەن ڕێبازی تایبەتیی، بوونە ئەستێرەی ئاسمانی کوردەواری، ئەوانەش ئەو خەسڵەتە تایبەتییەیان لەناو دەروون‌و هۆشی خەڵکی ئەم شارەدا وا خوڵقاندووە کە زیاتر لەخەڵکی شارو شوێنەکانی تر، ئەو بەستراوەیی‌و پابەندییەیان بەشارەکەیانەوە پێوە دیاربێت.

بۆیە هەر لە سەرەتای تەمەنی لاویمەوە، تەنانەت لەساتە پڕ لە مەترسییەکان‌و هەڕەشەی مردنیشدا، ئەو ئەوینە، بڵێسەی ئەو عەشقە هەمیشە گڕدارە هەرگیز خامۆش نەبووە، بەسەر ئەو هەڕەشانەدا زاڵ بووە. جاری وابووە لە کێشەیەك سەرفراز نەدەبوم کە دووچاری کێشەیەکی تر دەبوم. بەتایبەتی لە ڕۆژی دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلولەوە (١٩٦١) ئەگەر بڵێم تەنها بۆ یەك شەویش بێخەم‌و ئارام لەو شاری سلێمانیەدا سەرم نەنابوە سەر سەرین، وا هیچ زیادە ڕەویەکی تێدا نابێت. چونکە لەناخۆشترین کات‌و ساتە خوێناویەکانیدا، دڵم هەر بۆی لێیداوە.

بەتینتر لە پەپولەی شەیداو ئاشقی روناکیی، سەوداسەری ئەو شارەبووم. ناخۆشترین ساتەکانی ژیانم، ئەو کاتانە بون کە لە سلێمانی دوریان دەخستمەوەو لە ئاوو هەواو خۆشییو لەزەتی ئەو ژیانە بێبەش دەکرام..

دوای هەرەسو نەفیکردنم بۆ رەمادی بەدوو ساڵو نوێ بوونەوەی شۆڕش بە ساڵێك، لەنیوەی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا رژێم سەرگەرمی بانگکردنی لێپرسراو و کادیرە دەرکەوتووەکانی شۆڕشە هەرەسپێکراو و پارتییە روخاوەکە بوو. گوایا بۆ دڵدانەوەو گوێگرتن لەداواو گازندەیان، تا ئاسوودەییەکی وایان لابخولقێت کە بیر لە چوونەوە شاخ نەکەنەوە. بۆ ئەوە بەڕێوەبەری ئەمنی رەمادی ناردی بەدومدا، کە بینیم ئاگاداری کردم کە مودیری ئەمنی عام (فازیل بەڕاك) دەیەوێت بتانبینێت، لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی:"سەید المودیر" سیاسییەکی زۆر زیرەکە، کراوەیە بۆ هەموو گلەییو راو بۆچونێك، بۆیە چیت هەیە بێ سڵەمینەوە بۆی باس بکە! کە گەڕایتەوە حەز دەکەم بتانبینمەوە!

ئەو دیدەنییەی فازیل بەڕاكو بینینەوەی مودیری ئەمنی رەمادیی بۆ خۆیان چیرۆکێکن، ئەوەی مەبەستە لێرەدا بیڵێم سەرەنجامی بینینەکەی فازیل بەڕاکە. لەبەر ئەوەی وەڵامی داواو پرسیارەکانیان پێچەوانەی خواستەکانیان بوو. ئیتر مەبەستی دیدەنییەکەش پێچەوانە بووەوە. کە بەڕاك زانی خێزانەکەم نەبردووە بۆ ڕەمادیو لەگەڵ چەند برادەرێکدا پێکەوە دەژین، ئەوسا پرسیاری کرد:

- بۆچیی ماڵو منداڵ نابەیت بۆ ڕەمادیی؟

< چونکە کەسو کارو خانو و بەرژەوەندییەکانم هەمووی لە سلێمانین، ئەی بۆ خۆشتان خۆشیی و ئیسراحەتی ئێمەتان ناوێت؟ خۆ ئەمڕۆش نەبێت چەند ساڵێکی تریش بێت بۆ سلێمانی هەر دەگەڕێمەوە. ئەویش بە تورەبونو هەڕەشەوە گوتی:

- باشە کێ دەڵێت تۆ نەقڵ دەبیتەوە؟ تۆ نەقڵ ناکرێیتەوە، خۆ ئەگەر نەقڵیش بکرێیت وا یان بۆ بەسرە یان بۆ دهۆك دەگوێزرێیتەوە، تێدەگەیت؟ ئیتر سلێمانی لەبیر خۆت بەرەوە. خێزانەکەت بەرە بۆ ڕەمادیو بەبێ سەریەشە لەوێ دابنیشە! خێرا ئەوە هات بەخەیاڵمدا کە ئەوە بەخاڵێکی لاواز دادەنێن. بۆیە ویستم بیانوییەك بدۆزمەوەو گوتم:

< خۆ من بۆ خۆشم حەزدەکەم ماڵو منداڵم لەگەڵ بێت، بەڵام خانو دەست ناکەوێت، هەموو ڕەمادی گەڕاومو دەستم نەکەوتووە.

- بچۆرە لای مودیری ئەمنی ڕەمادیو بڵێ فازیل بەڕاك دەڵێت بەزووترین کات خانویەکت بۆ پەیدا بکات!

لەو ساتانەدا بەخۆم دەگوت: بەخوا چاك توش بووم! جا لەمەیان چۆن دەرباز دەبم! تۆبزانە ئەم دڵدانەوەیە بۆ من چۆن بوبە کێشە؛ بەخوا دڵدانەوە هەروا دەبێت..! دیارەو دەشبێت بەڕێوەبەری ئەمنی ڕەمادیش لەوە ئاگادار بکەن.!

هەر پێش فازل بەراك، مودیری شوعبەی سێ داوای لێدەکردم کە بۆ دەرخستنی دۆستایەتییم، نامە بنوسم بۆ ئەوانەی لەشاخنو داوای گەڕانەوەیان لێبکەم. گوتم:

< من کەس ناناسم، من مام جەلالو عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری دەناسم!

- وتی نا مەبەستم ئەوان نییە، چونکە ئەوان گەرەکیانە تۆ رابکێشن.

< دەی ئیتر من لەڕەمادیم و ئاگاداری هیچ نیمو نازانم کێ لەشاخە، بۆیە کەسیان لێ ناناسم.

- باشە ئێمە خۆمان ناوت دەدەینێو خۆشمان بەڕێگەی تایبەتیی خۆماندا نامەکان دەگەیەنین!

< ببوورن من شتی وا ناکەم!

- ئەویش گوتی: بۆچیی نایکەیت؟

< چونکە نامەی وا بگاتە دەست هەر کەسێك گاڵتەم پێ دەکاتو دەڵێت: سەیرە! مەحمود خۆی گەڕاوەتەوەو نەفی رۆژئاوای عێراق کراوە، کەچی دەیەوێت ئێمەش بگەڕێنێتەوەو بەنەفیکردنمان بدات! ئەویش هەڵیدایەو گوتی:

- نا مامۆستا تۆ نەفی نیت، عێراق هەمووی ولاتی خۆتە، ئەی سلێمانی و رەمادی لە عێراقدا نین؟ ئیتر چۆن قسەی وا دەکەیت!؟

< ئەی بۆ لەشارەکەی خۆم گوێزراومەتەوە؟ بۆچی دەتانەوێت بۆ بەغدا بگوێزرێمەوەو سلێمانیم لێ قەدەغە دەکەن؟ گوتی:

- بەقسەی من بکە تۆ لە سلێمانی نەبیت باشە، سلێمانی بۆ تۆ بەلایە.

ئیتر بەو بیانووە خۆمم لەو داوا گەوجانەیە دەربازکرد. ئەی ئاخر نامەی چیی! رەنگە بە ئەقڵی خۆیان وابزانن هەر وا ئاسان ئەو کارە نامۆیە دەسەپێنن.. نازانن لە دژەکرداری نەخشەی دوژمنانەیان، رێگەی نائاساییش بەئاسایی دەزانمو ئەوەش گەیاندومییە حاڵەتێك کە ئەگەر "کوێخا رینگۆش" لەشاخ بمێنێت هەر چەپڵەی بۆ لێبدەم.

ئەو بەڕێوەبەری شوعبەی سێیە لە زۆر کۆنەوە لەگەڵ کێشەی کورداو بۆ تێکشکانی، تێکەڵە.

ئەو بەیانییەی گەیشتمە بەردەرگای سەرەکیی ئەمنی عاممە یەکسەر لەگەڵ کەمال محێدینەدا یەکترمان بینی، ئەمیشیان لە قوڕنەوە بانگ کردبوو. لەچوونە ژوورەوەو سەرکەوتنمان بۆ قاتی دووەمی بینا سەرەکییەکە، ئەو تەوقەیەکی گەرمی لەگەڵ هەردوکمان کردو کەمال پێناسەی هەردوکمانی بەیەکتریی کرد. پێش ئەوەی لەیەك جیابکرێینەوە کەمال باسی هەندێ لە پەیوەندییەکانی پێش ساڵانی حەفتای لەگەڵ ئەو بەڕێوەبەرە کرد کە بۆ من تا ئەوکاتە شارراوەو نهێنی بوو، بۆ ئێستاش نامۆو تاقەتبەرن.

هەر لەو رۆژگارەدا، رۆژێك لە رۆژانی سەرەتای نەفیکردنم بۆ رەمادیی، لەپۆلدا دەرسی مێژووم دەگوتەوە، لێپرسراوی یەکێتی قوتابیانی بەعس دە دەقیقەیەك لەدەرس دواکەوت. بێ لەدەرگادان، هەروەکو کەس نەوەستا بێت، خۆی کرد بەژورداو چوە سەر کورسییەکەی خۆی. منیش چاوم تێ بڕیوەو سەرنجی ئەم دیمەنە نائاساییە دەدەم. دوای دانیشتنی گوتم:

< عەلی! هەستە، کە هەڵسا پرسیارم لێکرد: ئەرێ بۆچی لەدەرگات نەدا؟

- گوتی لەدەرگامدا، دیارە تۆ گوێت لێ نەبووە.

< نەخێر لەدەرگات نەدا. ئەرێ خەڵقینە گوێتان لەدەرگادان بو؟ کەس قسەی نەکردو چەند قوتابییەك بەسەر بادان نکوڵییان لەلێدانی دەرگا کرد. دەی بابڵێین لەدەرگاکەت دا! ئەی باشە کێ رێگەی پێدایت کە بێیتە ژورەوە؟ تۆ چاوەڕوانیت نەکرد تا بزانیت من رێگەت دەدەم یاننا. لەبەر ئەوە فەرموو بچۆرە دەرێ.

- بۆچی ئاخر خۆ ئەمە پۆلی خۆمەو من ئیشی یەکێتی قوتابیانم هەبووە.

< تۆ ئیشی یەکێتیت هەبووە یان نەبووە ئەوە پەیوەندیی بەخۆتەوە هەیە نەك بەمنو بە دەرسەکەوە. تۆ بێ ئیزن دواکەوتویت، بێ لەدەرگادانو بەبێ ئیزنی من هاتویتە ژورەوە، ئەوانەش شکاندنی دیسپلینو یاسای قوتابخانەیە. بۆیە دەبێت پۆلەکە بەجێ بهێڵیت. کە زانیی سورم لەسەر چونە دەرەوەی، سەری داخستو رووەو دەری پۆلەکە جولا.. ئەوسا لەسەر دەرسەکە بەردەوام بوم.

دوای ماوەیەك قوتابییەکە لەگەڵ ئیبراهیم- ی بەڕێوەبەردا هاتەوە.. بەڕێوەبەر گوتی:

- مامۆستا مەحمود رێگەی بدە بێتە ژورەوە چونکە من موحاسەبەم کردوە.

< زۆر باشە وەك بەڕێوەبەر موحاسەبەت کردووە، بەلام موحاسەبەی منیش ئەوەیە کە لەم دەرسە بێبەش ببێت.

- ئاخر من موحاسەبەم کردووەو ئیتر پێویست بەهی زیاتر ناکاتو منیش وەك مودیر دەڵێم با بێتە ژورەوە

< منیش وەك لێپرسراوی دەرسو پۆلەکەی ئەم سەعاتە، دەڵێم ئەم دەرسە نایەتە ژورەوە، ئەگینا هەموو قوتابییەکانی تر فێری ئەو لە دیسپلین دەرچوونە دەبنو قوتابخانەکە دەبێتە ئاژاوە. بۆیە من رێگەی نادەم!

- گوتی ئاخر من مودیرم، موحاسەبەم کردووەو دەڵێم رێگەی بدە با بێتە ژورەوە ئەگینا خۆم دەینێرمە ژورەوە..

< گوتم ئەو بێتە ژورەکەوە من بەجێی دەهێڵم!

- ئینجا بەخۆفشکردنێکەوە روی کردە قوتابییەکەو گوتی: بچۆرە ژورەوەو دانیشە. چاوەڕوانم کرد تا قوتابییەکە دانیشت ئەوسا روم کردە بەڕێوەبەرو گوتم:

< زۆر باشە دەی بفەرمو جەنابیشت وەرە ژورەوەو دەرسەکە تەواو بکە. ئیتر ژورەکەم بۆ بەجێ هێشتو چومە ژوری مامۆستایان، جگەرەیەکم لێ داگیرساندو چایەکم بانگکرد، تا چاوەڕوانی بەزمی پشووی چاخواردنەوە بکەم.

بەڕێوەبەر بەرپرسیارییەکی حیزبیشی هەبوو، لاوێکی تازە دەرچووی لەخۆڕازیی بوو. کە لەپایزی ساڵی حەفتاو پێنجدا ناوەندیی (مغیرە بن شعبە) لەناو ڕەمادیدا کرایەوە، منیشیان لەناوەندیی جزیرەی ڕەمادی کەلە پێش پشووی هاویندا بۆی نەفی کرابوم، گواستەوە بۆ ئەوێ. جا بەڕێوەبەر هیچ شتێکی دەربارەی کاروباری بەڕێوەبردنو تۆمارو ڕێکخستنو نامە نوسین نەدەزانیی.. کە پەنای بۆ هێنام تا یارمەتیی بدەم.. زۆر شتم فێر کرد. ڕۆژێك بەدەم ئیشکردنەوە وتی:

- ئەرێ مامۆستا مەحمود بۆچی نایەیت ئیشمان لەگەڵدا بکەیت؟ منیش خۆمم لێ هەڵەکردو گوتم:

< ئەی ئەمە چییە؟ ئەمە ئیش نییە؟

- نا مەبەستم مەکتەبی مامۆستایانە.

< من سیاسەتەم وازلێهێناوەو جارێکی تر بەلایدا ناچمەوە.

- جا ئەوە چیی پەیوەندیی بەسیاسەتەوە هەیە، ئەمە ڕێکخراوێکی پیشەییە. ئیتر ئەو تازە پیاکەوتوبوو، دیاربوو لە رابوردوشم بێ ئاگا بوو.

< باشە تۆ دەزانیت من چیی بوومو بۆ گەیاندراومەتە ئێرە..؟

- نەخێر، جا من چیی پەیوەندییەکم بە رابوردووەوە هەیە!

< دوای ئەوەی کەمە باسێکی رابوردوی سیاسییو هۆی گەیشتنە ڕەمادی- م بۆ کرد، گوتم هەق نییە وا ئاسان ئەوانەی لەسەنگەرێکی تردا بەرامبەر بە ئێوە بون وا ئاسان بڕوایان پێ بکەن، کورد نابێت بەعەرەب، بون بە بەعسیش مانای بەعەرەب بوونە، جا ئێوە چۆن بڕوا بەیەکێك دەکەن کە لە ئەسڵەکەی خۆی هەڵبگەڕێتەوە.

- وتی نانا، حیزبی بەعس هی هەموو عێراقییەکەو جێگەی هەموو کەسی تێدا دەبێتەوە.. هەق نییە تۆ ئەو بیرەت هەبێت!

کە جەرەس لێدراو هەموو مامۆستاکان هاتنە ژورێو دانیشتن، نەگەیشتنە دەست بردن بۆ چا، بەڕێوەبەر خۆی کرد بەژورداو دەستی بەشاتە شاتو قڕە قڕو سەرزەنشتی من کرد، گوایا یاسای قوتابخانەو قسەی ئەوم شکاندوەو پۆلەکەم بۆ ئەو بەجێ هێشتووە. لەناو قسەکانیشیدا گوتی:

لەبەر چونە دەرەوەی باسی کێشەکەش نەبوایە وا بە حیزبیشم دەگەیاند.. منیش دوای ئەوەی هەڵەی هەڵوێستەکەی ئەوم باسکرد گوتم: هەقی خۆتە ئەو شکاتەش بکەیت! وا دیارە تۆ بە پەنابردنە بەر دەسەڵاتی حیزب کێشەکانت بۆ چارە دەکرێت!

دەی باشە وا شکاتیشت کرد! چیم لێ دەکەن؟ ڕەنگە ئەمجارە لەبری ڕەمادیی بۆ (ڕوتبە) نەفی بکرێم، کە هەردوکیان بۆمن وەك یەکن.

حەمە سالح محەمەد ئەمین کە لەسەردەمی بونم بە بەڕێوەبەری ئامادەیی بازرگانیی سلێمانی (١٩٧٢) داوام کرد کە ئەو ببێتە یاریدەدەرمو ئیتر لەو ڕۆژگارەوە بو بە برادەرێکی زۆر خۆشەویستو نزیکم، لەنەفیکردنو لەم قوتابخانەیەشدا هەر پێکەوە بوین، لەداخو ڕقێکی دوولایەنە خوێنی تێدا نەمابو، لایەك لەبەر ئەو دەمروتە کە دەیەوێ خۆی بکاتە کەڵەگا، لایەکیشی لەبەر من کە بێدەنگ نابمو ڕەنگە خۆم توشی بەڵایەکی گەورە بکەم، خێرا خێرا بەڕوخساری گرژو بروسکەی چاوە پڕ لە ڕقەکانییەوە پێم دەگەیەنێت کە لەسەری نەڕۆم، خۆ دەسەڵاتی ئەوەشی نییە هەستێو سواری سەری ئەو ببێو پێی بڵێت: هەی دەم ڕوتی تازە پیاکەوتوو، ئاخر ئەم شەڕ فرۆشتنە بۆچیی؟

بۆ هێمن کردنەوەی دۆخەکە سەعدی کە مامۆستای سەرەتایی بوو، بۆ وەرزش دایاننابوو، بەعسییەکی هێمنو بێ هاشەو هوشەش بو، بەدەم هاتنییەوە بۆ لام گوتی: نانا مامۆستا مەحمود تۆ نەفیی نیت تۆ میوانی ئێمەیت، ڕەمادی شاری خۆتەو هەر لەوڵاتی خۆتدایت. مامۆستا برایمیش نەدەبو ئەو گرفتە بچوکە وا گەورە بکات. گوتم: برا کە من لەشارەکەی خۆم نەفیکراوم، ئیتر ڕەمادیو سیبریبیا بۆ من جیاوازییەکی زۆر گەورەیان نییە! ئەی قابیلە لەسەر شکاتی بەڕێوەبەر لە کێشەیەکی وادا لە سێدارەم بدەن!

ئینجا سەعدی دەستی گرتمو بەرەو دەری ژورەکە بردمیو گوتی: من تۆم زۆر خۆش دەوێت، بۆیە دەڵێم: هەق نییە ئەو جۆرە قسانە بکەیت.. نایەڵم ئەو ساردییەش لەگەڵ بەڕێوەبەردا بەردەوام بێت.. گوتم برا ئێمە وەك میللەت لەڕوی سیاسییو سایکۆلۆجییەوە حوکمی ئیعدام دراوین، بۆیە گوێ نادەینە ناڕەحەتیی تر.

ئەم هەر ئەو مامۆستایە بو کە لەسەرەتای دانانم لەو قوتابخانە نوێیە، ڕۆژێك لەپشوی چاخواردنەوەدا، نوسراوێکی دەخوێندەوە، مەلی خەیاڵی منیش لەناو تابلۆی دیمەنو یادەکانی سلێمانیدا کە دوکەڵی هەڵکشاوی جگەرەم، لەناو ژورەکەدا، بۆتە ئاوێنەیان، و ئاوازی بەسۆزی دەچرپاند بەگوێمدا!. لە پڕ بانگیکردمو گوتی: مامۆستا مەحمود وەڵا تۆ هەقە بۆ سیبریبیا نەفی بکرێیت! لەگەڵ تەواوکردنی ڕستەکەدا هاتە تەنیشتمەوەو نوسراوەکەی دایە دەستم. ئەوە یەکەم لیستەی ناوی ئەو کتێبانە بو کە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، ڕژێم بڕیاری قەدەغە کردنیانی دابو، چونکە ناوەڕۆکەکانیان لەگەڵ بیروباوەڕو سیاسەتی ڕژێمدا

نەدەگونجان. لەناو لیستەکەدا کتێبی "دیپلۆماسیێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی"یەکەی منیشی تێدا بو کە لە ساڵی حەفتاو سێدا لە سلێمانی بەچاپم گەیاندبو. دوای خوێندنەوەی نوسراوەکە بەپێکەنینەوە گوتم: جا پیاو کە نەفی کرا، ئیتر لەهەر شوێنێك بێت جێگەی دەبێتەوە! خۆ لەتێگەیشتەی ناوەڕۆکی زاراوەکەشدا، نەفیکردن هەر نەفیکردنە، بۆ سیبریا بێت یان بۆ ڕەمادی..!

هەر لەو ماوانەدا ڕۆژێك تالیب ڕۆستەم، کە مامۆستای سەرەتایی بو، ئەویش بۆ ڕەمادی نەفی کرابو، هات بۆ لام وتی:

- بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم زۆر نارەحەتی کردوم، چونکە زۆرم لێ دەکات کە لەگەڵیان کار بکەم. جا هاتوم بزانم ڕای تۆ چییە؟

پرسیارێکی سەیر بو، یەکسەر مەزەنەی ئەوەم دەکرد کە لەوانەیە پەیوەندیشی کردبێت. گوتم:

< جا بۆ نایکەیت!

- چۆن یەعنی ببمە بەعسی؟ وەڵا مامۆستا چاوەڕوانم نەدەکرد ئاوا وەڵامم بدەیتەوە!

< وەڵامی پرسیاری نامەعقول هەردەبێت وابێت. ئەی خۆت چاکەو خراپەی کاری وا لەیەك جیاناکەیتەوە. نازانیت بونە بەعسیی مانای چیی؟ ئەوە پێویستیی بەڕا وەرگرتن هەیە؟ جگە لەوە. لەم تاراوگەیەدا من لە کەسی ترم نەبیستووە کە بەزۆر ڕێکیان بخەنو بیانکەن بە بەعسی! کەچیی ئەو لەناو ئەو هەڵوێستە نیمچە ڕوخاوییەوە گوتی: دەی باشە با شتێك بکەین! لەوەشدا وەڵامم دایەوە کە نە ئەوەیان و نەئەمەیان، باشترینو سەربەرزترین هەڵوێست بۆ ئەم سەردەمە خۆڕاگریو بە بەعسیی نەبونو هاندانە بۆ ئەم ڕێگەیە، لەم ڕۆژگارەدا ئەوە لوتکەی خەباتە. خولاسە دیاردەو ڕوداوەکانی تری ناوژیانی سیاسیی سەرزەمینەکەی ئەو شارو مەڵبەندە، نەبونە هۆی گۆڕینی بیروبۆچونەکانو کۆسپی بێزارکەر، نەبونە هۆی لەقینی بیری ئازادیخوازو خەونی سەرفرازیی شارو نەتەوەکەم.. بۆیە دەبو سەرەنجامەکە هەر بەو جۆرە دژ بەو حەزو خواستەم بن، دەبو هەر ئەو خۆشەویستییە هۆی دەست پێکردنی ئەم کاروانی بێ کۆتاییە بێت بەم وەیشومەیە لەپارشێوی عارفە گەورەی جەژنی قوربانداا.

# کاروانی بێ کۆتایی و گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## (١)

## ڕووبەڕووی وەیشومەی مەرگچنی شارەکە

ئەو شەوە بەپێچەوانەی شەوانی ترەوە، لە شیرینەی خەوێکی قووڵی نائاساییدا بوم، چونکە بەهۆی تازە دەرهێنانی گورچیلەی لای ڕاستم لە (مستشفی الرازی) لە بەغدا لای دوکتۆر (مکی الواعـن) لەسەر ڕاسپاردەی ئەم، بۆ پارێزگاریکردنی گورچیلەکەی ترم، دەبو ڕۆژانە چەندین لیتر ئاو بخۆمەوە. ئیتر کردبوم بە پیشەو بەردەوام ڕاسپاردەی دوکتۆرم جێبەجێ دەکرد. شەوانیش چەند جارێك بۆ میززەڵان بەتاڵکردنەوە بەخەبەر دەهاتم. بەڵام ئەو شەوە هەروەك بەنجکرابم بۆ ساتێکیش چییە هۆشیاریی نەبووە میوانم. تا بەخەبەر هێنانەوەیەکی زۆر نائاسایی وا ڕاپەڕاندم، کە وەك شێت، بگرە هەر شێتی تەواو، لەناو ژورە تاریکەکەدا، بێ هیچ بیرکردنەوەیەك بەرز بومەوەو کەوتمە سۆراغی ڕوناککردنەوەی ژورەکە، بێ ئەوەی تەنانەت سویچی کارەبای ژورەکەم بۆ بدۆزرێتەوە. نەمدەزانی، ئەوە دنیایەو کۆتایی دێت، یان بومەلەرزەیەو شارەکە وێران دەکات! چونکە تەپەو گرمەو ناڵە سەرزەمینەکەیان وا گرتۆتەوە کە ئەو قیامەتە دروستبکرێت. بەهەر حاڵێك بو دەرگای ژوری نوستنم کردوە، بێ ئەوەی بزانم گەلاوێژی هاوسەرم و هەر پێنج منداڵەکەم، کە ناچاربوین لەو ڕۆژگارە نائاسایی و پڕ لە مەترسییانەدا، هەموویان لای خۆمان بخەوێنین، بەخەبەر هاتون یاننا. تەپە تەپ و گرمە گرم، زرەی دەنگ ناسازی جەرەسە کارەباییەکە یەکبینە لەناو ئەو قیامەتەدا لەناو مێشکدا دەنگ دەدەنەوە، نەمدزانیی چییەو چیی ڕویداوەو چیی ڕوودەدات.

هەر لەگەڵ دەرگام کردەوە ڕاستەو خۆ ڕووبەڕوم بو، هێندەیان باسکردبو وێنەکەی لەمێشکمدا جێگیر بوبو، عەسکەری کلاشینکۆف بەدەست نیو ئەڵقەیەکیان

لەدەوری دروست کردووە. رووبەڕوو خۆم لەبەردەم مەرگچنی شارەکەدا بینییەوە. لێکدانەوەی گەرەك نەبو بزانم ئەمە (ملازم محسن)ە و بۆچی هاتوە. چونکە لەو سەردەمانەداو لە سلێمانیدا، بەهێرشی ناکاو بۆ سەرمالان، بەگرتن‌و کوشتن، بە ئیعدام کردندان بوبووە ڕەمزی تۆقاندن‌و مەرگچنین. بەخۆمم گوت ئەمە دوا شەوو دوا ساتەکانی ژیانە. چونکە لە ڕۆژگارێکی وادا، بەم جۆرە بدەن بەسەرماڵدا، بێ هۆ نییە.

هەر چەندە ڕژێمیش لەگەڵ ئێراندا دوچاری جەنگێکی وا خوێناوی بووە. بەتێگەیشتنی سروشتی ڕژێمە نوێیەکەی جمهوری ئیسلامیی، وایان دەردەخست کە سەرسەختانەو بۆ تۆڵەسەندن لەو شەڕە لەپڕو چاوەڕواننەکراوەی پێیان فرۆشرا، درێژە بەشەڕەکە دەدەن. ئیتر ئەقڵ نەیدەبڕی کە بەعسییەکان کێشەی زیادە بۆخۆیان زیاتر بکەن. لەگەڵ بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆ خەریك نەبن نەك بێ هێزکردنی.

هەر تەنها چەند ڕۆژێك لەوەوبەر کاتێ بەختیار مستەفا هاتە لام گوتی:

> دەزانیت ئەو چەند ڕۆژەی گرتیانم لەبەردەم چی هەڕەشەو گوڕەشەو ئەشکەنجەی دەرونیدا بوم. هەڕەشەیان لێکردم کە:

- ئەگەر نەوشیروانی برات یەك کەسی تر بکوژێت وا هەموو خێزانەکەتان دەکوژین!

خۆ نامەشم بۆ کاکم نوسیوە بەڵام وەڵامی نەداومەتەوە. ئێستا هاتوم بۆلای تۆ تا ڕێگەیەکم بۆ دابنێیت. من بۆخۆم بڕیاری ڕاکردنم داوە، هەر لەبەر کاکم ناوێرم سەربەخۆ بڕۆم. گوتم:

> باشە من نامەیەکی بۆ دەنوسم، تۆ چاوەڕوان بە تا وەڵامەکەی دێتەوە، بەڵام بڕواناکەم هێرشی گرتن بەردەوام بێت. چونکە بەپێی لۆجیکی بارودۆخی جەنگەکە دەبێ هەوڵ بدەن ئارامیی‌و ئاسایش بخولقێنن نەگ گرتن‌و تۆقاندنی زیاتر. بۆیە باشتر وایە واز لە بیری ڕاکردن بهێنیت، با بشزانین کاکت چیی دەڵێت..

لەبەردەم ملازم موحسین‌و، لەناو تێڕوانینە پڕ لە سامەکەیدا کەمردنیان لێوە دەردەکەوت، ئەوانە وەك بروسکە بەمێشکمدا گوزەریان دەکردو بەخۆمم دەگوت: لەبەر ئەوەی ئەم بەعسە لەکۆمەڵگەی شارستانیی بەدورەو هەر هەمان دواکەوتویی سەرەتایە کە لەم کۆتایی سەدەی بیستەمەدا بە بەرگێکی نوێوە سەری دەرهێناوەتەوە، بۆیە دەبێ قاموسی سیاسیی ئەم سەردەمەو شارستانێتیی نوێ نەیانخوێنێتەوە، چونکە بەپێچەوانەی ئەقڵی مرۆڤ دەجوڵێتەوە، بەزانست‌و لۆجیك نامۆیە..

لەناو ئەو بیرانەدا چاو تروکاندن بەچاوتروکاندن چاوەڕوانیی پەلامارەدەکەم. ئەویش لەناو سەیرکردنێکی چڕو لەئاسایی بەدەر ناموێ سەر ئەو ڕوخسارە بێزراوو و ترسناکەیدا لێوی جوڵاندەوەو بەزمانەکەی خۆی گوتی:

- ناوت؟

< مەحمود.

- ناوی باوکت؟

< مەلا عززەت

- باپیرت؟

< مەحمود

چەند سانییەك لەسەرهەمان دیمەن بەردەوام بو. تێینەدەگەیشتم ئا لەو سەرەتا کورتە چڕو خێرایەدا ئەوە شەڕێکی سایکۆلۆجیی روخێنەرە دەیکاتو چاوەڕوانیی ئەوە دەکات کە قسەیەك بکەم، یان شتێکی تری لەمێشکدایەو دەیەوێ بڕیارێکی بە پەلە بدات! کە هەردوکیان بۆمن لەبەردەم ئەم مەرگچنەدا مەرگەساتن، چونکە هەموو رۆژگارە خوێناوییەکانی سلێمانییو سەرجەمی ئەشکەنجە سەختە بیستراوەکان: نینۆك دەرهێنان، بوتڵ تێبڕین، کارەبا، هەڵواسین، حەوزی سارد، زیندانی تاککەسیی، جگەرەو شیشی سورەوە کراو، قاچو دەست بڕین، حەوزی تێزاب... تاد، دەهێنایەوە بیر. بۆیە سات بەسات زیاتر خۆ ئامادەکردوو دەبم، بیرم لەسەر خراپترین حاڵەتو ئەنجام چڕ دەکرد. تەنها ئەوە نەبێت کە لەناو ئەم ترسە گەورەیەو لەبەردەم ئەم وەیشومەدا ئەوەی زۆرتری لێ دەترسمو لەئەگەری روداني بیردەکەمەوە، پشکنینی ژورەکانە. بێ لەوە چیی تر دەبێت بابێت! زۆر لەکۆنەوە لەهەموو بۆنەیەکدا گوتومە پیاو یەك جار دەمرێتو نابێت بەدووان..

گێژاوە کە هێندە لەپڕوچڕو خێرا ڕەوتی دەکردو گوزەری پێدەکرا کە هەموو شتێك نامۆو ئەبڵەقکەربێت.. نەمدەزانی چۆن دەرگای دەرەوە کراوەتەوە. خۆ لەناو ئەو بومەلەرزەیەدا. جەرەسە دەنگ هەراشە بێزارکەرەکە، کە دیاربوو پەنجەی لەسەر داگیرابوو، بەجۆرێکبوو هەر دەتگوت لەناو مێشکمدایە.

لەو ساتانەداو لەپڕ قسەیەکی دایکم سەرنجی ڕاکێشام کە گوتی:

خوا هەڵناگرێ هیچی نەکردوە، نەخۆشە.

ئەوسا هاتەوە بیرم کە ئەمە بەرەبەیانی عارفە گەورەی جەژنی قوربانەو لەگەڵ باوکمدا پارشێو دەکەنو رەنگە هەر ئەوانیش بوبن دەرگاکەیان کردبێتەوە. ئیتر لەم دیمەنەی گرتنی کوڕەکەیان واقیان ورماوەو وەك سەرئەنجامی گرتنی ڕۆڵەکانی تری ئەم شارە، کوشتنو لەسێدارەدان دێتەپێش چاویان.

قسەکانی دایکم وا سەرنجی ڕاکێشام کە بە خێراییەکی نائاسایی‌و بەتیلەیەکی چاو، نیگایەك ئاڕاستەی بکەم، لەوەدا دەیان عەسکەری کلاشینکۆف بەدەست حەوشەکەیان پڕکردوە، ئەوەش زیاتر سەرنجمی بۆهاتوچۆو تەپەتەپی سەربان ڕاکێشا، وڕەو ڤڕەی دەنگی ماشینەکانی بەردەرگا دیمەنێکی ترسناك‌و ناشیرینی تری خستە سەر ئەو شانۆگەرییە.

سەیرە، ئەم ڕژێمە بەناو نیشتمانییە نەفرەتلێکراوانە هیچ ماناو ڕێزێکیان بۆ یاساو ئازادیی مرۆڤ و حورمەتی ماڵو ژیانی خێزان، جەژن‌و پیرۆزیی پرنسیپەکانی، ئاسایشی هاوولاتی‌و دڵنیایی لەماڵو منداڵ نەهێشتۆتەوە. خۆ تەنانەت لەسەردەمی پاشایەتیشدا، هیچ نەبوایە فەرمانی بەرپرسی یاسا وەردەگیراو ئاگاداری موختاری گەڕەك دەکرا، بەشێوەیەکی دور لەم دڕندایەتییە لەدەرگای ماڵیان دەدا، ئەوسا دەچونە ژورەوە، کەچی ئێستا ئەو ڕۆتینەش پێشێلکراوەو قەرەقۆشانەش ڕەفتار دەکەن.

دیار بو ئەو دەرگاکردنەوەیەش هەر بۆ هاتنە ژورەوەی ملازم موحسن‌و حەرەسە تایبەتییەکانی بو. چونکە سەربان‌و بن بان‌و حەوشەکە بۆخۆیان بوبونە سەربازگەیەك. تومەس ئەو گرمەو بەزم‌و ڕەزمە. ئەو هاتوچۆو سەرکەوتنی پەیژە بۆ سەربان‌و دابەزین‌و بازدان‌و هاتنە حەوشەی ماڵەکەو ئەو جەرەسە بەردەوامەو گرمەو ڤڕەڤڕی ماشێن‌و زرێپۆشانەن ئەو بومەلەرزەیەیان خوڵقاندووە. مانەوەی تاقمێکیشیان لەسەربان بەشێك بو لە پیلانی تۆقاندن‌و ترسی خۆیان لە دەستکردنەوەو ئەگەری بونی پێشمەرگە لەناو شار. ئەگینا گرتنی مرۆڤێکی سڤیل بەبیجامەوەو لەناو شیرینی خەوداو لەتەك هاوسەرو پێنج منداڵی وردیدا ئەم بەرە سەربازییەی بۆ چییە..!

دوای ئەو سێ کورتە پرسیارە، ملازم دەستی دایە شتێك کە لەسەر مەکینەیەکی ڤۆڵڤۆ کە لە لایەکی ڕاڕەوی بەردەم قاپیی دەرەوە دانرا بو، هەڵیگرت‌و هەردو چاومی پێ پێچایەوەو پەلم گیرا.

ئەوسا گوێم لەدەنگی دایکم بووەوەو لەسەرخۆ گوتی: ئەوە بۆ کوێی دەبەن وەڵڵا هیچی نەکردوە، خوا هەڵناگرێ، عەمەلیات کراوەو گورچیلەیان دەرهێناوە، نەخۆشە ئاخر چیی کردوە چیی..؟

من بۆخۆم دەمزانی دایکم چەند لەم ڕۆژە دەترسا، هەمیشە دڵەڕاوکێی بو، هەر بۆخۆشم دەمزانیی خۆشەویستیی ئەم کورەی چۆن ڕیشەی لەناو دڵ و مێشکیدا داکوتاوە، هەروەك خوا بەتەنها ئەمی پێ سپاردبێت‌و ئەو ڕیشانە لەناو ساتەکانی ڕۆژو شەوی هەر نۆمانگو نۆ ڕۆژەکەدا بنجبەست بوبن، و لەناو بەرەژانی سەرەتاو

تەوژمی ئازاری پرۆسەی سەرفرازبون، لەگەڵ بیرە مێشک ئاڵۆزکراوەکانی رۆژانی رابوردو بوبن بە پەیکەرێکی یاقوتیی بەدەنگو وێنەی ناو سینەی هەرگیز لەیاد نەچو، کەوا ئێستا لەناو دەستی دەردەهێننو زەوتی دەکەنو جارێکی تر نایبینێتەوە.

تێکەڵ بەو خۆشەویستییە، هۆیەکی تری خولقانی ئەو سۆزە بێسنورە بۆ ئەم کورەی ئەو بەزەییە بەردەوامەی ناو ئەو بیرانەیەتی کە وای دادەنا ئەمیان نەحەواوە بووەو خوا هەر دەربەدەریی شاخو داخو نەفیکردنو خۆشاردنەوەو زیندانیی بەباڵا بڕیوە.

ئەو سەرجەم منداڵەکانی خۆش دەویست، هەروەك دەزوی تەزبیح بو بۆ ئەو بنەماڵە گەورەیەی مەلا عززەت کە لەماوەی زیاتر لە نیو سەدەدا وەچەیەکی فرە لکی زۆری لێ بووبۆوە.. لە تێڕوانینی چاوەکانیدا پەی بەوە دەبرا کەچی خۆشەویستییەکیان لێ دەبارێ. ئیتر لەناو سۆزی گەرمی دایکێتیو رەنگدانەوەی ئەو خۆشەویستییەی هەروەك گوێم لەقرچەقرچی جگەرسوتانی بێت.. هەروەك لەناو ئازاری پشکۆچزاندن بەدڵو هەناویدا بم، ئا بەو جۆرەو لەناو ئەو ترسی گرتنەمدا هێندەی تر بێهەناوو بێورە بوم. هێندەی قورسایی خەمی گرتنەکەو ئەو سۆزی بەزەییەی دایکیشم، رقو کینەم لەم رژێمە داگیرکەرە بەهێز تر دەبێ، چونکە ویژدان مردوییان لەئاستێکدایە کە سۆزی بێنازی پیرێژنێکی بەساڵاچوی حەفتاو پێنج ساڵەی کڕنوش بردو بۆبەر قاپی یەزدان، لەناو پارشێوکردنو بەڕۆژوبون لە ڕۆژێکی وا پیرۆزی عارفەی جەژنێکی وا گەورەدا، هەر وا ئاسان بەسەریدا تێبپەڕنو گاڵتەیان پێی بێت.. بۆیە زۆر بەپەرۆش بوم کە تازوە لەبەرچاوی نەمێنمو دورم بخەنەوە تا ئەو دیمەنەی لێ ونببێت.

لەناو ئەو خواستە سادەو داوا بێ ئەرکەی ئەو ساتانەدا، کە خەیاڵم دەکەوتە سەر (پشکنین)، گرتنەکەم زۆر گرانتر دەهاتە بەرچاو. ئیتر ئەو دیمەنەی دایکمو بێ دەنگییەکەی باوکمو بیری ژوری نوستنو کەنتۆری جلو ژوری میوان نائارامتریان دەکردم. هەر لەو ساتانەدا دەمگوت: تۆ بڵێی خێرا بمبەنە دەرەوەو بیر لە پشکنین نەکەنەوە! چونکە ئەگەر هەر تەنها یەك هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێن دەکەونە ناو ژورەکەوەو یەك هەنگاوی تریش دەیانخاتە بەردەم دەرگای کەنتۆرەکە. هەر ئەوەندەش دەرگاکەی بکەنەوە، وا ئەوەی بەدویدا دەگەڕێن ئاسان دەکەوێتە بەردەستیان. یان هەردوو هەنگاو بەرەو دواوە بنێن وا خۆیان لەژوری میواندا دەبیننەوە کە راستەوخۆ مێزی نوسینەکەمو هەموو ئەو شتانەی لەسەری دانراون دەکەونە بەرچاویان.. ئیتر سانییەم لێ بو بە سەعاتو دوعا دوعامە کە پەلە لەبردنە

دەرەوەم بكەن‌و بمبەن‌و ماڵەكە چۆڵ بكەن تا ئەو دوو دیاردە روخێنەرەم لێ ون ببێت! نەخێر ئەوە شتێكی نامۆ دەبێت هەروا ئاسان بێ پشكنینێكی ورد، ماڵەكە بەجێبهێڵن. كاتێ دەستیان بەرەو دەرەوە گرتم ئەوسا بەرزیی دەنگ‌و زۆریی غەڵبەغەڵب‌و ورەو ڤڕەی ماشێن‌و زریپۆش وەك خۆیان هاتنەبەرگوێ. وا دیار بو كە ئەو ناوەیان پڕ كردبێت. دوای چەند هەنگاوێك فڕێیان دامە ناو ماشێنێكەوە، نەمزانی چۆن لەسەر كورسییەك دایاننام. لەهیچ شتێكی دەوروپشتم ناگەم. بەو كارانەش دڵنیاییەكەم نەگەیشتە ئاستێكی ترس رەوێن چونكە مەزەنەی ئەوەم دەكرد كە لەوانەیە تاقمێكیان لەگەڵ پشكنین خەریك بن. كە ماشێنەكانیش كەوتنە جوڵە، دیسان نائارامیم بەردەوام بو، نەدەچو بەئەقڵدا كە بێ پشكنین ئەو خانوە بەجێ بهێڵرێت. ئەوە خاڵێكی زەقی ناوترس‌و لێكدانەوەكانمە. لەگەڵ ئەوەشدا دڵی خۆم بەوە خۆش دەكرد كە بەخۆمم دەگوت: نانا بڕوانەكەم پشكنینی ماڵ لەم كاری گرتنەمدا هەبێت! چونكە ئەگەر وانەبێت وا دەبوو هەر لە سەرەتاوە دەستیان پێبكردایە. خۆ ئەگەر ئەمەش نەكرێت وا خودی گرتنەكەش دووردەبێت لە مەزەنەی پۆست گرتن یان ئیعتیرافكردن، چونكە لەم حاڵەتانەدا پشكنین دەبێتە كارێكی گرنگ‌و تەواوكەری گرتن‌و لێكۆڵینەوەو ئەشكەنجە.

بەڵام قورسایی سۆزو بەزەیی دایكم‌و دیمەنی رۆڵە كەساسەكەی بەردەستی ئەو پیاوكوژانە، بۆ هەردووكمان، وەك خۆی نەماو بو بە تارماییەكی ناو پەراوێزی روداوەكانی ئەو بەرەبەیانە..

خاڵێكی تریش كە سەرم لێی سوڕما بو، كەمە ئارامییەكیشی دەدا بە مێشكم، ئەو بێ دەنگ بردنە دەرەوەیەو سەرخستن‌و دانیشاندنەبو. ئەوە بە پێچەوانەی لێكدانەوەكانم بو. چونكە چاوەڕوانیی ئەوەم دەكرد كە هەر لە یەكەم ساتا، یان لەچونە دەرەوەو سەرخستنە سەرماشێندا، یەكسەر سواری سەرم بن‌و بەنیوە مردویی بمگەیەننە ئەمنی سلێمانی، هەروەك كردبویان بەپێشە.

لەو گفتوگۆ دەرونییەی ناو ئەو ترسەی سەرەتای گرتنەكە بەخۆمم دەگوت: نانا جارێ كاتی ئەوە نەهاتووە، خۆ ئەوان هەر بۆ لێدان خەڵك ناگرن، بەڵكو هەر لەمەبەستە تایبەتییەكاندا لێدان‌و ئەشكەنجە دەكەنە ئامرازی گەیشتنە مەرام.

ماشێنەكان خرانە جوڵە، ورەو ڤرەو گرمەو لورە ئەو ناوەیان گرتۆتەوە. ماوەیەكی كەمە كە ماشێنەكان كەوتونەتە ڕێ، لەپڕ وەستان، زۆری نەبرد قیژەو گریانی ژن‌و منداڵ تێكەڵ بەنەڕەو جنێوی عەسكەری بەعسی بەرزبونەوە، ئیتر یەكێك سەرخرا، دیسان ماوەیەكی تر هەر بەو جۆرە كاروان وەستا، لەناو دیمەنێكی تردا، یەكێكی تریش هێنرا، نەخێر بۆ سێیەم جار وەستان بو بە .. چوار.. پێنج

شەش.. حەوت ئیتر لەوە دەرچو لەسەر ژمارەکردن بەردەوام بم. هەریەکێ سەردەخرا دەترنجێنرایە بەینی دوانەوە.

ئەو ڕوداوانە دوو بیری لەپڕیان لەمێشکدا قوت کردەوە: ئەم شێوەی گرتنە ئارامییەکی تری لام خولقاند، چونکە نیشانەی ئەو گرتنە ترسناکە نییە کە لە یەکەم ساتەوە بیرم لەسەری چڕبوبو. بەڵام لەلایەکی ترەوە ترسی ئەوەم لێدەنیشت کە کارەساتەکانی رابوردوی ئەم شارە دوبارە بکەنەوە..

خودایە دەبێ چی ڕوویدابێت؟بڕواناکەم ئەمە ڕەشبگیربێت. چونکە سروشتی ئەمانە لە ڕەشبگیردا لای خەڵکی ئەم شارە ئاشکرایە.. ئەی ئەم کۆکردنەوەیە بۆچییەو لەچییەوەیە؟ چەند دەگرن؟ کێ دەگرن؟ بۆچی دەگیرێن؟ ڕەنگە پۆستێك گیرابێت یان شارەزایەك بەر شەپۆلی ئیعتیرافکردن کەوتبێ..؟ لەناو کاروانی ئەو سەرەتایەدا، دەیان بیرو پرسیاری بێ وەڵامی لەو جۆرانە بەمێشکدا گوزەریان دەکرد.. وەستانو خەڵك سەرخستن بەردەوامە، وادیارە لەهەر گەڕەکێك یان یەکدوو گەڕەکی نزیك بەیەك ئەم گرتنی بەکۆمەڵە دەکرێت. جێگا بەتەواوی تەسكو تەنگەبەر بووە. دەبێت ئەوانەی تر کێ بن دەگیرێنو دەخزێنرێنە ئوتومبیلەکەوە! ناشزانم حەرەسو مەرەس لەگەڵماندایە یاننە.. ناو بەناو یەکێکیان هەر لەسەرخستنییەوە، بە لەسەرخۆییەکەوە دەڵێت: لاحول ولا قوة الا بالله العلي العظيم.. ئیتر نەجارێك و نە دووان. ئەوە کەم چیکلانەی کردم. پێش ئەوەی قسەیەك بکەم ئانیشکێکم لەوەکەی تەنیشتمەوە داو گوتم:

- تۆ کێیت؟ گوتی:

< دلێری شێخ مستەفا قەرەداخی. هەناسەیەکی تری کەمێ ئارامم هەڵکێشا، چونکە بۆ منو لای من ناسراو نەبو، کە درێژەی دایەو گوتی برای مامۆستا شێخ حەسەن قەرەداخی، ئەوسا ناسیمنەوە، ئەویش بەهەمان شێوە پرسیاری لەناوی من کردو وەڵامم دایەوە. دوای ئەوە ڕومکردە سەرچاوەی دەنگەکەو لەسەر خۆ گوتم:

- ئەرێ کاکە بەس نییە؟!

< بۆچی قسەی خراپم کردوە.. چیم وتووە؟ ئەویش لەسەرخۆتر وا وەڵامی دامەوە.

- ئەی ئەوە قسەی خراپ نییە، کاکە ئەوە جنێوەو بەوانەی دەدەیت، تێدەگەیت؟ ئیتر ئەو بێدەنگ مایەوە، کاری ڕاستبێت جارێکی تر گوێمان لێی نەبووەوە..

وڕەی دەنگی زریپۆشو ئۆتومبیلێکی زۆر بەردەوامەو نازانین لەکوێینو کێ دەگیرێو دەخرێتە تەکمان. کات کەیە؟ نازانم. بەڵام بە مەزەنەی ساتەکانی پارشێوکردنەکەو ئەو ماوەیەی بەسەرگرتنو هێنانە دەرەوەمدا تێپەڕیکردووە، ڕەنگە کات نزیك بە شەشی سەر لە بەیانیی بێت.

ماوەیەك لەدەنگی ماشین بەولاوە شتێکی تر نابیستم..

دوای دەیان وەستانو خەڵك سەرخستن، دیسان خولانەوەی ماشێنەکان بەردەوام بون.. پێدەچێت وەستانو گرتن کۆتایی هاتبێت. ماوەیەك بەسەر ئەمەشدا گوزەری کرد. وام لێکدەدایەوە کە ئەم کاروانی گرتنی بەکۆمەڵە بەرەو جێگەیەك لەدەرەوەی شار دەبرێت. زۆری پێ نەچو کە وەستان دەستی پێ کردەوە، نەخێر وردە وردە دەنگی ماشین کەم دەبووەوە. تا تەواو خامۆش کران. ئیتر لە دەنگی عەسکەری عەرەب زیاتر هیچ شتێکی تر نابیستم. دەنگی دەرگای ئۆتمومبیل کردنەوە هاتە گوێم. وا داگرتنمان دەستی پێکرد، زۆری نەبرد پەلم گیراو درایە دەست یەکێکی تر، راکێشەو دوای کەوە. هەستم دەکرد بە کۆلانێکی تەنگەبەردا کێش دەکرێم. نەخێر پێپلیکانەیە.ئەی باشە بۆچی خەریکە دەکەومە خوارەوە.! ها ئەم هەنگاو نا هەنگاوەکەی تر بەردەبمەوە، هەر دەڵێیت بەسەرتەنافدا رەوتمان پێ دەکەن، بۆیە هەر وەك منداڵی تازە پێگرتوو کەوتومەتە لارە لارو دارە دارە!

پاش ماوەیەك کرامە ژورێك. هەموو گیراوەکان کراینە ژورێك. کش‌و مات هەروەك خۆڵو دۆ بەسەرهەمواندا کرابێت. زۆری نەبرد وردە دەنگو وردە بۆڵەم گوێ لێدەبێت. هیچ هەستم بەوە نەدەکرد کە حەرەسی لێبێت. هەوڵێکی زۆرمدا کە لەژێر پەرۆکەی سەرچاومەوە شتێ ببینم، بێ سود بو. جوڵە جوڵی ناوچەوان هێنانو بردنیش کەڵکی نەبو..

لەهەمان کاتدا نائارامییەکەی سەرەتا زیادو زیاتر دەبێت، گوشاری بەر موسەلانم بێ ئارامترم دەکات..

جار بەجارێکیش لەخۆم دەپرسیی: تۆ بڵێیت ئەم رۆژە رەشە هەمە جۆرانەی دوچاری سلێمانی دەبێت هەروا بەردەوام بێت. ئەمە رۆژێکی رەشی ترە. رێك هەر لەم رۆژەی ساڵی ١٩٥٧ دا بو کە رەشەبای رەشی سروشتکرد بەسەر شاردا هەڵیکرد. هوروژمی تەرزەی دامێنی گۆیژە کە لە گوێز گەورەتر بون، بەدوایدا رەهێڵەی باران کە هەروەك کوندە قڵپ بکرێتەوە.. لەماوەی نیو سەعاتێکدا شەقامەکانی ناوەڕاستی شاریان کرد بە روبار، گردی تەرزەش لەدەیان شوێنی نزمی ئەو لام ئەولای شەقامو لەکۆلانەکاندا بەرز دەبونەوە. چەندین کەس بونە قوربانیی ئەو لافاوەو زیانێکی زۆریشی لەماڵو بازاڕو قەیسەرییەکاندا.

ئەو ساڵە لەپۆلی پێنجی قوتابخانەی ئامادەیی کوڕانی سلێمانی بوم، ئەو عەسرەش لەسەیری فوتبۆڵێنی نێوان دوو تیپ بوم کە لە یاریگەی قوتابخانەکەمان دەکرا. لە ونبون لەناو ئەو بیرانەدا بەخۆم دەگوت خۆ (حەمدی) شاعیر لەسەر ئەو نەهامەتییانەی بەسەر سلێمانیدا دەهێنران هەر لە داگیرکردنو بۆردومانکردنییەوە

لەلایەن ئینگلیزەکانو ئەو ئیستیعمارەی بەسەر کوردیاندا سەپاند، بە مەبەستی روخاندنی مەلیکایەتێکەی شێخ مەحمودو کپ کردنەوەی دەنگی ئازادی نەتەوەو شەڕی چەکداریی، تا ئاگر کەوتنەوەو لافاوو ئەو جۆرە کارەساتانە، لە خۆیەوە ئەم هۆنراوەیەی بەبۆنەی لافاوەکەی ساڵی ۱۹۳۲ وە دانەناوە کە لەسەرەتاکەیدا دەڵێت:

ساڵی جارێ هەر دەبێ ئەم شارە بێتە مەزبەلە
یا بە بۆمبا، یان بە ئاگر، یان بە بارانی پەڵە

هۆنراوەکەش بەم دێرە پڕ لە گیانی خۆگریی و هیوا گەشە کۆتایی پێدەهێنێت:

ئەم برینانە زەمانە هەردەبێ سارێژی کا
(حەمدی) ئەمما بۆ ئەمەش پێویستە سەعیو حەوسەڵە

زۆر بەسەردانیشتنی گیراوەکاندا تێپەڕی نەکرد، کە یەکێك کرا بەژوردا، نەخێر بو بەدووان ئیتر پەیتا پەیتا خەڵکی تر دەکەن بەژورەکەدا. لەهێنان و بردنی پەڕۆکەی سەرچاوم کەمێ زیاتر روناکیی لێوە دەبینم، نەخێر بێ زەحمەتییەکی زۆرشتم دەناسییەوە. کە ورد سەرنجمدا، خێر گەلێ لەمانە، هەر ناناسم. ژمارەیەکیشیان زۆرباش دەناسم. هەریەکە لەگەڵ سەرنجدانی حەشاماتەکە خەریکەو کەسیش لە مەتەڵی ئەو گردکردنەوەیە تێناگات. ئەوانەی لە بەرەبەیاندا گیران زیاتر خەڵکی سەرکارێزو سەیوان و ناوچەکانی دراوسێیان بون.. بەگشتیی گەرەکی گۆیژەی گرتبۆوە.

ماوەیەك کشوماتیی باڵی بەسەر هەمووواندا کێشایەوە. ئەوسا کەوتنە بانگکردنمان، دەرکەوت کە دەوامی ئەمن، وەك دایەرە، دەستی پێکردووە، من نەمدەزانی ئەو بانگکردنە بۆ چییە، دوای دوو سێ کەس لە مەبەست حاڵی بوم.. دوای خوێندنەوەی ناوی چەند کەسێك بانگی منیشیان کرد، هەر بەچاو بەستراوی پەلیان گرتمو هەروەك ئەوانی تر بردمیان، کەمێ زیاتر پەڕۆکەی سەرچاوم جولابو، بۆیە بێ زەحمەتییەکی زۆر شتی بەچاو ئاشنام دەناسییەوە. بەناو حەوشەیەکدا بەرەو کورسیو مێزێك دەبرام.. ئای ئەمە ئەو قوتابخانە ناوەندییە کە نۆ ساڵ لەمەوبەر بەڕێوەبەری بوم، ئەمە بینای قوتابخانەی ناوەندیی کانێسکانە کە لە رۆژگارێکدا مەڵبەندی خوێندن بو کەچی وا ئێستا لە زانست زەوتکراوەو بۆتە زیندان بۆ قوتابیو مامۆستاو بەڕێوەبەرو زانست. کە لەبەردەم مێزو کورسیەکەدا وەستێنرام، یەکێك کەوتە پرسیارکردن:

- ناوت؟ (دیارە بەعەرەبی)

< مەحمود.

- ناوی باوكت؟

< مەلا عززەت.

_ باپیرت؟

< مەحمود.

- مەوالیدت؟

< ١٩٣٩

- ئیشت؟

< مودەریس. ئیتر چیی پێویست بێت بۆ لێکۆڵینەوە لەشوناسنامەی زیندانییەك، هەر لەو پرسیارانەوە تا دەگاتە ناوو تەمەنی ژنو یەکە یەکەی منداڵان، هەمووی تۆمارکرد. هەموو ئەو زانیاریانەی دایەرەی ئەمن پێویستێتی، بۆ بەندێك کە دەیانەوێت بەپێی خواستی خۆیان تاوانباری بکەن، ئەنجامدراو نوسرا. دەنگو جۆری پرسیارەکانی سەرەتا زۆر سەرنجی راکێشام، قوڵتر بیرم لێکردەوە، دەنگەکە بەگوێم زۆر نامۆ نییە، خێر دەنگەکە دەناسمەوە، تروسکایی سوچی پەڕۆکەی سەرچاوم جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە (کەمال پشدەری)یە. جۆرێ لە ئەدەبی پرسیارکردنی تیایە. نەمدەزانی بۆچی. هەر پێش ئەم گرتنەو لەبینینی ئاساییشدا شەرمو ئەدەب لە روخساری دەباریی! هەر لەو ساتانەدا لەخۆم دەپرسیی: ئەگەر زەلامێك شەرەفو کەرامەتی شەخسیی خۆی بە دوژمنێکی داگیرکەری وەك بەعس فرۆشتبێتو لە نزمترین ئاستا لەدژی نەتەوەکەیو بۆخزمەتی ئەو بەکار بهێنرێت، دەبێ ئەو کەسە بزانێت شەرمو شکۆ چییە!؟ ئەشێ ئەو دوودیاردە تەواو دژ بەیەکە لەیەك کاتداو لەیەك کەسدا کۆببنەوەو پێکەوە هەڵبکەن!؟ ئەوە چی نەگبەتییەکە کە بەو جۆرە کوردێك لەناو سیخوڕیدا ببێتە مەقاشێکی سورەوەکراوی دەستی داگیرکەرو لە دژی رۆڵەکانی نەتەوەکەی بەکاربهێنرێت، بۆ تاقمێکیش کە دوژمنایەتی کوردو ئەوەی بەبۆنیش بەکورد بگات تێکەڵاوی خوێنو مۆخیان بوبێت! چی نهێنییەکە کە پاڵ بەو جۆرە ئادەمیزادانەوە دەنێت خۆیان لەو زەلکاوەدا ببیننەوە!

دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە لە شوناسنامەم، برامەوە ژورەکە. ئەوان بەردەوامن لەسەر بانگ کردنی حەپسەکانی ژورەکە بۆ هەمان مەبەست.

لەکاتێکدا کە لەناو لێکدانەوەی: ئەرێ ئەبێت دوای ئەوە چیتر بکرێت، نوقوم بوبوم، ورتەو گوشاری بەر موسەلانیشم زیاترو زیاتر دەبێتو بیرم بۆلای خۆی کێش دەکات. چاریشم ناچارەو دەبێت زۆر لەخۆم بکەمو لەبیر خۆمی بەرمەوە، ئەی خۆ ناکرێت داوای چونە سەر ئاودەست بکرێت! رەنگبێ تا ئێستا هەر تاساوی ناو گرتنەکە ئەو گوشارەی لەبیربردبمەوە. دەی سەبر بگرەو ددان بەخۆتدا بگرە بابزانین چیمان لێ دەکەن..!

# كاروانی بێ كۆتایی‌و گۆشه‌یه‌كی ژیاننامه‌ی سیاسیی

## (٢)

## كاروانی مه‌رگ

زۆر به‌سه‌ر ته‌واوكردنی ئه‌و لێكۆڵینه‌وه‌یه لەشوناسنامەمان تێپه‌ڕی نه‌كرد، كه‌ كه‌وتنه‌وه بانگكردنمان. به‌هه‌مان چاوبه‌ستراویی دوو دوو كه‌له‌پچه ده‌كرایه ده‌ستمان‌و كێش ده‌كراین. له‌لێكدانه‌وه‌ی دیارده‌كه‌و پرسیاری: ئاخۆ بۆ كوێمان به‌رن دا بووم كه وه‌ستێنراین‌و ئینجا سه‌ر ده‌خراینه ناو ماشێنێك. به‌خوێندنه‌وه‌ی ناوه‌كاندا مه‌زه‌نه‌ی ژماره‌مان له‌بیست تێده‌په‌ڕی. ماوه‌یه‌ك كش‌و ماتیی باڵیان كێشا به‌سه‌ر چاوبه‌ستراوه كه‌له‌پچه‌كراوه‌كاندا، هه‌ستیش ده‌كه‌م هاتوچۆ به ڕێڕه‌وی ماشێنه‌كه‌دا ده‌كرێ، تا ده‌نگێكی نائاسایی ماتییه‌كه‌ی ره‌وانده‌وه‌و به‌عه‌ره‌بی گوتی: گوێ بگرن!

- هه‌ر جۆره جوڵه‌و قسه‌و سه‌رهه‌ڵبڕین‌و چاوكردنه‌وه‌یه‌ك له‌هه‌ر كه‌سێك ببینرێت ده‌یكوژین، باش حاڵیی ده‌بن!؟

له‌ڕێگا یه‌ك ته‌قه‌مان لێبكرێ هه‌ر هه‌مووتان ده‌كوژین، تێگه‌یشتن..!؟

هه‌ركه‌سێك له‌جێگه‌ی خۆی بجوڵێته‌وه ده‌یكوژین، گوێتان لێبوو!؟

قسه‌و چرپه‌و سرپه‌كردن قه‌ده‌غه‌یه، هه‌وڵدان بۆ لابردنی په‌ڕۆی سه‌رچاو قه‌ده‌غه‌یه، تێبیگه‌یشتن!؟

گه‌لێكی تر له‌م ئامۆژگارییانه‌ی بۆنی خوێنیان لێ دێت درا به‌گوێماندا. ئه‌وسا كاروان كه‌وته‌ڕێ.

هه‌ر كه ماشینه‌كه جوڵا دیسان ئه‌و هه‌ڕه‌شانه دووباره كرانه‌وه..

قسەکانی وا بەجیددی دەگوتران، بەجۆرێك ددان بە یەکەیەکەی وشەکاندا دەهێنران‌و وا بەڕوونی لەزار دەردەچوون کە تێمان بگەیەنن ئەمە کاروانی مەرگە..

باشە ئەگەر لە ڕێگا تەقە بکرێت گوناهی ئێمە چییە؟

خۆ ئەگەر لەبەر ئێمەش ڕێگەیان پێ بگیرێت وا ئەم هەڕەشانەی ناو ئەم ئۆتمۆبیلە، هیچ دادێکی نەخۆیان‌و نە ئێمەش نادەن.. لەبیرکردنەوە لە ئەقڵی ئەوانەو ئەو هەڕەشانە، کەوتمە ناو شیکردنەوەی هۆی ئەم گرتنەو پرسیاری ئاخۆ ئێستا دەبێت بەرەو کوێمان بەرن‌و بەرەو کوێ دەڕۆین؟ من بۆخۆم نازانم‌و بۆشم مەزەندە ناکرێت رووەو کوێ دەمانبەن، خۆ جۆری کەلەپچەکردن‌و دانیشتنەکەش ماوەی ئەوە نادەن سود لەو کەمە تروسکاییەی ژێر پەڕۆکەی سەرچاوم وەربگرم.

ماوەیەك تێپەڕیکرد، جۆرێ لەتاسەو بەرزو نزمیی هەست پێدەکەم. دەبێ بەرەو کوێمان بەرن؟ بەهیچ جۆرێك ڕوی ڕۆیشتنەکەم لا روون نییە. هەوڵمدا کەمێکی تر پەڕۆکەی سەرچاوم بەرزبکەمەوە، نەگەیشتمە جولاندنی کە یەك مشتەکۆڵەیان سرەواندە سەرم‌و بەدەنگێکی ناسازو بەعەرەبی وتی:

- جارێکی تر بجوڵێیتەوە دەکوژرێیت.

خۆ ئازاری مشتەکۆڵەکەی یەکەم نەڕەویوەتەوە وا یەکێکی تریشی چووە بان، وا چاکە دەست لەبیری پەڕۆ لابردن هەڵبگرم! ئێ ئەوا زانیشم بەرەو کوێ دەبرێین، دەی ئەوە چیی لەم واقیعە ترسناکە دەگۆڕێ..!

کاروانی روەو چارەنوسێکی نادییار بەردەوامەو منیش کەوتمە ناو مشتومڕێکی دەرونیی:

تۆ بڵێیت ئەم هەڕەشەو توندوتیژییە بێ زەمینە بێت؟ تۆ بڵێیت ئەمە کاروانی مەرگ بێت؟

دەی کاروانی مەرگیی چیی ئەم گرتنە بەم هەڕەمەکییە، بێ بەڵگەو بێ دیاربوونی هیچ هۆیەك، بەلای ئەوەدا ناچێت.

ئێمە لە ترپەی پێی هاتوچۆی حەرەس‌و وڕە وڕی ماشێنەکە زیاتر هیچی تر نابیستین. من هەر ئەوەندەم بۆ لێکدەدرایەوە کەمەزەنەی بردنمان بەرەو سەربازگەیەکی خۆیان بکەم. ڕەنگە بۆ بارمتەو مسۆگەرکردنی خۆپاراستن لەهێرشی دوژمنەکان بێت.

نەخێر بارمتەی چیی! ئەو گرتنە هەرەمەکییەو دەرنەکەوتوویی لەمەوبەرو نەناسینی زوربە، ئەو بیروبۆچونانە بێ زەمینە دەکات. جگە لەوە خۆ ئێمە ئەسیری جەنگەکە نین، هیچ پەیوەندییەکیشمان بەئێرانەوە نیە تا کارێکی وا بیر لێبکەنەوەو ئەنجامی بدەن.

هەڕەشەو گوڕەشەی حەرەسەکان بەجۆرێك بوو کە کەس نەوێرێ فزەی لێوەبێت. باشە تۆ بڵێیت چاویان لەهەموو وردەکارییەکی هەمووومان هەبێت؟ بڕوانەکەم! دەی کەواتە با بە چرپەیەك لەم هاوڕێی کەلەپچەو کاروانی مەرگە، کە نازانم کامیانە، بپرسم:

ئانیشکی دەستە کەلەپچەکراوەکەم خستە جوڵەو زۆربەنزمیی گوتم: بەرەو کوێ دەبرێین؟

چاوەڕوانی وەڵام بوم بێ ئەوەی هیچ سرپەیەك ببیستم. نەخێر وەڵام نییە. ماوەیەك وەستاو ئەوسا پرسیارەکەم دوبارە کردەوە، پێش تەواوکردنی پرسیارەکە، بە نەئێکی خێرا وەڵامی دامەوە.

ڕێگاکە زیاتر درێژەی کێشا. نەخێر بەرەو سەربازگەی چیی. هیچ سەربازگەیەکی نزیك سلێمانی هێندە دورنییە. ڕەنگە هەر بۆ کوشتن بێت. ئەی باشە جێگە قاتییە وا بۆ کوشتن‌و لە چاڵنانی بەکۆمەڵ ئەوەندە دورمان بخەنەوە! خۆ ئەمانە هیچ شیکردنەوەیەك‌و هیچ قاموسێکی سیاسی نایانگرێتەوە..

ئەی لە ٩ی جونی ساڵی ١٩٦٣ لەنوێ بونەوەی شەڕ لەدوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆ بۆ لامەرکەزیی، لەسلێمانی زیاتر لەپێنج شەش هەزار کەسییان لە ڕۆژێکدا نەگرت.

ئەی لەدۆڵێکی قەراغ شاردا، زیاتر لە سەد کەسیان لێ گوللەباران نەکردن‌و لەگۆڕی بەکۆمەڵدا نەیانشاردنەوە..!

شیوعییەکانیان قەلاچۆ نەکرد..

لەشەڕی حەفتاو چواردا سەدان کەس لە سێدارە نەدران..

زۆر دڕندانە قەڵادزێ‌و هەڵەبجەیان بۆمبباران نەکرد..

ئەی لەسەر ڕێبازی جێبەجێکردنی نەخشەی بەعەرەبو بە بەعسیکردنی کوردو گۆڕینی باری دیمۆگرافی کوردستان‌و هەڵتەکاندنی قەوارەی نەتەوەیی کورد لەهەرەسی شۆڕشی ئەیلول بەدواوە، ئەوەی لەدەستیان هاتبێت نەیانکردووە!

سەرەڕای ئەوانە، یەکەیەکەی چینە فەرمانڕەواکانی ئەو عێراقە، هەر لە دامەزراندنییەوە بەزۆر داگیرکردن‌و پێکەوە لکاندنی باشوری کوردستان بەمیسۆپۆتامیاوە، تا ئەم توخمەی بەعس‌و تا ئێستا، بە ئاشکراو تا سەرئێسقان ڕقییان لەخەڵکی سلێمانیی بووەو بەسەری مارەکەیان داناوە. ئیتر چۆن چاوەڕێی هەموو کارێکی دڕندانەو نامرۆڤانەی دژبەکوردو دژ بەم شارە لەمانە ناکرێت..!

کاروان بەرەو شوێن‌و چارەنوسیی نادیار هەر بە ڕێگەوەیە. نە بەچاوو نە بەگوێ‌و نە بە هەست کەس ئاگاداری دەوروپشتی خۆی نییە، تەنانەت نازانم

هاوڕێی کەلەپچەکراو لەگەڵم کێیەو ناوی چییە! نوقمی ناوقوڵایی بیرکردنەوەیەکی بێ سەرەنجام بوبوم کەماشێن یان ماشێنەکان وەستان. مۆتۆرەکانیان خامۆش کران. دەرگای ماشێن کرایەوە. دەنگو ترپەی هاتوچۆو جموجوڵو ئەم سەرو ئەو سەری یاساوڵەکان بەرزبونەوە. زۆری نەبرد دابەزێنراین، کێشکراین، زۆر بەرێوە نەبوین کە ڕاوەستێنراین. دوای ماوەیەك بەپێوە وەستان، کەلەپچەکانیان لەدەست کردینەوەو فەرمانیان پێدایین تا دابنیشین. هەریەکە لەجێگەی خۆی دانیشتو دەستکرا بەناوخوێندنەوە لەکۆتایی ناو خوێندنەوەکەدا زانیم کە ئێمە بیستو چوار کەسین پێکەوە گیراوینو بۆ ئێرە کێشکراوین، بێ ئەوەی بزانرێ بۆچیو لەسەر چیی گیراوین. دەبێت ئەو تاوانانەی دەیدەنە پاڵمان چیی بن؟ بۆ کوێ هێنراوینو لەکوێ زیندانی دەکرێین؟. دواییتر کەوتنە پشکنینمان، چیمان پێبو لێمان سەندرا، من بیجامەم لەبەردابو، ئەوەی لێم سەندرا جوتە نەعلێك بو، چونکە کاتی گرتنەکە بواری هیچ شتێکیان نەدابن. دوای ئەوە چاوەڕوانیی.. چاوەڕوانیی. دنیا کشومات. جارجار قسەو دەنگو هاتوچۆی حەرەسەکان گوێ قولاغم دەکەن، ئیتر نەمدەزانی چاوەڕوانیی چی دەکەنو مقۆمقۆی چییانە.

عارفەیەو دیارە هەریەکە لە ناوماڵو منداڵی خۆیدایەو لەگەڵ خۆئامادەکردن بۆ پێشوازیی جەژنی قوربان خەریکە. ئێمەی بەدبەختیش چارەنوسمان ئەم زیندانەیە. جا کێ دەڵێت ئەمە زیندانە؟ بۆچی قەسابخانە نەبێت؟ بۆچی شوێنی کوشتنی بەکۆمەڵ یان شوێنی ئەزمونی تاقیکردنەوەی تێزابو چەکی کیمیاوییو غازی ژەهراوی نەبێت؟

کات بۆتە دەمەو عەسر، دەبێ لێپرسراوان لێرە نەبنو چاوەڕوانی فەرمان یا هاتنی ئەوان بن. زۆری خایاند، نابێ هەر بۆ ئەوە ئەوەندە بووەستن. ڕەنگە ئەمان بەتەمای ئەم کاروانە نەبوبن کە بەم ڕۆژی عارفەیەو بەو پەلەپەلەش لەسلێمانییەوە کێشبکرێنە ئێرە. شتێکی ئاسایی نییە، بۆیە دەبێ بێ بڕیاری ئەوان کارێ نەکەن.

لەو چاوەڕوانییە بێزارکەرەدا بوم کە لەپڕ جوڵەیان دەستی پێ کردەوەو کەوتنە چرپەچرپو هاتن بەیەکدا. ئینجا دەستیان کرد بەناو خوێندنەوە:

عمر عزيز محمد

محمد رحيم عبدالرحمن احمد

كمال علی محمود

محمد سعيد صالح عبدالله

محمود ملا عزت محمود

بیانبەن بۆ ژوری ژمارە٤. ئیتر بەرەو ئەو ژورە بردیانین. لەو ساتانەدا کە ئێمەیان ڕاپێچ دەکرد، ئەوان لەسەر ناوخوێندنەوە هەر بەردەوام بون. ئەمەش نیشانەی

ئەوەبو کە هەر چوار کەس و پێنج کەسمان دەخەنە ژورێك. لەو حەوشەیەوە رووەو حەوشەیەکی تر براین، پاش پانزدە بیست هەنگاوێك لەبەردەم دەرگایەکی ئاسنیندا وەستێنراین‌و فەرمان درا کە پەڕۆی سەرچاو لاببەن..

## ئادەمیزادی ئەشکەوتی دەوری بەرد

دەرگای ئاسنین کرایەوە، کراین بەژوردا. ئای ئەوە چیی دەبینم! ئێرە کوێ بێت..! واقمان ورماوەو تەواو ئەبڵەق بوین. ئەم شوێنە ئەشکەوتێکە بۆخۆی. پڕە لەئادەمیزاد، چۆن ئادەمیزادێك، زەردو ریشن‌و قژن، جل دڕاو، سەیرو چڵکن‌و پڵکن، وەك کورتە باڵاو ئینسانی دەوری بەرد دەهاتنە پێش چاو! خۆ بۆن‌و بۆگەن‌و هاڵاوی ژورەکە پیاوکاس دەکات! هەرکە کەوتینە ناویانەوە بەسەرسامییەکی ئاشکرای سەر ڕوخساریان‌و جموجوڵی نائاسایی دەوریان داین. کەوتنە جوڵەو سەرنجدان‌و زیاتر نزیکبوونەوە، ئای خۆ ئەمانە تەواو لە ئینسانی کۆن دەچن. دەبێ ئێرە کوێ بێت؟ چەندین ساڵ بێت ئەمانە لێرەدا گیرۆدە کرابن! چل پەنجا مرۆڤ لەم ژورەدا چی دەکەن؟ چۆن دادەنیشن؟ ئەی چۆن دەنون؟ دەیان پرسیار لەمێشکدا وەك فوارە هەڵدەقوڵان بێ ئەوەی بۆ خۆشم چاوەڕوانی وەڵام بم. ئێمە هەر ئەوەمان پێکرا خۆمان بەدیوارەکەوە نوساند، هەروەك بت خۆمان پێوەی مەڵاس دا. ئەوانیش زیاتر لێمان دەهاتنە پێشەوە، تا نیوە بازنەیەکیان بەدەورماندا دروست کرد. لەگەڵ پیاهەڵڕوانین‌و سەرنجدانی یەکە بە یەکەمان کەوتنە پرسیارکردن. هەریەکە پرسیارێکی دەکردو هەر هەموو گوێ قولاغی وەڵامەکەی بون. ئەوە خۆ ئێمە بەهۆی جەژنەوە بەتەمای عەفوات بوین! تۆ بڵێی دەربچێت؟ کاکە ئێوە خەڵکی کوێن؟ لەکوێ گیران؟ چۆن گیران؟ بۆچی گیران؟ هەموو پێکەوە گیران؟ کەی گیران؟ لەکوێوە هێنران بۆ ئێرە؟ ئێرە هەیئەی تەحقیقیی خاسەیە لە کەرکوك، دیارە ناوتان بیستووە؟ ئەرێ وەزعی حەرب لەچیدایە؟

هەریەکە یەکدوو پرسیاری لەدەم دەردەچو. ئێمەی واقوڕماو هەر ئەوەندەمان پێدەکرا بەخێرایی‌و بە وشەو دوو وشە خۆمان مەرەخەس بکەین، یان بە نازانم وەڵام بدەینەوە. بەڵام ئەوان لەسەر پرسیارکردنی خۆیان هەر بەردەوامن:

ئەرێ برسیتان نییە؟ خۆ خواردنیش هیچ نەماوە، داخمان ناچێت لەکاتێکدا هاتن کە هیچ شتێ نەماوە. باشە نانی چی ژەمێکتان خواردووە؟ ئیتر هەروەك بیانەوێ پرسیار هەڵبڕێژن‌و لەدواییدا بەیەك جار وەڵامیان بدەینەوە..

ئێمە لە بەیانی زووەوە لەسلێمانی گیراوین‌و نازانین ڕۆژ چ وەختە، نە نانمان خوواردوەو نە ئاومان خواردۆتەوە، لەناو ئەو ئەبڵەقبونەی ئێمەو ئەو پرسیارو

لێکۆڵینەوەیەی ئەواندا، بەشی زۆری بیروهۆشم لەسەر ئەم ئادەمیزادە نەبینراوانە چڕ کردووە. من بۆخۆم لەناو مەزەنەکردندا تەواو نقوم بوم. لەگەڵ برادەرەکانمدا بە سەرنجی خێرا خێرا سەیری یەکتری دەکەین و نیگا بەسەر حەشاماتەکەدا دابەش دەکەین، بێ ئەوەی قسەیەك لەگەڵ یەك بکەین، بە سەیرکردنەکانماندا لەیەکتری دەگەیشتین.. تۆ بڵێی ئەمانە شێت بوبن، ئەی چۆن مرۆڤ لەو جێگەیەو بەو جۆرە ژیانە شێت نابێت. خۆ ئەگەر شێتیش نەبوبن وا بەرەو شێتێتی دەڕۆن. چونکە هەموو نەخۆش کەوتون، جەستەیی‌و دەرونیی، هەریەکە شوێنەواری چەندین نەخۆشییان پێوە دیارە.. لۆجیکترین سەرەنجام لە لێکدانەوەکانمدا ئەوەیە کە دەبێ ئەمانە ئەسیری جەنگی "قادسییە شومەکەی سەددام" بن وا لەناو ئەم ئەشکەوتە وەحشەتناکەدا بونەتە ئادەمیزادی کێویی.. ئەم گفتوگۆو پرسیارو وەڵامە کورتانە هێندە چڕو خێراو بێ وەستان بون کە دەرفەتی ئەوەیان نەداین داوای کەمێك ئاو بکەین‌و ئەو تونێتییە زۆرەی خۆمانی پێ بشکێنین، یان هیچ نەبێت کەمەکێك لێوو قوڕگمان تەڕ بکەین، و بواری ئەوەشیان نەداین کە ئێمەش یەکدو پرسیاریان لێبکەین‌و شتێکیان لێتێبگەین! لەناو ئەو پرسیارانەی ئەوان‌و وەڵامەکانی ئێمەدا دەنگی زرنگەزرنگی کردنەوەی قفڵ‌و دەرگا ئاسنەکە بەرزبۆوە، لەپڕ دەرگاکە کرایەوە، هاوار کرا: تازەکان بەپەلە بێنەوە دەرێ. ئێمەش خۆمان گەیاندە بەردەرگاو خراینەوە جوڵە. کەمێك دڵم ئاسودە بو کە لەو ئەشکەوتە وەحشەتناکە رزگارمان بو.

دەبێ ئەم هێنانەدەرەوەیە چی بێت! ئەم هێنان‌و بردنەیان لەچیی بێت! ئەوە خۆهێنراینەوە هەمان حەوشە، دیسان هەر هەموومان لەوێدا مۆڵدراینەوە. حەرەسەکان هەربەیەکدا دێن‌و دەچن بێ ئەوەی لێیان تێبگەین. رەنگە بەهەڵە هێنرابین بۆ ئێرە! دەبێ بمانگێڕنەوە ئەمنی سلێمانی! دیارە بەهەڵە گیراوین. نا نا هەڵەی چی‌و گێڕانەوەی چیی! بۆچی ئەمانە هەڵە دەکەن‌و دەزانن مانای هەڵە چییە! ئەو پرسیارو وەڵامانە لەناو چاوەڕووانییەکی نادیاردا سەریان دەردەهێنا. لایەنێکی هۆشم لەگوێ قوڵاغبوونایە بۆ وشەیەکی عەسکەرەکان تا لەشتێك حاڵی ببم. رەنگە ئەوان نەتوانن بڕیارێ بدەن. دور نییە چاوەڕوانی فەرمانی لێپرسراوی یەکەم بن. رەنگە نەزانن لەکوێن‌و نەتوانن بیاندۆزنەوە، ئێوارەی عارفە گەورەیەو خوا ئەیزانێت ئێستا چۆن خەریکی سازکردنی رێوڕەسمی جەژنی قوربانن. ئێمەش هەموو وەك رانە مەڕی مۆڵدراوو خۆڵو دۆ بەسەردا کراو جوڵانەوەی ئاساییش نابینین. لەناو تینوێتی‌و برسێتی‌و کشوماتییەکی هیلاککەردا بوین کە لەپڕ کەوتنەوە جموجوڵ‌و بەیەکدا هاتن، یەکێکیان بەدەنگێکی بەرز گوتی: هەموویان بۆ ژوری ڕەقەم یەك، بۆ ژوری ڕەقەم یەك! هەرچەندە ئەزمونی حەپسخانەی دوژمنی داگیرکەرم نەبو. بەڵام

لەچیرۆکی حەپسخانەکانی ئەم ڕژێمانەدا ڕەقەم یەك بەدترین ناوی هەیە. بۆیە یەکسەر ئەو نەهامەتییانەم دەهاتەوە بیر کە لەڕەقەم یەکی زیندانەکانی ڕژێمە جۆربەجۆرەکانی بەغدایان گێڕابوەوەو بەرگوێم کەوتبون. دەی بابزانین ئەم ڕەقەم یەکەی هەیئەی تەحقیقیی چۆن دەبێت! هەرچی چۆنێك بێت جاریٚ وا شتێك رونبووەوەو دەزانین شوێنمان کوێیە. خۆ رەنگە ئەمە باشتر بێت کە هەمو پێکەوە بین. خۆ لەو ژورە باشترە کە ئەو هەموو یەخسیرانەی تێدایە، بڕواش ناکەم ئەوانە دیل بن، ئەی چۆن ئاوا دەبنە کێویو ئادەمیزادی دەوری بەرد؟

### ژوری رەقەم ١

دەرگای ئاسنینی ژور خرابووە سەر پشت بەندەکانی تر گوێزرانەوەو بەچۆڵی بۆ ئێمەیان تەرخانکرد، هەموومان کراینە ناوییەوە. لەگەڵ پێوەدانی دەرگاکەو بەرزبونەوەی دەنگو زرنگە زرنگی کلیلو قفڵدا دیاربو کە لەسەرمان قفڵدرا. هەرچەندە کەس لەژورەکەدا نەمابو دیسان بۆگەنو پیسو پۆخڵیی پێشوازییان کردین.

زیندانێکی عەسکەرییو نهێنیی بەعس بێت لەکەرکوك، ناوی هەیئەی تەحقیقیی خاسەبێ کە دادگایەکی عەسکەریشی پێوە بەسترابێت، بۆ کوردانێ کە بەئاشکرا بەدوژمن لەقەڵەم بدرێن، لەبارودۆخێکی وا دژواردا گیرابنو لە ژوری ژمارە یەك توندکرابن، ئیتر کورد واتەنی دەبێت هەر بڵێم ئاخرییەکەی خێربێت..

من بۆخۆم لەسەر ناووناوبانگی زیندانەکانی ڕژێمی بەعس زۆرم بیستبو. کەم کورد هەبو شتێ دەربارەیان نەزانێت. لەناویاندا ئەم زیندانە سەربازییە نهێنییەو (المحکمة الخاصة) کەی لەهەموویان زیاتر بەدناو تربو. لەساڵی ١٩٧٤دا هەر بەتایبەتیی بۆ کورد دامەزرێنرا، بۆ لە ڕەگو ریشە هەڵکەندنی ئۆپۆزسیونی کوردو شۆڕشەکەی تەرخان کرا. گەلێ باسی ئەم زیندانەم لەتێکۆشەران بەگشتییو لەدوو ئەزمونی دوو کەسی بنەماڵەکەمانم بەتایبەتیی بیستبو.

ساڵ حەفتاو چوارەو شەڕی کورد لە دژی ڕژێمی بەغدا یان راستتر شەڕی دژ بە کورد دەستپێکردبۆوە. بەرەبەیانی رۆژی ١٩ی ئایار عەسکەر هەڵیکوتابووە سەرماڵی باوکم. دایکمو باوکم لەگەڵ ڕەووفی (کەڕو لاڵی) برامو گێلاسی ژنی کە زەییستانو چلو هەشت سەعات بو کوڕێکی بوبو بەسێ منداڵی تریشییەوە لەگەڵ نەرمینی خوشکەزام کە بۆ یارمەتیی دایکم گل درابووەوە. بە جلی شەوەوە سواری

زرپیۆشیان کردبون، بێئەوەی منداڵە تەمەن چل و هەشت سەعاتییەکەیان پێبێت. بە فەلاکەت ڕێگەی هێنانە دەرەوەیان دابو.

بەرەو ئەمنی سلێمانی دەبرێن. لەوێ داوایان لە باوکم کردبو کە (مەحمودی) کوڕی بهێنێتەوە، چونکە تا ئەو کاتە هەر لەماڵی باوکمدا دەژییاین، ئەویش پێیگوتبون جا ئەگەر مەحمود بە حوکمەت نەیەتەوە ئیتر چۆن بەمن دێتەوە. بۆیە هەموویان بۆ ڕێگەی کۆنی هەڵەبجە، لەولا (کانیبا) لە دە کیلۆمەتریی ڕۆژهەڵاتی سلێمانی دەبەنو لەوێ دایاندەبەزێننو دەڵێن: دە بڕۆن بۆلای مەحمودی کوڕتان. منداڵە چلو هەشت سەعاتییەکەش ناوی "کۆچەر"ی لێنرا.

ئەوکاتە من لەهەرگێنەی پێنجون بوم لەکارگێڕی لقی سلێمانی کاری سیاسیم دەکرد. ڕەفعەتی مەلا- ی ئاوەڵزاوام کە بە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجەو ئۆردوگای پەنابەران لە (ئەنزلی یەك) دانرابو، بروسکەیەکی بۆ ناردم لە هەواڵەکە ئاگاداری کردم. چونکە هەر دوای فڕێدانیان بەماوەیەك ماشینێك بەوێدا دەڕوات کە شوفێرەکە ناویان دەپرسێت سواریان دەکات و دەیانگەیەنێتە بیارە کە گەلێ خزمی باوکم لەوێو لەدەرگا شێخان بون، چونکە:

باپیرە گەورەی مەلا عززەت (فەقێ محەمەد) بەهۆی ئاژاوەی ناودێی (گەلی) لەشاربازێڕ، ئەو موڵکوماڵەی لە باپیرانییەوە بۆ دەمێنێتەوە، ئەمیش بۆخزمانی بەجێدەهێڵێتو رودەکاتە (دەرگاشێخان)ی هەورامانی کوردستانی باشورو لەوێ ژن دەهێنێتو خۆی پێدەگەیەنێتەوە.. ئەرزوباخێکی زۆریش بەجێ دەهێڵێتوسەرەنجام بۆ (مەحمود ئەفەندی) بەجێ دەمێنێ. لەبەر ئەوەش کە مەحمود ئەفەندی دەبێتە ئەفسەری سوپای عوسمانی، لەسلێمانیی دەژیو ژن دەهێنێت، بەتەنها مەلا عززەت- ی دەبێت (١٨٩٨) ئیتر لەئاژاوەیەکی نێوان عەشایەر لەناوچەی دهۆك کە ئەمو هێزێکی سەربازیی دەنێردرێن بۆ لابەلاکردنی، پێش ئەوەی بگاتە شوێنی مەبەست، هەر لەو ناوچەیەدا، تاقمێك چەکدار بۆ مەحمود ئەفەندی ناوێکی تری دوژمنیان دەچنە کەمینەوەو دەستڕێژیان لێدەکەن و بەسەهو دەکوژرێت.. باوکیشم ئەو باخو ئەرزو ئاوانە دەدا بەخزمەکانی تا بۆ خۆیان بەرهەمی بێنن.

بەپەلە خۆم گەیاندە بیارە، کە بینیمن لەوەزعێکی نائاساییدا بون. بەتایبەتی دایکم بەردەوام دەگریا، بەڵام باوکم هەر پێدەکەنی. هەرچەندە ماوەیان نەدابون جلی شەویش بگۆڕنو پێلاو لە پێبکەنو پارەو پولێ لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن. تەنانەت نەیانهێشتبو کە باوکم جامانەکەشی ببەستێت. دوای گرتنو دەرکردنیان، ماوەیەك عەسکەر لەماڵەکەدا دەمێنێتەوە لەدواییدا دایدەخەنو لۆکی دەکەن، تا کەس نەتوانێت کەلو پەلی ناوی بگوێزێتەوە، یان خانووەکە بەکاربهێنرێت..

ئەو دیمەنانە زۆر پەستیانکردبوم، ئاخر دەبێت تاوانی باوکێکی تەمەن حەفتاو شەش ساڵو دایکێکی تەمەن شەستو نۆ ساڵ چیبێت؟ ئەی براو براژن؟ ئەی منداڵەکانیان؟ ئەی ساوایەکی تەمەن چلو هەشت سەعاتو دایکی زەیستانو خوشکەزام چیبکەن کە من لە رژێم نارازیمو بەرەی ئۆپۆزسیۆنم لەشاخ هەڵبژاردوە.
هەرکە ئەوان دەردەکەن، کاکە حەمەم رێگە دەگرێتەبەرو خۆی دەگەیەنێتە بیارە.

دوای دوو سێ رۆژ خەبەریان بۆ باوکم نارد کە پارێزگاری سلێمانی دەڵی بەهەڵە ئەو کارە کراوە، داوای گەڕانەوەی کردبو. دیاربو دوای ئەوەی دۆستو ناسیاوەکانی باوکم گلەیی لەبابەکراغای پشدەریی دەکەن کە ئەو سەردەمە پارێزگاری سلێمانی بو.

لەسەرەتادا من هیچ رایەکم لەسەر ئەو داوایە دەرنەبڕی، چاوەڕوان بوم بزانم باوکم بۆخۆی چی دەڵێت. ئاسایی قسەی دەکرد، لەناو پێکەنینو گاڵتەدا دەیگوت ئەوانە ئێمەیان "شاربەدەر کردوە" ئیتر گەڕانەوەی چی.. کە باسەکە هاتە سەر بڕیارو لەمنیان پرسیی، گوتم:

< لەبەر ئەوەی خۆیان داوایان کردووەو پەشیمان بونەتەوە، باشتر وایە بگەڕێنەوە. چونکە دەمزانی ژیانیان زۆر زەحمەت دەبێت. لەدایکیشم زۆر دەترسام، لەسنور بەدەر پەستو غەمگین بو، تەڕایی لەسەر لێوی نەمابو. خێراخێرا بە باوکیشمی دەگوت: ئەی ئەگەر نەڕۆینەوە ئەی لێرە چی بکەین؟ چیی لەماڵو حاڵ، مەحەل، کورەی گەچ، سەیارەکان دەکەیت. کە باوکم ئەو قسانەی بیست، پێکەنینی نەماو بەڕوگرژییو ددان بە وشەناندا گوتی: ئەوە ئێوە دەڵێن چیی؟ ئەوە بە راستتانە؟ئەوانە بێ هیچ هۆو گوناهێك بەم جۆرە لەماڵو حاڵو شارەکەی خۆم بەم وردانەوە دەریانکردوم، ئێستا هەر لەسەر قسەیەکی یەکێکیان بگەڕێمەوە! سا بەخوا سلێمانیشم لەسەر تاپۆبکەن ناگەڕێمەوە، تازە لەگەڵ ئەم خەڵکە دەژیمو لەگەڵ ئەمانیش دەگەڕێمەوە.. من وام دەزانی زۆر لەباوکم گەیشتبوم، بەڵام ئەو کاتە زانیم کە لە هەموو شتێکی نەگەیشتوم. ئەو نهێنییەشم بۆ دەرکەوت کە بۆچ لەهەر کاتێکی وەرگرتنی بڕیارە سەختەکانمدا لەچونە دەرەوەو خۆشاردنەوەو کارەکانی دژ بەرژێمدا، کە پرسم پێدەکرد، هەرچەندە خۆشی دەخستە بەردەم مەترسیی. دەیگوت: تۆ چی بەباش دەزانیت هەروا بکەو بۆخۆت دەزانیت چی دەکەیت. باوکم بڕیاری خۆی دابو. ئیتر دەبو هەر هەموو دەرکراوەکان لەگەڵیدا بمێننەوە. بەڵێنەکەی خۆشی بردە سەرو تادوای هەرەس مایەوە، ئەوسا لەگەڵ گەڕانەوەی سەدان هەزار کەس چووەوە بۆ سلێمانی.

کە باسەکە هاتە سەر کاکە حەمەم، گوتم: ئەگەر لەخۆت ناترسیتو خۆشت بەباشی دەزانیت وا بگەڕێیتەوە باشترە، ئەی حەوت منداڵو خێزانەکەی چی

لێبکات. ئیتر ڕێگەی گەڕانەوەی لاپەسەند تر بو. لەگەڕانەوەیدا هەرچەند ڕۆژێك تێدەپەڕێ. دوایی دەیگرنو ڕەوانەی هەیئەی تەحقیقی خاسەی دەکەن. زیاتر لە چوار مانگ زیندانیی کرا..

کە هەواڵی بەربونیم بیست، ئاگادارم کرد کە بێتە دەرەوە، چونکە گەلێ جار کە بەندێکیان بەردەدا، دەیانگرتەوەو ئیتر نەدەبینرایەوە، کاتێك بینیمەوە، بەزەحمەت دەناسرایەوە، لاوازو بێ تاقەتو پڕوکاو.. زۆر لە چیرۆکی زیندانەکەو ئەشکەنجەی بێوێنەی دەگێڕایەوە. تەنانەت حاجی حەمە سعید مەعروف کە لەسەر عەبدوڵای کوڕی دەگیرێت، هەر لەبەر ئەوەی کوڕەکەی تێکۆشەرێکی ناو بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردستان بو. هێندە ئەشکەنجەی دەدەن تا ڕۆژێك ئەو پیاوە موسوڵمانە باشو بێ وەیە زیاتر لەشەست ساڵە لەژورێکی زیندانەکەدا لەبەردەستی کاکە حەمەمدا لە ١٩٧٤/٧/١٥ گیانی دەردەچێت.

کاکە حەمەم ئەم جارەش لەدەستی بەعس سەرفراز دەبێت هەروەك ساڵی ١٩٦٣ کە لە گرتنە چەند هەزار کەسییەکەی بەرەبەیانی ڕۆژی ٩ حوزەیران ئەمیش لەگەڵ کاکە ئەحمەدمو ڕەئوفو کوڕانی خاڵم دەگیرێت، ئیتر ئەم لەو دەگمەنانەی ئەو ڕەش بگیرییە بو کە تەنانەت دوای ڕژێمی بەعس روخانیش ئازاد نەدەکرا. لەکۆمەڵکوژییە بێ دادگاییکردنەکەشدا کە لە دۆڵی شەهیدان لەباکوری شار لە گۆڕی بەکۆمەڵدا نێژران، ئەگەر فریاکەوتنو ڕاستکردنەوەی قسەکانی لەلایەن هونەرمەند ڕەفیق چالاك- وە نەبوایە کە قسەکانی بەزمانە عەرەبییەکەی خۆی بۆ ڕێك دەخات، ئەمیش لەگەڵ ئەو کاروانەدا دەبو.

هەر لەو زیندانەو ئەو ڕۆژگارەدا حەمە ساڵح، کە بەساڵح هیتلەر ناوی دەرکردبو، یەکێك بو لەو کەسانەی لەو ژورەی زیندانەکەدا بو. ئەم لە کاژێکەکانی سەرەتابو. دڵسۆزو خوێندەوارو نەتەوەپەروەرێکی ڕاستگۆ بو، خەوی بەوەوە دەبینی کە ببێتە هیتلەرێکی کورد. بەڵام لەو زیندانەدا لەژێر ئەشکەنجەدا قسەی پێ دەکەن، لەوەش خراپتر شتی نەبووش لەسەر خۆی باردەکات. قسەش لەسەر چەند کەسێك دەکات.. و لەگەڵ خۆیدا بڕیاری خنکاندنو لەسێدارەدانیان دەدرێت.. کە لەدوای هەرەس گەڕامەوە سلێمانی (حەمە ساڵح دیلان) ئاگاداری کردم کە بەهۆی قسەکانی ساڵح هیتلەرەوە حوکمی غیابیت بە لەسێدارەدان درابو. منیش گوتم زۆر سوپاسی حەمە ساڵح دەکەم کە قسەی لەسەر من کردبو نەك لەسەر کاکە حەمەم کە لە تەنیشتییەوە بوەو لەگەڵیشیدا خەریك بووە کە خۆی بگرێتو قسە نەکات.. لەڕاستیشدا من حەمە ساڵحم هێندە دەناسیی کەناو بەناوو بەڕێکەوت یەکترمان ببینیایە قسەمان لەسەر دروستیو نادروستیی بیرو بۆچونەکانی ئەو دەکرد.

ئەو قسەی حوکمدانەش بۆ من بووە ترس و سەریەشەیەکی گەورەو بیرکردنەوە لە ڕاکردن! خۆ هەر ڕێگەی ئێرانیشم لەبەردەمدا بو، بۆیە پرسیارم لەخۆم دەکرد کە: ئایا دەکرێت لەناو گەرموگوڕیی ڕێکەوتنی ئازاردا بۆ ئەوێ هەڵبێمەوە یاننە!؟

دو ساڵێك کەمتر دوای هەرەس، (یاسین)ی برازام دەگیرێت، لەسەر خەبەرلێدانی عەسکەرێکی ئیستیخبارات کە گوایا جنێوی بە ئەحمەد حەسەن بەکری سەرەك کۆمار داوە.. دەینێرن بۆ هەیئەی تەحقیقی. لەژێر ئەشکەنجەدا نیوەمردوی دەکەن، ئەگەر خەسرەو محمد محێددینی رەفیقی نەبوایە کە ئازایانە لەهەیئە شایەتی بۆ دەدات کە ئەو عەسکەرە درۆ دەکات، سەرفراز نەدەبو. کە بەمۆڵەت لەرەمادییەوە گەڕامەوە بۆ سلێمانیو بینیم پیاو بەزەیی پێدا دەهاتەوە، ئەمیش جیاوازیی نێوان ئەو ماوەیەی زیندانەکەی بۆ باس کردم کەچیی لەزیندانیی دەکەنو چۆن ئەشکەنجە دەدرێن..

بەو جۆرە لەدورو لەنزیك ناوی ئەم زیندانەم بیستبو کە ئێستاو لەژوری رەقەم یەکیدا لەگەڵ بیستو سێ کەسی تر خۆم تێیدا دەبینمەوە. کە دەرگای ئاسنمان لەسەر قفڵدرا، ئەوسا کەوتینە تێڕووانینو سەیرکردنو یەکتری ناسینەوە.

لەسەرنجەکانی سەرەتادا دوو پرسیاری ناو دوو دیاردەی نامۆ سەرنجی ڕاکێشام.. ئەم تێکەڵکردنە لەو گرتنەدا لەسەر چی بناغەیەك بێت؟ دەبێت بۆچی گیرابین؟ من بۆخۆم هەر لە ئەمنی سلێمانییەوە مەزەنەی گرتنەکەم لەسەر بنچینەی گومان دەکرد. وا لێرە ئەوەم زیاتر بۆ ساغ دەبێتەوە کە لەراستییەوە نزیکم.. لەکۆی گیراوەکان کە لەدوایدا بوین بە ٢٨ زیندانیی، تەنها دە کەسێکم باش دەناسی لەڕوی رابوردوی سیاسییو زیندانیی کۆن کە بەردەوام لەگەڵ خەباتی میللەتەکەی خۆیاندا بون، لەدواییشدا دەرکەوت کە هەندێکی تریان کۆنە پێشمەرگە بون، یان برای پێشمەرگەی لەسێدارەدراو بون، وا دیار بوو زوربە سەر بە یەکێتیو ئەوانی تریش بێ لایەن بون. چەند کەسێکیشیان سەر بەلایەنی تر بون هی واشمان لەگەڵ بو لەوە دەچو کە هەر سیاسەتی نەکردبێت.. لەڕوی پیشەشەوە: یەك مامۆستای سانەوی، چواری سەرەتایی، چەند فەرمانبەرێك لەگەڵ گەلێ لە کاسبکار، مۆبیلەفرۆش، بەنا، خاوەن دوکانو سەربازی هەڵاتووبوین..

هەر لە سەرەتاشەوە لەگەڵ کەمالو شێخ عەبدولو حەمە سەعیدی حاجی فەقێ لەسەر ئەوە یەکمان گرت کە هیچ جۆرە قسەیەك لای کەس نەکرێتو لەهەڵسوکەوتدا زۆر هوشیار بین..

کات بو بەدەمەو ئێوارە.. نەنانو نە ئاو نەکەوتۆتە سەر لێوانمان.. هەریەکە کەوتە باسکردنی گرتنەکەی هەر هەمووشمان پێمان لەسەر ئەوە دادەگرت کە

لەخۆڕاییو بێ تاوان گیراوین ئینجا هەریەکە کەوتە پرسیارو باسی جۆری گرتنەکە.. نەخێر هەندێك، ئەوەی لەبیرکرد کە ئێمە لەکوێدا خۆمان بینیوەتەوە. بەتایبەتی یەکێ لەحەرەسەکان دەرگاکەی کردەوەو کەوتە قسەکردن، رستەکانی دۆستانە بو، نەك وەك قسەی پاسەوانی هەیئە، هەندێ لەوانەی ئێمەش کەوتنە قسەو پاکانە کە لەخۆڕایی گیراوین، هەروەك قسە بۆ یەکێکی ئاشنابکەن.. کە دەرگاکە داخرایەوە.. هەمان بەزمی هەراو قسەکردنو بگرە پێکەنین بەردەوام بو. چونکە شێوەی قسەکان کەمێ دڵخۆشکەربون بەجۆرێ کە (شوان)ی کۆنە پێشمەرگە کەوتە قاقای پێکەنین. حەرەسەکە دەرگای کردەوەو پرسیاری کرد:

- ئەوە کێ بو؟

< ئەویش هەستاو گوتی من بوم..

ئیتر بانگیان کردو بردیانە دەرەوە. هەر ئەوەندە پێی خستە ئەو دیو دەرگاکەوە ئیتر کەوتنە گیانی، دەنگی زرمو کوتی سۆندەو هاوار هاواری زیندانیی‌و پێکەنینی عەسکەرەکان دیمەنێکی خەمناکی لای ئێمە دروست کرد، چونکە ئەم کوڕە هەڵەیەکی وای نەکردبو تا بەو دەردەی بەرن، دوای حەسیرمەیانێکی خەست کردیانەوە بەژوردا. بێ جوڵەو بێ دەنگ شوان لەشوێنەکەی خۆی دانیشتەوە. عەسکەرێکیش بەسەرنجدانێکی زەردەخەناویی‌و گاڵتەپێکردن بەلێدراو، بەهەموو زیندانییەکاندا هەڵیدەڕوانیی. لەو کاتەدا دەنگی پرمەی ژێرلێوی یەکێك بەرزبووەوە. عەسکەرەکە ڕوی تێکردو گوتی: ئەوە بەچیی پێدەکەنیت؟ یەکسەر گوتی بەخۆم.. گوتی سەگباب بۆ تۆ مەیمونیتو لە ئاوێنەدا سەیری خۆت دەکەیت! بەخۆم پێدەکەنم! باشە ئێوە گاڵتەجاڕی واتان بینیوە..! دە وەرە دەرێ وەرە.. ئەویش کەمێ لێدانی خواردو کردیانەوە بەژوردا.. پێدەچو ئەو حەرەسە عەریفی حەرەسەکان بێت، چونکە دوای ئەوانە بەیەکێ لەحەرەسەکانی گوت: وا دیارە ئەمانە نازانن لەکوێن، هیچ شتێك دەربارەی ئێرە نازانن، نازانن چۆن ڕێز لەخۆیانو ژورەکەو یاسای ئێرە بگرن! دەی دەرسێکیان دابدەو فێریان بکە چۆن یاساو فرمانو پرنسیپەکانی ئێرە ڕێز لێدەگرن.

**چەند دەرسێکی ناگاو:**

**یەکەم دەرسی تیۆری: ئەدەبی دانیشتن لەژوورەکەدا!**

دەرگاکە هەروا بەکراوەیی مایەوە. عەسکەرێکی تر هاتە پێشەوەو گوتی: دیارە تازە گیراون نازانن لەکوێن، لەیاساو سستمی هەڵسوکەوتی ئێرە شارەزانین. بۆیە دەبێت زۆر بە وردی گوێ لەقسەکانم بگرن، ئەم قسانە پرنسیپو یاسای ئێرەیە. ئەوەی لێیان دەربچێت یان جوانو رێكو پێك پێرەوییان نەکات توندترین سزا دەدرێت. ئیتر هەر لەو جۆرە لێدانە ئاسانەوە تا کوشتن.

ئێرە یاساو پێرەوی تایبەتیی خۆی هەیە. لەم ژوورەدا هەموو جۆرە قسەو چرپە، هەڵسانو جوڵەو ئیشارەت، دەنگو زەردەخەنەو پێکەنین، سەرهەڵبڕینو سەیری حەرەسکردن، سەیرکردنو گوێ هەڵخستن، تەپەو دەنگ لەدیوار هێنان، تەنانەت کۆکەو پژمینی بەرز، ئەوانە بەتەواوی قەدەغەن. هەرکە بانگ لەیەکێك کرا دەبێت راستەوخۆ بە بەڵێ وەڵام بداتەوە.

ئەم زیندانە بۆ دوژمنانی حیزبو شۆڕش تەرخانە، درۆکردن لەوەڵامی پرسیاردا مردن ئەنجامێتی، هەموو جۆرە لاساریو گوێ نەگرتنو تێنەگەیشتنێك سەرپێچیی کردنە لەیاسا، سزای سەرپێچی کردنیش کوشتنە. ئێستا خۆتان دەناسنەوە چینو لەکوێدان!؟

دوای ئەوە دەرگاکەی داخستەوە.

**دوەم دەرس: پراکتیکی جۆری سەردانی ئاودەستە..**

ئێمە هیچ زانیاریو ئاگادارییی وردەکارییەکانی یاساو پرنسیپو ژیانی ئەم جیهانی هەیئەمان نەبو. حەپسخانەکە چۆنە، چەند کەسو کێی تری تیادایە، چۆن ئەم حەشاماتە بۆ نوستن، نانخواردن، ئاوخواردنەوە، چونە سەر ئاودەست رایی دەکرێن، چۆنو کەی دەست بە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە دەکەنو تا کەی دەوامی دەبێت؟ گەلێ پرسیاری تر بۆ ئەو سەرەتای گرتنە دەهاتن بەمێشکدا بێ ئەوەی بتوانرێ وەڵام بدرێنەوە. یەکەم ئێوارەمانەو من بۆخۆم وام لێکدەدایەوە کە مامەڵەو لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە بۆ ئەم گرتنە زۆر قورس نەبێت. ئەی بۆچی قورس بێت کە بەڵگەی گرتن نەبێو هۆیەکەی نەزانرێ. نانا وا نییە، قسەکانی مامۆستا عەسکەر پێچەوانەی ئەوەن! ئەمە بەعسە بەعس! هەروا لە خۆڕاییو وا بەم پەلەپەلەو بەو بەیانییە زووەی عارفە گەورە نەگیراوینو ئاوا راپێچی ئێرەیان نەکردوین! بۆیە بڕواناکەم هەروا بەئاسان لەچنگیان دەربچین. ئەگەر ئەوانی تریش ئاسان سەرفرازبن تازە رەحمەتە من لەدەستیان قوتارم ببێت. خۆ ئەگەر بەڵگەشییان بەدەستەوە نەبێت وا بەدرێژایی ماوەی کاری سیاسیم من دژی هاوکارییکردن بوم لەگەڵ رژێمەکان بەگشتیو رژێمی بەعس بەتایبەتی. چی لەناو رێکخستنەکەمو چی لەدەرەوەی، چی بەنوسینو چی بەقسە. خۆ ئەگەر هیچ زانیارییەکی کۆنیش

نەهێننەوە بەردەست، هەر کتێبی "دیپلۆماسیێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی"(١٩٧٣) کە دوای هەرەس ناوی خرایە ناو لیستەی کتێبی قەدەغەکراوەوەو لەگەڵ "کۆماری میللی مەهاباد" یش کە بۆ لەچاپدانی سانسوری رژێم لە ٧٩دا نەك هەر لەیەکە یەکەی لاپەڕەکانی مۆری قەدەغەکردنی لێدا، بەڵکو لەناو لیستەی کتێبە قەدەغەکراوەکانیشدا لەژێر ناوی "من مسودات الکتب المنوعە"دا دەستخەتی ئەو کتێبەش قەدەغەی کەوتە سەرو بەهەموو دایەرەو قوتابخانەکانی عێراقدا بڵاوکرایەوە.. جا ئەگەر هەر ئەوانەش بهێننە پێشەوە وا بێ ئەشکەنجەی قورس‌و بێ سزا قوتارم نابێت. ئیتر لەو ماوە کورتەی کە چاوەڕوانی (دەرسی) جۆری سەردانی ئاودەستمان دەکرد، سەرجەمی روداوەکان وەك فلیمێك بەبەرچاومدا تێپەڕ دەبون. تا خۆم لەو خەیاڵانەی پەیوەندییان بەسەر ئەو واقیعەمەوە نەبو، دور بخەمەوەو بەتەمای بەربونێکی ئاسان نەبم.

دوای ماوەیەك حەرەس دەرگاکەی کردەوەو دەستی بەقسەکرد: کە دەرگا دەکرێتەوە چوار چوار دێنە دەرێ، دەرگاکە پێوەدەدەنەوە، ملتان بۆزەوی دادەنەوێنن، چاو لە ئەرزەکە دەبڕن، قسەو پرسیارو ئاوڕدانەوەو سەیرکردن بەتەواوی قەدەغەن. کە دەچنە ئاودەستەکە، هەرکە لە دەرگاکە درا یەکسەر بێ وەستان دێنە دەرەوە، حەرەس چی پێگوتن، یەکسەر جێبەجێی دەکەن. دوای لەئاودەست هاتنەدەرەوەو دەست شوشتن هەریەکە لەبەر دەرگاکەداو لەپشتی ئەوی ترەوە بەچیچکانەوە چاوەڕوان دەبێ تا چوارەکە تەواو دەبن، ئەوسا دەچنە ژورەوەو چواری تر بەو جۆرە دەکەن تا هەمووتان تەواو دەبن. هەموو جوڵەو قسەو ئەملاو ئەولا کردنێك تەواو قەدەغەن.

کە مامۆستا حەرەس لەو موحازەرەیە بوەوە، ئینجا گوتی: دەی ئێستا کاتی مەشقە، وەرنە دەرەوە، یەکەم چوار کەس هاتنە دەرەوەو دەرگایان پێوەدا، لەڕێکی دیواری حەمامەکە کە ئاودەستێکی لەتەنیشتەوەیە، بەڕیز وەستان. وا ئێمەش هەرچی هۆش‌و گۆشە ئاراستەی ئەم شانۆگەرییەمان کردوە. وەختێکمان زانیی دەنگی زرموکوت بەرزبووەوە. پێدەچێت حەرەسەکە دەست نەپارێزێت. کە دەنگی شەقەی سۆندە نەما، ئەوسا گوتی:

دەی بۆ ئاودەست. یەکێك خۆی پیاکرد. نیو دەقیقەیەکی نەبرد حەرەس دەنگی لێبەرزبۆوە: لەدەرگابدە، بەهەستان‌و خۆپێچانەوەو هاتنە دەرەوە لەماوەی دانیشتەکە زیاتری نەخایاند. کەچی هەرکە پێیی خستە ئەم دیو دەرگاکەوە، بەسۆندەو بەشەق قوربەسەرەکەیان بیراز کردەوە.

لەسەرەی دووەم کەسدا، هەر دوای هەمان ماوە ئەمری لەدەرگادان درا، ئەم چابوکانە خۆی لەبەرکردو هاتە دەرێ، لەتاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتو بو کەچی بێ ئارەق دەرنەچو. بەمیش گوترا دەی دەستت بشۆ، کورەش بەپەلە پەل لە بەردەم ئاوەکە کەمێ دەستی هەڵگڵۆفیو چوە پشتی یەکەم کەسو کەوتە سەرچیچکان، بەو جۆرەو لەگەڵ لێداندا ئەم تاقمە تەواو بو.

لەچونە ژورەوەیاندا تاقمێکی تر بەهەمان شێوە هاتنەدەرێ. حەرەسەکە کەوتە لێدانیان، ئەمانیش هەمان رێورەسمی چونە سەر تەوالێتیان تەواوکرد. بۆ تاقمی سێیەم، کەس ئامادە نەبو، هەموو خۆمان لە ئاودەست دەدزییەوە. حەرەسەکە هاتە پێشێو گوتی:

دەی تاقمێکی تر. کەس قسەی نەکرد. بەجنێوی پیسەوە قیژانیی: ئەوە لەگەڵ کێمە کەربابانە بۆ ناجوڵێنەوە..! جوڵانەوەی چیی، کێ دەوێرێت خۆی بخاتە بەردەم ئەو لێدانە بێ هۆو خۆڕاییە! نەخێر کەس ورتەو جوڵەی بۆنەکرد. قایمتر بەجنێوی پیسو پیسترەوە نەڕاندیی:

ئەوە لەگەڵ کێمە بۆ نایەنە دەرەوە، دەتانەوێت بێینە ژوورەوەو بیرازی هەمووتان بکەین! یان ئیتر رێگە نەدرێ بچنە سەر ئاودەست.

روم کردە عەسکەرەکەو گوتم ئاخر خۆ ئێمە هیچ گوناهێکمان نییە! ئەگەر یەکێکیش هەڵەیەکی کردبێت ئیتر خەتای ئەوانی تر چییە؟

ئێمە بێ تاوان گیراوینو هیچ خەتاو هیچ هەڵەیەکمان نەکردوە! کە قسەکەم تەواوکرد ئەو گوتی:

ئەی بۆچی هێنراون بۆ ئێرە؟ خەڵکی بێتاوان ناگاتە ئێرە، ئێرە جێگەی درندەو پیاوکوژو دوژمنانی شۆڕشە. کە لەو قسانە بووەوە گوتی:

دەی ئێستا تاقمێکی تر بێنە دەرەوە. دوای سەیرکردنێکی خێرای یەکتری، چواری تر بەترسو لەرزو جۆرێك لە نادڵنیاییەوە ریزبونو چونە دەرەوە. نەخێر دەنگی قامچی نییە. یەکەم کەس کاری ئاودەستی تەواوکردو بێ ئارەق دەرچو. ئێمەش لەکونی کلیلی دەرگاوە سەیردەکەین بزانین چیی تر ڕودەدات. حەرەسەکە لەوانی تر نزیك دەبووەوە، کەوتە پیاکێشانی نەرمو خێراخێرای سوێندەو وردە شەق هاویشتن.. ئەوانیش بێ دەنگ لەبەر ڕەحمەتی سوێندەی ئەو ملۆزمەدا ناو بەناو سەریان بۆلای دیوارەکەوە دەچەماندەوە تا لە سوێندەکە بپارێزرێن.. بەو جۆرە تاقم تاقم بەیەکەم ئەزمونی چونەسەرئاودەستدا تێپەڕمان کرد..

**موحازەرەی سێیەم- دیسان تیۆری**

دوای تەواوبونی ئەو پراکتیکەو پێش دەرگا قفڵدان حەرەسەکە گوتی: گوێ بگرن: ئێستا هەندێك یاسای ترتان بۆ باس دەکەم:

- ئێوە رۆژی دو جار دەبرێنە سەر ئاودەست. ئەو دوو تەنەکەیەی دەهێنرێت یەکێکیان بۆ میزکردنی رۆژو شەوە، بەڵام هەر بۆ میزکردن، ئەوەی پیسایی تێ بکات دەیتۆپێنین. تەنەکەکەی تر بۆ ئاوی خواردنەوەیە. دوای چونە سەر ئاودەست ئیتر دەرگا ناکرێتەوە، بۆ هیچ کەسێكو لەهیچ حاڵەتێکدا، هەر بۆلێکۆڵینەوە نەبێت.. تەنانەت ئەگەر هەر هەمووتان بکەونە حاڵەتی مردنو پێویستیتان بەدەرمانو دوکتۆر بێت، نە دەرگا دەکرێتەوەو نە کەسیش دەهێنرێتە دەرەوە.. تێیگەیشتن.. کەوابو کە دەچنە سەر ئاودەست، ئەوەتان لەبیربێت..

دوای تەواوبونی یەکەم ئەزمونی ئێمە لە چونە سەرئاودەستدا، دەنگی هەمان پرۆسە دەوامی هەیە کە لە کونەکەوە سەرنجمان‌دا، چونە سەر تەوالێت بەهەمان شێوە بەردەوامە. پۆل پۆل زیندانیی تر وەك ئێمە دەبرێن بۆ سەرهەمان ئاودەست. نە تاقمێكو نە دو و نە دە. ئەوە خۆ تەوابونیان بۆ نییە! ئاخۆ ئەم زیندانە چەندین ژوری واو گەورەتریشی تێدا بێت! دەبێت ئەمانە لەچی هۆڵێکی گەورەوە بهێنرێنە دەرەوە..! ئاخۆ دەبێت ئەم زیندانە چەندین گروپی نەگبەتی تری وەك ئێمەی تێدا ئەوق کرابێت.. ئەو ژورەی بۆی براین لە ژمارەی ئێمە زیاتر دەبون، ئەو ژورەش چەندین ئەوەندەی ئێمە زیندانیی تێدایە، وا دیارە دەیان ژورو سەدان زیندانیی تر لەم هەیئەیەدایە.

ئەم یاساو مامەڵەکردنەی هەیئە، ئەگەر بەو جۆرە بەردەوام بن، وا بێ لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە، مردنێکی لەسەرخۆ سەرەنجامیان دەبێتو لەکۆتاییدا رەنگە کەس بە زیندوویی لەم زیندانە نەچێتە دەرەوە.

یەکەم دیاردەی سەرنج راکێشەرو زۆر خراپ لەچونە سەرئاودەستدا، جگە لە پیسوپۆخڵی، لێدانو ئەزییەتدانو نائارامیی، نەبونی سابون بۆ دەستوپل شوشتن لەدوای خۆ پاککردنەوەی سەرئاودەست، ئەو ماوە زۆر کورتەیە کە بۆمانەوە بۆ خۆرایی کردن تەرخان کراوە.. پانزدە بیست سانییە، یان کەمتر لەنیو دەقیقە هەر زۆر کەمە، پیاو بەهیچدا را ناگات! یان هەر بە یەکێکیاندا رادەگات، بەتایبەتیی لەململانێی نێوان گوشاری ریخۆڵەو میزەڵاندا، کامیان پڕترو گوشاریان زۆرتر بێت وا ئەویان وروژم دێنێ، ئەوسا سەرەی ئەوەکەی تریان دێت، ئەگەر فریا بکەوێتو کات تێپەڕ نەبێت.

نا نا کێ دەڵێت هەروا دەبێت، ئەمانە هەر بۆ فێرکردنو چاوترساندنە.. ئەگینا کەس ئیدارە ناکاتو بەرگەی گوشاری خۆبەتاڵ نەکردنەوە ناگرێت.. بەتایبەتیی ئەگەر حاڵەتێکی وەك ئەوەکەی سەرلە بەیانیی ناو ئەمنی سلێمانی دروست ببێت..

ئیتر دەبو یان ئاو کەم بخۆمەوەو ئامۆژگاریی دوکتۆرەکەم بشکێنم، یاخود خۆم بۆ دووبارە بونەوەی چەندین دیاردەی وا ئامادە بکەم، چونکە مەحاڵە یەك تەنەکە بەشی ئەو ژمارە زۆرە بکات.. ئەم جۆرە دیاردانە ترسیی ئازارو چەرمەسەرییەکەی سەرلەبەیانیم دەهێننەوە بەرچاو..

بەرەبەیانی ئەم رۆژی گرتنە، هەروەك بەشێك لە دیاردەکانی شەوێکی شوم بۆ من، بەپێچەوانەی شەوانی ترەوە بەخەبەر نەهاتبوم تا میززەڵانم بەتاڵ بکەمەوە. بۆیە هەر لەسەرکەوتن بۆ ناو ئۆتمۆبیلەکە هەستم بەجۆرێك لە ناڕەحەتیی دەکرد. ئەو بەخەبەر نەهاتنە، ترسی وەیشومەی بەعس، چڕکردنەوەی بیروهەست لەسەر هۆی گرتنەکەو ئەو سەرەنجامە ڕەشەی چاوەڕوانمە، لەگەڵ فێنکیی ئەو بەرەبەیانەی دواناوەڕاستی ئۆکتۆبەر، زیاتر یارمەتیی میز قەتیسکردنەکە بون کە گوشاری بەرموسەڵانی پترتر دەکرد.

لەو بیرکردنەوەیەدا بوم، یەکێکیان گوتی:

مامۆستا مەحمود ئەوە بۆچی پەڕۆکەی سەرچاوت کەمێ لانابەیت. ئای خۆ من دەمێکە ئەوەم بەبیردا هاتوەو ئێستا بۆ چاری ئەم زۆر بۆ هێنانەی میزەڵان، لەشوێنی خۆیدایە، شتێ ببینم. دیارە ئەوانیش هەر وایان کردوە. مانای وایە حەرەس لەژورەکەدا نییە. بۆیە یەکسەر دەستم بۆ پەرۆکە بردو کەمێك هەڵمدایەوە. نەخێر ئەوەی لەو ژورەدایە گەلێکیان دەناسم. بەڵام هیچیان بۆ من جێی پرسیارو مەترسیی نەبون. تەنها دوان سیانێکیان نەبێت، ئەوانیش ناڕاستەوخۆ. ئەوە کەمێك ئارامی کردمەوەو گوشاری بەرموسەڵانەکەمی لەبیر بردمەوە.. بەڵام ئەوە هەر ماوەیەکی کورت بو دوایی وای لێهات کەبواری بیرکردنەوە لەهیچ شتێکی تر نەدات.

هەر پاش ئەو چاوگێڕانەی دوای پەڕۆ لەسەرچاو لابردنەکە، لەپڕ یەك بۆکسیان سرەواندە تەوقی سەرم، تەواو وڕو تاساوی کردم، فرمانیدا کە چاوم دابپۆشمەوە. بەڵام فشاری هەڵوسانی میزەڵانو گوشاری بەرموسەڵان نەیانهێشت بیر لەسەر ئازاری شوێن بۆکسەکە چڕبێتو بەکاتیی کەلایان خست. ئازاری بەر موسەڵان بەجۆرێك زۆری بۆ هێنام، کە گرتنم لەبیر بباتەوەو گوێ نەدەمە لێدانو بۆکسی تر. بۆیە دەستم بۆ پەڕۆکەی سەرچاوم بردو کەمێك بەرزمکردەوە، ئینجا کەوتمە گەڕان بەدوای کونی ئاوەڕۆکەی ژورەکە، چونکە ئەرزی کۆنکرێت پێویستی بەئاوەڕۆکە هەیە، یەکێکیان گوتی:

- ئەوە مامۆستا بۆچیی دەگەڕێیت؟

< گوتم بۆکونی ئاوەڕۆکە دەگەڕێم، بەسەرسوڕمانێکەوە گوتی:

- بۆ چیتە؟

< خۆم لەم ئازارە بێمانایەی بەرموسەڵڵانم سەرفراز ئەکەم، میزەڵانم وەختە بتەقێت.

- سابەخوا دەتکوژن، یەکێکی تریان هەڵیدایە.

< برا بەحاڵم نازانێت، بڕوا دەکەیت بەخیلی بەمردو دەبەم، کوڕە من ئارامم لەبەرهەڵگیراوە، ژیانم لا بۆتە دۆزەخێك کە ئاوات بەخودی دۆزەخی ناسراو دەخوازم.. ئیتر دەبێت لێدان لەو ئاستەدا چیبێت! چەند کەسێکی تر هەڵیان دایەو گوتیان بەخوا مامۆستا ئێمەش زۆرمان بۆ هاتووە. دەی کەواتە باداوای چونە سەر ئاودەستیان لێبکەین. پاش ماوەیەك گوتیان: نابێت ئەوە قەدەغەیە.. ئەی خوای گەورە توشی چی بەڵایەکت کردوم، وەرە لەم سەرەتا کورتەدا گرتن‌و زیندانیی بەعست لەبیر بچێتەوە! دڕندەیەکی وەك ڕژێمی حزبی بەعست لەناو ئەم دۆزەخی گوشاری بەرموسەڵڵانە لابوبێت بەشتێکی ئاسایی‌و شتێکی تر بەسەریدا زاڵ ببێت..

ئەم گوشارە زۆرو هەڵاوساندنە ئارامبەرە، ترسەکانی گرتنیان ڕەواندۆتەوە. دەی خۆ ناکرێ لەبەرچاوی هەمووان میزەکە بکەیتە ژورەکەوە. خۆ ئەوە کوت‌و مت وەك میزەکە بەواندا بکەیت وایە. ئەی چارە؟ باشە لەحاڵەتێکی وادا عەیبی چییە میزەکە بکەیت؟ خێرا خۆم بەخۆمم گوت: ئەوە دەڵێی چی؟ نانا جوان نییە. کورە چی دەڵێن بابڵێن، عەیبی چییە پیاو لە نەگبەتیی واخۆی سەرفراز بکات. دەی با هیچ نەبێت یەکێکی تر ئەوە بکات ئەوسا منیش بیکەم! دەی ئاخر ئەوان وەك من‌و هێندەی من ئاویان نەخواردۆتەوە تا ئەم فشارەیان بۆ دروست ببێت. کوڕە تۆ بڵێیت ئەم ژورە زلە بێ ئاوەڕۆکە بێت، بڕواناکەم. ئەوەی بارەکەی خراپتر دەکرد ئەم بێ دەنگی‌و خۆمت‌و مات کردنەیە کە جەڕاندنەکە زۆر بە ئازارتر دەکات. دەی هیچ نەبێت با قسەیەك بکەم: دەی بەقوربانتان بم بگەڕێن. نابێ‌و ناکرێ کونێکی تیا نەبێت! دەی با هێندە بقیژێنم هاوار بکەم تا چارەیەکم دەست دەکەوێت یاخود دەمکوژن‌و دەبڕێنەوە. باشە کوشتن لەسەر شتی وا هەر ڕوی نەداوە، دور نییە کەمێکم لێبدەن‌و ئیتر دەبڕێنەوە. دەی بیرێکی باشە. لەهەموو بیرەکانی تر لەبارترە دوای ئەو قسانەی بەمێشکدا دەهاتن گوتم: ئەرێ کوڕینە بۆچی داوای چونە سەرئاودەستیان لێنەکەینەوە، یان بۆ داوای تەنەکەیەك نەکەین؟ چیتێدایە داوای بکەین، خۆ نامانخۆن، یا ئەیدەن یان ئەڵێن نییە.. پاش ئەوەی یەکێکیان بەحەرەسەکەی گوت، هێندەی نەبرد تەنەیەك هێنرا. هەر کە چاوم پێی کەوت، وامدەزانیی سەرفرازکەرێك خۆی کردوە بەژوردا. پێش ئەوەی دابنرێتە سەر ئەرزەکە من بیجامەکەم بۆ ئامادە کردبو. یەکسەر لێی چومە پێشەوەو خەریك بو حاڵەتی میزکردن وەربگرم. لەپڕ یەکێکیان گوتی: مامۆستا گیان بەقوربانت بم پەرێشانم، یارمەتیم بدەو هەریەك دەقیقە لێم بووەستە، ئها ئهە. ئەرێ ئەم بەڵایە چیبو خۆ تا ئێستا یەك ورتەم لێ

نەبیستوە، ئەوە بۆچی واخۆی خستۆتە حاڵی چاو و ئەو هەموو زۆرانبازییەی لەبەرچاو نییە.. دیارە زۆر کەم چیکلانەو خۆنەگرە. خۆ هەر بیئەوەی بڵێم باشە والیمهاتۆتە پێشیو تەنگی پێهەڵچنیوم. خۆ نەگونجاویشە ئەگەر گوێی نەدەیتێ. نەخێر هەر پێش ئەوەی بڵێم دەی باشە کاکە فەرمو، حاڵەتی میزکردنی وەرگرت، چاوەڕوانیی.. چاوەڕوانیی! ئەوە چییە کاکە تۆ تەنگەتاو نیت ئەگینا چۆن میزت بۆ ناکرێت؟ ئەوە چییە! ئەوە خۆ هەر بەڕاست بۆم ناکرێت! لەبەر خۆیەوە سکاڵای ئەو حاڵەی خۆی هەڵدەڕشت. دە کاکە وەرە بەم لاوە، تازە توشی جەڕان بویت. سەبر گرەو ڕێگە بەمن بدە، ڕاوەستەو سەیری خۆ بەتاڵکردنەوەکە بکە، ئەوە یارمەتییەکی زۆر گەورە دەبێت بۆ نەهێشتنی ئەو جەڕاندنەی تۆو ئامادە بون بۆ میزکردن، بۆ ئەوەش چەند ساتێك چاوەڕوانیو سەیرکردنت دەوێ تادەکەوێتەوە سەرخۆت، سەرحاڵەتی نیمچە ئاساییبونەوەی دەرونت. نەخێر کەڵکی نییە. سەیرێکی منی کردو گوتی دەی مامۆستا تۆ. هەر ئەوەندەی چومە پاڵ تەنەکە، ئیتر لێشاوی قەتیسبوو بێ وەستان دەڕژایە ناو تەنەکەکەوە. ئەوەی گۆمی مەنگی ئارامیی ئەو جیهانە تایبەتییە نەدیتراوەی لێدەشڵەقانم ئەو دەنگانەی دەورم بون کە یەك لەدوای یەك بەگوێمدا دەدراو دەگوترا دەی مامۆستا گیان خێراکە، دەی بەساقەدبم پەلەبکە. هەریەکەیان دەیگوت: دەی نۆرەی منە. گیانی بەزەیشم لەناو کەمبونەوەی گوشاری میزەڵڵانو بەرموسەڵلان دەبونە هاندەر بۆ هەوڵدان بۆ وەستاندنی لێشاوەکە تا ڕێگە بۆ ئەوانی تریش بکرێتەوەو لەو ئازارە، کە مەگەر هەر من بزانم بەری لەکوێوەیە، سەرفرازبن. بەڵام پیرە میزی پەنگەوە خواردو وەستانی بۆ نییە. جڵەوەکەی لە دەستی خۆمدا نییە تا بیوەستێنمەوە. بۆیە بەوەی لە هەموان نزیکترو بە دیمەن پەککەوتەتر بۆ گوتم دەی کاکە عەیبی نییەو تۆش دەستپێبکە. تومەس بەسزمان چاوەڕوانی قسەیەکی وای دەکرد. خۆ لاشم ناڕەوابو وابزانرێ گوێم لەدوای کەس نییە. کەسیشیان نەهەستیان بەو دەردەسەرییەی من دەکردو نە بەم گوشارە دوولایەنیەش دەزانن. ئیتر هەروەك ژنێکی ژاناویی بەردەم منداڵبون کە منداڵەکە شوێنی ئاسایی خۆی بەجێ دەهێڵێو دێتە دنیای نائاساییەوە تادایکی لەمەینەتیی ئەشکەنجەی ژان سەرفراز بکات، ئا بەو جۆرە ئازاری ئەو جەڕاندنەم لەکۆڵ بووەوە. تەواوی جومگەکانی لەشم، ماسولکەو دەمارەکان ئارام بونەوە. ئای کە خۆش بو، لەش خاوبونەوەو ئیسراحەتی ئەو میزەڵڵان بەتاڵکردنەوەیە، نەك بۆ ئەو کاتە، بەڵکو بۆ سەرجەمی ژیانی دوایی هەرگیز لەزەین ئاوا نابێت. ئەو کاتەش زانیم کە ئەوە تاکە ڕوداوی تەمەنی تا ئەو کاتەم بو کە ئارامییەکی لەوێنە نەبوی وای لام خوڵقان کەوا بزانم سەرفرازبوم.

دوای ئەو شانۆگەرییە چرپڕەی ئەو دوو سێ سەعاتەی گەیشتبوینە هەیئەو ئەو مەخسەرانەی خرانە بەردەممان. کاتی نان خواردن هات. ئێمەی یەخسیر تەواو

برسی‌و تینوی ناو ئەو کاروانە ئایندە تاریکەین، هەرچەندە چرپی روداوەکان‌و هەڕەشەو ترسەکان نەیاندەهێشت زۆر هەست بەوانە بکەین، بەڵام وا ئێستا زۆریان بۆمان هێناوەو خواخوامانە شتێکمان بدەنێ. من بۆخۆم لەنان‌و ئاوزیاتر چاوەڕوانی هیچی تر ناکەم. داواکرا دەی یەکێك بێتە دەرەوە. سێ سینیی نیسکێنە کێشرایە ژورێ لەگەڵ سەرو سەمون.. هەر هەشت کەسەو لەدەوری سینییەك خڕبوینەوە. هەریەکە لەبەردەمی خۆیەوە دەستی کرد بەخواردن. دەشبو خۆم لەگەڵ ئەو شێوەی بەکۆمەڵ‌و بەدەست نانخواردنە رابهێنم، چونکە یاسای هەیئە کەوچك‌و چنگاڵیشی خستبوە ناو لیستەی قەدەغەکراوەکانەوە. ئیتر دەبێ چێشت بەدەست خواردن ببێتە کارێکی ئاسایی..

بێگومان دەبێت زۆریش نەبات کە هێرشی پەتاو نەخۆشیی دەست پێبکات.. ئەی بێ سابون‌و ئاوی گەرم‌و خاولی، بێ دەست‌و پل خاوێنکردنەوەی دوانان بەدەستخواردن، لەگەڵ ئەو شێوەی چونە سەرئاودەست‌و خۆپاککردنەوەو تەنها بە ئاوی سارد دەست شتنە، لەو ژورەو بەو ژیانە، هەردەبێت زۆری پێ نەچێت ئەوە روبدات. خۆ ڕەنگە هەر ئەوە بەس بێت بۆ بێزارکردنی گەلێك زیندانی‌و ئیعتیرافکردن، ئەی ئەگەر بەو جۆرە مامەڵەمان بکەن ئیتر لێدان‌و ئەشکەنجەی بۆ چییە! ئەوانە بۆخۆیان خراپترین شێوەی ئەشکەنجەو نەخشەیەکی لێکۆڵراوەی کوشتنی لەسەرخۆیە..

پارچەیەکی سەمونەکەم وەك کەوچك لێکردو نەختێکم بە سەمونەکەوە خوارد، کە دەستم هەڵگرت، کەمال گوتی:

- ئەوە چییە تێربویت؟ گوتم:

< نا پیاو سێ ژەم نان نەخوات چۆن بەوەندە تێردەبێت، بەڵام لێرەدا تا دەتوانرێت کەم خواردن باشترە. گرنگتر لەوەو بۆ من ئاو بو کە تینوێتییەکەی شکاندم‌و خەمی لای تاکە گورچیلەکەمی تاڕادەیەك کەم کردەوە..

لەم سەرەتا زووەشدا دەبێت ئیتر دەم‌و ددان شوشتن لەبیری خۆمان بەرینەوەو هەر بەئاوی سارد لەدەم وەردان رازی بین. دیسان وادیارە کە دەبێت بیر لەسابون‌و ئاوی گەرم نەکەینەوە، بۆیە دەبێت چەند بتوانم خۆم لەدەست چەورکردن لابدەم. باشە ئەی دوای توالێت پیاو چۆن پارێزگاریی کەمە خاوێنییەك دەکات، خۆ دوای خۆپاککردنەوە بەدەست‌و ئاوی سارد، نە سابون لای ئاوەکەوە دانراوە، نە ئاوی گەرم هەیەو نە خاولی، خراپتریش لەوانە یەکێك لەفەرمایشتەکانی مامۆستا عەسکەر ئەوە بو کە ئەگەر سابونیش دانرابوو! بەهیچ جۆرێك بۆ کەس نییە دەستیشی بۆ بەرێت نەك بەکاری بهێنێت. دەی با بزانین چۆن دەبێت خۆ بەم چەند سەعاتە هەموو

شتێك روون نابێتەوە.. کێ دەڵێت هەروا دەمێنێت..! دوای تەواوبونی نان خواردنەکە سینییەکان برانە دەرەوە. ئیتر دەشبو یەکێك بۆ ئەم کارە تەرخان بکرێت.

لەجۆری نوستن بەو قەرەباڵغییەو لەژورێکی وا بچوکدا نەشارەزا بوین. چۆن جێگەی نوستنی بیستو چوار کەسی تێدا دەبێتەوە.

ژورێکی لاکێشییە پانییەکەی هەر هێندەیە کە لە درێژبونی دو کەسی کەڵەگەت بەرامبەر بە یەکتری بنی پێیان بەریەك دەکەوێ، بەمەزەنە شتێك لەچوار مەتر کەمترە. درێژییەکەشی هەر پێنج مەترێکە، چوار دیوارە کۆنکرێتییە پیسو پۆخڵەکانی یەکپارچە نوسینە، کەمێکی ئاسان دەخوێنرێنەوە. دەرگای ژورەکە ئاسنەو ئەمەش تەنها دەربازگەی ژورە بێ پەنجەرەو بێ هەواییەکەیە، نێوان قەراغی ژێرەکەیو ئەرزەکە هەر چوار پێنج سانتیمەترێك دەبێت. کونی کلیلەکەشی، کە ئێستا بۆ کێلونکردنی بەکارناهێنرێو کراوە بە قفڵێکی گەورە کە هەر لەدەرەوە دادەخرێو دەکرێتەوە، کەمە شتێکی دەرەوەی لێوە دەبینرێت. گلۆپێکی زەرد بەنزیك بن میچی دیواری خوارەوەی ژورەکەو پانکەیەکیش بەبن سەقفەکەوە هەڵواسراون بێ ئەوەی سویچەکانیان لەژورەوە بن. بەتانی شڕو پیسی عەسکەری ئەرزی کۆنکرێتیی ژورەکەیان داپۆشیوەو، گەڵێ بەتانی تریش دانراون.

ئەم شەوە یەکەم ئەزمونی نوستنی ناو ئەو بەندیخانەیەیە. شەو چرا ناکوژێنرێتەوە، پانکەکەش لەدوا گوریدایەو بێ پشوو گڤەگڤی دێت. چۆن بنوین..؟ ئەو پرسیارەمان لەخۆمان دەکرد بێ ئەوەی وەڵامی دروستمان لابێت.

لەسەر جۆری نوستنو جێگەبونەوەمان کەوتینە مشتومڕ. با نیوەمان بەپێوەبینو نیوەکەی تریشمان بخەوین، لەنیوەی شەودا هەردوو نیوەکە پێچەوانە بکرێنەوە. یا با نیوەمان دابنشینو نیوەمان بخەوینو لەنیوەی شەودا پێچەوانە ببینەوە. یان سەرەو خواروو سەرەو ژور بخەوین رەنگە جێگەی هەموومان ببێتەوە. بەو جۆرە گەڵێ ئەلتەرنەتیڤ باسکرا بێ ئەوەی هیچیان گونجاوبن.. زۆر نارەحەت بوین.. هەرچیی چۆنێك بو بەو تاقیکردنەوانە بە نیوەو ناچڵ رۆژمان بەشەوەکە کردەوە.

لەبەر ئەوەی سەر عەمەلیاتی گورچیلە دەرهێنراوەکەی لای راستم هەوی کردبو، ماوەیەکی زۆریشە بە ئیلتیهابەوە گیرم خواردوە. بۆیە پێویستم بەوە بو کە لەشەودا زەختی نەکەوێتە سەر، واتە کەس هێندە لێم نزیك نەبێت کە لە پەل هاویشتنی کاتی خەوتندا بەر کەلەکەم بکەوێت. لەو ژورەشدا کەس ئەوەی دەست نەدەکەوت.

هەریەکەم شەو بۆمان دەرکەوت کە تەنەکەی میزەکە دەوری خۆی دەبینێ. ئەوانەی بەناچاریی رێگەیان تێی دەکەوێ.. هەرچی پێویستیی بوایە دەچووە سەر

تەنەکەکەو خۆی لەسەر خاڵی دەکردەوە، کە خۆم یەکێکیان بوم.. هەروەها تەنەکەی ئاوەکەش پێویستییەکی گرنگ بو بۆمان.

پێش نوستن، ئەو میزکردن و ئاو خواردنەوەیە زۆر زەحمەت نەبو. زەحمەتییەکە لەکاتی نوستندا دەستی پێکرد. بەتایبەتی بۆ ئەوانەی لێیانەوە دور بون زۆر بەزەحمەت جێگەپێ دەبینرایەوە، خۆ ئەگەر نەبینرایەتەوە، وا ناچار بەسەر لەشی نوستووانداا بەرەو تەنەکەکان گوزەرمان دەکرد. لەوانەش ناموٚتر ئەوە بو کە بە دورم دەزانی تەنەکەی ئاو خواردنەوەکە لە پرِیشکی میز بێبەش بێت. چارەش نییەو ناتوانرێت دو جێگەیان بۆ تەرخان بکرێت.

بەرەبەیان زوو دەوری سەعات پێنج، زرنگە زرنگی دەنگی قفڵکردنەوەو دەرگا خستنە سەر پشت لەخەو رِای پەرِاندین، فەرمان درا؛ دەی خێرا چوار بۆ دەرەوە. ئیتر بەهەمان شێوەی دوێنێ ئێوارە، چونە سەر ئاودەست دەستی پێکرد. دەی یەکێکیش تەنەکە میزەکە بهێنێتە دەرەوە تا برِێژرێ. ئیتر ئەم نەریتی بردنەدەرەوەی تەنەکەی میزکردنە کرا بە سەرەو دەبێت هەر رۆژە یەکێك لێی بەرپرسیار بێت. من ئەم بەیانییە لەرِوی دەرونییەوە خۆم ئامادەکردبو کە لەکەمترین ماوەدا هەوڵ بدەم چەند بتوانم خۆم بەتاڵبکەمەوە، چونکە شوێنەواری نەچونە دەرەوەی دوێنێ نارەحەتی کردبوم. رێورِەسمی هاتنە دەرەوە، دەرگا کردنەوەو پێوەدانی، چاوەرِووانی سەرە بۆچونە سەر ئاودەست، بێدەنگی و نەجوڵان و سەر شۆرِکردن بۆ زەوی و سەر هەڵنەبرِین ئەگەر بانگیش بکرێیت، جۆری چونە سەر ئاودەستەکە، لە دەرگادان و هاتنە دەرەوە، دەستوپل شوشتن و جۆری چونەوە بەر دەرگاو چاوەرِوانی و ئینجا چونەوە ژورەکە دەزانران.

بەم یەکەم بەیانیی جەژنە دەرسی نوێ چاوەرِوانی دەکردین. دەرسی پرسیارکردن و وەڵامدانەوە، هەروەك تاقیکردنەوە.

حەرەسەکان کەوتنە ئاراستەکردنی پرسیاری کورت کورت لەم یان لەو: ناوت چییە؟ خەڵکی کوێیت؟ کێت کوشتووە؟ چیت کردووە؟ ئیشت چییە؟ لەگەڵیشیاندا ناو بەناو دەچووە پێشەوەو سۆندەیەکی دەکێشا بەزیندانییەکدا، یان شەقێك لەیەکێکی تر هەڵدەدرا، لەویتر دارێ یان تفکردنە دەموچاو، یا سیخورمەیەك. لەدرەنگ هاتنە دەرەوەدا جۆرێکی تر لەسوکایەتی پێکردن و لێدان دەستی پێکرد، دیارە وردە وردە فێری ئەم دەرسە نوێیانەمان دەکەن، وەك دانەواندن و پەنجەی شایەتمان گیرکردن لەزەوی و بەدەوری خۆدا خولانەوە، لەگەڵیدا جار جار سۆندەیەك یان لەپشتەوە شەق تێسرەواندن تا زیندانییەکە بەدەمدا دەکەوت، ئەمر دەکرا کە هەڵبسێتەوە! سەرلەنوێ دەستپێکردنەوە تا بەندەکە هیلاك دەکراو لەبەردەوام بون دەکەوت، کە ئەو هیلاك و حەرەسەکانیش تێرتێر پێدەکەنین، ئینجا وازی لێدەهێنرا..

هەروەك دوێنێ لەبەردەم ئاودەستەكەدا سۆندەكە درێژ بۆتەوە، پڕبەپڕی ئاوێكی ڕون و بەگوڕ دەهاتە دەرێ، زیاتر لە دوو مەترێك درێژ بۆتەوە، ئەوەش ئەو ئاوبەدەستو دەموچاو كردنە بەپەلەیەی زەحمەتتر دەكرد. دیسان هەریەكە لە دوای ئاودەست بەپەلەپەل دەستی دەداتە بەرئاوەكەو یەكدوجار بەسەریەكدا هەڵیان دەگلۆفێو یەك دوو مشت دەكات بەدەمو چاویداو خێرا خۆی دەگەیەنێتە ریزی بە چیچكان دانیشتووەكانی بەردەم دەرگای ژورەكە، تا تەواوبونی كۆمەڵەكەو چونە ژورەوەو هاتنە دەرەوەی پێنج كەسی تر.. ئیتر هەمان رۆتینی دوێنێ بە جیاوازیی جۆری مامەڵەو لێدانو دەرسی نوێو هەمان ماوە بۆ چونە سەر ئاودەست كۆتایی هات.

یەكێك بانگكرا تا نانی بەیانیی بهێنێتە ژورێ. چا لەدۆلكەیەكدا لەگەڵ تاقمێك سەمون، و چەند كوپێكی فافۆنی پیسو قوپاو و هەر بۆ دوو كەس قوتویەك پەنیری كرافتی بچوك، بێ ئەوەی كلیل یان سەرقاپكەرەوەی لەگەڵدا بێت، هێنرانە ژورەوە، غەریبە، پەنیری كرافتمان دەدەنێ! باشە بێ سەرقاپكەرەوە چیی لەم پەنیرە بكەینو چۆن بیكەینەوە!؟

یەكێك لەدەرگاكەیداو لەحەرەسەكەی پرسیی. بەجنێوەوە گوتی دەمت داخە. بۆیە دەبو پەنیر خواردن لەبیرخۆمان بەرینەوە، دەمانگوت دیارە هەر بۆ جوانییەو تا رەنگوبۆی كرافتیشمان لەبیر نەچێتەوە!

دەستكرا بەچا تێكردنو دابەشكردنی، چونكە لەبەر كەمیی كوپەكان دەبو بەسەرە نانو چاكە بخۆین..

ئەمرۆ یەكەم رۆژی جەژنی قوربانو دووەم رۆژی زیندانیمانە.

هەرچەند زۆر لەمێژە ئەمجۆرە جەژنە پیرۆزانە نائاساییو لەناو مەینەتیو بەپۆل چونە سەر قەبرانو یادكردنەوەی شەهیدو كۆچكردو كارەسات، هەر بەناو ماون. جگە لەوەی كە بەشێك لە "نوێخوازانی" كورد یارمەتیدەرن بۆ گوێنەدان بەو جەژنانەو لەبیرچونەوەیان بەو بیانووەی كەئەوانە بە جەژنێكی غەیرە كوردیی دادەنێنو خۆیان لەو راستییە لادەدەن كە ئەو جۆرە بۆنانە، جگە لە لایەنە ئاینییەكەیان، بوون بە بەشێك لە كولتوری كوردو دەبێت گەشەیان پێبكرێو زیاتر بایەخییان پێبدرێت، چونكە ئەو جۆرە بۆنەو جەژنو شادیو رۆژانی حەسانەوانە ژیانی خەڵك زیندو ترو خۆشو بەتامو پڕ ماناتر دەكەن.. لەگەڵ ئەوانەشدا بۆ منداڵ جەژن هەر جەژن بو، بۆ ئەوان هیچ رووداوێك كاری نەدەكردە سەرگرنگیو ماناكەی، بۆیە جەژنی خۆیان هەردەكەن، هەر لەجلی نوێو نانی بەیانیانو پارەو جەژنانەوە تا چونە دەرەوە، گەڕانو شت كڕین، سواری پاسكیلو ماشێنو كڕینی یاریی منداڵان.. تاد.

ئەو بیرانە هۆشیان بۆ لای منداڵەکانم راپێچ کردو خەمو پەژارەیەکی زۆر باڵی بەسەرمدا کێشا..

جوڵەو قسەو پێکەنینو یارییو گاڵتەو گەپو هەڵسوکەوتی چونە قوتابخانەو هاتنەوەو لەگەڵ دەرسو دەور خەریك بون تا ئەم جۆرە بۆنەو رۆژانە بوون بە تابلۆیەكو لەپێش چاوم قوت بووەوە. ئاییی! ئاخۆ دەبێت ئێستاکە چیی بکەنوچۆن بیربکەنەوەو چەند لەنازی باوکێتیی بێبەش بن! دەبێت چۆن بیر لەباوکیان بکەنەوەو چۆن ئەم فڕاندنو ونبونە لێکبدەنەوە.! ئەی دەبێت دایکیان چۆن شیوەنی نەمانی هاوسەرەکەی بکاتو نەیەڵێت پارچەکانی دڵی پێ بزانن تا لەوە زیاتر دڵشکاو و نائارام نەبنو بێ باوکییان پێوە دیار نەبێت..

ئاییی ئەوە خۆ ئەو خەیاڵانە خەریکە خۆمم لەبیر دەبەنەوە! چۆن دەبێت پیاوی هوشیار لەم جۆرە شوێنانەدا مل بۆ سۆزو ئەو جۆرە بیرو یادانە دابنەوێنێت!

نەمهێشت ئەوە زۆر بخایەنێت، خۆم هێنایەوە ناو زیندانەکەو دڵی خۆمم بەوە خۆش کرد کە گەلاوێژ باشتر سەرپەرشتییان دەکات. ئێ مادام لای دایكو باوکمن ئیتر خەمی چیم هەبێت. چونکە لەوە دڵنیا بوم کە بێ ناز نابن، بەتایبەتی دایکم بەردەوام چاوی لێیان بو، خۆ لەم گرتنەشدا خۆشەویستییەکەی من هەمووی رو دەکاتە ئەوان. هەرچەندە بۆ منداڵ کەس جێگەی دایكو باوك ناگرێتەوە. بەو جۆرە بیری خۆمم لەسەر ئەوان پەرەوازە کرد.

هەر لە سەرەتای رۆژەکەوە چاوەڕوانین بزانین چیمان لێ دەکەن. بانگ دەکرێین یاننە، جەژن بۆ ئەوانو لەم زیندانەدا دەورێك دەبینێت یاننە؟ زۆرمان لەو باوەڕەدا بوین کە ئەوانە گوێ نادەنە جەژن، ئەگینا بەو پەلە پەلە راپێچی هەیئەیان نەدەکردین.

کات نزیك نیوەڕۆ بووەوە.. بانگ لەیەکێك کرا کە بچێتە دەرەوە. کە سینیەکان کران بەژوردا، چیمان بینیی! ئای خۆ ئەوە برنجەو شلەشی بەسەردا کراوە، ئەوە خۆ گۆشتیشی لەسەرە. هەر بەدەستوری دوێنێ لەدەوری سینی کۆبوینەوەو دەستکرا بەنانی نیوەڕۆ خواردن.ئیتر بۆ من بو بەنەریت کە پارچەیەك لەسەمونەکە بکەمە کەوچك. گۆشت دابەشکراو من گوتم ناخۆم. کەمال سەیرێکی کردم، تێی گەیشتم دەڵێت چیی. هەرچەند سەمونەکەم خوارد، دیسان پڕ بە گەدەم نانم نەخواردو دەستم هەڵگرت..

دوای نیوەڕۆش هیچ گۆڕانێك نەبو، دەنگی بانگکردن دیار نەبو. لەبری ئەوە حەڵوا هێنرا، ئەمە جەژنانەیەکی چاوەڕواننەکراو بو. حەڵوای "جەیش" خۆشو بەناوبانگ بو، بە بادام خۆشتر کرابو..

كاتى چونه سەر ئاودەست هات. ئاسايى پێڕەوى پرنسيپەكانى خۆيان كردو دەشبوو لەهەمان ماوەدا هەريەكە پێويستيى خۆى ئەنجام بدات، ئيتر بە وردە لێدانو جنێوو گاڵتە پێكردنەوە بەڕێوە براو كۆتايى پێهێنرا.

ڕێوڕەسمى نيسكێنە خواردنى ئێوارەش بەهەمان شێوەى دوێنێ تەواوكرا. لەكاتى نوستندا هەمان كێشەى دوێنێ شەومان ڕووبەڕوو بووەوەو بێ ئەوەى چارەيەكى وا بەبيرى كەسدا بێت.

بەرەبەيانى سێيەم ڕۆژى گرتن دووەم ڕۆژى جەژنمان هاتە بەردەم. بەيانييەكەى لەيەكەم ڕۆژ توندوتيژتر بون. كەس نەبو بەرلێدان نەكەوێت! بەعەدالەت جنێوى پيسيان دابەش دەكردو كەسى لێ بێبەش نەدەكرا.. ماوەى مانەوە لەتەواليێت كەمتر بو، كەس فرياى لايەنى كەمى گوشار كەمكردنەوە نەدەكەوت.. ديارە ئەمانە دەيانەوێت كەس ئارام نەبێت، هەميشە گوشار لەئارادا بێت تا ترسو لەرز هيچ زيندانييەك بەجێ نەهێڵن.

نانى بەيانىو نيوەڕۆ وەك ڕۆژى پێشو خوراو بەسەربرا.. بێ ئەوەى بانگردن دەست پێ بكات..

بۆ دواى نيوەڕۆ دوو زيندانيى هێنرانە لامان. هەردوكيان خۆيان بە يەكە يەكەمان ناساندو لەگەڵ گەلێ لە برادەرە گيراوەكانم ئاشنايەتييان هەبو. بەتايبەتيى خۆ پێناسينەكە گەرمو گوڕو لەگەڵ ئەملاو ئەولاى يەكترى ماچكردن دەستى پێدەكرد..

من كەسيانم نەدەناسى.. يەكێكيان دواى ماوەيەك لێم هاتە پێشەوەو گوتى:

- مامۆستا گيان نامناسيت..؟

< نەخێر تۆ كێيت..؟

- چۆن نامناسيت ئەى مامۆستام نەبويت، لەپۆلى پێنجى سانەويى هەڵكەوت مێژوى ئەورووپاى نوێ- ت پێنە دەگوتينەوە؟ من (قادرى حەمەى مەلا نادرم) ئەى بيرتان نايەتەوە كە حسەينى مامە ڕەشە پێى گوتيت كە ئاگاتان لێم بێت..

< با با بيرمەو ڕاست دەكەيت..

ئەوە جۆرێك دڵنياى كردم.

هەرچەند حسەينى مامە ڕەشە تێكۆشەرێكى دێرينو دۆستێكى دڵسۆزو خۆشەويستو سەخيى من بو. حەزى دەكرد جيى هەيە بۆ هاوڕێ دڵسۆزەكانى بكات بە دەعوەت، خۆ گيپەى ماڵى ئەمان ناوبانگى دەر كردبو. لەگەڵ ئەوەشدا قادر كەوتە ناو ليستى باش نەناسراوەوە. هيچ گومانێكم لەسەرى نەبوو، بەتايبەتيى مشتومڕە گەرم و دۆستانەكەى لەگەڵ حەسەن حسەين لەسەر باوكى كە بەدەستى

رژێم کوژرابوو، هاندەری دڵنیابون بولێی. لەگەڵ ئەوانەشداو، لەبەر روناکیی ئەو پرنسیپەی کە دەبێت ببێتە یاسای مامەڵەکردن لەم زیندانەدا، قادر نەدەکەوتە ناو خانەی متمانە پێکردنەوە.

زۆری نەبرد دوەمیان هاتو خۆی پێم ناساندو گوتی:

- من (ئەکرەمی حەپسەم) دەمناسیت؟

< نەخێر.

- مستەفا چاورەش پورزامە.

< ئا مستەفا باش دەناسم، برادەرم بوو.

بێ پێشەکیی ئەکرەم کەوتە گێرانەوەی ژیانی حەپسیی خۆی لە ئەمنی سلێمانی، هێنانی بۆ هەیئەو بردنەوەی بۆ سلێمانی بەنیازی بەردان. ئینجا رازی نەبونی بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی لەسەر ئەو بەربونەو سەرلەنوێ ناردنەوەی بۆ هەیئە. دواتر کەوتە باسکردنی: چۆن لێرە ئەشکەنجە دراوەتەوەو چۆن قسەی پێکراوە. ئەوەشی دەرخست کە لە سەردەمی گرتنەکەیدا هیچ جۆرە پەیوەندیو چالاکییەکی سیاسیی نەبوە. بەڵکو هەر لەسەر روداوە کۆنەکان گیراوەو ئەشکەنجە دراوە ئەو قسانەی کردوە. گوتی بەڵام رەئیسی هەیئە بڕواناکات کە بێ پەیوەندیی بم زیاتر گومانی لەوەیە کە پەیوەندیم بەمستەفاوە هەبێت.

دوای گێرانەوەی قسەکان پرسی ئەوەی کرد کە ئایا لە ئیعدام سەرفراز دەبێت. منیش گوتم بڕوام وایە کە بەحەپسی ماوەی ژیان (ئەبەدی) رزگارت دەبێت. هەوڵمدا دڵی بدەمەوە، کەڵکی نەبو، چونکە لەدواییدا گوتی:

- رەئیسی هەیئە پێیگوتم تا بای لەسێدارەدان قسە نەکەیت دەست بەردارت نابین.

< دەی باشە خۆت رابگرتایە. هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو گوتی ئەشکەنجەکە لە سنور بەدەر قورسو بە ئازار بو. لەژێر زەحمەتیی لێداندا ناچار کرام ئەو قسانە بکەم. خۆزگە هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ ئێوە بومایە.

< دەتوانیت پەشیمان ببیتەوە. گوتی:

- ناتوانم، چونکە بەرگەی ئەو لێدانو ئەشکەنجەیە ناگرم.. لەهەمووی زەحمەتتر ئەوەبو کە بوتڵی غازیان بە گونمەوە هەڵدەواسیی، ئیتر ئەو دنیام بەچاوی خۆم دەبینی. ئەو لەسەر گێرانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆی بەردەوامەو منیش ورد ورد گوێ بۆ قسەکانی شل دەکەمو کەوتبومە ئەو باوەڕەی کەسێدارەی مسۆگەر کردوە. لەناو ئەو سەیرکردنو بیرکردنەوەیە لەو گەنجە کورتە باڵا تێکسمڕاوە کەمێ گەنم رەنگە کە رۆژێ لە رۆژان ئەندامی حیزبی شیوعی عیراق- قیادە مەرکەزی بوە، بگرە

یەکێك لە جەربەزەکانی ئەو حیزبە بو کە لەپرۆسەی کوشتنی دوژمنەکانی حیزبەکەیدا حسابی بۆ دەکراو لێی دەسڵەمینەوە، بەخۆمم دەگوت: دەی مردنی ژێر ئەشکەنجە لە قسەکردن و سێدارە باشتر نییە!؟

لەگەڵ ئەوانەشدا بیرم لەخۆمو ئەو ئەشکەنجە سەختە دەکردەوە کە دەبێت چاوەڕوانی ببمو دەمگوت: دەی ئەگەر مرۆڤێکی وا بەو دەردەی بەرن و بیگەیەننە ئەو ئاستەی کەوا بەئاشکرا پێی بڵێن دەبێت بای لەسێدارەدان قسە بکەیت و ناچاریشی بکەن، دەی بڕوا ناکەم بەکەمتر لەوە لەمن رازیی بن. باشە بۆچی ئەم دەردە گرانەی خۆی و ئەم چارەنوسەی لای یەکێکی وەك من بەو جۆرە باس دەکات؟ دەبێت مەبەستی روخاندن بێت؟ دور نییە، هەر خۆم وەڵامی خۆمم دەدایەوە. چونکە لەڕوی دەرونی و بەخیلییەوە زۆر بەندی لەم بابەتانە، بۆ پاساودانی هەڵوێستەکەی خۆیان، حەز دەکەن خەڵکی تریش بچنە ریز. سەیرە کەم مرۆڤ هەیە لەو خەسڵەتە خراپە شۆردراوە بێت. نا نا بڕوا ناکەم، کێ دەڵێت ئەم وایەو لەو بابەتانەیە. ئەی ئەگەر بچێتە ئەو ئاستەوە، وا تەسلیمیان دەبێت و خۆی سەرفراز دەکات، یان هیچ نەبێت درێژە بەتەمەنی دەدات.. ئەوە تۆ باسی چیی دەکەیت؟ سەرفرازیی چیی، بەخوا ئەوەی ئیعتیراف لەسەر یەك شت بکات راپێچی هەموو نهێنی داماڵینێکی دەکەن و ئینجا چارەنوسیشی هەر سێدارە دەبێت. دوای ئەوەی تەواو دایدەدۆشن و هەموو شتێکی لێدەردەهێنن ئەوسا بەشێوەی خۆیان دەیکوژن.

ئەمڕۆ بیستی ئۆکتۆبەرە، ئەم رۆژە لە مێژوی سلێمانی و کوردستاندا رۆژێکی ئاسایی نییە. لەم رۆژەی ساڵی (١٨٢٠) دا بو کە مەولانا خالید لەبەر هۆی تا ئێستا ناڕوون، سلێمانیی بەجێهێشت و جارێکی تر نەگەڕایەوە، ئەگەر ئەو زانا ئاینییە بەناوبانگە وڵاتەکەی بەجێ نەهێشتایە رەنگە مێژووەکەمان بەبارێکی تری روناکدا رەوتی بکردایە..

لەناو ئەو قسانەدا توشی جۆرێك لەکاسی و تاسبردنەوە بومو کەوتمە بیرکردنەوە، باشە دەبێت بۆچیی ئەم دوو کەسەیان بۆ لای ئێمە هێنا بێت؟ بەتایبەتیی هەردووکیان وەك باسیان کرد بەرەو مردن دەبرێن..! باشە ئەی دەبێت چۆن چۆنی لەگەڵ ئێمە دەست پێبکەن؟ ئەی چیی بە من بڵێن؟ چی تاوانێکم ئاراستە بکەن؟ چۆن باسی کۆنم لەگەڵدا دەهێننە پێشەوە؟ چی جۆرە زانیارییەکی کۆنیان لاهەبێت تا بۆ ئەم گرتنە کۆی بکەنەوە؟ ئیتر دەبو شریتی کاروانی رابوردووی چالاکییەکانم بە وردەکارییەکانیانەوە بهێنمەوە پێش چاو، تا بۆ هەر حاڵەتێکیان وەڵامێ ئامادە بکەم.. ئەی باشە بۆ بەرهەموو نوسینە قەدەغەکراوەکان و نوسینی ناو رۆژنامەو گۆڤار چیی دەکرێ و چۆن بڕوبیانویان بۆ دەهێنرێتەوە! بڕوا ناکەم تازە لە دەست

ئەمانە سەرفرازبم. زۆر زەحمەتە لەژێر ئەو ئەشکەنجانەدا دەربچم. تازە ئێرە دوا مەڵبەندی ژیانم دەبێت.

بەرامبەر بەوانە هێدی هێدی لەناو ئەو بیرکردنەوانەدا، بەرەو سەرەنجامی گرتنەکەو بەراوردکردنی لەگەڵ ئەرکی خەباتو مافی زەوتکراوی نەتەوەو نیشتمانەکەمو ئەم سەرەتانی بەعسە.. رەوایی تێکۆشان لەدژی ئەم داگیرکەرە، ئەگەری مانەوەی بارودۆخ بەو جۆرەو لە ژێر چنگی رژێمی بەعسو ئاییندەی کورد بەرەو کوێ دەبرێ؟ دوایی‌تر ناوو ناوبانگو کورتیی ماوەی ژیانو سەروەرییو سەربەرزیی وەك گەورەترین سەرمایە کە بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە.. لەو بەراوردو بیرکردنەوەو مەزەنەی ئەنجامی ئەم گرتنە و چارەنوسەکەم، لەڕوی سایکۆلۆجییەوە باشتر خۆم بۆ واقیعە تاڵەکە ئامادە دەکرد. جا کێش دەڵێت مرۆڤ بەرگەی ئەو ئەشکەنجانە ناگرێت؟ نا نا ئیرادەی مرۆڤ هێندە بەهێزەکە بەرگەی ئەشکەنجەی قورستریش بگرێت، جگە لەوە ئەی پیاوەتیو شەهامەتو نیشتمان پەروەریی مانای چیی! ئەی ژیان بۆخۆی چییە.. ساڵێ بژیتو سەد کۆتاییەکەی هەر مردنە.. پیاوی لەدنیا گەیشتوش هەر یەك جار دەمرێت. تەنها دو جۆر مردنیش هەیە. مردنیش تەنها دوو سەرەنجامو پێناسەی دژ بەیەکیان هەیە. هەروەك چۆن هەریەکە لەبەهەشتو دۆزەخ چارەنوسی دوو جۆر مرۆڤن. جا گرنگ ئەوەیە مرۆڤ کام جۆریان هەڵدەبژێرێت. هەروەك چۆن لەهەڵبژاردنی بەهەشتدا دوو دڵیی لەئارادا نییە، ئەو دوو جۆر مردنەش هەر بەو جۆرەیە. ئیتر لەم ساتانەوە وامدەزانیی کە لەناو سەختترین ئەشکەنجەدا بڕیاری چارەنوسسازی خۆمم هەڵبژاردوە. یان مردن یان سەرفرازیی بەسەربەرزیی. ئەوەم بۆ خۆم کردە بڕیار، بەڵام بۆ خۆشم نازانم تاکەیو تا کوێ بڕدەکات. ئەم دوو میوانە زۆر لە بۆچونەکانیان تێکداو تابلۆیەکی رەشتریان لام خوڵقاند..

دوای تەنها چەند رۆژێك لەهێنانیان، لەوێداو بۆ من چیرۆکی ئەکرەمی حەپسە کۆتایی هات. چونکە لەگەڵ قالەی حەمەی مەلا نادردا بانگ کرانو بران بۆ (المحکمە الخاصە)ی سەر بە (هەیئەی تەحقیقی خاسە) لە کەرکوك. هەر ئەو رۆژە قالەیان هێنایەوە. لەناو گیانی پڕ لە بەزەییو فرمێسك هەڵڕشتندا گوتی: ئەکرەم حوکمی ئیعدام دراو رەوانەی موسڵی دەکەن. نازانم چۆن ئیعتیرافیان بەو پاڵەوانە کرد. هەرچەند رۆژێکی ترەو ئیعدام دەکرێت!

ئینجا کەوتە باسکردنی خۆیو هۆی هێنانەوەو دواخستنی بڕیاری حوکمەکەی کە گوایا لەگەڵ چەند کەسێکی تر رۆژی حوکمدانەکەیان بۆ دواخستون. سەیرم لێ دەهات، ئەویان بۆ مردنو هێنانەوەی ئەمیان! بەتایبەتیی ئەمیش باسی چیرۆکی

گرتنەکەی‌و ئەندامێتیی کۆمەڵەی بۆ کردبوم، دەیگوت منیش لەئیعدام رزگارم نابێت. کەچی وا هێنایانەوە. بۆ کوێ؟ دیسان بۆ لای ئێمە. بۆیە هەر لەوێدا گومانم لەوە بو کە ئەو بۆ دادگا برابێت. ئیتر جۆرێك لەگومانم لاخولقا. رەنگە هەر بۆ سیخوڕیی بۆ ئێمەشیان تەرخان کردبێت!

خۆم دیمەنی سەردەمی قوتابێتیی ئەم کوڕەم لە زەیندا نەمابو، تەنها راسپاردەکەی حسەینی مامە ڕەشەم دەهاتەوە یاد.. چونکە من بۆخۆم دوای نەقڵکردنەوەم لەگەڵ بڕیاری نەقڵکردنەوەی هەموو "عائیدون" لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٨ داو داوی ئەوەی هەمووان گەڕانەوە جگە لە بەندەو دوو کەسی خەڵکی بادینان نەبێت کە دوای بگرەو بەردەیەکی دوو هەفتەیی ئێمەشیان مەرەخەس کردو گەڕامەوە سلێمانی‌و لەسانەوی ئەزمڕ بە مامۆستای مێژوو وە کۆمەڵناسی دانرام. ساڵی دواتر لە سانەوی هەڵکەوت قوتابیانی پۆلە ئەدەبییەکان مان لە "رەمەزان" ناو، کە بەعسی بو، دەگرن ودەڵێن نامانەوێت ئەو دەرسمان پێ بڵێتەوە، بەو ناوەوە کەتوانای بەسەر دەرسەکەدا ناشکێت. ئیتر لەچەند لایەکەوە داوام لێکرا کە ئەو چەند دەرسەی مێژوی پۆلەکانی پێنجی ئامادەیی ئەو ڕەمەزان ناوە بە موحازەرە وەربگرم. وەفدێك لەقوتابییەکانیش هاتنە لام، تێی گەیشتم کە ئەگەر ئەو کێشەیە زوو لابەلا نەکرێت لەوانەیە قوتابییەکان توشی گێرمەو کێشەی دەستی بەعس ببن. لەراستیشدا لەکێشەیەکی وادا دەبو مەزەنەی خولقاندنی جۆرێ لەگرفتیش بۆ خۆم بکەم. بەتایبەتیی تا ئەو کاتە بون بە بەعسیی لەسلێمانیدا نەبو بو بەباو، ئەوانەی "حەبەکەیان" خواردبو بە پەنجەی دەست دەژمێردران‌و لەقسەو گاڵتەپێکردنیش خۆیان لادەدا. بۆیە دەمزانی کە مانگرتنەکە سیاسییە زیاتر لەوەی مەسەلەی دەرس گوتنەوە بێت. منیش ئەو کارەم بەلاوە باش‌و بەسود بو، جۆرێك لەئابڕوبردنی ئەو جۆرە کەسانە بو، بەشێك بو لەو خەباتە جەماوەرییە نەبەزانەیەی خەڵکی شارەکە، کە هەر لەسەرەتای هەرەسەوە بو بە گیانگەی بەردەوامیی خەبات. خۆخۆمان بەگاڵتەپێکردن‌و پێکەنین بەحەب خۆرەکان کەمتەرخەمیمان لەوانە نەدەکرد کە دەگوترا بونەتە بەعسی، خۆیان سوێندو تەڵاقیان دەخوارد کەوا نییە.

# کاروانی بێ کۆتایی‌و گۆشه‌یه‌کی ژیاننامه‌ی سیاسیی

## (٣)

## په‌رده‌ی چاوه‌ڕووانیی هه‌ڵده‌درێته‌وه

**ئه‌م حه‌پسخانه‌یه‌ی ناوی هه‌یئه‌ی ته‌حقیقیی خاسه‌یه:**

زیندانێکی سه‌ربازیی نهێنییه، له‌ ناوه‌ڕاستی گه‌وره‌ترین سه‌ربازگه‌ی که‌رکوك‌و ناوچه‌که‌دایه. هه‌ر له‌سه‌ره‌تای شۆڕشی ئه‌یلوله‌وه‌ شاری که‌رکوك کرا به‌ ناوه‌ندی پرۆسه‌ سه‌ربازییه‌کان‌و له‌شکرکێشیی له‌دژی کورد. هه‌ر له‌دامه‌زراندنی ئه‌م وڵات‌و ده‌وڵه‌تی عیراقه، دوای یه‌که‌م جه‌نگی جیهان، ئه‌و شاره‌ گرنگترین شوێنێك بو که‌ له‌دوای پایته‌خت بایه‌خی سه‌ربازیی پێ دراوه‌ به‌ بنکه‌و فڕۆکه‌خانه‌ی سه‌ربازیی‌و هه‌موو جۆره‌ چه‌کێکی قورس‌و نوێ‌و بونی گه‌وره‌ترین مه‌خزه‌نی چه‌کی جۆراوجۆر. چونکه: ناوه‌ندی کێڵگه‌ گرنگه‌کانی نه‌وته، بایه‌خێکی ستراتیجیی‌و هه‌ڵکه‌وتی جوگرافیی هه‌ستیارو ڕۆڵبینه‌ری هه‌یه، پێکهاته‌ی دانیشتوانی له‌کوردو تورکمان‌و عه‌ره‌ب به‌جۆرێك بووه‌ که‌ ئاسان سود له‌ ناکۆکی‌و ململانێی نێوانیان وه‌ربگیرێت به‌تایبه‌تیی له‌نه‌خشه‌ی ڕژێمی به‌عسدا به‌گۆڕینی باری دیموگرافیی که‌رکوك چی وه‌ك شارو چی وه‌ك پارێزگا. له‌به‌ر ئه‌وانه‌ هه‌میشه‌ ناوه‌ندێکی گرنگیی ده‌زگا جاسوسی‌و داپڵۆسێنه‌ره‌ هه‌مه‌ جۆره‌کانی ڕژێم بووه‌ له‌دژی بزوتنه‌وه‌ی نیشتمانیی کوردستان.

هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ش له‌ ئازاری ٧٤دا بوو به‌یه‌کێك له‌ خاڵه‌ گرنگه‌کانی نوێبونه‌وه‌ی شه‌ڕی نێوان ڕژێمی به‌عس‌و شۆڕشی کورد. چونکه‌ ڕژێم، سه‌ره‌ڕای ئه‌و گۆڕانانه‌ی تا ئه‌و کاته‌ ئه‌نجامی دابوو، ده‌یزانیی سه‌نگی مرۆڤیی کوردی نه‌گه‌یاندۆته‌ ئه‌و ئاسته‌ی که‌ خۆی ده‌یه‌وێت. له‌ کۆتایی ساڵی ٧٣و سه‌ره‌تای ٧٤ هاتوچۆو مشتومڕ

لەسەر جێبەجێکردنی خاڵە گرنگەکانی بەیانی ئازار بەردەوام بو بەتایبەتیی لەسەر کەرکوك. رۆژێکی نیوەی دووەمی مانگی فێبریوەری عەلی عەبدوڵڵا (ئەندامی م. س و لێپرسراوی لق و پارێزگاری سلێمانی) گوتی کارێکی زۆر گرنگم پێتەو هەر بەتۆش دەکرێت. گوتم: فەرمو. گوتی: تۆمارەکانی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوك ساڵی ١٩٤٧م بۆ هێنراوە، بۆ ماوەی سێ رۆژ، دەبێت دوای ئەوە بریێتەوە جێگەی خۆیان، ئەمە کارێکی زۆر نهێنییەو نابێت کەس پێی بزانێت.. سەرجەم ئامارەکانی دانیشتوانی کەرکوك و هەموو ئەو قەزاو ناحییەو ئەو ناوچانەی ململانێیان لەسەرە بۆم دەربهێنێت تا لەدوا کۆبونەوەکانی نێوان وەفدی ئێمەو رژێمدا بکرێنە بەڵگەی داواکانی خۆمان. کارەکەم لەماوەی دانراودا جێبەجێ کرد.

لەوەدا دەرکەوت، کە زوربەی دانیشتوانی پارێزگاکە کوردە، دوای ئەوە کەمایەتیی تورکمان و ئینجا عەرەبە، تەنانەت راژەی ژمارەی کورد لەشاری کەرکوکدا لە ژمارەی هەریەکە لە تورکمان و عەرەب زیاتر بو، شتێکی واش لەکۆی ژمارەی هەردوو لایان کەمتر نەبو.

لەئاماری رەسمیی ساڵی ١٩٥٧یشدا ژمارەی دانیشتوانی لیوای کەرکوك بەم جۆرە بو (کورد: ١٨٧٥٩٣)، (تورکمان:٨٣٣٧١)، (عەرەب:١٠٩٦٢)، (کلدان و سریان: ١٦٠٥) بەوەشدا دەردەکەوێت کە تەنانەت لەو سەردەمانەشدا جۆرێك لەنەخشەی بەعەرەب کردنی ناوچەکە جێبەجێ کراوە.

دەزگای لێکۆڵینەوە (هەیئەی تەحقیقی) زیندانەکە بە سەرۆکەکەشییەوەو هەموو ئەفسەری پلە جۆراو جۆرن. سەربازەکان هەم پاسەوانن و هەم جەللادو ئەشکەنجە دەرن. تەنانەت ئەوانەش کە کاروباری بەرێوەبردن و ئازوقەی زیندانەکەیان پێ سپێردراوە، بێگومانەکە هەمووشیان دەبێت بەعسی بن.

دادگایەکی تایبەتیی سەربازیش بەناوی (المحكمة الخاصة)ی پێوە بەستراوە. کە هەموو ئەفسەری بەعسین هەموو ئەو زیندانییانەی لە هەیئە دەکەونە بەر ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەو ئیعتیراف پێکردن و ئیمزاکردنی ئەوەی ئیعتیرافی لەسەر دەکەن، لەگەڵ دۆسێکانیاندا دەنێردرێن بۆ ئەو دادگایە. زوربەی هەرە زۆری ئەوانەی بەر شەپۆلی بریاری لە سێدارەو گوللە بارانکردن دەکەون کە لە زیندانێکی تایبەتی لە موسڵ حوکمی ئیعدامەکان جێبەجێ دەکرێن، لەم دادگا جەنگەڵییەوە دەنێردرێن.. ئەوانەی تر کە شانسیان هەبێت یان ئیعتیرافەکەیان زۆر جێگەی مەترسی نەبێت بەر حوکمی جۆراو جۆر دەکەون، زیندانی ئەبو غرێب- یش دەبێتە بەهەشتی خواستراو بۆ ئەوانە کە بەخۆشییەوە چاوەروانی گواستنەوە دەکەن تا قورسایی مۆتەکەی هەیئەیان لێ دوور بکەوێتەوە. کەم کەس بەر بەردان و ئازادکردن دەکەوێت.

ئەوەی زۆر سەیرو جێگەی سەرنجە لەو هەیئەو دادگاکەیدا ئەوەیە کە هەر کەسێك بەدەمی خۆی ئیعتیراف نەکات‌و خۆی پەنجە مۆری نەکات ناکەوێتە بەردەم هەڕەشەی ناردن بۆ ئەو دادگایە. ئەوەشی دەنێردرێت، دەبێت لەوێش هەریەکە ددان بنێ بەو تاوانانەدا کەلە دۆسیێکەیدایەو خۆی پەنجە مۆری کردووە. خۆ ئەگەر زیندانییەك جورئەتی پەشیمان بونەوەی تێدابێت‌و بڵێت لەژێر زۆری ئەشکەنجەدا ئەوەی پێ گوتراوەو پێی پەنجە مۆرکراوە، نکولیی لەو تاوانانەی بەسەریدا دراوە بکات، وا دەنێردرێتەوە بۆ هەیئە بۆ سەرلەنوێ لێکۆڵینەوە. بێگومان دەبێت چاوەڕوانی هەمان پرۆسەی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە بکاتەوەو بڕیاری خۆگریشی دابێت تا چاوەڕێیی شانسی سەرفراز بوون بکات، لەحاڵەتی بوونی بەڵگە یان گومانی بەهێزیشدا، گریمانی مردن یان کوشتن لەژێر زەبری ئەشکەنجەدا هەمیشە لەبەردەمدایە.

ئەم زیندانەی رژێم کە ناوی هەیئەی تەحقیقی خاسەیە لە کەرکوك، بریتییە لەسێ بەش. لەهەریەکەیاندا یەك تەوالێت‌و یەك حەمام هەیە. حەمامەکانیش بۆ زیندانیی تاککەسیی تەرخان کراون. پێدەچێت سێ خانوی یەك نەخشەی وەك یەك بوبن، بەتێکدانی دیوارەکانی بەینیان کرابن بەیەك. سەرجەمی خانووەکە بەئەرزو دیوارو سەربان‌و بن بان‌و حەوشەوە کۆنکرێتن.

حەوشەی یەکەم: ئامرازەکانی ئەشکەنجە هەمووی لەم حەوشەیەدان، لێکۆڵینەوەو پرۆسەکانی ئەشکەنجە لەم بەشەدا ئەنجام دەدرێن. ژوری ژمارە (٨)یش دەکەوێتە ئەم بەشەوە، لەهاوین‌و کاتی گەرمادا دەبێتە دۆزەخێك بۆ خۆی، تەنانەت لەزستانیشدا بنمیچەکەی یەق دەکاتەوەو دەبێتە دڵۆپە ئاو بە سەقفەکەوەو دەچۆڕێتەوە بۆ سەر ئەو زیندانیانەی رێگەیان تێی دەکەوێت، ئەوانەش زۆر نین، چونکە جێگەی کاتیی زیندانییە تایبەتییەکانن کاتێك کە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەیان لە سەر چڕ دەکرێت. ژورەکە بێ پانکەو پەنجەرەیە، تەنها شوێنێك کە شتێکی دەرەوەی لێوە دیار بێت کونی کلیلی دەرگاکەیە. وەك هەموو ژورەکانی تر دەرگاکەی ئاسنینەو بە قفڵێکی گەورە دادەخرێ، ماوەی نێوان زەوی‌و قەراغی خوارەوەی دەرگاکە وەك ژورەکانی تر هەر چوار پێنج سانتیمەترێك دەبێت.. ئێرە یەکێکە لە شوێنە گرنگەکان بۆ دەرس دادانی جۆری ئیعتیرافکردن، لەدوای ئەشکەنجەی گیانیی‌و دەرونیی. لەوێشدا درێژە بەشەڕی روخاندنی ورەو گیانی بەربەرەکانیی خۆگرەکان دەدرێت، بەتایبەتی سەرجەمی دەنگی پرۆسەی ئەشکەنجەدانی زیندانییەکان‌و دیاردەی روخان لەبەر گوێی دانیشتوانی ژورەکەدان. لەنێوان ئەم حەوشەیەو حەوشەی ناوەڕاستدا، ژوری ژمارە (٧)ە کە کراوە بە ژوری ژنان، ئەمەش هەر لەسەر ئەم حەوشەیەیە.

حەوشەی دووەم یان ناوەڕاست: بەتەنیشتو درێژبووەوەی ژوری ژمارە حەوتە. دوای ئەوە ژوری ژمارە (٢) دێت. ئەمە دو ژوری بچوك بونو خراونەتە سەریەكو ژورێكی درێژی لێدەرچووە. لەتەنیشتییەوە، بەدروستبونی گۆشەیەكی نەوەت پلە، ژوری حەرەسو جەللادەكانە. دوای ئەوە ژوری ژمارە (١) دێت. بەتەنیشتیشیەوە بەگۆشەیەكی نەوەت پلە، حەمامو ئاودەستەكەیە كە راستەوخۆ دەكەونە بەرامبەر ژوری ژمارە دوو.

حەوشەی سێیەم، هەمان نەخشەی حەوشەی دووەمە بەڵام بەهەڵگەڕانەوەی لای راست بۆ لای چەپ، واتە: ئاودەستو حەمامەكانی هەردوو بەشەكە پشتیان بەیەكەوەیەو هاودیوارن. بەتەنیشتی حەمامەكەوە بە گۆشەیەكی نەوەت پلەیی ژوری ژمارە (٥) دێت. بەتەنیشت ئەمیشەوە ژوری ژمارە (٤) دێت. ئەم ژورەش بەگۆشەیەكی نەوەت پلەیی درێژ دەبێتەوە تا لەگەڵ دیواری ژوری ژمارە (٣) یەك دەگرێت.

لە بەشی خوارەوەیان دیوارێكی دوورو درێژە بۆ هەرسێ بەشەكە.. پانتایی حەوشەی هەر خانویەك لە دوو سەد مەتر دووجا زیاترە.

### پەردەی چاوەڕوانیی هەڵدەدرێتەوە..

چوار رۆژەی جەژنی قوربانمان بەو جۆرە بەسەر برد. شەوی دوا رۆژ بیرمان لەسەر رۆژی ئایندە چڕ كردبو. بەهەموو مەزەنەیەك سبەینێ ئەم وەستاوییە كۆتایی پێ دێت، شتێك هەر روودەدات. هەرچی چۆنێك بو شەوگارمان بەو مۆلەقەییو نائارامییە بردە سەرو رۆژی پاشە لەقە هاتە پێشەوە.

سەر لەبەیانییەكەی وەك رۆژانی تر نەبو. سەردانی ئاودەستو دەموچاو شوشتن لە هەموو رۆژەكان توندو تیژو خراپتر بون، هەروەك ئەوە پەیامێك بێت بۆ دەرخستنی روخساری راستەقینەی زیندانەكە. بەڵام نانخواردن وەك رۆژانی تر بەڕێوەچو. ماوەیەك دواییتر ئەو كشوماتییەی باڵی بەسەر حەوشەكەدا كێشابو، بەیەك زرمە لە دەرگا هەڵسان تەرەكراو بەدەنگێكی ناخۆش هاوار كرا (عمر عزیز محمد) كە بە بەڵی وەڵامی دایەوە. زرە زڕ بەدەرگاكە خراو كرایەوە. دەنگیان دا كە بچێتە دەرەوە. رۆیشتو دوای نزیكەی سەعاتو نیوێك هێنایانەوە. كە كردیان بەم دیو دەرگاكەدا، خۆی بەسەر پێوە نەدەگرت، هەروەك بەناو ژیلەمۆدا بڕوات وای لێ بەسەر هێنرابو. بە زەحمەت خۆی گەیاندە جێگەكەی خۆی، دانیشت و پاڵیدا بە دیوارەكەوەو هەردو قاچی لێ درێژكرد، بەوردە گریان و وردە هاوارەوە سەیری بنی پێ ئاوساوەكانی خۆی دەكردو بەهەردوو دەستەكانی ئاماژەی بۆ دەكردنو دەیگوت:

باشە توو خووا ئەمە ڕەوای هەقە! ئاخر من چیم کردوە چیی وا ئاوام لێدەکەن! پیاو بەدڵ بەزەیی پیادا دەهاتەوە. لێی کۆبوینەوەو هەموو چاوەڕوانی ئەوە بوین بزانین چییان لێپرسیوەو بۆچی ئەشکەنجەیان داوەو خۆی وەڵامی چیبوە..؟ گوتی:

هەر ئەوەندەیان پرسیوە کە ئەوانەی لەسلێمانیدا خەڵك دەکوژن کێن؟ ئەو پیاو کوژانەی لەسەر زاری خەڵك باس دەکرێن کێن..؟ کە گوتومە من نازانمو کەس ناناسمو هیچیشم نەبیستووە. هەڕەشەیەکی زۆریان لێ کردم کە ئەگەر قسە نەکەم وا دەمکوژن. ئیتر بردمیان بۆ فەلاقە کردنو ئاوایان لێکردوم کە دەیبینن.. ئێمە کەوتینە دڵدانەوەیو یەك دوو برادەریش کەوتنە شێلانی..

ئەو لێدانو ئەشکەنجەیە دوو دیاردەی لەبەردەممدا قوت کردەوە:

- یەکەمیان: بەسزمانێکی وا کە وەك خۆی دەڵێت تەنها تاوانی هەر ئەوە بوبێت کە لەساڵی حەفتاو چواردا کە پۆلیسو (رئیس العرفا) بووە. وەك ئەو هەموو خەڵکە چوبێتە شاخو لەبەر ئەو وەڵامەی پرسیارەکە، بەم دەردەی بەرن، دەی قوڕ بەسەر ئەوەی شکی تری لێدەکەن یان باش دەیناسن یان شتی لەسەر ساغ دەبێتەوە..

- دووەم: جۆری لێدانەکە ئاسان هاتە بەرچاوم. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەگەر ئەشکەنجەکە هەر ئەوە بێت وا من جۆرێ لەئەزمونی ئەو لێدانەم بەسەردا تێپەڕ بووە.. بەڵام بڕوام نییە کە هەر بەوە قایل بن، ئەی عومەر ناڵێت لێکۆڵەرەکە گوتی ئەمە سەرەتایەو قسە نەکەیت دەکوژرێیت. کە یەکەم ڕۆژ پرسیار لەعومەر کرا: چۆنو لەکوێ گیرایت، گوتی: بەیانی زوو بەڕێکەوە بوم بۆ نانەواخانە تا نان بۆ منداڵەکانم بکرم، زرێ پۆشو ئوتمۆبیلێکی سەربازیی زۆر وەستان و دەنگیان دام کە بچمە پێشەوە، داوای هەوییەیان لێ کردم، دامە دەستیان، سەرنجیان لێداو دایانەوە دەستمو گوتیان بڕۆ. هەر شەش حەوت هەنگاو دوورکەوتمەوە، لەپڕ بانگیان کردمەوەو گوتیان سەرکەوە، ئەوە بو هێنایانم بۆ ئەمنی سلێمانیو خستیانمە پاڵ ئێوە. ڕەنگە ئێستاش منداڵەکانم چاوەڕوانم بن کە نانیان بۆ ببەمەوە..

دوای ماوەیەکی کەم بە ڕۆیشتنێکی لەسەر خۆ بەڵام لەگەڵ تەپەی پۆستاڵ دان بەسەرزەویدا وا دەردەکەوت کە بەرەو ژورەکەی ئێمە وردە وردە نزیك بەدەرگاکە دەبێتەوە، لەپڕ دەنگ نەما. دوای چەند هەناسەیەك زرمەیەك لەدەرگاکە هەڵساو هەموومانی لەخەوی چاوەڕوانیی بەخەبەرهێنا. بانگی محمد سعید ساڵحو دلێر مستەفا کرا. هەرکە گوتیان بەڵێ دەرگا کرایەوەو فەرمانیان پێدرا کە بچنە دەرەوە. هەردوکیان بران. ئەمان زۆرتر مانەوە. کە هێنایاننەوەو کردیاننەوە بەژوردا پەرێشانییان پێوە دیار بو. ئەمانیان بەدەست هەڵواسی بو. هەمان ئەو پرسیارەی لە

عومەریان کردبو. ئاراستەی ئەمانیشیان کردبو. ئەمانیش گوتبویان ئێمە کەس ناناسین‌و ناوی کەسمان لەوانە نەبیستووە کە پیاو کوژن. پاش ساتێك لە هێنانەوەیان دلێر هەستاو دەستی کرد بە ریازە. بەتایبەتی تەمرینی سویدی، زۆر لەگەڵ باڵی خەریك بو. ئەو دیاردەیە نیشانەی خۆپەسەندی‌و گاڵتەکردن بە ئەشکەنجەکەی لێوە دەردەکەوت..

تاقی سەر لەبەیانیی تەواو بوو، کاتی نان خواردن هاتە پێشەوە. خواردنەکە هەروەك ڕۆژانی تر بێگۆڕان بوو، ئەوە بۆ ئێمە کەمێك دڵخۆشکەر بو. چونکە لەو ژیانە پڕ لە هیلاکەتی‌و پیس‌و پۆخڵییەدا ئەو خواردنە کەمێ پارسەنگی توانای لەش‌و بەردەوامیی بەربەرەکانیی رادەگرێت. هەرچەندە من لەسەر کەم خواردن بەردەوامم، بەڵام ئەوەندە نا کە کار بکاتە سەر خراپتر بونی لەشم.

دوای نیوەڕۆ کەمال عەلی بانگکرا. ئیتر دەبو سەرەی من بێت، بۆیە بە نائارامییەکی زیاترەوە چاوەڕوانی بانگکردنم دەکرد، هەر دەنگی تەپەی پێیەك بهاتایە وام دەزانی لە دەرگادانی بەدوادا دێت. کات گوزەری دەکردو دەنگ نەبوو. سێ سەعاتێك زیاتری خایاند تا کەمالیان هێنایەوە. کە کردیان بە ژوردا، هەروەك ئازارەکان لە دەموچاوی ببارێت ئاوا دەهاتە پێش چاو. زۆریان ئەزییەت دابو. فەلاقەیەکی خەستیان کردبو. بەڵام خۆگریی پێوە دیار بو، بێبایەخ سەیری شوێنی ئەشکەنجەکانی دەکرد. بۆ ڕۆژی دووەم لەناو هەڵواسینیدا بەو لەشە قورس‌و باڵا بەرزەیەوە، پەکیان خستبو. سێیەم ڕۆژ کە هێنرایەوە، خۆی بەسەر پێوە نەدەگرت، ئەمجارەیان زیاتر بە کێبڵ لە پشتی پێی درابو. ئەم شێوەیە لەوانی تر زیاتر ناڕەحەتی کردبو، لەگەڵ ئاوسان‌و شین بونەوەدا خوێنیان تێزابو. جێگەی وای هەبو خوێنی لێدەهات، بۆیە بەپێوە خۆی نەدەگرت. دەیگوت لەسنوربەدەر ئازاری هەیە.

ئەمە یەکەم گرتن‌و یەکەم زیندانیی کەمال نییە، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵێکی تر لەئەندام‌و لێپرسراوانی (کۆرەك) لە سلێمانیی بەهۆی خەتمایلێکی ڕژێمەوە لە ساڵی (١٩٧٥)دا دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول دەگیرێن.

لەهەمان سەردەمدا، پێش ئەوەی کێشەی سەردەرهێنانی یەکەم دیاردەی عیراقچێتیی ناو کۆمەڵە بەتەواوی لابەلا بکرێت، ناکۆکییەکی تر لەسەر خاڵێکی گرنگی ستراتیجیی لەناو ڕێکخراوەکەدا دەبێت بەچەقی ململانێیەکی کۆنی نوێبووەوە. بەڵام لە هەموو ئەوانە کوشندەتر بۆ کۆمەڵە، ڕوداوێکی سەیرو سەمەرەی ناو ڕێکەوتنێکی ئەفسانا وییە کە پوختەی چیرۆکەکەی بەم جۆرەیە:

دوای هەرەس مام جەلال نامەیەك بە برادەرێکی لە "الحرکە الاشتراکیە العربیە"دا "ولید زنون" دەنێرێت بۆ لێپرسراوانی کۆمەڵە، ولید باسی نامەکە بۆ "ئەنوەر"

دەکات کە ماڵو جێگەی کارکردنی لەبەغدا دەبێت، بەڵام پێش بە دەستگەیاندنی نامەکە دەگیرێت. دوای سێ مانگ هیچ دەنگی ئیعتیرافکردنێ هەستپێناکرێت، ئیتر ئەنوەر پشتی لێ دەکاتەوە. دواییتر بەهۆی شەڕی دوو منداڵی دراوسێو تێکەڵبونی ژنو پیاو، پۆلیس دەگەنە جێگەی شەڕ، لە چونە ماڵی "ستار شعلان" باوکی یەکێك لەمنداڵەکان، چاویان بە بڵاوکراوەیەکی "حەرەکە" دەکەوێت، ئیتر ستار کە لێپرسراوێکی سەرەکیی ئەو ڕێکخراوە دەبێتو ژنەکەشی دەگیرێن، دوایی ستار ناچار دەکرێت کە بەژنەکەی بڵێت ببێتە هاوکاری بەعسییەکان، ئەمێش دەکەنە داو بۆ گرتنی لێپرسراوێکی سەرەکیی تر بەناوی "سالم جاسم" ژنە بەگرتنی دەدات، و سالم یەکسەر دەڕوخێت، پێیان دەڵێت لێم مەدەن وەرن بابچین بۆ ماڵەوە، دەیانباتە ماڵەوەو جانتاکەی هەڵدەگرێتو پێیان دەڵێت فەرمون ئەمە هەموو "حەرەکەی ئیشتراکییە". دوای بردنو کردنەوەو لێکۆڵینەوە لە کەلوپەلی ناو جانتاکە، نامەکەی مام جەلال- یش دەگیرێت. کە ڕووبەڕووی وەلید دەبنەوە، ئەویش دەڕوخێتو دەڵێت بۆ ئەنوەرم هێناوە، کە ئەنوەر لە نیوە شەودا لەسەر کارەکەی دەگرنو دەیبەنە ماڵەکەی، دەمانچەیەکو هەندێ کەلوپەلو دەڵێن لیستەیەکی ناویش دەدۆزنەوە. بڕیاریش دەبێت کە عەسری ڕۆژی گرتنەکەی ئەنوەر لە ماڵیان کۆبونەوەیەك بکرێت، کە برادەران دەچن، ئەوسا لە ڕوداوەکە ئاگادار دەبن، و ڕێگەی ئێران ئەگرنە بەر، لەوێ دەگیرێنو دوای سێ مانگێك لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٦ دەیاندەنەوە دەست ڕژێمی عێراق..

ئیتر بەهۆی ئەوانەوەو ئیعتیرافی حەمەی میرزا سەعیدو چەند کەسێکی تر، لەهەولێرو بەغداو خانەقین چەند ئەندامێکی تریش دەگیرێن.. کۆی هەموویان دەگاتە چل کەسێك کە زوربەیان لێپرسراوی ستافی یەکەمو دووەمی ڕێکخستنەکە دەبن.. سەرەنجام شەهابو جەعفەرو ئەنوەر بە لە سێدارەو، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، جەبار فرمان، دارۆی شێخ نوری، کەمال عەلی، حسەین ڕەزا، سەعدون فەیلی، ئاوات عەبدولغەفورو گەلێکی تر بەشەش ساڵ زیندانیی حوکم دەدرێنو ئەوانی تر ئازاد دەکرێن.

ئەو خۆگرییەی جەعفەرو گیانی بەنوکتە گاڵتەکردن بە لێکۆڵەرانو، ئەو لە ئەستۆی خۆگرتنەی شەهاب بۆ لێپرسراوەتیی کارەکە، دوو داستانی نەمری ناو کاروانی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کوردنو هەمیشە بەزیندویی دەمێننەوە. جێگەی داخو پرسیاریشە کە ڕێبوارانی ماندوبووی ئەو کاروانە تا ئێستا بایەخیان بەوانە نەداوە.

تا ئەو کاتانەو تا دەستپێکردنی شۆڕشی نوێ من لەکۆمەڵەوە دوور بووم، هەرچەندە ئەو ناکۆکیو ململانێیانە بەشێکی گرنگ بوون لە هاتنەدیی

پێشبینییەکانی ئێمە لەسەر دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوە، و دوورکەوتنەوەمان لەپرۆسەی دامەزراندنەکە، لەگەڵ ئەوەشدا بەلای منەوە، ئەو ناکۆکیانە بەڵایەکی خۆلێلانەدەر بوون، چونکە ریشەکانیان هەر لەسەرەتادا جێگەی خۆیان داکوتابو. جگە لەوەش کە خەتەرێکی جیددیش بوون نەك هەر بۆ سەر خودی ڕێکخراوەکە، بەڵکو بۆ سەر گیانو پرۆسەی بەربەرەکانیی رژێم، بەتایبەتیی دوای هەرەس، چونکە ئەم ڕێکخراوە بوو بە تاکە هیوای بەردەوامیی بزووتنەوەی نیشتمانیی لە قاڵبێکی ڕێکخراودا، تاکە ئەلتەرنەتیڤی بەرەنگاربوونەوەی نەخشەکانی رژێم بۆ تەبعیسو تەعریبو هەڵتەکاندنی بنەمای ئابوریی کوردستانو قەوارەی نەتەوەیی کورد هەر لەو ڕێکخراوەدا دەبینرا.

هەر تەنها لەبەر ئەوەش بو کە راستەوخۆ دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول کاتێ جەمال تایەرو حەمە سابیر گوتیان دە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە لەکۆمەڵەدا کاربکەیت، یەکسەر بە ئامادەبوونم وەڵامم دانەوە، بەڵام ئەو روداوانەو تێکچونی شیرازەی لێپرسراوەتییەکانو نەفیکردنی زوربەی زۆرمان، کارەکەیان بۆ رۆژگارێکی تری دوای دەستپێکردنی شۆڕش هێشتەوە.

کەمال زۆر لەمن نزیك بوو، لەگەڵ ئەمدا هەندێ نهێنیمان بۆ یەك دەدرکاندو سەردەمانی رابوردومان بەسەر دەکردەوە. دیارە لەو کاتانەدا کە دەرفەتمان وەربگرتایەو کەس گوێی لێنەبوایە، یان راستتر ئەگەر فرسەتمان لە قالە بهێنایە. چونکە هەر دوای رۆیشتنی ئەکرەمی حەپسە خۆی گەیاندە تەنیشت منو لێم دور نەدەکەوتەوە.

دوای کەمال دوو دوو چەند کەسێکی تر بانگ کران، هەمان پرسیار رووبەڕووی یەکە یەکەیان کرابووەوە. تیایاندا هەبو بەبێ ئەشکەنجە دەگەڕایەوە.

لەگەڵ ئەو ناخۆشیو گوزەرانە پڕ لە مەینەتییەی ناو زیندانەکە، سەرنجم لەسەر روداوەکان باش چڕ دەکرد تا بتوانم زۆرترین روداو بەزۆر وردەکارییەوە لەمێشکدا تۆمار بکەم..

لەناو بانگکراوانی دووەم رۆژدا شێخ عەبدولی شێخ سالح بوو. بەلێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە تەواو شەکەت کرا زیاتر بەهەڵواسین. کە چومە تەنیشتییەوە، دەرفەتی هێناو بە ئاسپاییەك گوتی: خەمت نەبێت.

من زۆر مەبەستم بو کە خۆڕاگر بێت. چونکە هەر ماوەیەك پێش گرتنەکەمان، بۆ کارێکی لێکۆڵینەوە لە پەیوەندیی خێزانی لێپرسراوێکی لەسێدارەدراو (ع) لەگەڵ معاونێکی ئەمنی بەعسیدا کە فێری لێخوڕینی ئۆتمۆبیلی دەکرد، ئەمم راسپاردبو، ئەنجامەکەشی نەدابووەوە دەستم. جار جار بیریشم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر

بەگوشارو ئەشکەنجە بیپروخێنن، وا لە قسەکردنیدا سەرە دەگاتە سەر ئەو باسەش.
چونکە زۆر لەوانەی دەڕوخێن یان دەیانڕوخێنن، لێکۆڵەران شێتگیر دەبن بۆ وەرگرتنی زانیاریی زیاتر، تا تڵپەی تەڕیان تیا ناهێڵن.
لە دوەم جارو سێیەم جاردا تەواو پڕوکاندیان. لە چوارەم بانگکردنیدا بە نیوە بوراوەیی هێنایانەوە، قسەی بۆ نەدەکرا، من زیاتر پەرۆشی بوم، ئەم تێکۆشەرێکی بێ دەنگو خۆدەرنەخەر و نەگۆڕ بو.. کە بۆ جارێکی تر لە ناو ئەو شپرزەکردن و شەکەتییەیدا، لام روون بوو کە دەیویست لە ورەی نەگۆڕی خۆی ئاگادارم بکات، بە سرپەیەك گوتی مەترسە هیچ نییە، بەوە باشتر دڵنییای کردمو زیاتر لام خۆشەویست بو. دیار بو من شێخ عەبدولم لەو رووانەوە باش نەناسیبو. کورد واتەنی: سەفەرو موعامەلە سەنگی مەحەکە، جا کە پیاوەتیی پیاو لەناو ئەم سەفەرو مامەڵانەی ئەم دۆزەخەشدا بەو جۆرانە دەردەکەون، وا روی گەشی تێکۆشەرانی نەگۆڕ دەبنە روناکیی‌و رێنما بۆ هاورێبازەکان، و بەخۆشم دەگوت دەك رەحمەت لە شێخ سالح بۆ خۆی‌و پەروەردەی. چونکە لەوێدا لەناو زەحمەتیی ئەو ئەشکەنجەو ژیانە سەختەدا بۆم دەرکەوت چی خۆ ڕاگرێکە، بۆیە هیچ ترسێکم لێی نەما. چی لەسەر خۆی‌و چی بۆ ئەوانەی دەیناسین، بەسڵەمینەوەکەی خۆشمەوە. هێندەش ئازاریان دەدا کە شێخ عەبدولەکەی جاران نەمێنێت. وەك سەرەتا لەسەر قسە خۆشەکانی بەردەوام نەبو. چونکە رۆژانی سەرەتا، پێش دەستکردنە ئەشکەنجە لەگەڵ حەسەن حسەیندا گەلێ قسەی خۆش‌و نوکتەی سەردەمی رابوردویان لەسەر خۆ دەگێڕایەوە.. روداوەکانیان بەشێوەیەك باس دەکرد کە لەو شوێنەداو لەناو ترسی دەنگ دەرنەچونیشدا هەمووامانیان دەهێنایە پێکەنین..
هەر لەو سەروبەندەدا چەند جارێك جەمیل بانگکرا هەر جارە بە ئەشکەنجەی زیاترو ئازاری زۆر ترەوە دەیان هێنایەوە. بێ دەنگو لەسەرخۆ بو. دیار بو وەك جەماله رەشی برای بو، کە هەر لەم شوێنەدا، دوای ئەوەی وەك دەڵێن بە پیلانی عومەری مارف و کێشەیەکی نێوانیان! دەکەوێتە داوی رژێمەوە، سەرەنجام لێرەوە بەرەو پەتی سێدارە بۆ موسڵ دەنێررێ.. شوێنەواری نەبەزیی‌و خۆڕاگریی خۆی بە هەڵبەست لەسەر دیوار بەجێ هێشتبو، پاڵەوانانەش چوبوە بەردەم پەتی سێدارە..

## هوشیاریی‌و گومان، لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە:

هوشیاری‌و گومان لەهەموو ئەو کەسانەی ناناسرێن مەرجێکی زۆر گرنگە بۆ خۆلادان لەپیلانی جاسوسەکانیان کە لە ژورەکاندا چاندویانن. چونکە یەکێك لەمیتودی لێکۆڵینەوە، خوێندنەوەی دو لایەنەی مێشك‌و کاردانەوەی زیندانییەکانە

لـە سـاتە جیاجیاكـاندا، بەتایبـەتیی دوای ئەشـكەنجەو لێكۆڵینـەوەو پرسـیارو وەڵامـەكان. خۆ مەرج نییە ئـەوەی كە ئەو هەڵوێستەی بەرامبەر وەردەگرێـت بـاش نـەبێت یـان خـراپ نـەبێت، بـەڵام ئـەم زیندانـە لـەناو ئـەو شـوێن ئەشـكەنجەو لێكۆڵینەوانەدا، نابێت بۆ زیندانیی، شوێنی تاقیكردنەوەی بێ پلان بێت، چونكە سادەیی‌و متمانەی بێ زەمینـەو بڕواكـردن بەخـەڵكێك كـە نەناسـراوبێت، تەنانـەت ئەگەر ناسـراویش بێـت بـەڵام تـاقی نـەكراوە بێـت، لـەو جێگەیـەدا بـێ مانایـەو لـە قاموسی ژیانی ناو ئەو زیندانەدا جێگەیان نابێتەوە..

یەكەم دیاردەی ناو قسەكردنی بێ بیركردنەوە لە حەسەن حسەینەوە دەركەوت.. لە یەكەم ڕۆژی هاتنی ئەكرەمی حەپسـەو قالـەی حەمـەی مـەلا نـادر وا دەركـەوت كـە لەگەڵ حەسەندا ئاشنایەتییان هـەبێت. چونكە زۆر لەیەك نزیك بونەوە. زۆر گـەرمو دۆستانە مامەڵەی یەكترییان دەكرد. یەكێ لەو قسانەی كە حەسـەن بە قالـەی گـوت: ئەو كەسەی كە باوكتی كوشت نـەهێڵرا كفنەكـەی زەردببێـت، هـەر لەسـەر قەبرەكـەی كوژرایـەوە، جا كە یەكـەم ڕۆژ حەسـەن بـرا بـۆ لێكۆڵینـەوە دوای سـێ چـوار سـەعات هێنایانـەوەو بەڕوتو قوتـی كردیان بەژوردا. سـەرتاپا گیـانی شـوێنی قـامچیی بـوو بەجۆرێ كە زۆر شوێنی شین بوبووەوە، هەندێكی تری خوێنـی تێزابو، شـوێنی واش هەبو خوێنی لێدەهات. ئیتر شوێن نەمابو بە هەڵواسراویی بەر قامچی نەكەوتبێت.. پاش ماوەیەك لە هێنانەوەی كەوتە قسەو گوتی:

< لـەوەڵامی هـەمان پرسیاردا وتم: مـن كـەس ناناسـم، بچـن لـەو پێشـمەرگانەی تەسلیم بونەتەوە لەوانە بپرسن. دیار بو ئەوە بەرهـەمی دژە كرداری هەڵواسینو ئـەو ئەشكەنجەیە بو. ئەگینا نەدەبو قسەی وا بكات، بەتایبەتیی خۆشمان لـەو بابەتـەمان لەگەڵدایە..

**بەشێكی تر لە ئەشكەنجەی دەرونیو گیانیی..**

بەرە بەرە ئەشكەنجە قورس دەبو. شێوەی هاتن بەدوای زیندانیدا بۆ ئەشكەنجەو لێكۆڵینـەوە، ترسـناكو سـامناك تـر دەبـو. لـەناو كشـوماتییەكی كـاتیدا، تەقـەی پۆستاڵی بەرەو لای دەرگای ژوری ئێمە، مـەنگیی كشوماتییەكەی دەشڵەقاندو وردە وردە دەنگەكـە سـامناكتر دەبـو. كـە یـەك شـەق لەدەرگاكـە هـەڵدرا، بـۆ نـاو ئـارامو بێدەنگییەكـەی ئێمـە لـە ژورەكـەدا، هـەر وەك بۆمبایـەك بتەقێتـەوە، هـەمووماني لـەناو خەیاڵێكی قوڵی ناو تاسە بردنەوەیەكی پڕ لەبەزەیی بەخۆو بە شڵەژاویو نائارامیی چاوەڕووان بۆ بیستنی ناوی خۆ، ڕاپەڕاند. چونكە هـەر یـەكێكمان لـەدڵی خۆیـدا بەخۆی دەگوت: ڕەنگە من بانگ بكات، تا لـەو گرمەیـە وەخەبـەر دەهاتینـەوە، كـە هاوڕێیەكمان بانگ دەكرا، ئەوسا ئارامییەكی كاتیی تا تەپەی پێو بـانگكردنێكی تـر دەبووە میوانی زۆربە..!

جاری وا هەبو هێندە بە ئاسپایی ناوەکە لە زاری عەسکەرەکە دەردەچو کە زۆرمان تێینەدەگەیشتین، مەگەر هەر خاوەن ناوەکە خۆی حاڵی ببوایە. خۆ ئەگەر خاوەن ناو یەکسەر بە بەڵێ وەڵامی نەدایەتەوە وا ئەوەش سزای تایبەتیی خۆی هەبو. جاری واش هەبوو بە عەمدی ناوێکیان ئاوەژو دەخوێندەوە، هەندێك جار، بۆ سەرلێشێوان بۆ ئەو کەسانەی کەمەبەستییان بو.. بۆ نمونە کە دەهاتن بەدوای قالەدا، دەمێك بە محمد ملا نادر، دەمێك بەنادر قادر مەلا محمد، یا ملا نادر محمد قادر، مەلا قادر نادر تاد، بانگ دەکرا.. کە بەو جۆرانە بانگیان دەکرد، قالە خۆشی زۆر بەسەرسوڕمانەوە دەیگوت: سەیرە ئەوە چوار پێنج مانگە لێرەم کەچی ئەم سەگبابانە ناوەکەم فێرنابنو هەر رۆژە ناوێکم لێدەنێن! هەروەك بیەوێت ئەو دیاردانە ئاسان بەسەر زیندانییەکاندا تێپەڕ بکات!

رۆژی سێیەمی چڕکردنی ئەشکەنجە لەسەر حەسەن حسەین، لەرۆژانی تر توندو تیژ تر بو. کە هێنایانەوە. خراپتریان لێکردبو. بەهەڵواسین لەپەلوپۆیان خستبو. جاری وا هەبو ئێمە لە ژورەکەمانەوە گوێمان لەهاوار هاواری دەبو. ئەوەی کە سەختیی ئەشکەنجەکەی زیاتر کردبو، هەر بەهۆی ئەو قسەیەی لەسەر باوکی قالە نەبو، بەڵکو لەناو ئازاری زۆری قۆڵو شانو پەلیدا بەهەڵواسین، بۆ پشودان بەخۆی، هەندێك جار لە هەڵواسینیدا هاواری دەکرد: دامگرن ئیعتیراف. کە دایاندەگرت، هەمان قسە کۆنەکەی بۆ دەکردنەوە، ئیتر هێندەی تر ئازاریان دەدا.. لەهێنانەوەیدا، سەختیی ئەشکەنجەکان هەم بە لەشییەوە زۆر دیاربو، هەم لە روی دەرونییەوە گۆڕابو، دوای ساتێك دانیشتنو سەرنجی چڕو حەپەساویی ئێمە، روی کردە منو گوتی:

< ماموستا مەحمود وەڵلاهی یەك سۆندەی ترم لێبدەن هەموو سلێمانی دەهێنمە هەیئە..

هەڵوێستێکی سەیرو سەمەرەیە، بۆیە زۆر شڵەژام چونکە قسەیەکی چاوەڕوواننەکراو بو.. دیارە لە شەکەتیدا توشی جۆرێ لەهیستریا بووە. نەمزانی بۆچی ئەو قسەیەی کردو بۆچی روی دەمی هەر لە منەو وا بەناو ناوی منی هێناو ئینجا قسەکەشی کرد. ئەوە هەم قسەیەکی چاوەڕوان نەکراوەو هەم زۆر نامۆیە کە لەشوێنێکی واداو لەژێر باری ئەو ئەشکەنجە سەختەو کاتی چڕکردنی لێکۆڵینەوەدا قسەی وابکرێ.

من چاوم لەحەسەن بڕیوەو بیر لەشێوەی وەڵامدانەوەی دەکەمەوە، دوای هەڵوێستەیەکی کورتو لەسەر خۆ گوتم:

< برا: تۆ کەیفی خۆتە چیی دەڵێتو چیی دەکەیت، چیی بۆ خۆت بەباش دەزانیت بیکە، بەڵام ئێمە هەموو خۆمان بەزوڵملێکراو دەزانین چونکە دەڵێین

لەخۆڕایی گیراوین، دەی کەوا بێت بۆ لەخۆڕایی خەڵك توش بکرێن‌و بۆ ئێرە کێش بکرێن. هەرکەسە خۆی تەحەمولی قسەی خۆی دەکات‌و کەسمان لەئازاری یەکتری کەم ناکەینەوە.. بەڵام گوناهە خەڵك لەخۆڕایی راپێچی ئێرە بکەین‌و بەم دەردەی ئێمە ببرێن.

- گوتی :ئەی باشە بۆچی لەخۆڕایی ئاوام لێدەکەن!

< جا خەڵکی سلێمانی گوناهیان چییە؟ خەفەت مەخۆ سەرە دێتە سەر هەمووان..

دەمزانی ئەوقسەیە قسەی حاڵەتێکی تەواو نائاساییە، دەرپەڕاندنی قینی پەنگەوە خواردوی ناوسنگ‌و مێشکە بەڵام بەشێوەیەکی هەڵەو ترسناکیش! لەگەڵ ئەوەشدا پیاو دەبێت هەم لێبوردنی هەبێت‌و هەم بزانێ چۆن لەسەرخۆ ئەو جۆرە کەسانە دەهێنێتەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆی. دوای ئەوەی حەسەن پشوویەکی بەبەردا هاتەوە ئەوسا هاتە تەنیشتمەوەو گوتی:

- بە راستیی وەزعم زۆر خراپەوداوای لێبوردن دەکەم. گوتم:

< چاوەکەم ئێمە لەیەك دەبورین، ئەم دڕندانە لە ئێمە و لەکەسی تر نابورن،. سود لە سادەترین هەڵەو دیاردە وەردەگرن، ئەم جۆرە قسانە بۆ ئێرە زۆر خەتەرە!چونکە بۆنی‌ئەوەی لێدێت کە من‌و تۆ شت دەزانین، خەڵك دەناسین.. ئەوە لەسەر خۆت دەبێت بەماڵ‌و بە بەڵگە. بۆیە دەبێت ئاگاداری خۆمان بین.جارێ ئەمە سەرەتایەو دەبێت چاوەڕوانی خراپتربین.. ئیتر ئەو حاڵەتانە جۆرێك لەمەترسیی لەسەر ئەو پەیداکردبو. وای بۆ دەچوم کە ئەشکەنجەنەدانی هەندێك‌و کەمتری برادەرەکانی تر بە بەراورد لەگەڵ خۆیدا، هۆیەکی تری ئەو رەشبینییە بێ. زۆرم بەزەیی پێدا دەهاتەوە، لەراستیشدا تا ئەو کاتە، کەسمان هێندە ئەشکەنجەی قورس نەدراوە. بۆیە لەبواری کەمێك هاندان‌و دڵخۆشکردندا پێمگوت: لام وایەو لەوانەیە ئیتر بانگت نەکەنەوە، یان ئەگەر بانگیشت بکەنەوە وا ئەشکەنجەدانت بەرەو کەمی‌و سوکتر دەچێت!

ئەم هەڵچون و داچونەوەیە، بەڕوکەش کۆتایی هات بەڵام گومانم لەوەدا نییە کە دەبێت منیش باجی ئەم قسەیەش بدەم.

کە بۆ دووەم جار دلێری شێخ مستەفا بانگکرا، دوای چەند سەعاتێ ئەشکەنجە هێنایانەوە.. دیسان یەکسەر دەستیکرد بەخۆ جوڵان‌و وەرزشکردن، هەڵواسینەکە دەست‌و قۆڵی نارەحەت کردبو، هەر وەك لەشوێنێکی ئاساییدا بێت ئاوا خێرا خێرا دەستەکانی بەهەردوولاو بۆسەرو خوار درێژ دەکرد گەرمتر لەیەکەم جار، هەروەك بۆ هەمووانی دەربخات کە دیسان باکی لەو ئەشکەنجەیە نییەو هەر گوێشی ناداتێ..

بەڵام شێخ حەسەنی برای کە لەکۆنەوە دەمناسیو پێکەوە قوتابیی ئامادەیی سلێمانی بوینو هەر لەپۆلی چوارەمدا یەکترمان ناسیو بوینە برادەر. ئەم مامۆستای قوتابخانەی سەرەتاییە. یەکەم رۆژی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەکەی زۆر قورس نەبو.ئەوەی کە باری شانی ئەویشی زۆر گران کردو زۆر کەوت لەسەری: لەگەڵ هێنانەوەی بۆ ژورەکەو دانیشتنی، یەکسەر بەسەرسورمانێکی سەرنجڕاکێشەرەو، بێ بیرکردنەوەو بێ گوێدانە ئەوە کە نەوەکا سیخوڕێکمان لەگەڵدا بێت، گوتی:

- سەیرە ئەم سەگبابانە ئەڵێی هەمیشەو بۆ هەر کوێیەك چوبم بەدوامەوە بون.. هەرچەندە من هەوڵمدا لەسەری نەڕوات بەڵام تا بێدەنگمان کرد یەك دو جاری تر ئەوەی گوتەوە. لەوە بووەوە ئەوسا کەوتە جنێودان بە "چەك و سیلاحەکەی" خۆیوهەردوو دەستیبۆ ناو گەڵی درێژکردو گوتی:

< ئا ئەم سەگبابانە بەڵای گەورەن.. تومەس کە لە لێداندا زۆری بۆ دەهێننو خۆی دەبورێنێتەوە.. کە دەیانەوێ بزانن راست دەکات یاننە،کارەبای وزە گونجێنراو بۆ ئەو جۆرە تاقیکردنەوانە دەهێنن بەو شوێنە هەستیارانەدا کە خۆی لەبەردەمدا بۆ راناگیرێت، ئەگەر بزانن خۆی خۆی بوراندۆتەوە، وا دەکەونەوە وێزەی. ئەم دو قسەیە بۆ ئەفسەرانیهەیئە کە بەهۆی سیخوڕەکانی ناومان پێیان دەگاتەوە، لە دو مەبەستدا بونە بەڵگە لەسەر شێخ حەسەن کە شتێك دەزانێتو نهێنییەکی لەژێر سەردایە، یا هەر پەیوەندیی هەیە، بەتایبەتی شێخ جەعفەری برای لێپرسراوێکی پێشمەرگەی کۆمەڵەیەو رۆڵێکی دیار لەناوچەی قەراخدا دەبینێت یەکەم، دووەمیش پێزانینی ئەو ئیزعاج بونەی بەکارەبا، خستیە سەرباری زیاتر بەکارهێنانی بە مەبەستی پشونەدانو روخاندنو ئیعتیراف پێکردن.بۆ رۆژی دووەم شێخ حەسەنیان شپرزە کرد.

سرپاندی بەگوێمدا:

< بەخوا ئەم سەگبابانە وازم لێناهێنن. رۆژی سێیەمو چوارەم بەهەمان شێوە. ئیتر ئەم تەواو بێتاقەتکرا. لەشی وردە وردە دەئاوسا بەتایبەتی دەمو چاوی. رۆژی پێنجەم کە هاتەوە، لەسنور بەدەر بەزەیی دەجوڵاند. بەسرپەیەك لەناو حاڵەتێکی تەواو بێ ئومێدییەوە پێی گوتم:

- بڕوا ناکەم تازە دەست بەردارم بنو لەژێر ئەشکەنجەدا دەمکوژن. بۆ دڵدانەوەی گوتم:

< خۆت بگرەو زۆری نەماوە.. دوای شەشەمو حەوتەم جار، کەوتمە گومان کە شێخ حەسەن توانای بەرگەگرتنی مابێت.

هیچ گومانم لەوە نەبوو کە قالە قسەکانی گەیاندووە، لەوەش دەچوو کە یان لەژێر ئەشکەنجەدا دەیکوژن یا قسەی پێدەکەن.

لەو ماوانەدا دوو دوو سێ سێ ئەوانی ترمان بانگ دەکران، بەجارو دوو جارو سێ جار ئەشکەنجە، بەکاتیی، دەستبەرداریان دەبون، بۆیە دەشڵێم بەکاتیی چونکە کەس نەبو بۆ یەك سەعاتیش لەخۆی دڵنیابێت کە بانگی ناکەن یا بانگ ناکرێتەوە. چەند کەسێکیش هەر بە لێکۆڵینەوەی بێ ئەشکەنجە دەیانهێنانەوە، بێئەوەی ئەمانیش لەخۆیان دڵنیا بن.

خۆ دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە هەموو ساتێکی ئەم زیندانە تەنانەت لەناو خەوتنیش‌دا بۆخۆی ئەشکەنجەیە،بگرە سەختترین ئەشکەنجەی دەرونییە، سەختترین شێوەی ئەشکەنجەی گیانیی هەمیشەییە بەبێ ئامرازی دەستیی، بەڵام بە ئەسپێ‌و بۆن و پیس‌و پۆخڵی، نەبونی سابون و ئاوی گەرم، بەو شێوەی نوستن‌و ژیانەی ناو ژورەکە، بەو جۆری چونە سەرئاودەستە، بەلێدانی رۆژانە کە لە چاو ئەشکەنجەکاندا بەناخونەك دادەنرێن،بەوشێوەی ئاو خواردنەوە نائاساییە. هەموو ئەوانەش زەمینەیەکی بەپیت‌و رەخساوی لەبارن بۆ هەموو جۆرە پەتاو نەخۆشییەك..

ئیتر لەو چەند رۆژەدا ئەوانەی کەوتنە بەردەم چڕکردنی ئەشکەنجە دەهێنران‌و دەبران.. دیمەنێکی ترسناك‌و روخێنەرە. هەر تەواو لەناو جەنگێکی دەرونی‌و گیانیداین.. کەس لەخۆی دڵنیا نییە. هەر کەسە وا دادەنێ کە ئەم جارە نۆرەی ئەو دێت.. وا دەزانین کە هەموو لێکۆڵەرو جەللادەکانی هەیئە خۆیان هەر بۆ ئێمەتەرخان کردوە.. چونکە بە سەعاتیش بوار نادرێین، ئیتر ژورو حەوشەو هەر بستێکی هەیئەمان لێکراوە بە دۆزەخ..رۆژانەش دۆخەکە بەرەو خراپ و خراپتر دەچێت.

ئەوانەی لەم خولەی یەکەمدا ئەشکەنجەیان لەسەر چڕکرا: شێخ حەسەن، شێخ عەبدول،حەسەن حسەین،کەمال، جەمیل، دارا، حەمە سەعیدی غەدۆ.. بەڵام یەکەم‌و دووەم لەهەمووان زیاترو پڕ مەترسیی تر، چونکە بەرووالەتەکەی وا پێدەچێت کە دەستبەرداریان نەبن.

**حورمەتی جێگری سەرەك کۆمار لەهەیئەدا..**

کە خولی دووەمی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە دەستی پێکرد،حیکمەتی عەبە پاشا لەناو بانگکراوەکاندا بو. دوای نزیکەی نیو سەعاتێك لەبردنی، کەکردیانەوە بەژوردا، نەك هەر ساغ‌و سەلامەت بو، بەڵکوکەمە بزەیەکیش بەسەر لێوانییەوە روی گەش کردبۆوە. هەر ئەوەندەی دانیشت‌و پاڵی بەدیوارەکەوەدا، لە دەوری کۆبونەوەو هەریەکە پرسیارێکی لێدەکرد.پوختەو کۆی وەڵامەکانی:

پاش ئەوەی چەند پرسیارێکیان لێکردم، هەر وەك ئەوانەی ئێوە،وەڵامەکانم بەناڕازانم دایەوە.. ئیتر هەرکە پێم گوتن خزمی (تەها محێددین- جێگری سەرۆك کۆمارم)، یەك زللە چییە لێیان نەدام، زۆر ئیحتیرامیشیان لێگرتم. بگرە پێدەچێت لە گرتنم سەریان سوڕمابێت. بۆیە وا ئاسان هێنایانمەوە بۆ ئێرە، بەخوا وا بزانم کەمێکی تر بێن بەشوێنمداو ئازادم بکەن.

هەر کە لە قسەکانی تەواو بو، زیاتر لەدەوری کۆبونەوە. وامان لێکدەدایەوە کە هەر ئێستاکە دێن بەدوایدا. بۆیە حیکمەت نەیدەزانی گوێ لە کێ بگرێت، هەر یەکە کەوتە پێسپاردنی راسپاردە بۆ کەسوکار، ئەویش بەو لێنەدانو ئەو قسانەو ئەم بۆچونەی هەمووان بۆ بەربون، هێندەی تر دڵ خۆش بو. نەمدەزانی کە ئایاگوێ شلکردنەکەی هەر بۆ ئەوەیە کە ئەوانە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە یان دەتوانێت هەمووی لەمێشکیدا جێگیر بکات. لە راستیشدا هەر وەك لەسەر ئاگر دانیشتبێت وا دەهاتە بەرچاوم، هەرواش دیارە، لایەنێکی هۆشی لای دەرەوەیە، گوێقولاغە بۆ هاتنو بانگکردنی، ها ئێستا نا ها ماوەیەکی تر دێن بەشوێنیداو سەرفراز دەبێت. وەختیش دەڕۆیشتو بانگکردنەوەی دیار نەبو.. تا شەو داهات. ئیتر ئومێدەکەی دواخست بۆ سبەینێ بەیانی.. ئێمەش هەر ئەو حسابەمان دەکرد کە سبەینێ دێنەوە بەدوایدا. بۆ رۆژی ئایندە دوای نانخواردن، حیکمەت کەوتەوە چاوەڕوانیی. هەر کە لەدەرگا دەدەن ئەم خۆی ئامادە دەکات، کە بانگی ناوێکی تر دەکەن، پەژارە جێگەی ئومێدەکەی دەگرێتەوە، دوای دوو سەعاتێك لەدەرگا درا، ئەوسا ناوی حیکمەت خوێندرایەوە، زیاتر خۆشیی لە روخساریدا دەرکەوت.. هەندێکیش خواحافیزیان لێکرد.

دوای بردنی حیکمەت، زوربە دەیگوت خۆزگەمان بەو، رەنگە ئێستاخرابێتە رێ، بێگومانە هەر ئەمڕۆش بۆسلێمانیی دەنێردرێتەوە، رەنگە ئێستا بە رێگەوە بێت، پاش سەعاتە وەختێك، یەکێك دەیگوت ئێستا لەسلێمانییە، یەکێکی تر دەیگوت نەختێکی تر دەیگاتێ. بۆ زۆریشمان، رزگاربوونی یەکێکمان، لەسەختیی کێشەکەو لەو بە قورسگرتنەی گرتنەکەمان کەم دەکاتەوەو تروسکاییەك هیوا زیاتر دەکات. لەناو بەردەوامیی بانگکراوەکاندا حیکمەت لەبیر چووە.

دوای دو سەعاتێك لەپڕ دەرگاکە کرایەوە، جارجارێك بێ لەدەرگادان، بەم جۆرە دەرگا دەکرایەوەو یەکێك یان دووان بانگ دەکرا،بۆیە هەریەکە گوێی بۆ ناوی خۆی هەڵخست، لەپڕ بە پاڵێکی بەهێز یەکێکیان بەنیوە مردوویی فڕێدایە ژورەوە. کە سەیر دەکەین ئایی ئەوە حیکمەتە. حیکمەت! ئەوەچییە؟ خۆ ئێمە وامان دەزانی

بەردراویت و ئێستا گەیشتویتەوە سلێمانی.. ئەوە بۆچیی وایان لێ کردویت؟ ئەی ئاگادارت نەکردنەوە کە خزمی تەها محێددینیت؟

بە زەحمەتییەکی زۆر قسەی لەزار دێتە دەرێ، هێندەیان لێداوە بەدانیشتنیشەوە خۆی ناگرێ. دەی باشە بۆمان باس بکە ئەم جارە پرسیاری چییان لێ کردیت؟ وا دیارەحورمەتەکەی تەها محێددین هەر ئەوەندە دەوامی کرد، یان هەر بای ئەوەندەیە. چی بو چیی حیکمەت؟

بەزەحمەتێکی زۆرەوە گوتی وازم لێبێنن خۆزگە ناوی ئەو سەگبابەم هەر نەبردایە، خۆ بۆم بوو بە بەڵا. دوای ئەوەی هەمان پرسیارە ئاساییەکەم لێکرایەوە، هەر ئەوەندەی گوتم کەس ناناسم، دەستیان کرد بە ئەشکەنجەدانم.. نەخێر لێدان وەستانی بۆ نەبو.. لەگەڵ زرمەو کوتی یەکێکیان و سەندنەوەی یەکێکی تر، دەیانگوت ئەمەش لەبەر خاتری (سەید نائیب الرئیس) هەریەکە بەوی تری دەگوت دەی توخوا خاترانەی سەیدو النائیب لەبیر نەکەن، ئەگینا سزا دەدرێین، کورە ئاگاداری خۆتان بن نەکەونە بەردەم شەپۆلی غەزەبی (سەیدولنائب) یەکێکی تریان وەڵامی دەدایەوە: نا نا (سەیدولنائب) رۆحی ئێمەیە، ئێمە هەر ئەو کاکەیەمان هەیەو دەبێ رێز لێگرتنەکەی لەسنور بەدەربێت، دەبێت حورمەتی لەسەر سەرو لەسەر چاوان بێت.

من بۆ خۆم دەمزانی نائیب الرئیس هێندە لای بەعسییەکان بێ حورمەتەو کردویانەتە مەقاشی سورەوەکراوی دەستیان لە دژی میللەتەکەی خۆی! بەڵام ئەوەم نەدەزانی کە تەنانەت لای عەسکەری سادەو پیادەش وا بێ حورمەتە، لەبەرچاوی بەندێکی یەخسیری بەردەستیشیان ئەو سوکایەتییەی پێدەکەن.

تا ئێستا لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە چەند کەسێکی نەگرتۆتەوە، یەکێکیان خۆمم، ئاواتیشم دەخواست کە زوو بانگ بکرێم، بۆچیی؟ من هەر ئەو لێکدانەوانەم بۆ دەکرد کە: بزانم چیی لە من دەپرسن، چۆن ئەشکەنجەم دەدەن! بەخۆمم دەگوت: تۆ بڵێی لەبەر عەمەلییاتەکەم چاوێکی بەزەییان لێم نەبێت. تۆ بڵێیت لەمان زەحمەتتر ئەشکەنجە بدرێم؟ ئەی بۆچی بانگ نەکراوم! ئیتر جۆری گەیشتنە وەڵامی ئەو پرسیارانەو ترسی ئەشکەنجەو هەڵواسین و ئەو دیمەنە ترسناکانەی دەمبینی و لەناویاندا دەژیام بوبونە مەتەڵ و ترسیان لەناو مێشک و دەروندا دەخولقاند. هەرساتە ناساتێکیش کە دەمگوت: بەخوا لەهەمویان زیاتر ئازاری من دەدەن. ئیتر شریتی سەرگوزشتەی رابوردوو بە وردەکاریی روداوە لەبیرچووەکانیشەوە دەکەوتە جوڵە. نا نا بڕواناکەم وابن، ئەگەر وابونایە هەریەکەم کەس بانگیان دەکردمو هەر زوو دەکەوتمە بەر هێرشی ئەشکەنجە. کە ئەوانەم دەکردە لایەنێکی دڵ خۆشکردنی خۆم، زۆری نەدەخایاند کە پێچەوانەکەی دەبو بەوەڵامو هۆشی بەئاگا دەیگوت:

ئەم دواخستن‌و شانۆگەرییە پڕ لە ئەشکەنجانە بۆ خۆی ئەشکەنجەیە، بۆ خۆی سەرەتایەکە بۆ ئەشکەنجەی پڕ لەزەحمەتیتر. ئەوانە بۆ روخاندنی ورەو گیانی خۆگرییە، ئەوە هەر بەنەخشەیەو بۆ گەیشتنە مەبەستی ئیعتیراف پێکردن بەو شێوەیەی خۆیان، شەڕێکی سایکۆلۆجی‌و سەرەتایە بۆ لاوازکردنی بڕواو گیانی خۆگریی، بۆ لاوازکردنی جەستەو بەرگە نەگرتنی ئەشکەنجە.

رەنگە لەسەرەتادا وایان لێکدابێتەوە کە بە بینینی مولازم موحسین‌و ئەو شێوەی گرتنە بڕوخێم‌و بڵێم لێ'م مەدەن چیتان گەرەکە لەخزمەتتاندام! کە ئەوە روی نەدا، وا دەبێت زەمینەیەکی باشتر بۆ ئەوە بڕەخسێنن. خۆ ئەو بۆچۆنەش بێ زەمینەو بێ ئەزموونی خۆیان نییە، ترسناکترین حاڵەتەکانی گرتن، ئەو ساتانەی سەرەتایە، بەتایبەتیی ئەگەر بە بەڵگەی زیندووەوە بێت. ئەگینا دەبێت هۆی بانگ نەکردنەکە چیی بێت ئەگەر بۆ ئەوانە نەبێت!

ساتە نا ساتێکیش پرسیارم لەخۆم دەکرد: تۆ بڵێیت ئەو گیانی خۆگرییەم تیابێت کە بەرامبەر بەو ئەشکەنجەدانە بوەستم‌و خۆم سەرفراز بکەم. خۆم نەدۆڕێنم، رابوردوی سیاسیم، ناوو ناوبانگ، نیشتمانپەروەریی نەبنە رەنجی بێهودە.. جا کە ئەوانە نەمان‌و پێچەوانەکان جێگەیان گرتنەوە، تەنانەت ئەگەر بەساغو سەلامەتیش بەربدرێم، ئیتر چی مانایەك بۆ ژیان دەمێنێتەوە! چی مانایەك بۆ ئەم لەش‌و گیانە بۆ ئەم مرۆڤە دەمێنێت! دەی تۆ بڵێیت لەژێر زەبری لێداندا عەمەلیاتەکەم نەپچڕێتەوە!؟

ئەو مشت‌و مڕە دەرونییە بەسودە بەڵام هیلاککەرە، بۆ ساتێکیش لەمێشکم دەرناچێت. هەرچی هۆش‌و گۆش هەیە لەسەر ئەو پرسیارە گەورەیە چڕ دەبێت: کامیان لەگیانی بەزین‌و روخان، گیانی خۆگریی‌و نە ڕوخان سەردەکەوێ؟ چونکە رێگەی سێیەم لەئارادا نییە. هەر لەهەمان کاتدا وەڵامی خۆمم دەدایەوە: نا نا بیر لەچی دەکەیتەوە، زەلکاوی ئیعتیراف زۆر دورەو مردن ئەلتەرنەتیڤەکەیەتی.

جار بەجارێکیش گلەیی لەخۆم دەکەم کە چۆن دەبێت بچوکترین گومان بەبیری مندا بێت، جگە لەوە ئیعتیراف لەسەر چیی؟ خۆ ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە تا پیاو بکەوێتە گومانی دانپێدانان یا نکوڵیکردن، خۆ لەم حاڵەتەشدا هەر نکوڵیکردن گریمانی سەرفرازیی لەدوایە.

نا نا ئەوانە گومان نین، ئەو جۆرە بیرکردنەوەو خۆ ئامادەکردن‌و بەراوردو نرخاندن‌و پێشبینی‌و مەزەنەکردنانە زۆر پێویستن. نابێت مرۆڤی ناو ئەم زیندانەو هی بەردەستی ئەم ئادەمیزادانەی بەناهەق ناوی مرۆڤیان پێوە ماوە، هەروا بێ لێکدانەوەو خۆئامادەکردن، بێ پێشبینیی هەموو جۆرە روداوێك‌و چاوەڕوانیی هەموو گریمانێك، بکەوێتە بەردەم ئەشکەنجەیان. پێویستەو دەبێت هەموو لایەن‌و

چارەنوسە پڕ مەترسییەکان لێکبدرێنەوەو، خۆ بۆ ترسناکترینەکەیان ئامادە بکرێت.. ئەوە بۆ خۆی دەمە زەردکردنەوەی گیانی ورەو خۆگرییە!

سەرەڕای ئەوانەش ئەم ئەشکەنجانەی تا ئێستا، دیسان هێندە قورس‌و روخێنەرنین، دەی خوا دەکات هەر لەسەر ئەوانە بەردەوام دەبن وا بەرگەگرتن‌و خۆگرتن لە وزەی هەمووواندا بووەو لەوزەی منیشدا دەبێت. خۆ تا ئێستا کەسیش لەژێر ئەشکەنجەو لێداندا نەڕوخاوە یا نەمردووە.. لەوانەشەوە دەگەیشتمە سەر ئەوەی کە جارجارە خۆزگە بۆ ئەوە بخوازم کە منیش بانگ بکرێم‌و لەم "حەشرەی خەڵکەکەدا هاوبەشیی جەژنەکەیم بە نسیب بێت" ئەی بۆچیی پێم خۆش نەبێت، ئەوانەی تا ئێستا ئەو ئەشکەنجانە دراون، لە ترسناکترین رۆڵیاندا، تێکۆشەری ئاسایی‌و ستافەکانی ناونجیی‌و خوارەوەی رێکخستن‌و ریزی تێکۆشانن، هەر لەبەر ئەوە، جار بەجارێك شەرمم بە خۆم دێت کە تا ئێستا ئەشکەنجە نەدراوم، دیسان بەخۆمم دەگوتەوە: دەی پەلەت چییە، ئەم گۆمە هێندە مەنگ‌و قوڵە کە ئاسان ئەم کاروانە بێ کۆتاییە لێی سەرفراز نابێت! وا ئاسان چاوم لێناپۆشن، بگرە ئەوانە تیشکی سورو نیشانەو زەنگی مەترسیین بۆ من..!

## کاروانی بێ کۆتایی‌و گۆشەیەکی بیۆگرافیی سیاسیی

## (٤)

## سەرەتای ئەشکەنجە

**بانگکردن‌و پرسیاری سادە..**

دوای نانی ناشتا هەمو چاوەڕوانین تا بزانین چیتر ڕوودەدات. ئەشکەنجەکانی یەکەم خولی لێکۆڵینەوە، ئەوەشی تا ئێستا بەر دووەم خول کەوتووە، لەگەڵ سەختیی ئەشکەنجەی چەند کەسێکمان، دیسان بە بەراورد لەگەڵ دڕندەیی بەعس‌و داموو دەزگا داپلۆسێنەرەکانی، لەوە کەمترە کە مەزەنەم دەکرد، ئەو ئەشکەنجە سەختانەی بیستبوم‌و بیرم لێدەکردنەوە کەسمان بەرنەکەوتووە. دیمەنەکە زۆر خراپ نەدەهاتە بەرچاوم. گیانی خۆگری‌و یاخیبون لە ئیعتیرافکردن بەئاشکرا دەردەکەوت، تەنها قسەیەك کە لەدەمی یەکێکەوە دەرچوبێت، پێشمەرگەیەکی کۆن و تازە عەسکەری فێرار بوو کە گوتویەتی لەشاخەوە پەیوەندییان پێوە کردوم‌و ملم بۆ ڕۆیشتنە دەرەوە نەداوە..

لەناو تاوو توێکردنی ئەو بیرانەدا بوم‌و، هێندەش بەسەر نانخواردندا گوزەری نەکردبو، کەوتنە بانگکردن، لەئێمەش بانگ دەکری‌و منی تێدا نیم. لەپاش ماوەیەك کشوماتیی، نامۆتر لەجارەکانی تر، دەنگی ڕۆیشتن‌و تەپەی پۆستاڵی سەر چیمەنتۆکە بەرەو لای ئێمە نزیك دەبووەوە. دیار بو کە بەرەو لای ژوری ڕەقەم یەك دەهات. هەروەك مەشق بەحەرەسە جەللادەکە بکرێت ئاوا لەسەریەك نەزم پێی بە ئەرزەکەدا دەکوتا. زۆر لەنزیك دەرگاکەوە لەشوێنی خۆیدا کەوتە ڕاوحکردن‌و بەهەمان نەزم پێ بەزەویدا دەماڵێت. لەپڕو بێ لەدەرگادان، بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: عثمان قادر محمد، مەحمود مەلا عززەت. لەگەڵ بە بەڵێ وەڵامم دایەوە یەکسەر لەپشت دەرگاکەوە چیچکانم بۆ کرد. دەرگا کرایەوەو هەنگاوم بۆ ئەو دیو نا. چاوم بەسترایەوەو سوندەیەك درایە دەستم‌و خرامە ڕێ، لەگەڵ هەنگاوەکانمدا بیرم لەسەر

پرسیارو وەڵامو ئەشکەنجە چڕ بووە، ئاگاداری هاوڕێکەم نەمام، کە وەستێنرام دوای چەند ساتێك دەنگێك بەرزبووەوە:

- ناوت چییە؟

< مەحمود.

- ناوی باوكو باپیرت؟

< مەلا عززەت مەحمود.

- پیشەت؟

< مودەڕیس.

- لەکوێ

< لەسانەوی ئەزمڕ لە سلێمانی؟

- ژنت هەیە؟

< بەڵێ.

- چەند منداڵت هەیە؟

< پێنج. دوای ئەو پرسیارانەی کە بە پێیان شوناسنامەکەم دەسەلمێنن گوتی:

- دەزانیت تۆ ئێستا لەکوێیت؟

< بەڵێ دەزانم.

- چۆن دەزانیت؟

< بەهۆی زیندانییەکانی ترەوە.

زۆر باشە، دیارە ناووناوبانگی ئێرەشت بیستوە کەچی قوتابخانەیەکی بەرزو شۆڕشگێڕە بۆ پەروەردەکردنەوەی لادەرو تێکدەر..؟

خۆم بێدەنگ کرد. ئەو سا دەستی بەقسەکردەوەو گوتی:

- دەزانیت ئێمە تۆمان بۆچی هێناوەتە ئێرە..؟

< نەخێر.

- ئێمە پێویستمان بە یارمەتیی تۆ هەیە، مادام ناوبانگی ئێرەشت بیستووە، دڵنیاین کە قسەمان ناشکێنیت، وەك هاوولاتییەکی دڵسۆز یارمەتیمان دەدەیت..

کەمێك وەستاو ئەوسا لەسەر قسەکانی بەردەوام بو:

لای ئێوە بەخۆڕاییو بێ هیچ تاوانێ خەڵك دەکوژرێت، تەنانەت هاوپیشەکانی تۆ لە مامۆستای زانکۆو مەعهەدو ئامادەیی دەکوژرێن.. ئێمە دەزانین کە ئەو تێکدەرانەی بەو کارانە هەڵدەستن، ناویان لەسەر زاری خەڵکە. لەناو خەڵکدا باس دەکرێن. جا تۆش وەك دانیشتویەکی شارەکەو شارەزاو مامۆستایەك کە خەڵك دێنە سەردانت یان لە قوتابخانەو لەناو مامۆستایانو قوتابیاندا، باسی جۆراو جۆر

دەکەن‌و شت دەبیستن، زیاتر باسی کێ دەکەن‌و ناوی کێ دەبرێت؟ وەك تۆ بیستوتە ئەوانە کێن کە بەو کارانە هەڵدەستن؟ خۆت دەزانیت بنبڕکردنی ئەو جۆرە روداوانە لەخزمەتی شارەکەی خۆتدایە، خزمەت بە خەڵکەکەی خۆت دەکات.

هەر وەك لەژێر هەرەسەوە هاتبمەدەرێ، هەوڵمدا وشەکان وا کۆبکەمەوە کە لێکۆڵەران لێم تێبگەن..

< نزیکەی چوار ساڵ لەڕەمادی بوم. من ئەوەندە نییە نەقڵی سلێمانی کراومەتەوە. دوای ئەوەش هەر لەگەڵ نەخۆشیی خەریك بوم، ئەوەتا سەیر بکەن من عەمەلییات کراوم‌و گورچیلەی لای راستم دەرهێنراوەو بە ئیلتیهابێکی زۆرەوە گیراوم. من لەماڵ‌و لە قوتابخانە زیاتر نەچومەتە هیچ شوێنێکی تر. جگە لەوە من مامۆستام نە کارم بەسەر پیاوکوشتنەوە هەیە، نە کەسیش باسی ئەو جۆرە شتانە لای من دەکەن، نە ئەو کەسانەش دەناسم یا دەبینم کە لەگەڵ ئەو جۆرە قسانە مەشغوڵن یا گوێی لێدەگرن. من گورچیلەم دەرهێنراوەو یەك گورچیلەم هەیە. ئێستاکە پێویستم بە خەستەخانەو دوکتۆرو تەداویە نەك حەپسخانە!

لێکۆڵەر گوتی:

- باشە باشە دەزانین، ئێمەش بۆیە تۆمان هێناوەتە ئێرە تا ئەگەر راستیمان پێنەڵێیت و قسە نەکەیت عەمەلییاتەکەت بۆ بکەینەوە..

< من لەحەفتاو پێنجەوە لە سیاسەت دورکەوتومەتەوە، تا ئەم دواییەش هەر لەڕەمادی بوم، سوێندم خواردوە بەلای سیاسەتدا ناچمەوە، لەبەر ئەوە نە ئاگاداری ئەو جۆرە کارانەم‌و نە ئاگاداری دەنگوباسەکانیشیانم‌و نەهیچیشم بیستووە.

- ئێمە باسی سیاسەت ناکەین، ئێمە داوایەکی زۆر سادە لە تۆ دەکەین. با پێشەکی پێشت بڵێم: ئێمە بە هیچ جۆرێك گوێ لەم قسانەی تۆ ناگرین. ئێمە دڵنییاین کە تۆ شت دەزانیت. بۆیە داوای یارمەتیی لەتۆ دەکەین.. لەپێناوی شارەکەی خۆتدا کە ئاژاوەی تێدایەو دەمانەوێت ئارامی بکەینەوە. بەخۆشیی قسە دەکەیت وا دەچیتەوە ناو ماڵ‌و منداڵی خۆت. ئەگینا بەزۆر قسەت پێدەکەین ئینجا دەتکوژین. کە گوتمان دەتکوژین، یەعنی دەکوژرێیت‌و کۆتایی بەژیانت دەهێنین.

< من کەس ناناسم، بەچیی دەڵێن سوێندتان بۆ دەخۆم کە نە کەس دەناسم‌و نە ئاگاداری هیچ شتێکم! یەکێکیان گوتی:

گوێ بگرە رەئیسی هەیئە قسەت بۆ دەکات. قسەکانی وەربگرەو چیی دەڵێت جێبەجێیان بکە، چونکە ئەم هەلەت دەخاتە بەردەم. ئینجا رەئیسی هەیئە دەستی بەقسان کرد:

- تۆ پیاوێکی روناکبیرو تێگەیشتویت. خاوەنی پێنج منداڵیت. نەخۆشیت. نەسیحەتێکی دۆستانەت دەکەم کە چەند ناوێك بڵێ‌و خۆت سەرفراز بکە. هەر کە

ناوەکانی لەدەمت هاتەدەرێ بۆ سبەینێ بەرەو ماڵەوە دەڕۆیتو دەچیتەوە ناو ماڵو منداڵی خۆت!

< وەڵلا وەبیللا هیچ نازانم غەدرم لێ مەکەن، ئەوەی ئێوە بەدوایدا دەگەڕێن لای من دەست ناکەوێت. گوتی:

- گوێ لە من بگرەو بەقسەم بکە، ئەگینا پەشیمان دەبیتەوە، خۆت مەخەرە بەردەم ئەشکەنجەو ئازارو مەینەتییەك کە دەتوانیت بەئاسانی خۆتی لێ لابدەیت. بینیت چیی لەبرادەرەکانت کراوە، بڕوا بکە ئەوانە خۆیی چێشت دەبن! بۆیە گوێم لێبگریت بەقازانجت دەگەڕێتەوە.

< بە کەونو کائینات ئاگاداری هیچ نیم. ئەوسا رەئیس هەڵی دایەوەو گوتی:

- دیارەی تۆ پیاوێکی لاساریتو نەسیحەتی باشە نابیستیت. بەقسەی من بکە زەرەر ناکەیت. بەقسەم نەکەیت بەزۆری ئەشکەنجە قسەت پێ دەکەین، خۆ ئەوساکە پەشیمانیشت لێ قوبوڵ ناکەینو لەژێر ئەشکەنجەدا هەر رۆژە پارچەیەکت لێ دەکەینەوە.

که قسەکەم دوبارە کردەوە.

- گوتی جا بۆچی ئەزییەتی خۆمان بدەین بیبەن بە زۆر قسەی پێبکەن..

پاش ماوەیەکی زۆر کورتو کەمێ کێش کردنم بەلایەکی تردا، بەسەرما قیژاندییان خۆت داکەنە.. بیجامەکەم داکەند، گوتیان دەی ئەوانی تریش، کە ئەوەشم کرد، ئەوسا دامیان بەئەرزداو هەردو لاقمیان بەرزکردەوە، کەوتنە بەستنەوەو جەڕاندنیان.. ئینجا کەوتنە لێدانی بنی پێم.. یەکێك لەم دیوو یەکێك لەو دیو، زرمەی ئەو تەواو نابێت هی ئەویتر بەدوایدا دێت. خۆم خواردەوە خۆم خواردەوە.. نەخێر ئازار زۆری بۆ هێنام، دەی خۆ هاوار هاوارو گریان عەیب نییە! خۆ ئەوانە شێوەیەکیشن بۆ کەمکردنەوەی ئازارو دژەکرداری ناو دڵو دەرون.، جگە لەوە ئەی خاوەن ئەزمونی ئێرە نەیاندەگوت تا هاوار هاوارو گریان بەرزبێتەوە ماوەو قورسایی ئەشکەنجە کەمتر دەبێت، نا چۆن دەبێت لەم سەرەتایەدا ئەو دیاردەیە سەردەربهێنێت! دەی خۆبگرەو گوێ مەدەرێ، خۆ بگرەو ماوەیەکی ترە دەبورێیتەوەو ئیتر هەستی ئازارت دەمرێت، ئەوکاتە پێویست بەقیژەو هاوارهاواریش ناکات.. دەی باشە بۆچ نابورێمەوە! کەی بەرگەی ئەم لێدانو ئازارە بەردەوامە دەگرم! من لەژیانمدا نەمتوانیوە بەبێ گۆرەویش بۆ یەك سات بەسەر زەویی ئاساییشدا بڕۆم.. نا.. نا خوادەکات ئەشکەنجە هەروا دەبێت! وا زۆر گرنگ نییەو خۆم دەگرم ماوەیەکی کورتی ترەو دەبورێمەوە.. نەخێر هەر بەردەوامنو گوێشم لێیە بەجنێوەوە دەڵێن خۆ هاواری لەدەم نایەتەدەرێ! خێر قورسایی

لێدانەکەو چڕی تێسرەواندنو توندوتیژییان دەرگای هاوارهاواریان شکاندو وەك بورکان تەقییەوە، بێ ئەوەی مانای خۆڕاگرتن بۆ هاوار هاوار نەکردنم لەمێشکدا مابێت، کەوتمە هاوار هاوار. بەڵام هاوارهاواری دەنگ هەراشێك ئەو ناوەی گرتبۆوە.. ئیتر لەناو زەحمەتیی تێسرەواندنەکاندا هەستم دەکرد توانای هاوارکردنەکەش کەم دەبێتەوەو دەنگم نزمو بەرەو کوژانەوە دەچێت،تا وردە وردە ئاگام لەخۆم نەدەماو کەوتمە ناو دنییای بورانەوەوە.

کاتێ هۆشم بەخۆدا هاتەوە کارەبا لە قوڕگمەوە بۆ کەلەکەم و ئینجا بەناو گەڵمدا دەهێننو دەبەن. هەر ئەوەندە هەستم زیندوبو کە دەرك بەو جوڵە جوڵە بکەم، بێ ئەوەی هیچ دژە کردارێکم هەبێت. دوای کەمەکێك هەستم دەکرد کە فوارەی ئاوە ساردەکە لەشم تەی دەکاتو هێدی هێدی دێمەوە هۆش خۆم. تا دەنگێکم هاتە گوێ: (رەئیس) دەڵێت ئەوەم بۆ بێنن. قیژێنرا بەسەرمدا کە هەستم، نەمتوانی، پەلم گیراو راکێشرامە نزیك دەنگێکەوە. رەئیسی هەیئە موقەددەم عامر موسڵاوی کەوتە قسەی خۆشو تێکەڵ بەهەڕەشە:

- مامۆستا مەحمود من چیم پێ گوتیت! تۆ بۆچیی وا لەخۆت دەکەیت؟ تۆ دەبوایە ئێستا لێپرسراوێکی گەورە بویتایە. تۆ دەبو ئێستا وەزیر بویتایە. رەفیقەکانت هەموو وەزیرن. ئەوە ئوستاز بابەکر، ئەوە ئوستاز شیخ ستار، ئەوە مەلا عەبدوڵڵا! باشە پێم ناڵێیت لەپێناوی چیدا خۆت وا لێدەکەیت؟ ئاخر دەبێت وەڵامی پرسیارێكو ناوبردنی چەند کەسێك چیی بێت! ئەوە دەهێنێت تۆ وا لەخۆت بکەیت! هاوکاریمان بکەو وەڵامی پرسیارەکەمان بەراستیی بدەرەوە. وەعدی شەرەفت دەدەمێ کە هەر ئێستا دەچیتەوە ماڵی خۆت.. خۆ دەزانیت ئەگەر ئەوە نەکەیت چیی دەکەین؟ خۆشت دەزانیت لەکوێیت.. ئینجا دەستی کرد بە سوێند خواردن کە لێرە بەساغیی ناچیتە دەرەوە.. هەمان وەڵامو قسەکانی خۆمم دوبارەکردەوە.. ئیتر ئەمری کرد کە بیبەن بۆ دۆزەخ..

دەبێت ئەم دۆزەخە چیی بێتو کوێ بێت! رەنگە بۆ کوشتن بێت! نا بڕواناکەم کوشتنی چیی! جارێ سەرەتایە. ئەوان ئومێدیان زۆرە کە روخان لەبەردەمدایە، دەزانن کە شت دەزانم، بڕوام وایە کە گومانی بەهێزیشیان لەوە هەیە کە کاردەکەم. بۆیە تا لەوە نائومێد نەبن کە ئیعتیراف ناکەم بیر لەکوشتن ناکەنەوە. لەو خەیاڵانەدابوم کە یەکێکیان گوتی:

- فریای خۆت بکەوەو بە قسەی رەئیسی هەیئە بکە. ئەگینا بۆ کوشتن دەبرێیت. دەڵێی چیی؟ بچین بە رەئیس بڵێین وا ئێستا ئامادەیە قسە بکاتو وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە؟ بابچین، دەی کورە تۆ ئەگەر ئەقڵت لەسەردابێت هەروا دەکەیت! خۆم بەیێوە نەگرت و کەوتم...

> ئێوه بەبێ گوناه من دەکوژن، من هیچم نەکردووه. بڕوام وایه ئێوه لەسزای خوا دەرناچن، چونکه بەناهەق‌و لەسەر هیچ ئاوا لەمن دەکەن.. پرسیارو قسەکانی رەئیس‌و لێکۆڵەرەکانی تر زۆر ساکارو منداڵانه داڕێژراون. نەسیحەتەکانیان بێ ئەقلانەیە. وا دەزانن بۆ منداڵ قسه دەکەن.. ئاخر ئیعتیرافی چیی؟ ناوی چیی‌و هی کێ؟ چونه ماڵەوەی چیی‌و بەرەڵاکردنی چیی! بەراستیی نەسیحەتەکان دۆستانەن نەك دوژمنانه! بۆ سەرفرازکردنه نەك بەداوەوە کردن! بۆ سەربەرزییه نەك کوشتن بەسەرشۆڕیی! منیش بۆ خۆم بڕیارم دابو که قسەو وەڵامەکانم کورت‌و سادەو پوخت بن. لەئاست پرسیارو ئەقڵی ئەواندا بن.. نا نا بڕواناکەم هێندە ساکاربن‌و بەو پرسیارانەوە بووەستن، بڕوام وایه ئەوه پێشینەو سەرەتایەکی سادەیە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی ئاڵۆزو ئەشکەنجەیەکی سەخت..!

لەو بیرانەدا بوم که یەکێکیان هاتو لە پشتەوە دارێکی لەپشتم گیرکردو گوتی بەرز بەرەوە! ئاخر من لەئەرزدا خۆم ناگرم ئیتر بەرزبونەوەی چیی! بەجنێوەوە گوتی دەی چی دەڵێم وا بکە. ناچارو بەلارەلارو شەلەشەل کەوتمە هەنگاونان. کزەو ئازاری بنی پێم لەهەنگاونانداا بەجۆرێکه که دەڵێیت بەسەر ژیلەمۆدا دەڕۆم. رۆیشتم، رۆیشتم لەپڕ سەرم بەردیوارێك کەوت. گوتی بەلای چەپدا وەرگەڕێ. به قسەم کرد. سەرلەنوێ دەستی بەپاڵ نانەوە کرد. هەنگاوم نا، هەنگاوم نا. لەپڕ یەك لەقەم لێدراو بەلادا کەوتم. بێ قسه جێیان هێشتم. ئەم دیاردەیە، بۆ من‌و لەوکاتەدا خۆش‌و ناخۆش بون. ناخۆش بون چونکه لەبەردەم کۆمەڵێك جانەوەردا ئاوا گاڵتەو سوکایەتیت پێ بکەن! نا نا نا سوکایەتی چیی! ئەوه بەشێکه لەئەشکەنجەکەیان، گوێی مەدەرێ! ئەوه شەرەفەو بەشێکه لەبەرگریی لەدژی ئەم رەگەز پەرستانه. ئاوا لەو ساتانەدا دڵی خۆمم دەدایەوە. خۆشیش بو چونکه لەو هەڕەشانەوەو لەبردن بۆ دۆزەخەوە بێته سەر ئەوە.. زۆر باشه هەر زۆر زۆر باشە.. دەی چیی لەم جۆره ئەشکەنجە سایکۆلۆجییانه دەکەن با بیکەن! لەو خەیاڵانەدا بوم که یەکێکیان نزیك بووەوە.. سۆندەیەکیان خسته دەستمەوەو گوتیان بیگره گرتم و راکێشرام. بڕۆ بڕۆ بڕۆ.. دوای ماوەیەك، گوێم لە دەنگی کردنەوەی قفڵ و دەرگایەك بو. چاویان کردمەوەو کردمیان بەژوردا.. چومه جێگەکەی خۆم برادەرەکانم زۆر بەزەییان پێمدا دەهاتەوە. نزیکەکان پرسییان: هەرهەمان پرسیار بو؟ گوتم بەڵێ. ئازارەکەش تا بێت زیاتر دەبێت‌و دەئاوسێ. پاشان سەیرێکی برادەرەکانم کردو هەروەك قسه بەتەنها بۆ قادر بکەم: زۆر سەیره ئەمانه بۆ وا دەکەن. ئاخر ئەگەر سیاسەتم بکردایه بڕوا بکەن پێم ناخۆش نەدەبو. پیاو ئەگەر شتێك بکات وا سزاکەی قوبوڵە! بەڵام من هیچم نەکردوە، ئیتر بۆچی وا دەکەن..!

سەعاتەوەختێك تێپەڕی کردبوو کە سەرلەنوێ ناردیانەوە بەدوامدا. دەی خوایە خۆمن ناتوانم بەرێگەدا بڕۆم، ئێستا چۆن بەرگەی لێدانی تر دەگرمەوە. بەهەر حالێك بو کەوتمە دوایان.. بەهەمان شێوە کەوتنەوە ئەشکەنجە، زۆری نەبرد بورامەوە. وەختێك هاتمەوە هۆش خۆم، ئاوێکی بەگوڕو سارد بەگیانمدا دەکرێت.. سەعاتە وەختێك بەجێیان هێشتمو لەدواییدا بردیانمەوە بۆ ژورەکەمان..

پێش هەموو برادەرەکانم قادر خۆی گەیاندە تەنیشتم، کەوتە شێلانو دڵدانەوەو گوتی ئیتر بڕوا ناکەم بانگت بکەنەوە.. برادەرەکانی ترم بەگیانی پڕ لە بەزەییەوە سەیریان دەکردم، پێم زیاترو زیاتر دەئاوسان، ئازارەکان ژان دەبەنە ناو مۆخیشەوە. بەو حاڵەشەوە قسەکەی قادرم لا نامۆ بو. زۆر لام سەیر بو. چۆن بەیەك ڕۆژو دوو جار ئەشکەنجە دەستبەردارم دەبن؟ ئەی دەبێت بۆچی ئەو قسەیە بکات؟ دەبێت مەبەستێکی هەبێت؟ دوای ماوەیەکی تر سەیرێکی دیوارەکانی کردو لەناو نوسینە تێکەڵو پێکەڵەکانی سەر دیوارەکان (مەژیی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان چۆن قازانج دەکەی تا نەکەی زیان)ی خوێندەوەو گوتی - دەزانیت ئەوەهی کێیە؟- گوتم نا. - چۆن؟- چاك. ئەسڵەن من هەر حەزم لەشیعر نەبوەو هەر ناشمەوێت بزانم هی کێیە. دەمزانی قالە ئەم وەزعە بەهەل وەردەگرێو دەیەوێت سودێك وەربگرێت. من لەخۆشم بێزار بوبومو دەمویست وازم لێ بهێنێت..

بۆ بەیانیی ڕاستەوخۆ دوای نانخواردن، بانگکرامەوەو ڕاپێچی بەردەم لێکۆڵەران کرام. کەمێ وەستاندمیانو ئەمر کرا: بیبەن. دیسان وەك دوێنێ ڕوت کرامەوەو بەپێوە دەستکرا بە بیراز کردنم.. دەکەوتمو هەڵیاندەساندمەوە، هەستم دەکرد کە لەهەمو لایەکەوە سۆندەم بۆ دێت، دیارە ئەم قوڕمساغانە بەڕاستییانەو لەژێر لێداندا دەمکوژن. ئەمە لێدانی کوشتنە. دەی وا خەریکە لەسەر خۆم دەچم. لەناو زرمو کوتی ئەوانو هاوار هاواری منو زیندانییەکاندا لورەی ئینزار بەرزبووەوە. هاتوچۆو دەنگە دەنگی شڵەژانی جەللادەکانو فریاکەوتنی بردنەوەی زیندانییەکان بۆ ژورەکانی خۆیان تا فریای خۆگەیاندنە شوێنی خۆپاراستن لەبۆمبباران بکەون. هەست پێدەکرا، یەکێك هات وتی: دە خێرا جلەکانت هەڵبگرە. ئەوسا بەپەلەپەل کێشیکردمە ناو ژورێکەوە، حەمامێکەوە دەرگای لەسەرم داخست، ماتیو بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو شوێنەدا کێشا، زۆری نەبرد دەنگی بۆمبباران بەرزبووەوەو مەنگیی بێدەنگییەکەی نەهێشت. دەی خوایە دەی ئاسمان، ئێرەش بگرێتەوە. سەیرە هەروەك بۆمباکان ئەگەر بەسەر ئێرەدا ببارێنرێت، ئێمە نەگرێتەوە. هەر بەدڵو لەناو ویژدانمەوە حەزم دەکرد ئەم خانوانە بەر بکەون، ڕەنگە ئومێدێکی سەرفرازیی بەدەمەوە بێت. بێ ئەوە ڕزگاربون ستەمە. جگە لەوە ئەم جانەوەرانەش بێ ئارەق

دەرناچن. دوای ماوەیەك دەنگی بۆردومان نەما. لورەی ئینزاری نەمانی مەترسیی بەرزبووەوە. ئیتر وردە وردە دەنگە دەنگ پەیدا بووەوە. دواییتر لێکۆڵینەوەو لێدان دەستی پێکردەوە. منیش بەهەڵتوتانەوە چاوەڕوان بوم تا بێنەوە بەشوێنمداو بمخەنەوە بەردەم ئەشکەنجە. کەس دیار نییە. کات تێپەڕ دەبێتو نەهاتن بەدوامدا. جلەکانم لەبەر کردەوە، ئیتر ناوی جلەو دەبێت هەروا ناوی ببەم. سەیرە ئەی قابیلە لەبیریانکردبم.. دەی قەیدی چییە، لەئەشکەنجە رزگارم دەبێت.. با هەرنەیەن.. نا بڕواناکەم لەبیر بچم.. دەی باچاوەڕوان بمو بزانم چیی رودەدات.. زۆر بەسەر ئەوەدا تێپەڕ نەبو کە غەڵبەغەڵب پەیدا بووەوە. وەختێکم زانی هاوار هاوارو گریانی ئەشکەنجە دراوان بەرزبووەوە من هەر میوانی حەمامەکەم. ئیتر کەوتمە بیرکردنەوەو لێکدانەوەی لەبیرچونەوەم. باشە قسە بکەم یان چاوەڕوان بم! تۆ بڵێیت لەسەر ئەمەش لێدانی تایبەتیی‌و سزای خۆی نەبێت؟ نا نا باشتر وایە لەدەرگا بدەم دوای ماوەیەکی باش، تەق تەق بەدەست کێشام بەدەرگاکەدا. ها کێیە ئەم تەقە تەقە چییە لەناو حەمامەکەدا؟ لەپڕ یەکێکیان هاواری کرد، ئەمەی حەمامەکە، ئەوەی ناو حەمامەکە.. خێرا دەرگاکەم لێکرایەوەو کەوتنە سۆندەباران بەسەرمدا. چی دەکەیت لەوێدا؟ چۆن کەوتویتە ناو ئەو حەمامەوە؟ گوتم خۆتان منتان هێناوە. دەیاننەڕاند باشە بۆچی دەنگت نەدەکرد؟ لەکاتی ئینزاری فرۆکەکاندا خۆتان منتان گەیاندە ئێرە. واشم زانیوە خۆتان دەتانەوێت لەوێ بمێنمەوە. ئیتر دەبێت گوناهی من چیبێت. دیار بو فرۆکە جەنگییەکانی ئێران وای تۆقاندبون کە حاڵیان لەحاڵی ئێمە خراپتر بێت، بۆیە بەم پرسیارو لێدانە دەیشارنەوە.. ئینجا لێم پرسرا لەچی ژورێکیت، کە گوتم یەك، ئیتر بەرەو ئەوێ کێشیان کردمو کردمیانەوە بەژوردا. دیسان هەموو لێم کۆبونەوەو دەستیان کردەوە بەپرسیار.. منیش بۆم گێڕانەوەو پرسیاری خواردنم کرد.. گوتیان جارێ کاتی نەهاتووە.. برادەرەکانم بەگیانێکی بەزەیی سەیریان دەکردم، کەمال‌و شێخ عەبدول دەرفەتێکیان دەستکەوت دەیانویست لە وەزع‌و ورەم بگەن..

چەند زیندانییەکی تر..

لە یەکەم رۆژی گرتنەکەوە، زۆر مەراقی دەنگ‌و باسی سلێمانی بوین، حەزمان دەکرد بزانین دوای ئێمە دۆخەکە چیی لێ بەسەرهاتوە. ئایا کاری دژ بە رژێم بەردەوامە.. ئەی چۆن دەنگ‌و باسی گرتنی ئێمە بەناو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە. چونکە ناوەرۆکی ئەو پرسیارە سادەیەی لێکۆڵەران ئەوەیان دەگەیاند کە ئێمە لەتێکدانی ئاسایش بەرپرسیارین. ئیتر وام لێك دەدایەوە کە ئەگەر ئارامیی‌و بێ چالاکیی باڵ بەسەر سلێمانیدا بکێشێت‌و ئەوە بەردەوام بێت، وا گومانەکەی ئەوان راست

دەردەچێت و لە چنگیان رزگارمان نابێت. خۆ ئەگەر چالاکییەکان هەر بەردەوام بن وا ئەو شكو گومانە بێ بنچینە دەمێنێتەوە.. هەرچی چۆنێك بێت وا ئەمڕۆ ئەم میوانە نوێیانە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەنەوە..

دیاردەی نوێ لە فەرهەنگی بەعسدا: لەزەت وەرگرتنە لە ئەشکەنجە..!

ئەمڕۆ ٢٥- ١٠ لەناو خەیاڵی قورسترکردنی ئەشکەنجەدا چاوەڕوانیی بانگکردنەوە دەکەمو جارێ هیچ دەنگ نییە.

دوێنێ مەحمود قەراخی لەگەڵ مەغدیدی کوێخا عەبدولاو سەرداری کەستەن بەگ، لەسلێمانی دەگیرێن، وا ئەمڕۆ پێش سەعات ٩- ی سەرلەبەیانی بون بە هاوڕێی ئێمە. هەر لەو دەوروبەرەدا سەرداری حاجی قادریش دەهێننە لامان. ئیتر کۆی هەمومان بوینە ٢٨ کەس.

بەهۆی خەباتی سیاسیو رێکخستنەوە دەمێك بوو مەحمود قەرەداخیم دەناسیی. یەکێکە لە تێکۆشەرە کۆنو نەگۆڕەکان. ئەمیش مامۆستای قوتابخانەی سەرەتاییە. هەرکە کردیان بەژوردا کەوتینە پرسیارکردن لەدۆخی سلێمانی لەدوای گرتنی ئێمە. گوتی:

> ئەو گرتنەتان دەنگی دایەوە، بووە هۆی شڵەژانی زۆر کەس، هەموو تێکۆشەرو خاوەن رابوردوو ناوبانگ باشەکان لەترسی گرتن کەوتنە خۆیان، من لە سەرەتادا خۆم شاردەوە. لەپاش شەش رۆژ کە زانیم کەسی تر ناگیرێو بەدوای منیشدا نەگەڕابون، هاتمە سەر جادەو لەبەر ئەسحابە سپیدا گرتیانم. شەوێك لە ئەمنی سلێمانی هێڵرامەوە وا ئەمڕۆ وا هێنایانم بۆ ئێرە.

لەگەڵ گەیشتنیدا نەیانهێشت بحەسێتەوەو پرسیاری زیاتری لێ بکەین هاتن بەدوایدا. پێش دەستکردن بە ئەشکەنجە. لایەکی سمێڵیان تاشی. ئەم شێوەیە لە ئەشکەنجەی دەرونیی، سەرەتایەك بوو بۆ دەرککردن بەوە کە بەتەنها ئەشکەنجەی گیانیی لەگەڵ ئەم بێسودە..

دوای ئەوە کەوتنە لێدان لە بنی پێ، هەڵواسین.. تا دەوام تەواو بوو، ئەوسا هێنایانە بەر دەرگای ژورەکەمان بە عەمودێکی ئاسنینەوە کە هەردوو مەترێ لە قاپییەکەوە دوور دەبێ بەسترایەوە تا دەوری سەعات دوی شەو بەلێدان و هەڕەشەو ئاوپێداکردندا مایەوە. ئەوسا بە شەکەتییو پڕوکاویەوە کردیانەوە بە ژووردا...

تاشینی لایەکی سمێڵیشی راستەوخۆ سەرنجی رادەکێشا، بە زەردەخەنەیەکی خۆی ئاساییەوە کە نیشانەی شانازیکردن بەخۆو گاڵتەکردن بوو بە ئەشکەنجەی دوژمنان گوتی:

ئەو بێشەرەفانە سەرەڕای ئەم هەمو ئەشکەنجەیە پێم دەڵێن:

"تۆ لەزەت لە ئەشکەنجە وەردەگریت بۆیە ئیعتیراف ناکەیت".

ئەمیش وەك هەمومان هیچ بەڵگەیەکی تاوانبارکردنی لەسەر نەبو. ئەوە نەبێت کە تێکۆشەرێکی کۆنو ملی بۆ ملهوڕیی دوژمن دانەنەواندووە. جگە لەوە روداو و گرتنی کۆنیشیان بۆ بوژاندۆتەوە. دەیانویست راستییەکان لەزاری خۆی وەربگرن. چونکە کاتی خۆی بە ئەمنستی بەر بوبو. گومانیان لەوە نەبو کە کاتی خۆی کاری کردوەو ئاگاداری هەندێ روداوە بەتایبەتیی لەدەربەندیخان. ئەمیش نکوڵیی لە هەمو شتێك دەکردو ئامادە نەبو بچوکترین قسەیان بسەلمێنێت.

ئەگەر ئەمنستی نەبوایە وا نە ئەمو نە جەمال تایەر سەرفراز نە دەبون.

هەروەك جەمال دوای بەربونەکەی باسی حەپسیی‌و ئەشکەنجەدانی خۆیانی بۆ کردمو بۆی گێڕامەوە کە:

بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانیی پێی گوتم: من دەزانم تۆ ئیش دەکەیت ناوی نهێنیت "سەرکەوت"ە، ئەگەر ئەمنستیی "سەرۆك سەددام" نەبوایە وازم لێ نەدەهێنایت! بەڵام بڵێم چیی فرمانی "سەرکردەی قائیدە" و دەبێت جێبەجێ بکرێت.

بۆیە مەحمود قەراخی لای ئەمنی سلێمانی ناسراوو جێگەی گومان بوو. بەهۆی ئەو گرتنەشییەوە ببوە خاوەنی ئەزمونی شێوەی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەی بەعسییەکان.

ئەمڕۆ یەك شەممەیەو ٢٦ی مانگە، دووەم رۆژی بانگکردنی مەحمود قەرەداخییە لەگەڵ دلێری شێخ مستەفادا بانگکرا.. دوای دەوام بە ئەشکەنجەو ئەزییەتدانێکی چاوێنییەوە هێنایاننەوە ژوورەکەمان.

دوای دووسێ رۆژ دارای کوێخا عەبدوڵڵا. بانگکرا، دوای ئەشکەنجەیەکی خەستی سێ چوار سەعاتیی بەهەڵواسین‌و سۆندە شپرزەیان کردو کردیانەوە بەژوردا. ئەمو مەغدید دوو کوڕی کوێخا عەبدوڵڵا بوون، باوکیان پێشمەرگەیەکی ئازاو دڵسۆزی بەرەی مەکتەبی سیاسیی بوو، ئەمیش قوربانییەکی ناو شەڕی براکوژیی بوو. دوو جاری تر دارا بۆ ئەشکەنجە برا..

ئەمڕۆ ٢٩ی مانگە راستەوخۆ دوای نانی بەیانیی، شەقێك بەدەرگاکەدا کێشراو هەمومانی خستە ناو خەیاڵی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە، چونکە هەریەکە گوێ بۆ ناوی خۆی هەڵدەخاو خۆی لەبەردەم ئەشکەنجەدا دەبینێتەوە. مەحمود بانگکرا، یەکسەر بە عەموودەکەوە بەستیانەوە. ئینجا کەوتنە سۆندە بارانی، لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئاوە ساردەکەشی پێدا دەکەن. ناوبەناویش لێی دەچنە پێشەوەو

پێیدەڵێن: باشترە ئیعتیراف بکەیت ئەگینا بەم عەمودەوە دەمریت.. ئەویش خۆی مت کردوەو وشە لە زاری نایەتە دەرەوە.

کاتی چونە سەر ئاودەست هات، بەتەنیشتیدا تیپەڕ دەبوین. هەردوو هەنگاوێك لێمانەوە دورە.

نانی شێو خوراو ئەوی لێ بێبەشەو بە بەستراوەیی لەژێر ڕەحمەتی ئاوی ساردو لێدان و هەڕەشەو جنێودایە.

شەو بەسەردا هات ئەو لەژێر ئەو بارە قورسەدا نرکەی بۆ ناکات. هەر ئاوی پێدا دەکریو داوای ئیعتیرافی لێ دەکەن.. وا بیرم دەکردەوە کە دوای چوار سەعاتێ ئەشکەنجەو ئەو شەش حەوت سەعات هەڵواسینە ئیتر وازی لێدەهێنن.. ئەگەر شەو درەنگانێکیش بێت هەر دەیکەنەوە. هەر لەهەمان کاتدا بە خۆم دەگوت: نا ئەم سوربون و شێوەی ئەشکەنجەیە هی ئەوە نییە کە دەستبەرداری بن، ئەی قابیلە بێ هەڵکڕاندنی شتێك دەستبەرداری بن! یان نایەڵن لەژێر ئەشکەنجەدا دەربچێت.

بەدرێژایی شەو تا درەنگانێك هەرچی هۆش و گۆشم هەیە چڕم کردبووە سەر ئەو قسەو جوڵانەی بەردەرگاکەمان، تا بزانم چی لەچارەنوسی هاوڕێکەم دەگەم. بێئەوەی هیچم لێ حاڵی ببێت. ئەوە نەبێت کە بەردەوام سۆندەکەی لەسەرەو ئەو ئاوە ساردە بەخوڕەی پێدادەکەن، خێرا خێراش پێیدەڵێن دەی ئیعتیراف بکە ئەگینا دەتکوژین.

بەخەفەتی ئەوەوەو چاوەڕوانیی هەمان چارەنوس خەوم لێ کەوت. کە بەیانی ڕۆژی ئاینده ۳۰- ۱۰ لەخەو ڕایان پەڕاندین بۆ چونە سەر ئاودەست، سەیرمان کرد ئەوە خۆ هەر بە عەمودەکەوەیە، شل بوەو هەرچی ناوی جوڵەیە لێی نابینرێت. لەسەر ئاڕاستەکردنی سۆندەی ئاوەکەش هەر بەردەوام بونو خێرا خێرا پێیان دەگوت: بۆ ئەوەی لەو مەینەتییە ڕزگاربیت دەبێت ئیعتیراف بکەیت. هەروەك مردو دێتە بەرچاو، نەجوڵەو نە نوزەی تێدا نەماوە. ڕەنگە لەسەر خۆی چوبێت. جا چۆن نابورێتەوە، ئەو بەو وەزعەوە وا بیستو چوار سەعاتیشە نانو ئاو نەچۆتە سەردەمی، نەچۆتە سەر ئاودەست..

تاقی بەیانی لەگەڵ بانگ کردنی چەند کەسێکمان، ئەو هەر بە هەڵواسراوی ماوەتەوە. نانی نیوەڕۆ هاتە پێشەوە، دەنگی کردنەوەی نیە. زیاتر لە ۳۷ سەعات مایەوە. دەی خوا فرسەتت بدا کوڕی ڕۆژی زەحمەتیی!

کە هێنایانەوە ژورێ، تەواو پەکی کەوتبو. نەیدەتوانی بجوڵێتەوە، قسەی بۆ نەدەکرا، شکم لەوە هەبو کە بیەڵن لەژێر ئەشکەنجەدا بەساغی دەربچێت. کە نزیکتری بومەوەو زانیی کێم، چاوێکی هەڵبڕیو سەیرێکی کردمو گوتی:

> مامۆستا تۆ بڵێت وازم لێبهێنن؟ بەهەمان سرپە گوتم:
لام وایە ئەوە لوتکەی بەرنامەی ئەشکەنجەکەیەو ئەگەر وازیشت لێنەهێنن وا بەرە بەرە ئەشکەنجە کەمتر دەبێتەوە.
گیانی بەزەیی‌و خۆشەویستیم بۆ ئەو خۆگریەی، خوێنی گەرمی دەزگای سوورانەوەی خوێنمیان هێنابووە قوڵپدان. چونکە ئەو هەڵوێستە ئازایانەی بو بە نمونە بۆ ئەشکەنجەدراوانی تر کە گیانی خۆگریی‌و نەبەزینیان تیا بەهێزتر دەبێت.
هەرچەندە گەلێك قسەم بەنیازی دڵدانەوە بۆ کرد، چونکە هەستم ئەکرد دەبێت شتێك بڵێم، ئەگینا دەزانم‌و گەیشتبومە ئەو بڕوایە کە مەحمود قەرەداخی پۆڵایەو شکاندنی بۆ نییە. ڕۆژی ئایندە سەرلەنوێ بانگکرایەوە، ڕەفتاریی ئەم ئەشکەنجەیە ئەوەی بۆ دەدرکاندم کە بڕیاری کوشتنی درابێت. پاش چەند سەعاتێك هێنرایەوە.. تیشکی ئاسوودەیی خۆی کردە ناو دڵ و دەرون چونکە بۆ خەستەخانە برابوو کە چوومە نزیکیەوە و کەوتە سرپە تێیگەیاندین کە دوژمن لاوازەو بیروباوەڕو کوردایەتی زۆر بەهێزەو گوتم: لە ڕاستیدا وا بیرم دەکردەوە کە ئەم هەیئەیە پڕە لە ئامرازو کەرەسەی سەردەم بۆ ئیعتیراف پێکردن، کە ئەوەش بۆ خۆی پیاو دەتۆقێنێ. کەچی هەرهەمان ڕێبازی کۆن و ئەشکەنجەی ملهوڕەکانە، هەرچەند پڕوکێنەرو بە ئازارو کوشندەن، بەڵام بۆ پاڵەوانێکی وەك مەحمود جێگەی پێکەنین و گاڵتەن

## کاتێ کە ویژدان دەژاکێت!

ئەو دیمەنەی مەحمود قەرەداخی ئەشکەنجەکەی خۆمی لە بیر بردمەوە. بەخۆشمم دەگوت تۆ بڵێی بەرگەی ئەو هەڵواسینە دورو درێژەو سەرمای ئاوپێداکردن‌و لێدانەکان بگرم! من وام مەزەنە دەکرد کە ئەوانە بەشێکن لە شەڕی دەرونی. بۆیە دەبو خۆم بۆ ئەو جۆرە ئەشکەنجانەش ئامادە بکەم. بەتایبەتی لەناو ئەو پرسیارانەی خۆم‌و ئەو مامەڵەی ئەشکەنجەو سوکایەتی پێکردنانەدا، بێزم لەژیان دەکردەوە. لەگەڵیشیاندا گیانی بەربەرەکانیم تیا بەهێزتر دەبو. بڕیاری خۆڕاگریی ناوقوڵایی هۆشم چەسپیو تر دەبو، هەروەك پەیکەریکی درەوشاوە لەناو ئازارو ئەو خەیاڵانەدا جێگەی خۆی دەکردەوە. بەتایبەتیی هەر لەسەرگومان‌و بەبێ بەڵگەو بێ شایەت دەبێت بۆچی وامان لێبکەن!
باشە خۆ من ئەمانەم باش دەناسیی. لە هەمو سەردەمەکاندا وام دەردەخست کە لەهەمو کەس باشتریان دەناسم، بۆیە مامەڵەکردنیان بە سنوری سور بڕینم دادەنا. ئیتر لەو ساتانەدا کەوتمە گلەیی لەخۆم‌و لە مانەوەم لەبەردەست‌و لەژێر سایەو سێبەری ئەو بەعسیانەدا. جا پەشیمانی لەمانەوەو لە چڕ نەکردنی خەبات بۆ ئێستا

چی کەڵکێکی هەیە! هەستم دەکرد کە ئەوە دەبێتە دیاردەیەکی زەق لەئاییندەی ژیانی سیاسیمدا، ئەگەر بەساغی لەم زیندانە دەربچم. بۆیە بڕیاریشم دا کە لەسەر فرازبونمدا ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەمەوە.

یەکێك لەو دیاردە زەقانەی ژیانیی سیاسیم کە هۆیەکی ئەو مانەوەیەم بو، ئەوە بو کە لەساڵی حەفتاو پێنجدا بڕیارم دابو کە جارێکی تر لەناو خەباتیی سیاسیدا ئەوەی ناوی لێپرسراوەتییە، بەلایدا نەچمەوە. دیارە هۆیەکانی ئەوە زەق و لەجێگەی خۆیدا بون. بەڵام بەرامبەر بەمەش، بەربەرەکانی ئەم دوژمنە لەوێنە نەبوە، هەڕەشەی ئەم سەرەتانە، لەوە گەورەتر بو کە پیاو بە بڕیارێکی واوە خۆی ببەستێتەوە.

بەتایبەتیی دوای وتوویژە بەزیانەکەی مەلا مستەفای رەحمەتی کە بووە هۆی خولقاندنی سەرەتانی شەڕی ناوخۆو هەڵە دوولایەنییەکەی شەست و شەش، بڕیارمدا کە لە سیاسەت دوور بکەومەوە. بەڵام گەلێك هۆ، لەسەرو هەموویانەوە، دڕندەییو رەگەز پەرستیی رژێمەکانی بەغدا، بونە کۆسپ لە بەردەوامبوون لەسەر ئەو بڕیارە.

خۆ ئەم دوژمنە سەرەکییەو ئەو پەلامارە شێتگیرانەیەی نەتەوەکەم تەنانەت بەرووخاندنی شۆڕش و ئاشبەتاڵی سەرکردایەتییەکەشی دەستبەرداری چەوساندنەوەو نەخشەی لەناوبردن نابێت. ئەو هەڕەشەیە: لەلایەك، لەبەرامبەرەکەشی:

ئەو هەڵەو دیاردانەی لەسەردەمە جیاجیاکاندا رووبەڕوو دەبونەوەو روخساری خەباتو رەوشتی شۆڕشگێڕێتیان ناشیرین دەکرد لەگەڵ ئەم بڕیارەی مندا.. چۆن پارسەنگیان رادەگیرێتو لەمێشکی یەك مرۆڤدا کۆدەکرێنەوەو لەگەڵ یەك دەگونجێنرێن؟ هەڵنەبژاردنی لایەکو خۆ نەخستن بەلای دروستدا شتێکی مەحاڵەو دەبێت قوربانیی بەهەندێك شت بدرێ.

بێ هیوایی لەهەڵە زەق و قەبەکانی کاروانی لەوەوبەری بەرەی گەل، ئەو بڕیارەیان بەسەرمدا دەسەپاند. لەلای بەرامبەرەکەش، هەڕەشەی رژێمی بەعس بو کە بەو جەنگە پیسە لەناوبەرە، بوبوو بەو ناکۆکییە سەرەکییە رووبەڕووبووە خۆلێلانەدەرە کە دەبێت هەڵوێستی بەرامبەر وەربگیرێت، هەڵوێستێك کە لەخزمەتی بزوتنەوەی نیشتمانییو لەدژی ناکۆکییە سەرەکییەکە بێت.

باشە لەو میانەداو لەناو ئەو دوو دیاردە ناکۆك و دژە بە یەکەدا چارە چییە؟

لە نەخشەی سیاسیو شێوەی رابەریکردنی جەماوەر زۆر بێئومێد بوبوم. ناکۆکیو ململانێی نێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسیی کە لە کۆنگرەی پێنجەمەوە لەسەر دەسەڵات لەسەر کردایەتیی پارتیدا دەردەکەوت.. تا گەیەنرایە شەڕی ناوخۆو لەتکردنی پارتیو شۆڕش.

دواییتر گواستنەوەی شەڕی ناوخۆ بۆ كوردستانی ڕۆژهەڵاتو ڕاوكردنی تێكۆشەران لەلایەن سەركردایەتیی بارزانییەوەو تەسلیمكردنیان بە ڕژێمی شا، بە زیندویی یان بە كوژراوی كە لەوەدا تاقمێكی هەڵبژاردە لە تێكۆشەرانی لێپرسراو، بەتایبەتیی: سلێمانی موعینێی، عەبدوڵای موعینیی، مینەشەم، مەلا مەحمودی زەنگەنە، ئیسماعیلی شەریفزادە، مەلا ئاوارە، قاسم وەستا خانە، نحۆ.. تاد) كەوتنە بەر ئەو شاڵاوی مەرگە. جگە لەوانە، كاتی خۆی سەركردایەتیی پارتیی، بەفرمانی میت، "سەعید ئالچی" ڕێبەری باڵێكی پدك- ی توركیا دەكوژێت. هەر لەناو هەمان نەخشەدا "د. سەعید قرمز توپراخ- د. شڤان- " ڕێبەریپدك- توركیا بەوە تاوانبار دەكەن، ئیتر بارزانیی دوكتۆر شڤانو چەندئەندامێكی تری سەركردایەتی ئەو حیزبە، لەوانە "بروسك و چەكۆ" دەكوژێت..

درێژەپێدانی شەڕی ناوخۆ، بەوتراجیدییە سیاسییانە، بنەماكانی كوردستانیكردنی كوردایەتیو بەرژەوەندیی نەتەوەیی كوردیان هەڵدەتەكاند..

لەگەڵ ئەو شێوەی ململانێیەی لە دامەزراندنی كۆمەڵەدا خولقێنرا، هەرەسو تراجیدییەكانی. ئەوانە هۆی سەرەكی بون لەگومان دروستكردن لەسەر نەڕەخسانی هەلومەرجە خۆییەكان بۆ شەڕی چەكدارانە.

بەرپابوونی شۆڕشی نوێو سەرلەنوێ دروستبوونەوەی شەڕی براكوژیی. ئیتر لەوانەشەوە بۆ دور كەوتنەوە لەچالاكیی زۆر دیارو لێپرسراوێتی. هەر ئەوەش وایكرد كە گوێ لەداواو داخوازیی هەندێ لەبرادەرەكانم نەگرمو هەر لەسنورێكی تەسكدا كاری سیاسیی بكەمو زیاتر بیر لەنوسین بكەمەوە.

لەیەكێك لەو نامانەی (نەوشیروان مستەفا) بۆی دەناردم، لەسەردەمی نەفیكردنم لەڕەمادیو پێش نەقڵبونەوەم بۆ سلێمانی، گلەیی لێكردبوم كە بۆ ناكەومەوە ڕۆڵبینینو كەی ویژدانم دەجولێت..! بۆخۆشی دەیزانیی ویژدانی من زۆر لە زووەوە جوڵابو. خۆی دەیزانی كە ویژدانم لە گەرمەی جوڵەو بزوزیدایەو هۆی ئەوە دیاردە پڕ لە زیانەكانە.

لەناو گەرمەی حەماسەتی خەبات و هەرەتی لاوێتیم و سەرەتاكانی كاری سیاسیدا ویژدانی نەتەوەییم بریندارو ژاكاوو بێ هیوا كرابو. لە سەرەنجامی ئەوانەدا، هەرچەندە لەسیاسەتی ڕژێمی بەعس وا تێگەیشتبوم كە ڕۆژێ لەڕۆژان بیر لەوە ناكاتەوە كە بییەڵێت كورد بەئارامیی، تەنها بەئارامیی وەك نەتەوە، وەك گەل، وەك مرۆڤ لەسەر زەویی نیشتمانی خۆی بژی. لە سەرەنجامی هەرەس و نەخشەی بەپەلەی ئەو ڕژێمە بۆ هەڵتەكاندنی قەوارەی نەتەوایەتیی كوردو گۆڕینی باری دیموگرافیی كوردستانو بەعەرەبكردنی، بەشێوەیەك بون كە دەیویست ئەم

میللەتە وەك نەتەوە شوێنەواری نەهێڵێت بۆیە کەوتمە ناو حاڵەتێکی تەواو پێچەوانەوە. دەمگوت ئەگەر (کوێخا رینگۆ)ش لەسەر تەقو تۆق بەردەوام بێت چەپڵەی بۆ لێدەدەم. دەی وەرە ئەم دوولایەنە ناکۆکو دژ بەیەکە کە لەمێشکی مرۆڤێکدا کۆبونەتەوە لابەلا بکە،دروستەکەیان هەڵبژێرەو لەهەڵە یا لە نەگونجاوەکە، یان لەوەی بۆ ئەوسەردەمە ناسازو نەگونجاوو بەزیانە جیابکەرەوەو بڕیارێکی گونجاوبدە!

هەر ئەو هۆیە گرنگەی ناو ئەو ناکۆکییە دەروونییە پاڵی پێوە نابوم کە بێ لێکدانەوەی هەڵەو پەڵەی کۆنو لەناو گوشاری برادەرەکانم بۆ کارکردن، دوای دەسپێکردنی شۆڕشی نوێ (١ی حوزەیرانی ١٩٧٦) لەگەڵ کۆمەڵەو یەکێتیدا لەو ئاستەی بۆ خۆمم هەڵبژاردبو کار بکەم. لەنوێ بونەوەی شۆڕشدا گەلێك برادەر دەیانویست چالاکیی کاری سیاسیی دەست پێ بکەمەوە، بەتایبەتیی:

حەمە چاوشین، جەمال تایەر، حەمە سابیر، عەزیز مەحمود، ئارام، پێش ئەوەی لەگەڵ نەوشیروان ئاڵوگۆڕی نامە دەست پێبکات. سەردەمێکی پێشتریش ئارام بە نامە حەزو خواستی خۆی دەرخستبوو کە بکەومەوە چالاکیی کاریگەر،بەڵام بیرو بۆچوونەکانی لەسەر هەمان نەزمی سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵە بوو. هەر لەو ماوانەشدا مام جەلال بەنامە داوای رۆڵبینینەوەی چالاکانەی لێدەکردم.

بەڵام فاکتەرو هۆکانی ژاکاندنی ویژدان زۆرو گرنگو وەرچەرخێنەری رەوتی ئاسایی بزوتنەوەی نیشتمانیی بون..ئەم بیرکردنەوانەو گەلێ لە وردەکارییەکانی رووداوی تری سەردەمەکان وەك فیلمێك دەهاتنەوە بەرچاو.

هەر ساڵێك دوای بەرپاکردنی شۆڕشی ئەیلول دیاردەی ناکۆکیی نێوان مەکتەبی سیاسیو بارزانیی لەئاستێکی زۆر تەسکدا دەردەکەوت، بەتایبەتیی بەهۆی بونی چەند کەسانێکی دژ بە مەکتەبی سیاسی، لەوانە ئەحمەد توفیق (عەبدوڵلای ئیسحاقی) شێخ محەمەدی هەرسین، حەمەی عەزیز، کە لەبارەگای بارزانیدا لەبەهاری ١٩٦٢وە "دیسان بارزانی" یان بڵاو دەکردەوە کە بەنزینێ بو دەرژێنرا بەسەر ئاگری دووبەرەکیی ژێر پەردەدا.

لەئۆکتۆبەری ئەو ساڵەوە ئەندامی لقی سلێمانی بوم کە لە: عەلی حەمدی (مەردان) لێپرسراو، بەندە یاریدەدەری لێپرسراو، مەحمودی حاجی توفیق) پێك هاتبو. ئەرکی نوسینو وەڵامی نامە بەرەو رووی من کرابۆوە، چەند جارێك نامەمان بۆ بارزانی نوسییو مەترسی ئەو دیاردەیەمان دەخستە پێش چاو، بێ ئەوەی سودێکی هەبێت.

لەناکۆکییەکانی ناو کۆنگرەی کۆیە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی بەعس (١٩٦٣)، ململانێیەکە رویەکی بێ پەردەو زیاتر ئاشکرای هەبو. ئەگینا تەنها دیاردەیەك کە

پێشتر ئەو ناکۆکییانەی لەناو دەرەوەی شۆڕش و پارتییەکەدا ئاشکرا کرد، دیدەنییەکەی ڕۆژنامە نوسی ئەمەریکایی "دانا ئادەم شمیس" بو کە لەمیدیای دنیادا بڵاوکرایەوە.. بەڵام ئەوە لێفەیەکی بەسەردا درا.

لای من ئەو دیاردەی ناکۆکییە زۆر نامۆ نەبو، چونکە پێشینەی خۆی هەبو. هەر ساڵێك دەبو کەناکۆکیو ململانێ لەسەر سەرکردایەتیی پارتی لەلایەن بارزانییەوە بەدورخستنەوەی تاقمی هەمزە عەبدوڵڵا کۆتایی پێهێنرا (دواییتر لەکۆنگرەی چوارەمدا- تەمموزی١٩٥٩، ئەو تاقمە دەرکران).کەچی زۆری نەبرد کە دووبەرەکییەکی نوێ سەری هەڵدا. کۆنگرەی پێنجەم(ئایاری ١٩٦٠) شانۆی تەقینەوەی بو. زۆر هەوڵدرا تا بارزانیی ئامادەی کۆنگرە بێت، سەرەنجام تەنها لەدوا کۆبونەوە ئامادەبو. لەوێشدا چەندی توانی قسەی دور لەگیانی پارتایەتیی خۆی لەدژی ئەندامانی م. س کرد، لەهەڵبژاردنیشدا، لیستەی ناوی پاڵێوراوان لەسەر تەختەیەکی ڕەش نوسرابو کە لەسەرو هەموویانەوە ناوی مەلا مستەفا بوو، خۆی ناوەکەی خۆی کوژاندەوەو لەشوێنەکەی ناوی ناهیدەی شێخ سەلامی نوسیی، و دەنگیشی هەر بۆ ئەو و بۆ ئیسماعیل عارف داو بارەگای پارتیی بەجێ هێشت.

بۆ ڕێگەپێدانی نوێنەرانی: کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا بۆهاتنە بەغداو ئامادەبون، لەکۆنگرەی یەکێتیی گشتییقوتابیانی جیهان کە ناویان خرابووە ناو لیستەی قەدەغە کراوانەوە، وەفدێکی قوتابیانی زانکۆی بەغدا سەردانی بارزانیمان بۆ ئەو مەبەستە کرد، ئەوە یەکەم جارو دووا جاریش بووکەوا ڕووبەڕوو لەگەڵ بارزانیی دابنشیم. هەرکە باسەکەمان کردەوە، تاتوانیی قسەی بە ئەندامانی مەکتەبی سیاسییو بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەی خەبات گووت بەرادەیەك کەلە کۆتاییدا گوتی: دەی چیتان دەوێت بینوسن تا بۆتان ئیمزا بکەم، ئێمە لە داواکەمان پەشیمان بوینەوەو سوپاسمان کردو خوا حافیزیمان لێکرد.

ئەگەر هەرزەیی سەرکردایەتیی حیزبی بەعس نەبووایە وا ناکۆکیی نێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسیی لەسەردەمی گفتوگۆی نێوانیاندا (١٩٦٣) دەتەقییەوەو بۆ شەستو چوار دوانەدەکەوت.

گفتوگۆی نێوان بارزانیو موشیر عەبدولسەلام عارف لە شوباتی ١٩٦٤دا ڕاستەوخۆ ناکۆکییەکەی تەقاندەوە،چونکە ڕێککەوتنەکە هیچ مافێکی بۆ کورد مسۆگەر نەکردبو. مەبەستی بارزانیش لەخودی ڕێکەوتنەکە لابەلاکردنی ئەو ناکۆکییە بویە بەکارهێنانی گفتوگۆکە لەدژی بەرەی م. س و بۆ دەرکردنی لەسەر گۆڕەپانی پێشمەرگایەتیی...

هەر لەنیسانی ئەو ساڵەدا بو کە هێشتا ئومێد هەبو بە گفتوگۆو بە ئاشتی ناکۆکییەکان چارەسەر بکرێت کەچی هێزەکانی بارزانی پێش هێرش بردنە سەر

ماوەتو دەرپەڕاندنی باڵەکەی م. س و پێشمەرگەکانی هێزەکەی بەزۆری شەڕ بۆ ئێران.. کەوتنە راوکردنی کادیرو ئەندامان..

دوای کۆنفرانسی بەرەی م. س لە ماوەت (٤ تا ٩- ٤- ١٩٦٤) بەنزیکەی هەفتەیەك، لەکۆبونەوەم لەگەڵ لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە، بۆ دەورو تەسلیم لەگەڵیان، بەهۆی گواستنەوەی کاری حیزبیم لە لێپرسراوەتی ئەو لیژنەیەوە بۆ سلێمانی. شەو لەسەعات دوانزەدا تاقمێك چەکدار دایان بەسەرماڵی مەلا سەعیددا، منو ئەندامانی لیژنەی ناوچە: (شێخ عەلی شێخ کەریم، مەلا سەعید، خالیدی حاجی فەرەج، مەلا رەئوف توفیق، مەلا لەتیف)و ئەدهەم کە کادیرێکی چالاکی لیژنەی ناوچە بو، گیراینو بەو شەوە رەوانەی خورماڵو بۆ بەیانی زوو رەوانەی حەپسخانەی پێنجوێن کراین.

لەو سەردەمەدا عەبدولوەهاب ئەتروشی‌دەوری زۆر خراپی لەقوڵکردنەوەی شەڕی ناوخۆدا دەبینی، بارەگای بارزانیش باشتر رۆڵیان جێگیر دەکرد. ماوەیەك لەبەندیخانەدا هێڵراینەوە، کە بۆیان دەرکەوت ناتوانن هەڵەی ئەو گفتوگۆیە بەسەر ئێمەدا تێپەڕ بکەن، بەو مەرجەی ئەندامانی لیژنەی ناوچە لە سیاسەت دوربکەونەوە، ئەگەر لەگەڵ باڵەکەی بارزانیی کارنەکەن، منیش نەچمەوە بۆ هەڵەبجە، ئازادکراین.

هەر لە سلێمانیش جەماعەتی کانی ماسیی‌کە کاژێك مەلایی رۆڵی گرنگیان تێدا دەبینی کەوتنە گرتنی لێپرسراوان بەتایبەتیی: عەلی حەمدی، مەحمودی حاجی تۆفیق،سمکۆ فەتحوڵلا، فەقێ عەلی و دەیان ئەندامی چالاك، تا لە لق و لیژنەی ناوچەی سلێمانیدا هەر بەندەو حەمە چاوشین مابوینەوە کە کەوتینە کاری ژێرزەمینیو راپەڕاندنی ئیشو کاری رێکخستن.

جگە لەوانە ئەو تاقمە کەوتنە راوو ڕوتو سەرانە سەندنو دەستدرێژیی بۆ گەنجی تازە پێگەیشتوو بەدبەختکردنیان. دیسان نۆ کەس لەشیوعیەکانیشیان بەیەك رۆژ کوشت.

لەتەممووزی ئەو ساڵەشدا منو حەمە چاوشین و ئیسماعیل سەلیم- یان بەردەسترێژداو بەقەلاکەت خۆمان رزگارکرد. ئیتر کون بەکون بەدوای، بەقسەی، ئەوان "جەلالیدا" دەگەڕان، هەندێك بەناچاریی شارەکەیان بەجێهێشت، لەوانە: کەریمی حاجی مەلا مارف کە ئەندامێکی چالاکو دڵسۆزی لیژنەی ناوچەی سلێمانی بو، بەهۆی دەوڵەمەندییەوە دەیانویست سەرانەشی لێ بسەنن.

ئەوانە دوای سەردەمێ دەکران کە تەنها بەندەو بەهاندانی منیش شەوکەتی حاج عەلی ملمان بۆ فرمانی زەعیم سدیق دانەنەواندو بروسکەی دژبە بارزانی‌مان لێنەدا

(٢٧- ١١- ١٩٦٢) ئیتر لەپارێزگای سلێمانیدا هەر هەمو مامۆستاو فەرمانبەرانی پەروەردە لەپارتیو سەربە پارتی، بەوانەشەوە کە خۆیان بەدەرویشی بارزانیی دادەنا، دیارە هەموو ڕێکخراوو حیزبەکانی تریش، جگە لە سێ مامۆستای شیوعی کە بروسکەیان کرد.

لەکاتێکدا لێپرسراوی لقو ئەندامێکی تری ک. ن (ناهیدەی شێخ سەلام) زۆریان هەوڵدا تا رازیم بکەن کە ئیمزای بکەم گوایە کارەکانی لق لە ئازادیی هاتوچۆ باشتر دەکرێن وەك لە کاری ژێرزەمینی. چەندیان گوت من گوێم لێ نەگرتنو پێم گوتن ئەمە پێوەندیی بەکەسێتی خۆمو ناوو ئاییندەی سیاسیمەوە هەیە نەك هەر تەنها بەناوبانگی پارتایەتیمەوە.

دژە کرداری ئەو کارانەش، هەڵەی دوو لایەنەی خولقاند، بە ڕوبەڕوبون و تەقینەوەی شەڕی ناوخۆو هەوڵی هەردولا بۆ هاوکاری لەگەڵ ڕژێمدا. سەرەنجام بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ خوێندرایەوە، هەرچەند نوێنەری بارزانیی لەسەر تەلەفزیۆنی بەغدا لایەنگریی لەبەیانەکە کرد. لەهەمان کاتدا سوور بو لەسەر پاوانکردنی بەیانەکەو هاوکاریی لەگەڵ حوکمەت، تا باڵەکەی م. س چەکبکرێ. تەنانەت کە عەبدولڕەحمان عارفی سەرەك کۆمار لە ٢٦ توکتۆبەری ١٩٦٦ دا سەردانی مەلا مستەفای کرد، تەنها داخوازییو مەرجی بارزانیی بۆ ملدان بۆ ڕێککەوتن چەککردنی هێزەکەی بەرەی مەکتەبی سیاسیی بو. ئیتر هەڵەی هاوکاریی ڕژێم، ناکۆکییەکانو شەڕی براکوژی زیاتر قوڵ دەبوونەوە. لەو ململانێ سێ پلەییەدا:

- لەیەکەمیاندا لەدژی بەرەی ناراستو لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بەرامبەر بە (ڕێککەوتنەکەی موشیر- بارزانیی لە ١٩٦٤دا).

- لەپلەی دووەمدا لەدژی هەڵوێستی مەکتەبی سیاسی کە نزیکەی هەشت مانگ ڕێکخستن و سیاسەتم بەجێهێشت. چونکە لە بۆچوونو ڕاکانی خۆمدا کە بە دوورو درێژیی بۆ مەکتەبی سیاسییم نوسیبو: دەبێت خۆمان لەشەڕی ناوخۆو ڕووبەڕووی چەکدارانە دووربخەینەوە، لەبەر نابەرابەریی هێزو پەیوەندییەکان، شۆڕش بۆ بارزانی بەجێبهێڵین، ئێمەش وەك ڕێکخراوێکی سەربەخۆ بمێنینەوە، بێئەوەی لەسەرەتادا زۆرانبازیی توندوتیژ بکەین، تا بارزانیی لەناو هەڵەکانیدا لاواز دەبێتو جەماوەر لێیتێدەگات.. تاد

یەکێك لە زیانە شەخسیەکان، کە دژە کرداری ئەو هەڵانە خولقاندیان، سوتاندنی کتێبخانەکەم بو لەسەر ئەو بڕیارو رقەی کە ئیتر جارێکی تر بەلای پارتایەتیو سیاسەتیشدا ناچمەوە.. ئەوەی لەو هیستیریای سوتاندنە رزگاری بو، چەند

فەردەیەك كتێبو هەمو ڕۆژنامەكانی خەباتو گۆڤاری رزگاریی (كۆتایی پەنجاكان) بو كە مام جەلال دوای هاتنی بۆ سلێمانی داوای لێكردم. ئیتر حسە رەشی خەیات، رۆڵەی ئەو جۆرە خەباتە نهێنیو پڕ لەمەترسیانە كە لە سالانی سەرەتای شۆڕشیشدا لەگەڵ ئەحمەد سەلیمو حەمەی مامە رەحمانو حەمەی خەنەشۆ بوبونە شۆڕە سواری شۆڕش لەناو شاردا، لە پەیداكردنو كڕینی پێویستییەكانی شۆڕش لە بەغداو كەركوكو سلێمانیو ناردنیان بۆ شاخ. ئەو ئەوانەی گواستەوە بۆ ئەوماڵەی مام جەلال خۆی تێدا شاردبۆوەو خەباتی نهێنییو سەرپەرشتیی نەخشەی جێبەجێكردنی راپەڕینی دژ بە بارزانیی تێدا دەكرد.

- لەپلەی سێیەمیشدا، دوای هەشت مانگ دانیشتن كە دەستم بەكاركردەوە: لەململانێی ناوخۆی رێكخستنەكەمدا لەسەر هەمان راوبۆچوونی خۆم بوم، لەدژی بەردەوامیی شەڕی ناوخۆو هاوكاریی میریی. لەهەمان كاتدا لەدژی بەرەی بارزانیی بوم چونكە: هیچ جۆرە بووارێكی بۆ رێككەوتنی ناوخۆو ئاشتبوونەوە نەهێشتبۆوە، هەموو دەرگاكانی كێلون دابوو، هەمو تواناو هێزو سیاسەتو پەیوەندییەكانیشی بۆ تێكشكانی بەرەی م. س تەرخان كردبوو، بێئەوەی كۆ لەهیچ هەڵەو لادانو زیان بەشۆڕش گەیاندنێك بكاتەوە..

جگە لەو هەموو هەڵەو لادانانەی رێكخستنو چەكدارەكانی لەشارو شارۆچكەكاندا.. كە لەئەنجامی ئەو هەولانەدا ئاژاوەیەكی گەورە خولقا، زۆر لەخەڵكانی تێكۆشەر دانیشتن. زۆری تر سۆزو حەماسەتیان كەمو لاواز بو، هەلپەرستیی بەشێوە ئاشكراكەی سەری دەرهێنا، دزییو چەك فرۆشتنو ئەمبەرو ئەو بەركردن، كوشتنو كاری تیرۆرو بۆمبای میقاتكراو ناردن بۆ ماڵی تێكۆشەران زۆربو. لەگەڵ خولقاندنی گەلێ دیاردەی تری ناشۆڕشگێڕانەی دور لە رەوشتی پارتایەتیو كوردایەتی، بێ ئەوەی بارزانی، كە سەركردەی لایەنی براوە بو، چارەیان بكات، بگرە هەر لەستافی دەوروپشتەكەیەوە، بەئاگاداریی خۆی هانی ئەو جۆرە كارانە دەدرا تا ناكۆكییەكان قوڵو قوڵتر ببنەوە، بۆ ئەوەی لە سەرەنجامدا كوردستانو سیاسەت پاوان بكەن.

لەناو ئەو هەموو ئاژاوەو شەڕو گوشارانەشدا جارجار سروشتیش دەرگای خۆی لێ دادەخستینو دەبو بەیارمەتی دەری دژەكان.

رۆژێكی هاوینی هەمان ساڵ لە ماڵێك كە هەم كاری لیژنەی ناوچەو لقمان تێدا دەكردو هەم خۆشمان لەچەكدارەكانی مەلا مستەفاو لە حكومەتیش دەشاردەوە. وەختێكم زانی بومەلەرزە شارەكەی شڵەقاند. دەی كردگار ئا لەو ساتانەدا چۆن لەناو سێ كوچكەی سێ ئاگردا دەرباز دەبیت! ئاگری: دامودەزگا داپڵۆسێنەرەكانی

حکومەت، هاوکارەکەی چەکدارەکانی باڵەکەی بارزانیو بومەلەرزەی وێرانکەر. خانووەکە کۆنو لەقوڕو دار دروستکرابو کە ئاسان لەبەردەم بومەلەرزەدا دادەڕمێ. ناچار خۆم دایەدەست قەدەرو دەرپەریمە سەرشەقامو کۆڵانەکان. بۆ ترسی سودفەی زەفەر پێبردنی یەکێك لەو لایەنانەش هەر ئەوە هاندەر بو کە بەخۆم بڵێم: زۆری پێ ناچێت ئەم بەڵا سروشتکردە بەسەردەچێت!

دیسان دوای ئینشیقاقو گەڕانەوەی هێزەکەی م س لەئێرانو هاوبەشیکردنەوە لەنوێ بونەوەی شەڕی دژ بەڕژێم، مەکتەبی سیاسی بڕیاری لەسەر "ئیزدیواجییەتی تەنزیم" دا ئەوەش بریتی بو لە ناردنی ئەندامان بۆ ناو ڕێکخستنی باڵەکەی بارزانی تا بەرەبەرە دەست بەسەر ئەو ڕێکخستنەدا دەگیرێت.. ئەو سەردەمە ئەندامی لقو لێپرسراوی لیژنەی ناوچەو لێپرسراوی ڕێکخراوو یەکێتییەکانی ئافرەتانو لاوانو قوتابیانو مامۆستایانی کوردستان- سەر بە باڵەکەی مەکتەبی سیاسیی بوم. لەدژی ئەو بڕیارە وەستامو ملم بۆ جێبەجێکردنی نەدا. چونکە لام وابو کە ئەو کارە دەبێتە زەمینەیەکی لەبار بۆ زیادبونی خەڵکانی هەلپەرستو نائاساییو دوو روو دوو ڕەوشتی سیاسیی دژبەیەك، بێ ئەوەی ئەو جۆرە کارانەش هیچ سودێکی چاوێنیی لێ بە ئەنجام بێت، چونکە بەهێزیی باڵەکەی بارزانی لەڕێکخستنو هێزی پێشمەرگەو سەرکردایەتییەکەیەوە نییە، بەڵکو لەکەسێتیی خودی بارزانی خۆیەوەیە.

م. س لەو هەڵوێستەم زۆر تورە دەبن. بەجۆرێك یاخی بونیان دەزانی. ئیتر لەگەڵ حەمەی حاجی تایەر کە لێپرسراوی لق بو بانگ کراین بۆ قەڵادزە (حوزەیرانی ١٩٦٥) عەلی عەبدوڵاو نوری شاوەیس و نوری و ئەحمەد تەها لەوێ بون. مشتو مڕەکە زیاتر لەگەڵ عەلی عەبدوڵا دابو، دیار بو ئەو لەجێگەی سکرتێر کاری دەکرد بەتوڕەبونو دڵدانەوە وە زۆری هەوڵدا بە ڕاکانی خۆی ڕازیم بکات، نمونەی چاوێنیی سودیی ئەو پلانەی لەو بوونەی خۆیاندا لەقەڵادزەو لەو خانوەدا کە بارەگای لیژنەی ناوچەی سەر بە باڵەکەی بارزانی بو وە میرزا باپیر لێپرسراوی بو، دەهێنایەوە. سەرەنجام من ملم بۆ ئەو کارە نەداو گوتم واز لە لیژنەی ناوچە دەهێنم تا ئەو کارەی کە بە زیانی دادەنێم لەسەردەستی مندا نەکرێت، کە هەر ئەوەشم کرد.

دوای گەڕانەوەی هێزەکەی م. س لەئێران، مام جەلال، عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف، عەلی عەبدوڵا، نوری شاوەیس، عەلی عەسکەریو نوری ئەحمەدی تەها لەدۆڵە ڕەقە دانران. زۆر بەسەر ئەوەدا تێپەڕی نەکرد کە ئیدریس بارزانیی دەنێرێت بەدوای مام جەلالو حیلمیو عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریدا.. ئیتر ئەندامانی م. س و ك. ن- ی لەسەر چون یان نەچون، ڕاکردن یامانەوە، دەبن بەدوو بەشەوە.. چونکە برایانی بانگکراو وایان مەزەنە دەکرد کە ئەو بانگکردنە بۆ کوشتنە. دوای

مشتومڕو نەگەیشتنە ئەنجام پەنا بۆ لقەکان دەهێنن، تا بەپێی رای لقەکان بڕیارێکی گونجاو بدەن.

منو، لەسەرەتادا هەمو ئەندامانی لقیش، رامان وابو کە: با ئەوەی مەترسیی کوشتنی دەکەوێتە سەرو ئەوەشی کە دەیەوێت خۆی رزگار بکات، بێنە شارەکانەوە. بەڵام ئەوە بۆ کۆکردنەوەی پێشمەرگەو شەڕی دژ بە مەلا مستەفا نەبێت، چونکە شەڕی ناوخۆ دەخولقێ. بڕیاریشماندا کە: ئەگەر هاوکاریی میری‌و شەڕی ناوخۆ بەرپا کرا ئێمە لەگەڵی نەبین، وە ئەگەر مەکتەبی سیاسیی لەسەر ئەو ناکۆکییانە بوو بەدوو بەشەوە ئێمە لەگەڵ کەسیان نەبین..

رۆژێك منو سمکۆفەتحولا لەگەڵ وەڵامدانەوەی نامە خەریك بوین، ئەو گوتی:

> نامەیەکی عولەما بۆ م. س هاتووە، لەژیانمدا بۆ یەکەم جار بوو کە بیر لە کردنەوەی نامەیەك بکەمەوە کە پەیوەندیی بە منو ئێمەوە نەبێت، هەستم دەکرد نامەکە شتێکی تێدایە کە پەیوەندیی بەچارەنوسیی هەمووانەوە هەیە، بۆیە نامەکەم کردەوەو وا دەرچو.

> گوتم هەق نەبو شتی وابکەیت. ئەویش گوتی:

> تازە کردمو ئەوە نامەکەیە حەز دەکەم پێش ئەوەی بینێری بیخوێنیتەوە!

نامەکە لەسەر سەرەتای پێوەندیکردن بوو بەمیرییەوە.. بۆیە:

لەمشتومڕ لەسەر ئەو مەسەلە چارەنوسسازانە، لەچەند نامەیەکدا بیروڕاو مەترسییەکانم رونکردبۆوە، بە تایبەتیی لەنامەیەکی ٢٣ لاپەڕەییدا کە دوانامەم بوو.

سەرەنجام ئەو برادەرانەمان خۆیان گەیاندە سلێمانی‌و کەوتنە کاری نهێنی‌و دابەشبوون بەسەر لقەکانی رێکخستندا.

ئەوانەی لەدۆڵەڕەقە مانەوە (عەلی عەبدولا، نوری شاوەیس، نوری ئەحمەدی تەها) دەچنە لای بارزانی‌و تێکەڵ بەرێکخستنەکەی دەبن.

دوای دەربازبونی برادەران لە دۆڵەڕەقە. پێش بزوتنەوە چەکدارییەکەی دژ بە بارزانیی کە نێوی راپەڕینی لێنرا، مام جەلال‌و عومەر دەبابە لەماڵی وەستا سدیق کە سەرکردەیەکی کرێکاریی دڵسۆزو لە ساڵەکانی کۆتایی شەستەکاندا لێپرسراوی یەکێتیی نەقابەکانی کرێکارانی پارێزگای سلێمانی بو، کۆبونەوەیەکیان بە لقی سلێمانی کرد (حەمەی حاجی تایەر، سمکۆ فەتحولا، حەمە چاوشین، کەریمی ئیعاشە وە بەندە) دوای ئەوەی هەریەکە راوبۆچونی خۆی باسکرد، من هەمان ئەو بۆچونانەم لەسەر هەڵەی بەرەنگاربوونی چەکداری‌و هاوکاریی لەگەڵ میریدا دەرخست.

سەرەنجام کە زانیم راو قسەو رەخنەو دەرخستنی مەترسییو هەڕەشەی هاوکاریی لەگەڵ میرییو قوڵبونەوەی شەڕی ناوخۆ کەلەو ماوانەدا لەسەرم نوسیونو قسەم لەسەر کردون، هیچ سودێکیان نەبووەو کارناکاتە سەر ڕەوتی روداوە نەخشە بۆ کێشراوەکان، ئەو شەڕو هاوکارییە لەبەردەمدایە، بۆیە لە ڕێکخستنو سیاسیەت دوورکەوتمەوە. تا کۆتایی ئۆگەستی ئەو ساڵە.

هەر لەماوەی دانیشتنەکەمدا لیستەیەك ناوی لێپرسراوو ئەندامی چالاکی بەرەی مەکتەبی سیاسیی لە سلێمانی بە بەکرە کوڵ گیرا کە فرمانی کوشتنیان لەلایەن لقی چواری باڵەکەی بارزانییەوە درابو، سەیر لەوەدا ئەوە بو دوای ناوی لێپرسراوی لقی سلێمانی (حەمەی حاجی تایەر) ناوی من بوو.

لەکۆنفرانسی تیماردا (٢٨- ٨- ١٩٦٦) (کە ئامادە بونەکەم بۆ خۆی چیرۆکێکی ترەو سەرەتای کارکردنەوەشم بو). لەرۆژی دووەمیدا ئاگادارکرام کە بە بەڕێوەبەری تاقیکردنەوەکانی بەکەلۆریی دانراوم. ئیتر دەبوو بگەڕێمەوە سلێمانی. داوای روخسەتم لەمام جەلال کرد، ئیتر کە زانیی دەبێت بگەڕێمەوە، کاری کۆنفرانس بۆ هەڵبژاردنو پڕکردنەوەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی پێش خرا. من نەمدەزانیی بۆچیی جەخت لەسەر مانەوەمو ئامادەبونی ئەو هەڵبژاردنە دەکات. کە کۆبونەوە دەستی پێکردو کاتی پاڵاوتن هات، مام جەلال منی پاڵاوتو هەر خۆشی هەرچیی لایەنی پۆسەتیڤو چالاکیی هەیە باسی کرد. هەرچەند من خۆم ئامادە نەبوم بۆ کارکردنو قسەشم لەدژی هەڵبژاردنم کرد، بەتایبەتیی ئەو ماوە دورودرێژەی دانیشتنو رەخنە توندوتیژەکانمو دژایەتیی ئاشکرای خەتەکە پێچەوانەی کارێکی وابو. لەگەڵ ئەوەشداو زیاتریش لەسەر قسەکانی مام جەلال، بەئەندامی ك. ن. هەڵبژێردرام.

ڕێککەوتنەکەی ئازاری حەفتا گەلێ سودیشی هەبو. یەکێك لە ئەنجامە گرنگەکانی، ئاشت بونەوەو ڕێککەوتنەوەی هەردو باڵەکەو لابەلاکردنی شەڕی ناوخۆ بو. کە لە راستیدا ئێمەی لقی سلێمانیو لیژنە ناوچەکانی، گەلێ لە برادەرانی هەولێرو کەرکوك و بەغدا رۆڵی بڕێنەرەوەو چارەنوسسازیان لەوەدا بینیی. هەر ئەوەش هۆی راستەوخۆی زوتر دامەزرانو ئاشکراکردنی کۆرەك بو.

هەریەکە لەسەرکردایەتی بەعسو پارتی، کۆمەڵە مەبەستێکی نهێنیو تایبەتیی خۆیان لەڕێککەوتنەکەی ئازاردا هەبو. سەرەکییەکەی بۆ هەردووکیان تێکشکان یان پاکسازیی دوژمنە سەرەکییەکانی ناوخۆ بو، بۆ بەعس، داوێك بوو بۆ بارزانیو شۆڕش. مەبەستی سەرەکیی بارزانیش لابەلاکردنی شەڕی ناوخۆ بو لەسەر ڕێبازو بیرو مەبەستی خۆی، بەتایبەتیی لەوەوبەر، سەبارەت بە رۆڵی رژێم، بەشەڕ کۆتایی

بێ نەهێنرا. ئیتر ئەم بواری سەرکەوتنە لەرێککەوتنەکەی ئازاردا، هەل بو بۆ یەکەڵبونەوەی هەردوو باڵەکەی پارتی. بەوەش بەرە ناکۆکەکەی ناوخۆی لەسەر گۆڕەپانەکە نەهێشت. بێ ئەوەی بتوانرێت گرفت و کێشە هەستیارەکانی ناوو دەوری پارتیو شۆڕشو سەرکردایەتییەکەیو هەلو مەرجە ناکامڵەکان چارەسەر بکەن.. بۆیەو لەگەڵ ئەوەشدا کە یەکێتیی ریزەکانی شۆڕشو پارتیی سازو خورت بووەوە، دیسان هەر ئاسان بەرێککەوتنەکەی ٦ ئازاری ١٩٧٥ هەرەسی هێنا. هەرەسیی سەرکردایەتیی پارتیی بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو لەناو روخاندنەکەیاندا بە بروسکە داوای رێککەوتنیان لەحیزبی بەعس کرد. وەڵامی رژێمی بەعسیش: دەبێت ئاڵای سپی هەڵبکەن ئەوسا بگەڕێنەوە.. ئیتر بەشێکیان گەڕانەوە عێراق بەشێکیان چوونە ئەورووپاو بەشەکەی تریان لەگەڵ ماڵی بارزانیدا ئێرانیان هەڵبژارد. سەدان هەزار چەکدارو تێکۆشەرو چەندین ئەوەندەش هاو نیشتمانییان لەبەردەستی بەعسدا بەجێهێشتو بەگورگان خواردویان دان. ئەوەش تراجیدییەکی مێژویی سیاسەتی کورد بوو.. ئەوەی کە لێرەدا نابێت پشت گوێ بخرێت، گوێ نەگرتنی مەلا مستەفا بو لەمەکتەبە سیاسییەکەی بۆ بروسکە لێدان بۆ بەعس، ئەوەش بەیەکێك لەهەڵوێستە باشەکانی مەلا مستەفا دەژمێردرێ..

جا لەناو بزوتنەوەیەکی نیشتمانیی و رزگاریخوازی نەتەوەیەکی داگیرو دابەشکراو کە کێشەکەی پڕ لەگرێوگۆڵو ئاڵۆزیی بوبێت ئەو هەمو کارو روداوە روخێنەر و ئەژنۆ شکێنەرانە روودەن، ئیتر چۆن ویژدان ژاکاونابێت و تەوژمی کارکردن کەم نابێتەوە..! لە راستیدا زۆر سەیرم لەو کاروانە دەهات کە لەناو ئەو هەموفیداکاری و قوربانی و ماڵ کاولییەدا، ئەو هەموهەڵانە روودەن کەچی بەشێ لە روناکبیرو تێکۆشەرانی ناو ئەو کاروانە هەروا سەرپێی و راگوزاریی بەسەریاندا تێدەپەڕن.. لای من ئەوە یەکێکە لەبەردەوامیی هەڵەو دەلاقە گەورەکانی ناو بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردستان.

دەرفەتی دەنگ نەبوونی بانگ کردن و ئەم جۆرە گەڕانەوانە بۆ رابوردو، کەمێ ئازارە جەستەییەکان لەبیردەبەنەوە.. یان جاری واهەیە خەیاڵم دەبەنەوە لای روداوی تری هاووێنەی ئەو سەرەتای ئەشکەنجەدانەم..

ئەشکەنجەی هەیئەو فەلاقەیدێرزەمان..

لەناو ئەو دۆزەخەدا، ئازاری ئەو ئاژاوەو ناکۆکی و دیاردە نامۆیانە سەرلەنوێ مێشکیان داگیر دەکردمەوەو لە خۆمم دەپرسیی: باشە ئەوەچی نەهامەتییەکی نەتەوایەتییە سەرکردەیەکی میللی خۆشەویست بەوجۆرە مامەڵەی ئەندامان و لێپرسراوانی پارتییەکەی خۆی بکات! ئەو پرسیارە بۆ سەردەمێکی دورترو ژیانی منداڵی رایانکێشام.

ئێمەی قوتابیانی سەرەتایی سەرکارێزی دایکی پاشا لە گەڕەکی گۆیژە هەر لەمنداڵییەوە، کاتێك لە پۆلی چوارو پێنج بوین، بارزانیمان هێندە خۆش دەویست کەسەری ئەومان لە هەمو شتێکی تر لاپیرۆزتر بێت. کاتێك لە بەفر بارینی زستاناندا، ئەگەر بەباوە بوایە کلیلە دروست دەبو. کە دەچوینە قەراغ شار بەتایبەتیی بۆ کارێزی وەستا شەریف و سەیوان و رێگەی کانیبا، بۆ یاری ناو ئەو بەفرەو بازبازێن لەدۆڵە قوڵەکانی پڕبو لە بەفر ، ئەگەر یەکێك نەیوێرابا باز بدات، ئێمە بەسەری بارزانی سوێندمان دەدا ئیتر هیچ یەکێکمان لەو سوێندە دەرنەدەچوین..

لە پۆلی دووی ناوەندی بوم کە مامۆستای وانەی عەرەبی (عەبدوڵڵا زێباری)، رۆژێك داوای کرد ئینشایەك لەسەر یەکێك لەو پیاوە مەزنانە بنوسین کە خزمەتێکی گەورەی کردبێت و خۆشمان دەوێت. منیش باسی مەلا مستەفام بۆ نوسی. بۆ وانەی ئایندە هاتە لای رەحلەکەمەوەو گوتی جارێکی تر لەسەر ئەم جۆرە شتانە مەنوسە. خۆ وێنەکەی بارزانی بە بەرگی جەنراڵییەوە کە لەسەردەمی کۆماری مەهابادا ئەو پلەیەی پێدرا، عەوداڵی بینینی بوین و لەو دەربەدەرییەشیدا ئاواتی کوردمان لەودا دەبینیی..

لەناو بەسەرکردنەوەی ئەو یادگارە کۆنانەدا دەمگوت ئەوە چی خەسڵەتێکی سەرکردەیە وا لەو رۆڵانەی میللەتەکەی بکرێ کە لە منداڵییەوە بەو جۆرە بووبن و لەپێگەیشتنیشیاندا ئەوە رۆڵیان بێت و وەك پێشمەرگەیەك بەکاڵاوو پێتاوی خۆیانەوە لەناو کاروانەکەدا بە لە خۆبوردویی کاربکەن، کەچی لەلایەن دامو دەزگای ئەوەوە بەو جۆرەیان لەگەڵ بکرێ و پاداشتیان بدرێتەوە!

ئەشکەنجەی ئەو دوو رۆژە لەسەر یەك، قاچو لەشمی وا لێکردبو کە خۆم بەپێوە نەگرم. بۆیە کە کاتی چونەسەر ئاودەست هات، دەرگا کرایەوە. من نەمدەتوانی لاقم بجوڵێنم و پێ بخەمە بان زەوی، ئیتر نەشمدەتوانی بچمە سەر تەوالێت. بۆیە هەر لەژورەکەمانەوە. لەکاتێکدا زیندانییەکانی ژورەکە وەك رۆژانی تر تاقم تاقم دەچونە دەرەوەو دەهاتنەوە. ئازاری شوێنی ئەو شێوەی ئەشکەنجەو لێدانەی ئەم فەلاقەیە بەرەو بیرەوەرییەکانی منداڵی و فەلاقەکانی ئەو دەمانە رایاندەکێشام..

ئەو کاتەی کە لەپشوی هاویندا باوکم ناچاری دەکردم بچمە حوجرەی مزگەوتی تەکییە لەسەرکارێز، کە نزیك بەماڵی خۆمان بو. شێخ رەئوفی شێخ سەعید ئیمامو مامۆستای ئێمەش بو. خەلفەیەکی هەبو، هەرچەندە ئێمە بزێو بوین، بەڵام رۆژ نەبو بەهەق و بەناهەق بەلێدانمان نەدات.

هەر تەواو ئیزعاجی کردبوین، لەبەر باوکیشم نەمدەوێرا حوجرەکە بەجێ بهێڵم. لەدژەکرداری ئەو کردەوانەی خەلفەکە، ڕۆژێك منو جەلالو جەمال عەزیز کە هاوڕێی گەڕەكو قوتابخانەش بوین، ئەودەم لەپۆلی دوو یان سێ بوین، تەگبیرمان لەخەلفە کرد کە تۆڵەی خۆمانی لێبکەینەوە. ڕۆژێك مەلا شێخ ڕەئوف گوتی: من دەڕۆم کارم هەیەو ئێوەش بێدەنگ لەگەڵ دەوری خۆتان خەریك بن. هەر کەمێك دوای ڕۆیشتنی، خەلفەمان بەگیرهێناو لەسەرسەکۆی حەوشی مزگەوتەکە بەپشتێنەکەی خۆی بەستمانەوەو داخی دڵی خۆمانمان پێڕشت.

بۆ بەیانی، لەبەر ئەوەی شکاتی لێکردبوین، کەوتینە بەر فەلاقەکردن، فەلاقەی ئەودەم: پەتێکی قایمو ئەستوریان بەمسەرو ئەوسەری دارێکی ڕێكو سافی درێژەوە دەبەست، قاچیان دەخستە ناوی، مەلاو خەلفە هەریەکە سەرێکیان دەگرتو چەندیان دەتوانی بایان دەدا.

نەخێر ئازار پەیدا بو، زیاترو زیاتر دەبو، هاوار هاوار کەڵکی نەبو، گریان، بێسود بو، لەراستیدا ژانیان بردە دڵەوە. ئەو ئازارەی ئەو فەلاقەیە تا ئێستاش لەبیرم نەچۆتەوە. فەلاقەکە بۆ ئەو منداڵییەم هێندە سەخت بو کە لەدوای ماوەیەکی دورو درێژ چاڵایی شوێنی پەتەکە شوێنەواری هەر مابو.

لەگەڵ ئەو زوڵمە گەورەیەی شێخ ڕەئوف لێی کردین، ڕقم لێی نەدەبووەوە، چونکە، لەگەڵ ئەو منداڵییەشمدا ئەوەم لەبەرچاو بو کە هەندێ جار لە پێشی خۆ پیشاندانی دژ بەرژێمی پاشایەتییەوە ئەم هوتافی دەکێشاو ئەوانی تر بەیەك دەنگ دەیانگوتەوە..

مزگەوتەکەشی وەك بارەگایەکی سیاسیی بو، بیرم ماوە کە هەر لەو سەروبەندەدا پارتییەکان سەیرانێکیان بۆ زەڵم کرد، چەند لۆرییەکی پڕ لە خەڵك کە منیش بەهۆی کاکە حەمەمەوە لەگەڵیان بوم، لەبەردەمی مزگەوتەکەوە کەوتنە ڕێ.. سرودی (گوڵی سەربەستی)یەکەی قالەی حاجی حسەینو دەنگە خۆشەکەی لەگوێ روباری زەڵمو لەو بەهارە سەوزو ئەڵوەنەدا، وا لەمێشکمدا تۆمار بون کە ئێستاش یادی زۆر لە وردەکارییەکانی ئەو سەیرانە سیاسییەم لەزەیندا بمێنێت..

هەر ئەو ئەشکەنجانەی هەیئەو ئەو خەیاڵانە ڕوەو قوتابخانەی خالیدییەی سەرەتایی ڕایانکێشام، ئەودەمەی کە لە پۆلی پێنج بوم. ڕۆژێك لەگەڵ جەمالی مەلا عومەر لەسالۆنی بەردەرگای قوتابخانەدا یاریمان دەکرد، سەری زۆر هاتبو، منیش بێ بیرکردنەوە ڕوم کردە ڕێبوارێك کە هەر بە ڕێکەوت بەوێدا گوزەری دەکرد، هەر ئەوەندەی گوتم: ئادەی خاڵەگیان سەری ئەمەمان بۆ بتاشە. بەبێ قسەو وەڵام کابرا هەر وەك شێت خۆی کرد بەقوتابخانەکەدا. هەرکە گەیشتە بەردەم ژورەکەی

بەڕێوەبەر، دەرگاکەی دایە بەر لەقە، ئێمەش لەترسانا رامانکردە پۆلەکەمان. زۆری پێ نەچو کە نوری فەڕاش هاتو منی بانگکردو گوتی وەرە بەڕێوەبەر بانگت دەکات. بردمی بۆژوری مامۆستاکان. یونس ئەفەندی بەتوڕەبونەوە کەوتە قسە. منیش سوێندم بۆ خوارد کە ئێمە یاریمان کردوەو هیچ شتێکی خراپمان بەو پیاوە نەگوتوە. گوتی ئەی چۆن ئەو دوکانی خۆی هەیە بۆ سەرتاشین تۆ بانگی دەکەیتە قوتابخانەکەوە کە سەربتاشێت؟ سوێندم بۆ خوارد کەلەخۆمەوە ئەو قسەیەم کردووەو من کابرام نەناسیوەو نەمزانیوە کە سەرتاشە. ئیتر هیچ تاوانێکم نەکردوە، نەخێر چەندم گوت بەڕێوەبەر گوێی لێنەگرتم. دار حەیزەرانەکەشی بەدەستەوەبو، بەتوڕەبونەوە، گوتی: دەی دەستبگرەوە. دەستی راستم بۆ گرتەوە، هەروەك عادەتی خۆی تا توانیی حەیزەرانێکی کێشا بە بەری دەستمدا.. ئازارەکە چووە ناو ناخی ئێسقانەکانەوە. ئەمری کرد دەی، ئەوەکەی تر، دەستی چەپیشم بۆ درێژ کرد بەهەمان هێز دووەم حەیزەرانی وەشاند. دوەم دار خستمییە گریانو هاوار کردن. ئەوەش کەڵکی نەبو. دەی دەستت بگرەوە ئەمجا لەسەری پەنجەکانم ئیتر شەش دانە حەیزەرانی بەهەمو هێزی خۆی لەهەردوو دەستمدا.

هەستم بەئازارو زوڵمێکی زۆر گەورە کرد. کەوتمە حاڵەتێکی هیستریاوە، بۆیە هەر لەژورەکە چومە دەرێ دەستم کرد بەجنێودان تا چومەوە پۆلەکەم بەدەنگی بەرز هەر جنێوم دەدا. هێشتا دانەنیشتبوم، نوری هاتەوە گوتی: وەرە بەڕێوەبەر بانگت دەکات.

ئەمجارەیان بردمی بۆ ژورەکەی خۆیو گوتی:

> ئەوە جنێو بەئێمەش دەدەیت!؟

< گوتم بۆ بەخۆڕایی لێم دەدەیت، من هیچ گوناهێکم نییە. گوتی:

> دانیشە پێڵاوەکانت دابکەنە، ئەوسا نوری بانگ کردو گوتی دەی قاچی بگرە بۆم. ئەویش هەردو قاچمی بەرزکردەوەو یونس ئەفەندیش بەحەیزەران کەوتە بیرازکردنی بنی پێیەکانم، نە دارێك نەدووانو نە دە. هاوارو گریانو پاڕانەوەو سوێنددان هیچ سودێکیان نەبوو، هەر ئەوە نەبو نەدەبورامەوە، ژانی دەستم بەسەر نەچوبو وا ئەم فەلاقەیەشی هاتەسەر.. هەتا هیلاك بو داری وەشاند، ئەوسا گوتی دە هەستە بڕۆ پۆلەکەت..

پێڵاوەکانم گرت بەدەستەوەو هەر پێم نایە ئەو دیو دەرگای ژورەکەوە، ئەوەندەی تر جنێوم پێداو بەرەو دەرگای دەرەوە دەرپەڕیم بەرەوماڵەوە.

روداوەکەم بۆ باوکم گێڕایەوە، بۆ بەیانی لەگەڵمدا هات بۆ قوتابخانە. کەوتە گلەیی لەیونس ئەفەندی. ئەمیش کەوتە گلەیی لەبزێویو جنێوەکانی من.. دیارە خۆشەویستی باوکم نەبوایە یونس ئەفەندی لەو تایپانە نەبوو کە وەرم بگرێتەوە.

لەگەڵ یەکەم فەلاقەو لێدانی ناو هەیئـە، راستەوخۆ ئـەم بیرەوەریو فەلاقانـەم کەوتنەوە یاد، بەخۆم دەگوت خوا دەکات ئەشکەنجەو لێدانەکان هەر لەم سنورەدا دەبن، وا من لەو منداڵییەدا بەرگەی حەیزەرانم گرتووە گوایە ئێستا بەرگەی سۆندە ناگرم..! خوا ئەکات ئەشکەنجەکان هەروا دەبن وا چـی دەکـەن بابیکـەن، ئیتر مـن هیچی ترم گەرەك نییە.

خولی یەکەمو دووەم بۆ هەموان کۆتایی هات. سێیەمو چوارەمو.. تاد، بۆ هەندێك بەردەوام بو.. ئەوە نزیك بەدوو هەفتەی خایاند.. دوا رۆژی ئەو دوو هەفتەیە، سیو یەکی مانگی ئۆکتۆبەرە، دوای نانی نیوەڕۆ. لەپڕو لەناو بەرزبونەوەی دەنگە دەنگو غەڵبەغەڵب دەرگاکە کرایەوە. دەست کرا بەناو خوێندنەوە..

ناوێك، دووان، سیان، چوار، پێنج بۆ دەرەوە، بێ ئەوەی بزانین مەسەلە چییەو بۆ کوێیان دەبەن! بۆ بەرەڵاکردنە، بۆ دادگایی کردنـە، بۆ کوشتنە؟ زۆری نەبرد دەنگەکە چارەنوسەکەی رونکردەوە. لیستە بەدەست گوتی:بۆ ژوری ژمارە سێ. لەسەر ناو خوێندنەوە بەردەوام بون. ئەوەندەی تر بانگ کران. ئەوانیش بۆ ژوری چوار. سەیرە لەم ریـزی بانگکردنەشدا باز بەسـەر نـاوی مـنو کـەمال‌دا درا. دەی باجارێ چاوەڕوان بین. دیسان ناوی ژمارەیەکی تر خوێندرایـەوەو بـران بـۆ ژوری پێنج. چوارەم تاقم بۆ ژوری دوو بەرێیان کردن. ئیتر بانگکردن نـەما. قابیلـە هـەر ئەوەندە لەم ژورەدا بهێڵرێتەوە! لەوانەی لەژورەکە ماینەوە: جگە لە بەندە، کەمال، شێخ عەبدول، حەمە سەعید حاجی فەقێ ئەورەحمان، شێخ حەسەن، حسەین رەزا، حەمەی مامەورەحمانو چەند کەسێکی تر. دیارە قالەی حەمەی مەلا نادریش هێڵرایەوە. بەگوێی کەمالدا چرپاندم کە دیارە رۆڵی ماوەو بزانین چیی دەکات!

چەند دەقیقەیەك بەسەر ئەودابەشکردنەدا تێپەڕی، وەختێکمان زانی، تاقمێك هاتن. دەرگا دانەخرابو کە هێنـدەی تریـان هێنـا. هـەر دوو سێ‌دەقیقەیەك بەسـەر ئەوەشدا گوزەری نەکرد کە تاقمی سێیەم، ئینجا چوارەم، دوایـی پێنجەم کران بەژوردا.. دوایی تر حسابی خۆمان کرد بوین بە ٣٤ کەس.خەمی شەو دایگرتین، چونکە لەبری کەمبونەوە، وا شەش کەسی تر زیادی‌کرد! ئەی ئێستا چۆن چۆنی بنوین..؟

لەوەش ناخۆش تـر ئەوەیـە کـە ئێمـە ئەمانـە ناناسین. نازانرێ چەند کەسی گومانلێکراوی تریان تێدایە!

ئیتر من ئاگاداری ئەو برادەرانە نەمام کە گوێزراونەتەوە.. زیاتر بیرم لای مەحمود قەرەداخییەو خەمی ئەومە، چونکە بەهەمو لێکدانەوەیەکم، ئەو لەدەستیان دەرناچێت.

لەوانەی لەژورەکەدا لام ماونەتەوەو ئەشکەنجەیان لەسەر بەردەوامە شێخ حەسەن قەرەداخییە.. لەجیاکردنەوەکەماندا دلێر هاتە لامەوەو داوایکرد کە ئاگاداری کاکی بم،منیش پێم گوت پێویست بەوە ناکات تۆ داوام لێبکەیت!

کە دەورەی پێنجەمو شەشەمیشی بەسەردا تێپەڕبوو.. ئیتر ئەوەی ناوی هێزە لەمدا نەماوە، دەموچاوی ئاوساوە، تاڕادەیەك زۆر لەخۆی بێ ئومێدە، منیش نەدەهات بەبیرمدا کە وازی لێبهێنن، چونکە قسەکانیو ئەم گومانی گرتنەو بونی شێخ جەعفەری برای، بارەکەی ئەمیان قورسو زەحمەتو پڕ مەترسیی کردووە. ئێمەش زیاتر دلمان دەدایەوە، ئەوەی کەمێك ئومێدی پێ پەیدا کردبوین، ئەشکەنجەی دەرونیو هێنانو بردنی بوو، ئەگینا بەرگەی ئەشکەنجەی قورسی نەدەگرت.. وام مەزەنە دەکرد کە شێخ حەسەن مردنی هەڵبژاردووە نەك قسەکردن.. کە دەڵێم قسەکردن، هەر تەنها مەبەستم ئەوە نییە کە ئەو کەسە خەباتی نهێنیی کردبێت، بەڵکو زۆر جار ئەم لێکۆڵەرانە قسەیان دەوێت، ئیتر راستبێت یان درۆ، گرنگ ئەوەیە زیندانیی ئیعتیراف بکاتو ئەمانیش عەزەلاتی زیرەکیو ئەزمونی پڕ بەرهەمی خۆیان لەمەیدانەکەدا پیشان بدەن! شێخ عەبدولیش بەخولی شەشەمدا تێپەڕی بو، تەواو لاوازو دەنگ کزو زەرد بویو، بەلام لە ورەدا، کێوێکی لەروخاننەهاتوو بو.

رۆژێك حەپسێکیان کرد بەژوردا، دوای ئەوەی باسی هەڵبژاردنی رۆناڵد ریگانی کرد بۆ سەرەك کۆماری ئەمریکا، گوتی: دەنگوباسی دەرەوە هەموی باسی ئەوە دەکات کە بەم نزیکانە کودەتادەبێت! تا بڵێیت بەزەییم بەم زەلامە سادەو دەشتەکییەدا دەهاتەوە، بەخۆمم دەگوت قوڕ بەسەر چاوەڕوان بە تا باجەکەی دەدەیت.. دوای دوو سێ سەعات هاتن بەدوایداو ئیتر نەمانبینییەوە.. منیش بەخۆمم دەگوت: واوەیلا بۆ ئەو حەپسەی لێکدانەوەی نییەو بێ پەروا قسە دەکات..

هەر لەو ماوانەدا کوڕێکی چەمچەماڵییان هێنایە ژورەکەی ئێمە، لاوێکی سوروسپی بالا مامناوەنجیی جوانکیلەو نزیك بە بیست ساڵ یان شتێك کەمتر دەبو. جاش بووەو هەر وەك خۆشی دەیگوت پەیوەندیشی بەشۆڕشەوە هەبووە، چۆنو لەکوێ گیراوە باسی ئەوانەی نەدەکرد.. زوو زوو عەسکەرەکان بانگیان دەکردە دەرەوە، زۆری پێنەدەچوو دەیانکردەوە بەژوردا، ئەوە سەرنجی منی زۆر راکێشابو، کە لەکونی کلیلی دەرگاکەوە سەیرم کرد، ئیتر لەنهێنیەکە گەیشتم. عەسکەرەکان فەرمانیان پێ دەدا کە خۆی بەئاوە ساردەکە بشوات.. ئیتر بەسەیرکردنی لەشی روتی ئەو [illegible]وە یەخسیرە، حەزوئارەزوی خۆیانیان پێ جۆش دەدا، بۆیە زۆر جار بانگیان دەکردەوەو عەباسەکان لێی دەهاتنەپێشیو دەکەوتنە پیاهەڵڕوانینی،

بەنۆرە ماچیان دەکردو لەگەڵیشیدا چۆنیان بویستایە دەستیان بۆ دەبرد، ئەویش نەیدەزانی چیی بکات، چەند خۆی دور دەخستەوە بێ سود بوو، کە هەڵوێستەیان بۆ قسەکردن دەکرد ئێمە هیچی لێ تێنەدەگەیشتین..

ماوەیەکی دواتر دوو منداڵی قوتابیی: (بابان) و (سیروان) هێنران یەکێکیان لەدایکبووی ساڵی شەستو هەشتبوو. ئەوی تریش زۆر لەو زیاتر نەبو. یەکسەر ژیلوانی کورم دەهاتەوە بیر. ئاخر لەچیی وڵاتێکی دنیاداو چیی یاسایەك منداڵێکی تەمەن نزیك بەدوانزدە ساڵ لەزیندانێکی وەحشەتناکی وادا توند دەکات!؟ ئەزمونەکانی رژێمی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، وەڵامی سەدان پرسیاری وا دەدەنەوە..

تا دەهات سەردانی ئاودەست ناڕەحەتتر دەبو. سستێمی مانەوە، گۆڕانی خراپتری تێدادەکرا.. یەك ئاودەست بۆ زیاتر لەسەدکەسی حەوشەی ناوەڕاست، ماوەی چونەسەر ئاودەستی کەمتر دەکردەوە، رۆژ بەرۆژیش ژورەکان قەرەباڵغتر دەبن. زۆریی زیندانییەکان وای لێ هاتووە کە دوای دەست بەئاو گەیاندنی سی چل کەس، میزو پیسایی بەرز دەبێتەوەو گۆلاو دروست دەبێتو پیاو دەبێت لەناو ئەو گوواوەدا پێویستییەکان ئەنجام بدات! تەنیا شتێ کە بۆ پاكو تەمیزی دانراوە جوتێك نەعلە! کە زیاتر لەکاتی گۆلاوبەستنی ئاودەستەکەدا دادەنرێتو دەشبێت بەکاربهێنرێت. بۆ زیاتر پاكو تەمیزیو بۆرێزگرتن لەو یاسایەی زیندانەکە، دەبێت ئەوە رەچاو بکرێت. لەو نەهامەتییانەدا پیاو پێکەنینی بەخۆی دێت نەعلەکان لەپێ دەکاتو دەچێتە ناو گواوەکەوەو تا قولەپێشی تیانقوم دەبێت. بەو جۆرەش پەیڕەوی دەستوری خاوێنیی دەکرێ چاریش ناچارەو دەبێت داشبنیشێتو لەو ماوە کەمەشدا، لەناو بۆگەناوو گۆلاوەکەدا رێورەسمی دانیشتن ئەنجام بدرێتو پێویستییەکانی رایی بکرێت. لەهەمو ئەوانەش پۆخڵتر ئەو سیستمی چونە سەر ئاودەستە، خۆ بەدەست تەمیزکردنە، بێ ئەوەی بە سابون دەستو پل خاوێن بکرێنەوە، ئەوەش مەڵبەندی پەتا بلاو بونەوەیە لەهەموانەوە بۆ هەموان، بەتایبەتیی پەتاکانی گەدەو ریخۆڵە کە من زۆریان لێدەترسم.

عەسرێك سۆندەی ئاوە ساردەکەی بەر ژورەکە کرایەوەو، کۆمەڵ کۆمەڵ هێنایانینە دەرەوەو خۆمان دایە بەر ئاوە ساردەکە، منیش تا دەمتوانی دەستم لەلەشم دەخست.. هەر باشە، کەمە خورویەکی لەشم کەم دەکاتەوە، بەڵام قەتماغەی چڵك بەجۆرێکە کە وا ئاسان بەو ئاوە ساردەو بەبێ سابون لەشی لێ پاکناکرێتەوە.

رۆژێك بانگی قالەیان کرد، چوە دەرێو دوای چەند دەقیقەیەك هاتەوە.. چەند دەرپێو فانیلەی ژێرەوەی پێبو، گوتی ئەوە عومەری ئاوەکەڵێ بۆی هێناوم.

عومەر پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە دەبێت. وابەستەیی بەرژێمەوە لێ دەردەکەوێتو دەگیرێت. دوایی را دەکاتو دەبێت بەبەکرێگیراوێکی درندەو پیس.. هەر بەو بۆنەیەوە قالە گوتی: هەر ئەویش هەوڵ دەدات تا بەربدرێم. دیار بوو کە لەهەردوو ریوایەتەکەیدا درۆ دەکاتو دەیەوێت چاوڕاو لە ئێمە بکات.

گوتم: جا ئەوە چەندین مانگە تۆ لەم دۆزەخەدایتو نەیتوانیوە شتێ بکا، وەك خۆشت دەڵێیت بردیانیت بۆ دادگاو هێنراویتەوە، ئەگەر ببرێیتەوە تۆش بەسێدارە حوکم دەدرێیت! دەی باشە کەی ئەم واسیتەیەت دەجوڵێتو لەو مەینەتییانە رزگارت دەکات؟

ئەو قسانەم زیاتر بۆ گاڵتەپێکردن بو. چونکە هەمو کەس دەیزانی کە سەرجەم کوردە بەعسیو جاسوسەکانیان لەخەڵك بەگرتنو بەکوشتندان زیاتر هیچی تریان پێ ناکرێت، بەعس کوردی هەر بۆ ئەو مەبەستانە دەوێت نەك بۆ شتێکی تر. جگە لەوە ئەم خۆی لە عومەر پیستری لێهاتووە.

ئەمرۆ دووشەممەیەو ١٧ی نۆڤەمبەرە..

لەپەستیو خەمەکانی خۆمو دڵڕەقیو کرداری گیانلەبەرانی سەر بەم دەزگا داپڵۆسێنەرەی ئەم داگیرکەرەو کۆنەکردنەوەی لەهیچ خراپەیەكوگوێ نەدان بەدابو نەریتی کۆمەڵگای شارستانیی، لەگینگلدانی ناو ئازارو خەفەتی ئەم ژیانە کۆیلانەیەدا، بیر دەچووە سەر تاکە ئامرازی خۆپاراستن لەم جۆرە دوژمنانە. کە تەنها قەوارەیەکی خۆماڵیو سەر بە خۆیە کە ئەرکی پاراستنی مرۆڤی کورد لەم جۆرە دڕندانە بگرێتە ئەستۆ، لەوانەوە بۆ: ئاخو داخو بۆ بیرەوەریە مەزنەکەی ئەمرۆ.شەستو دوو ساڵ لەمەوبەرو لەم رۆژەدا (١٧- ١١- ١٩١٨) بو کە حوکومداریی شێخ مەحمودی حەفید لەسلێمانی پایتەختدا بڵاوکرایەوە. کورد یەکەم نەتەوەی ناوچەکە بو کە خۆی سەربەخۆیی خۆی بڵاوبکاتەوە، خۆی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دابمەزرێنێ، یەکەم نەتەوەی ناوچەکە بو کە دەیویست سەربەخۆی تەواو و بێ چاوڕاوی هەبێت، و یەکەم نەتەوەش بو کە بەهێزی چەك بەرامبەر داگیرکەر، ئیمپریالیزمی بریتانیای مەزنو دەستکردە تازە بەوەڵەد بووەکەش بووەستێ.

داخ بۆ لە دەستچوونی ئەو حوکمدارییەو دووەمو سێیەم پلەی مەلیکایەتییەکەی شێخی کورد (١٩١٨- ١٩٢٤) کە روخاندنی بو بە نەهامەتییەکی بەردەوام بۆ کورد، کە تا ئەمرۆش لەتاڵاوەکەی دەچێژین. چونکە گەلێ لە ئەفسەرە دەسەڵات بەدەستەکانی ئینگلیز نەك هەر سەربەخۆییان پێڕەوا نەبینینو نەك بە کۆلۆنیی خۆشیان قوبوڵیان نەکردین. بەڵکو باشوری کوردستانیان ئەوقی ئیستیعمارێکی دواکەوتەی وابەستە بەخۆیان کرد. مەبەستم ئیستیعماری کەمایەتیی چینی

رەگەزپەرستو بورجوا دەرەبەگی عەرەبزمانو سوننە مەزەبە، بەمەلیکایەتی پاشەیەکی دەربەدەر لەولاتی خۆیو دەرکراو لەولاتی سوریاو بێگانە بەو ولاتە تازەیەو نامۆو داگیرکەر بۆ کورد. هەر ئەوەش شیعرەکەی شێخ مەحمود خۆی هێنایەوە یادم کە دەڵێت:

نامەوی ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومڕەهی
نایکەمەسەر خۆم بەدەستی مودەعی تاجی شاهی
قەت بەئەمری دوژمنانم نامەوێ فرماندەهی

لە بەسەرکردنەوەی ئەو شیعرەشدا دەمگوت: ئەگەر کورد هێزو توانای شەڕی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهانی نەبوبێت، کە لەو سەردەمەدا هیچ میللەتو دەوڵەتێکی تری دنیا لەو ئاستەدا نەبو. دەی لە پیرەمەگرون سەربڵند تر، دەبا ئەو ئەمرەی مودەعیو دەستەکەیت بۆ ئەو ماوەیە قوبوڵ بکردایە تا ئەو ئیستیعمارە دواکەوتەیە جێگەی حوکمڕانییەکەی ئەو ئیستیعمارە پێشکەوتووەی نەگرتایەتەوەو هەر دەستی ئینگلیزو ئەمرەکەی ئەومان بەسەردا بسەپێنرایە، نەك ئەو بەڵایەی کە دوای شەستو دوو ساڵ ئاوا لەژێر چەپۆکی رەشیداناڵەمان دێتو کەوتوینەتە بەردەم هەڕەشەی لەناوبردن.

هەر لەو بۆنەیەدا، لەقوتبوونەوەی دژەکان بەرامبەر بەکوردو سەرکردەکەی، کە کورد خۆشی دەستی تێدابووە، ئەو دوژمنە گەورەیەی ترم وەبیرهاتەوە کە زیرەکانە هەم کوردی بۆ مەبەستەکانی خۆی بەکاردەهێناو هەم بو بەگەورەترین دوژمن لەتێکدانی هیوای کوردو دەستکەوتەکانی لەکۆتایی نۆزدەکانو نیوەی یەکەمی بیستەکانی سەدەی بیستەمدا. مەبەستم ئەتاتورکی پەروەردەی دەستی لاوە تورکەکانە کە کورد رۆڵی لە خوڵقاندنیدا بینیی. سەرەتاکەشی ئەو کۆنگرەیە بو کە لەساڵی ١٨٨٩ دا بەستراو "جمعیە اتحاد عوسمانی" لێوە خوڵقێنرا کە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی: (ابراهیم تمو- ئەلبانی، اسحاق سکوتی- کوردی دیاربەکر، محمد رشید- چەرکەسی، وە د. عەبدوڵلا جودت- کوردی عریگیە، بون. ئەوەش زەمینەی دامەزراندنی لاوە تورکەکان بو لە (١٨٩٦) دا کە بون بەگەورەترین ملۆزمی رەگەزپەرستانە لەدژی کوردو خواستەکانیو ئینجا خوڵقاندنی تراجیدییەکانی کۆمەڵکوژکردنی کوردو راگواستنی سەدان هەزار خێزانی کورد لەکوردستانی باکور بۆ ناوچە دورەکانی تورکیا تا دەستیان بەکوردستاندا نەگاتەوەو نەتوانن زمانو کولتوری خۆیان بپارێزن، شان بەشانی کۆمەڵکوژکردنی زیاتر لەیەك ملیۆن ئەرمەنیی. ئەم زیندانییەشوئەم زوڵمو ئەشکەنجەو چەوساندنەوانەش بەشێکی سەرەنجامی ئەو دیاردە مێژوییە غەریبانەن.

تا دەهات ژیانی ئەم زیندانە قورس‌و زەحمەت‌و پڕوکێنەر تر دەبو. نینۆکی دەست‌و قاچمان درێژ دەبون، سەرو ریشمان زیاتر دەبو، چڵکنی‌و پیس‌و پۆخڵی‌و نەبونی حەمام، قەدەغەکردنی ئاوی گەرم‌و سابون‌و جل گۆڕین تا دەهات چڵکن‌و پڵکن و رزیو دەبون.. ئەسپێی ناو لەش‌و قژو ریشمان بوبوە لەشکرێکی لەشکان نەهاتو، چونکە دۆزین چاری نەدەکرد، جگە لەوە روناکیی گلۆپێکی کەم تیشک‌و ژورێکی لەو جۆرە وای لێکردبوین کەچاومان هەر ئەسپێ گەورەکان ببینێت. کە سەرمان دەتەکاند بەسەدان دەهاتە خوارەوە، ریشمان‌و تەنانەت سمێڵ‌و برۆشمان ئەسپێیان لێهەڵدەوەریی.

رۆژ لەدوای رۆژ لاوازتر دەبم.. خۆشم کەم خۆرم. جار جار کەمال دەڵێت: بەخوا تۆ نەبیت تێربون بەخۆمەوە نابینم، ئەم گیانێکی بەو کەم خۆرییەی منە. لەم ماوەیەدا هەندێك توشی سکچون بووە. هەبو بیری لەپەتاو نەخۆشیی نەدەکردەوە! شەوێك یەکێکمان هەستاو گوتی بەخوا بشمکوژن من لەسەر تەنەکەکە دادەنیشم، چونکە خۆم پێناگیرێت، چەند کەسێك بەتوندیی بەرامبەری وەستان‌و بەوە رازی نەبون. کوڕەش بەروخسارێکی پڕ لە بەزەییەوە دەیگوت: بابە لەبری ئەوەی بیکەم بەخۆمداو بۆن زیاتر بێت بەسەرتاندا، بابیکەمە ناو تەنەکەکەوە باشترە.. ئیتر کە نەتوانرا رازیی بکرێت دوکەس بەتانییان بۆ کرد بەپەردەو کەوتە رییان. دیمەن‌و بۆنێکی بێزراو بو، دەشبوو قبوڵ بکرێت، دوور نییە ئەوە نەیەتە رێگەی هەر یەکێکمان. بۆ بەیانی کە حەرەسەکە کەشفی تەنەکەکەی کرد، و پرسیاری کرد: ئەوە کێ لە یاسا لای داوە؟ ئەویش دەچێتە دەرێ‌و حەسیرمەیانێکی باشی دەکەن‌و دەینێرنەوە ژورێ. کابرا گوتی بەخوا نرخەکەی گران نەبو، گەڵێ لەوەش زیاتر بوایە هەر ناچار بوم قوبوڵی بکەم، راستیش دەکات، چونکە ئەگەر بیشیکردایە بەخۆیدا وا ئەو لێدانەی هەر دەخواردو ئێمەشی زیاتر ناڕەحەت دەکرد. ئیتر دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا رابێین. چونکە ناو بەناو لەسەر تەنەکە دانیشتن بو بەدیاردەیەکی خۆ لێلانەدەر.

منیش توشی ئازاری سك بوم.. هەرچەند داوای خەستەخانەم دەکرد بێ سود بو.

ماوەیەك پێش ئەوە قالەیان بانگکرد، کە هاتەوە، تەواو خۆی خەمبار کردبوو، وتی دەمنێرن بۆ مەحکەمەو حوکمی ئیعدامیشم دەدەن. جارێکی تر بانگیان کردەوەو گوتی:

- ئیتر تەواو ئەمە دوا جارەو ئیتر ناتانبینمەوە..

دوای چەند رۆژێکی تر لەحەمامەکەی تەنیشت ژورەکەمان بینرایەوە..

دیار بو پێیان گەیاندبو کە توشی سکچون بوم. بەیانییەك کە کاتی چونە سەر ئاودەست بو، لەگەڕانەوەو دانیشتن لەبەر دەرگاکەدا بۆ چونە ژوورەوە، هەستم کرد کە قالە بانگم دەکات، زیاتر گوێم شلکرد، راستبو قالە بو، گوێم پێنەدا، دوایی دوو دەنك حەبی دابووە دەست یەکێکی ترو لەگەڵ خۆیدا هێنایە ژوورەوە.. وتی:

> ئەوە قادر بۆی ناردویت..

< وتم چۆن زانیت ئەوەو چۆن وێرات لێی وەربگریت..؟

< وتی حەرەسەکە ئاگادار نەبوو. سەیرێکی کەمالم کردو وتم:

< ئەم هەتیوە چی تری بەدەستەوەیە.. من تا ئەو کاتە نەمدەزانی چیم لەسەر بارکراوەو چیتر ماوە پرسیاری لەسەر بکەن. بەڵام ئەوەندەم مەزەندە دەکرد کە رێگەیەکی دورو درێژم لەبەردەمدا ماوە. بەهەرحاڵ حەبەکانم فڕێدا.

ئەم شانۆگەرییەی قالە بو بەجێگەی بیرچڕکردن لەسەری‌و بەدوای هۆیەکەیدا دەگەڕام، دەمزانی بۆ سەلماندنی بەتەنگەوە هاتنی من ئەوە دەکات، بەڵام بۆچی‌و بۆ کەی.. ئەی هێندە بێ ئەقڵن و گوایە نازانن‌و پیاو پرسیارێ لەخۆی ناکات کە: ئەو چۆن چۆنیی ئەو حەبانەی دەستگیر بووە؟ ئایا دەبێت جارێکی تر بهێنرێتەوە لامان و بمانبینێتەوە..؟ دەبێت چی تریان بەدەستەوە بێت‌و چی نەخشەیەکیان بۆ دانابێت..؟ زۆر زەحمەت بو وەڵامی ئەو پرسیارەو ئەو باری سەرنجانە بدرێتەوە.. بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە کاری شەڕو تێوە گلاندنە نەك کاری دۆستانە. دوای دوو سێ رۆژ قالە لەحەمامەکە گوێزرایەوە.

رۆژێك لە هاتن بەدوای زیندانیدا بۆ ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە، لەرۆژانی تر نائاساییتر بو، لەلێدانی دەرگاکە تەواو بەپێچەوانەی جارانەوە بو، بەئەسپایی لەدەرگاکە درا، بەجۆرێ کە هەستمان نەدەکرد دەرگای ژورەکەی ئێمەبێت، کەسیش وەڵامی نەدایەوە، جارێکی تریش هەر بەو جۆرە لەدەرگاکەی دایەوە، لەپڕ هاوارێك بەرز بووەوە کە بۆچی وەڵام نادرێتەوە.. کە یەکێك بەبەڵێ وەڵامی دایەوە ئەوسا هاوار لەناوی عەلی محەمەد کەریم کرا، کەس وەڵامی نەدایەوە، کە دووبارەی کردەوە، هەریەکە سەیری ئەویتر دەکات‌و کەس نییە وەڵام بداتەوە، هەمو بێدەنگ ماینەوە، بەتوڕەبونەوە سێبارەی کردەوەو گوتی ئەوناوە لێرەیە بۆ وەڵام نییە بۆ قسەناکەن؟ دیسان کەس قسە ناکات. کە عەسکەرەکە جارێکی تر ناوەکەی گوتەوەو هاواری کرد. ئەو ناوە لێرەیە بۆ قسە ناکات؟

ئەوسا کوڕێکی تازە لاوی باریکەلەو لاواز، تەمەن کەمتر لەهەژدە ساڵ، بادینانی‌و قوتابی ناوەندیی، تازە هێنابویان بۆ ئەم ژورە، هەستاوو بە بەڵێ وەڵامی دایەوەو ئەوسا گوتی: من ناوم عەلی محەممەد عەلییە. دەرگاکە کرایەوە. جەللادەکە کوڕەی

بۆ دەرەوە بانگ کرد. هەرکە پێی خستە ئەودیو دەرگاکەوە، دەستیکرد بە داپڵۆسینیی، بەگەلێك جنێوی ناشیرینەوە گوتی:

- سەرنج بدەن لەم گێلە پیاوە، تەنانەت ناوی خۆشی نازانێت، ئەی باشە کە هاوار دەکەم عەلی محەمەد کەریم بۆ نالێیت بەڵێ.

> ئاخر من ناوم عەلی محەمەد کەریم نییە! من ناوم عەلی محەمەد عەلییە.

- ئێ ئەی من دەڵێم چیی تۆ ناوت عەلی نییە؟

> بەڵی من ناوم عەلییە.

- باوکیشت ناوی محەمەد نییە؟

> بەڵی باوکیشم ناوی محەمەدە.

- ئێ کەواتە تۆ عەلی محەممەیت..؟

> ئەوسا کوڕەی سەرلێشێواو گوتی: راستە من عەلی محەمەدم بەڵام باپیرم ناوی عەلی- یە نەك کەریم.

_ئێی تۆ عەلی ناویتو بڕایەوە، هەی گەلحۆ، کەی فێری ناوی خۆت دەبیت؟ باشە بزانە ئێستا چۆن فێرت دەکەین کە ناوی خۆت لەبەر بکەیتو چۆن دەبێت ناوی خۆت فێرببیت. ئیتر بەلێدان لەگەڵ خۆیدا بردی، پاش نزیکەی چارەکێك بەلێدان هێنایانەوەو کردی بەژورداو ڕوی کردە هەموانو گوتی:

- ئەم سەگبابە ناوی خۆشی نازانێت، من هاوار لەعەلی محەمەد کەریم دەکەم کەچی ئەم لەخۆیەوە بەرزەپێ رادەوەستێتو دەڵێت منم، ئاخر تۆ باپیرەت ناوی عەلییەو ئەوەی من هاتوم بەدویدا باپیری ناوی کەریمە، دەی عەلیو کەریم هەر خوایان یەکە، تۆچۆن جوتت کردنو هەردوکیانت کرد بەیەك. ئەم کەرە چۆن لەدەرەوە تێکدەربوە بۆ وڵات، وا لێرەشدا بۆ ئێمە بۆتە سەریەشە..

بەو جۆرە عەلی بەسزمان، پێش لێکۆڵینەوە، بەهۆی ڕێکەوتی ئەو دو ناوەوە لێدانی مزریان دەرخوارد دا، و ئەوەندەی تر گێلیان کرد. چونکە لەراستیدا جگە لەو تەمەن منداڵییەی، خۆشی زۆر گێژو وێژ بو، زمانی لەدەمدا نەبو. وای بۆ دەچوم کە ئەگەر لەخۆڕایی نەگیرابێتو شتێك بزانێت وا زۆر بەئاسانی خۆی دەدات بەدەستەوە. هەرچەندە هەندێك لەزیندانییەکان دەیانگوت ئەمە پارتی بووە، ئیعتیرافی خۆی کردووەو لێبۆتەوە.

هەر لە سەرەتای هێنانی بەندە نوێیەکان، دوای جیاکردنەوەی ئێمە، عەرەبێکمان لەگەڵ بو، دەیگوت لەبەر قاچاغچێتی چەك گیراوم، قاچاغچێتیەکەی زیاتر لەگەڵ پێشمەرگەدا بووە. پیاوێکی کەڵەگەتی تێکسمڕاو، تەمەنی نزیك بەچلو پێنج ساڵ دەبو، بەردەوام قالە ئیزعاجی دەکردو شەڕی پێدەفرۆشت، ئەویش بەردەوام لەگەڵ

خەو خەریك بوو، كە ئەوو كەمال لەپانی ژورەكە بەرامبەری یەكتر پاڵدەكەوتن، رێك بنی پێی هەردوكیان لەیەكی دەدا.

ژورەكە تا دەهات قەرەباڵغتر دەبو. هەروەك ژورەكانی تر، ژوری ژمارە دوو بوبو بە ٩٥ كەسێك. ژورەكەی ئێمە لەچلو پێنج تێپەڕی كردبو. كۆی زیندانییەكانی هەرسێ ژورەكانی سێیەم حەوشە (٣و٤و٥) نزیك بە سەدو پەنجا زیندانییەك دەبو، رۆژ بەرۆژ زیاتریش دەبون. ئەوەی بۆ من ئاسان بو كە لەگەڵ ژمارەی زیندانییەكانی هەر ژورە بەجیاو هەمو هەیئە بەگشتیی ئاگاداربمو رۆژانە سەرنجی لێبدەم. دابەشكردنی هەندێ خواردەمەنی بۆ نمونە سەمون كە هەریەكە دانەیەكی بەردەكەوت، ئیتر بۆ هەر ژورە ژمارەكەیان دەگوت كە چەند ببرێت بۆی. دوای ئەوە بەماوەیەكی كەم وای لێهات كە ژمارەی زیندانییەكان رۆژانەو بەگشتیی لەدەوروبەری سێ سەدو پەنجا زیندانیدا بێت. جاری وا هەبو چەند دەبران بۆ مەحكەمەو نەدەهێنرانەوە، ئەوەندە، كەمێ كەمتر یان زیاتر لە زیندانیی نوێ دەهێنران..

ماوەیەك كشو ماتو بێ بانگكردن بو بۆ تاقمەكەی ئێمە.. ئەو ماوەیە بە تاقمەكەی عەلی حەسەناغای مەنگوڕییەوە مەشغول بون، كە لەپڕ خۆیو سوارەو قادر (كەوا بزانم برازای بون) وە سێو چوار پیاوێكی، كران بەهەیئەدا. وەختێكمان زانی هاوار هاوارێكی نائاسایی لەچەند كەسێك بەرزبووەوەو باڵی بەسەر هەیئەدا كێشا. دووەم رۆژ بەهەمان شێوە.. دیار نەبو كە زۆر بەتوندیی ئەشكەنجە دەدران، جاروبار هاوار دەكرا: ئیعتیراف ئیعتیراف ئەوە چەند رۆژێك دەوامی كرد.. لەناویاندا ئەو سوارەیە زۆر ئازاو خۆڕاگر بو.. سەرەنجام هەموویان روخان قادر نەبێت كە دەستیان لە ئیش خستبو. بۆیە وازیان لێهێنابو، لەژوری ژمارە یەك دایاننابو. ئەو رۆژانە من لەوێ نەمابوم.

ئەوان دانیان بەوەدا نابوو. كە ئەو لوغمەی بۆ قائیدی فیرقەی ٣٤ دانرابو بەهۆی ئەوەوە كە گوایا لەماڵی عەلیاغاش دەعوەت دەبێت، ئەوان لەسەر رێگەكەیدا دایاننناوەو بۆتە هۆی كوشتنی ئەوو چەند كەسێكی تر. سەرەنجام هەواڵی ئیعدامكردنی هەمویان باس دەكرا. لەناو خەیاڵی ئیتر چیمان لێبكەنو چیمان لێنەكەن‌دا دەژییاین. قالەش لەتەنیشت منو كەمالەوە نەمابوو. بۆیە كەوتبوینە گێڕانەوەی سەرگوزشتەی سەردەمەكانی رابوردو، لەسیاسیو ناسیاسیی. رۆژێك گوتی: ئەوە تۆ بیری ڤیانو ژیلوانو ئاریانو مەریوان و ژوان ناكەیت..؟ سەرنجێكم داو دوای كەمە بێدەنگییەك گوتم نە.. بەسەرسوڕمانێكەوە گوتی ئەوە بەراستتە..؟ گوتم لەم قەسابخانەیەدا نابێت سۆزو عاتیفە ئاراستەی مرۆڤ بكات. هەرچی ناوی

چڕکردنی بیرکردنەوەی لەو بابەتانەی ناو ئەو جۆرە باسانەیە نابێت بهێڵرێت سۆزو بەزەیی‌و خۆشەویستیی بجوڵێنێت، نەوەکا ببنە هۆیەکی لاوازکردنی ورەو خولقاندنی زەمینەیەکی خراپ بۆ روخاندن. گوتی راستە بەڵام چۆن ئەوە دەکرێت؟ گوتم تا بتوانرێت دەبێت ئێمە وا بکەین. بۆیە نابێت تۆش بیر لەدەزگیرانەکەت بکەیتەوە. چونکە ئەم لەو رۆژەی تێیدا گیرا دەبوو دەستگیرانەکەی نیشانە بکات، جا لە بری ئەو ئاهەنگە وا ئێستا دەبێ لەگەڵ ماتەمیی ئێرەدا خۆی بگونجێنێت..

لەراستیشدا لەژێر زۆرو گوشارێکی بێ ئەندازەدا ئەو بیرانە لەخۆم پەرەوازە دەکەم، هەرچەندە ئەوانە کاتی‌و بۆ کەمالی دەرناخەم، ئەگینا خۆشەویستی هەمو جگەرگۆشەکانم لەناو مۆخ‌و قولایی وردە دەمارەکانی خوێندا ریشەیان داکوتاوە، هەریەکەیان تاموچێژێکی تایبەتیی‌و جۆرێکی بێ وێنەی خۆشەویستییان لای من هەیە کە هیچ گوشارێك لەتوانایدا نییە بیرەکانی دەوریان ئاوارە بکات.

تا ئێستا شتێك دەربارەی چارەنوسمان نازانین. بەتایبەتی ئەشکەنجە لەسەر چەند کەسێك بەردەوامە. هەرچەندە من تا ئێستا سێ جار بانگکراوم، دیسان ئەوە بە کۆتایی نازانم، بگرە وا هەست دەکەم کە بارە قورسەکە هێشتا نەدراوە بەکۆڵمدا، چونکە ئەگەر وا نەبێت وا نەدەبو کەمتر لەهاوڕێکانم لێم بدرێت..

لەم رۆژانەدا کە رووەو کۆتایی مانگی نۆڤەمبەرە. بانگنەکردنی ناو لە کۆمەڵەکەی ئێمەدا بەردەوامەو وای بۆ دەچین کە سەرە هاتبێتە سەر ئیفادەو پەنجەمۆرکردن. هەرچەند من بۆ خۆم ئەوە نەدەهات بەخەیاڵمدا کە بەرامبەر بەمن، بەوەی ئێستا کردویانە رازیی ببن..

بەندێکی تازە هێنرایە ژورەکە، هێندە تێیگەیشتین کە ئەمیش دوو سەرە بووە، کە بردیان بۆ ئەشکەنجە، زۆری نەبرد بەدەنگە دەنگی عەسکەرەکاندا زانیمان کوڕە هێنرایەوە، نەخێر کردیان بە ئاودەستەکەدا، دوایی تێیگەیشتین کە لەژێر ئەشکەنجەدا خۆی پیس کردووە. لەبەر بۆن وازیان لێهێناوەو بۆ خۆپاککردنەوە کردویانەتە ئاودەستەکەوە.. جارو دوو جار هەمان دیاردە لەو زیندانییە روی دەدایەوە. من وای بۆ دەچوم کە ئەوە بە ئەنقەستو بۆ خۆ لەئەشکەنجە دزینەوە بێت.

# کاروانی بێ کۆتاییو گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## (٥)

## سەرەتای زیندانی تاککەسیی

دەمەو عەسری دوا رۆژی مانگی نۆڤەمبەر، بەشێوەیەکی نائاسایی لەدەرگا درا. بانگی ناوی من کرا. بۆیە دەشڵێم نائاسایی، چونکە ماوەیەك بو بانگکردنمان لەبیر چوبووەوە. وامان دەزانی کە رەنگە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە بۆ هەمومان دوایی هاتبێت، هەروەك ئەزمونی زیندانییەکانی تریش ئەو بۆچونەی دەسەلماند. کە دەرگا والآکراو هەنگاوم بۆ دەری دەرگاکە نا، چاومیان بەستەوە. سۆندەم درایە دەست. پاش دوو دەقیقەیەك وەستان، فرمان درا: خۆت دابکەنە! خۆداکەندنی چیی، من بیجامەیەکم لەبەردایە کە چڵکنیی ئەو مانگو نزیك دوو هەفتەیە دایپزاندووە، هەر بە ناو جلم لەبەردایە، دیارە ئەمانە نایەڵن تەنانەت بەو جۆرە جلە شڕانەشەوە ئەشکەنجە بدرێم، نەکا شتێك لەئازاری کێبڵو سۆندە بگێڕێتەوە. جلەکانم داکەند بەسەرما قیژاندیان:

- ئەگەر ئیعتیراف نەکەیت وا ئەمڕۆ دوا رۆژی ژیانت دەبێت.

< ئیعتیراف لەسەر چیی..؟

- لەسەر ئەوەی کە دەیزانیت.

< ئاخر من هیچ نازانم.

درام بەزەویدا، کەوتنە سۆندە وەشاندن. هەستم کرد کە چەند کەسێك بێ دەست پاراستن سۆندەو کێبڵ دەهاون، لەنوکی پەنجەکانی پێمەوە تا تەوقی سەرم دەگرێتەوە. هاوار هاواری من بەجنێوو تێسرەواندنی قاییمتر لەلایەن ئەوانەوە وەڵام دەدرێتەوە. نەخێر دیارە بەجیدییانەو ئەمە لێدانی مردنە. ئەمە دۆزەخەکەیە. ئازار لەسنور دەرچووە. هەمو گیانم دەگرێتەوە. دەست لەسەرودەمو چاویش ناپارێزن. ئەشکەنجە بەردەوامەو گەیشتە ئەو ئاستەی کە وردە وردە لەشم لەگەڵیدا قاڵ ببێت.

دەی ئێستا نا کەمێکی تر بورانەوە حەیاتەکە لەقاپیم دەدا. نەخێر هەر تەواو بێڕەحمانە دەمکوتنەوە. وەك خەو گوێم لەدەنگێکە دەڵێت: لەوە دەچێت بورابێتەوە. تا لەناو پڕوکاویی ئەو ئەشکەنجە شەیتانییەدا ئاگام لەخۆم نەما..

کاتێك هۆشم بەبەردا هاتەوە. کارەبام لێدەدرێت. ئاوم پێدادەکەن. دنیا ساردو ئاو ساردتر. ئەمەیان ئەو ساتانە بو کە پێش بینین لێی دەترسام. دوای ماوەیەك بەجێهێشتن، هەستم کرد هەمو ئەندامانی لەشم وەك گەڵای بەردەم رەشەبا هەڵدەلەرزێن. بەسەرما نەڕاندیان تا بەرزبیمەوە. هەوڵمداو کەوتمەوە بەزەویدا، بەشەق کەوتنە گیانم.. بەرز نابمەوەو لەدەست خۆمدا نەماوە، مەگەر بەچواردەستە بەرزم بکەنەوە. ماوەیەك بەجێیان هێشتم. دیسان هاتنەوەو ئەمری هەستانیان پێکردمەوە.. هەرچی چۆنێك بو بەچەماوییەکەوە خۆم راگرت. گوتیان بگرە.. دەستم برد سۆندە بگرم، لەگەڵ دەست بەرکەوتندا بەتوندیی فڕێدرامو دامی بەدیوارێکدا، هەستم کرد کە بەرەو ئەرزەکە شۆڕدەبمەوە. کە هۆشم بەخۆدا هاتەوە دیسان ئاوە ساردەکە لەسۆندەکەوە فیچقەی دەکرد. لەسەرەوە تا خوارەوە بەلەشمدا دەکرا. جەستەیەکی بەناو گیان تیاماو لەناو زەحمەتیی ئەو ئەشکەنجەو ئەم ئاوە ساردە بەو وەرزی زستانە دەبێت چیتری لێبکرێت؟ لە راستیشدا خەریکە هیچ مانـاو ئومێدێك بەژیان نامێنێت. وام لێهاتوە کە مردنم لا زۆر ئاسایی ببێت. رقو گیانی تۆڵەی رەواش لەهەناومدا قوڵپی دەدا. لەو شەکەتبونو بەرەو مردن چونەدا ئاواتم بەو رۆژە دەخواست کە بتوانم جارێکی تر لەدژی بەعس خەبات بکەمەوە. خێرا خێراش پرسیارم لەخۆم دەکرد: باشە ئەی تۆ بەعست نەدەناسیی؟ چیت کرد بۆ یەکگرتنەوە لەدژی بەعس؟ ئەی باشە خۆت چیت بە بابەکراغاو بەمەلا ماتۆڕ گوت. ئەی خۆت لەهەمو بۆنەیەکدا لەدژی رژێمەکان، بەتایبەتی ئەم جانەوەری بەعسە، بەئاشکرا قسەت نەدەکرد، ئەم وردەگلەییو رەخنانە لە نەبەستنەوەی کردەوە بە لایەنی تیۆرییەوە بەرەو هەندێ بیرەوەریی تر رایانکێشام..

رۆژێکیان لەگەڵ مام جەلال-دا لەسەر بەعسو بەیانی ئازارو پاشەڕۆژی سیاسیمان قسەمان دەکردو گوتم:

< جگە لەئەرکی نەتەوایەتیو نیشتمانیی بۆ بەردەوامیی خەبات لەدژی ئەم حیزبە تا بیناقاقە شۆڤینییە، ئێمە ئەرکی تۆڵەسەندنی رەواو ویژدان ئاسودە کردنیشمان لەسەرە.. مەبەستم ئەوەبو کە یەکێك لەهۆیەکانی ئاشتبونەوە لەگەڵ بارزانیدا رونبکەمەوە، بۆ بەرە دەرهێنـان لەژێر پێی رژێمی بەعسو ئەو ناوو ناتۆرەیەی بەناڕەوا بە باڵەکەی مەکتەبی سیاسییەوە لکێنرا بێ ئەوەی ئەهلی ئەوەبێت.

> مام جەلال کە لەو کاتەدا بڕیاری خۆی لەسەر ڕێکنەکەوتنەوە لەگەڵ بارزانیدا دابوو. لەبۆنەی کۆتایی ئەو پرۆسەی یەکگرتنەوەیەدا، لەدوا ڕۆژی دواخولی کۆبونەوەکانی دواکۆنگرە لەجەژنی قوربانی ئەوساڵەدا، بۆ هەڵوەشانی پ.ش.ك و یەکگرتنەوە لەگەڵ بارزانیی، وە بۆ نوسینی بەیانی یەکگرتنەوە، کۆنگرە (مام جەلالو عەبدولڕەحمان زەبیحیو بەندە)ی هەڵبژارد، لەماڵەکەی زەبیحیی، لەباسی ئەم ڕێککەوتنەوەیەدا لەدرێژەدان بەهەڵوێستەکەی خۆی گوتی:

> باشە وا ڕێکدەکەون من لێتان دانابڕێم، چونکە ئەو کاروانە کە ئێمە لێی بەرپرسیار بوین، هەر بەو لێپرسراوەتییەوە لەگەڵتان دێم تا لەئاوەکە دەتانپەڕێنمەوە.. ئەوسا من خواحافیزیتان لێدەکەم..

< گوتم باشە ئاخر خۆ مەسەلەی ڕێککەوتنەوە لەدوای هاتنەکەی فاخیر مێرگەسوریی بۆ بەغدا، هەر خۆت هێناتە ئاراوەو دەرگاکەیت کردەوە لەڕاستیشدا هەر تەنها مام جەلال دەیتوانی ئەو دەستپێشخەرییە بکات، چونکە لەو بارکەوتوییەی ڕێکخستنەکەمان و ئەو سەرکەوتنەی مەلا مستەفادا، زیاتر خۆپەسەندیی کوردانەو بیری خۆگریی لەناو کارەساتدا ڕۆڵیان دەبینی. هەرچەندە ئەو لابەلاکردنی شەڕی ناوخۆو ڕێککەوتنەوەیە یەکێك بو لەمەبەستە سەرەکییەکانمان، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە پڕکێشیی کارێکی وامان نەدەکرد، چونکە لەوەش دەسڵەماینەوە کە نەیارەکانی ئێمە هەڵوێستەکەمان بەبارێکی ئاوەژودا بۆ بخەنە بەرچاو. بەڵام مام جەلال دەرگاکەی کردەوە، ئەوسا زەمینەکە سازو لەباربو بۆ مشتومڕ لەسەر باسەکە.

دیسان هەر لەو بۆنەیەداو لەوەڵامی بۆچونەکەی ئێمەدا لەسەر ڕێککەوتنەوە، گوتی:

> ئاخر بەرە لەژێر پێ دەرهێنان بەو جۆرە ناکرێ، ئێوە سەبر بگرن بزانن بەرە لەژێر پێ دەرهێنان چۆن دەبێتو چۆن دەیکەم ئێوە پەلەم لێ مەکەن...

من بۆخۆم لەگەڵ برادەرەکانمدا گەیشتبوینە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر ئەم دەرفەتی ڕێککەوتنەوەیە لەدەست بدرێت، وا لەنوێ بونەوەی شەڕدا ڕۆڵی بێلایەنیمان پێ نابینرێت، هەروەك چۆن لەوەوبەر نەمانتوانیی ببینین. چونکە هیچ جۆرە زەمینەو هەلو مەرجی ڕۆڵێکی وا لەئارادا نەبو. لەدوو ڕێگەش زیاتر لەبەردەمدا نەدەما، یان لەگەڵ ئەملا یان لەگەڵ ئەولا، چونکە هیچ لایەکیان بێلایەنیی ئێمەیان قوبوڵ نەبو. بۆ ئێمەی لایەنگرانی ڕێککەوتنەوە، ئەملا بەرەی گەلو ئەولاش بەرەی دوژمنی سەرەکی بوو. بۆیە بڕیاری خۆمان لەسەر ئەو لێکدانەوەیە دابوو. بەڵام گرفتی گەورە لەوەدا بوو کە بارزانیی مەرجەکانی خۆی دەسەپاندو گەلێ لە لێپرسراوەکانی زۆر ناحەزانە ڕەفتاریان دەکرد..

لەناو ئەو شەکەتییو مەرگەساتانەدا ئەو بیرانە خۆیان قوت دەکردەوەو بروسکە ئاسایی تێپەڕ دەبون.. بەلام کارەبا لەعنەتییەکەو جۆرێك لە خوتوکەدان، دەیهێنامەوە ناو دنیای ئازارو ئەشکەنجە، نەیدەهێشت تەنانەت لەساتەکانی نیمچە سەرەمەرگیشدا بەو خەیالانەوە خەریك ببم‌و ببنە هۆی کەمێك بیرلادان لەئازاری ئەشکەنجە. منیش بڕیارمدا کە هەر بەلەسەر خۆچون خۆم پیشان بدەم بۆیە هەولم دەدا، دان بەخۆمدا بگرم‌و جولەی بۆ نەکەم.. چەند هەولیانداو ئەمسەرو ئەوسەریان بەکارەباکە کردو بەشوێنە هەستیارەکاندا دەیانهێناو دەیانبرد، بێ سود بو. لە ڕاستیشدا لێدان‌و کوتانەوەی هەمو گیانم بەو بێ ڕەحمییە، یارمەتیدەرێکی گەورەی ئەو خۆگرییەیە. چونکە کەمتر هەستم بەکاری کارەباکە دەکرد. کەمێك وەستان و لەپڕ یەك دوو لەقەیان تێسرەواندم‌و بەجنێوە پیسەکانیانەوە قیژاندیان هەستە. نەجولام، قسەکەیان دوبارە کردەوە، هەر کەلکی نەبو. ئەوسا ڕایانکێشامە بەردەم ڕەئیسی هەیئە. بەرزیانکردمەوە، نەمتوانی خۆم ڕابگرم بۆیە کەوتمەوە بەزەویدا.

ڕەئیس گوتی:

- با بە دانیشتنەوە قسە بکات. ئەوسا ڕەئیس خۆی (موقەددەم عامر موسلاوی) کەوتە قسەی پڕ لەگیانی بەزەیی: کە بۆچی وا بەسەر خۆم دەهێنم؟ بۆ قسە ناکەم، دەی قسە بکەو با ڕزگارت بێت.. دەی دەلێی چیی ئوستاز مەحمود ناتەوێت بچیتەوە ناو مال‌و مندالەکەت!

ڕقی ئەو ئەشکەنجەیە، هی ئەو ئازارو سەرماو سۆلەیە، هی ئەو ژیان‌و مامەلەیە هی ئەو قسە بێ لەزەتانە زیاتر تێکەل بەگیانی توڕە دەبن. بەلام ئەوەی کە پەنگ بەخەفەتی ناو ئەو گوزەرانەم دەخواتەوە، نەبوونی ئەو دەرفەت‌و ئازادییەیە کە بتوانم وەلامەکانی ناو مێشکمیان بەسەردا هەلبڕژێم، هەمو جارێکیش دەبێت ئاگادار بم لە هێمنکردنەوەی خۆم پێش ئەوەی وەلام بدەمەوە.

< چیی بلێم، ئێوە لە ئیرهاب‌و ئەشکەنجە زیاتر زمانێکی تر نییە قسەی پێبکەن؟ بۆچی وام لێدەکەن؟ من چیم کردووە؟ بەلگەیەك بێنن تا بلێم هەقتانە، ئەگەر ئێوە بەیاساو لێکۆلینەوەی دادپەروەرانە مامەلەم لەگەل دەکەن، وا ئەمە ڕێگەی یاسایی‌و شارستانیی نییە! ئەگینا چی یاسایەك ڕێگەدەدات وا لەمن بکەن؟ چی یاسایەك ڕێگە دەدات بەم جۆرە مامەلەم بکەن؟

لەپڕ یەکێك لە لێکۆلەرەکان بەهەلچونێکی ئاشکراوە هەلی دایەو گوتی:

- جەنابی سەرۆکی هەیئە ئەم جانەوەرە لێرەدایەو لەبەردەستمان‌و لەژێر ئەشکەنجەشدایە ئەم قسە زلانە دەکات! دەی دەبێت لەدەرەوە چیی گوتبێت‌و چیی بلێت! ئەم قسانە بەلگەن کە ئەم لەگەل تێکدەراندایە! کەوابو هەقمانە بەم شێوەیە

ڕەفتارت لەگەڵ بکەین، بەم شێوەیە بەزۆری هێز قسەت پێ بکەین و ئیعتیراف لەدەمی خۆتەوە ببیستین! ئەی ئەگەر تۆ بەقسەی خۆش و بە بەڵێنی بەرەڵاکردن و بەسوێندەکانی جەنابی سەرۆکی هەیئە قسە نەکەیت، دەی ئیتر هەر ئەم ڕێگەیە لەبەردەمی ئێمەدا دەمێنێتەوە. تۆ قسە ناکەیت، یارمەتیمان نادەیت، ڕەحم بەخۆت و بە منداڵەکانت ناکەیت، دەی ئیتر داوای مامەڵەی یاسایی چیمان لێدەکەیت! دەڵێی تۆ حەزت لەژیانی وایە نەک مەسئولیەت و پایە بەرزیی. دەی هەموی بەدەست خۆتەو قسە بکە. دە فەرمو ئەگەر ئێمە دەستبەرداری ئەشکەنجە ببین، شوێنی باشت بۆ تەئمین بکەین، ئایا قسەمان بۆ دەکەیت؟ واز لەو کەللە ڕەقییە دەهێنیت؟

< ئاخر من ئاگاداری هیچ شتێك نیم و هیچم نەبیستووەو لەسیاسەت بەدورم، ئیتر قسەی چیتان بۆ بکەم!

- دەی بەرامبەر بەهیچ نەزانین هەر ئەوە ئامرازی ئێمەیە، چارمان ناچارەو تۆ ناچارمان دەکەیت لەسەر ئەم شێوەی مامەڵەو ئەشکەنجەدانە بەردەوام بین، ئەوەش بزانە ئەگەر قسە نەکەیت بڕیاری تەواوەتیمان داوە کە لەژێر ئەشکەنجەدا دەتتۆپێنین..!

ئەو قسانەی ئەو لێکۆڵەرە ڕاستییەکی زۆر گرنگی یاسایی و سیاسیی خستە بەردەمم:

لەم زیندانەدا ئەشکەنجەیە کە لەناو یاسای بیابانەدا لێکۆڵینەوە بەڕێوەدەبات، تەنها مەبەستیش لێی ئیعتیرافکردنە بەزیندانیی، بۆ گەیشتنە ئامانجی سەرەکیی خۆیانە کە لەرەگو ریشە هەڵکەندنی کوردایەتی و کپکردنی دوادەنگی زوڵاڵ و دوا داوای مافە.

لە ناو ئەو ڕاستییە یاسایی و سیاسییەدا من لەبەردەم دوو ئەلتەرنەتیڤدا بوم، کە بۆ هەریەکەیان هەڵوێستی تایبەتی و جۆرە وەڵامدانەوەیەکی پێویستە، کە بۆ هەردووکیان لەیەك ئامانجدا یەکدەگرنەوە.

یەکەم: ئەگەر گرتنەکە بێ بەڵگەو بنچینەو بێ شایەت بێت، تەنها لەسەر گومان و لەبەر ڕابوردوو هەڵوێستی سیاسیی کۆن بێت.

دووەم: یان شایەت و بەڵگەی زیندویان بەدەستەوە بێت و بەپێی ڕەوتی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە بەریبخەن.

لەیەکەمدا دەبێت بەرگریکردن لەخۆ، وەڵامدانەوەی پرسیارەکان هەر لەناو بازنەی نکوڵیکردن لەهەمو شتێك بێت. لەناو وەڵامی پرسیار لەسەر لایەنە سیاسییەکان، خۆلابدرێت لەچونە ناو باسی سیاسیی و بەربەرەکانیی ڕژێم و هۆی ململانێ. چونکە چونە ناو ئەو بازنەیە، مانای خۆخستنە ناو داوەکەیانە. ئیتر

رزگاربون دەبێت بە مەحاڵ ئەگەرچیی لەكوشتنیش دوربێت. بەتایبەتیی رژێم ناهێڵێت دەنگو قسەوباسی ئەو دادگایەو وێنەكانیی بگاتە كەس. كە ئەوەش رێگرە لەبەردەم ئەو جۆرە كەسانەی كە دەیانەوێت بە بەرگریكردنی ئاشكراو ریسواكردنی دوژمنو دادگا كارتۆنییەكانی، ئەركێكی سەرشان ئەنجام بدەن، تا لەبڵاوكردنەوەو گەیشتنییان بەنەوەكانی تری نەتەوە سودیان لێوەربگرنو چاویان لێبكەن، بۆ بەرەنگاربوونەوەی داگیركەران، لەدووەمیشدا كە لەزۆر حاڵەتدا رزگارنەبون جێگەی پرسیار نییە، دوو رێگە دێتە بەردەم زیندانیی:

- نكوڵیكردن لەهەمو شتێك بە بەڵگەكانیشەوە..

- رووبەڕووبونی راستەوخۆ وەك خاوەن كێشە، ئیتر شێوەی وەڵامدانەوەی پرسیار قاڵبێكی تەواو سیاسی وەردەگرێ، جا كە بزانرێت مردن لەبەردەمدایەو خۆلادان لێی مەحاڵە، وا وەك ئەركێكی نیشتمانیو بەشێك لەململانێیەكە وەڵام دەدرێتەوە. هەرچەندە هەرچییەكیش بڵێیت نەك هەر ناگاتە دەرەوە، بەڵكو لەدۆسێكانیشیاندا نامێنێتەوە، چونكە هەر ئەوانە تۆماردەكەن كە خۆیان مەبەستیانە، تەنانەت بەداڕشتنەكانیشەوە..

پێش ئەوەی وەڵامی ئەو قسەیەی لێكۆڵەر بدەمەوە بروسكە ئاسایی ئەوەم بەبیردا هات.

دوایی‌ترگوتم:

< قسەی چیی بكەم، وەڵامی ئەو پرسیارانەی ئێوە لای من نییە. شوێنی من ماڵو قوتابخانەیە. لەم جێگایانەشدا باسی ئەو جۆرە شتانە ناكرێت، باس هەر باسی رەوشتو زانستو زانیارییە، لەقوتابخانەدا سیاسەت قەدەغەیە!

هەركە ئەو قسەیەم لەدەم هاتەدەرێ، یەكسەر رەئیسی هەیئە هەڵیدایەو گوتی:

- ئەوە چی سەگبابێك دەڵێت سیاسەت لە قوتابخانەدا قەدەغەیە؟ چۆن قەدەغەیە. ئەی تەنانەت دەرسە زانستییەكانیش تێكەڵ بەسیاسەت نەكراون؟ ئەی بۆ خۆت نەتبینیوە تەنانەت سیاسەتمان تێكەڵ بە ماتماتیكیش كردووە، كەواتە ئێوە لەوانەكاندا باسی سەرۆكی سەركردەو شۆڕش و حیزبی قائید ناكەن؟ ئەگەر وا نەكەن مانای وایە ئێوە پێچەوانەی یاساو لەدژی شۆڕش كاردەكەن. ئیتر چۆن چۆنی سیاسەت قەدەغە دەكرێت!؟ ئەو قەدەغەیە هەر بۆ دوژمنانی حیزب‌وشۆڕشە!

- دەی بابێینە سەر پرسیارێكی تر: باشە بابڵێین تۆ هیچ دەنگو باسێكت لەو بابەتەی پرسیارەكەی ئێمە نەبیستووەو نازانیت چیی لەشارەكەتدا روودەدات! با وا فەرزیش بكەینو بڵێین تۆ دانیشتویت! باشە لەو ماوانەدا لەبرادەرە كۆنەكانت كامیان پەیوەندیی پێوە كردیتو نامەی بۆ ناردیت؟ خۆ ئێمە دەزانین تۆ ئیشیان لەگەڵ ناكەیت.. بەڵام هەر حەز دەكەین بزانین چۆن وەڵامت دایەوە؟

< نەخێر من تازە لە ڕەمادییەوە بۆ سلێمانی گەڕاومەتەوە، ئەو ماوەیەش هەر بە دوکتۆرو خەستەخانەو چون بۆ بەغداو عەمەلیاتی گورچیلە دەرهێنانەوە خەریك بوم. ئیتر نە نامەی کەسم بۆ هاتووەو نەکەس پەیوەندیی پێوە کردوم.. چونکە ئەوانیش وەك ئێوە دەزانن من دانیشتوم و لە سیاسەت دورکەوتومەتەوە..

- باشە چۆن دەزانن؟

< ئەی کە من لێیان دوربموو ئیشیان لەگەڵ نەکەم، ئیتر چۆن نازانن!

- بەڵام ئێمە دەزانین کە جەلال تاڵەبانی نامەی بۆ ناردویتو داوای ئیشکردنی لێ کردویت. ئێمە دەزانین تۆ ئیش ناکەیت، ئێمە هیچمان لەسەر تۆ نییە، تەنها ئەوەمان پێ بڵێ کە چۆن وەڵامت دایەوە؟

< باشە کە ئێوە دەزانن من ئیش ناکەمو هیچیشتان لەسەر من نییەو هەرتەنها لەبەر ئەوەی بزانن من چۆن وەڵامی نامەیەکم داوەتەوە کە هیچ ئەسڵێکیشی نییە، چۆن دەبێت بەم جۆرە زیندانیم بکەنو ئەشکەنجەم بدەنو ئاوا مامەڵەم لەگەڵ بکەن!؟

- ئێمە دەزانین تۆ شت دەزانیتو دەتوانیت یارمەتیمان بدەیت! ئەوەش بزانە ئێمە دەزانین کە هەر هەمو جەلالییە کۆنەکانی تریش کاغەزیان بۆ چوەو ئێمەشیان لێ ئاگادارکردوەو هەندێکیشیان تیشکی سەوزمان داونەتێ کە لەگەڵیابن..ئەی تۆ چیت بۆ نوسی؟

< لەدەمێکەوە من ئاگاداری ئەو نیمو هیچ جۆرە پەیوەندییەکیشم پێوەی نەبوە، نامەشی بۆ نەنوسیوم تا وەڵامی بدەمەوە..

- پێی ناوێت تۆ نکوڵی لەوە بکەیت، چونکە ئێمە بە مسۆگەری دەزانین چۆنیش نامەکەیان گەیاندۆتە تۆ. ئێمە لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە زانیارییەکان وەردەگرین! بەڵام ئێمە دەمانەوێت سەراحەتی تۆ لەمەدا تاقی بکەینەوە. باشیش وایە نەیەڵیت ئەو بەڵگەیەت بخەینە بەردەست. چونکە ئەو کاتە پەشیمانیو ئیعتیراف دادت نادات! دەی چیت نوسیو بەکێدا وەڵامەکەت ناردەوە..؟

دیارە ئەمانە ئەقڵی لێکۆڵینەوەیان لاوازە، ئەگینا جارێ جەختی لەسەر وەڵامی پرسیارە ترسناکەکە نەکردووەو هیچی دەستگیر نەبووە وا پرسیارێکی ترسناکی تری خستە تەك. ئینجا ئەو سەرچاوەیەی ئەو دەیڵێت دەبێت کامە سەرچاوە بێت وا هێندە بڕواپێکراوە! وا دیارە ئەو هۆو پرسیارانەی منیان لەپێناودا گرتووە ئێستا سەر دەردەهێنێت. دەستم کرد بەسوێندخواردن کە ئەوەی ئەو خەبەرەی داونەتێ درۆی کردوەو ڕەنگە دوژمنایەتیی لە گەڵمدا هەبێت وا دوچاری ئەم نەگبەتییەی کردوم. ڕەئیسی هەیئە کەمێ وەستاو ئینجا گوتی:

- وا دیارە جارێ تۆ هیلاکیت بیبەن با ئەمشەو بحەوێتەوە. خۆ ئەگەر سبەینێ خۆی دەست نەکات بەقسە وایەل پەلی دەکەین..

قسەکانی رەئیس هەر ئەوەندە راستە کە من نامەم بۆ هاتوە. ئیتر بڕوا ناکەم قسەکانی تری ئەسڵێکیان هەبێت.. ئەوە بەشێکە لە فرۆفێڵی لێکۆڵینەوەکەیان.. رەنگە درۆی وا بەسەر خەڵکی سادەدا تێبپەڕێنرێت. چونکە ئەوە هوشیارییەکی زۆری پێناوێت کە پیاو لەو جۆرە قسانە حاڵی ببێت. خۆ هەر داڕشتنی پرسیارەکە خۆی هەڵەیە..ئەگینا ئەگەر بزانن نامەم بۆ هاتوەو بزانن بەکێدا نێرراوە، وا هەر زوو دەیانزانی چیی تێدا نوسراوە، وەڵامم داوەتەوە یاننا، چۆن وەڵامم داوەتەوە. جگە لەوە، نامەکە بۆ چالاکیی بووە نەك بۆ ئیش کردنەوە، چونکە لەمێژ بو من کارم لە سنورێکی تەسکدا دەکرد. زیاتر لەوانە ئەگەر ئەو قسانەی رەئیسی هەیئە راست بن، وا لەکاتی خۆیدا دەگیرام نەك دوای ماوەیەکی دورو درێژ. خۆ ئەگەر راستییەك لەو قسەیەدا هەبوایە وا باسی نامەی نەوشیروانیشی دەکرد کە بەدەیانم بۆ نێرراوەو زیاتر لەوەم نوسیوەو وەڵامیانم داوەتەوە، خۆ هەر بەهەمان رێگەشەوە نامەکان دەهاتن‌و دەنێردران.

راستە لەهاوینی حەفتاو هەشتدا لەنامەیەکیدا مام جەلال داوای لێکردم کە هەقە ئیتر دەست بەچالاکیی بکەمەوەو رێکخستنەکانی یەکێتی لەسلێمانی‌و هەولێرو کەرکوك ببوژێنمەوە. منیش وەڵامم دایەوە کە باش وایە ئەم جۆرە کارانە بەوانە بسپێردرێت کە دەرکەوتونین.. من چاوەدێرییەکی زۆر دەکرێم‌و هەمیشە مەترسیی گرتنم لەسەرە. ئەگەر بگیرێم لەوانەیە زیانی گەورە بەر رێکخستنەکە بکەوێت. خۆم هەستم پێ دەکردو دەمزانی‌و زانیاریشم هەبوو کە ڕژێم گومانی لێم هەیە چاوەدێریم لە سەرە هەرچەندە لەیارمەتیی‌و ئاڵوگۆڕی بیروڕاو هاوکاریی‌و رێنمایی برادەران کەمتەرخەمیم نەدەکرد.

دوای ئەو پرسیارو وەڵامانە بەرزیان کردمەوە، بەزەحمەت دەتوانم هەنگاو هەڵبهێنم. بەزۆر لەخۆکردن‌و شەلە شەل هەنگاوم دەناو کردیانمەوە بەژوردا.

لەئازارو لەسەرمادا سەرتاپای گیانم وەك شەقشەقە هاتۆتە لەرزین. بەو حاڵەش ئەوەی یەکسەر سەرنجی راکێشام:

ژورێکی چۆڵ‌و هۆڵ. تەنها جێگەیەکم بینی کە چەند بەتانییەکەو یەکێکیش کراوە بەسەرین. پانتۆڵێکی قاوەیی خەتخەت هەڵواسراوە. کۆمەڵێ گۆڤاری عەرەبی دانراوە. لە سەرنجەکانی سەرەتادا ئەوانەم بینی. چونکە لەو هەیئەیە ئەوانە زۆر غەریبن، ئیتر زۆر ئاگام لەخۆم نییە خۆمدا بەسەر ئەو جێگەیەدا، هەروەك بۆ من راخرا بێت!

زۆری نەبرد، هێڵنجدان‌و هێرشی رشانەوە راپیەڕاندمە سەر تەنەکەیەك کە بۆ میز دانراوە.. تالاوێك لەمەعیدەمەوە دەردەچێت هەروەك زەهراوم پێ خورابێتەوە..

هێڵنج بەسەر هەڵلەرزینو سەرماو ئێشو ئازاری ئەشکەنجەکەدا زاڵ بوو، وا دەزانم ئێستە نا ساتێکی تر گەدەم دەتەقێ، بۆخۆشم نازانم ئەو تاڵاوە لەکوێوە هەڵدەقوڵێ!

دوای بەتاڵکردنەوەی مەعیدە لەو تاڵاوە، گوشاری بەرموسەڵانو میز زۆریان بۆ هێنام، کەوتمە میزکردن، ئەوە خۆ یەکپارچە خوێناوە.. دەبێت ئەو خوێناوە لەکوێوە هەڵبقوڵێت! ئیتر لەسەرەوە زەهراوو لەژێرەوە خوێناو دەهاتنە دەرێ.

دەنگی دەرگاکە هاتو کرایەوەو یەکێك خۆی بەژوردا کرد، ئاورێکم دایەوە تا بزانم کێیەو چیی باسە. ئایی ئەوە خۆدیسان قالەی حەمەی مەلا نادرە! ئەبێ ئەم سیخورە چیی تری بەدەستەوە بێ.دیارە کارە سەرەکییەکەی تازە دەست پێدەکات. دەبێت پیاوەتییەکانی زوری رەقەم یەکی بۆ ئێرە هەڵگرتبێت. رەنگە دڵیشی خۆش بێت کەزۆر نابات بەری چاکەکانی دەکەوێتە دەستو دەیکات بەدیارییەکی نایاب بۆ رەئیسی هەیئە. خێرا نزیك بووەوە. هەروەك ئاگاداری هیچ نەبێت، گوتی ئەوە مامۆستا گیان تۆیت.. ئەوە بۆچی وایان لێکردویت؟

< من نازانم چیم لێ بەسەرهاتوە! لەبەر ئازارو سەرماو هەڵلەرزینو رشانەوەو خوێناو هێنانەوە سەیری خۆمم پێناکرێت.

ئینجا پەلمی گرت و وردە وردە بۆ جێگەکەی بردمو پاڵی خستمو گوتی دەی بخەوە با ئیسراحەت بکەیت. خەوی چی! من تەواو پەرێشانم، بڕواناکەم بەرگە بگرم، لام وایە ئاخرو ئۆخریی سەعاتەکانی ژیان بێت! نازانم ئەم سەگبابانە لەسەر چیی وادەکەن.. ئیتر لەو دۆخەشمدا کەوتمە قسەی بەمەبەست تا خۆیو رەئیسەکەی وا تێبگەن کە کاردانەوە گەیشتۆتە ئاستی خۆی..

زۆری نەبرد لەناو شەکەتیی لەشو سەرمای لەعنەتیو ئازاری بێ کۆتاییدا وەنەوزم لێ نزیك بووەوە. هەرچەندە قالە قسەم بۆ دەکاتو دەڵێت ئاخر مامۆستا گیان بۆ وا لەخۆت دەکەیت، بۆ خۆت رزگار ناکەیت.. ئیتر لەو بەیتو بالۆرەیەی رەئیسەکەی دەیلێت، زۆری لێ گوتەوە، بەو مەبەستەش کە نەیەڵێت خەوم لێبکەوێت. من مێشکم لەقسەکانی داخستوەو خوا خوامە گوێم لەو قسە سوكو جنێوانە نەبێت. بەڵام ئەو لە سەر ئەو چەنەبازییەی خۆی بەردەوامە. چەندم توانی بیرم لەسەرخەو چڕکرد. ئەویش هەر دەیرپێسێت. تا وەك شێت لێی راپەڕیمو بەچەند جنێوێکەوە گوتم: بۆچی وازم لێ ناهێنیت؟ من مێشکم هیچ شتێك وەرناگرێت. کەمێك وەستام تاکەمێ خاو ببمەوە. ئینجا گوتم:

< چاوەکەم تۆ سوێند دەخۆیت کە لە برات زیاتر منت خۆش دەوێ چونکە مامۆستات بوم!

- ئەرێ وەڵا بەقەبری ئەو شەهیدەی باوکم وایە.

< خۆ وەزعیشم دەبینیت؟

- بەڵێ ئەی چۆن!

< دەی باشە رەحمەت لەباووباپیرانت وازم لێ بێنە تا کەمێ ئیسراحەت بکەم، بەڵکو سەرخەوێك بشکێنم.

نەخێر رشانەوە بۆ سەر تەنەکەکە راپەڕاندمەوە.. باشە ئەم هەموو زەهراوە لەکوێوە دێتە دەرەوە! ئیتر بێ ئەوەی لێی بپرسمەوە خۆم بەسەر جێگەکەدا دایەوە، دیارە قسەی تری پێیە بەڵام سڵەمینەوەیەکی لێ بەدی دەکەم. وردە وردە وەنەوز سەردەردەهێنێ. وا هەست دەکەم کە ئاگام لەخۆم نامێنێت. نەمدەزانی ئەوە خەوە یان لەسەر خۆچونە! کاتێك بەئاگاییەکی بێ هەستەوە خۆم دەجولاندەوە، وەك خەوبینین قسەکانی قالە زۆر بە ئەسپایی بەلای گوێمدا تێدەپەڕن و سەرنجمیان رادەکێشا، بێ ئەوەی لەهیچ بگەم. تا لەدواییدا لەوە گەیشتم کە گوتی:

- ئێستاکە چۆنیت؟

< گوتم نازانم، زۆر خراپ، رەنگە بەرەو مردن بێت.

- باشە تۆ لەشی خۆتت بینیوە؟

< جا سەلامەت نەبیت لەکوێوە بیبینم و چۆن بیبینم! بۆچی هۆشم لای خۆم ماوە تا ئاگاداری لەشم بم!

- خۆ شوێنی ساغت بە دەرەوە نییە.

< تۆ خۆش بیت گوێی مەدەرێ!

- مانای چیی؟بۆچیی من خۆشم بم؟ ئەو بە مۆنییەکەوە ئەو قسەیەی کرد.

< ئەی بڵێم چی؟ ئەی بڵێم کێ خۆش بێت؟ ئەی لە تۆ زیاتر کەسی ترم لەبەردەستدایە تا روی قسەمی لێ بکەم؟ لە راستیشدا ئەگەر شتێکیان لەسەرم هەبوایەو بەڵگەیەکیان هەبێت وا چیی تر بکەن لام ناخۆش نییە..

وا باشە خۆم لەم قسانە لابدەم چونکە دوور نییە لە مەبەستەکانم بگاتو بزانێت دەرك بەوە دەکەم کە ئەویش لەگەڵ برادەرەکانی قامچی بەدەستبووە. بۆ ئەم ساتانە تا دەتوانم با جەخت لەسەر ئەو جۆرە رستانەی تر بکەم، بەتایبەتیی قسەی دوا نەشکەنجەو لەسەرخۆچون حسابێکی تری بۆ دەکرێت. دوای ساتێ بێ دەنگیی، روی تێکردمو گوتی:

- برسیت نییە؟

< لای من هەنگوینی شەمەتلێنکە لە زەهری مار خراپترە. ناو سکم تاڵاوێکە گەدەمی کردۆتە دۆزەخ لێم..

- ئەی تینوت نییە؟ لەدڵی خۆمدا گوتم دەبێت بەزۆریش بێت ئاوەکە بخۆمەوە، چەند بتوانم زۆر لەخۆم دەکەم بۆزۆر خواردنەوە. چونکە هەم بۆ میزکردن و

پاککردنەوەی گورچیلەو بۆرییەکانو میزەڵان لەو خوێنەی تێیاندا ماوە، هەم بۆ کەمکردنەوەی چڕیی ئەو تاڵاوەی لەناو سکمدا ماوە، خۆ لە هەموو زەمانو زەمینێکدا، چی جای لەم شوێنە لەعنەتییەو لەم گوزەرانەی منیشدا، ئاو باشترین دەرمانە بۆ سەرجەم دەزگاو ئۆرگانەکانی لەش.

< بەرێ وەڵڵا بزانم بەزۆر نەختێك ناخۆمەوە..

هەستاو لەپەرداخە فافۆنەکە ئاوی هێنا.. چیی هێنا بەزۆر کردم بەقوڕگمدا.

دیسان سەرم نایەوە، ئەویش کەوتە قسە، دەشیویست بەدڵسۆزێکی بێ هاوتا خۆی پیشان بدات.. چارم ناچارە، ئەوە ئەرکی سەرشانی ئەوەو منیش دەبێت کەم چیکڵڵانە نەبم. ئەی خۆ ناکرێو ناشبێت وەك قوتابییەکەی هەڵکەوتو خزمەکەی حسەینی مامە ڕەشەی برادەرم مامەڵەی بکەم.. دەشبو نەیەڵم هیچ جۆرە هەستێ بەوە بکات کە من لەشتێك گەیشتومو دەرکم بەو ڕۆڵەی کردووە. دەبو وا تێبگات کە لەوانە زۆر بێ ئاگام. ئەگینا دەخرێمەوە ناو ئەزمونێکی ترەوە.

گرفتی گەورە بۆ ئێستا ئەوەیە کە نایەڵێت بخەوم.. هەرکە خەو دەچووە چاوم ئەو بە قسەیەك یان پرسیارێك رایدەپەڕاندم.. نە جارێكو نەدوو نە دە.. تا لەناو جۆرێك لەهەڵچون کە زیاتر لە هیستیریا دەچێت سەرم هەڵبڕیو گوتم:

< بەسەو بیبڕەوە، من نامەوێ گوێم لەو قسە بێ سەرو پێیانە بێت. من هیلاکم هیلاك. ئەمە یان بۆ مردنە یان بەرەو لەسەرخۆچونە. دە وازم لێبێنە.

- گوتی من لەبەر تۆمە، دەزانم ئێستا دێنەوە بە شوێنتا! بەزیاتر تورەبونەوە گوتم:

< باشە پێم ناڵێیت تۆچۆنو لەکوێ دەزانیت کە دێنەوە بەدوامدا؟ لەناو قسەکانمدا هەوڵمدا کە وردە وردە خۆم هێمن بکەمەوە، نەوەکا لەوە زیاتر بڕۆمو ڕاستییەکەی بخەمە دەستەوە.

وا چاکە بۆ خۆمو بۆ ئەم دەورەی قادر کە لەوانەیە ئەمە گرنگترین پلەو ڕۆڵی بێت، با هەر بەو نەهێنییە بمێنێتەوە باشترە، ئیتر وا باشە لەوەش زیاتر نە قسەی توندی لەگەڵ بکەمو نە لێشی تورەببم!

< دەی باشە تۆ غەیبت پێیە وا ئەم رمڵە لێدەدەیت!؟ تۆ لەیەکەم رۆژی ئەشکەنجەدا گوتت ئیتر بانگ ناکرێیتەوە، کەچی ئێستاش دوای ئەو هەموو رۆژو هەفتەو ئەشکەنجەدانە پێچەوانەکەییم پێ دەڵێیت! باشە چیی سودێكو لەزەتێك لەوە وەردەگریت وا ئەم قسانە لەگیرفانی خۆت دەردەهێنیتو بەو جۆرە دڵی منی پێ خۆش دەکەیت!

## وانەی ئیعتیرافپێکردن

دوای بێدەنگییەکی کورتخایەن دەرگاکە کرایەوە. قادریان بانگکرد. زیاتر لەنیو سەعاتێك بەسەر ئەو چونە دەرەوەیەدا تێپەڕیی، لەگەڵ یەکێکی تردا هاتنە ژورەوە، کەمێ لەولاترەوە دانیشتن، کوڕە دەمی هەڵهێنایەوەو گوتی:

- بەخوا وازم لێناهێنن.. قالە وەڵامی دایەوە:

- رەحمان! ئاخر مردومراو من چیم پێگوتیت.. نەمگوت وازت لێ ناهێنن ئەگەر دوا وشە لەمێشکتدا بمێنێ، چیی هەیە نەیخەیتە دەستیانەوە وازت لێ ناهێنن!

- ئاخر وەڵا هەمویم گوتوە، بیللا هیچ نەماوە، بەخۆڕایی لێمدەدەن.. ئیتر قالە کەوتە رێگەو شوێن دانان بۆ تەواوکردنی ئیعتیرافو خۆ رزگارکردنی کوڕەی قوڕبەسەر..! تومەس ئەم ژوری ژمارە هەشتە هەر تایبەت بەم کارانەیەو منیشیان بۆ ئێرە راپێچ کردووە تا لەگەڵ ئەم جۆرە ئەشکەنجە سەختەدا ئەم شەڕە دەرونییەشی بچێتە سەرو ورەو باوەڕم بڕوخێنن.. پاش دەرسی ئیعتیراف پێکردن، قالە لێیپرسی:

- ئێستا دەزانیت چی دەڵێیت:

- بەڵێ بەڵێ.. بەڵام بەقوربانت بم تۆ بڵێیت ئیتر لێم نەدەن، وازم لێبهێنن..؟

- نا نا مەترسە،تۆ وەك پێم گوتیت وا بکەو هەقت بەسەرهیچەوە نەبێت..

دەی ئەمە چی شانۆگەرییەکە لەناو ئەم دۆزەخی پڕوکاندنەدا! دەبێ ئەم قوڕمساغە لەچی قوتابخانەیەکی بەعسدا پەروەردە کرابێت؟ رەنگە لەقوتابخانەش هەر سیخوڕ بوبێت؟ دور نییە، ئەی دەبێت راستبکات کە کۆمەڵەش بوبێت وەك خۆی دەڵێت؟ بڕوا ناکەم، دیارە ئەوە هەڵبەستراوەو بەشێکە لە ئەرکەکەی قالە. لەدەرگا دراو کوڕە گەنجەکە بانگکرا. ئەو بە تەمەن هەر بیستو پێنج ساڵێك دەبێ. لەشێکی تۆکمە، باڵا سەدو حەفتاو پێنج سانتیمەترێکە، گەنم رەنگ، بەقسەکانیشیدا خەڵکی گەرمیانە. ئەم کوڕە تەواو روخاوە، ئەوەی ناوی ورەو بڕوایە لە ئەقڵی ئەودا نەماوە. قالە مایەوە.. پاش چەند دەقیقەیەك، ئەویشیان بانگکردەوە. ئیتر هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئەم خۆی بەشێکە لەلێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەش. ئەمەش سەرنجو پرسیارەکانی ژوری یەکی هێنایەوە یاد کە ناو بەناو لەمو لەوی دەپرسی. کامە تەعزیب زۆر ناخۆشە؟ تۆ بە کام لێدانو ئەشکەنجە زۆر ناڕەحەتی..؟ دوای ماوەیەکی کورت هاوار هاوار بەرزبووەوە.. ئەوسا زانیم کە ئەم ژوری هەشتە لەسەر حەوشەی سێیەمە کە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەی تیادا ئەنجام دەدرێ. زۆری نەبرد رەحمان کەوتە قسەو وتی: باشە چی ترتان دەوێت دەیڵێم. دوای ماوەیەکی کورت

قالە کرایەوە بەژوردا. وا لێیدانیشت هەروەك دەرەوەی نەبینیبێت.. روخاوەکە کرایەوە بەژوردا.. قالە لێی چوە پێشەوەو گوتی ئەوە چیبو؟ ئەویش وتی:

> ئەی تۆ نەتگوت ئیتر ئەشکەنجە نادرێیت؟

- باشە تۆ هەمو قسەکانت کرد؟

> وەڵڵاو بیللا هیچ نەماوە نەیڵێم.

- نا نا بەخوا ئەزانن کە شتت پێ ماوە بۆیە وازت لێناهێنن. بەخوا هەمو شتێك دەزانن. خۆت بۆ بەتران دەدەیت. بابە ئیتر من هەقم نییە بەسەرتەوە چیت لێدەکەن بابیکەن، خوای دەکرد ئەیانکوشتیت، من بەزەییم پیاتا هاتەوەو گوتم با یارمەتییەکی بدەم.

کوڕەی نەگبەت هاتە قسە:

- بەچیت بڕوایە چیم لا هەبووە بەزیادەوە گوتومە. ئیتر هیچم لانەماوە، بگرە هەندێك لەوانەی گوتومە هیچ راستییەکیان تێدا نییە. هەر لەبەر ئەوەی لێم نەدەن ئەو قسانەم کردوە. ئەگینا هەر ئەوە ماوە کە خەڵکی بێ گوناه راپێچی ئێرە بکەم!قالە قسەکەی لەدەم قۆستەوەو خێرا گوتی:

- ئێێێی بۆ نایکەیت. کێ فریات دەکەوێت.ئەوەی ئەیزانیت دەبێت بیڵێیت، ئەوەی شتێکی کردوە، یان شتێکی لەسەر دەزانێت خێرا ناوەکانیان بڵێ! هیچ سێو دووی لێ مەکە، ئەی کێ فریات دەکەوێت ئەگەر خۆت فریای خۆت نەکەویت! بڵێ، بیڵێ، چیی لەمێشکتدایە بیخەرە بەردەستیان، ئەگینا دەتکوژن.. هەروا بزانم ئەگەر وانەکەیت بڕیاریان داوە کە ڕەمی بکرێیت!

ئیتر پیاو کە شەرەفی نیشتمانیی خۆی لەدەستداوەو کەوتۆتە ناو داوی خزمەتی داگیرکەرەوە، وائەوەی ناوی رەوشتو پاکیو دابو نەریتوسەربەرزییە لەدەستیان دەدات. هەر دوای ئەو وانەی ئیعتیراف پێکردنانە، هەروەك من گوێم لەهیچ نەبوبێتو ئاگاداری ئەو شانۆگەرییە نەبم، قالە لەسەر دەورەکەی خۆی بەردەوامەو بەتەمای هەڵکڕانی شتێکە ئەگەر بچوکیش بێت. چونکە هەر کە کوڕەکەیان بردە دەرێ، قالە هاتە تەنیشتمەوەو گوتی:

- ئەزانی ئەم هەیئەیە لێکۆڵەری چەند بێ شەرەفی تێدایە!

< ئەوە دەڵێیت چیی!؟ بۆچیی بێ شەرەفن!

- ئەزانیت ئەمڕۆ رەئیسی هەیئە چیی پێ گوتم؟

< جا من لەکوێ بزانم، کێ ئاگاداری کەینو بەینی تۆو رەئیسی هەیئەیە؟ ئادەی چیی پێ گوتیت!؟

- ئەمڕۆ زۆر تورەو بەقین بوو، پێی گوتم خاڵە سەگبابەکەت دەچێت "فاتە تەماتە" دەکوژێت گوایە لەبەر ئەوەی سۆزانییە، کەچی خوشکە قەحبەکەی کە

دایکی تۆیە، رۆژانە بەتەن گان دەداتو ناشی کوژێت! ئەگەر تۆش پیاو بیت کە چویتە دەرەوە خوشکەکەی دەکوژیت!

< ئینجا قسەکانی رەئیس راستن یان هەر لەخۆیەوە قسە دەکات؟

- بەرووگرژیی‌و تێکچوونێکەوە گوتی مەبەستت چییە؟

< گوتم راستە ئەو ئافرەتە سۆزانی بووەو خاڵیشت لەبەر ئەوە کوشتویەتی؟ ئەی تۆ چیت گوت؟

- ئەی بۆ وا نییە بەرێ وەڵڵا بە دۆزەخی گەیاند! چونکە جاسوسی ئەمانیش بو!

< ئەی بۆ دایکت چیت پێ گوت؟ گوتت نەخێر وا نییە یان باشە بەرمبدەن تابیکوژم..؟

نا نا نەموێرا هیچ بڵێم..

ئیتر ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵگەیەکی بەزۆر دروستکراوو بەزۆری هێز بەرێوەبراوو لەژێر سایەو سێبەری رژێمێکی نامۆدا هەردەبێت بەو جۆرە هەڵبتەکێتو ئاوا یاسای جەنگەڵی تێدا پیادە بکرێت کە لادان هەمو کەلەبەرێکی ژیان بگرێتەوە، پەروەردەکانیش هەروا بەخوارو خێچی‌و نائاسایی‌و نالۆجیکیی لنگەو قوچ بکرێن..

ئەم بەخۆی رەوا دەبینێت بەم جۆرە خەڵك بە لەسێدارەدان بدات یان لەسێدارە نزیکیان بکاتەوە، بەڵام ئەوە بە فاتە تەماتە رەوا نابینێ کە دڵنیام لەسەرەتادا هیچ گوناهێکی خۆی تێدا نەبووە کە خزاوەتە ناو ئەو بەدخوورییەو ئینجا ئەو سیخورییەوە کە، رەنگە وەك ئەمیش نەبوبێتە ئەو مەقاشە سورەوە کراوەی لێرەدا رۆژانە بە جەستەی ئەم زیندانییانەدا دەچزێنرێت، خۆ لەبەر داگیرکەری ملهوڕ، هیچ دەستێکی یاسایی‌و لێپرسراوەتیی‌و ژیانیی ئاساییش نەبووە کە لەو زەلکاوە دەربازی بکات. کەچی ئەمیش هەروا ئاسان کوشتنەکەشی بەرەوا دادەنێت. هەروەك چۆن خاڵیشی لەفاتە تەماتە بێدەنگ نابێتو دەیکوژێت، کەچی لەخوشکەکەی بێ دەنگ دەبێتو کورەکەشی چاوی لێدەپۆشێت.. ئەگەر قسەکەی قالە خۆی و رەئیسەکەی راست بن.

خۆ رەئیسەکەشی نایەوێت نایاسایی دیاردەکان لەوەشدا بوەستێنرێن، بەڵکو وا هانی نۆکەرەکەشیان دەدات کە لە دەریشەوە لەسەر خوێن رشتن بەردەوام بێت.. ئائەوەیە رۆڵی دەوڵەتی تیرۆریست کەتەنانەت لەو جۆرە دیاردانەش سود وەردەگرێت.

جا باشە کێ دەڵێت ئەم سەرگوزشتەیە راستە؟ کێ دەڵێت رەئیس فەرمانی نەداوەتێ کە بۆمنی باس بکات تا متمانەی پێ بکەم! هەرچیی چۆنێك بێت،

لەهەردوو حاڵەتدا ئەو لای من بێزراوتر دەبێت. چونکە ئەگەر ئەوە راست بێت یان درۆ وا من بۆخۆم هەر بۆ هەردوو حاڵەتەکەیان هەر لەسنوری راستییەکەدا وەری دەگرم.

ئەگینا متمانە بەکێ؟ بەیەکێك کە رۆڵەکانی لای من ئاشکرا بووە؟ ئەوە بێسنور گێلێتی و کەللەپوتییە ئەگەر تا ئێستاش چاوەڕوانی شتێکی وابن!

لەناو ئەو قسەو خەیاڵانەدا بوم کە دەرگا کرایەوەو قادر محەمەد مەلا نادر بانگکرایەوە. تا سەر لەو زیندانییە روخاوەو منی شەکەت بشێوێنێت، هەروەك بۆ لێکۆڵینەوە بیبەن، سەرێکی باداوگوتی: وا دیارە ئەم سەگبابانە دەستبەردارم نابن.. نازانن لای منو لای گەلێك لەزیندانییەکان قالە لە (عەباسە رەشو عەباسی سور) ناسراو تر بوە. بەڵام بێ ئەوەی لەم رۆڵە روخێنەرە بەئاگابن. ئەو دوو جەللادەش بێناموسو درندەترینی مەخلوقی ناو هەیئەن. دوای رۆیشتنی قالە بۆ نیو سەعاتێك رەحمان کرایەوە بەژوردا. لەگەڵ دانیشتنو کەمە بێدەنگییەك، هەروەك بەهەلی بزانێت، لەگەڵ خێرا خێرا سەرنجدان لەقاپییەکە پرسیی:

- ئەوە مامۆستا بۆچی وایان لێکردویت؟

< گوتم نازانم.

- گوتی ئەی ئیعتیرافت نەکردووە؟

< لەسەر چیی؟

لەسەر ئەوەی لەسەری گیراویتو بەو جۆرەت لێکراوە..

< من لەسەرهیچ گیراوم. کۆن پێش هەرەس، سیاسەتم کردوە، ئێستا لەسەر ئەوە گیراومو هێنراوم بۆ ئێرە.

- مامۆستا! ئەوە خۆ گیانت هەموی برینداره.. ئەوساکە وردتر سەیری خۆمم کرد، کە بیجامە داڕزاوەکەشم بەرزکردەوەو سەرنجی ژێرەکەیی‌و ئەملاوئەولای خۆمو ئەوەی چاوم دەیبینیی کرد، ئەویش بەحەپەساوییەوە چاوی تێبڕیبو، ئینجا سەیرێکی سەرجەم پشتەوەشمی کرد، ئەوسا گوتی: ئای باوکە گیان خۆ هەمو گیانت جنراوە! کوشتویانیت! ئەوە بەچیی ئەشکەنجەیان داویت؟

< ئەی تۆیان وا لێنەکردوە؟

- نەوەڵڵا خۆ دەمردم.. نا نا جا بۆچی بیەڵم وام لێبکەن!

< ئەی بای سێدارە قسەت کردوە!؟

- سەری داخستو گوتی لەوانەیە، دەیانەوێت ئەوەندە بڵێم کە ئیعدامم بکەن.

نەگبەتیی هەروا دەبێت، دیارە ئەمە هی ئەوە نییە کە قسەیەکی خێری بۆ بکرێت! هەرچی پیرۆزیی پیاوەتی بێت تێیدا نەماوە.

چونەدەرەوەو گەڕانەوەکەی ئەم جارەی قالە زۆری خایاند. ڕەحمان بەترس‌و لەرزەوە هەندێ پرسیاری تری لەسەر گرتنەکەم کرد، منیش ئاسایی وەڵامم دایەوە، ئینجا لێیم پرسی:

< ئەی تۆ چیکارە بویت؟

- من کۆمەڵە بوم.

< مەبەستم کارە کار، چیی ئیشێکت دەکرد؟

- کرێکاریی.. لەو کاتەدا دەرگا کرایەوەو قالە خۆی کردەوە بەژوردا. ڕاستەو خۆش بۆ لای ڕەحمانی نەگبەت. دەستیان کرد بە ورتە ورت، بێئەوەی بیەڵن من گوێم لەهیچ بێت!

قالە باش لە ڕەحمان گەیشتبو، ئەوی هەش بەسەریش لەخۆی گەیشتبوو،بەڵام لە پارێزەرەکەی خراپ‌وپێچەوانە حاڵیی بووبوو.

لەوە دەچوو شانۆگەرییە دوو پەردەییەکە لەوێدا کۆتایی هاتبێت. پێدەچێت هەم ڕەئیسی هەیئە بە مەبەستی خۆی گەییشتبێت، هەم قالە بە ئەرکی خۆی هەستابێت‌و هەم ڕەحمانیش لەوەی دەیزانی‌و نەیدەزانی چۆڕپڕ کرابێت. بۆ تێگەیشتنی ئەنجامی چیرۆکەکەو شوێنەواری هەردوو پەردەکە، دەبێت تێبینییەکان بخرێنە بەردەم شیکردنەوەو و ئەنجام هەڵهێنجانی دوولایەنە، تا شتێك حاڵیی بێن، ئەگینا بۆ من ئەنجامەکان روون‌و بێ گومان بوون.

که هاتن بەدوای ڕەحماندا بردیان‌و جارێکی تر نەمبینییەوە.

لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕەحمان قالە کەوتە ناو دەریای خەیاڵەوە.. دوایی دەرگای بێ دەنگییەکەی بەپرسیارێك لەسەر جگەرە کردەوە:

- دەبێت ئێستا زۆر حەزت لە جگەرە بێت؟

< ئەی چۆن، ئەرێ وەڵلای بەقەدەر هەمو دنیا حەزی لێ دەکەم.

- ئینجا هاتە سەر جێگەی نوستن‌و گوتی باشتر وایە ڕێکیبخەین..

< منیش گوتم زۆر باشە، بەڵام چۆن.. سەرەنجام من دوو بەتانیم بەرکەوت‌و بوم بەخاوەنی جێگەی خۆم. ئینجا دەستی کرد بە قسەکردن. لەباسی قوتابخانەو دەرس گوتنەوە بۆ جۆری جگەرەکێشانو گوتی: هێندە جوان پاکەتی دیمۆریەکەت دەردەهێناو بە چەرخێکی جوان داتدەگیرسان، پیاو هەر حەزی دەکرد جگەرە بکێشێت.. ئینجا بۆ باسی فانیلەی بەرم کە چەند جوان‌و کەشخە بوو. پرسی کرد کە ئایا ئەوەم لەکوێ کڕیبو؟ گوتم لە لەندەنەوە بەدیاری بۆیان هێنابوم.. سوێندی دام کە ئەگەر بەرببین ئەو فانیلەیەی بدەمێ! ئینجا لەوانەوە بۆ سیاسەت‌و بۆ هەیئەو بۆ ئەم وەزعەی من. هەندێ جار قالە زۆر زیرەکانە ڕەفتاری دەکرد. بۆیە پێدەچی بەدەیانی بەئیعدام کردن دابێت‌و ئیعتیرافی بەزۆری تر کردبێت..

ڕۆژێ پێش ئەم تاکزیندانییەم، یەکێك لە گیراوە نوێیەکان بۆی گێڕاینەوە کە ئەکرەمی حەپسە لە زیندانەکانی موسڵەوە مستەفا چاوڕەشی ئاگادارکردووە کە هەرچی قسەیەکی لای قالە کردوە بۆ ڕەئیسی هەیئەی گێڕاوەتەوەو ڕاستەوخۆ ئەو بەهۆی ئەو حوکمی ئیعدامە دەزانێت.

درەنگانێك دوای نانی ئێوارە، بێ سرپە دەرگاکە کرایەوە. عەباسە سور بە پەنجە ئاماژەی چونە دەرەوەی بۆم کرد. کە چوم چاوی بەستمەوە. کەمێك بەوناوەدا سوڕاندمییەوە ئەوسا لە شوێنێکدا ڕایگرتمو گوتی هەردو دەستت بۆ ئاسمان، ئەوەم کرد. قاچێکیشی پێ بەرزکردمەوە، ئینجا گوتی: هەروا دەوەستیت، بجوڵێیت دەتکوژم!

سەیرە! هێنانە دەرەوە لەم کاتانەدا قەدەغەیە. نەمدیوە لێکۆڵینەوە هەبێت. ئەی ئەمە یانی چیی!

دەستم شل بوو قاچم توانای نەما. لەشم بەرگەی وەستانی تیا ئاوابو. دەی ئەینەلمەفەڕ هەی ئەهلی شەڕ؟ ناچار جێگۆڕکێم بەقاچم کرد. دەستیشم کەمێك نزم کردەوەو بەدیوارەکەوە نوساندم.. هێندەم زانی تێم سرەوێندرا، سرپێنرا بەگوێمدا: دەست هەڵبڕە دەی بەرزتر بەرزتر، ئێستا قسە دەکەیت؟ ئەگەر ڕەئیس بانگت بکاتەوە قسەی بۆ دەکەیت؟ قسە بکە، وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە. ئەزانیت ئەگەر قسە نەکەیت دەکوژرێیت. ئەو کوڕەت بینیی؟ بەخوا لەوە خراپترت لێ دەکەین. دەنگەکە نەما. بەهەمو لێکدانەوەیەکم ئەو دەنگە دەناسمەوە. ئاخر هەی قالەی ویژدان مردو کەس نا تۆ ئیعتیراف بەمن دەکات! بۆ هەمو کەس ڕەحمانە!

لەو ساتانەدا هاتبومە سەر ئەو بیرەی کە بە ڕویدا بدەمەوەو پێی بڵێم: ئاخر ئاوا مامەڵەی برا خۆشەویستترەکەو مامۆستاکەت دەکەیت! ئەگەر لە ڕوخاوییەوە کەوتویتە ناو ئەم زەلکاوەوە وا ئەوەش سنورێکی هەر هەیە! خۆ ئەگەر خۆت پێیان بەخشیوە وا دیسان پێوانەیەك، لێکدانەوەیەکی پاشەڕۆژ، ترسێك، ناسیاوییەك هەر دەمێنێ..!

نانا نەکەیت، کارەکە لەخۆت تێك نەدەیت! ئەوە دەڵێیت چیی‌و بیر لەچیی دەکەیتەوە! وا ئەوانەشت پێ گوت، دەی ئەوە چیی سودێکی دەبێت! تازە ئەو بۆتە چەقەڵێکی گەڕی ناو ئەم زەلکاوە..

لە تەواو شل بوندا بوم کە خوا کردی‌و سۆندەدرایە دەستمو بردیانمەوە بۆ ژورەکە.. قالە خۆی مەشغوڵ کردوە، غەمبارییەکی زۆر لەدەموچاوی دەبارێت. نازانم ئەوە ویژدان جوڵانو پەشیمانییە لەو دەورەی کە خراپتر لەشیشی سورەوەکراو لەدژی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی خۆی و بەرامبەر بە مامۆستاکەی بەکاردەهێنرێت..
یان ئەوەش هەر تەمسیلەو وا دەزانێت بە مەبەستی خۆی دەگات. گوتم:

< قادر! ئەزانی ئا لەم وەزعەی خۆشمدا زۆر بەزەییم بەتۆدا دێتەوە، باشە وا من تا حەفتاو پێنج لەدژی ئەمان سیاسەتم کردوە، خۆ تۆی نەگبەت هیچت نەکردوە، وانیە؟ سەری داخستو گوتی:

- بەرێ وەڵڵا وایە!

بەیانی زوو بەخەبەر هێنراینو ئەمرکرا تەنەکەی میز بریێتە دەرێ.. بەزەحمەت هەوڵمدا خۆم بەرزبکەمەوە. لەدڵی خۆمدا گوتم قالە با لەمەشدا هەر کوێخابێت! قالە بەرزە پێ بووەوەو گوتی نا مامۆستا گیان بەخوا دەستی لێوە نادەیت هەر خۆم دەیبەم. نانا چۆن دەیەڵم مامۆستاکەم لەوە زیاتر زەحمەتیی بخەنە سەرشان. هەر ئەمیش لە ژوری رەقەم یەك لەباتیی من تەنەکەی میزی دەرشت.. کە چاوی بەپیرە تەنەکە کەوت گوتی:

- مامۆستا ئەو هەمو خوێنە چییە. بە ڕوانینە ناو قوڵایی چاوییەوە گوتم:

< خوێنە خوێن! سەرێکی داخستو تەنەکەی بردە دەرێ. دوای ماوەیەك، منیشیان بۆ ئاودەست بانگکرد. کە سەرنجمدا عەریف ئەحمەدە. ئەم ئەحە رەشە لەبێناموسیدا وێنەی نییە. بۆچی وا نەبێت ئەی خۆ لەخۆڕایی نەکراوە بە عەریفو لێپرسراوی جەللادەکان.. سەیرێکی کردمو گوتی:

- ئیعتیرافت کرد؟

< لەسەر چیی؟ خۆ من هیچ شتێکم لانییەو هیچیشم نەکردوە تا ئیعتیرافیان لەسەر بکەم؟

شەقێکی تێسرەواندمو گەلێ جنێوی خۆیان ئاسایی‌داو چومە سەر ئاودەستەکە. ترسی ئەوەشم هەیە نەیەڵێت کەمێ زیاتر دابنیشم، چونکە هەست بەناڕەحەتیی ناو سکم دەکەم. بە زەحمەت میز دێتە دەرێ، کەمێ بەلوعەکەم بەردایەوە. باش بو جولا. ئەوە خۆ دیسان هەر خوێناوە! پاش ماوەیەك بەرە بەرە زەرداو دەرکەوت. من پەلە پەلمەو زیاتر گوشار دەخەمە سەر خۆم تا ئۆرگانەکانم زوو بەتاڵ ببێتەوە پێش ئەوەی گوێم لەدەنگی تەقەی دەرگاکە بێت کە بەردەوام گوێقوڵاغیم. باشە رەحمێکیان تیا جولاوە، ئەمە یەکەم جارە لەم هەیئەیەدا هێندە لەسەر ئاودەست دابنیشم بێئەوەی لە دەرگا بدرێ. ئەم حەوشەیە، هەر ئەم ژورەو ژوری ژمارە حەوتی لەسەرە کە ژوری ژنانە. بەردەوام چەند ژنێکی تیایە. بێ ئەوەی بزانم چەند کەسن. ئەزمەی ئاودەستی حەوشەکەی تر لێرە نییە، چونکە لێرە ئەو قەرەباڵغییە نیە، سەربەستیی خۆڕاییکردن لەئاودەستا لەم زیندانەدا قەدەغەیە، کەچی وا ئەم جارە بەئارەزوی خۆمو بێ لەدەرگادان دێمە دەرەوە. دەموچاو شتنیش بەئاوە ساردە ئاساییەکە هەر بەئیسراحەت بو. بۆیە لەخۆمم دەپرسیی: تۆ بڵێیت بڕیاری تازە

درابێت؟ هێندە بەسەر ئەو پرسیارەدا تێنەپەڕی کە وەڵامەکەم خرایە مشتەوە. عەریف ئەحمەد بە سەیرکردنێکی پڕ لە تاوانو خوێنەوە، پێیدا هەڵپڕوانیمو گوتی:

- ئێرە دوا مەڵبەندی ژیانتە، رەئیس ئاگاداری کردوم تا پێت رابگەیەنم کە تۆ لێرەدا دوابڕیار لەسەر خۆت دەدەیت. لێرەدا بڕیار دەدەیت کە دەژیت یان دەتەوێ بمریت. بڕیاری مردن بەدەست خۆتەو ئێمە هەر جێبەجێکردنمان لەسەرە. دەی ئاقڵ بەو رەحمێکیش بەخۆتو منداڵەکانت بکەو وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە. من سوێندی شەرەفو کەرامەتو موقەدەساتی ئیسلامت بۆ دەخۆم کە رەئیسی هەیئە دەیگوت هەر قسەمان بۆ بکات دەینێرینەوە ماڵی خۆی، چونکە گوناهەو عەمەلیاتەکەی خراپ ئیلتیهابی کردووە. با لەوە زیاتر ئەزییەتی نەدەینو لەژێر ئەشکەنجەدا نەمرێت.

ئەو، ئەو جۆرە قسە خۆشانەم بۆ دەکات، منیش راستەوخۆ لە روخساری هەڵقرچاوو بێزراوو چاوی دەڕوانم بێ ئەوەی تورە ببێت. ئەوەش یەکەم جارە کە روخساری بەدفەساڵێکی وا بەو جۆرە ببینم.

لەناو قوڵایی ویژدانمەوە پێکەنینم بەو شەرەفو موقەدەساتانەی ئەوانە دەهات. دوای ئەو دیمەنو وانە بەنرخەی سەرۆکی جەللادەکان، بەزەردەخەنەیەکی بەدەنگەوە گوتی:

- باشە دەیبینیت قسەکانم راستن یاننا. بەدەم هەنگاونانەوە فڕێیدامەوە ناو ژورەکە. قالە لەوێ نەبو. زۆری پێنەچو لەژێر دەرگاکەوە پارچەیەك نانو لەسواڵەتێکدا کەمێ چایی خرایە ئەمدیوەوە. هەر لەخواردنەکە بومەوە دەرگاکەم لەسەرکرایەوەو بانگیان کردم. عەریف ئەحمەد بەچاوێکی پڕلەقینو ئاگراوییەوە.. لەگەڵ چاو بەستنەوەمدا گوتی:

- ئەزییەتمان مەدەو قسە بکە باشترە. دیسان دەستیکردەوە بەسوێندخواردنو گوتی:

- لە دەستمان دەرناچیت، بۆیە ئاقڵ بەو خۆشت رزگار بکە. من هیچ وەڵامم نەدایەوە. گەڵێ بەحەوشەکەدا سوڕانمێوە. من هێزم لەبەربڕاوەو ئەو بە جنێو هەڵپڕشتنەوە دەیگوت خێرا بڕۆ، لەوە دەچێت بەدەرگایەکدا بۆ ژورێکم بەرێت. کە وەستاندمی بەهەمان دەنگی دوێنێ رەئیسی هەیئە ئەمری کرد با دابنیشێت. کە دایاننیشاندم، کورسییەکی نەرمو نۆڵ بو، سەیرە ئەمەیان چیی بێت!؟ رەئیس کەوتە قسە، دوای یەك دوو رستە زانیم لەگەڵ یەکێکی تر قسە دەکات.. ئەویش گوتی:

- تۆپیوەکە چیی لێ بکەین؟

- بیبەن‌و بیخەنە ژێر چاڵەوە. رەئیس بەو جۆرە وەڵامی دایەوە.
- ئەی ئەو چەند کەسەی تاقمەکەی سلێمانی کە ئیعتیرافیان کرد؟
- ئیفادەکانیان بنوسن‌و بیانهێنن بۆ دادگای شۆڕش، دیارە لەوێش بڕیاری بەردانیان دەدرێت. ئەوانەش کە راستیان گوتووەو ئامادەیی خۆیان نیشانداوە، وا سبەینێ ئازادیان دەکەم‌و دەڕۆنەوە ماڵی خۆیان.
- ئەی ئەوانی تر؟
- ئەوانی تر.. ئەوانی تر.. کە ئەمەیان یەکێکیانە.. ئەوسا بەناوبردنمدا زانیم کە ئیتر پەردەی شانۆگەرییەکەی ئەمڕۆ تەواو و ئیتر کاتی پرسیارکردن هاتووە:
- ئەی ئێستاکە چۆنیت ئوستاز؟ دیاربوو کە ڕوی قسەی لەمن بوو.
< زۆر خراپم، پێویستم بەخەستەخانە هەیە.
- زۆر باشە هەر ئێستا عیادەی بۆ بکەن. هەر دوای لێکۆڵینەوەکە. یەکسەر بێ وەستان بیبەن بۆ خەستەخانە، چیی پێویستە بۆی بکەن.
- دەی بزانم لەپرسیارەکەی دوێنێ چیمان بۆ باس دەکەیت؟
< کامە پرسیار؟
- دیسانەوە خۆت غەشیم کردەوە. بڕوابکە ئێمە چۆن دەزانین تۆ ناوت مەحمودە ئاواش دەزانین کە جەلال نامەی بۆ تۆ ناردوە. دەی قسەمان لەسەر نامەکە بۆ بکە. چەند سوێندێکم بۆ خوارد کە ئاگاداری هیچ نیم.. ئەوەکەی تر هەڵی دایەو گوتی:
- ئوستاز وا مەزانە ئەوەی بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەیڵێیت ئیعتیرافە، نا وانییە، ئێمە هەر ئەوەندەمان لەتۆ دەوێ کە چۆن وەڵامت دایەوەو بۆت ناردەوە.. ئەمە هیچ تاوانێك نییە تۆ کردبێتت، بەپێچەوانەوە، ئەمە هەنگاوێکی زۆر باشە لەتۆوە کە ملت بۆ کارکردن نەداوە، ئەمەش باشترین پاکانەو بەڵگە دەبێت بەدەستی تۆوە کە گوێت لەوان نەگرتووە، من بزانم تەنها ددانتان بەم راستییەدا سەرفرازت دەکات. ئەوەش بزانە قسە نەکردنت لەسەر ئەوە مانای وایە تۆ درۆمان لەگەڵ دەکەیت‌و لەگەڵ تێکدەراندا کاردەکەیت. نا نا قسە دەکات خۆی خاوەن تەجروبەیەو ئێمەش باش دەناسێت، یەکێکی تر هەڵی دایەو ئەوانەی لەزار دەرچون.
ئەو نەیهێشت هیچ قسەیەك بکەم، ئەمریشی کرد: بیبەنەوە ژورەکە، با مۆڵەتێکی تری بدەینێ. باش بیربکەرەوە، کە بانگ کرایتەوە، وەڵاممان لێت دەوێت، گوێت لێ بوو؟ هیوادارم تۆش سبەینێ لەگەڵ زوربەی برادەرەکانتا بیت بۆ ناردنەوەتان بۆ ناو ماڵ‌و حاڵی خۆتان.
بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت بردیانمەوە بۆ ژورەکە..
قالە چوار مەشقیی لێی دانیشتبووە، خۆی بەگۆڤارەکانەوە خەریك کردووە.. هەروەك لە دەرەوە نەبوبێت‌و ئاگاداری هیچ نەبێت. بە ماتییەکی ڕێویانەوە سەیرێکی کرد..

دوای کەمێك لەو تێڕوانینەی گوتی:

- مامۆستا گیان ئەوە چی بو؟

< هەروەك ئاگاداری هیچ نەبوبێت، منیش وەك خۆی قسەکانم بۆ گێڕایەوە.

- دەی مامۆستا گیان توخوا ئەگەر لەوە زیاتر خۆت بەلێدان بدەیت، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خۆت سەرفراز بکەیت، بە قەبری ئەو شەهیدەی باوکم بەقەدەر برایەکی گەورەم خۆشم دەوێیتو دەزانم نە بەرگەی ئەشکەنجەی تر دەگریتو نە ئەوانیش وازت لێ دەهێنن!

دەك نەعلەت لەو برا گەورەییەت! لەناو ئەو مەینەتییەو بەو هەمو ئەشکەنجە گیانییو دەرونییو ئەو گوزەرانە سەختو پەتپەتێنەوە پێکەنینم بەئەقڵیی ئەو و رەئیسەکەی دێت. خۆشیشە پیاو قسەی وا ساکار بکاتو باشیشە وا گێلەپیاوانە تێیبگەن.

< گوتم: دیارە تۆ شارەزایت، باشە چیی بکەم تا خۆم رزگار بکەم..؟

- پێیان بڵێ من ئامادەی هاوکارییم لەگەڵ حیزبدا. چیی تێدەچێت، ئیمزایەکەو دەبڕێتەوە. بەخوا دوای چەند مانگێك بەهەزاران دێنە لات بۆ واسیتەو واسیتەکاری، لەوەشدا دەتوانیت خزمەتێکی زۆری خەڵك بکەیت! خۆ ئەگەر ئەوەش نەکەیت وا هەر بەلێنێکی سەرپێیو ئاساییان پێبدە کە سەرفرازیش بویت ئەوسا دەتوانیت نەیکەیت، یان را بکەیتو لەوەش خۆت رزگار بکەیت! بەخوا خۆت رزگار نەکەیت دەتکوژن!

ئەم پەیامو دەعوەتو هەوڵی خوێندنەوەی مێشکە، بیروداوێکی ترسناکی ترە، دیارە کە بەری ئەقڵی قالە نییە! منیش لەگەڵ قسەکانیدا هەوڵم ئەدا کە خاڵی لاوازی سەر روخساری بدۆزمەوە تا تیژو راستەوخۆو بێ تروکاندن چاوی تێ ببڕم، چونکە ئەگەر ئەو خاڵە لاوازە هەبێت وا بەشێوەیەکی کاریگەر کاردەکرێتە سەر لایەنی سایکۆلۆجیی بەرامبەرەکەت، بەتایبەتیی ئەوەی ئەم جۆرە سیخوڕییەت لەگەڵ دەکات.. بەلام ئەو خاڵە لاوازەم لەو روخسارەدا نەدەبینیی. ئەو خاڵەی بۆ ئەم حاڵەتە بۆ ئەو زۆر بەهێزە بەلام بۆ من چاوێنیی نییەو ئەویش وا دەزانێت لای من نادیارە، مەبەستم رەوشت نزمیی ئەو خۆفرۆشییەو بونە داردەستی دوژمنو کەوتنە ناو ئەو زەلکاوەیە کە دژە بە هاوزمانو هاوولاتیو هاوشارو بەرامبەر زیندانییەکی وەکو منیش کە تا دوێنێ مامۆستای بوم، کەچی ئەو هاوبەشییە دەکات لە راکێشانم بۆ ناو داوی ئەو زاڵمو داگیرکەرانە.. پێدەچوو لە جۆری سەیرکردنو مەبەستەکە حاڵی بوبێت.. ئیتر سەری داخست. دەشبو هەندێك قسە بکەم وەك وەلامی زارەکیی ئەو قسانەی قالە، تا زیاتر رەئیسەکەی لەهەندێك هەڵوێست دڵنیابکەم. گوتم:

< قادر تۆ دەزانیت لەگەڵ ئەم هەمو زۆرداریيەشیاندا لێیان ناترسم.

- چۆن لێیان ناترسیت؟

< چاك!؟

- ئاخر چۆن.. بۆچی هەیە لەمانە نەترسێت؟

< رۆڵە من لەخۆڕایی گیراوم، لە هەرەسی حەفتاو پێنجەوە لەسیاسەت دورکەوتومەتەوە. باشە تۆ دەزانیت من لەسەر چیی گیراوم؟ گوتی نا.

< بۆ تۆڵەسەندن منیان گرتووە، تۆڵە لە رابوردو، تا تۆڵەی رابوردوم لێ بکەنەوە.

- بۆچی خۆیان وایان پێ گوتیت..؟

< نا نا من خۆم باش دەزانم‌و بە لێکۆڵەرانیشم گوتووە. چونکە من هیچم نەکردووە تا بەم دەردەم بەرن.

- باشە مامۆستا تۆ قەت بیر لەوە ناکەیتەوە ئەگەر وەزیفەیەکی گەورەت بدەنێ وەری بگریت‌و خۆت لەکوشتن رزگار بکەیت.

< من دەڵێم جارێکی تر سیاسەت ناکەم. خۆ ئەگەر حەزیشم لەوەزیفەی گەورە بوایە بۆچی دەگیرام.. جگە لەوە من بەڵێنی درۆ نادەم، ئەگەر زانیومە هەر ئێستە سەرفرازم دەکەن. من دەڵێم سیاسەتم واز لێهێناوە بۆیە هیچ شتێك ناکەم کە بۆنی سیاسەتی لێبێت! دوای ئەوە بۆچی دەمکوژن؟ ئەمان خەڵك لەخۆڕایی دەکوژن؟ دەی وەڵامم بدەرەوە؟

- نا نا بڕوا ناکەم.

دەی منیش بڕوا ناکەم کاری وا لەگەڵ بێتاواندا بکەن.

بەرامبەر قسەکانم گوێقوڵاغ بوبو، خێرا خێراو بەسەر شۆڕییەوە دەیگوت خۆ ناهەقیشت نییە! بەڵام ئەی چۆن خۆت لەم بەڵا گەورەیەی ناو ئەم هەیئەیە سەرفراز دەکەیت!؟

هەستم بەجۆرێك لەحەسانەوە دەکرد. بابزانین رەئیس چی تری لەدڵدایەو دژەکرداری چیی دەبێت‌و بە قالەدا چیی تر دەنێرێت.

زۆر بەسەر ئەو مشت‌و مڕەدا تێپەڕ نەبو کە لە دەرگا دراو بانگی قالە کرا.. پاش نیو سەعاتێك هاتن بەدوای منیشدا.. رەئیس هاتە قسەو گوتی:

- ههها مەحمود! ئێستا دەڵێیت چیی..

< چیی بڵێم! وا دەزانم ئێستا خۆشتان گەیشتونەتە ئەو باوەڕەی کە من لەخۆڕایی گیراوم‌و ئاگاداری هیچ شتێك نیم..

- ئەی گوایا بەبێ تاوان تۆمان گرتووە؟

< بەڵێ، ئەگەر بەڵگەیەکتان لەسەر من هەبو وا دەڵێم لەخۆڕایی نییەو هەقی خۆتانە، چیشم لێدەکەن قسوری مەکەن.

- باشە ئەی بۆچیی تۆ گیراویتو بۆ ئێرە نێردراویت؟

< لەسەر کۆن منتان گرتووە، لەبەر ئەوەی تا ساڵی حەفتاو پێنج من سیاسەتم کردووە!

- یەعنی ئێمە تۆڵەت لێدەکەینەوە؟

< بەڵێ بۆ تۆڵەیە، ئەگینا نابێت بەڵگەیەکم پیشان بدەن! سەرۆکی هەیئە گوتی:

- ئەم سەگە نەعلەتییە بەرنو نامەوێت چاوم پێی بکەوێتەوە.

قسەی سەرزاری تەواو نەبو بو کە پەلاماریان دامو دایانم بەزەویداو. بە لێدانە جەهەننەمییەکە کەوتنە گیانم.. لەهەمو لایەکەوە قامچیو سۆندە دەبارێت. تا تەواو شەکەت بومو کەوتمو ئاگام لەخۆم نەما.

کە بەهۆش هاتم. ئاوە ساردەکە لەسۆندە دەردەپەڕێتو دەکرێت بەدەموچاوو لەشمدا. ئەوەندە هەست دەکەم کە دەستی راستم لە کەلەکەم، لەسەر جێگەی عەمەلیاتەکە توند کردووە.

دواییتر برامەوە ژورەوە. هێندە هیلاك و نائارام بوم وام دەزانیی لەناو جۆرێك لە بورانەوە یان دڵ وەستاندام. ئای لەم قەسابخانەیە، کە دیاردەی سەیرو نامۆی تیا دەخولقێت، پیاو کە لەو ئەشکەنجەیە دور دەکەوێتەوەو دەبرێتەوە شوێنی خۆی، چەند بەوە خۆشحاڵ دەبێت، هەروەك ژورەکەی ئەو زیندانە ببێتە ماڵی خۆیو شوێنی حەوانەوەی دوا ئەشکەنجەبێت. ئەی ئەوە نییە لە بێ ئومێدیدا هەمو هیوایەکی من هاتۆتە سەر ئەوەی کە بمبەنەوە ژوری ژمارە یەك یان هەر ژورێکی تر کە زیندانیی تری تێدا بێت.

نوێکردنەوەی پرسیارەکە لەسەر نامەی مام جەلالو ئەو هەمو سوربونو پێداگرتنە خستیانمەوە ناو دەریای بیرکردنەوەو گومانەوە. نا نا هیچ پێویست بەلێکدانەوە ناکات، ئەمانە لەسەر زانیاریی کۆن ئەو قسانە دەکەن. یاخود هەروەك شێوەیەکی لێکۆڵینەوە ئەم جۆرە پرسیارانە دەهێننە ئاراوە..

ئەوەی ئێمەو مانانیشی زیاتر دەخستە بەرچاوی دەزگا سیخوڕەکان، ئەو کەسانە بون کە رۆژێ لە رۆژان ئەندامی پدك بونو ئێستا بونەتە کاربەدەستو جاسوس. ئەوانەش کە خۆیان هەڵخلیسکاون، حەزدەکەن هاوبەشیی بکەن لەراکێشانی خەڵکی تر بۆ ناو ئەو زەلکاوە، خۆ لێپرسراوەکانی پاراستنەکەی پارتی بونەتە سیخوڕو کێیان بوێت توشی دەکەن.. لەناویشیاندا تۆڵەسێنی وا هەیە کە هەرچی لەتوانایدایە دەیخاتە کار بۆ توشکردنی نەیارە کۆنەکانی..

خۆ پیاو بڕواش بەوە ناکات کە لەمەکتەبی سیاسیدا بۆمبای زامنکراو هەبێت! باشە ئەی دەبێت لەکوێوە زانیارییان دەستکەوتبێت! ئەگەر وابێت چۆنو کێ بووە..

من تا ئێستا گومانم لەهیچ نەکردوەو ئەوەم هەر بە شێوەیەکی گوشارو گومان دروستکردن یان لەسەر زانیاریی کۆن لێکداوەتەوە. بەڵام ئەی بۆچی باسی نامەی نەوشیروان ناکەن کە بەردەوام نامەمان لەبەیندا بووە. کە ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکردەوە، خێرا وەڵامەکەیم دەدایەوەو دەمگوت: دەیجارێ پەلە مەکە، نالۆجیکییە ئەگەر سەرەی ئەویش نەیەت.

ڕۆژێکی گەرمی هاوینی حەفتاو حەوت بو کە بۆ مۆڵەتی پشوی هاوین لەسلێمانی بوم، "ف"، لە فولکەی قاوەخانەی سەرچیمەن، کە لە نیوەی ڕێگای ماڵەوەمانو ئەسحابە سپییەو هەردوو سەد مەترێکیان بەینە، پێمگەیشتو گوتی:

- ئەوە دو سێ ڕۆژە بەدواتا دەگەڕێم!

< خێرە..؟

- تکات لێدەکەم تا زووە فریای خۆت بکەوە، "س" ئاگاداری کردم کە بێمو پێت بڵێم کە "ع" زۆر بەقینە لێت، پێی گوتووە کە یەك چاڵم بۆ هەڵکەندووە هێز نییە فریای بکەوێت.. ئینجا گوتی: قسە لە "س" ناشارێتەوەو وتویەتی کە ڕاپۆرتێکی زۆری لە سەرت داوەو گەیاندوییەتی، گوایا تۆ لێپرسراوی جەلالییەکانیت.. لەبەر ئەوە تا زووە بڕۆ..

دوای ئەوەی کرژیی ناو بیرە پرشو بڵاوەکەی ئەو هەواڵەم ڕەواندەوە، چونکە بۆ خۆم دەمزانی کە ئەوە ڕاستەو ئەو سیخورە نوێیە چەندی ڕق لەچەند کەسێکمان دەبێتەوە، گوتم:

-زۆر سوپاسی دڵسۆزی و ئەم برایەتییەتان دەکەم، مەترسن هیچ نییە، بەتایبەتیی من ئێستاکە کارناکەمو ئاگاداری هیچ شتێك نیم لەبەر ئەوە لەخۆم ناترسم، ئەگەر بشگیرێم ترسم لەهیچ نییە.

خۆفرۆشیی "ع" گەیشتە ئەو ئاستەی کە کوڕەکەی خۆی کە پێشمەرگە بو لەماڵی خۆیدا بەگرتن بداتو لەسێدارە بدرێت.. "ف"و "س" دوو برادەری کۆنی دڵسۆزی ناو ڕێکخستنەکان بوون کە بەردەوام لەناو کاروانە سیاسییەکەدا دڵسۆزانە حیزبایەتییان کردوە. لەسەرەتادا "ع" پیاوێکی دڵسۆزو ئیشکەر بەڵام دروزنو ئاستی سیاسییشی نزم بو. لە لیژنەی ناوچەی سلێمانیدا کە ئەویش ئەندامێکی بو، گیرمان بەدەستییەوە خواردبو. تا لەکۆنفرانسی ناوچەی سلێمانی (ساڵی ١٩٦٩)دا نەمانهێشت ئەوو بێ کەڵکەکانی تری وەك "ج" لەهەڵبژاردندا دەربچن، تەنانەت لە کۆبونەوەکانی کۆنفرانسەکەدا یەکەم بورایەوە، یان ڕاستتر خۆی بوراندەوە! تا هاوبەشان ڕەحمێکی پێ بکەنو هەڵی ببژێرن، بەڵام بێ سود بو. دووەمیش خۆی بەپێوە نەدەگرت، هێندەی نەمابو لەسەرخۆی بچێت. بۆیە هەردوکیان بەڵێنیان

بەخۆیان دابو کە چەند بتوانن کاری دژ بەمنو نەوشیروانو شازادو رەفعەتی مەلاو حەمە چاوشین بکەن. دووەمیشیان سوێندی خواردبو کە بەهەر نرخێك بێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، بۆیە لەدوای بەیانی ئازارو هەڵوەشانی پ.ش.ك هەم پەیوەندییان بەئەمنی رژێمەوە کردو هەم بەپاراستنی پارتیشەوە، دووەمیان داوێکی دوو سەرەی نایەوە، هەرچەندە ئەندامی لقی سلێمانیش بوم لەگەڵ ئەوەشدا عەلی عەبدوڵڵا نەبوایە پاراستن بڕیاری بەگرتنو فڕاندن بۆ گرتوخانەی خەلان دابو (هاوینی ١٩٧٣)، هەرکەسێکیش رێگەی بکەوتایەتە ئەو گرتوخانەیە، کوشتن دەبووە چارەنوسی. جا دەیان کەس لەم جۆرانە کەبوبونە نۆکەری بەعس.. ئیشیان هەر راپۆرت نوسین بوو. قسەی راستو ناراستیی ئەوان لای دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعس کلاشەیان دەکرد.

لە لێکدانەوەکانمدا بۆ ئەوە دەچوم کە ئەو پرسیارەی لەمەڕ نامەی مام جەلال، پلەی دووەمی لێکۆڵینەوەیە لەگەڵم. لێرەشەوە بەرپرسیارییم یان تاوانبارکردن دەگاتە ئاستێکی تر. ئەمەش سەرەتایەکە بۆ پلەی ترسناكو ئاڵۆزتر. چونکە تاوانە قورسەکە یان پرسیارە قورسەکانی تر هێشتا ماون. چاوەڕوانیی.. چاوەڕوانیی، هەندێك جار لەو دۆزەخەدا ئەو چاوەڕوانییە زیاتر پیاو هیلاك دەکات، دەقیقەیەکت لێ دەبێت بەسەعاتێك. هەندێ جار خۆشتر دێتە بەرچاو کە بانگ بکرێم لەبریی ئەم چاوەڕوانییە بێ سەرەنجامە یان راستتر ئەم چاوەڕوانییە ئەنجام تاریکە. دیارە حەزەکەم بۆ ئەوەیە کە بزانم ئەو هەڕەشەو لێکۆڵینەوانە بەرەو چیی‌و کوێ دەبرێن؟ کات گەییشتە نیوەڕۆ بانگ نەکرامەوە. دەی کێ دەڵێت ئیتر وازیان لێم نەهێنابێت! ئەی لەوە زیاتر چیم لێدەکەن. خۆ لەشیشم بەرگەی ئەشکەنجەی تر ناگرێت.. رەنگە لەوە گەیشتبن بۆیە بانگ ناکرێم. نانی نێوەڕۆش خورا. هیچ دەنگ نییە. سەرم نایەوە تا سەرخەوێك بشکێنم ئەوسا لە دەرگادان راپەڕاندم. چاوبەسترایەوەو کێشکرامەوە. وەستێنرام.. تا بڵێی هیلاكو تەواو نوشتاومەتەوە. گوتی با دانیشێت. دەنگی رەئیسی هەیئە بو. لەسەر عەرزەکە دایاننام، کەوتە نەسیحەت کردن. قەوانە کۆنەکە لێدرایەوە.

دوایی کەوتەوە هەڕەشە، ئینجا گوتی:

- ئێمە دەزانین تۆ لەگەڵ جەلالدا نیت.. ئێمە دەزانین تۆ نە کۆمەڵەیتو نەیەکێتیتو نەجەلالیت.. بەڵام مەعلوماتی تەواومان هەیە کە تۆ ئاگادارییت لە دامەزراندنی کۆمەڵە هەیە. تۆ خۆت بۆ ئەوە کارت دەکرد، بەڵام لەدواییدا دور کەوتیتەوە.. ئێمە هیچمان لەتۆ ناوێت ئەوە نەبێت کە پێمان بڵێیت دامەزرێنەرانی کۆمەڵە کێ بون؟ نامانەوێ چیرۆکەکەمان بۆ بگێڕیتەوەو بزانین بۆچی

دورکەوتیتەوە، ئێمە هیچمان لەو جۆرە قسانە ناوێت. ئەوە نەبێت کە پێمان بڵێیت ئەوانە کێ بوون کە لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵە خەریك بوون؟ هەر ناو بڵێ ناوو هیچی ترمان لە تۆ ناوێت؟

وا سەرەتای پلەی سێیەم لە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە دەرخرا. لەوە دەچێت ئەشکەنجە قورسەکان لێرەوە دەست پێبکرێت! دەبێت خەتە بەیانییەکە هەر سەرەو ژور ببرێت. بەلێکدانەوەی خۆشیان وەڵامی پرسیارەکە ئاسانە، تەنها ناو گوتنەو هیچی تر!

< من ئاگاداری هیچ جۆرە باس‌و خواسێکی لەو بابەتانە نەبوم، من بۆ رەمادی نەفی کرابوم، بۆیە لەدەنگو باسی کوردستان دابڕاوبوم..

- خۆت گێل مەکە، ئێمە پرسیاری ساڵی حەفتا دەکەین نەك حەفتاو پێنج.

باشە ئەی ئەوانەی لەدوای ساڵی حەفتاو پێنج گیران‌و چەند کەسێکیشیان ئیعدام کران ئەوانە نەبون؟

< من هیچ جۆرە زانیارییەکی لەو بابەتانەم نەبووە، چونکە من بۆ رەمادیی نەفی کرابوم.

- باشە ئەی ئەوانەی کە حوکم دران؟

< نازانم کێ بون‌وکێ نەبون، ئاگاداری ئەو روداوانە نەبوم.. ئەوە نەبێت کە دەگوترا ئەوانەی کۆمەڵە بون لەسێدارەدران.

- باشە ئەوانە کێ بون؟

< دەگوترا شەهابی شێخ نوری‌و جەعفەرو ئەنوەر بون.

- کێ دەیگوت؟

< خەڵك، ئەوە بەسەر زاری هەمو کەسێکەوە بوو.

- تۆ ئەوانەت دەناسیی؟

< من هەر شەهابم دەناسیی.

- چۆنت دەناسی؟

< کوڕی گەڕەکێك بوین.

- ئەی سیاسەتت لەگەڵ نەکردبو؟

< نەخێر هەر دوور بەدوور یەکترمان دەناسیی.

- باشە ئەوانەی تر کە حوکم دران..؟

< نازانم کێن، من بەدرێژایی ئەو ساڵانە لەرەمادی بوم، بۆیە لەو دەنگو باسانەش دوربوم..

- باشە ئەوانەی دەتناسین کێ بون.؟

< نازانم کێ حەپس کراو کێ حوکم دراو کێ ئازاد بو.

- باشە ئەی فەرەیدون ناناسیت؟

< کام فەرەیدون؟

- فەرەیدون عەبدولقادر.

< نەخێر نەدیبوم‌و نەدەمناسی.

- ئەی عومەری سەید عەلی؟

< ئەو کاتەی یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردە بوم بۆ کاروباری قوتابخانە سەرەتاییەکان، وەك مامۆستای قوتابخانە دەمناسیی. ئەم لە ۷۳دا پاراستن گرتیان و فڕاندیان کە بەهیە مەعروف هاتە ماڵەوەو خەبەرەکەی دامێ.. پاش سۆراغ کردن و ددانننان بە گرتنیدا، حەمە رەحیم گوتی: کاکە ئەمە "لەعینە". گوتم زۆر ناشیرینە بۆ ئێوە هەم خەڵکی باش دەگرن و هەم ناوی وا ناشیرینیان پێوە دەلکێنن.. ئیتر بەڵێنی ئازادکردنی پێدام..

دوای ئەوەی چەند ناوێکی تری پرسی، بە نایناسم وەڵامم دایەوە. گوتی:

- ئەی ئەوانەی دەیانناسیت ئێستا لەکوێن؟

< نازانم.

- ئەی نەتبیستووە کە ئەوانەش کۆمەڵە بون؟

< نەخێر هیچ شتێکم دەربارەی کەسیان نەبیستووە.

- ئەی چۆن باسی ئەوانەت بیستوە؟

< وابزانم حەپسن، لەراستیدا هیچ زانیارییەکم دەربارەیان نییە..

یەك شەقم تێ سرەوێنراو بەجنێو دابارینەوە گوتی:

- ئەمە وا دەزانێت بەم درۆو دەلەسانە هەڵماندەخەڵەتێنێت‌و بڕوای پێ دەکەین.. ئەگەر یەکێك نەیناسێت دەڵێت لەشامی شەریفەوە هاتووەو بەسزمانە ئاگاداری هیچ نییە، رەنگە نەختێکی تر بڵێ من هەر سیاسەتم نەکردوە، لەوانەشە بگاتە ئەو ئاستەش کە نکوڵیی لەناوی خۆشی بکات‌و بڵێت من مەحمودی مەلا عززەت نیم! کوڕە تۆ ئاگاداری هەمو کەین‌و بەینێك بویت! لەبەر ئەوەی کە قسە ناکەیت‌و وا دەزانیت گێڕانەوەی مێژوش هەر ئیعتیرافە.. ئەوە دەیسەلمێنێت کە تۆ تا گرتنەکەشت هەر لەگەڵ تێکدەراندا بویت، ئەوە بەڵگەیەکی زیندووە بۆ ئێمە..!

وا گەیشتنە لوتکەی پلە ترسناکەکە.. بەس لەوە ناگەم بۆچیی لەو سەرەتایەوە دەست پێ دەکەن؟

وا بزانم مەبەستەکەیان هەر سەرلێتێکدان‌و وەك خۆشیان دەڵێن هەر گێڕانەوەی مێژووە! ئەوان وای لێکدەدەنەوە کە بەرامبەرەکەیان بەو شێوەیە ئاسان

رادەکێشرێتە ناو داوەکەیانەوە.. رەنگە پلانەکەشیان هەر لەسەر ئەو مەزەنەیە بێت کە گەیشتومەتە لوتکەی شەکەتی‌و لاوازیی جە ستەو نزمیی لایەنی دەرونیی نزیك بەڕوخان‌و قسەکردن، بۆیە وا ئێستا هاتونەتە سەر ئەسڵی مەبەست. ئەم ماوەیە باش دەرکەوتووە کە هیچ جۆرە بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە. هیچ جۆرە زانیارییەکی بەدەر لەو سەرەتای دامەزراندنەی کۆمەڵەیان لا نییە، بۆیە وا عەودالی سەرە داوێکن تا بەڵگەیەکیان دەست بکەوێت..

دوور نییە ئەوانەش هەر بەشێکی زانیارییەکانی پێش ئەو پلەیە نەبن‌و خۆیان شتی تریشی تێ هەڵکێش بکەن.. بەتایبەتیی ئەو سەردەمەی خەباتگێڕەکان نیمچە ئاشکرا بون، بەڵکو هەر ئاشکرا بوون، بەهۆی گۆڤاری رزگاری‌و بارەگاکەیەوە، بارەگای پێشمەرگەی ناوشار، هاتوچۆو کۆبونەوەی بەردەوام.. کۆڕی هەفتانەی رۆشنبیریی لای مام جەلال لەبەکرەجۆ، بوونی بارەگای یەکێتی نەقابەکانی کرێکاران، گێڕانی ئاهەنگی جەژن‌و بیرەوەرییەکان‌و خۆپیشاندان، شەڕو ئاژاوەی ناوخۆ. ململانێی ناو رێکخستن‌و ناکۆکییەکان کە، هەندێك لایەنی بەمەبەست ئاشکرا دەکران.. ئەوانە رویەکی ئاشکرای کارەکان بوون. بۆیە ئەندامانی لق‌و لیژنەی ناوچەو زۆر لە رێکخراوەکان دەناسران. جاروبار بڵاوکراوەی نهێنی‌و تایبەت بە ئەندامانیش دەگەییە، دەزگای سیخوڕیی سوپای عێراق، بێ ئەوەی بتوانێن بیدۆزینەوە، ئەوەش وای دەگەیاند کە خەڵکیان لەناو رێکخستنەکەشماندا چاندبو..

لە راستیشدا ئێمەی لقی سلێمانی لەو سەردەمەدا لەسێ جۆر ململانێدا بوین:

- زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتیی باڵەکە نەیاندەویست بەو مەرجانەی بارزانی، رێکبکەون، جگە لە دڵنیا نەبون لەخودی بارزانی. چونکە وەك سەرەك هۆز، کە لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی: سەپاندنی خواست‌و ئیرادەی خۆی بە سەر سەرکردایەتیی بەکۆمەڵ‌و پێڕەوی ناوخۆدا، کە لەگەڵ پرنسیپەکانی پارتایەتی‌و دیموکراسیی‌و گیانی مشتومڕو دەنگدان‌و بڕیاردان بەپێی ناوەندێتیی دیموکراسیی لە مەسەلە گرنگەکاندا نەدەگونجان، هەمو بیرکردنەوەو قسەکردنێکیش لەسەر ئەوانە لای ئەو بەدەست بەستن‌و بەدەسەڵات کەمکردنەوەی دادەناو لەدژی دەوەستا.

زۆریش هەوڵدرا کە بارزانی بەوە رازی بکرێت کە باڵی مەکتەبی سیاسیی وەك رێکخستنێکی سەربەخۆ بمێنێتەوە، بارزانیش سەرکردەی شۆڕش‌و هەمو لایەك بێت. بەڵام مەلا مستەفا بەوە رازی نەدەبو، ئەو دەیویست، سەرجەمی باڵەکە تێکەڵ بکاتەوە، تەنانەت بە مانەوەی باڵەکە لەئاستی مەڵبەندی حیزبەکانی تریشدا کە هەموی کەوتبونە ژێر باڵ‌و ناو سیاسەت‌و سەر رێبازەکەیەوە رازیی نەدەبو..

هەر لەسەرەتای ناکۆکییەکەشەوە بارزانیی هەوڵی ئەدا کە مام جەلال ببێت بەسکرتێری پارتی، بێ ئەوەی ئەم بیر لە قبوڵکردنی بکاتەوە. لەناو برادەرانی

سەرکردایەتیشدا جۆرێك لەدوودڵی‌و ناسەقامگیریی لە راو هەڵوێستدا هەبو، بەڵام لەدواییدا، جگە لەمام جەلال‌و حیلمی عەلی شەریف (هەرچەندە ئەم لە رێکخستنەکە دورەپەرێز وەستابو، بەهۆی ئەوەوە کە روشدی- برای لە کەلار لەیارییەکی فوتبۆڵێن لەنێوان دوو تیپی پێشمەرگەدا، لەتەقەی خۆشیی گۆڵکردندا گوللەیەکی وێڵی بەردەکەوێت‌و دڵی گەورەی دەوەستێ (١٩٦٩). حیلمی جۆرێك لەگومانی لا خولقابو، چونکە ناردنی روشدی بۆ کەلار بۆ بردنی پارەی مانگانەی پێشمەرگە بە نائاسایی دەدایە قەڵەم)و حەمەی حاجی تایەرو کەمال محێددین‌و زەبیحی، هەمو برادەرانی تری مەکتەبی سیاسی‌و کۆمیتەی ناوەندیی هاتنە سەرخەتی رێککەوتن.. هەرچەندە تیاشیاندا هەبو بە "الحکم لله" دەستی بەرزدەکردەوەو دەنگی بۆ رێککەوتنەوە دا. مەلا مستەفا خۆشی قبوڵی نەبو چەند کەسێکی وەك زەبیحی‌و حەمەی حاجی تایەرو کەمال محێددین لەگەڵ برادەرانی تردا بچنە حاجی هۆمەران.

- تاقمێکی تر نەیاندەویست رێکخستنەکەی بەرەی مەکتەبی سیاسی هەڵبووەشێنرێت ئەمان دوو بەشی جیاواز بوون، لایەکیان چەپەکان بوون، کە رێککەوتننامەشیان لەگەڵ بارزانیدا بە باش دەزانی بەڵام لاکەی تر، کە پێچەوانەی بیرورێبازی لای یەکەم بوو، دەیانویست بەهەر نرخێك بێت رێکخستنەکە بمێنێتەوەو. رێککەوتنەوەش لەگەڵ بارزانی نەبێت. لەناو ئەم بەرەیەدا خەڵکانی وەك مەلا عەبدوڵڵاو بابەکراغاو شێخ ستار هەبون، کە دیاربوو دەیانویست لەگەڵ رژێم بمێننەوە، وا دەردەکەوت کە جێگەی خۆشیان خۆش کردبێت! ئیتر ئەوانە لە نوێ بونەوەی شەڕدا رژێم کردنی بەوەزیرو ئاشکرا تێکەڵ بە بەعسییان بوون! و بۆ هەریەکەیان حیزبێکی کارتۆنی دامەزرێنرا، بۆ ئەمان، نائاسایی نەبوو کە ببنە هاوکاری رژێم، بەڵام بۆ تێکۆشەرانی وەك "زەبیحی"ی نامۆ بوو، یەکێك لە هەڵە گەورەکانی ئەم پیاوە روناکبیرو لەخۆبوردووە، ئەو هاوکارییەی بوو لەگەڵ حیزبەکەی مەلا عەبدوڵڵادا..

- تاقمی سێیەم ئەوانە بون کە کاریان بۆ: لابەلاکردنی شەڕی ناوخۆ، دامەزراندنی رێکخراوێکی نوێ، دوای هەڵوەشانی پدك (بەرەی م.س) سەبارەت بە گەلێك هۆو هەڵەو ناکۆکیی کۆن، دەکرد، لە راستیشدا زۆر لەپێش بەیانی ئازارەوە کار بۆ ئەوانە دەکراو زەمینە بۆ هەندێکیان ئامادە کرابوو..

سەبارەت بەوانەش، هەم سەرچاوەی دەرچونی زانیاریی ناو رێکخستنەکە بۆ دەرەوەی زۆر بوبو.. هەم دەبوو وردو قووڵ بچمە ناو روداوەکانی ئەو سەردەمانەوە تا بزانم چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەیکەن بدەمەوە، بەپێی پرسیارەکان‌و ئەو زانیاریانەی پێیان گەیشتووەو لایان ماوەتەوەو پرسیاری لەسەر دەکەن. هەرچەند لەم شوێنانەدا "نازانم، رەحەتی گیانم" باشترین وەڵامە بۆ ئەو جۆرە پرسیارانە.

دوای پرسیاره چڕەکان، بەجێیان هێشتم، دنیای ئەو ناوە دەنگی گیزەی مێشولەشی لێوە نەدەهات.. بەجۆرێك کە وام دەزانی کات زۆر درەنگەو رەنگە هەمو زیندانییەکان لەپرخەی خەودا بن.. بۆیە منیش بێ بیرکردنەوە لەناو ئازارو سەرمادا، بەناچاریی لەسەر کۆنکرێتەکە لێی راکشام.. لەناو تاوو توێی ئەو مێژوەو لە شەقەی باڵدانی مەلی بیرکردنەوەم بۆ ناو ئاسمانی ئەو خەیاڵانەی رابوردوودا بوم کە دەنگێکی ناساز داوەکانی پچڕاندو هێنامییەوە ناو دنیای هەیئە.. دەنگە گڕەکە بەرز بووەوەو گوتی:

- وازی لێ بهێنن، وازی لێ بهێنن! گوێ قولاغ بوم تا بزانم چیی تر دەڵێت. بێ ئەوەی لەجێگەی خۆم بەرزببمەوەو بزانم مەبەستی چییە. کەمێك دوای ئەوە هەمان دەنگی ناساز لەنزیك ترەوە گوتی:

- بۆچی عەزییەتی خۆمان بدەین بیبەن بۆ ئۆرزدیی لەهەمووی باشترە.

سەیرە، دەبێت ئەمەیان چیی بێت! ئۆرزدییەکەیان لەکوێ بێت! ئەگەر ئەمە ئۆرزدی نەبێت ئەی دەبێت ئەوی تر چۆن بێت؟ تۆ بڵێی نینۆك دەرهێنان، قاچو قوڵ بڕینەوەی تیابێت؟ هەرچەند ئەم ماوە دورو درێژەی کە لێرەم، دیاردەی وام نەبیستووە..! بەڵام کێ دەڵێت نەیانکردووە! ئەی هەندێك لە زیندانییەکان نەیاندەگوت هەڕەشەیان پێکردووە.. نا رەنگە مەسەلەی بوتڵ بێت، خۆ ئەمەیان، کراوە. رەنگە زۆر کەس ئەوەیان لەگەڵ کرابێت. ئەی ئەکرەمی حەپسە نەیدەگوت.. ئەی جەماعەتەکەی عەلیاغا باسیان نەکردبو. ئەی قالە نەیدەگوت کە هەمو جۆرەکانیان بەکار هێناوەو زۆر کەس لە ژێریدا دەرنەچووەو هەندێکی تری سەقەت کردووە.. دەی کردگار لە بەعس نەتپاراستین دەی هیچ نەبێت لەم ئامڕازانە بمانپارێزە، بڕوام نییە بەرگەی هیچ جۆرێکیان بگرم..

لەگەڵ ناوی بوتڵ بە مێشکدا هات، سەردەمی تۆقاندنەکەی دوا مانگەکانی حوکمی عەبدولکەریم قاسمم هاتەوە یاد. ئەو دەمە کە راونان، گرتنو ئەشکەنجەی زیندانیی زۆر بوبو. ئێمەش قوتابیانی دوا پلەی زانکۆی بەغدا بوین، رۆڵی چاوێنییمان هەبوو. لە خۆشمان دەترساین کە بەر هێرشی گرتنو ئەو ئەشکەنجانە بکەوین. بە تایبەتیی چالاکییەکان بۆ ئێمە کە رۆڵی لێپرسراوەتیی رێکخستنەکەو یەکێتی قوتابیانمان دەبینی، لەسەرەتادا بەئاشکرابو، نە دەشاررراینەوە. لەبارودۆخ خراپبونیشدا دەبو کارە قورسەکان خۆمان بیکەین، تەنانەت لەسەر دیوار نوسینیش.

ساڵی شەست وەك بەردەوامیی ساڵی پێشوو، گەرمەی چالاکیی هەمە چەشنەی ئاشکرای پارتایەتیو قوتابیان بو. کۆنگرەی قوتابیانی گشتیی جیهان لە بەغدا

دەبەسترا (٨- ١٠- ١٩٦٠) نوێنەرانی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا وەك گوێگرو بۆ یەکەم جار ڕێگەیان پێدرابوو کە ئامادەبن بەڵام زۆری نەبرد ناویان خرایە لیستی رەشەوەو قەدەغەی سەفەریان بۆ بەغدا کرا، بە هەوڵێکی زۆری ئێمەی قوتابی خالید نەقشبەندی کە ئەندامی (مەجلیسی سیادە) بو کارەکەی بۆ کردین کەمال فوئادو عیسمەت شەریف هاتنو ئامادەبون ئێمەش رۆژانە دەچوینە کۆنگرەو چیمان لەدەست بهاتایە لە بەیان بڵاوکردنەوەو قسەکردن لەسەر قوتابیانی کوردستانو مەسەلەی کورد بۆ وەفدەکانو لەناو کۆنگرەکەدا دەمانکرد.

یەکێك لەو کارانەی لە کۆبونەوەیەکی پەراوێزی کۆنگرەکەدا لە (٢١- ١٠- ١٩٦٠) ئەنجام درا، بڕیاری دامەزراندنی یەکێتی قوتابیانی گشتیی کوردستان بو. لیژنەیەکیش بۆ بەڕێوەبردنو بۆ پەیوەندیش لەگەڵ ئەوروپا لە: روناك زوهدی، سەروەر محەممەد، سەردار میرزا عەبدولرەحمان، ئەسعەد خەیلانی و بەندە) پێکهێنرا. بەیانێکیش دەرکرا کە ئەوە یەکەمو دوا چالاکیی ئەو رێکخراوە بو. بەڵام وەك یەکەم هەنگاوێك لەسەر رێبازی کوردستانی کردنی بزوتنەوەی قوتابیان، دوای ئیفلیجکردنی چالاکییەکانی لە سەردەمی دەسەڵاتی مارکسییە لینینییە عیراقیەکانی هەمزەییەکاندا کە بووە هۆی دورکەوتنەوەی چەند کەسێك، لەوانە (مستەفا سلێمان) سکرتێری گشتیی یەکێتی قوتابیانی کوردستان (یان ئەگەر لە زەینم ئاوانەبوو بێت بەناوی سەرۆکی لیژنەی باڵای ی.ق.ك- بوو) کە دەرکەوتوترین لێپرسراوی چالاکی قوتابیان بو. ئێمە ئەو کارەمان بەهەنگاوێکی گرنگی سەر رێبازی کوردستانی کردنی بزوتنەوەی قوتابیان دادەنا.

رۆژ لەدوای رۆژیش بارودۆخی سیاسیی عێراق خراپو خراپتر دەبوو، تەنگ بەهێزە چەپەکانو کورد هەڵدەچنرا، دواتر شەپۆلی خۆپیشاندان بەغدای گرتەوە. راونانو گرتنو ئەشکەنجەی زیندانییەکان زۆرو زۆرتر دەبوو. رۆژنامەکان دادەخران، گروپە راستڕەوو ئیسلامییو نەتەوە پەرستە توندڕەوەکانی عەرەب باڵادەست دەبون.. دیکتاتۆرییەت لەهەموو بوارەکانی ژیاندا خۆی دەسەپاند..

ئەشکەنجەو بوتڵو گون لە یادەوەریی پێشتردا: رۆژێك لەدوا رۆژەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسم لە یانەی زانستگاکەمان دانیشتبوین باسی گرتنو لێدانو شێوەو ئامرازی ئەشکەنجەمان دەکرد کە بۆ ئیعتیراف پێکردنیی زیندانیی بەکاردەهێنرێت، کەچیی بەکاردەهێننو چۆنیان دەخەنە کار، کە قسە هاتە سەر بوتڵ بەکارهێنان، لەتیف حامید، کە لە بۆنە گشتییەکاندا وتارەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی دەخوێندەوە، چونکە هەم عەرەبییەکی باشی دەزانی، خۆیشی لە بەشی زمانی عەرەبی بو، هەم دەنگیشی زۆر لەبارو گونجاو بو. گوتی:

بەخوا برایینە من بەرگەی هەمو جۆرە لێدانێك دەگرم، بەڵام هەرکە ناوی بوتڵیان برد، دەڵێم بوەستن، چیتان دەوێت دەیڵێم، بنوسن:

یەکەم: ئیبراهیم میرانیی (ئەم لێپرسراوی پەیوەندییەکان بو هەم لە کۆنگرەکەی قوتابیانی جیهانیداو هەم لە چالاکییە گشتییەکانی قوتابیان لەگەڵ حیزبو رێکخراوە سیاسییەکان، سەرپەرشتکاری لاپەڕەی قوتابیانی کوردستانیش بو لە رۆژنامەی خەباتدا) کە لەدواییشدا بەر ئەو هێرشی گرتنە کەوتو ماوەیەك ئەوقی زیندانی (خلف السده) کرا.

دووەم.. مەحمود مەلا عززەت.

سێیەم: ئیتر یەکە یەکە ناوی هەموتان دەڵێم. ئێمەش دەستمان کرد بەپێکەنین.

گوتی ئەوە بەچی پێدەکەنن، هەر بەجیدیو بەراستمەو بەراستیشی وەربگرن، ئیتر کەیفی خۆتانە، لەدواییدا نەڵێن ئاگاداری نەکردوین، پێتان دەڵێم من بەرگەی هەمو شتێك دەگرم بەڵام بەرگەی بوتڵ تێبڕین ناگرم، بۆیە هەر کە من گیرام دەبێت ئێوە فریای خۆتان بکەون..

دوای ئەوەی دەنگە ناسازەکە پەیامی ئۆرزدیی گەیاند، هەڵیانساندمە سەرپێو دوای چەند هەنگاوێك. چرپەیەك بەگوێمدا کرا:

- فریای خۆت بکەوە، بۆ کوشتن دەتبەن، قسە بکە.

منیش نوزەم لەخۆم بڕیوە. سیخورمەیەکم تێسرەوێنراو گوترا:

- ئەوە لەگەڵ تۆم نیە بۆ قسە ناکەیت؟

< قسەی چیی بکەمو چیی بڵێم؟ من هیچم لانییە تابیڵێم!

دەنگە گڕەکە بەرزبووەو گوتی:

- ها ئێستا چی دەڵێیت؟ ئیعتیراف دەکەیت؟ قابیلە جەنابت لەو فێڵانەی کە بینیوتن بەهێز تر بیت!؟ ئیتر لەوە زیاتر خۆت توشی فەلاکەتی تر مەکە، منیش جوڵەم لەخۆم بڕیبو. بیریشم لای مردن چڕ بووە. سەیرە بۆچیی ئەو وشەیە واخۆی خزاندۆتە مێشکمەوە، دەبێت هەستی شەشەم بێت وا مردنی لەبەر لوتمدا قوت کردۆتەوە.

بە راستیی تاوانو زوڵمێکی گەورەیە مرۆڤ وا لێدەکەنو بەم جۆرە دەیکوژن، دور لەیاساو ویژدانو بێ ئەوەی بەڵگەیەك بەدەستەوە بێت، بێ ئەوەی ماڵو منداڵی بزانن چی لێهاتووەو چۆن کوشتیان و بۆچی نەیانبینییەوە!

سەرلەنوێ دەنگە گڕەکە چەند رستەیەکی گوت بێ ئەوەی بەباشیی گوێم وەریان بگرێت، دوا رستە نەبێت کە گوترا نا نا جارێ بابمێنێ.. چۆن هەروا ئاسان دەیکوژین.

کە سۆندەکەیان دایە دەستمو گوترا: دەی، کەوتمە هەنگاونان، زۆری نەبرد گوترا: چاوبکەرەوە.. لەگەڵ کردنەوەیدا گوترا: دەی بۆ ژورەوە.. ئای ئەو ساتانەی کە دەڵێن چاوت بکەرەوە، وا دەزانیت لەناو دەریای تاریکستانی مردنەوە گیانت بەبەردا دەکرێتو بۆ سەرزەوی هەڵدەکێشرێتەوە..

وەختێك کرامەوە بە ژوردا قاله لەگەڵ نیسکێنە خواردن خەریك بو..

بەر موسەڵلانم زۆری بۆ هێناوم، کە چومە سەر تەنەکەکە، دیسان هەموی خوێناوە.

دوای ئەوە چەندم توانی بەزۆر ئاوم خواردەوە، چیی مابو لە نیسکێنە لەگەڵ پارچە سەمونێکی ماوەدا خواردمو لێی پاڵکەوتم.

لە بیرکردنەوە لەقسەو پرسیارەکانی سەرۆکی هەیئەو لێکۆڵەرەکانو پەیوەندییان بە رابوردووەوە، کەوتمە شەنو کەو کردنی ئەو روداوانەی لەگەڵ پرسیارو وەڵامەکاندا یەکدگیر دەبن! لەگەڵیدا وەنەوز دایگرتوم، لەگەڵ ئازارو شەکەتییو ئەو خەیاڵو بیرکردنەوانەدا کەوتە زۆرانبازییو ئیتر ئاگام لەخۆم نەما. کە لەناو جۆرێك لە کەروێشکە خەودا هەستم بە جۆرێك لە وشیاریی دەکردو چاوم کردەوە، ئەوسا زانیم ئەوە دەنگی قالەیە، تومەس لە بانگکردنی ئەوە واخەبەرم دەبێتەوەو دەڵێت:

- ئەوە چییە مامۆستا؟

< چیی؟ چیبووە؟

- ئەو هاوار هاوارە چییە؟ خێرا خێرا دەڵێیت ئیعتیراف ئیعتیراف.

< کەمێ وەستامو لەخۆمم دەپرسیی تۆ بڵێیت خەوم بینیبێت! تۆ بڵێیت لە ورێنەی دەم خەودا قسەی وام کردبێت بە لەسەر خۆییەکەوە روم تێکردو گوتم:

< ئەوە دەنگدانەوەی قسەکانی جەماعەت بوو کە لە گوێتا ماوەتەوە.

- مەبەستت چییە؟

< کاتێك لەو چەند کەسەیان ئەدا تۆ نەخەوتبویت وا نییە!؟

- بەڵێ وەڵڵا نەخەوتبوم، خەوتنی چیی.

< ئێی کەوا بو تۆ گوێت لە دەنگی ئەوان بووە نەك دەنگی من.

- بەڵێ راستە گوێم لێیان بو، بەڵام لێدانەکە زۆر نەبو، جەماعەت زوو روخان.

< کاتێ هاواریان دەکرد ئیعتیراف دەنگیان بەرزبو؟

- بەڵێ زۆریش بەرز بو.

< دیارە شت دەزاننو شتێکیان کردووە، ئەگینا چۆن پیاو شت بۆخۆی هەڵدەبەستێت!

کە قالە لە قسەکەیدا مایە پوچ مایەوە، ئەوسا پێچێکی پێداو باسەکەی لەبیر خۆی بردەوە.

لەو قسانەدا بوین، هاتن بەشوێنمداو بەپەنجە بانگیان کردم. سەیرە شەو لەو کاتانەدا بانگکردن نائاسابییە. بەلاّم زانیم کە بەخەبەرکردنەوەکەم بێ بانگکردن نابێت. دیسان شتێکیان لەچاومەوە پێچاو سۆندەم درایە دەست.. کەمێك راکێشرام. ئینجا وەستێنرام. روبەڕوی دیوارێك بووم. فرمانم پێدرا: دەی هەردوو دەستت بەرزبکەرەوە. ئەوەم کرد. گوتی: بیجوڵێنیت دەتکوژم. ناو بەناویش دێتە پێشەوەو سیخورمەیەك دەهاوێژێو دەڵێ ئیعتیراف بکە. یا شەقێك دەهاوێژێو هەمان قسە دەکاتەوە. دەستم بەتەواوی هیلاك بو، تەواو شلو بێتاقەت بوم. زۆری نەبرد کەوتم.. لەقەیەکم پێدا کێشراو بەجنێوەوە فرمان درا کە هەستمەوە.. ئەو جنێوانەی لێرە بەسەرتا دەبارێنرێ لەژیانمدا نەمبیستبون، ئەو سوکایەتییەی بەکوردی دەکەن.. پێش ئەم زیندانیکردنە ئەقڵ نەیدەبڕی، ئەوەی بەفارسەکان دەڵێن کە لەجەنگێکی خوێناویدان لەگەڵیاندا.. بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی بەئێمەی دەڵێن، هیچی وانییە.

لەم هەیئەیە تێگەیشتم کە دوژمنایەتیو سوکایەتی بەکورد لەگەڵ مۆخ و خوێنیاندا تێکەڵ بوە.. بەزۆر هەڵیانسانمەوە.. خۆم نەگرتو کەوتمەوە.. هەرچەندە هێزی ئەوەم تیانەمابو کە باش خۆم بگرم، بەلاّم پەرێشانتر خۆم نیشان دەدا.. ئیتر ناچار وازیان لێ هێنامو دوای ماوەیەك لەژورەکە خۆم بینییەوە. خۆمدا بەسەر جێگەکەدا. قالە ویستی دەستبکات بەقسەکردن.. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەم ویژدان مردووە لەدەرەوە ئەشکەنجەو لەژوریشەوە پاسەوانی خەو زڕاندنو پشوو نەدان!. بەتوڕەبونو هەڵچونەوە گوتم:

< زۆر هیلاکمو نامەوێت گوێم لەیەك وشە بێت، وازم لێ بێنە با کەمێك بحەوێمەوە.. ئەوەی توانای گوێ گرتنو بیرکردنەوەیە لەمندا نەماوە.. بەدەم قسەکانمەوە، لەناو ئازارو پڕوکاویدا، خەوم لەخۆم خستو جوڵەم لەخۆم بڕیی. باش بو، توڕە بونەکەشم کاری خۆی کردو نەیوێرا قسەیەك بکات. ئەوەش دەرفەتێك بوو کە بیر لەسەر خەو چڕبکەم تا کەوتمە ناو دنیای بێئاگاییەوە. کە هەستام هەستم دەکرد کەمێك هیلاکییەکەم دەرچووە.. چونە سەر ئاودەست، و دەموچاو شتنیش بێ عەریف ئەحمەد بو..

دوای نان خواردن، قالە کەوتە پرسیارکردن:

- دەبێت ئەم ئەشکەنجە قورسەو ئەم درێژەدانە بە لێکۆڵینەوە بێ بەڵگەبێتو هیچ بەڵگەیان لەسەرت نەبێت؟ یان رەنگە گومانی زۆر بەهێزیان هەبێت؟ باشە پرسیارەکان لەسەر چیی دەکەن..؟

< ئەرێ تۆ لە یەکەم رۆژی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدانی منەوە، کەوا لە مانگو نیوێك تێپەڕ دەکات، ئاگاداری هەمو کەینو بەینێکیتو دەزانیت ئەوانە بەبێ بەڵگەو

بەخۆڕایی بۆ تۆڵە منیان گرتووەو ئەشکەنجەم دەدەن، چەندین جاریش ئەوەم بۆ چەند بارە کردویتەوە، کەچی تازە ئەو پرسیارە حەللەق و مەللەقە لەمن دەکەیت.. ئەڵێی جێگۆڕکێت بەڕۆڵی قوتابیێتی و ڕۆڵی لێکۆڵەر کردوە!

هەڵوێستەیەکم بۆ کردو هەستم کرد کە هەڵچون هێڵەکەی پێ بەزاندمو دەبێت لەو جۆرە قسانە دوور بکەومەوە، دەنا ڕیسەکە دەبێتەوە بە خوری..

- جا مامۆستا بۆچی تورە دەبیت؟ پرسیارەو دەیکەم! ئەی باشە بۆ وازت لێناهێنن؟ بۆچی بەردەوامن لەسەر ئەشکەنجە؟

< من پێم گوتیت ئەمانە تۆڵەی کۆنم لێدەکەنەوە. ڕاستە پرسیار دەکەن بەڵام هەموی لە گیرفانی خۆیان دەری دەهێنن، یان هەڵبەستراوی خەڵکی درۆزن و تۆڵەسێنە.

- ئەی باشە تۆ لەگەڵ زۆر لە برادەرانی کۆمەڵە هاوڕێی گیانی بەگیانیی بویت، چۆن لێیان دورکەوتیتەوە؟

< مەبەستت کێیە؟

- زۆریان.

< ئاخر زۆری وەك کێ؟ ئەوە تۆ باسی چیی دەکەیت؟ ئەزانی دوای ڕوخاندنی شۆڕش و کورد بەگورگانخواردودان من هەمو شتێکم لەبەرچاو کەوتوە.. قالە لە سەر ڕاسپاردەکانی ڕەئیس بەردەوامەو گوتی:

- بەڵام من بیستومە کە تۆ یەکێك بویت لەکەسایەتییە ناسراوەکانی ئەو ڕێبازە، من بۆ خۆم کۆمەڵە بوم، گەلێ جار باسی تۆ دەکرا. خۆ من وەك قوتابییەکت قسەدەکەمو ئێمە هەردوکمان زیندانین و ڕەنگە ئیعدامیش لەچارەمان نوسرابێت.

< ئەرێ تۆ دەمێك دەڵێیت حەزم لە کچێك کردبوو، باوکی پێی زانیی بو، کەوتبووە هەڕەشە، تۆش چویت دەمانچەت بە قاپییەکەیانەوە ناوە! دەمێکیش دەڵێیت کۆمەڵە بوم! دەتگوت لەگەڵ ئەکرەمی حەپسە بە لەسێدارەدان حوکم دەدرێم، پار ئەم کاتانە یا کەمێك زیاتر، کە دەرسم پێ دەگوتیتەوە، بۆنی شیری خاو لەدەمت دەهات، باشە کامیان لەوانە ڕاستە؟

- مامۆستا گیان داوای لێبوردنت لێ دەکەم وا دیارە قسەکانم زیادە ڕەوی زۆری تێدایە، بۆیە ئیتر ئەو جۆرە پرسیارانە ناکەمەوە..

< یەعنی دەکەویتەوە ناو سەردەمی قوتابی و مامۆستایەتی. دەی تۆ وا بەرەو سێدارە دەڕۆیت! هیوادارم بەدڵێکی پاکەوە سەرفراز ببیت! ئەرێ تۆ گوتت دەمنێرنەوە بۆ دادگا، کەچی هیچ دەنگ نەبوو، دەبێت لەبیریان چوبێتەوە..؟

- لەبیرچونەوەی چیی! هاکە بانگکرامو برام.

لەو قسانەدا بوین کە دەرگا کرایەوەو بە پەنجە ئاماژەی چونە دەرەوەم بۆ کراو برام بۆ بەردەم لێکۆڵەرێك‌و گوتی:

لەمەوبەر داوامان لێکردیت هەندێك زانیاریمان بدەیتێ لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەو ئەوانەی هاوبەشبون تێدا، هەروەك باسێکی مێژویی، چونکە ئەمە پێوەندیی بە لێکۆڵینەوەکانی ئێستامانەوە نییە، بۆیە دڵنیات دەکەین کە هیچ مەترسیو ترسێکی تێدا نییە، دەی باسی ئەو مێژووەمان بۆ بکە. خۆ تۆ خۆشت مامۆستای مێژویت، دەبێت زۆر باش ئەوانەت لەبیر مابێت، هەمویشی دە ساڵێکە، دیارە کە سەرجەمی وردەکارییەکان دەزانیت.. ئێمە خۆمان زۆری دەزانین.. خۆ ئەم گێڕانەوەیەش ئیعتیراف نییە.. ئەمە باسێکی کۆنەو هیچ پەیوەندیی بە ئێستاوە نییە، باسی دە ساڵ لەمەوبەرە، ئەمە هەر موحازەرەیەکەو قسە بۆ ئێمە دەکەیت!

< من ئاگاداری ئەوانە نیمو ناشزانم کۆمەڵە کەیو چۆن دامەزراو کێ دایمەزراند..

- چۆن تۆ ناڵێیت من شەهابی شێخ نوریم دەناسیی؟

< نا من گوتم وەك کوڕی گەڕەك دەمناسی نەك خۆیم ناسیبێت یان ڕەفیقم بوبێت.

- ئەی لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا، خۆ ئێوە هەمیشە لەبەکرەجۆ لای ئەو بون؟

< ئەو سەردەمانە زیاتر بۆ خوێندنەوەو خۆفێرکردن دەچوینە لای ئەو..

- باشە ئەی بۆچیی تۆ جیابویتەوە؟

< لەچیی؟ من لەگەڵ کەس نەبوم تا جیاببمەوە.

- چۆن. بۆ ناڵێیت نەوشیروانیش ناناسم:

< کام نەوشیروان؟

- دەی خۆت بەرە حەوت تەبەقەی ئاسمان! نەوشیروان مستەفا..

< بەڵی، برادەر بوین بەڵام دوای حەفتاو یەك ئەو چو بۆ ئەوروپا بۆ خوێندن. لەراستیشدا ئەوەش هەڵەی ئێوە بو، چونکە لەرۆژانی سەرەتای بەیانی ئازاردا پیلانێك بەدەستی دەزگای ئەمنی حکومەت‌و پاراستنی پارتی سازکرا. یەك پیکاپ پۆلیس لەبەردەم ئامادەیی کچانی سلێمانیدا پەلاماری پێشمەرگەیەکی گۆڤاری رزگاری (جەمال ئەحە خورشە) دەدەن، بەزۆری زۆردارەکیی نارنجۆکی بەر پشتێنەکەی لێ دەسێنن‌و هەڵی دەدەنە حەوشەی ئەو قوتابخانەیەوە، باش بوو خوێن لەلوتی کەس نەهات، روداوەکە، گەورە کرا پێشمەرگەی ترو نەوشیروانیشی تێوە گلێنرا. لەکاتێکدا هەر لەو ماوەیەدا دوو خوشکی نەوشیروان خۆی (ناجیەو تاڤگە) یەکەم مامۆستاو دووەم قوتابیی ئەو قوتابخانەیە بون. رووداوەکە لای ئێمە هێندە ئاشکرا بو کە تەنانەت کاتێ ئەمری گرتنی دوو پێشمەرگەی تریش دەرکرا کەناویان

خالید ئەحمەد ڕەشید (مام خالید)و مەجید محەحەد عەبدوڵڵا (مەجید گوڵنان) بوو، لەسەر قسەو بەڵێنی ئێمە کە دوای قسەکردن لەگەڵ (شوکری سەبری الحدیسی) پارێزگاری سلێمانیو دڵنیابون لەوەی هیچ مەترسییەك لەئارادا نییەو تەنها لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێتو ئازاد دەکرێن، ئێمە بەو پێشمەرگانەمان گوت کە بچن خۆیان بدەن بەدەستەوە.. ئیتر دوای دادگاکردنێکی ناعادیلانە جەمالی قوڕ بەسەر لەسێدارە درا، نەوشیروانو ئەو دوو پێشمەرگەیەش یەکی بە دە ساڵ حوکم دران. دوای ئەوە بەماوەیەك نەوشیروان عیراقی بەجێ هێشت. دەڵێن ئێستاش هەر لەنەمسا دەخوێنێت! جا لەو ڕۆژگارەوە من هیچ جۆرە پەیوەندییەکم لەگەڵیدا نەماوە.

پێکەنینێکی گاڵتەپێکردنی کردو گوتی:

- زۆر باشە ئەو چیرۆکانەت وا لەزەیندا ماوە، دەی دیوەکەی تریشمان بۆ باس بکەو بەووردییەوە وەڵامی پرسیارەکەی ئێمەش بدەرەوە! بزانە ئەوەی خۆت بتەوێت چۆن بەوردیی باسیان دەکەیت! دەی بابزانین تا چەند لەگەڵمان ڕاستگۆ دەبیت.

هەستم کرد کە لەسنورەکەی خۆم تێپەڕیمو نەدەبو ئەو قسە زیادانە بکەم. چونکە ئەوان لەو جۆرە شتانە ناگەن، لەناو ئەو جۆرە باسانەدا، هەر بیر لەمەبەستەکەی خۆیان دەکەنەوە، ئەوەتا کەمو زۆر بیر لەهەڵەی لەسێدارەدانی بێ تاوانێکو بەناڕەوا حوکمدانی سێ کەس ناکەنەوە.

< دیوەکەی تریشی ئەوەیە کەوا ئێمەومانانیش بێ هیچ بەڵگەیەك بەم جۆرە ڕاپێچی ئێرە کراین، هەر ئەوە ماوە بمانبەنە سەر سێدارەکە.

- جارێ ماوێتی کاتی ئەوەش دێت! باشە ئەی ئێوە گۆڤاری ڕزگاریتان دەرنەدەکرد؟ بۆچی ناڵێیت گۆڤاری چییو من هیچم نەنوسیوە؟

< بەڵێ بەڵێ ئەو گۆڤارە خۆتان ئیجازەتان پێدا.

- باشە نوسینەکانت لەسەر چیی بون؟

< لەسەر مەهابادو ئەو جۆرە شتانە. لە ڕوژنامەی "النور"یشدا کە بەعەرەبی لەبەغدا دەردەچوو (الحركة التحررية الكردية والقضية الفلسطينية).

- چیی تر؟

< هیچی ترم بەبیردا نایەت.

- بلی زۆرت پێیەو هیچی دەرناخەیت، ئێمە زانیارییەکانمان لەناو خۆتانەوە بۆ هاتووەو دەزانین چیت کردووەو چیت نەکردوە! لەو کاتەوەی نەوشیروان هاتۆتەوە شاخ، ئێوە دەستتان بەچالاکی کردۆتەوە..

< دیاره خۆتان باشتری دەزانن. بەڵام ئەوەی ناوی منی تێهەڵكێش كردوە. ناحەزی منە، خۆشتان دەزانن ناحەزیی‌و دوژمنایەتی‌و گیانی تۆڵە سەندن لەناو ئێمەدا زۆر باوە. هەق نییە بەقسەی ئەوانەم لەگەڵدا بكەن.

- نا نا ئێمە زۆر باش دەزانین تۆو ئەمسالی تۆ چەندە حاقیدبون لەسەر حیزب‌و سەورە. ئێمە حیزب‌و دەوڵەتیشین. هیچ شتێك لەئێمە وننابێت. دەوری خیانەتەكانی ئێوەومانان بێ سزا نابێت! بیبەن‌و بڕیارەكەی بەسەردا جێبەجێ بكەن، قسەكردن لەگەڵ ئەمەدا بێ سودە..

< دەی باشە من ناڵێم ئێوە لەسەر رابوردوو منتان گرتووەو ئەشكەنجەم دەدەن! باشە چۆن بێ بەڵگە پیاو والێدەكرێت، كوا شتێكم لەسەر بسەلمێنن تا بڵێم خوێنی من بەئێوە حەڵاڵە! ئەو پرسیارانەی ئێوە هەموی پەیوەندیی بە رابوردوویەكەوە هەیە كە خۆتان چەندین جار ئەمنستیتان لەسەر دەركردوە! ئەی من ناڵێم ئێوە لەسەر رابوردو سزای من دەدەن، خۆ دیارەو ئەوانە دەری دەخەن كە ئێوە لەخۆڕایی منتان گرتووە..

لەراستیشدا كەمێ لەو قسانەی لێكۆڵەر راستییەكیان تێدا هەیە. خۆ هەر ئەوە ماوە كە زەلامەكە بهێننە بەرەورو. هەندێ لەپرسیارە هەستیارەكان كۆن بون‌و بۆی دەچوم سەرچاوەكەی لەكوێوە هەڵگیراوە، مەزەنەم دەكرد ئەوانە لەكوێوە گەیاندراون. دەمزانی لەخەتێكی مائیلەوە زانیارییەكانی ئەو سەردەمە دزەی بۆ دەرەوە پێكراوە؟ لەكۆمەڵەوە بۆ قیادە مەركەزی، زۆر بوغرنج نەبو، بەڵام لەقیادە مەركەزییەوە بۆ بەعس، ئەوەیان بۆ من مەتەڵ بو، چونكە قیادە مەركەزیی رێكخستنێكی پتەوی هەبو، بۆیە گومان هەبو لەوەی هەمان خەت مایل‌و هەمان كەس بۆ رژێمیش درێژ بوبێتەوەو بوبێتە سێ سەرە، هەروەك لەدواییدا هەندێك زانیاری ئاشكرا كران..

پرسیارەكانیش هەموی دەربارەی ئەو ماوانە بون كە لەناو هەمواندا مشتومڕ لەسەر دامەزراندنی كۆمەڵە دەكرا. بەڵام پرسیاری باسەكانی تری دوای ئەوە، تا ئێستا شتی كۆنكرێتییان تێدا نەبووە. دیسان هۆی كۆبونەوەكانی ئەو سەردەمە كە شێوە داخراوبون.

جگە لە دانیشتنەكان لەگەڵ مام جەلال كە دواجاریان لە ماڵی بەندە بوو لە نزیك "ساحەی شەواف" مام جەلال لە ئێمە زیزو زویر بوو، ئێمە دەمانزانی كە فازیلی مەلا مەحمود وهی تریش قسە بە ئاوەژوو نەقڵ دەكەن، بەخراپی قسەو رای ئێمە بۆ مام جەلال دەبات.. بۆیە بڕیارمان دا كە لەگەڵی دابنیشین و دڵی بهێنینەوە جێی خۆی.. بەڵام دانیشتنەكە بوو بە مشتومڕ لەسەر رێبازی ئایدیۆلۆجیی رێكخراوە

نوێیەکە.. کە ئێمە سووربوین لەسەر هەڵوێستی خۆمان، مام جەلال ئەو نهێنییەی درکاند کە هەر ئێمە لەسەر ڕێبازی دامەزراندنی ڕێکخستنێکی نوێ نین بەڵکو دوو گروپی تر هەن کە لە ئاراداو و دەمێکە دەستیان بەکارکردووە.. بەلام ئێمە لە گروپەکەی شەهابی شێخ نوری ئاگادار بوین و لە مشتومڕیشدا بووین بۆ یەکخستنی ریزەکان.. لەو ماوانەدا لەبەغدا چەند جارێك لەگەڵ شەهابی شێخ نوری دانیشتن کرا، دو جاریان فەرەیدون عەبدولقادریشی لەگەڵ بو. جارێکی تریان شازاد سائیبم لەگەڵ بو. لە سەرەتای پاییزی ساڵەکەدا بوو لە ماڵی ئەوان لە بەغدا جدیدە، من شازاد سائیبم لەگەڵ بوو، دوای هەندێ قسە، ئەو بەرنامەیەکی دەرهێنا کە چاپیشیان کردبوو..

لەسەر خاڵی: کۆمەڵە ڕێکخراوێکی مارکسی- لینینی- بیروباوەڕی ماو هەڵوێستەمان کردو گوتم باشە بۆچی بەو زەقییە ئەو خۆبەستنەوەیە بەوەوە، ناکرێ هەر لە سنوری سود وەرگرتن دا دابڕێژرێ؟. شەهاب- یش بە نارەحەتییەکەوە، دوای ئەوەی لاپەڕەی بەرنامەکەی داخستەوە و گوتی ئەگەر ئەوەتان قوبوڵ نەبێت. وا من ئامادەی موناقەشەی تر نیم.. ئێمەش گوتمان نەوەڵا بەو جۆرە لای ئێمە مەقبول نییە.

ئیتر دانیشتنەکە بو بە دانیشتنی قسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوە.. دەشمانزانی ئەمان زۆر بە پەلەن لە کارەکە. کە هەر لەو سەرەتایەدا هەڵەی پێوە دەردەکەوت.. دیسان لەسلێمانی لەگەڵ شەهاب ئەو مشتومڕە بەردەوام بوو. لەوانەداو لەسەرجەم مشتومڕو دانیشتن‌و کۆبونەوەکانی ناو گروپەکەی ئێمەدا، زانیارییەکان پچڕابون‌و هیچ پرسیارێ نەدەکرا، بەلام دوریش نیە هەندێك لەزانیارییەکانیان لەو زەلامانەوە بێت کە بون بە بەعسی‌و کاربەدەستی رژێم. چی لەسلێمانی‌و چی لەبەغدا.

راو هەڵوێستی ئێمە بۆ ڕێککەوتن‌و تێکەڵبونەوە ئاشکرابو، دوای ئەوەی دەرگاکە کرایەوە ئیتر بەبێ سڵەمینەوە قسەمان دەکرد. ڕۆژێك سەرێکی ئوتێل (المستنسریە)م دا لەسەر (شارع النهر- کە زیاتر شارع البنات- ی پێ دەگوترا، چونکە هەمو دوکان‌و کۆگاکانی سەر ئەو شەقامە جلوبەرگ‌و شتومەکی ژنانیان دەفرۆشت) ئوتێلەکە وەك بارەگایەکی لێ هاتبو. دوای چاك‌و چۆنی‌و هەواڵ پرسین‌و باسی بارودۆخەکە، مەلا عەبدوڵا (مەلا ماتۆڕ) گوتی: باشە کاك مەحمود تێکەڵ بوونەوە لەگەڵ بارزانی چیی سودێکی هەیە؟ ئەی مەلا مستەفا ناناسیت، سا بەخوا ئەوەی بچێتەوە لای دەیکوژێت. با جارێ ددان بەخۆماندا بگرین‌و کەمێکی تر چاوەڕوان بین.؟ منیش گوتم:

ڕێککەوتنەوە مانای لابەلاکردنی شەڕی براکوژیو ئەو خوێن ڕژانەی کوردە، خۆ ڕزگارکردنە لەم تێکەڵاوییە لەگەڵ ڕژێم. تێکەڵبونەوەو یەکخستنی ریزەکانی کوردە، ئەگەر ئەوە نەکەین وا دەبێت لەگەڵ بەعسدا تێکەڵ ببین، چونکە من ڕێبازی بێ لایەنیی بەمەحاڵ دەزانم. بۆ خۆشت دەزانیت سەرەك کۆمار چیی پێ گوتینو چەند کەوت لەسەر کورد! من مەلا مستەفا باش دەناسم بەڵام بەعس باشتر. باشە کێ ڕوی دێت جارێکی تر لەگەڵ ئەوان هاوکاریی بکاتەوە! لام وایە ئەوە جاشێتییە. مەلا تا سەر ئێسقان ڕقی لەمەلا مستەفا بو. کۆنفرانسو کۆنگرە نەبو لەبەردەم هەمواندا چیرۆکی لاسایی کردنەوەی مەلا مستەفای پێ نەکرێت کە هەمومانی دەهێنایە پێکەنین.

ئەوانەی بەرژەوەندییە تایبەتێتییەکانیان لەگەڵ ڕژێم تێکەڵ بوبو، هەر لەو سەرەتایەدا کەوتبونە چالاکیی..

هەر لەو ماوانەشدا ڕۆژێکی تر بابەکراغای پشدەریم پێکەیی، دوای چاكو چۆنی گوتی:

- ماوەیەکە بەدواتا دەگەڕێم، باش بو وا بەم ڕێکەوتە یەکترمان بینی.

< گوتم خێرە؟

- وەڵا بۆ باسکردنی ئەم وەزعەی خۆمان، بزانین چیی بکەینو چیی نەکەین! هەقیش وایە زۆر پەلە نەکەین چونکە حکومەتو حیزبی بەعس هەمو شتێکمان بۆ دەکەن، زۆر نابات زۆر شت ڕون دەبێتەوە، مەلا مستەفا بۆ هەقی کورد ئەو ڕێککەوتنەی نەکردووە.

< گوتم: لام وایە دوای کۆنگرە ڕۆژنامە نوسییەکەی احمد حسن البکرو وەڵامەکەی لەپرسیاری (وەکالەی ئەنبای سوری)، تێکەڵبونەوە بەوان خیانەتەو نابێت بیەڵێن خەڵکی دڵسۆز بیر لەوە بکەنەوە.

دەی هەرچی چۆنێك بێت گرنگ ئەوەیە بۆ ئێستا چۆن خۆم لەزانیارییە (نیمچە ڕاستەکان) سەرفراز بکەمو نەکەومە ناو داوەوە.

یەکێك لەو شتانەی هەمیشە لێی دەترسام، مشتو مڕی هێمنانە بو کە بێ زەحمەتیی مرۆڤ ڕادەکێشرێتە ناو دەربڕینی ڕاستییەکانی ناو مێشکەوە، بەتایبەتیی بۆ ئەوانە کە لەقسەکردندا ڕاستگۆو بێ پێچو پەنان.

ڕۆژێکی یەکەم هەفتەی گەڕانەوەی دوا هەرەس بۆ سلێمانیی، لەتەکسییەکدا بوم، دوکتۆر ئازاد کە لە خۆ تەسلیم کردنییەوە بو بوە هاوکاری ئەمن، فولکس ڤاگۆنێکی لێدەخوڕیی. ئاماژەی وەستاندنی بۆ شۆفێری تەکسییەکە کرد، هاتە

پێشەوەو روی کردە منو گوتی: مامۆستا لە بەیانییەوە بەشوێنتدا دەگەڕێم، چوار پێنج جار چومەماڵەوە لەوێ نەبویت.

"گوتم خێرە وا ئەو هەمو ئەزییەتەت کێشاوەو سۆراغت کردوم!؟

- مودیری ئەمن بانگت دەکاتو دەڵێت حەز دەکەم هەر ئێستا بیبینم. ئەگەر حەزیش دەکەیت با هەر خۆم بتگەیەنم؟

< باشە خێرە.. وا بەم پەلە پەلە؟

- نەعیم حەدادی وەزیر لەوێ بو، حەزی دەکرد بتبینێ، ئیتر نەدۆزرایتەوە. تا لەو تەکسییەدا بە رێکەوت تۆم بینی، دەبێت ببوریت کە لەم چەقی رێگەیەدا راگیرمکردن. ئێستاش لێپرسراوانی تری لێیەو چاوەڕوانی بینینی تۆ دەکەن، لەسەر سەفەریشن.

< دەی باشە بابڕۆین..

بەڕێوە بۆ لای ئەو لێپرسراوانە، کەوتمە ڕاوێژی خۆمو پرسیاری هۆی بانگکردنەکە.. زیاتر بۆ ئەوە دەچوم کە: رەنگە داوای ئەوە بکەن کە لەگەڵ ئەو تاقمەی دەیانویست جێگەی پارتی بگرنەوە، هاوکاری بکەم.

چونکە رەسوڵ مەمەندو چەند کەسێکی لەو بابەتە باسەکەیان لام کردبۆوە. وەك ئەو دەیگوت: عومەر دەبابە ساڵح یوسفی، عەلی عەسکەری، دارا تۆفیق، عەلی هەژار، سدیق ئەمین، عەبدولی سوران، و گەلێ لەئەندامانی تری مەکتەبی سیاسییو کۆمیتەی ناوەندییو لێپرسراوانی جۆر بەجۆر لەگەڵ ئەو هەوڵەدا بون کە سەرکردایەتی بەعس رازیی بکەن تا ئەوان ببنە ئەلتەرنەتیڤی پارتی.. بۆ ئەوەش کەمال محێددین لەگەڵ عومەر دەبابەدا سەفەری ئێرانیان دەکرد.

لێکدانەوەی تیۆریی ئەوان بۆ کارەکە، رزگارکردنی خەڵکەکە بو لە تێکشکانێکی گەورەتر کە بەهۆی دروستبونی بۆشایی سیاسیی دوای هەرەسەوە دەخولقێت.

من هیچ جۆرە بڕوایەکم نە بەو قسانەو نە بەو بیرەو نە بەبەعس نەبو. بۆیە ئەو جۆرە هەوڵانەم بەبێسود دەزانی. بگرە جاری وا هەبو دەمگوت ئەم دوژمنەی ئێمە هێندە رەگەزپەرستە تەنانەت لاشەیەکی بێ گیانیشی ناوێت کە ناوی کوردی لەسەر نوسرابێت! ئەگینا ئەگەر بێ ئەقڵ نەبنو لەلۆجیکی جوڵانەوەی مێژو گەیشتبنو سود لە ئەزمونەکەی خۆشیان وەربگرن، وا دەبو کاری لەو بابەتەیان زۆر پێ خۆش بوایە. چونکە دوای روخاندنی شۆڕش، هەر سەرکردایەتیو هەر رێکخستنێکی ئاشکراو هاوکار لەگەڵ بەعسدا دابمەزرایە وا لە رێکخستنە کارتۆنییەکانی تری هاشم عەقراوییو شێخ ستارو مەلا ماتۆڕو لەو بەتەڵەوەبوونەی حیزبی شیوعی زیاتر نەدەبوو..

لەناو ئەو بیرەوەریانەدا نقوم بوبوم کە گەیشتنە بەردەم ئەمن بەئاگای هێنام. چومە ناو ئەمنەوەو ئینجا لەبەردەمی ژوری بەڕێوەبەر وەستاین. لەدەرگای‌دا، چوە ژورەوە، دوای چەند ساتێك هاتە دەرەوەو بانگی کردم. کە چومە ژورەوە سەلامم کرد. سێ کەس دانیشتبون بەپێی خۆ پێناسینیان: (عامر) ناو ئەندامی فەرعی شیمال- حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکی عێراق- لەسەر مێزی بەڕێوەبەری ئەمنی پارێزگای سلێمانیی دانیشتوە، مودیری ئەمن و قائیدی سوپای ناوچەکە. بەخێرهاتنیان کردم، چا هێنرا، عامر گوتی:

- مامۆستا مەحمود دەمەوێ (مشتومڕێکی سەریحانە) بکەین، حەزیش دەکەم وەك کادیرێکی پێشکەوتو، بەراستگۆیی رای خۆت دەربڕیت..

< زۆر باشەو منیش لەژیانمدا هەر راستگۆبوم.

گەلێ پرسیاری ئاسایی کرد، پێدەچو زۆری تری پێبێت. لەتێوردبونەوەی پرسیارەکانی تا شتێ لەمەبەستی ئەم بانگکردنە حالّی ببم، هیچی لێتێنەگەیشتم. بەهەر حالّ بانگکردن‌و پرسیارەکانیان بۆ هەر مەبەستێك بووبێت وا وەلامی ئەم چەند پرسیارە کۆتایی بەهەمو شتێك هێنا.

- لەرۆژی یەکەمدا لەئوتێل سەلام تەلەفزیۆن چەند پرسیارێکی لەچەند کەسێك کرد کە مەبەست بون، تەنها تۆ رەفزت کردبو کە وەلام بدەیتەوە. وەك هەموو لێپرسراوەکانی پارتیی هەلّوەشاو بروسکەشت بەبۆنەی گەڕانەوەتەوە لێنەداوە؟ دیارە پێت ناخۆشە گەڕاویتەوە؟

< نەخێر! مەسەلە پێخۆشبوون یا پێناخۆشنەبوون نەبوو، بەلّکو بوونی زۆر لەکەس‌و کارم بوو لەسەر سنورو لەئێران.

- ئەی وەك هەمو عائیدونیش بەبۆنەی گەڕانەوەت بروسکەت لێنەداوە، یانی ناتەوێت پێخۆشحالّیی خۆت دەربڕی؟ بۆچیی نا، هاتنەوەم بەخواستی خۆم بووە، هەرکەسێك هاتبێتەوە یان بێتەوە، ئەوەشی لا نائاسایی نابێت!

لەپرسیارەکانیدا خۆپەسەندی‌و لە خۆبایبونی زۆر پێوە دیار بو. بڕواشم نەدەکرد بانگکردنەکەم هەر بۆ ئەوە بێت! ئەو لەسەر پرسیارەکان بەردەوام بو:

- باشە تۆو هاوڕێکانی وەك تۆی کادری پێشکەوتوو هوشیار.. وەزعەکەتان نەدەبینی چۆنە؟

< بەلّی دەمانبینیی.

- باشە بەچ پارەیەك مامەلّە دەکرا؟

< بەتمەنی ئێرانیی‌و بەپارەی عیراقیش.

- ئەی چەکە قورسەکانی رژێمی شای ئێرانتان بەچاوی خۆتان دەبینی، تۆپو دژی فڕۆکەو ئەم بابەتانە..؟

< بەڵی دەمانبینی. (لەراستیشدا خۆم هیچ شتێکی لەو بابەتانەم بەچاوی خۆم نەبینیبو، چونکە نە پێشمەرگە بوم‌و نەبەرەی شەڕیشم بینیبو.)

- خۆ زۆر باشیش دەتانزانی رژێمی شای ئێرانی عەمیلی ئیمپریالیزمی ئەمریکایە.

< بەڵی ئەمانزانیی.

- ئەی باشە چۆن کادیری پێشکەوتوو نیشتمانپەروەر دوای جوڵانەوەیەکی بەکرێگیراوو نۆکەری ئیمپریالیزم دەکەوێت؟ بۆچی ئەو کاتە نەگەڕانەوە؟

جۆری پرسیارەکە کەمێ وورووژاندمی، بەڵام بەدان بەخۆداگرتنەوە گوتم:

< ئەوە سود وەرگرتن بوو لەناکۆکییەکانی ناو هەرێمەکە.

- باشە بیستوتە جوڵانەوەیەکی نیشتمانیی پشت بە دەوڵەتێکی نۆکەری ئیمپریالیزم ببەستێت؟

< بەڵی بیستومە.

- لەکوێ؟ کەی؟ کێ؟ دە باشە نمونەم بۆ بێنەرەوە.

< ئوستاز عامر نمونە زۆرە.؟

بەتوڕەیی‌و ناوچەوان گرژییەوە گوتی:

- کوڕە من دەڵێم یەك نمونەم بدەرێ.. یەك نمونە.

هەستم کرد وەك ئەسیر مامەڵەم دەکات، ئوستازەکەش بووە بە "کوڕە". ئەو هەڵوێستە لەو ساتەدا رایکێشامە ناو گێژاوێکەوە، کە خۆم بەشەرمەزار بزانم ئەگەر وەڵامەکە بەو جۆرە نەبێت، کە وەك کورد دەڵێت: لەجێی سنگان قوزەڵقورتە، ئیتر سەرئەنجامەکەش چیی دەبێت بابێت.

< جا توڕە بوونی بۆ چییە. ئەگەر دەتەوێت وا دەتوانم دە نمونەت بۆ بێنمەوە!

بەهەڵچونێکی سەیرەوە گوتی:

- کوڕە من دەڵێم تەنها یەك نمونەم بدەرێ یەك نمونە، من دە نمونەم ناوێت! ئیتر شانۆگەرییەکە لەمشتومڕیی ئاسایی گۆڕا بۆ پرسیارو وەڵامی سەردەست‌و ژێر دەست، لێکۆڵەرو زیندانیی، هەر تەواو وەك یەخسیر خۆم هاتە بەرچاوو تفم لەو رۆژە دەکرد کە تێیدا گەڕامەوە..

< زۆر باشە، مادام هەر یەك نمونەتان دەوێت، با دوور نەڕۆین‌و لەمێژوی نزیك قسە بکەین:

کاتێك حیزبی بەعس لە ١٧ تەموزی ١٩٦٨ هاتە سەر حوکم، بەهاوکاریی جەماعەتی عبدالرزاق النایف و ابراهیم الداود نەبو؟ باشە دوای کەمتر لە دوو هەفتە

لە ۳۰ تەمموزدا بەهۆی ئەوەوە کە ئەو تاقمە گومان لێکراوبون، دەرنەکرانو پاك نەکرانەوە.. هەر سەیری عامریش دەکەم، هەست دەکەم جێگەکەی نایگرێتە خۆی، ئاگر لەچاوی دەبارێت، منیش وەك ئاوێکی سارد بە لەشمدا بکەن ئاوا مێشك ساف بومو بەخۆمم دەگوت دەی ئەم ئاڵچاغە چیی دەکات بابیکات! داوای راستگۆییم لێدەکات کەچی وەك کۆیلە مامەڵەم دەکات، پرسیار ئاراستە دەکات، خواستیشێتی چۆنی پێ خۆشو باشە هەروا وەڵامەکەشی بدەمەوە.

هەر کە قسەکەم تەواو کرد، بەهەڵچوونو تورەییەکی زۆرەوە گوتی:

- تا ئێستاش جەنابت ئەو سەرکردایەتییە نۆکەرە دەرەبەگە دژی میللەتە لەگەڵ قیادەی حیزبو شۆڕش بەراورد دەکەیت؟

< تۆ داوای سەراحەت دەکەیتو منیش راستییەکەم پێ گوتویت نەك بەراوردکردن، رۆشنبیرانی کورد مەسەلەکەیان بەو جۆرە لێکدەدایەوە. بەرێوەبەری ئەمن کە بەروخساریدا دەردەکەوت توشی جۆرێك لەسەرسوڕمان بووە، هەڵی دایەو گوتی:- ئوستاز مەحمود هیلاکە، با جارێ چەند رۆژێکی تر بحەوێتەوە ئەوسا دەکەوینە ئەم مشتومڕانە.

قسەکەی ئەمم بەجۆرێك لەدۆستانە هاتە بەرگوێ، بەڵام حاڵەتی وروژاوییەکەم بەردەوامەو جێگەی بۆ ترسو لێکدانەوەی ئەنجامی ئەم قسانە نەهێشتۆتەوە، بۆیە روم لەویش کردو گوتم:

< ئوستاز: ئەوەی دەیڵێم لەناو قوڵایی دڵمەوەیەو هیلاکیش نیم، ئوستاز عامر داوای راستگۆیی دەکات.. دەی راستیی بیرکردنەوەو لێکدانەوەکان بەو جۆرە بون.

ئەفسەرەکەش بەشێوەیەکی نائاسایی سەیرم دەکاتو جۆرێك لەسەرسوڕمان بەروخساری ئەمیشەوە دەردەکەوێت، لەسەرنجەکانیدا ئەوە دەخوێنمەوە کە پێم بڵێت ئافەرین بۆ خۆتو وەڵامو هەڵوێستت.

عامر لە تورەییدا رەنگی زەرد بوبو. ئیتر کەوتمە سەرحاڵەتی هەست بەمەترسییکردن. بەخۆشمم دەگوت: بڕواناکەم وەختی گرتن هاتبێت، ئەقڵ نایگرێت لەم سەرەتایەدا کە چاوەڕوانو دەیانەوێت هەمو خەڵکەکە بگەڕێنەوە، کاری وا دەست پێ بکەن.

زۆری نەبرد عامر روی لەمن کردو بەشێوەیەکی ناشیرین گوتی برۆ لەدەرەوە چاوەڕوان بە.

دواتر یەکێك هاتو گوتی: بەرێوەبەر دەڵێت بابڕوا، چونکە ئیشمان پێی نەماوە.

لەرێگا بەخۆمم دەگوت باشە ئەو حیزبە ئەهلی راستییو راستگۆییە وا خۆت دەخەیتە ناو داویانەوە!؟ باشە بگیرێیتو سەرەو نگوم بکرێیت کێ فریات دەکەوێت؟

هەر خۆشم وەڵامی خۆمم دایەوە: دەی لەو جۆرە هەڵوێستانەدا پیاو ناتوانێت خۆی کەڕولاڵ بکات، چیش دەکەن بابیکەن، خۆ پیاو لەبەردەم گەوجێکی لەخۆبایی بوی وەك ئەودا، کە بەناهەق ئەو مامەڵەیەت بکات، دەبێت هەڵوێستی وا بەرامبەری وەربگیرێت..

تەنها چەند رۆژێك بەسەر ئەوەدا تێپەڕ بو، ئاگاداریان کردم کە فەرمانی نەفیکردنم بۆ (الجزيرەی رەمادی) دەرچووە.

بۆ ئەوە بەخۆمم دەگوت ئەگەر سزاکە هەر ئەمەبێت وا نرخێکی زۆر هەرزانە. بەدەیان هەزار کەس لەخەڵکی ئاسایی هەر لەبەر ئەوەی لەئازاری حەفتاو چواردا چوبونە شاخ، یان لەبەر ئەوەی کورد بون، یان هەر لەبەر ئەوەی دێو نیشتەجێیان دەکەوێتە ئەو ناوچانەی کە رژێم بەستراتیجیی دادەنێت، دێیەکان تەخت دەکرێن‌و خەڵکەکەش رادەگوێزرێن.. دەی بۆ من هەر لەسەر ئەو گفتوگۆیە، نەك رابوردی سیاسیش، ئەوە نرخێکی زۆر هەرزان‌و سزایەکی تا بڵێیت ئاساییە. ئەوە لەناو سزای بەکۆمەڵی هەمو کورددایەو بەشێکە لەو مەینەتییە گەورەیەی کە سەرەنجامی هەرەسە. لەگەڵ ئەوەشدا بەخۆمم دەگوت:

باشە کێ دەڵێت هەر ئەوە سزاکەیەتی؟ کێ دەڵێت لەنەفیگە لەناو نابرێم! بەتایبەتیی ئەو حوکمە غیابییەش لەئارادایە!

بۆیە هەستم دەکرد کە مەترسییەکی جیددی گرتن و فەوتاندن رووبەڕووم بووە، ئیتر کەوتمە سەر بیرکردنەوە لەراکردن، بەڵام بۆ کوێ‌و چۆن؟

تێکەڵبونی ئەو بیرەوەریانەو ترسی ئەم پرسیارە چڕو پڕانە هێنایانمەوە ناو دنیای هەیئەو بەخۆمم دەگوت: ئەبێت تاکەی لەسەر ئەم پرسیارانە بەردەوام بن، تۆ بڵێی زانیارییەکان لەو سنورە زیاتر بن..! لەناو ئەو پرسیارو خەیاڵانەدا، دەنگێك بەرزبووەوە: هەابیگرە. بەهوشیاریو ترسیی کارەباوە دەستم درێژکرد، باش بو سۆندەکە بو، لەبیری ئەوەدابوم کە بەرەو ژورەکە دەمبەنەوە، دوای سێ چوار هەنگاوێك، بێ هیچ دەنگو سەنگێك، ئاوە ساردەکە بەروخسارو گیانمدا فیچقەی پێکرا، و لەگەڵیدا درامە بەر سۆندە.. زۆر خۆم لەبەریدا نەگرت، کەوتمو دوای ماوەیەك لەژێر زەحمەتیی لێدانەکاندا لەسەر خۆم چووم..

کە وردە وردە بەئاگا دەهاتم گوێم لەدەنگێك بو دەیگوت: جارێ وازی لێ بهێنن، جارێ وازی لێ بهێنن.. کە هاتمەوە سەر خۆمو کەوتمە جوڵە، سۆندەکەیان لەدەستم نزیك کردەوە، گرتمو هەرچی چۆنێك بو خۆم بەرزکردەوەو بۆ ژورەکەم بردیانمەوە.

نە قالە لەوێ ماوەو نە جلەکانی.. خۆم دا بەسەر جێگەکەدا.. زۆری نەبرد هێڵنج زۆری بۆ هێنام‌و خۆم کێش کردە لای تەنەکەکەو کەوتمەوە تاڵاو هێنانەوە.. دیسان میزەکەشم بێ خوێن نییە. سەیرە وا خەریکە لەگەڵ ئەوانەشدا رادێم.

پڕوکاوی و ئەو شەکەتییە هەرچی ناوی ئومێد بەژیانە نەیهێشتوە. ژیان بۆتە دۆزەخێك‌و هەر بۆ نەمان باشە.

دوای هەڵڕشتنیی تاڵاوو خوێناو، کەمێ راکشام. هەستم دەکرد تروسکاییەك ئومێد دزە بۆ ناو دڵ‌و مێشکم دەکات.. زۆر بیرم لەوە کردەوە.. لەدواییدا بۆم دەرکەوت کە نەمانی قالە هۆیەکەیەتی. وا هەستم دەکرد کە ئیتر پرۆسەی ئەشکەنجە گەیشتۆتە لوتکە، ئەگەر لەمەودوا سەربەروخوار نەبێتەوە وا لەوە سەرەوژوور تر ناکرێت.

زۆر بەسەر خولقانی ئەو تروسکایی ئومێدەدا تێنەپەڕی کە بیر لەهۆی رۆیشتنەکەی قالە بەجۆرێکی تر مێشکمی داگیر کرد. لەخۆم دەپرسیی باشە دەبێت بۆچیی ژورێك برابێت؟ لەوانەیە بۆ ژوری یەك نێررابێتەوە، بۆ هەڵبەستنی هەندێ درۆ بۆ روخاندنی هاورێکانم، دیارە شتێکیان بۆ رێکخستووەو شتێ دروست دەکەن کە بڕوای پێبکەن. خەمێکی گەورە بۆ ناو دڵ‌و بیرومێشکم دزەی کردو تەواو نائارام بوم. لەپڕ بیری پێچەوانە گوشاری خستنەسەر ئەو نائارامییەو بەخۆمم دەگوت: باشە بۆ خۆت بەوەوە خەریك دەکەیت! بڕواناکەم کەس گوێ لەقسەی بگرێت. جگە لەوە هەرچییەك دەربارەی من بڵێت ناتوانێت بیبەستێتەوە بەوانەوە، خۆ ناتوانێت پەیوەندییەك لەنێوانماندا بخولقێنێ. چونکە هیچ کامێکیان پەیوەندیی لەگەڵ من نەبووە، ئیتر دەبێت لەچی بترسم! ئەی باسەکەی لەمەڕ شێخ عەبدول؟ نا ئەوە شتێکی وانییەو ئەمیش لە تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوتو بووە، تەواو متمانەم پێیەتی، وشەیەکیش لەدەمی نایەتەدەرێ، باشە ئەی بۆ ئەو قسانەی کە لەگەڵ کەمالدا کردومە. هەق نەبو بچمە ناو ئەو جۆرە باسانەوە، ئەوە شکاندنی بڕیارەکەی خۆشمە. دەی ئەوە گوێ دەدەیتە چیی، کەمال نە هی ئەوەیە ئیعتیراف بکات، نە ئەوەشە کە نهێنیی وا لەهیچ حاڵەتێکدا بدرکێنێت، ئەگەر هەموشیان بڕوا بەقالە بکەن وا کەمال‌و عەبدول‌و شێخ حەسەن بڕوای پێناکەن.

جگە لەوانە ئەوا بڕواشیان پێکرد، خۆ ماوەیەکی تر، ئەگەر بەسەلامەتیی لەژێر دەستیاندا دەربچین، هەر بە درۆ دەکەوێتەوە. لەبەر ئەوە هیچ پێویست نییە هێندە خۆم بەو بیرو خەیاڵانەوە خەریك بکەم‌و خۆم جۆرێکی تر لەئەشکەنجە لەسەر خۆم زیاد بکەم‌و لەوە زیاتر خۆم هیلاك بکەم.

پڕوکاوییەکە وای لێکردوم کە سەر حسابی زۆر شت بکەم..

باشە ئەم لێکدانەوانە بۆ چیی؟گوایە لەمە خراپتر دەکەن! ئەگەر خراپتریش بکەن، لەشم هێندە سڕو خۆشە بوە کە ئەوەندە هەست بەئازار ناکەم، لێدانو ئەشکەنجە بۆ من زۆر دەوریان نەماوە، زیاتر دەبێت لەگەڵ گوشاری سایکۆلۆجی خەریك بن. جا گرنگ ئەوەیە چۆن بەرەنگاری ببم؟ مەگەر بڕیاری کوشتنیان دابێت ئەوسا لەسەر ئەشکەنجە بەردەوام بن. ڕاستە ئەوە وایە بەڵام خۆ کێ دەڵێت ئەو بڕیارەیان داوە! مەگەر بەڵگەیەك بدۆزنەوە ئەوسا ئەوە مسۆگەر دەبێتو کوشتنەکەش بێگومان دەبێت.

ڕۆژێك دوای ڕۆیشتنی قالە لە ژوری ژمارە یەك، لەگەڵ کەمالدا لە قسەکردن لەسەر بیرەوەرییەکانی ڕابوردو، گلەییمان لەخۆشمان دەکرد کە چۆن لەبەردەستی بەعسدا ماینەوەو دەمگوت:

دەی دەستیان خۆش بێت هەرچییەکمان لێدەکەن هەقی خۆیانە، چونکە هەڵە گەورەکە لەخۆمانەوەیە! خۆ لەو ماوانەشدا من هێندە بێ خەم دەجوڵامەوە کە بەرەبەیانی ماڵ داگیرکردنەکە، لەناو بومەلەرزەی گرتنەکەدا هەر خواخوای ئەوەم بو کە زوو بمبەن، گرتنەکەم لابوبو بەکارێکی ئاسایی ئەگەر هەر بەوەوە بوەستنو ماڵەکە بەجێبهێڵن، چونکە هەر تەنها یەك هەنگاوی تر دەیهێنانە ناو ژوری خەوتنەکەوە، یەك هەنگاوی تریش دەیانخاتە بەردەم کەنتۆری جلەکانمان، بەکردنەوەی دەرگاکەشی، بێ گەڕان، تازەترین نامەی نەوشیروان کە چەند ڕۆژێك بوو بەدەستم گەیشتبوو دەکەوتە بەردەستیان. خۆ ئەگەر بەرەو دواشەوە دوو هەنگاویان بنایە وا دەکەوتنە بەردەم دەرگای ژوری میوان، لەگەڵ چونە ژورەوەشدا یەکسەر چاویان بەنوێترین بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەو یەکێتیو حیزبەکانی تر دەکەوت کە نەوشیروان لەگەڵ نامەکەیدا بۆی ناردبوم، لەگەڵ: "دیپلۆماسیێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی" ١٩٧٣ دەستخەتی کۆماری مەهاباد کە زۆر نییە سەنسوری ڕژێم چاپکردن و بڵاوکردنەوەی قەدەغە کردو لەنێو کتێبە قەدەغەکراوەکانیشدا ناوەکەی بڵاوکرایەوە، دەستخەتی "کوردو ململانێی دیپلۆماسیی" کە زستانی ساڵی ٧٤- ٧٥ لەهەرگێنە تەواوم کردبو، هەمو بەڵگەنامەکانی سەردەمی کۆماری مەهاباد کە لە جەنراڵ حەمە ڕەشید خانی بانە وەرمگرتبون (ئازاری١٩٧٣)، چیرۆکێکی سیاسیی کە چەند ساڵێك بوو لەگەڵی خەریك بوم، گەلێك نەسری شێوە هەڵبەستی سیاسیو دڵداریی کە یادەوەریی زیاتر لەبیست ساڵیان تێدایە، ئەو دیدەنیو نوسینانەم کە لە: گۆڤاری ڕزگاری، ڕۆژنامەکانی: النور، برایەتی، التاخیدا بڵاوکرابونەوە،، ئەوانە هەموی لەسەر مێزی نوسینەکەم دانرابون، جگە لە کتێبخانەکەشم..

لەو رۆژگارەی دوا دەستپێکردنی شەڕی عێراق- ئێران، من هیچ جۆرە وریاییەکم لەسەر خۆمو ئەو شتانە نەمابو. چونکە وام لێکدەدایەوە کە بەعس خۆی دوچاری ئەم شەڕە کردووە، توانای هەر بۆ ئەوە تەرخان دەکات. بۆیە زیاتر لەگەڵ نەخشەدانان خەریکبوم بۆ تەواوکردنی هەندێ باسو لێکۆڵینەوە.

هەرچەندە هەر لەو رۆژانەشدا گەلاوێژ سەری کردبووە سەرمو هەمیشە دەیگوت بۆ خاتری خواو پێغەمبەر ئەوانە لاببە! ئاخر چی سودێکی هەیە وا دەیانهێڵیتەوە، وەڵا لایان نەبەیت دەیانسوتێنم! ئەگینا توشی فەلاکەتێکی گەورەمان دەکەن. ئەم لەهاتنی جەمال تایەر، کە هەندێك جاریش ئەگەر نامەم بۆ بهاتایەو لەوێ نەبومایە، وادەیدایە دەستی. جگە لە هاتوچۆی حەمە چاوشینو خەسرەو خاڵ، ئیتر لەم جۆرە دیاردانەوە دەیزانی کە من کار دەکەم. ئەمیش بەردەوام لەترسێکی بێ کۆتاییدا بو. ئەوەش بێ هۆو زەمینە نەبوو:

لەشەستو پێنجدا ئێوارەی رۆژێکی سەرەتای ئازار ١٩٦٥ بو کە باوکی بەڕێکەی مزگەوت- ماڵەوە بو، هەر بیست مەترێك لەو لاماڵەکەی خۆیەوە، عەسکەر دەستڕێژی لێدەکەنو لەناو گۆمی خوێنی خۆیدا دەیبیننەوەو بەو جۆرە دەیبەنەوە ناو خێزانو هەشت منداڵەکەی کە گەورەکەیان حەڤدە ساڵ بسو. بۆیە تارمایی ئەو کارەساتە خوێناویە و ترسی عەسکەرو پۆلیس هەرگیز لەزەینی ئاوانە دەبو، کە ئەمانەشی دەهاتە سەر، ئیتر پێش روودانی کارەسات ئەم تێیدا دەژییا، لەسنور بەدەر بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، چاریشم نەبو، خۆ دەبو بە لایەنی هەرەکەمی ئەرکو بەرپرسیارێتیی نیشتمانییو میللییم هەستم..

لەگەڵ ئەو گوشارانەی گەلاوێژیشدا دیسان مەترسیی رۆژگارەکەم سەرنج لێنەدەدا، بێخەم ئەو نامەو بڵاوکراوانەم بەوجۆرە دانابو.

ئەو ژمارە زۆرانەی زیندانییەکان لەو ژورە بچوکانەدا، ئەو هەمو پیسو پۆخڵییە، نەبونی حەمامو ئاوی گەرمو سابونو جل گۆڕین، خراپیی خواردنو کەمی ڤیتامین، بێ داوو دەرمانو دوکتۆرو خەستەخانە، ئەو هەمو ئەسپێو جڕو جانەوەرە، شێوەی ئاو خواردنەوەو میزکردن، ماوەی زۆر کورتی چونە سەر تەوالێت، گواوو پیساوی رۆژانەی ناو ئاودەستەکە، بۆنو پیسیی ئاوو هەوای ژورەکانو نەبونی پەنجەرەو خۆر نەهاتنەژورەوەو نسرمییان، دەنگ نەکردنو نەجوڵانەوەی وا کە حەرەسەکان گوێیان لێبێت، داخستنی پانکە لەگەرماداو کردنەوەی لەرۆژانی ساردو سەرمادا، نوستنی شەوانەو کێشەکانیی، جنێودابارینو لێدانی رۆژانە، بێ لەکاتی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە، پچڕان لەدنیای دەرەوەو تەنانەت لە برادەرەکانی تریشم، نەبونو نەبینینی رۆژنامەو رادیۆو جگەرەو ئەو جۆرە پێویستییانە، ونبون لەمنداڵو

نەبیستنی هیچ جۆرە دەنگو باسێکی یەکتری، ئەو گوشارە دەرونییانەی کار لەهەمو گیانو ژیانی مرۆڤ دەکەن، چاندنی سیخورەکانیان لەناو ئەم ژورانەشدا، قەدەغەکردنی سەردانی زیندانییو شت هێنان، بگرە هەر کەسیش نازانێت لەکوێین‌و چیمان لێ بەسەر هاتووە، جگە لەو کەرەسەو شێوانەی ئەشکەنجە کە بەهۆیەوە، رۆژانە لەژێر باری خراپترین شێوەی ئەشکەنجەدا زۆر لەزیندانییەکان بۆ سەر قەنارە دەبرێن یان لەژێر ئەشکەنجەدا دەکوژرێن..

رۆژی چوارەمی ژوری هەشت، چلو چوارەمی زیندانەکانی هەیئەی تەحقیقی خاسە.. قالەو ئەو پرۆسەی ئیعتیرافپێکردن‌و ئەو زەلیلییە پڕ لە شورەییەی روخاوەکان تێیدەکەوتن کە پیاوی لەچەند رویەکەوە ئازار دەدا، لەبەرچاوم نەماون.

دیمەنی دوو روخاوی تر بەهەمان شێوەی رەحمان کەوتبونە بەردەست ئەم شەیتانەی هەیئە، هەمان دووبارە بوونەوەی شانۆگەریەکەی رەحمان- قالە بون. ئەو دیاردانە، بۆ من هۆیەکی تری زیاتر پتەوبونی بڕوا بەخۆو نەفرەت لەدوژمن بو. بەپێچەوانەی نەخشەی رەئیسی هەیئەو ئەفسەرە لێکۆڵەرەکانی تر..

سەرلەبەیانیو نیوەڕۆیەکی بێدەنگ بوو. جگە لە کەمە هاتوچۆیەك لەحەوشەکەدا کە لەچاو حەوشەکەی تردا لەجێی نەبووانە. هەستم بەکەمە حەوانەوەیەکی دەرونیی دەکرد، رەنگە زیاتر بەهۆی نەمانی قالەوە بێت چونکە وا مەزەنە دەکەم کە، دەبێت ئیتر ئەشکەنجەش رو لەکەمی بێ‌و خەتە بەیانییەکەش بەرەو خوار ببێتەوە..

لەم سەرەتای مانگی دوانزەیەدا ئەمڕۆ ژورەکە گەرمە، بن میچەکەی یەقی کردۆتەوە. سەرماکەی ناو ئەشکەنجەو ناوە لەعنەتییەکەی رۆژانی پێشو لەو گەرمییەش مەحرومیان کردبوم.

لاوانەوەی ژنی زیندانیکراو باری ئەشکەنجەی دەروونیم ئاڵۆزتر دەکات:

ئەو رۆژە بەرە بەرە هەتاو دەکەوتە ئەو بەری تاکزیندانەکەم، هەروەك لەسەیرکردن لەناو کونی کلیلی دەرگاکەوە دەردەکەوت. لەناو بیرو خەیاڵەکانمدا ونبووبوم کە دەنگێك هاتە گوێم.. سەیرە ئەوە خۆ دەنگی ژنە! تۆ بڵێیت لەژوری ژنانەوە بێت؟ براوشناکەم خانووبەرەو خێزانی سەربازو خوار ئەفسەر لەم ناوەوە نزیك بن. کە زیاتر گوێ قولاغ بوم، ئەوە خۆ لاواندنەوەیە. نەخێر گۆرانییە پڕ لەخەم‌و پەژارەکانە کە بەدرێژایی مێژو هاوسەری ژیانی هەمو کوردێکی خاوەن هەست بووە. نەخێر راستەو ئەوە دەنگی ژنە، دەی خوایە ئەمە چیی بێت، گۆرانیو لاواندنەوە لێرەدا! چومە نزیك دەرگاکەوە، لەو بۆشاییەکەمەی ژێرەوەی هیچ نابینم. لەکونی کلیلی دەرگاکەوە، سەرنجمدا دو ژنە کورد لەبەر هەتاوەکە دانیشتون‌و لەبەر خۆیانەوەو لەسەرخۆو بەهێواشی گۆرانییەك دەڵێن کە زیاتر لە لاواندنەوە دەچێت

نەك گۆرانیی. ئەو دیمەنە خستمییە ناو پەژارەو بیرکردنەوەیەکی پڕ لەخەفەتی زیاتر..

یەکێ لەو دیاردانەی کە لەژیانیی ئاساییمدا بەزەییم دەجولێنێ‌و هەستم دەژاکێنێت، گریان‌و لاواندنەوەی ژنە. لەسنور بەدەر پەست‌و غەمگینم دەکەن، خەم‌و ئازارم بۆ دەهێنن. فرمێسك دەبارێنن. لەخۆگریی ناو گەورەترین کارەسات‌و خەم‌و پەژارەی ناخۆشیدا ئەو دیاردەیە لاوازم دەکات، دەمهەژێنێ‌و ئەمخاتە جوڵەو گریان. بۆ خۆشم نازانم ئەو دیاردە دەروونییە لەچییەوەو چۆن دروست بووە! رەنگە لاوازیی زۆر لەژنان لەو کۆمەڵگە پاتریارکییەدا، بەتایبەتیی لەپێش سەردەمەکانی چارەکە سەدەی رابوردووەوە، هۆیەکی گرنگ بێ. بێگومانیشە کە جوانیی ژن‌و ئەو بەهرە بایۆلۆجییە سروشتکردەی کە سەرجەم ئۆرگانەکانی کردۆتە تابلۆی خۆشی‌و لەزەتی ژین‌و سەرچاوەی بەردەوامیی ژیان‌و گەشەکردنی کۆمەڵگە، بەرادەیەکە کە هەریەکەیان بۆتە ڤینۆس‌و پەرستگەیەکی تایبەتیی بۆ پیاوێك کە رۆڵی کاریگەری خۆی لە خولقاندنی دیاردەکەدا بینیوە.

ئەم ژنانە لەشاریی ناچن. بەشێوەی جل‌و لاواندنەوەکەدا لە خەڵکی ناوچەی پشدەر دەچن. هەرچەندە کەم‌و زۆر لە وشەو رستەکان ناگەم، چونکە دەنگەکانیان زۆر نزم‌و لەسەرخۆن. لەگەڵ ئەوەشدا، دەنگ‌و ئاوازەکە دەبونە شەماڵ‌و پەژارەیان بەرومدا دادەباران، چونکە ئەمە هەر تەنها دەنگی لاوازو پڕ لەبەزەیی‌و لاواندنەوەی ژن نییە، هەر هی ژنی دیل‌و یەخسیری ناو ئەم زیندانە نەهێنی‌و سەربازییە نییە، بەڵکو هی ئەوانەو ژنی کوردو یەخسیری دەست ئەم جانەوەرانەن کە لەهەر سوچێکەوە بیریان لێ دەکەیتەوە ئازارت دەدەن، هێندەی تر ویژدان نائاسودە دەکەن.

لەناو ئەو چەرمە سەرییانەدا ئەمەش زیادی کرد. کارەکە بەوە باش بو کە دەنگەکانیان زۆر نزم‌و لەسەرخۆبون، بۆیە لەپەژارەی ناو دڵ‌و مێشکیان نەدەگەیشتم‌و نەمدەزانی لەسەر چی چیرۆکێکی پڕ لە نەهامەتیی دەدوێت‌و چیی گەرداوێك فرێی داونەتە ناو ئەم زیندانەوە کە لەهەموو بەزەیی‌و ویژدانی مرۆڤانە بێ بەشیان کردوون. لام سەیرە کە حەزدەکەم چی تر گوێم لەدەنگیان نەبێت، کەچیی وردتر گوێ دەگرم تا لەرازونیازی ناو دەرونیان بگەم!

ئەمانە کێن‌و چین‌و بۆچیی گیراون؟ دەمێکە لێرەبن یان تازە میوانن. رەنگە ئەمانە لەژوری ژمارە حەوت بن. ئەوانەو چەندین پرسیاری تری لەو بابەتە خۆیان قوت دەکردەوە. بێئەوەی لەو تاقی تەنهاییەمدا وەڵامێك دەستگیر ببێت. لەناو ئەو نائارامییانەدا بوم کە بێدەنگیی باڵی بەسەر حەوشەکەدا کێشا، لەسەرنجدانێکی تردا بۆم دەرکەوت کە براونەتەوە شوێنی خۆیان. ئەو حەزەی منیش بۆ ئەو

هێوربونەوەیەی خۆم، جۆرێك لەنامۆیی تێدایە، چونکە ئەوان لەو خەم هەڵڕشتنە کاتییە بێبەری دەکات. هەرچەندە ئەوانە هیچیان لەخواستی ئێمەوەو بەدەستی کەسمان نییە.

دەمەو عەسرێکی درەنگی پێنجەم رۆژ، لەناو کش‌و ماتی‌و بێ دەنگییدا گوێم لەجوڵەو دەنگی پاسەوانەکانە. گوێم هەڵخست، ئینجا لەکونی کلیلی دەرگاکەوە سەیرێکم کرد، ئای ئەمڕۆ چی دەبینم! هەروەك لاوانەوەی کیژە کوردە یەخسیرەکان ئەم دیمەنەیان لێوە هەڵقوڵابێت. خۆ ئەوە شێخ حەسەن‌و دلێری برایەتی.!

مەترێك کەمتر لەدەرگاکەوە دوربون. ئەوە خۆ سەریان تاشراوە کراسی تازەیان لەبەردایە. من هەر بەشی سەرەوەیان دەبینم، وا دیارە پانتۆڵ‌و پێڵاوی تازەشیان لەپێ کردون. بێگومان دەبێت ئەمە هەر بۆ ئازادکردن بێت. دەی فرسەتە بابە چرپەیەك تێیان بگەیەنم کە من لەژیاندام! تا هەواڵەکە بگەیەننە کەس‌و کارو لەوانیشەوە بۆ برادەرەکانم. بەسرپە بانگم لەشێخ حەسەن کرد، چەند جارێك دووبارەم کردەوە، بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی بیستنیان لێببینم. دەی با بانگی دلێر بکەم، رەنگە کورتییی ناوەکە ئاسانتر بکەوێتە بەرگوێ. دیسان ئەویش بێ وەڵامە. زۆر هەوڵمدا، هیچ کەڵکی نییە، هەر ئاوڕیشیان نەدەدایەوە، رەنگە گوێیان لێ نەبێت، خۆ ناوێرم لەوە زیاتر دەنگ بەرزبکەمەوە! کێ دەڵێت ئەگەر گوێشیان لێم بێت دەوێرن جوڵە بکەن جا کە ئەوان لەیەك وشە نەگەن، یان گوێ نەگرن، ئەی چۆن لەرستەدەگەن! خۆ هەریەك وشە بیستن‌و گوێیان لەناوەکەم بێت، وا مەبەستەکەم دێتە دی. دەی جا چۆن شێخ حەسەن لەناو ئەو هەمو مەینەتیانەدا دەوێرێ جوڵە بکات. خۆ مەرج نییە جوڵە بکەن، گرنگ ئەوەیە گوێیان لەمن بێت‌و بزانن من کێم. سەرەنجام بەدڵ رەنجاو مامەوەو ئەوانیشیان پێش خۆیان دان‌و بردیانن‌و ئیتر چاوم پێیان نەکەوتەوە..

بینینی ئەو دوو هاوڕێیەی زیندانەکەم، خەیاڵی بۆ لای ئەوانی تر راکێشاو کەوتمە گومان لەوەی کە دەبێت زۆری تریان بەو جۆرە بەردرابن.

ئەو خەیاڵانەی ناو دیاردەی بێئومێدیی، بێ هیواییان لە بەسەلامەتی سەرفرازبون زیاتر دەکرد. رەنگە زۆری تری وەك ئەمان بەردرابن. کێ دەڵێت هەمویشیان بەرنەدراون! ئەی ئەگەر شێخ حەسەن بەربدرێت کە هەر تەنها دوو رۆژ لەمەوبەر بو کە لەکونی کلیلی دەرگاکەوە بینیم دەستی بۆ ئاسمان درێژکرابو، ئاشکرا دەمبینی کە هەمو گیانی لە لەرزینێکی بەردەوامدا بو. ئەم تەنیا کەس بو کە لەو کاتەوەی جیاکراومەتەوە بیبینم. ئەو بەو هەمو ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوانەوە لەپڕ ئازاد بکرێت! ئەی بۆچیی ئەوانی تر بەرنەدرابن یان بەرنەدرێن!

دیاره دەبێت هەروەك مەزەنەم دەکرد هەرمن‌و دوان سێیانێکی ترمان مابینەوە! دوور نییە هەر واش نەبێت. ئەی پرسیار دەربارەی نامەی مام جەلال‌و نەوشیروان‌و دامەزراندنی کۆمەڵەو ئینجا تاوانبار کردنم بەکارکردن‌و پێوەندیی بەوانەوە. لەخۆیانەوە نەیانهێناونەتە ئاراوە! هەروا ئاسان بەسەر ئەوانەشدا تێناپەڕن. لام وایە ئەوانەش هەر سەرەتان بۆ کۆمەڵێك پرسیاری ئاشکراتر کە راستەوخۆ بەکارکردن‌و چالاکیی بێگومان تاوانبارم بکەن، بەتایبەتیی لەوەش دەچێت کە زانیارییان دەربارەی هەندێ لایەنی ژیانی سیاسیم هەبێت.

خۆ هەر زانیارییەکانی ئەمنی سلێمانی، نەجەف، کەربەلا، عەمارە، رەمادیی‌و بەغدا بەسن بۆ دەرباز نەبونم. ئەوانە بیری بێ ئومێدییان زیاتر تەڵخ دەکرد. ئەو بێ ئومێدییەش بیرەوەرییەکانی کۆنی لەبەردەمدا قوت دەکردەوە.. بەتایبەتی ئەوانەی کە لەمەزەنەی لێکدانەوەی ئالۆزییە سیاسییەکاندا رەنگە تاوە دەزویەك لەئەسڵی کلافەکان یاخی بوبێت‌و رۆژێك لەرۆژان لەو ناوەدا سەری هەڵدابێت!

بەڵام ئەوەی زیاتر سەری لەسەرچاوەی زانیارییەکانی ئەو لێکۆڵەرانە تێکدەدا ئەو دوو ساڵ‌و چەند مانگ کارکردنەم بو لەلقی سلێمانی پ.د.ك دا، (کۆتایی ساڵی ١٩٧٢) دوای نزیکەی دوو ساڵ لەیەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە،و ئینجا دانانم بەسەرپەرشتکاری مەکتەبی کرێکاران‌و جوتیارانی پارێزگای سلێمانیی.

هەر ئەو کارکردن‌و هەڵوێستەشم خستبومییە بەردەم گلەیی چەند برادەرێکی ترم لەناوو لەدەری کۆمەڵەو ی.ن.ك چونکە ئەوان، بەهۆی لێکدانەوەی یەکلایەن، باش لەهۆ سەرەکییەکانی ئەودیدو بۆچون‌و هەڵوێستانەم نەدەگەیشتن:

< ئەوان وەك من بارودۆخە سیاسیی‌و ناکۆکیی‌و ململانێیەکەیان هەڵنەدەسەنگاند.

< ئەو کەموکورتیی‌و هەڵانەی لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا سەریان دەرهێنا، لام وابو کە لەئایندەدا کێشەی قەبە دەخوڵقێنن.

دواییتریش لای من مەسەلەی دوژمنی سەرەکی‌و ناسەرەکیی روون‌و بێگومان بو، ململانێی نێوان کوردو رژێمی بەعس ناکۆکیی سەرەکی‌و توندوتیژی سەپێنراو بو، هیچ ئەلتەرنەتیڤێکی تریش نەبو کە جێگەی مەلا مستەفا بگرێتەوە. لەناو زۆرانبازییەکەشدا کە پەلە لەتەقینەوەی دەکرا نە ئەو ئەلتەرنەتیڤە دەخوڵقاو نە چارەیەکی تریش هەبو. ئەزمونەکانیش هەر ئەوەیان سەلماندبو.

< ئالۆجیکیش بوو مرۆڤ بگاتە باوەڕێکی وا کە لەو بارودۆخەدا، رێکخراوێکی نوێ لەناو ئەو دەریای ناکۆکی‌و ململانێیانەدا وا بەپەلە گەشە بکات، لەرووبەڕووبونی رژێمی بەعسدا بتوانێت جێگەش بە بارزانی‌و پارتییەکەی لێژ بکات‌و جڵەوی رۆڵ بگرێتە دەست.

خۆ لەسەردەمەکەشدا هیچ ئەلتەرنەتیڤێکی جێگرەوە نەبو کە بتوانێت ململانێیەکی لەو بابەتە پیادە بکات.. زۆرانبازییەکانی لەوەو بەریش بەرێککەوتنەکەی ئازار کۆتاییان پێ هێنرا. هێندەی تریش مەڵبەندی بارزانیی، بەکاتیی بەهێز کرد.

هەر لەساڵەکانی شەستو شەش و شەستو حەوتیشەوە گەیشتبومە ئەو باوەڕە کە تا مەلا مستەفا لەئارادا بمێنێت هیچ جۆرە کەسو رێکخراوێکی تر ناتوانێت لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان رۆڵی هاوتای رۆڵی سەرۆکایەتیی مەلا مستەفا ببینێت، ئەزمونەکانی دواییش هەر ئەوەیان سەلماند، بۆیە دوای کۆچی دوایی بارزانی، لای من نامۆ بوو کە لە میدیایی حیزبەکاندا بە قسە و بە وشە وەك سەردەمی ژیانی خۆی مامەڵە بکرێ.. باشترین کار ئەوە بوو کە لە هەڵسەنگاندنی بابەتیی و زانستیانەدا لایەنە باش و خراپەکان. وەك مێژوو.. باس بکرێن.. زەرەرو زیان و لایەنە باشەکان بنرخێنرێن و ئیتر رەحمەتیش بۆ قیامەت بەجێ بهێڵرێ..

روداوەکانیش زۆر بەپەلە رەوتیان پێدەکرا، سیمای پیلانو نەخشەی بەعس ئاشکرا تر دەردەکەوت، بیرکردنەوە لەرۆڵبینینی درێژ نەفەسی رێکخراوێکی تازە بەوەڵەدبوو، لای من بوبو بە خەیاڵێکی ئالۆجیکیی.

هەر لەبەر ئەم هۆیانەش بوو کە سەرەڕای کارکردنم لەپارتیدا هەندێك لەبرادەرە زۆر نزیکەکانم، دوای نائومێدییان لەکارکردن لەسەرەتادا، هەوڵیان دەدا کە هیچ نەبێت جۆرە پەیوەندییەکم بەکۆمەڵەوە هەبێت. بەڵام بەهۆی ئەوانەوەو، لەبەر ئەوەی کە لەژیانی سیاسیمدا کاری دوو سەرەی لەو بابەتانەم بەخراپ دەزانیو بۆ خەڵکی تریشم بەناڕەوا دادەنا، بۆیە هەرگیز بیرم لەکاری وا نەدەکردەوەو بگرە دژیشی بوم، هەروەك چۆن کاتی خۆشی لەدژی "ئیزدیواجییەتی رێکخستن" بووم (بەهاری ساڵی ١٩٦٥).

دوای هەرەسیش کەم کەس هەبو درك بەبیری سیاسییو رۆڵی من بکەن، جگە لە ژمارەیەك لەبرادەرانی کۆمەڵەو یەکێتیی، تەنها ئەوانەی کە منیان باش دەناسیی، بەبیریاندا نەدەهات کە بێ لایەنو دانیشتو خۆم گۆشەگیر بکەم.

بۆ مەبەستە گرنگەکانم هەرکە پشویەکی دوا ئەشکەنجەم بۆ دەرەخسا، دەکەوتمەوە شەنو کەوکردنی کاروانی سیاسیی رابوردوو.

لەهاوینی ساڵی حەفتاو چواردا، شەڕی رژێمی بەعس لەگەرمەیدا بو، لقی ٤ی پدك کە تانزیك بەکۆتایی ساڵەکە، ئەندامی کارگێڕەکەی بومو کاروباری رۆژانەم دەکرد، یا وەڵامی راپۆرتی لیژنە ناوچەکانم دەدایەوە. کارەکانم بێ شەڕ فرۆشتنو سەریەشەو کێشەی جۆراو جۆر نەبوون.

ڕۆژێك لێپرسراوی لق گوتی: کێشەیەکی قیادە مەرکەزی هەیە حەز دەکەم تۆ بەلێکۆلینەوەکە هەستیت بۆ لابەلاکردنی کێشەکە.

بیرێکی وردی گەرەك نەبو کە هۆی ئەو ئەرك پێسپاردنە بزانرێت! ئەو لەکێشەی کاژێکەکانو ململانێی نێوان پێشمەرگەو ڕێکخستنیشدا هەمان کاری بەرەو روم دەکردەوە! بەتایبەتی ئەو ناکۆکیانەی پەیوەندییان بەفەتاحاغاوە هەبو، کە لەو سەردەمانەدا ئامر هێزی خەباتو یەکێك بوو لە لێپرسراوە بەدەسەلاتەکانی مەلا مستەفا، ئەم وەك کاژێکیکی رەسەن تاسەر ئێسقان دژی باڵەکەی م.س و شیوعییەکان بو. بەبێ ئەوەی بیناسم یان پێیبزانم، یەکێك بوم لەوانەی کە بێ سنور رقی لێم دەبۆوە. لەیەکەم بینینو یەکترناسیندا لەبیارە(١٩٧٣) گوتی:

< ئایی مامۆستا مەحمود کە هەولمان‌دا بتکوژین! منیش گوتم:

< سا بەسەری تۆ زوربەی نیوەشەوان بەتەنها لەکۆبونەوە یا لەیانەی فەرمانبەران دەگەڕامەوە. ئەویش گوتی ئاخر بەوەمان دەزانیی بۆیە بەردەوام بێئومێد نەدەبوین لەئەنجامدانی کارەکە. هەر لەو سەرچاوانەوە ڕۆژێك تەنەکەیەك دینامیت گوایە هەنگوینەو بەدیاریی نێرراوە، جا لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە دیاریو شت هێنانە لای من کارێکی بێزراوو قەبوڵنەکراو بوون، بۆیە گەلاوێژ دیارییەکەی! وەرنەگرتبوو، ئەگینا ماڵەکە بەژنو دوو منداڵو دایكو باوکمو برامو منداڵەکانیەوە دەکەوتنە بە ڕەحمەتیی دیارییەکە. هەروەك چۆن ماڵی عەلی عەسکەریی لەکارێکی تیرۆریستانەی وادا نیمچە هەلتەکاو کرا، بەلام بەرێکەوت کەسی بەرنەکەوت. نارنجۆکێك خرایە خانوی رزگاریەوە، بێ ئەوەی کەس بەر بکەوێت، دیسان هەر ئەم و عەبدولوەهاب ئەتروشی لە شەستو نۆدا شەوێك مەفرەزەیەك بەلێپرسراوەتیی حسەینی فارس دەنێرن تا ماڵەکەمان بەر بازۆکە بدەن، هەروەك چۆن ماڵی حیلمی عەلی شەریف- یان بەر بازۆکەدا، بەلام حسەینی فارس، وەك خۆی دوای هەرەس بۆی گێڕامەوە، هەر بەلێنی زارەکیی پێدابونو نەیویستبو کارەکە ئەنجام بدات. هەر بۆ ئەو مەبەستانە، بەدرێژایی ساڵێ حەفتاو چوار لەشاخ لەگەلم خەریك بو تا جارێك لەگەلیدا بۆ بەرەیەکی شەڕبچم، منیش هەر بەلێنم پێدەدا بێ ئەوەی بیر لەو چونە بکەمەوە.

پێش هەرەسو دوای لابردنم لەلقو گواستنەوەم بۆ لێپرسراوی ل. ن. هەلەبجە ئەو و جەمال نامیقو پاراستن پیلانێکی تر سازدەکەن کە لەدەستکردن بەکار بۆمبای میقاتکراو لەژورەکەمدا دابنێن، بێ ئەوەی بگەنە ئەنجامدانی چونکە لەو ماوانەدا من بڕیاری دانیشتم دابو. ئەم پیلانە لە دانیشتنێکی قومارو خواردنەوەدا، دوای هەرەس لە ئێران بە ئامادەبوونی زۆر کەس باسکرابوو.. ئەو تەنانەت رقی لەپارتییەکەی مەلا مستەفاش دەبووەوە، کەچی ماڵی بارزانیی وەك ئەندامی

بنەماڵەکە سەیریان دەکرد. لەگەڵ ئەوانەشدا من رقم لەفەتاحاغا نەدەبووەوە، چونکە دەمزانیی دڵسۆزی نەتەوەکەی بو، بەڵام لەسەر رێبازو لەناو بیرێکی هەڵەدا خۆی بینییەوە، بۆیە سەرەنجامی کارەکانی هەڵەو دژ بەنەتەوەکەی خۆی دەگەڕایەوە، چونکە وردو قوڵ بیری لەئەنجامەکانو پاشگەزبوونەوە نەدەکردەوە. لەناو پەشیمانیی لەو جۆرە کارانە رۆژێکیان شەفیق ئاغا نمونەیەکی خۆی باسکرد کە لەکۆتایی حەفتاو دوودا بووم بەئەندامی لقی سلێمانیی، هەستم دەکرد شەفیق ئاغا حەز لەنزیکیی‌و دۆستایەتیم دەکات. رۆژێك لەبواری قسەکردن لەسەر رابوردوو گوتی:

> دەزانیت کاتی خۆی من زۆرم رق لەتۆ بوو! گوتم:

< جا منیش بەرامبەر بەتۆ هەر وابوم.

> بەڵام هی من بەڕادەیەك بوو کە ئەگەر حاکم بومایەو بیانهێنایتایەتە بەردەستم، یەکسەرو بێ لێکۆڵینەوە حوکمی هەڵواسینم دەدایت!

< لەراستیدا من نە بەو جۆرە بومو نە واشم دەکرد، باشە بۆچیی تۆ بەو جۆرە بویت؟

> بەهۆی قسەی درۆو دەلەسەوە، ئێ من لەکوێ بزانم تۆ ئەم کوڕە زیرەكو دڵسۆزەیت!

< بەڵام نالۆجیکییە بێ لێکۆڵینەوەو بێ بەڵگە ئەو جۆرە هەڵوێستانە وەربگیرێت. دەی ئاغا! بزانە چەندین کوردی دڵسۆزو باش‌و تێکۆشەر بەو جۆرە لەناو براون، ئەوە تراجیدیایەکە پێویستە کۆتایی پێ بهێنرێت!

جا لەو جۆرە کار پێسپاردنە بەپیلانانەشدا، لام نامۆ بو کە خۆمیان لێ بدزمەوە، بەڵام دەبو بە ئاگادارییەوە کارەکان ئەنجام بدەم..

کێشەکەی قیادە مەرکەزی، هی پێشمەرگەیەکی ئەو حیزبە بو کە جنێوی بە بارزانی دابو. بۆ ئەوە فاروقی مەلا مستەفا هاتە ژورەکەم، دوای قسەی ئاساییی‌و چا خواردنەوە، گوتی زۆرم پێخۆش بو کە بیستم تۆ لەو کێشەیە دەکۆڵیتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە مەبەستەکەی گەیشتم گوتم بۆچی؟ گوتی ئەی چۆن، لەبەر نزیك بونمان، گوتم لەچی رویەکەوە؟ گوتی: جگە لەناسیاوی‌و هاوگەڕەکیی، بۆچی هێندە بێ زانیارییم؟ گوتم مەبەستت چییە؟ پێدەچێت مەبەستت کۆمەڵە بێت..؟ گوتی رێبازە گشتییەکە. گوتم من کۆمەڵە نیم. لەژیانیشمدا رقم لەدوو مەڵبەندو دوو جۆر ئیشکردن‌و دو سەرە بووە. گوتی نا منیش دەزانم تۆ لە کۆمەڵە دوریت، بەڵام زۆر خاڵی ناوکۆ یەکمان پێ دەگرێتەوە.

دوای ئەوەی زۆر قسەی ترو باسی روداوەکەی کرد گوتم: بەهەرحاڵ من ئێوەم خۆش دەوێت‌و حەزناکەم توشی گێرمەو کێشە بێن یان خۆتان توش بکەن، ئەوەش

پێویستی بە هوشیاریی برادەرانتان هەیە، بۆ خۆت دەزانیت جنێودان بە بارزانی، لای ئەوان کوشتن سزاکەیەتی، نابێت مەجال بدەن کاری وا روبداتەوە. باشیش وایە بۆ ماوەیەك ئەو کورە لەکار دوربخەنەوەو سزایەکیشی بدەن. ئیتر بەو جۆرە کێشەکە لابەلا کرا.

من دەمزانی ئەم زانیارییەکانی لەکوێوە وەرگرتوە.. هەر هەمان ئەو زەلامە لەدامەزراندنی کۆمەڵەشدا دەورێکی خراپی بینی، قسەی راستو ناڕاست، هەقو ناهەقی دەگەیاند، بەکۆمەڵێ درۆو قسەی هەڵبەستراوەوە، بەتایبەتیی لەنێوان ئێمەو مام جەلالدا، ئەوەش ساردییو ناکۆکییەکانی زیاترو قوڵتر دەکرد.

کاتێ کە رەئیسی هەیئە باسی سەردەمی دامەزراندنی کۆمەڵەی دەکرد، ئەو زەلامەم وەبیر دەهاتەوە، بەڵام ئاستی دەرچونی نهێنییەکان بەسنور بون، بێ ئەو کۆبونەوانە بو کە بۆ پێکهاتن و یەکخستنی لایەنەکان دەکراو بەندە نوێنەری لایەنەکەی خۆمان بوم کە دەرکەوتووەکانی:

(حەمە چاوشین، شازاد سائیب، حەمە سابیر، عومەر فەتاح، جەباری مەلا محەممەد، جەمال تایەر، رەفعەتی مەلا، تەها تۆفیق، فؤاد قەراخی، د. کەمال خۆشناو، نەوشیروان مستەفاو بەندە) بوین.. لەگەڵ دەیان تێکۆشەری چالاكو دەرنەکەوتوو، سەدان ئەندامی رێکخستنەکانی لقی سلێمانی کە لەساڵی شەستو نۆوە تا شانە سەرەکییەکانی هەمو رێکخراوەکان پوختکرابون، لەگەڵ گەلێك لێپرسراوو کادیرو ئەندام لەشارو پارێزگاکانی تر، بە تایبەتی لە هەولێرو کەرکوك و بەغدا.. ئەگەر بەهەڵەدا نەچم و لەبیرم مابێت لەوانە:

جەلال کەریم، فەیزوڵڵا، ئەحمەد رشوانی، جەمیل رەنجبەر، سەربەست بامەڕنی، رەمزی دزەیی، یوسف دەرگەڵی و گەلێکی تر.. ئەوانە پێش بەیانی ئازار، لەو سەردەمانەدا کە هەوڵی ریفۆرم یا دامەزراندنی رێکخراوێکی نوێ بوبوە مەبەستی سەرەکیی خەباتی ناوخۆ، سازکرابوون. ئەگەر کاری تیرۆر، بەکوشتنو ناردنی تەنەکەی لوغم کراو بۆ ماڵانو هێرشی شەوانەی چەکدارانی بارزانی.. تاد نەبونایە کە تەواو ئێمەی خەریك کردبو، لەوانە بوو کە لابەلاکردنی شەڕی براکوژیی نەگەیشتایەتە ساڵی حەفتا.

چەندین جار لەبەغداو لەسلێمانی کۆبونەوە لەگەڵ لای سێیەمدا، دەکرا. لەسەرەتادا لەسەر زۆر خاڵ پێکهاتبوین. بەڵام لەسەرنجامدا ئەوان لەهەندێ خاڵی گرنگ پەشیمان بونەوە..

ئێمە چەند خاڵێکمان کردبو بە بنەماو بەردی بناغەی سەرەتا بۆ دامەزراندنی رێکخراوێکی نوێ کە گرنگەکانیان:

- خۆ بەستنەوە بەو کۆنکرێتیو بەو توندو تۆڵییە بەمارکسیم- لینینیزم- بیرباوەڕی ماویەوە لای ئێمە پەسەند نییە.

- نابێت سەرجەمی ئەوانەی لە پ.ش.ك دا بون، ئێستا سەرلەنوێ لەم ڕێکخراوەدا کۆبکرێنەوە.

- ئەم ناوکە زەمینە دەبێت بۆ دامەزراندنی پارتییەکی شۆڕشگێر کە لەئایندەدا ڕۆڵی خۆی ببینێ.

- بۆیە دەبێت لەسەرخۆو لەماوەیەکی دورودرێژدا ئەو ڕێکخستنە بینابکرێتو بەنهێنی بمێنێتەوە، هەم بۆ ڕەخساندنی هەلو مەرجەکانو هەم بۆ ڕووبەڕوونەبونی ناوەخت لەگەڵ دژەکان..

- شۆڕشو بارزانی بەهەمو کەمو کورتییەکانیانەوە بەشێکی بزوتنەوەی نیشتمانیین، دوژمنی سەرەکی هەر ڕژێمی بەعسە.

- نابێت پەلە بکرێت لە هێنانە سەر شانۆی ئەم ڕێکخراوە نوێیە، لەبەر مەترسییەکانی دەوریو هەڕەشەکان..

- نابێت ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی پ.ش.ك لێپرسراوەتیی ئەم ڕێکخراوە وەربگرن.

ئەوان سوربون لەسەر راکانی خۆیان.. زیاتر لەوەش، بەهەڵپە پەیوەندییان بەخەڵکی هەمەجۆرەوە دەکرد، هەروەك ئەوانە لە دەستیان رابکەن یا نەوەك ئێمە پەیوەندییان پێوە بکەینو لەکیس ئەوان بچن! لەوەش خراپتر ئەوە بوو کە لەو سەرەتایەدا کە خۆیان بە خاوەن مەسەلەکە دەزانی تا ئەو رادەیەی کە برادەرانی ئێمە ناڕەحەت بکەن.

**ڕۆژێکی سەرەتای ساڵی حەفتاو دوو**

(ب.ح) دەچێتە لای شازادو داوای دەمانچەی لێدەکات کە گوایا ئیتر چەك کۆدەکەنەوە چونکە بە موڵکی ئەوان دادەنرێ، ئەمیش لێی تورە دەبێت و دەڵێ: ئێوە چین، بەهەموو حسابێك لایەنی خاوەن هەق و خاوەن ڕێکخستن هەر ئێمەین، بۆیە دەری دەکات...

دوای دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان، زوربەی برادەرانی گروپەکەی ئێمە لایان وابو کە ئیتر ئێمەش ڕێکخراوی خۆمان دابمەزرێنین. من رام وابو کە پەلە نەکەینو زیاتر هەلو مەرجەکان هەڵبسەنگێنرێن، چونکە مەزەنەی ئەوەم دەکرد کە کارێکی لەو بابەتانە بەئاژاوەو هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ سەر هەردوولا دوایی دێت. سەبارەت بەگەلێك هۆ..

لەگـەڵ ئەوانەشـدا پیـاو کەلێکدانەوەیـەکی بابـەتیی روداوەکـانو سـەرجەمی ناکۆکیو ململانێیەکانی ناو کوردستانو عیراقو ناوچەکەی دەکرد، دەگەیشتە ئەو باوەڕەی کە سەرەتایەکی وا بچوك لـەناو ئـەو نـاکۆکیو زۆرانبازییانـەو ئـەو هـەمو دوژمنانـەی دەوری داوە، مەحاڵـە بتوانێـت رۆڵـی کاریگـەر ببینێـت. چونکـە بـەپێی سروشتی رێکخراوەکەو ئەو هۆیانەی کە رەفزی هەمو کـۆنو داوای ئەلتەرنـەتیڤی نوێ دەکرێ، دەبوو ناساز یا ناحەز یا دژو ناکۆك بێت بەهەمو بووەکان..

لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە ئەوەی کە بوو بەبڕیاڕی چارەنوسسان، ئەوەبو کە لەگەڵ مام جەلال- دا نەگەیشتینە مەبەست.. بۆیە ئێمە لەناو خۆماندا مشتو مڕمان لەسەر ئاییندەی خۆمانو ئەو رەوتـەی ئـەوان دەکرد، تا بزانین چیـی بکـەین؟ لـەدوا کۆبوونـەوەمان لـەمانگی ئابی ساڵی حـەفتاو دودا لـەماڵی عومـەر فـەتاح دوابڕیاری خۆماندا: بۆ دروست نەبونی ململانێو ئاژاوە، ئەو کارە بۆ کۆمەڵەی دامەزراو بەجێ بهێڵرێت. ئـەو برادەرەش کـە دەیـەوێت لەگـەڵ ئـەو رێکخـراوەدا کـار بکـات ئـازادە لەپەیوەندی کردنو کارکردن، چونکە نزیکترین رێکخراو لەئێمە هەر ئەوە. ئیتر زۆر لەبرادەران لەگەڵ کۆمەڵە پەیوەندییان کرد، لەو سەردەمەو دواتریش چەند هەوڵدرا کە منیش کاریان لەگەڵ بکەم بەڵام بێ سود بو، بۆیـە تا هەرەسی شۆڕشـی ئـەیلولو بەرپاکردنەوەی شۆڕشی نوێی کوردستان خۆم لەو رێکخراوە گۆشەگیر کردبو. وەك لەبیرشم مابێت ئەو برادەرانەی هاوبەش بوون لەو بڕیاری چارەنوسسازەدا: جەباری مەلا محەمەد. حەمە چاوشین، حەمە سابیر، شازاد سائیب، عومەر فەتاح و بەندە..

میوانێکی پاكو خاوێن

کات بووە عەسرێکی کـەمێ درەنـگ.. کە دەرگا کردنەوە رایچڵەکاندمو وامزانـی بانگ دەکرێم. یـەکێك کـرا بـەژورداو دەرگاکـە داخرایـەوە. کوڕێکـی تەمـەن نزیـك بـە سیی سـاڵ یـان کـەمتر، باڵا بـەرزو گـەنم رەنگـی مەیلـەو سپیی بـەجلو بـەرگدا زیـاتر لەخەڵکی شارۆچکەیەکی سلێمانیی دەچێت. لەسەرخۆ هەنگاوی رووەو لای دیواری بەرامبەر دەرگاکە نا، نەگەیشتە دیوارەکە لێـی دانیشت، دوای سـەلامو وەڵامەکەی.. زۆر سـەرنجم لەسـەر روخسـاری چڕکـرد، لەشـێواو نـەدەچوو، بـەجلو بـەرگو پـاكو تەمیزیدا هەر بەوە دەچوو کە ئێستا هێنرابێت. کە سەری هەڵبڕی لێم پرسیی نـاوت چییە؟ گوتـی حەمـە سـەعید. خـەڵکی کوێیت؟ دەربـەندیخان. کـەی گیراویت؟ دوێنـێ ئـەمڕۆش هێناومیـان بـۆ ئێرە.. خێره..؟ هیچـی وا نییـە بەشـوبهە گـیراوم. دەمـەزێ لەسـەر ئـەم پرسیارانە بەردەوام بم تا بوار بـەو نـەدەم بکەوێتـە پرسیار، چونکـە بـە هەقو ناهەق من حسابی پیاوباشی بۆ ئەم جۆرە میوانانە ناکەم. رەنگە ئـەوە جۆرێ

لەناهەقیی بخولقێنێت. بەڵام بۆ من هەر واباشە کە ئەوە بیروبۆچونم بێت. لەهەردو حاڵەتەکەشدا بەرامبەرەکەم هیچ زەرەر ناکات.

< کاکە شوبهە لەچیی؟

- لەسەیارە، سەیارەکەی من بەهی یەکێکی تر تێدەگەن کە کاری دژ بە حوکمەتی پێکراوە..

< یەعنی سەیارەکەت شوبهەی لێدەکرێ نەك خۆت..؟

- بەڵێ بەڵێ، هیچ گومانێکیان لەخۆم نییە.

< دەی کەوابو هیچ نییەو هێندە نابات دەردەچی. لەدڵی خۆشمدا دەمگوت چۆن هیچ نییە ئەگەر وابێتو ساغ بکرێتەوە کە وایە وا چوار پەلی لەمێخ دەدەن، کەمێك هەڵوێستەم کرد تا بزانم چی پرسیارێکی تری لێبکەم. ئەو هەڵی دایەو کەوتە ئەو جۆرە پرسیارانە، منیش کورت وەڵامم دەدایەوە.. هەروا سەعاتە وەختێکی نەبرد کە دیسان دەرگاکە کرایەوەو بانگیان کرد. نیو سەعاتێکی نەبرد هاتەوە.. چاوەڕوانی پرسیاری من بو، منیش وام نیشان دا کە هیچ نەبوەو بانگیش نەکراوە.. ئەو سەرنجێکی لێدامو گوتی: باشە مامۆستا تۆ دەڵێیت لەسەر هیچ گیراومو هیچم نەکردووە، ئەی بۆ وایان لێ کردویت..؟

< منیش هەروەکو تۆی لێدەزانم.

- چۆن..؟

< چاك.

- وەڵڵاهی غەدرێکی گەورەت لێدەکەن..

< ئەی برا غەدر لەمە گەورەتر هەیە! بەڵام سەرەنجام بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو غەدرەیان لێکردوم.

- یەعنی بەرەڵات دەکەن؟

< ئەی چیم لێدەکەن قابیلە لەخۆڕایی ئیعدامم بکەن!

- لەخۆڕایی چیی، جا بۆچیی ماوێتی پێت بکەن! خۆ ئیعدامەکە باشترە لەو حاڵەتە.. پاش ماوەیەکی کەم گوتی: مامۆستا لەوە دەچێت هەر ئەمڕۆ من بەربدەن، ئێستا بۆ ئەوەیان بانگکردم. گوتم خێری پێوەیە. گوتی ئەی ئیشێ کارێ راسپاردەیەکت نییە؟ گوتم نەوەڵلا کاری چیی؟ گوتی خۆمن بەسلێمانیدا تێپەڕ دەبم، بۆ من زۆر ئاسانە، هەر قسەیەکت هەیە بەسەر چاوو بەسەر سەر. ئەی پارەت لازم نییە؟ گوتم پارە بۆچی باشە، لێرە لای ئێمەمانان پارە نرخی نەماوە چونکە هەزاران دینار یەك جگەرە ناهێنێت کە نەفەسێکی لێبدەیت. گوتی حەزت لە جگەرەیە. گوتم زۆر، خۆ لێرە پیاو جگەرەش نابینێت. چونکە ئەوە لێرە وەك هەمو

شتێکی تری ژیان قەدەغەیە.. دەی باشە مامۆستا راسپاردەیەکت هەبو..؟ نە کاکە نەء. دەی حەز دەکەیت هەرچی سوێندی پیرۆز هەیە بۆت دەخۆم کەچیی بڵێیت وەك خۆی دەیگەیەنم. منیش بەخۆمم دەگوت: ئیلحاحی ئەم میوانە زۆر خۆشە، پێدەچێت هەر ئەوەش رۆڵەکەی بێت، نە کاکە خۆ من دەزانم تۆ پیاوێکی باشیت، دەزانم دەیگەیەنیت. خۆ ئەگەر هەر زۆرت پێخۆشە خزمەتێکم بکەیت، وەك دەڵێیت، وا برایەکی دوکاندارم هەیە، ناوی رەئوفە،هیچ نابیستی، پێی بڵێ کە براکەت باشەو لە کەرکوك گیراوە. گوتی باشی چیی! گوتم کاکە تۆ ناتەوێت خزمەتم بکەیت، من لەوە زیاتر هیچ قسەیەکم نییە. خۆ ئەگەر ویستت زیاتری پێ بگەیەنیت، وابڵێ خۆشتان دەزانن کە لەسەر هیچ گیراوە هیچیشی لەسەر نییە، لەبەر ئەوە مەترسن هەر بەردەبێت. زۆریش سوپاست دەکەم کە ئەو زەحمەتییەت دەدەم. مەبەستم لەباسی جگەرەکەش هەر بۆ ئەوەیە تا بەخاڵێکی گرنگی لاوازیی دابنێن. ئەگینا ئەشکەنجەو ئەو ژیانە سەختە وایان لێکردبوم کە هەر بیریشی لێ نەکەمەوە. هەر دەڵێی جگەرەکێشیش نەبوم.

نیسکێنەو نانی ئێوارە هێنرا.. دیارە ئەم ئێوارەیە وەك ئێوارانی تر نییە، سەمونێکی زۆرو نەرمو نییانیشی لەگەڵە..

دنیا تاریك بوبو. گوتم دیارە ئەمشەو دەمێنیتەوە..؟ گوتی نا نا بڕوا ناکەم، چونکە من هیچ نیمو هەر بەخۆڕایی بۆ ئێرەیان هێناوم.

کات دەمەو نوێژی خەوتنان بو کە زرەی قفڵو دەنگی دەرگاکردنەوە بێ دەنگییەکەی نەهێشتو کوڕەیان بانگکردو ئیتر نەمبینییەوە. گومانیشم لەوەدا نییە کە شوێنەواری راسپاردەکە هەر لای رەئیسو خۆی دەمێنێتەوە..

ونبونی میوانە کاتییەکەو بیرکردنەوە لەو رۆڵانەو لەسەرەنجامی لێکۆڵینەوەکانو ئەگەری ئەو پرسیارانەی دەیکەنو جۆری وەڵامەکان، رایانکێشامەوە ناو روداوەکانی رابوردوو. بەتایبەتیی ئەوانەی کە لەوانەیە لێرەدا سەرهەڵبدەنەوەو کە لەکاتی خۆیدا دژایەتییەکی ئاشکرای رژێمو حیزبەکەی تێدابوە.

لەکۆنفرانسی تیماردا (٢٨- ٨- ١٩٦٦) لەپاڵاوتنمدا بۆ ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی، مام جەلال، لەگەڵ باسکردنی لایەنی پۆسەتیڤی رۆڵی من، تا بەشداران دەنگم بۆ بدەن، گوتی کاك مەحمود ئازادە کە نەك هەر پارێزگاریی لەراو هەڵوێستی خۆی بکات، بەڵکو لەناو رێکخستنیشدا باسی بکات.. راکانی منیش دژ بەهاوکاریی میریو خەتی راپەڕینەکە بو کە بەرامبەر بارزانی کراو ناچار بوم کە تا ئەو کۆنفرانسە خۆم لەسیاسەتیش دوربخەمەوە، ئەو دژ بوونەش لەراستو دروستیی رێبازەکەی بارزانیی نەبوو، چونکە سەرچاوەی زۆر لەهەڵەو روداوە وەرچەخێنەرەکان لەمو لەبالەکەی ئەمەوە خولقان.

هاوبەشیکردنەکەشم لەکۆنفرانسەکەدا بەدەر لەخواستی خۆم بو.

ئەو قسەو بۆچونەی مام جەلال دژ بە بیروپیڕوی ڕێکخستنە ستالینیزمەکان بوو، کە لە راستیدا دنیای حیزبایەتیی ئەو سەردەمانەی گرتبۆوە..لەدەری بازنەی پرنسیپەکانی پیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆو، دیموکراتییەکی دەری ئەڵقەی ناوەندیتیی دیموکراتی بووکە تا ئێستاش لەرێکخراوو پارتییەکانی ولاتانی تازەپێگەیشتودا تارمایی دیکتاتۆرییەتی کەمایەتییە بەسەر زۆرایەتیی و کەلەپچەکردنی دەنگی ئازادە لەناو ڕێکخستنەکاندا.

سەرئەنجامیش هەرچەند لەدژی هەڵبژاردنم قسەم کرد بەلام بەهۆی قسەکانی مام جەلال- ەوە کە بە مەبەستی هەڵبژاردنم دەیکرد هەڵبژێردرام. بە لێپرسراوی لقی پێشمەرگە دانرام. کە لە دوکتور حەمەی مەمەند. مام ئەحمەدی دادی، جەبار مەلا محەمەد، وابزانم حەمید سوری پێکهێنرا... بێ ئەوەی ئامادەی کۆبونەوەکانی (ک.ن) ببم. دواجار نەبێت کە بۆ سازکردنی بەستنی کۆنگرەی کەلار (هاوینی١٩٦٧) هاوبەشیم کرد.

لەو کۆبونەوەیەشدا دیاردەی ناکۆکی لەسەر ستراتیجی خەباتو ڕێبازی بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردستانی عیراق لەنێوان دوو قوتبە سەرەکییەکەی مەکتەبی سیاسیی دەرکەوت:

هەرچی مام جەلال بو، بڕوای تەواوی بەبرایەتیی خەباتیی هاوبەشیی کوردو عەرەب هەبو، لەو بڕوایەدا بو کە بێ ئەوەو بێ خەباتی یەکگرتووی هێزەکانی کوردو عەرەب، بە ئامانج گەیشتنی کورد لە کوردستانی عیراقدا مەحاڵە.

هەرچی سکرتێری پ.د.ك (باڵی م.س) م. برایم ئەحمەد بو دەیگوت: ئەگەر یەکێتیی کورد بدەنە دەستمو ئەو یەکتییە لەئارادا بێت وا بەتاپریش مافی کورد دەسێنم. ئیتر مشتومڕەکە زۆری خایاند بێ ئەوەی کەس هاوبەشیی تێدا بکات، لەدواییدا وا توند بوو کە مام جەلال لەناو هەڵچوونو تووڕەییدا کۆبونەوەکەی بەجێهێشت.. منو چەند برادەرێك بەتکاو ڕجا هێنامانەوە ناو کۆبونەوەکە.. بە تایبەتی ئێمە ئەومان بە رابەری خۆمان هەڵبژاردبوو..

لەکۆنگرەی کەلاریشدا (هاوینی١٩٦٧) بێئەوەی خۆم رام لەسەر بێت، زۆر لەبرادەرانیشم رازیی کرد کە دەنگم بۆ نەدەن هەڵم نەبژێرن چونکە ئەگەر هەڵیشبژێررێم کار ناکەم. لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر پالاوتنی سکرتێری پارتییەکەمان بە ئیحتیاتی (ک.ن) هەڵبژێردرامو دوای یەك مانگ ئاگادارکرام کە بڕیاردراوە ببمە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیو ئەندامی دەستەی نوسەرانی رۆژنامەی "النور" بەلام وەلامم دایەوە کە ئامادەی ئەو لێپرسراوەتی هەڵگرتنە نیم. ئەوەش هەر لەو هەڵوێستەوە بو کە دەبێت رابەرانی خەتەکە خۆیان ڕێبازەکە بەئەنجامێك بگەیەنن.

دیسان لەپلنیۆمی کەلار (جولای ١٩٦٨- چەند هەفتەیەك پێش ئەوەی بەعسییەکان بێنەوە سەر حوکم، پرسیارێك دەربارەی: لەحاڵەتی گۆڕانێکی سیاسی لەحوکمدا دەبێت هەڵوێستمان چۆن بێت؟ خرایە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە، بەوەش مەزەندەی رودانی کودەتایەکمان دەکرد کە برادەران ئاگادارن، کۆی بۆچوونەکان لەوەدا یەکگیر بوون کە بەپێی هەڵوێستی فرمانڕەوا نوێیەکان لەمافەکانی کورد هەڵوێست وەربگیرێت..

ئێمە بۆ ئەو پلینیۆمە خۆمان ئامادە کردبو بۆ هەوڵدان بۆ گۆڕان لەو پێکهاتەو ڕێبازەی ڕێکخستنەکە، کە گۆڕانی لەو بارودۆخە وەستاوە بەزیانەدا بکات‌و بەلایەکدا بخرێت..

لە پلینیۆمەکەدا، نەخشەیەکی لێکۆڵراوەمان هەبوو بڕیار بوو ئەنجام بدرێ، یەکێك لە هەنگاوەکانی: بەدەر لەعورفی ڕێکخستن‌و حیزبایەتی، ڕاپۆرتی لقی سلێمانی- مان کرد بەشێوە بەیان. بەڵام کە ڕاوێژمان بەروشدی عەلی شەریف کرد کە لای ئێمە خۆشەویست‌و پەسەند بو، بەوە ڕازیی کردین کە ڕاپۆرتەکە هەر بخوێندرێتەوە بەبێ دابەشکردن.

کە خوێندرایەوەو قسە لەسەر هەڵەو لایەنە چەوتەکان کرا، نکولیکردنی م.س لەوانەو پێداگرتنی لەسەر پێچەوانەکان، مشت‌و مڕی وا گەرم کرد کە من‌و نەوشیروان مستەفا وەك دەربڕینی ناڕەزایی، کۆبونەوەکەمان بەجێهێشت تا برادەرانی هەولێرو کەرکوك‌و سلێمانی هاتن‌و گوتیان چۆن ئێمە بەجێ دەهێڵن. یان هەمومان دەربچین یان ئێوەش دەبێ بێنەوە ناو کۆبونەوەکە..

هەر پێش کۆبونەوەکانی پلنیۆمەکە یەکێك لەو ئەلتەرنەتیڤانەی ئێمە لەناو خۆماندا باسمان کردبوو، ئەگەر نەتوانرێت گۆڕان بکرێت واجیابونەوەو پچڕان لە ڕێکخستنەکە چارەسەرێکی ترە، چونکە گەیشتبوینە ئەو باوەڕەی کە، بۆ ئێمە، ئەوە تاکە چارەسەری کێشە کوشندەکەی شەڕی ناوخۆیە. بەڵام زوربەی برادەران ئەو کارەیان بەباش نەدەزانی. ئیتر تا کۆنفرانس‌و کۆنگرەی تایبەت بە بڕیاردان لەسەر چارەنوسی پ.ش.ك دوای ڕێککەوتنەکەی ئازاری حەفتا، ئێمەی لقی سلێمانی هەوڵی تەواومان لەسەر دوو ئامانجی گرنگ چڕ کردبو:

یەکەم: گۆڕان‌و ریفۆرم لە ڕێکخستنەکەدا (دوای بەیانی ئازاریش، بوو بە: هەڵوەشان‌و دامەزراندنی ڕێکخستنێکی نوێ).

دووەم: یەکگرتنەوەی ریزەکانی شۆڕش. بەڵام ئەوە هەر خواستێکی یەك لایەنە بوو چونکە بارزانی بە تەسلیم بونەوە، زیاتر بەشتی تر ڕازی نەدەبوو.

دیموکراسیەت و رای بە کۆمەڵ و رێکخستنی دوور لە زۆر و هێز لای ئەو نامۆو نەفرەت لێکراو بوون.

بەبۆچوونو لەناو لێکدانەوەکانمدا، جەوهەری ئەو هەڵوێستانە لەو دیدو بۆچونانەوە بو کە:

- رژێم و حوکمە جۆربەجۆرەکانی عیراق، ئامادەنین سادەترین مافی رەوای کورد بسەلمێنن. بەردەوام بەهەمو جۆرە چەکێکیش لەدژی کاردەکەن.

- بەردەوامیی شەڕی ناوخۆ نامانگەیەنێتە ئامانج، بۆیە دەبێت بەهەر شێوەیەك بێت کۆتایی پێ بهێنرێت.

- بەهۆی هاوکاریی بارزانی لەگەڵ ئێران، ئامادەیی بۆ داشکان بۆ رژێمی بەغداو هاوکاریکردنی بەمەبەستی تێکشکانی باڵەکەی مەکتەبی سیاسیی، هاوپەیمانیی زۆر لەتیرەو هۆزەکان، هاوکاریی حیزبی شیوعیی عیراق بەهەردوو رێبازەکەیەوە: قیادە مەرکەزیو لیژنە مەرکەزی لەگەڵ بارزانییو پارتییەکەیدا، کەسێتیی بارزانی خۆشی.. تاد، ئەمانە ململانێیەکەیان لاسەنگو نابەرابەر کردووەو دەبێت دەربازگەیەکی تری دوور لەشەڕ بدۆزرێتەوە بەتایبەتیی رژێم سود لەشەڕی ناوخۆ وەردەگرێت، پەرەی پێدەدات تا کێشەکە لەدژی کورد کۆتایی پێ بهێنێت.

- ئەگەر ریفۆرمو گۆڕان لەو باڵەدا نەکرێت، چی لەڕووی ئایدۆلۆجیو چی لەروی سەرکردایەتیو سترەکتوری رێکخستنەکەوە، وا ناتوانرێ کاروانەکە بخرێتە سەر رێبازی دروستی خۆی. جیاوازییەکانیش لەگەڵ باڵەکەی بارزانیدا بەناسەرەکیی دەمێنێتەوە، بەتایبەتیی پێکهاتەی خێڵەکیی سەرکردایەتییەکەی پارتیی کە بنەماڵەی بارزانییەو رۆڵی بڕێنەرەوەو چارەنوسسازی تێدا دەبینێت، وەستاوو بێ گۆڕانە، مەحاڵە رێگەش بدەن سەرکردایەتییەکی نیمچە بەکۆمەڵیش بێتە ئاراوە.

رۆژێکی کۆبونەوەکانی کۆنفرانسی ساڵی حەفتا بۆ لابەلاکردنی چارەنوسی باڵەکەی مەکتەبی سیاسی کە تا کۆنگرەی هەڵوەشان هەر بەپارتی دیموکراتی کوردستان ناودەبرا، لە (الحبانیە)، بۆ باسی مەرجەکانی رێککەوتن، مشتو مڕێکی توند لەسەر مەسەلەی رێککەوتنەوە رویدا خاڵی وەرچەرخێنەر لە رەوتی قسەکاندا هاتبووە سەر راژەی ئەندامانی لقو لیژنەی ناوچەکان کە بۆتێکەڵبونەوە قسەی لەسەر دەکرا، هەرچی مەکتەبی سیاسیی باڵەکەی بارزانی بو پیی لەسەر سێ یەك داگرتبو. بەرەی مەکتەبی سیاسیش سوربوو لەسەر نیوە بەنیوە.. خەریك بوو باسەکە لەوێداو لەسەر ئەوە بوەستێو ئومێد بەرێککەوتنەوە نەمێنێت، بەتایبەت لەسەردانی حاجی هۆمەراندا کە نوێنەرەکان چوبون، هەڵوێستی خراپو زۆر ناحەزانەی ئەو لێپرسراوانە بۆ گفتوگۆ دانرابون، مام جەلالو برادەرانی تری زۆر

ئیزعاج كردبو، تەنانەت بەدانیشتنی بێ ئەدەبانەو بایەخ نەدان بەبرادەرانو بەپرۆسەكە. كە زیاتر بۆ تێكدانی رێككەوتنەوە بو، چونكە لەكورسیەكانی خۆیان دەترسان، بەتایبەتیی زۆریان سودیان لەو بۆشاییە وەرگرتبو كە شەڕی ناو خۆ لەباڵەكەی بارزانیدا خوڵقاندبوی.

من هەڵمدایەو گوتم: لەراستیدا جۆری موناقەشەكە لەسەر مەبەستەكە بەو جۆرە هەڵەیە. چونكە پێشەكی‌دەبێت ئەسڵی باسەكە وەك مەبدەئو وەك ئامانجو مەبەستی سەرەكییو ناسەرەكیی بخرێتە بەرباسو مشتومڕ، واتە ئایا رێكەوتنەوە لەگەڵ بارزانیو پارتیدا، ئایا لابەلاكردنی شەڕی براكوژی، بۆ كوردو شۆڕش باشو بەسودن یان خراپو بەزیانن؟ ئەگەر بەلامانەوە خراپو بەزییان بن وا ئەم مشتو مڕە لەسەر ئەو مەرج و مەرجكارییانە هەموی زیادەن. خۆ ئەگەر باشو بەسودبن وا پێداگرتن لەسەر مەرجێ كە لابەلاو ناسەرەكی بێت، لەگەڵ خودی رێككەوتنەوە كەو بەرژەوەندیی میللەتدا ناگونجێت. جا دەبێت كارەكە بەو جۆرە سەیر بكرێت.

لەراستیشدا یەكگرتنەوە زیاتر پەیوەندیی بەبڕواومتمانەوە هەبو، وەك لەشتێكی تر. چونكە ئەو گریمانەش لەبەردەمدا بوو كە دوای رێككەوتنەوە جڵەوی سەركردایەتیی لەهەموو بارێكدا هەر بەدەست بارزانییەوە دەبێت، كە ئەگەر بیەوێت وا دەتوانێ چی بوێت بیكات، چەند دەستكەوت بدات بەو لای دووەمە، وردە وردە هەموی زەوت بكاتەوە..

لەلایەكی تر ئەوەی بۆ ئێمە گرنگو هەستییار بو: نەهێشتنی شەڕی براكوژی بو، هەڵوەشانی رێكخستنەكەمانو دەستكردن بەبینای رێكخستنێكی نوێ بو كە داروپەردووەكەی گەلاڵە بو.

برادەرانی مەكتەبی سیاسی. بەوە نارەحەت بون، گەلێ قسەیان كردو برادەرێكیان گوتی: كاك مەحمود دەیەوێت بەبێ مەرجو مەرجكاریی تەسلیمی مەلا مستەفا ببینەوە. گوتم مەسەلە تەسلیم بونو تەسلیم نەبون نییە. ویستم لەسەر قسەكان بەردەوام بم بەلام سمكۆ فەتحوڵڵاو مەلا رەئوف كە لەناوەراستیاندا دانیشتبوم دەستیان گوشیمو چرپاندیان بەگوێمدا كە ئیتر پێویست بەوەلامدانەوە ناكات. دانیشتنی هەمومان لەسەرجەمی كۆبونەوەكاندا لەسە زەویی بوو.

دوای كۆبونەوەكان، لەسێبەری باخەكانی گازینۆكەی حەببانییەدا هەر چەند كەسێكمان لەدەوری مێزێك دانیشتنو دەستمان بەبیرە خواردنەوە كرد. عەلی عەسكەری بەپێكەنینە ئاساییەكەی خۆیەوە هاتو ویستیی قسە لەسەر ئەو بەگژاچونەوەیەی م.س بكات، هەڵم دایەو گوتم دەی هەڵوێستی مەبدەئی هەر دەبێت وابێت كە بێدەنگی بێت. قاقایەكی لێداو گوتی من خۆم بۆ دواشەڕ هەڵگرتووەو

جارێ وەختی ئەو شەڕە نییە. ئەو لەهەمو کەس زیاتر لەگەڵ ڕێککەوتنەوە بو، بەڵام لەسەرەتادا خۆی لەداوی ئەم جۆرە مشتومڕانە نەدەدا. ڕەنگە ئەوەش هەر شوێنەواری ئەو ناکۆکییەی نێوان ئێمەی لقی سلێمانیو ئەوبوبێت (١٩٦٩) بەهۆی بزێویی پێشمەرگەکانییەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە لێپرسراوەتییەکەی لەسلێمانیی گوێزرایەوە.

من بۆخۆم عەلی عەسکەریم لەهاوینی ١٩٦٣دا ناسیی. ئەو سەردەمە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوم، نەوشیروانی فوئاد مەستیش لێپرسراوێکی بەتواناو دڵسۆزو لە خۆبوردووی پێشمەرگە بو، لەو هاوینەدا هێرشی سەربازیی بۆ سەر ناوچەی مەکتەبی سیاسیی‌و چەمی ڕێزان گەرم بوبو، بۆ کەمکردنەوەی گوشار لەسەر ئەو ناوچانە چەند بەرەیەکی شەڕیان کردەوە، بەتایبەتیی لەهەڵەبجەو گەرمیان‌و دەربەندیخان‌و قەرەداغ‌و پێنجوێن. عەلی عەسکەری سەرپەرشتیی نەخشە چالاکییە سەربازییەکانی دەکرد، بەچونە ناو هەڵەبجەشەوە، بەمانەوەی چوار شەوو چوار ڕۆژ تێیدا. ئەوە سەرەتا بو بۆ ناسین‌و شارەزا بون لەئازایەتی‌و ڕووخۆشی‌و بزۆزیی عەلی عەسکەریی..

لە ڕۆیشتنیدا، قالە هەویەو هەندێ پارەی بەجێهێشتبو، منیش ئەوەم بەهەلێك زانیی تا بەهۆی ئەوانەوە سۆراغی ژورەکە بکەم‌و بزانم بۆچونەکەم ڕاستە یاننە!

سەرەتا قسەم نەکرد، وام لێکدایەوە کە ئەوەی بەئەنقەست کردوە یان ڕەنگە بهێنرێتەوە، بۆیە ئەوانەی لەگەڵ خۆی نەبردووە.

دوای کارە ڕۆتینییەکانی پێنجەم ڕۆژی ئەم تاکزیندانەم لەهەڵسان لەخەوو چونە سەر ئاودەست. هەر لەنان خواردن بومەوە. تەقەم لەدەرگا کە هێنا. حەرەس نەڕاندی: ها چیت دەوێت؟ کە قسەکەم پێ گوت دەرگاکە کرایەوەو گوتم: ئەم شتانە لە قادر محمد مەلا نادر بەجێماون، ئەو ئێستا لەژوری ژمارە یەکە، بەڵکو بیاندەیتێ.

پاسەوانەکە شتەکانی لێوەرگرتم‌و دەرگاکەی داخستەوە.. زۆری نەبرد دەنگە دەنگ‌و ئینجا زرم کوتی ئەشکەنجە دەستی پێکرد، هاوار هاوارو گریان بەرز بوونەوە.. زۆر بەسەر ئەو دیمەنە بەدەنگەدا ڕانەبورد کە دەرگاکەیان کردەوەو بانگیان کردم.. وەك هەمو جارەکانی تر چاویان بەستمەوەو سۆندەیان دایە دەستم‌و بەدوای خۆیاندا بردمیان. چەند ئەمسەرو ئەو سەرێکیان بەناو هاوار هاوارو گریانەکاندا پێکردم. بۆ ئەوە دەچوم کە ڕەنگە پرسیاری جۆری زانینی شوێنی قالەم لێ بکەن. چونکە ئەو ئاماژەکردنە ڕاستەوخۆیە بۆ ئەوان جێگەی پرسیارە! یەکێکیان گوتی:

دەی ئێستا دەڵێی چیی قسە دەکەیت یان دەست پێبکەین..؟

من گوێی خۆمم لەپرسیارەکە کەڕ کردو بێدەنگ مامەوە.

ئینجا دەنگی رەئیسی هەیئە هاتە گوێم کە دیار بو بەرۆیشتنەوە رووەو لای من دەهات، تا نزیك بووەوە ئەوسا گوتی: ئێستا دەڵێی چیی قسە دەکەیت یان.. نەختێك وەستاو ئینجا لەسەر قسەکەی بەم جۆرە بەردەوام بو:

- ئەری بوتڵەکە، بوتڵەکە.. کرا..؟

یەکێکیان وەڵامی دایەوە: نا سەییدی، خۆت نەتفەرمو جارێ بەکاری مەهێنن!

- نا نا ئەو کاتە وام دەزانی قسەمان بۆ دەکات، وا ئێستا خۆی ئەوەی بەخۆی حەڵاڵ کردووە! بیبەنو خێرا دەرخواردی بدەن. ئیتر دەنگی نەما. ئەمەیان چیی رۆژێکە! کامە بوتڵی مەبەستە بۆ پاشەوە،بۆ پێشەوە.. یان بۆ ژێرەوە؟ هەرسێکیان کوشندەنو لەژێر دەرچونییان مەحاڵە.

> گوتم دەی باشە زۆرم پێخۆشە بمکوژن، دەبمکوژنو خوێنم حەڵاڵتان بێت.

یەکێکیان هەڵی دایەو گوتی:

- ئێی ئێمەش هەروا دەکەین، بەڵام بەیەك جار نا، بەو جۆرەنا کە تۆپێت خۆشە. بەڵکو بەو جۆرە کە خۆمان پێمان خۆشە! نەخشەی ئێمە کوشتنی لەسەرخۆی ژێر ئەشکەنجەیە، سێدارەو گوللەباران بۆ تۆ نییە، چونکە: زوو، ئاسان، لەئازارێکی کورتخایەندا دەمریت.. ئێمە ئەو جۆرە کوشتنە ئاسانەمان پێ باش نییە! دەی تۆ جارێ کامە بوتڵت پێخۆشە؟

> خۆم لێ هەڵە کردو گوتم: بوتڵی چیی؟ یەکێکیان گوتی:

- بوتڵی ویسکی! ئەی چۆن تۆ میوانی عەزیزو خۆشەویستی ئێمەیت. بوتڵە ویسکیمان بەمەزەی خۆشەوە بۆ ئامادە کردویت، تۆ ئەمشەو دەعوەتی ئێمەیت. بەڵام لەبری ئەوەی لەسەرەوە بیخۆیتەوە، ئێمە لەژێرەوە پێتدەخۆینەوە. لەبەر ئەوەش کە تۆ لای ئێمە زۆر خۆشەویستیت، لەباتی ویسکییە کە ئێمە بوتڵەکەت لەژێرەوە پێ هەڵدەگرین. لەزەت لەوەدایە. بۆ تۆ نازانیت بوتڵی تریش هەیە؟ خۆم نەکرد بەخاوەنی وەڵام لەسەر ئەو قسانەو بێ دەنگ مامەوە. بۆیە قیژاندی بەسەرما: ئەوە بۆچی وەڵام نادەیتەوە؟

> گوتم بەڵێێێ!

- بۆ تۆ نازانیت چەند جۆر بوتڵمان هەیە؟

> ویسکی زۆر چەشنیان هەیە! یەکێکیان تێسرەواندم، بەجنێوەوە یەکێکیان گوتی: ئەوە گاڵتەمان پێدەکەیت..

> نا من هیچم نەوتووە، کێ دەوێرێت گاڵتە بەئێوە بکات..

- نەوعەکەی تریان لەمیان خۆشترە.. رایدەکێشێت، درێژی دەکات، نەزۆکت دەکات.. خۆ رەنگە هەر لەبندا دەری بێنێت.. قسەکانی ئەکرەمی حەپسەم وەبیردەهاتەوە..

- بەڵام هی سێهەم، ئەوەخۆت درێژ دەکات، هەروەك بەگوێچکە هەڵتبکێشن ئاوات لێ دێت..

لەنزیکیشەوە گوێم لەدەنگی رەئیسی هەیئە بو دەیگوت: ئەوە بزانن ئەمە دەرچونی نییە ئەگەر قسەمان بۆ نەکات، دەزانن بۆچیی؟

یەکێکیان گوتی: بۆچی..؟ گوتی:

- ئەمە لێپرسراویانە، تێکدانەکانی سلێمانی لەژێر سەری ئەماندایە. ئەم ئاگاداری تێکدانەکانی هەمو ناوچەی حوکمی زاتییە! ئەوانەی لەگەڵیدانو دەیناسن هەموویان ئیعتیرافیان کردوە کەچی ئەم خۆی دەڵێت من هیچ نیم.

بەرەبەرە دەنگەکە دوور دەکەوێتەوە، دوا رستەی: ئەمانە هەر بۆ کوشتن باشن! ئیتر دەنگەکە نەما.

جگە لەدەنگی پۆستاڵ کە بە کۆنکرێتەکەدا دەدرا هیچی ترم نەدەبیست.. پاش ماوەیەك ئەوەش نەما.

زۆری نەبرد تەقەیەکی گەورە رایچڵەکانم، زۆر بەهێز تەنەکەیەك بەئەرزدا درا، وامدەزانیی ئەوە بۆمبای فرۆکەکانی ئێرانەو ئەو شوێنانەی پێ تەمێ دەکرێت. راستەوخۆ دوای ئەوە یەکێکیان گوتی:

- رەئیس دەڵێت بوتڵەکان دوابخەن بۆ سبەینێ، با ئەم فرسەتەشی بدەینێ.. ئەوسا بردیانمەوە بۆ ژورەکەم.

ئەم دواخستنە هەواڵێکی خۆش بو، گەرماییەکی خۆشی بەلەشە ساردەوە بووەکەم بەخشیی. هیچ نەبێت مەینەتییەکە دواخرا، بۆ سبەینێش هەر خوا کەریمە!

تاوانەکان گەورەن، دیارە هیچ زانیارییەکیشیان نییە! دەیانەوێت، بەکاتیش بێت، یەکێك یان چەند کەسێك بکەنە قۆچی قوربانی لەناو ئەو فەلاکەتانەدا، ئەم چرپی ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەیە زیاتر بەلای ئەوەدا رامدەکێشێت کە مەزەنەی ئازاد نەبون بکەم. بارەکەم سەختتر دەکەن. خۆمم لێدا بەسەر جێگەکەدا. لەئازارو کەنەفتیو ناساغیو ئەوبێئومێدییەدا مێشکم وروژاوەو زیاتر وەنەوزو خەو دەتۆرێنن. ئەوەش بەرەو بیرکردنەوە لەهۆکارەکانی ئەم نەهامەتییانە راپێچیی کردم بۆ بەسەرهاتەکانی سەردەمی سەرەتای شۆڕش..

یەکەم تاقم کە دوای تێکشکاندنەکەی هەردوو دەربەندیخانو بازیان (٩- ١١ ئەیلولی١٩٦١) کە فرمانی گرتنیان بۆ دەرچو، یەکێکیان بەندەبو. چونکە

لەمانگرتنەکەی شەشی ئەیلولی ئەو ساڵەدا لە سلێمانیی، وەفدێك پێکهێنرا تا داواکارییەکانی مانگرتووەکانی سلێمانی بگەیەنێتە دەست کاربەدەستان منیش وەك نوێنەری قوتابیانی زانکۆ، ئەندامێکی وەفدەکە بوم، کە بەلێپرسراوەتیی جەمال شالیی پارێزەرو خاوەنی گۆڤاری (رۆژی نوێ)ی داخراو رێکخرا.

دوای چوون و داوا پێشکەشکردن، موتەسەریفی سلێمانی (کە تا ئەو کاتەو دواتریش هەر ئەو ناوە بەکاردەهێنرا) گوتی ئەم داخوازییانەو جێبەجێکردنیان لەدەسەلاتی من بەدەرن، بۆیە دەبێت داواکەتان بگەیەنمە لێپرسراوانی بەرز لەبەغدا.

کە هاتینە دەرەوە، گەیشتبوینە سالۆنی خوارەوەو بەرەو حەوشەکە دەرۆیشتین، یەکێك بانگی کردین‌و گوتی:

- ئێوە ناوەکانتان نەنوسیوە، دەبێت ناوتان بنوسرێت تا بزانرێت کێ داواکەی پێشکەش کردووە.

ئێمەش ناوەکانمان نوسی‌و ئیمزامان کرد.

راستەوخۆ دوای روداوەکەی هەردوو دەربەند، ئاگادارکرام کە فریای خۆم بکەوم چونکە فەرمانی گرتنی ئەندامانی وەفدەکە دەرچووە. منیش خۆم گەیاندە (ئەزمڕ) چونکە مام جەلال لەوێ بو، روداوەکانم بۆ باسکردو گوتم دەمەوێ بێمە شاخ. دوای کەمێ قسە، گوتی:

< ئێستا رێکخستنی بەغدا پێویستی بەئێوەو مانان هەیە، تۆش یەك ساڵت ماوە زانکۆ تەواو بکەیت، بچۆ هەم کار لەبەغدا بکەو هەم خوێندنەکەشت تەواوبکە. بڕواشم وایە لەبەغدا ناگیرێیت، بەلام لەسلێمانی مەمێنەرەوە. چەند هەولمدا کە بمێنمەوە، بێسود بو. ئیتر بەرەو سلێمانی‌و لەوێشەوە بۆ بەغدا کەوتمەرێ..

چۆن وشەی "شۆڕش" بۆ یەکەم جار لەشۆڕشی ئەیلولدا لەبەیانی پدك- بەکارهێنرا:

لەچونەوەم بۆ دەستپێکردنی پۆلی چوار لەزانکۆی بەغدا. بەئەندامی لیژنەی ناوچەی بەغدا دانرام کە لەبری لقیش کاری دەکرد. لەبەر ئەوەی لەسەرەتادا سەرکردایەتیی پارتی لەهەلوێستەکانیدا بەرامبەر شۆڕش‌و رابەریکردنی راڕابو، هیچ هەلوێستێکی ئاشکرا دەرنەدەخرا، مەکتەبی سیاسی بوبو بە دوو بەشەوە:

< مام جەلال‌و عومەر دەبابە لەشاخ بۆ شۆڕشی چەکداریی کەوتبونە چالاکیی‌و چەکدار کۆکردنەوە.

< ئەندامانی تری مەکتەبی سیاسی دژبون. بۆیە لەدوای روخانی هەردوو دەربەند (۱۱,۹ ئەیلول۱۹٦۱) ئاژاوەیەکی گەورە لەناو ریزەکانی پارتیدا دەستی پێکرد. لەسلێمانی کۆنفرانسێك بەسترا کە لەدواییەکەیدا نوری ئەحمەدی تەهاش

ئامادەبوو. ئێمە لەسەر ئەو رایە بویـن کـە دەبێت ئـەو ئەندامانـەی سـەرکردایەتی پارتی کە لەگەڵ شۆڕش نیین دەربکرێن. بەڵام راوهەڵوێستی: باچاوەڕوانیی بکەین، بەسەر کۆنفرانسەکەدا زاڵ بوو.

بەهۆی ئەو لێپرسراوانەی لەشاخ بون، بەرەبەرە بزوتنەوەکە خـۆی دەگرتـەوەو ئاژاوەی رێکخستن لابەلا دەکرا، مەکتـەبی سیاسـی دەکەوتـە نـاو جـەماوەرو شۆڕش. بەڵام بەنوسین هیچ هەڵویسـتێك دەرنـەدەخرا، تـا سـەرەتای بـەهاری ١٩٦٢ کـە لـە کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا بڕیارێ لەسەر جولانەوە چەکدارییەکە درا.

یەکەم بەیان گەیشتە بەغدا، عەبدولرەحمان زەبیحی کە لێپرسراوی راستەوخۆی ل.ن. بەغداو سەید عەزیز شەمزینی- یش نوێنـەری م.س بون، رۆژێك زەبیحـی هاتـە ئەو خانوەی کە کاری پارتیمان تێدا دەکرد، کە جگـە لـە سـەید عـەزیزو زەبیحـی، هـەرمنو ئەسعەد خـەیلانی هاتوچۆمـان دەکـرد، زەبیحـی بەیانەکـەی دایـە دەسـتمو گوتـی بـەڵکو تـایپ بکرێـتو دوو سـەد دانەیـەك بـەڕۆنیو رابکێشـرێت. بەیانەکـە بەعەرەبی بو.

منیش زۆرم پـێ خـۆش بـو کـە یەکـەم بـەیان لەسـەر شـۆڕش دەردەچێت. ئـەو رۆیشت. پێشەکی دەستم کرد بەخوێندنەوەی، سـەرنجمدا لـە سەرجەمی بەیانەکەدا لەبری زاراوەی "شۆڕش" "جولانەوەی چەکداری" بەکارهێنراوە. روم کـردە ئەسـعەد گوتم تۆ بزانە تا ئێستاش ددان بە وشەی شۆڕشدا نانێن. لەبەر ئەوە من "جولانەوەی چەکدار" دەگۆڕم و "زاراوەی" "شۆڕش" دەخەمە جێگـەی! گوتـی وەڵا خـۆ هـەقی خۆیەتی، بەڵام بەوە رازیی نابنو قوبوڵی ئەوە ناکەن. گوتم من دەیکەم چیی دەبێت گرنگ نییە..

ئیتر بەیانەکە بەو جۆرە ئامادەکرا. کە زەبیحـی هاتـەوە بـەئامادەکراوی کەوتـە بەرچاوی، زۆری پێخـۆش بـو، دانەیـەکی هـەڵگرتو دەسـتی کـرد بەپێداچونـەوەی. منیـش ورد سـەرنجی لێ دەدەم. هـەر کـە یەکـەم وشـەی شۆڕشـی بینـی، روخسـاری گۆڕرا، بەڵام لەسەر خوێندنەوەکە بەردەوام بو. دەگەیشـتە هـەر وشـەیەکی شـۆڕش زیاتر تورەیی بەدەمو چاوەوە دەردەکەوت! کە لێبووەوە، بەئاگر لەچاو بارینەوە روی لەمن کردو گوتی:

- کێ ئەو گۆڕانەی کردوە؟

< گوتم من.

- باشە بەچی دەسەڵاتێك ئەوەت کردووە؟

< گوتم ئەوە شۆڕشـە نـەك بزوتنـەوەی چـەکداریی ئاسایی، فـەرمون بڕۆنـەوە بـۆ کوردستان بزانن چیی دەبینن!

- گوتی ئەمە بەیانی کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندییەو مەکتەبی سیاسی نوسیویەتی تۆ بەچی دەسەڵاتێ دەستکاریی دەکەیت؟ دەبێت هەر ئێستا تایپ بکرێتەوە!

< گوتم من ناتوانم، چونکە دەبێت بڕۆم بۆ دانیشگاو کارم هەیە، جگە لەوە، بەشی رێکخراوی قوتابیان‌و کاسبکاران نێرراوەو تازە گۆڕینی سودێکی نییە!

- باشە چۆن پێش ئاگاداریی من‌و سەید عەزیز، بەم گۆڕانەشەوە تۆ سەربەخۆ دابەشی دەکەیت..؟

< بۆچی سەربەخۆیە، ئەی بەیانەکە بۆ رێکخستن‌و بۆ بڵاوکردنەوە نییە؟ ئەی من ئەندامی لیژنەی ناوچەو لێپرسراوی رێکخراوێکیان نیم!؟ ئەی لێپرسراوەتیی ئەو کارانەش لەئەستۆی ئێمەدا نییە؟

- بەدەم تورەیی‌و سەربادان‌و هەڕەشەی موحاسەبەو سزاداناوە بێ خواحافیزی بەشێکی بەیانەکانی هەڵگرت‌و چووە دەرەوە.

لەبەر ئەوەی ئێمەی قوتابیی خوێن گەرم‌و دەروێشی شۆڕش، هەرچی کارێك هەیە کە خزمەتی ئەو رێبازە بکات بەئەرکی سەرشانی خۆمانمان دەزانی کە لەباشترین شێوەدا ئەنجامی بدەین.. لەپەیوەندییەکانیشماندا لەهەڵوێستی سیاسیی حیزب‌و رێکخراوە عیراقی‌و عەرەبییەکاندا راستییەکی تاڵم بۆ دەرکەوتبو، لەناو ئەو ئەزمونانەدا رێبازی بەدەست هێنانی مافە نەتەوایەتی‌و نیشتمانییەکان وەك کورد خۆی گەرەکی بو، بوبووە شتێکی لەبەدەست نەهاتو. بۆیە بە هۆی رووداوەکانی سالانی سەرەتای دامەزراندنی رژێمی پاشایەتی‌و سەرەتای شۆڕشی تەمموزەوە چەند راستییەك لای من بوبون بە بەدیهە:

هیچ حیزب‌و تاقمێکی نەتەوەپەرستی عەرەب، گروپی ئیسلامیی، سادەترین ماف بەکورد رەوانابینن. بورجوازیی رەسەنی عیراق کە (الحزب الوطني الديمقراطي) و کامل چادرچی سەرۆکی بو نوێنەری راستەقینەی بورجوا ناسیۆنالیستی عەرەب بون، هیچ ئومێدێکیان پێ نەدەکرا. لەوکاتانەدا کە رۆژنامەی (الثورة) زمانحالی رژێمی قاسم کەوتبوە بانگەوازهەڵدان بۆ توانەوەی نەتەوەی کورد، کە مەکتەبی سیاسی پارتی‌و رۆژنامەی خەبات ئازایانە بەرەنگاری ئەو شەپۆلە بووەوە، کەوتبوە هێرشێکی فراوانی ناڕەزایی دەربڕین‌و کۆکردنەوەی ئیمزا، دیدەنیی سیاسەتمەدار و رۆژنامەنوس‌و لێپرسراوە نیشتمانپەروەرەکانی عەرەب‌و بڵاوکردنەوەیان.

بۆ ئەو مەبەستە رۆژێك بەنوێنەرایەتی رۆژنامەی خەبات بۆلای کامل الچادرچی نێردرام تاڕای لەسەر ئەو هەڵوێستەی ئەو رۆژنامە کۆنەپەرستە وەربگرم.. دوای ئەوەی باسەکەم کردەوەو لەهەڵوێستی پرسیارم کرد، زۆر بەئاسایی گوتی: جا

ئەوانە هەر قسەن خۆ هیچیان بەکردار نەکردووە، هەق نییە پارتیو خەبات هێندە کەم چیکڵڵانە بنو ئاوا بەو تورەییو توندوتیژییەوە هەڵوێست وەربگرنو کێشەکە ئاڵۆزتر بکرێت.. لەسەرەنجامی قسەکانیدا، کورد واتەنیی دەیویست بەشێوەیەك بن کە نە شیش بسوتێ نە کەباب!

یەکێك لەهەڵەکانی ژیانی سیاسیی (مەسعود محەمەد) کە دژەکردارێکی وای لای زۆر لاوی وەك ئێمەومانان خوڵقاند کە خۆشمان نەوێت، ئەو هێرشی نوسینانە بو کە هەر لەو رۆژگارانەدا لە رۆژنامەی "الحریە"دا دەینوسیی لەکاتێکدا ئەوە بڵاوکراوەی شۆڤێنیترین باڵی بزوتنەوەی عەرەبە نەتەوە پەرستەکانی عیراق بو کە راستەوخۆ بەئاشکرا پێشەنگی ئەو بانگەوازەی دەکرد. هەرچەندە نوسینەکانی لەدژی چەپو رێبازی مارکسیزم- لینینیزم بو، لەگەڵیشیدا راستەوخۆ، بەهۆی ململانێو ناکۆکی کۆنیشەوە، لەدژی مەکتەبی سیاسیی پارتیشی دەنوسیی، کە ئەوە جۆرێك لەپارسەنگی ململانێیەکەی دژ بەکوردی لاسەنگ دەکردو بە بەرژەوەندیی ئەو دژانە دەگەڕایەوە چونکە تەنها مەکتەبی سیاسییو رۆژنامەی خەبات ئاڵای دژ بەو بانگەوازە شۆڤێنانەیەی بەرزکردبۆوە. تاڕادەیەکیش حشع.

خۆ حیزبی شیوعیش دەستەکەی وا کەوتەڕوو، کردارەکانی هێند بێزراو بون کە هەر کۆمۆنیزمو سوسیالیزمیش لەبەرچاوی زۆر لە نیشتمانپەروەرو نەتەوەپەرستانی کوردو خاوەن بیری کوردستانیی بخەنو زۆری تریش ببنە دوژمنی ئایدیۆلۆجیی ئەو حیزبەو رێبازەکەی.. جا کە پیاو پرسیارێکی روبەڕو دەبووەو کە:

ئایا دوای دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە نائاساییەی عیراق، دوای نیو سەدە لەململانێی بێ ئەنجامو ئەو هەڵوێستانەی گروپە جۆربەجۆرەکان، دەبێت کورد بەتەمای چیی بێتو چاوەڕوانیی چیی بکات جگە لەپشت بەستن بەخۆو بەکاری خۆ..؟

لەناو ئەو ئەزمونو لێکدانەوەو بۆچونانەدا بۆخۆم گەیشتبومە ئەو باوەڕو مەڵبەندەی کە تا بارودۆخە خۆییەکان سازنەبن، هەلو مەرجەکانی خەباتو سەرکەوتن رەسیو نەبن، هەڵوێستی زلهێزەکان گۆڕانی بەسەردانەیەت، کورد بۆخۆی رێبازی سەرفرازیی نەگرێتەبەر وا مەحاڵە لەژێر دەستو سایەو سێبەری یەکەیەکەی تاقمە عیراقییە هەمە چەشنەکاندا بەمافەکانی خۆی بگات، خۆ لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەش ئەوە مەحاڵتر دەبێت ئەگەر هەلو مەرجەکان بەو جۆرە بمێننەوە.

روداوەکانی ناوشەڕی براکوژیی لەهەمو ناخۆشییەکانی تر زیاتر ئەزییەتیان دەدام، کاریان لەسەرم دەکرد، بۆیە لێرەشدا بێ ئازارنین! لەشەڕی ناوخۆدا دوای

ئەوەی کە بارزانی لەگەڵ موشیر عەبدولسەلام عارف، بێ ئەوەی هیچ مافێك بۆ کورد مسۆگەر بکرێت(١٩٦٤).

تاقمی کانی ماسی کە کاژێك مەلایی رۆڵیان تێدا دەبینیی، بوبونە دەسەڵاتدار لەسلێمانی، میری ئازادیی تەواوی بۆ دابین کردبون تاراوی کادیرانی باڵی مەکتەبی سیاسیی‌و شیوعییەکان بکەن. لە لق‌و لیژنەی ناوچەی سلێمانی هەرمن‌و حەمە چاوشین مابوینەوە.

لە ١٧- ٧دا برادەرێکم (مستەفای فەقێ عەلی) ژنی دەگواستەوە، من‌و حەمە چاوشین، هەرچەندە بەنهێنی کارمان دەکرد بەڵام پێمان باش بو سەردانی بکەین. دوایی چوار پێنج چەکداری بارزانیی کە زۆریان (کاژێك مەلایی) بون شەڕیان پێ دەفرۆشتین‌و دەیانویست بمانگرن، ئیتر لەبەر خانەقاوە کەوتنە راونانمان، نەخێر وردە تەقە بو بە دەستڕێژ، ناچار ئێمەش: من و حەمە چاوشین و ئیسماعیل سەلیم، کەوتینە بەرگریی لەخۆمان، هەر ماوەیەکیش رامانەکرد چەکداری تریان پێوە دەلکان تابون بە زیاتر لەپانزە چەکدار، لەشەڕە دەمانچەیەکی زیاتر لەسەعات‌و نیویی ئەم کۆڵان‌و ئەو کۆڵان‌و ئەم ماڵ‌و ئەو ماڵ لەبەر خانەقاوە بۆ سەرکارێزو ئینجا بەرەو سەیوان، کە خۆمان بەماڵێکدا کرد تا پشویەك بدەین، ئیسماعیل چووە سەربان‌و کەوتەوە تەقەکردن‌و مەشغوڵکردنیان، هاواری لەو چەکدارانە دەکرد هەی بێ شەرمانە، ئەمانەن تێکۆشەری راستەقینەن بۆچی وادەکەن!؟ ئەوە بوارێکی باشی بۆ رەخساندین‌و دەرپەڕینەوە دەرەوە، دەستڕێژیش گوێی گوێدار کەڕ دەکات، ئێمەش بەرەو گەڕەکی گاوران، باشتر تاومان‌دایە خۆمان. لەبەر ئەوەی جگەرەکێش بوم، توانای راکردنم کەمبووەوە، کەوتینە ناو کۆڵانێکی تەنگەبەری واشەوە کە بۆ چەند سانییەیەك لێیان ئاوابین، بەحەمەم گوت تا دیار نین با خۆمان بەماڵێکدا بکەین، گوتی نانا رابکە، دەمانگرن، گوتم کەواتە تۆ بڕۆ بەڵام ئیسماعیل کە هەر بۆ بەرگری لە ئێمە هاتە ناو کێشەکەوە، گیراو بە لێدان بەرەو حەپسخانەی چوارتا بردبویان.. ئیتر خۆم کرد بەماڵێکدا. ژنێك بەرزە پێ هەستاو بەترسێکی زۆرەوە لەم دەمانچە بەدەستە، گوتی:

> بیکە بۆ خاتری خوا ماڵم وێران مەکەو برۆ.

< گوتم: هیچ چارم نییە، قسەی زیاتریش مەکە، ئێرە جێگەمە تا دنیا تاریك دەبێت، ئەوسا دەڕۆم، ئەگەر زەحمەتیش نییە قومێك ئاوم بدەرێ. زۆری نەبرد ئاژاوەکە گەیشتە کۆڵانەکە، غاوەغاوو ها لەکوێوە، دەی لەکوێوە دەرچوون، ئەو ناوەی گرتەوە، یەکێك دەیگوت: خۆیان بەو ماڵەدا کردوە، یەکێکی تر دەیگوت: نەوەڵا لەپێشمانەوەن، تا غەڵبە غەڵبەکە کەم بووەوە، ئیتر کەوتمەوە سەر بیرکردنەوە

لەچارەنوسی حەمەو دوعادوعای رزگاربونی.. نەخێر دەنگە دەنگەکە پەیدا بووەوە.. زیاتر ئامادەو گوێ قولاغ بوم، چونکە پێدەچێت گومانەکەیان لابوبێت بەیەقین. یەکەم جارە لەژیانمدا بیر لە کوشتن بکەمەوە. خۆ ناچارییشە، دێنە سەرت بۆ کوشتن، ئەگەر بەرگریی لەخۆت نەکەیت وا ترسنۆکانە دەکوژرێیت. خۆ هەمو یاسایەکی دنیایی‌و ئاسمانیش مافی بەرگریکردن لەخۆ بەرەواو هەقیان داناوە، جگەلەوە ئەوان بەناهەق دەستدر یژییان کردوە، لەبەردەستیاندا هەڵهاتوین، دیسان هەر دوامان کەوتون دەست بەردارمان نابن. زیاتر لەوانە، ئەوانە لەبیرکردنەوەی ئێمەداو بەپێی بەرنامەی پارتییەکەمان بەیاخیبو دادەنرێن، چونکە ئەوان کۆمەڵە خەڵکێکی‌سەرسەری‌و شەڕانی‌و لەرێکخستنەکە هەڵگەڕاونەتەوە، ناوی خۆیان نابوو پێشمەرگەی نوێ، کە لە راستیشدا وەك نوری شاوەیس ناوی نابوون "پێشمەرگەی نەوی" بوون. رێکخراوەکانیش هەموو لەگەڵ خەتەکەی مەکتەبی سیاسیدا بوون.. بۆیە بڕیارم دابو هەر کە دەرگاکەیان کردەوە، دەستیان لێ نەپارێزم..

خوای کرد دوای ماوەیەك ئەو ناوەیان بەجێ هێشت‌و منیش هەناسەیەکی پڕ بەسییەکانم هەڵکێشا کە لەو کارەساتی خوێنڕشتنە سەرفرازبووم.

بۆ ئێوارە خاوەن ماڵ هاتەوە، پێش قسەکردنی، خێزانەکەی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەویش لەناوی خۆم‌و ناوی باوکمی پرسیی، کە گوێی لەناوەکان بو، زۆر رێزی لێگرتم‌و روی کردە ژنەکەیی‌و گوتی: خۆ قسەیەکی وات نەکردووە عاجزت کردبێت؟ ئەمە ماڵی "ئەوڕەحمانی حاجی عەزیز ئاغا" نییە، ماڵی مەلا عززەتەو بەقوربانی ئەم بێت، کە دنیا تاریك داهات، تەهای کاکە ئەحمەدم خۆی کرد بەماڵداو گوتی:

< چۆنی خۆ بریندار نەبویت؟

< ئانا مەترسە ساغوسەلامەتم.

> دەنگ وا بڵاوبوەوە کە پێکراویت‌و برینداریت. باشە تۆ دەمانچەکە بدە بە من، ماڵەکەی ئەودیویش خزمی خۆمانەو بابڕۆین، خاوەن ماڵ گوتی: بابە ئێرەش هەر ماڵی خۆتانە بۆچی دەڕۆیت، زۆر سوپاسیی پیاوەتیی خاوەن ماڵم کرد. کە هەواڵی حەمەم لەتەها پرسیی گوتی مەترسە خۆی دەرباز کردوە، هەواڵێکی خۆش بو. ئەوسا هەر بەسەربانداچوینە ماڵی (حاجی مەحمودی دارتاش) باپیری ئەنوەری مەجید سوڵتان، زۆر رێزییان لێگرتم دوای نان خواردن‌و میوە دانان، بەئیسراحەت لێیخەوتم، بەیانی زوو بۆ ماڵی بێستونی مەلا عومەرو دوای رۆژێك بۆ ماڵی ناهیدەی شێخ سەلام جێگەم گواستەوە. ئیتر دەبو تەنانەت هاتوچۆی شەوانیش بەهوشیارییەوە بکەم.. ئیتر سەرسەرییەکانی شار کە بوبونە پێشمەرگەی باڵەکەی

بارزانی، بارودۆخی شاریان تەواو تێکدابوو من و حەمە لەیەك دابڕابوین دوای چوار ڕۆژ یەکترمان دۆزییەوە.

زۆری نەبرد ئەو تاقمەی کانی ماسی لەیەك ڕۆژدا نۆ شیوعیان لەسلێمانیدا کوشت.. لەوەش نامۆتر ئەوە بو کە سەردەمێکی دواتر، حشع دەیویست تاوانەکە لەسەر مەلاییەکان بخاتە کۆڵ جەلالییەکان.. بگرە لەبەیانێکیشدا ئەو ئاوەژۆکردنەیان بەکارەساتەکە کرد..

ڕۆژی پێنجەم.. لەناو چاوەڕوانیی بانگکردنو بیرکردنەوە لەبوتڵ، لەڕوی دەروونییەوە تەواو شەکەت بوبوم. هەرچەندە شەنو کەوکردنی ئەو کارانەی رابوردوو ئازاری دەروونیمی زیاتر دەکرد، بەڵام لەهەیئەو هەڕەشە کوشندەکانی دوریان دەخستمەوە، جارجارەش بە خۆمم دەگوت دەی هەمو ئەوانە لەبیر خۆت بەرەوە تاڕوبەڕوت دەبن، مردن یەك جارەو نابێت بەدوو، کەی دەستیان پێکرد ئەوسا روبەڕووی ببە. خۆ لەوەش خراپتر هەیە. ئەی ناڵێن ئەمانە دەستو قاچ لێدەکەنەوە. ئەی حەمە سدیق پێنجوێنیو ئەوڕەحمانە کەرکوکییەکەی سەردەمی قوتابێتی لەبەغدا نەیاندەگوت لە ٦٣دا بەدەستو قاچ بڕینەوە وە کوشتییانن. ئەوە نزیکەی حەڤدە ساڵ لەمەوبەربو، بزانە ئێستا چەندی تر فێر بون، دنیای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا چییتریان خستونەتە بەردەستو فێریان کردون. ئەی چۆن لەوانە خراپتر نییە، بەڵێ لەوەش ناخۆشتر هەیە.

دەی جارێ بیر لەوانەش مەکەرەوە.. ڕاستە لەوانەش ناخۆشتر هەیە.. خۆم بەخۆمم دەگوت:

ئەی کوڕە خانەقینییەکە لەژوری ڕەقەم یەك، نەیدەگوت: لەخانەقین هەڕەشەیان لێکردم کە ئەگەر ئیعتیراف نەکەیت وا ژنەکەت دەهێنینو لەبەر چاوی خۆت دەیدەینە دەست عەسکەرەکان. ئەو وەك خۆی گێڕایەوە کە ئەوەیان لەگەڵ چەندین کەس کردووە. ئەم کوڕە لەگەڵ چەند کەسێکدا سەربە پارتی دەبن، تەگبیری چونە دەرەوە دەکەن، بەڵام یەکێکیان خەت مایل دەبێتو بەگرتنییان دەدات، دوای ئەوەی لەخانەقین وای لێدەکەن کە ددان بەوەدا بنێت، دەیاننێرن بۆ هەیئە.. پێم وت ئەوە هەر هەڕەشەیەو بڕواناکەم بتوانن کاری وابکەن. وتی مامۆستا لەخانەقین گەلێ جار شتی وایان کردوە. بەخوا من تەحەمولی هەموو لێدانێکم کردووەو یەك وشەم لەدەم نەهاتە دەرێ، لەخانەقین چەند ئەندامێکی پ.د.ك بوین کە گیراین، ئەوە ئێمەی روخاند، هەر کە ناوی ژنیان هێنایە پێشەوە ئیتر هەمومان روخاین. دیمەنەکەم هێنایە بەرچاومو روخاندمی.. شەرەف زۆر گرانە.. ئەو دیمەنە تەحەمول ناکرێ..

گوتم:

> وا دیارە تۆ ئەو دیمەنانەی تر لە ئیعتیرافکردنو خۆو خەڵکی تر بەئیعدامکردن دان بەدۆڕاندنی شەرەف دانانێیت؟ بەئابڕوو چونی نازانیت؟ ئەو جۆرە کارانەی دوژمن دەیکات، هەر کوت و مت وەك لێدانەکانی تر وایەو نابێت پیاو لەوانە جیای بکاتەوە..

لەپڕ پاشەکشەیەکم لەقسەکانم کردو گوتم باشە ئەو رووخاوە، تەواو بووە، ئێستاش ئامادە نییە دان بەهەڵەو ئەو کارەساتەدا بنێ کە بەسەر خۆیی‌و رەفیقەکانیدا هێناوە، ئیتر تۆ هەقت چییە بەسەرییەوە، ئەو وەفای بۆ خۆی نییە کە ئیعتیرافی لەسەر خۆی کردووە، ئیتر چۆن وەفای بۆ یەکێکی نەدیوو نەناسیو دەبێت کە تەنها لێرەدا یەکیان بینیوە. کێ دەڵێت قسەکانی بەرەئیسی هەیئە ناگەیەنێتەوە.. راستە راستە، خۆم بەخۆمم گوت. دوا وشە: پێیم گوت:

راستیش دەکەیت، خۆت باشتری دەزانیت، کەس بەئازاری کەس نازانێتو کەس لەدەردی کەس ئاگادار نییە، هەریەکە بەدەردێکەوە گرفتاربوە..

ئیتر ئەوە ئەقڵو سروشتی روخاوە، پاساو بۆ روخانی خۆی، بۆ خۆ بەلەسێدارەدان، بۆ زیاندان لە رێکخراوەکەی خۆی‌و لە میللەتەکەی، دەهێنێتەوەو دان بەراستیشدا نانێت، ئەگینا ئەوانە هیچیان لەوە ناگۆڕن کە پیاوی خاوەن مەسەلە، پیاوی خاوەن کێشەیەکی رەواو یاسایی‌و پیرۆزی وەك مەسەلەی نەتەوەی کورد بەرامبەر بەم دوژمنە لەوێنە نەبوە کە هیچ شتێك کاری تێناکات، دەبێت ئامادەی هەمو جۆرە ئەشکەنجەیەك بێت، لەبێ رەوشتترین شێوەدا ئەنجامەکانیش جێگەو مایەی شانازیی بن، لەوەش بگات کە تەنیا رێگەی دەربازبون لەدەست ئەمانە هەر خۆگری‌و قسەنەکردنەو هیچی تر.

سەرلەبەیانی رۆژەکە، بەو بیرکردنەوانە گوزەری کرد. بۆ خۆمەشغوڵکردن کەوتمە خوێندنەوەی ناوی ئەو زیندانیانەی ئەو ژورەیان بینیوەو ناوی خۆیان بۆ یادگار نوسیوە. لەو ناوانەی کەوتنە بەرچاوم و دەمناسیی (سەلامی مەلا عەبدولڕەحمان) بو. ئەمو عەلی مامە دوو تێکۆشەری ناو کۆمەڵە بون، لەناو خۆگریی خۆیاندا بەرسێدارە نەکەوتن، ئەمان بۆ چالاکییەکانی ناو شار پەیوەندییان بەحەمە چاوشینەوە هەبوو..

رۆژێك سەرلەبەیانیی دوکتۆر خەسرەو خاڵ هات بۆ لامو گوتی: شەو عەسکەر داویانە بەسەر ماڵی حەمە چاوشیندا، ئەویش خۆی دەربازکردووەو ئێستا لەماڵی خۆمانە، کە چوینو یەکترمان بینی‌و باسی روداوەکەو مەترسییەکانی خۆی کرد، هەرچەندە لەگرتنەکەی سەلامو عەلی مامەوە ئەم بەردەوام نائارام بو، ئێمەش لەبەر تیشکی قسەو باسکردنی رووداوەکە، مەزەنەی ئەوەمان کرد کە ئەو هێرشە بۆ یەکێکی تر بووە.. حەمە رووی کردە من و خەسرەو خاڵ و گوتی:

روداوەکە بەو جۆرە بووە.. من خۆم هیچ بڕیارێ نادەم، ئێوە چیی بڵێن و چۆن بڕیار دەدەن من وادەکەم.. ئێمەش لامان باش بوو کە سلێمانی بەجێبهێڵێتو بچێتە دەرەوە. بۆ سبەینێ سەرلەبەیانیی رووەو شاخ کەوتە ڕێ، حەمە بۆشاییەکی دیاری بەجێ هێشت. چونکە بە راستی کوڕی رۆژی تەنگانە و خەباتی ژێرزەمینی بوو.. ئیتر لەگەڵ دوکتۆر خەسرەو و عومەر فەتاح کەوتینە سەر رێکخستنی کاروبارەکانی ئەو خەتەی کۆمەڵە.. کە حەمە چاوشین راستەوخۆ لێپرسراوی بوو.

پێش ئەوە ناوی سەلامم لەسەرەتای حەفتاکانەوە لەناو قوتابییاندا بیستبو. لاوێکی بزۆزو خوێن گەرمو دڵسۆز. ئەم یەکێك بو لەو کەسانەی کە بەهۆی بەختیارەوە ئاگاداری کردم کە ئەگەر لام باش بێت وا یەکەم بەرهەمم: "دیپلۆماسێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی" بۆ کاری رۆشنبیری لەناو قوتابییانی کۆمەڵەدا بکەنە سەرچاوەیەك، ئەو کاتەش من زانیم لەکۆمەڵەدا کار دەکات.

دوای نانخواردن، کاری ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەو گریانو قیژە قیژ بەردەوام بو، لەناو ئەو ئازارو بارە دەرونییەی خۆشمدا، هێندەی تر دیمەنە بەدەنگەکانی پڕ لە زەحمەتیی دەکرد.. کە بانگیان کردمە دەرەوە کات عەسرێکی درەنگە.. کەمێ بێ قسەو بێ پرسیار ئەمسەرو ئەو سەرییان پێکردم، و یەکێکیان بەهێوایشی دەیگوت:

- هەر ئەم.. کەی.. تەواو.. دواجارە.. کێ دەیبات.. بەزنجیرە ئەو پرسیارە پچڕپچڕانەیان دەکرد بێ ئەوەی یەك رستەی بەمانای لێحاڵیی ببم. کە لەپچە کرام. بێ دەنگیی ئەو ناوەی داگرت. ئەوە زیاتر لەنیو سەعاتێکی خایاند. ئینجا دەنگێك پەیدابو:

- نا نا ئەمرۆ نییە، سبەینێ سبەینێ دەیبەین.. رەئیس دەڵێت بیبەنەوە ژورەکەی..

دەبێت ئەم کەینو بەینەیان لەچیی بێت!؟ نا نا ئەمانە بەشێکن لەجەنگیی دەرونیی.. یەکێك کەلەپچەکەی کردەوەو گوتی، چاوت بکەرەوە، دەرگای کردەوەو پاڵێکی پێوەنام بەدەمدا کەوتمە ناو ژورەکەوە..

هەر باشە ئەگەر ئەشکەنجە هەرئاوا بڕوات، وا شوکرانەی خوا دەکەمو زۆری پێ رازییم.. بەڵام تاکەی ئەم حاڵە دەوام دەکات.. کەی کۆتایی بە بەرەوژوربونەوەی ئەشکەنجە دێت! خۆ ناکرێ هەروا بەردەوام بن.. دەی پەلەت نەبێت زۆری رۆیشتووە کەمی ماوە، ئەوانەش سنورێکی خۆی هەیەو ئەمڕۆ ناسبەی هەر تاقەتیان دەچێتو لەکۆڵم دەبنەوە.

چاوەڕوانیی بۆ شێوکردن درێژەی کێشاو دەنگ نییە.. تا خەو زۆری بۆ هێنام. هەر بە ئومێدبوم.. سەرەنجام لەزۆرانبازیی نێوان برسێتییو خەوی ناو ئەو

شەکەتییەمدا، ئەمیان سەرکەوتوو لەگەڵیدا ئازارو هەستی ژاکاوو بیری ناکامو بێئومێدییش سەریان نایەوە بەرەو رۆژێکی تری ناو ئەم مەڵبەندە کە تا ئێستاش ناوی پڕ بەپێستی خۆی لێ نەنراوە..

**پێکەنینی چارەنوسساز لەبەردەم پەتی سێدارەدا:**

لەناو هەمان ئاڵۆزیدا بەیانییەکەی نائاسایی دەهاتە ناو بیرکردنەوەکانمەوە. کەوتمە تاووتوێی خەوو خەوبینینی شەوەکە. دەمزانی شتێکی نائاسایی بۆ ناو ئەم دۆزەخە رویداوە، بەڵام نەمدەزانی چیە! کە زیاتر بیرم لەسەرخۆم، لەسەر لەشم چڕکرد، ئەوسا زانیم چیی رویداوە!

پێکەنینم بەحاڵی خۆمو سروشتی مرۆڤو پێویستییەکانی گیانییو دەرونیی دەهات. ئەوە بۆ ساتی ئاسایی‌و لە دڵنیاییدا هیچ نامۆییەکی تێدا نییە، ئەوە خواستو پێویستیی گیانییو دەرونیی بەیۆلۆجیی مرۆڤە، رۆڵبینینی کاری ئاسایی ئۆرگانەکانی سیستمێکی لەشە کە ئارەزوی مرۆڤ بجوڵێت بیخوازێ و ئەگەر لەدۆزەخیشدا ئەو نەسرەوتیو تینوێتی شکاندنە سەرهەڵبدەن، دیسان هەر نامۆ نییە.. بەڵام لەناو زەحمەتییەکانی شەکەتیی ژێر ئەشکەنجەی ئێرەدا ئەوە دەبێتە دیاردەیەکی سەیر، خۆ ئەگەر بەخەوو لەخەودا بێ، ئەوە بۆخۆی زۆر نامۆ نابێت، دەبێتەوە کارێکی سروشتیی لەشی مرۆڤ. خۆ بۆ ئەم حاڵەتەی منیش دەبێتە کارێکی رەحمانیی نەك پێچەوانەکەی، چونکە لەپشکنینی وردتردا، بۆم دەرکەوت کە دەرەچەکەی ئەم بەشەی لەشیش لەخوێن بێ بەش نەبووە. رەنگە ئەم جۆرە دیاردانە یارمەتییەکی ئاسمانیی بن بۆ ئەوەی لەش لە خوێنی قەتیس ماوو ئەو شتە ماوەیەی ناولەش کە دەبێتە غەریب، سەرفراز بکات، بەمانەوەی، ئەو ئۆرگانەی لەش توشی هەوو نەخۆشی دەکات.. ئەو خەوە یەکسەر سەرگوزشتەکەی سەردەمی کەریم خانی زەندی وەبیرهێنایەوە کە کاتی خۆی (عبدولڕەحمان زەبیحی) بۆمی گێڕابووەوە:

لەسەردەمی کەریم خانی زەندا کە بەسوارچاکیو فەرمانڕەوایەتیی پڕ لەعەدالەتو ریفۆرمی کۆمەڵایەتییو بەرکەماڵکردنی ئاسایش ناوی دەرکردبو، بۆیە ناوی "وکیل الرعایا"ی لێنرابوو. وەك دەگێڕنەوە کەریم ناوێکی هەژار، لە بەرهۆیەك، حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا دەدرێت.. دەڵێن رۆژی لەسێدارەدان، کەریم خانی زەند خۆی بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکە ئامادە دەبێت. بەقلیان کێشانەوە سەیری ئەو دیمەنانە دەکات. کاتێ کەریم سەردەخەنە سەر قەنارە لەپێش پەت کردنەملیدا لێی دەپرسن:

- دوا قسەو داخوازیی پێش مردنت چییە بیڵێ تا بۆت جێبەجێ بکرێت.؟

کابراش کەمێك رادەمێنێو هەڵوێستەی بۆ دەکات، ئەوسا لەبری وەڵامی ئەو پرسیارەو داواکردنی ئەوەی دەیخوازێت، پێکەنین دەیگرێ.. خەڵکەکە سەریان سوڕدەمێنێ، ئەوە سەرنجی کەریم خان رادەکێشێ. جارێکی تر داواکە لەکەریم ناو دووبارە دەکەنەوە، ئەمیش زیاتر لەسەر پێکەنینەکە بەردەوام دەبێت! کەریم خان سەری سوڕدەمێنێو بەتوڕەییەوە لێی دەچێتە پێشەوەو لێی دەپرسێت:

- ئەرێ کابرا! تۆ پێم ناڵێیت لەبەردەمی مردندا ئەم پێکەنینە لەکوێوە دەهێنیتە دەرێ..؟

کابراش دەڵێ قوربان لێیگەڕێ منیش بۆخۆم سەرم سوڕماوە، من هیچم گەرەك نییەو با حوکمی وەکیل جێبەجێ بکرێت..!

- خان پێیدەڵێ نا جارێ قسە بکە با لەهۆی ئەو پێکەنینەی بەردەمی مەرگ بگەم..

کابرا شەرم دایدەگرێو دەپارێتەوەو دەڵی وەڵڵا قوربان ئەوە شتێکە لەحوزور جەنابتا بۆ گوتن ناشێت ووازم لێ بهێنن..!

- کەریم خان بەتوڕەبونەوە دەڵێت: ناگوێ مەدەرێو قسە بکە، بڵێ با بزانم ئەم نهێنییە چییە!؟

کابراش بەشەرمێکەوە دەست دەکات بە قسەو دەڵێت:

وەڵڵا قوربان لەناو ئەم نمایشەدا سەرم لەکاری سێ (کەریم) سوڕماوە. هەردوو دەستی هەڵدەبڕێو سەیرێکی ئاسمان دەکاتو دەڵێت ئەو (کەریم)ەی بەئاسمانەوەیەو کەسی لەرەنگ نییە، هەمومانی دروستکردوەو ئەو پلەو پایەیەی بەخشیوە بەم (کەریم)ی دنیا لەژێرپێیدا دەلەرزێو حوکمی ئەو سەرزەمینە دەکاتو فرمانی کوشتنی ئەم (کەریم)ە داماوەی بەردەستتانی داوە ئەم کەریمە داماوەی کەوا سەرەڕای ئەوەی لەبەردەم مردندایە، کەچی (دەعباکەم) بەرزبۆتەوەو لەبری دواداخوازیی پێش مەرگ داوای جێبەجێکردنی ئارەزووی خۆییم لێدەکات. دەی قوربان ئەمە پێکەنینی ناوێت..؟

کە کەریم خان قسەکانی کابرا دەبیستێت، بەلێدانی قاقای پێکەنینەوە فرمان دەدا کە دایگرنە خوارەوە. لەگەڵ خۆی دەیبات. عەفوی دەکاتو یارمەتییەکی باشیشی دەداتێ.

رۆژی ئایندە، دەرگای چونە ئاودەستیان لێکردمەوە، دەنگە گرەکەی عەریف ئەحمەد بو، ناوی ئەشکەنجەی لێدەباریی، سەیرێکی کردمو گوتی:

- ئەرێ تۆ مودەڕس بویت؟

> بەڵێ.

- باشە ئەگەر مودەڕیسەکەمان وەك تۆ بێت ئەی دەبێت نەخوێندەوارەکەمان چۆن بێت!

> بۆچی من چیم کردوە؟ من هیچ نایاساییەکم نەکردوە. بڕواشم وایە خۆشتان باش دەزانن کە من هیچم نەکردوە!

- زۆری وەکو تۆ ئەم درۆیانەی بۆ کردوینو خۆی بەلێدانێکی زۆر داوەو ئینجا راستییەکانی گوتووە. یان لەژێر ئەشکەنجەدا خۆی بەکوشتن داوە. تۆ دەزانیت زوڵم لەخۆت دەکەیت کە خۆت والێدەکەیت. بڕوا بکە "بەگەلێك سوێند خواردنەوە ددان بەقسەکانیدا دەنێت" وازت لێناهێنن تا قسە نەکەیت، جا باشتر وایە لەم سنورەدا بووەستیتو خۆت راست بکەیتەوە!

> من قسەی خۆمم کردووە.

- کەی؟ چۆن؟ لای کێ؟ چیت گوتووە..؟

> راستییەکانم بەهەموتان گوتوە کە من هیچ نازانمو ئاگادارییم لە هیچ شتێك نیە.

بەلاق پاڵێکی بەرەو ئاودەستەکە پێوەنام. باش بو لە تەنگەتاویی سەرفرازی کردم. دوای هاتنەدەرەوە، یەك دوو شڵپ لەئاوە ساردەکەم کرد بەدەموچاوماو کردمییەوە بەژوردا. نەکەوتە ئەوەی بکەومە خەیاڵی برسێتیو نان خواردن، سەمونێكو چەن قومێك چایی لەناو سواڵەتەکەدا لەژێر دەرگاکەوە بۆم رەوانەکرایە ژورێ. تابڵێی برسییمە، وەك خۆشترین خواردەمەنیم بۆ دانرابێت ئاوا بە لەزەتەوە نانو چاکەم خوارد. پاڵم دایەوە. خەودایگرتم. نەمدەزانیی خەوەیان هیلاکیی ناو خەیاڵی ئەو قسانەن، یان هەردووکیانە. بەڵام دەرگاکردنەوە رای چڵەکاندمو ئەحمەد گوتی وەرە. چومە پێشەوە، چاوی بەستمەوەو گوتی دەچێتە بەردەمی رەئیسی هەیئە، ئەو بڕوای وایە کە تۆ ئینسانی باشیتو قسەی لادەکەیت. هەر ئەویشە کە نایەڵێت بکوژرێیت. ئەگینا هەرزوو دەمانکوشتیت. هەر کە بڕیاری کوشتنت دەدرێت، ئەو رای دەگرێتو دەڵێت گوناهە! زۆری نەبرد وەستاندمیو دەنگی رەئیس هاتەوە گوێمو دەستی کرد بەنەسیحەتو ئینجا پرسیی:

- چەند منداڵت هەیە؟

> پێنج.

- گەورەیان تیاهەیە..؟

> نەخێر گەورەکەیان سیانزە ساڵە..

- ئەی بیریان ناکەیت..؟

> چۆن بیریان ناکەم!

- ئەی خۆشت دەوێن..؟

> بەڵێ.

- زۆر..؟

> بەڵێ. لەسنوربەدەر.

- کەوابو حەزدەکەیت ئەمڕۆ بچیتەوە ناویان..؟ دیارە ژنەکەشت زۆر خۆش دەوێت..؟

> بەڵێ..

- زۆر باشە، پێخۆشحاڵم ئاگادارت بکەم کە ئێمە بڕیاری ئازادکردنی تۆمان داوە، ئەمڕۆ دەچێتەوە ناو ماڵو منداڵەکانت، هیوادارم هاونیشتمانییەکی باشبیتو ئیتر لەخزمەت دوانەکەویت.. هەر ئیستە دەتنێرم بۆ خۆشتنو سەروریش تاشینو جل گۆڕین، جا پێش خواحافیزیی، هەندێك پرسیارمان نوسیوە، دەمانەوێت زۆر بەکورتیی وەلامیان بنوسیتەوە.. هەموی یەك سەعاتی تر نابات ئازاد دەبیتو دوای نیوەڕۆ لەماڵی خۆت دەبیت..

سەیرە! ئەمانە نائاساییین! نا هەر نائاسایی نین! ویژدانی مرۆڤ پەروەرییان تیامردووە. ئەم جارەیان دەیانەوێت لەناو ناخی هەستو سۆزی باوکێتییەوە بێنە ناو دەرونو هەستەکانمەوە، ئا بەو شانۆگەرییە نوێیەش! یەکێك لەخاڵە لاوازەکانی مرۆڤی کورد، و هی سەرجەم مرۆڤی سەر ئەو زەمینە، لەم جۆرە ساتو بەرەو روبونەوانەدا، ژنو منداڵە، کە نەك هەر هەستیارترین دیاردەی ژیانی مرۆڤو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، بگرەهی سەرجەم گیانلەبەریشە، تەنانەت سادەترینیشیان.، زۆری نەبرد زنجیرەی بیرەکانمی پچڕاندو غەرقی دەریایەکی تری بێبنی کردم.

ئینجا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو گوتی:

- خۆ پێویست بەنوسینەوەی پرسیارەکان ناکات، خۆت دەیانزانیت، تۆ هەر وەلامەکان بنوسە، بەلام راستییەکان هەموی دەڵێیت! کاغەزو قەڵەمت بۆ دەنێرین بیانووسە. تازوو وەلام بدەیتەوە زووتر دەچێتەوە ناو منداڵەکانت. خۆ ئەگەر ئەوە نەکەیت وا:

- یەکەم: ماڵومنداڵەکەت دەهێنینە ئێرە، خۆشت دەزانیت بۆچی بۆ ئێرەیان دەهێنین..!؟

- دووەم: لەم ناوەدا بەتەواوی ونت دەکەینو بلاوی دەکەینەوە کە کوژراوە، ئیتر برادەرەکانت دەکەونە نوسینو باسکردنت جا راستییەکانمان تەواو بۆ ساغ دەبێتەوە.

- سێیەم: تا ئێستا ئەشکەنجەی ئاساییمان داویت، لەمەولا دەکەوینە بەکارهێنانی سەختەکانیان بە بوتڵیشەوە، تا لەناو مردنێکی لەسەرخۆو پڕ لە ئەشکەنجەو ئازاردا کۆتایی بەژیانت بهێنین..

> هەرچی شتێك بکەن ناهەقیم لێدەکەن‌و زوڵمە.. نەیهێشت بەردەوام ببم گوتی:

- بیبەن‌و ئیتر من چاوەڕوانی وەڵامی ئیجابیی تۆ دەکەم، ئەگینا وەك پێم وتیت وا دەکەین‌و لەدواییشدا دوای کارەسات پەشیمان دەبیتەوەو ئەوکاتەش پەشیمانیی فریات ناکەوێت و لە هەردوو دنیا دەبیت!

سۆندە خرایە دەستمەوەو کرامەوە بەژوورەکەدا..

ئەی خوای گەورە لەمەیان چۆن رزگارم دەبێت! ئەمە ئەو بەڵایەیە کە خانەقینییەکەی روخاندو من گاڵتەم پێ دەهات. جا وەرە منداڵەکانیشی لەگەڵ بێت.. بەڵام.. چیی بکەم خۆ چارەکەی لای من نییە، ئەمانە تا سەرئێسقان دوژمنن! چۆن ئەو کارە بووەستێنرێت! چیی بکەم باشە!؟

ئەوە بیر لەچیی دەکەیتەوە؟ لەچارە؟ ئینجا کوا چارە لەدەست تۆدایە! کوڕە چارەی چیی! چیی دەکەن بابیکەن! چی دەکەن بابیکەن! ئەمانە رێزو کەرامەتی میللەتەکەمیان لەناو زەلکاودا نوقوم کردوە، رۆژانە رێزو بێگەردیی دەیان پیاوو ژن دەخەنە ژێر پۆستاڵەکانیانەوە.. ئیتر دەبێت بۆچ ئەوە نەکەن! دەبێت بۆچیی هەر ئەوە لەبەرچاوبێت، ئەی ئەو هەموو مرۆڤانە کوردنین، خوشك‌و برای من نین!؟ دەی چیی دەکەن بابیکەن..

کە دیمەنی منداڵەکانیشم دەهاتە بەرچاوو بە زەلیلیی بەردەستیی ئەمانە خۆیان نیشانم دەدەن هێندەی تر تۆڵەی کوردانەم دەوروژێ‌و هەرچی کردەوەیەکی ئەمانە هەیە لام دەبووە ئاسایی‌و سادە. جا هەر تێکۆشەرێك بەقسەیەکی وا شەرەف و ویژدانی خۆی لاسوك ببێت‌و بکەوێتە ناو زەلکاوەکەیانەوە، وا هیچ مانایەك بۆ پیرۆزیی‌و نیشتمانپەروەری‌و تێکۆشان نامێنێتەوە. چیی دەکەن بابیکەن، یەك قسەی نائاسایی لە من نابیستن. ئەگەر شەرەف‌و کەرامەت هەبێت واهی نەتەوەو نیشتمانە. بێ ئەوانە هەمو شتێکی تر بێبایەخن. من هەر لەسەرەتاوە بڕیاری چارەنوسسازی خۆمم داوە. جگە لەوە بۆچی ئەو کەسانەی کەوتونەتە ناو زەلکاوی قسەو ئیعتیرافکردنەوە، سەرفرازییەکی پڕ لەسەرشۆڕیشیان دەستگیر بووە..!؟ نەخێر! ئا لەو حاڵەشدا لەهەردوو دنیا بوون، لەهەردوو دنیایان کردوون! خۆیان لەهەردوو دنیا کردووە؟

خواردنی نیوەڕۆیان هێناو لەناو ئەو پەژارەو خەمانەدا کەوتمە خواردنی. نەمدەزانیی چۆن دەچێت بەقوڕگمدا! دیارە برسیمە بۆیە دەتوانم بیخۆم.. ئەی با

کەمێك هێزم بەبەردا بێتەوە.. با لەوە زیاتر لاواز نەبم.. با زیاتر بەرگەی ئەشکەنجەی تر بگرم.. دیارە دوای ئەوەی کە هیچیان لێم دەست ناکەوێت، دەکەونەوە گیانم. لەناو لێکدانەوەکانی بەستراو بەو دیمەنانەی ئەو قسانە دروستیان دەکرد، سەرم نایەوە.

*سێ کوچکەی لەشکری ئەسپێو چرنوکو چلکنیی...*

بەڵام سێ کوچکەی هێرشی: ئەسپێ کە بەهۆی سەرنەپەرژانە سەرڕاوکردنیانو تەنانەت خۆ تەکاندنیش، بۆتە لەشکرێکی لەبننەهاتو، ئینجا درێژبونی نینۆکەکانم کە وەك چرنوکی پڵنگیان لێهاتووەو بونەتە یەکێك لەدوژمنە گەورەکانی لەشی خۆم، چونکە کاتێك لەخۆخوراندندا لەپێستو چڵك گیر دەبوون ئازارێکی نوێ زیادی دەکرد! هێندەی تر ژیانەکە سەختتر دەبێ. ئەسپێ بی شومارن تەنانەت سمێڵو برۆکانیشیان بەجۆرێك داگیرکردووە کە پەنجەکانیان بەناودا دەهێنم بەدەیانیان لێدەکەونە خوارەوە. بۆیە هێرشەکانیان بەردەوام زیاتر دەبێت. لەشپرزەیی هیلاکیی‌و خەواڵوییدا، لەکاتی بێئاگایی خەودا، لەو کاتانەدا نینۆکەکانم لە لەشم گیردەبن، تا خوروی بەشێکی لەشم دەشکێنم جۆرێکی تر لەئازارو کزانەوە دەستپێدەکەن، ئیتر وام لێدەهات زۆر دەربەستیان نەبم، چونکە خوراندنەکان زۆر زیاتر ئیزعاجیان دەکردم، دواییتر کزانەوەو ئازاری برینەکان لەوانە ناخۆشترو بێتاقەتبەرتر بون، چونکە چڵکنییەکە وایکردووە کە هەروەك خوێ بکرێت بەسەر برینەکاندا ئەئاوا دەکزانەوەو ئازاریان دەدام..

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کاتێ باسی قەڵەمو کاغەزەکەم بەبیردەکەوێتەوە، ئەو دنیایەم لەبیر دەچێتەوە، دەکەومە ناو جیهانی ئازارێکی تر. لە وردکردنەوەی ئەو بیرانەدا بوم کە دەرگاکە کرایەوە، عەریف ئەحمەدە.

قەڵەمو کاغەزی دایە دەستم.. رەئیسی جەللادان بەدەنگەگرەکەیەوە گوتی: ئەمە نامەی ئەعمالتەو چارەنوسەکەتی لێ دەنوسرێت.. تێدەگەیت!؟ رەئیس دەیگوت ئەوەندە وەختی پێویست نییە، دەتوانێت بەچەند سەعاتێك ئەوەی دێتەوە بیریی بۆمان بنوسێت. خۆ ئەگەر هەمو ئەوەی پێویستە نەکەوتنەوە بیرت واقەیدی نییە! هەر کە هاتمەوە. دەبێت رێکو پێك، وەك دەمانەوێت بەپڕکراوەیی بیدەیتەوە دەستم، تێیگەیشتیت..!؟

کە سەرنجی روخساریم دەدا ئاگر لەچاوانی دەباریی. دەی کێ بەرپرسیارە لەم گاڵتەجارە!؟ ئەو نەخوێندەوارە کە کەس نازانێت لەچی دایكو باوکێکی ونناو بوە، لەچی کوچەیەکی نەناسراودا پەروەردەکراوە، والێرەدا بۆتە دەسەڵاتو یاساو دادگا

که چارەنوسی منی کەوتۆتە دەستو ئەو بڕیار بەسەر منی یەخسیرو گیرۆدەکراودا دەدا، بەبێ بەڵگەو بەبێ تاوانبارکردنی سەلمێنراو.
ئەو مامەڵەیەو ئەم بیرانەم زیاتر کەم چیکڵانەم دەکەن، رقو گیانی تۆڵە لەناو مێشكو دەرونو هەناومدا پەنگ دەخۆنەوەو هاوار لەویژدانم دەکەن که بەو جەللادە بڵێم: برۆ هەی بێشەرمی ویژدان مردوو، ئەوە دەرسی کێ دادەیتو دەتەوێ بۆناو زەلکاو کێشی بکەیت! برۆ ونبە لەبەرچاوم.. تا دێیتەوە چۆن ئەم کاغەزو قەڵەمە بێگەردو پیرۆزانەت هێناوە که لە گوناهیان هەڵبکێشیت، هەروەك خۆیان بەسپێتی بەبێ گەردیی دەیانبەیتەوە، ئەم دەستو پەنجانە هی ئەوەنین که پیرۆز ناپیرۆزو، پاك ناپاك بکەن، قەڵەمو کاغەز پەڕەی گوڵی هەمیشە گەشاوەو بۆن خۆشن. ئامرازیی چاندنی دڵسۆزیو خاوێنیو مرۆڤ پەروەرین، ئەگەر بەدەستی پۆخڵی ئێوەوە گیریان خواردبێت، وا لەناو دەستی خاوەنەکانیاندا سەرلەنوێ ئازاد دەبنەوە، هەر بەو ئازادییە دەیبیننەوە.. دوای ئەوەش چی دەکەن بیکەن.. ئانا ئەمە بۆخۆی پێگوتنێکە، کاغەزو قەڵەم چۆن هاتووە هەروا بدرێتەوە دەستی، ئەوەش بۆخۆی وەڵامە، بۆیە پێویست بەقسەی زیاتر ناکات که راستەوخۆ ببێت بەبەڵگەی تاوانبارکردنو ئیتر لەدەستیان سەرفراز نەبیت.
ئەو رۆژە سکم ئازاری هەبو، پێچێکی زۆری پێدادەهاتو تەواو بێتاقەتی کردبووم، نائارامییو ترس خراپترین هۆی تێکچونی مەعیدەو نەخۆش کەوتنێتی. دەمویست لەدەرگا بدەم، بەڵام کێ گوێی لێیە، باشە وا گوێشیان لێی بو چۆن دەیکەنەوە.. با سەبر بگرم باشترە، دەی هەردەبێت چاوەڕوان ببم ئەی وانەکەیت چیی دەکەیت. بۆ دورخستنەوەی ئەو خەمە گەورانە، باشتر وایە بیر لەقسەکانی رەئیسی هەیئە نەکەمەوە. با خۆم لەگەڵ گۆڤارە عەرەبییەکان خەریك بکەم، خۆ من تا ئێستا دەستم بۆ نەبردون.. جا من تواناو حەوسەڵەو کاتی ئەوەم بۆ رەخساوە که بیر لەوە بکەمەوە. ئاخۆ مەسەلەکە هەر لەوەدا نییە، بەڵکو لەوەشدایە که هەڕەشەیان لێکردوم که ئەگەر دەستیان بۆ بەرم واسزای توند دەدرێم. دەی قابیلە لەپڕ دەرگا بکەنەوەو لەوە بپرسنەوە! بەخوا مەگەر هەر ئەوە دەرمانێکی کاتیی ئەم ناڕەحەتییەم بێت.. دەستم دایە دانەیەکیان، لاپەڕە لاپەڕەم کرد هیچی وا سەرنجی رانەکێشام.. دەستم دایە دانەیەکی تر، لەهەڵدانەوەی لاپەڕەکانیدا بوم که لەپڕ دەرگاکە کرایەوە، سەیرە هەروەك کامێرایان دانابێت. خۆ بێزیشیان نایەت سەربێننە ئەمدیو ژورەکە. بۆیە فریای ئەوە کەوتم که لە شوێنی خۆی دایبنێمەوە.
زۆر غەریبە هەمو جەللادەکان شیعەن: دوو عەباس، عەبدولئەئیممە، جەعفەر، ئەمیر، کازم، عەریف ئەحمەد، رەئیس عورەفا حەمەد که لەدواییدا بو بە نایب زابت.

تەنها سەلمان سوننەیە، ئیتر هەمو جەللادەکان شیعەن. دەربارەی ئەفسەرە لێکۆڵەرەکان، رەئیسەکەیان مقدم عامر موسلاوی لە دڕندەیی و بێناموسیی‌و دەم پیسیدا بەشی کەسی نەداوە، مولازم سوبحی دەنگگڕو ناخۆش، لە سنور بەدەر بە دڵسۆزیی کار بۆ هەیئەو دژ بە زیندانییەکان دەکات..

هیچ زانیارییەکی ترم دەربارەی ئەوانی تر نەبیستووە..

عەباس گوتی ئەوە لەگەڵ چیی خەریکیت؟ گوتم سکم زۆر دەیەشێت، ناچارم بەهاتوچۆی ناو ژورەکە خۆم خەریك کردوە.. رێگەم دەدەیت بچمە سەر ئاودەست. چەند جنێوێکی بێ لەزەتی‌داو گوتی وەرە دەرێ چومە دەری ژورەکە. گوتی دەی برۆ بە ئارەزوی خۆت تێر بخۆ! بەدەگمەن کاری خێری وا لەمانە دەوەشێتەوە، بۆیە دەبێت لەگەڵ شتێکی نائاسایی جوتی بکەن.. هەروەك خوا دڵی ئەم حەرەسەی نەرم کردبێت، وازوو رێگەی پێدام، تاتوانیم بێ ئەوەی تەقە لەدەرگاکە بێت یان دەنگی عەباس ببیستم خۆم تەواو بەتاڵکردەوە.. باشتر خۆمم پاککردەوە، بەڵام پاککردنەوەی چیی! کە سابون نەبێت دەستی پی بشۆیت ئەوە کەڵکی چیی دەگرێت! رەنگە پاك نەکردنەوەکە باشتر بێت! چونکە ئەمە سەرچاوەی گەلێك نەخۆشیی عاسییە. ئەوسا هاتمە دەرێ، ئای ئەوە خۆ کەسی لێ نییە. سەیرە، هیچ دەنگێکیش لەهیچ لایەکی ئەم حەوشەیەوە نابیسترێ. بەڵام حەوشەی ناوەڕاست دەنگە دەنگو ژاوەژاوی لێوەدێت. ورد ورد چومە بەردەرگاکە، بیریشم لەوە دەکردەوە کە ئایا بچمە ژورێ یان بوەستمو چاوەڕوانی ئەو بکەم.. نا نا باشتر وایە برۆمەوە ژورەکە، ئیتر چومەوە ژورەکەو بەبێ دەرگا پێوەدان لێی دانیشتم. عەباس هاتو سەیرێکی کردمو گوتی ئەوە لەوێیت؟ گوتم: بەڵێ، گوتی باشت کرد.. ئەوسا دەرگاکەی داخست.

تاقی دوانیوەڕۆ لەگەڵ شەنو کەوکردنی وەڵامی بێ وەڵامی پرسیارەکانی رەئیس خەریك بومو دەمگوت: دەبێت دوای وەرگرتنەوەی کاغەزە سپێکە چییتر بکەن؟ ئەوە خستمیە ناو دەریایەکی بێ بنەوە،، چۆن ئەم شەوم لێ دەڕواو چۆن رۆژم لێ دەبێتەوە..! ئەوسا خۆم بەخۆمم دەگوت: جا بۆچیی قورسایی زەحمەتییەکان وا لەسەرخۆت زیاتر دەکەیت! گوێ مەدەری، سبەینێ هەر شتێك بوو روبەڕوی ببە، پێویست ناکات بەگوشاری بیرچڕکردن لەسەر ئەو چارەنوسە نادیارە هێندەی تر بارەکە قورستر بکەیت.. ڕاستە ڕاستە با چاوەڕوان بم بۆ ساتی ڕووبەڕووبونی هەڕەشە نوێیەکان! چارەنوسیش دووانەو نابێت بەسیان، لەهەردووکیشیاندا تەنها سەربەرزیی سەرتۆپی ژیانی دنیاو قیامەتە..

# کاروانی بێ کۆتایی و گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## ( ٦ )

## بەرەو تاریکستانی کوێستانی هەیئە

هەرچی چۆنێك بو شەوگارم بەسەربرد. نانی بەیانیی خورا. کەوتمەوە ناو گۆمی مەنگی بیرکردنەوە لەدژەکرداری رەئیسی هەیئە کاتێك کاغەزی سپی دەبینێت، تەپەی پێی حەرەس بەرەو لای دەرگاکە نزیکو نزیکتر دەبێتەوە. دەرگاکە کرایەوە. عەریف سەیرێکی کردو گوتی:

- کوا چیت کردو چیت نوسیی؟

بەبێ قسەکردن کاغەزو قەڵەمەکەم دایەوە دەستی. ئەمدیوو ئەودیوێکی پێکرد. هێندەی تر چرچاوی غەزەباوی بوو گوتی:

- باشە باشە خۆت دەبینیتەوە.

زۆر بەسەر رۆیشتنی رەئیسی جەللادەکاندا تێپەڕنەبو کە جارێکی تر دەرگاکەم لەسەر کرایەوەو بۆ دەرەوە بانگیان کردم. چاوم بەسترایەوەو برام. وەستێنرام. دوای ماوەیەك یەکێکیان لێی پرسیم:

- ئەزانی تۆمان بۆچی هێناوە..؟

> بەڵێ.

- بۆچیی..؟

> چونکە تا ساڵی حەفتاو پێنج سیاسەتم کردووە.

هەرکە ئەوە لەدەمم هاتە دەرەوە، بەشەق و بۆکس کەوتنە گیانم، لێکۆڵەر بەجنێو داباریەوە گوتی:

- دەك لەعنەت لەخۆتو میللەتە مەجوسەکەت، تا ئێستاش نازانیت بۆچی تۆمان هێناوەتە ئێرە، یان خۆت غەشیم دەکەیت، ئەوەش ناودەنێیت سیاسەت، ئەوەکەی سیاسەت بووە، ئەوە نۆکەریی بووە نۆکەریی..

> باشە ئەی خۆتان ڕێککەوتنی ئازارتان لەگەڵیان ئیمزا نەکرد؟ دەی باشە تاوانی من چییە؟ ئەی نابێت بەتاوانێکی دیارو بە بەڵگە منتان گرتبێت؟ دەی من سوێندتان دەدەمو تکاتان لێدەکەم کە بۆم ڕوون بکەنەوە بزانم بۆچی منتان گرتووەو بۆچی وام لێدەکەن؟ ئەی چۆن دەکرێ‌و چی یاسایەك ڕێگەدەدات کە هەر لەسەر گومان یان قسەی ئەم ناحەزو ئەو ناحەز ئاوا بەمرۆڤ‌و هاوولاتیی خۆتان بکەن! دەی بەچیتان بڕوایە سوێندی پێدەخۆم کە ئێوە لەخۆڕایی منتان گرتووە. من لەگەڵ کاری خۆم و سەرپەرشتیی منداڵەکانم خەریك بوم. بپرسن بزانن هەمو ساڵێك من شوکرم وەرنەگرتووە، چونکە نیسبەتی دەرچونی قوتابی لەتاقیکردنەوەکانی بەکەلۆریدا، لەدەرسەکەمدا بەرز بووە. ئەوە سلێمانی، بەغدا، کەربەلا، نەجەف، عەمارە، ڕەمادیی.. ڕەئیسی هەیئە هەڵیدایەو گوتی:

- ئینجا ئەوانە بەخزمەت حساب دەکەیت! تۆ هەزار ئەوەندە بکەیت بێ ئەوەی هەڵوێستت لەشۆڕش‌و لەحیزب هەبێت وا یەك پولی قەڵب ناهێنێ. تۆش نەبیت‌و هەزارانی وەك تۆش نەبن، ئێمە هیچ زەرەرێك ناکەین. چونکە مامۆستای میسری‌و هیندی دەهێنین. دوقاتی مەعاشەکەی ئێوەیان دەدەینێ‌و زۆر لەئێوە باشتر دەرس دەڵێنەوە، وەك ئێوەش توشی سەریەشەمان ناکەن.

ئەوە کوا وەڵامی پرسیارەکان؟ پێم نەگوتیت دەبێت قسە بکەیت؟ دیارە پیاوی لاساری وەك تۆ شایستەی ئامۆژگاری‌و یارمەتیدان‌و ئازادکردن نییە، لەبەر ئەوە لەمەودوا قسەکردنیشت دادت نادات، ئینجا دەکەویتە بەردەم ئەشکەنجەی تەواوەتیی!

> قسەی چیی بکەم؟ دەتانەوێت درۆ بکەم‌و شتیش لەسەرخۆم هەڵببەستم؟ دەتانەوێت بەخۆڕایی خەڵکی بێ تاوان ڕاپێچی ئێرە بکرێت..

- تۆ ناوی ئەوانەمان پێ بڵێ کە تاوان بارن، کەموستەحەقی ئەو هێنانە بن.

> من ئەوبێ ویژدانییە ناکەم! بەهیچ جۆرێك کەس توشی ئەم مەینەتییە ناکەم! ئەوە بێ مروەتییە کە خەڵکی بێ تاوان توش بکرێت! باشە ئەوانە لەبەردەم یاسا ئاسمانییەکاندا، لەبەردەم یەزداندا چیی دەڵێن؟

- ئەوە دەڵێیت چیی؟

> دەڵێم بێ ویژدانیی وا ناکەم کە خەڵك توشیی ئەم مەینەتییانە بکەم، ئەوسا هەڵی دایەو گوتی:

- ئەرێ تۆ پێم ناڵێیت بۆچی مەینەتییە؟ باشە تۆمان توشی چی مەینەتییەك کردووە؟ ئاخر بوتڵمان بەکارهێناوە؟ ماڵ‌و منداڵت هێنراوە بۆ ئێرەو هەر پەلێکیان بەدەست عەسکەرێکەوە بێت؟ ئەشکەنجەی منداڵەکانت دراوە؟ نینۆکەکانت

دەرهێنراوە؟ چاومان هەڵکۆڵیویت؟ چوارپەلت بڕراوەتەوە؟ لەنانو ئاوو هەوامان کردویت؟ زیندوونیت؟ ئاخر چیت لێکراوە چیی؟ دەی ناو بڵێ ناو، گوێ مەدەرێ، هەرکەسێك تۆ ناوی بەریت، بێ تاوان نییە، بۆ تۆ وا دەزانیت ئێمە نازانین تۆ کێیت؟ وا دەزانیت هەروا ئاسان بڕوا بەدرۆکانت دەکەین؟ ئێمە دەزانین چیت لەژێر سەردایە؟ دەی ناوی ئەوانەمان پێ بڵێ کە لەگەڵتا کاردەکەنو ناوچەکەیان تێکداوە. قسە نەکەیت ئێستا دەتخەینە ناو مەینەتیی راستەقینەوە. هەمو ئەوانەی کە بیستوتە یەکە یەکە ئەنجامیان دەدەین..

تۆ بزانە چەند بێ ویژدانیت، تەنانەت بەتەنگ ماڵو منداڵی خۆشتەوە نایەیەت، لەپێناوی خۆتدا ئەوانیش دەکەیت بە قۆچی قوربانیی خۆت، دیارە تۆ زۆر خۆپەرستیت! ئەگینا بیرت لەوان دەکردەوە، کە هیچ نەبێت ژنو منداڵەکەت رزگار بکەیتو نەیەڵیت بکەونە ناو ئەو مەینەتیانەی کە بەچاوی خۆت دەیانبینیی، بڕوا بکە ئەوساکە پەشیمانیشت لێ قوبوڵ ناکەین..

کەمێك وەستا، پێدەچوو یۆقڵەمەی حاڵەتیی دەرونیی منو دژەکرداری هەڕەشەکانی بکات، لەو کاتەدا دەنگی ئینزارەکە بەرزبووەوەو راپێچی ژورەکەیان کردمەوە.. دەنگ نەبو، فڕۆکە نەبو. ئینزاری دووەم لێدرایەوە..

سادیستیی ئەم جانەوەرانە هەمو سنورێکی بەزاندووە، تەنانەت منداڵی هیچ حاڵینەبوو لەدنیاش دەگرێتەوە، نەخۆشییەکە هێندە ترسناك بووە کە بە باسی ئەشکەنجەو هێنانی مرۆڤی ساواو بێدەرەتانیش لەزەت وەربگرن. بۆیە هەندێ جار ئەم لێکۆڵەرانە بێ پێچوپەنا قسەدەکەن. ئەی ئەوە نییە ئاسان داوای ناو گوتن دەکاتو هەروا ئاسانیش بێ بینینو بێ تاوانو دوور لەهەمو لۆجیکێك دەڵێت: ئەوەی تۆ ناوی بهێنیت بێ تاوان نییە. دەی قوڕ بەسەر ئەو کەسانەی کە دەکەونە بەردەم تۆڵەسەندنەوە. دیارە مەبەستی ئەمانە تاوانبارکردنی زۆرترین ژمارەیە، ئەی لێکۆڵەرێکیان نەیدەگوت ئەگەر لەسەدا نەوەتو نۆی لەوانەی دەیانکوژین بێتاوان بن وا ئەو تەنها لەسەدا یەکە بۆ ئێمە زۆرەو خۆمان بەسەرکەوتوو لەسەر هەق دادەنێنین! چونکە ئێوە کەستان بێ تاوان نین هەموتان تاوانبارن.

ئەمانە، کوشتنو تاوانبارکردنو حوکمدانی خەڵکە نەخشەو ئامانجیانە! تا لەم رێگەیەشەوە هەر لێپرسراوە هێزو تواناو زیرەکیو دڵسۆزیو بەرهەمی کاری خۆی بۆ سەروتر نیشان بداتو پاداشتەکەی وەربگرێت.

جاوەرە ئەمانە لە گرتنەکەمدا سوکە پشکنینێکی ماڵەکەیان بکردایەو بەڵگەکان بکەوتنایەتە بەردەستیان!!

سەفەر بۆ تاریکستانی کوێستانی بێ کۆتایی:

٨- ١٢ بەرەو دووەم زیندانی تاککەسی

لەناو بێ هەناویی ئەو قسانەو بیرکردنەوە لەهێنانی ماڵو منداڵ، بوتڵ، قاچ بڕینەوە، نیمچە تاساندنێکم توش بووە، ئەوە لەناو گۆمی نەهامەتییەکانی ئەنجامەکاندا نقومی کردووم، چونکە ئەو قسانەی لێکۆڵەران دوا تروسکایی ئومێدییان نەهێشت.

لە تەتەڵەکردنی قسەو رادەی جێبەجێکردنیاندا بوم کە تەقەی دەرگاکردنەوە رایچڵەکاندمو خۆم بۆ بانگکردنە دەرەوە ئامادەکرد.

باش بوو نانی نیوەڕۆ بو، قاپێك لەم دیو دەرگاکەوە دانراو داخرایەوە. سەیرە رۆژانی تر هەر لەژێر دەرگاکەوە نانەکەیان رەوانەی ژورەوە دەکرد.. بێ ئەوەی هیچ تامو لەزەتو سودێکی هەستپێکراو درك پێ بکەم نانەکەم خواردو لەژێر دەرگاکەوە سواڵەتەکەم کرد بەودیودا. سەعاتەوەختێك دواییتر سەرلەنوێ دەرگا کرایەوە.

رەئیس عورەفا حەمەد سەیرێکی کردم، جۆرێك لەبەزەییم لەروخساریدا بەدی دەکرد، دوای هەڵوێستەیەك گوتی:

- ناوت چییە؟

< مەحمود.

- بابت؟

< مەلا عززەت.

دەی خێرا بەتانییەك هەڵبگرەو وەرە. پەلاماری بەتانییەکم داو کەوتمە دوای. لەخۆمم دەپرسیی تۆ بڵێت بۆ کوێ بێت؟

قابیلە بۆ بەردان بێتو منیش بەربدرێم؟ ئەی بۆنا دۆستو برادەرێکی هێندە زۆرم هەیە کە بۆم تێکەونو هەوڵێکی جیددی بدەن. رەنگە هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ بەردانم خەریك بن. خۆم بەو جۆرە وەڵامی قسەکانی خۆمم دەدایەوە.

نا نا بەربونی چیی! هەوڵی چیی! بۆ کێ قسەی لای بەعس بڕدەکات تابتوانێ زیندانییەکی وەك منی پێ بەربدرێت. باشە ئەی بەربون بەتانی بۆچییە یا جاری ئەو هەش بەسەرانەی کە هیچیان نەکردوە. بەربن ئەوسا بیر لەبەربونی خۆم بکەمەوە.. بەرێگاوە ئەوانە لەمێشکمدا دەخولانەوە. ئەوە خۆ بەرەو حەوشەی ناوەڕاستە پێدەچێت بۆ ژوری یەك بێت، نەخێر بۆ حەوشەی سێیەمە. ئینجا پێچێکی کردەوە، زۆری نەبرد کردمی بەژورێکدا. دەرگاکە لەسەرم داخرا..

ئەمە حەمامێکی کۆنکرێتییە. دەرپێیەکی شڕو هوڕی لێیەو هیچی تر، یەکسەر هەستم بەنسرمیی ئەم تاکزیندانە کرد، بەهێنانە بەرچاوی ژوری یەك لەنەخشەی ئەم زیندانەدا، بەوەسفەکانی سەرداری حاجی قادردا، ئەمە هەمان ئەو حەمامە ساردەیە

كە بۆی باسكردبوین‌و دەیگوت زۆر ساردە پیاو تێیدا رەق دەبێتەوە.. سەیرە ئەو لە لوتكەی ئەشكەنجەو لێكۆڵینەوەدا هێنابویان بۆ ئێرە، كەچی بۆ من وا دوای ئەو هەمو پەت پەتێنە تازە بەتازە دەمهێننە ئێرە.. ئەو بەو پتەوی‌و گەنجێتییەو لەو سەرەتای گرتنەكەیدا، لەو كۆتایی ئۆكتۆبەردا ئێرەی بە زۆر سارد دادەنا. ئەی دەبێت بۆ منی سەرمابردەڵەو دوای ئەو هەمو ئەشكەنجەو چەرمەسەرییەو لەم زستانەشدا چۆن بێت‌و حاڵی رۆژانی ئاییندە بەكوێم دەگەیەنێت؟ ئەمە دەری دەخات كە راست دەكەن وازم لێناهێنن، لێرەدا رەئیسی هەیئە هەڕەشەكانی بەئەنجام دەگەیەنێت دەی ئیتر خوا كەریمە. من هیچم لەدەستدا نییە هیواو خۆڕاگریی نەبێت.. سەرفرازیی من، ئەگەر لەچارەم نوسرابێت، بەتەنها لەو دوو خاڵەدایە.

چاوێكم بەحەمامە كۆنكرێتییەكەدا گێڕا: یەك پەنجەرەی بچوكی چوارگۆشەی بێ شوشەی تێدایە، پانی‌و درێژییەكەی هەر سیی چل سانتیمەترێك دەبێت‌و بەسەر حەوشەكەدا دەڕوانێت. گڵۆپی تێدا نییە، بەلوعەیەك‌و ئاوەڕۆگەیەكی تێدایە لەگەڵ بۆرییەك كە دە پانزدە سانتیمەترێك لەناو كۆنكرێتەكەوە بەرزبۆتەوە. دوو بۆری ئاو بەدیوارەكەدا روەو بنبانەكە بەرزبونەتەوە..

لەم پلە نوێیەی لێكۆڵینەوەو ئەو هەڕەشانەدا، ئەگەر بەرگەگرتنی ئەشكەنجە لەناو بەرگەگرتنی ورەو توانای دەرونیدا لە دەست خۆمدا بوبێت، وا بەرگەگرتنی سەرمای لەوە زیاتر كە تا ئێستا چەشتومە، لەدەست خۆمدا نییە. لەشیشم هێندە لاوازو پوكاوە بووە كە توانای سەرەتای گرتنەكەمی تێدا نەماوە. بەتایبەتیی هەڕەشەكانی ئێستا هەر ئەشكەنجە قورسەكان ناگرێتەوە. هەڕەشەكانی: ماڵ‌و منداڵ هێنان، بەكارهێنانی بوتڵ، دەست‌و قاچ بڕینەوە، چاودەرهێنان، هەڕەشەی كوشتن، دژەكرداری دوای ناردنەوەی كاغەزو قەڵەم، ئەوانە ئەشكەنجەو ئەو ژیانە پڕ لەنەهامەتییەی رۆژانی رابوردوم لا ئاسان دەكات ئاخۆ ئەمانە چۆن‌و لەكوێ دەرسیان دادرابێت‌و مەشقیان پێكرابێت، وا ئەم جانەوەرانەیان لێ دەرچووە من بۆخۆم لەناو لێكدانەوەمدا ئەم دیاردانەم بۆ ساغ بۆتەوە:

- ئەو جەللادانە نەخوێندەوارو دواكەوتوو هەژارترین توێژاڵەكانی كۆمەڵەو هەڵبژێرراون.

- لەژیانی كۆمەڵایەتییاندا توشی گەلێك نەخۆشیی كۆمەڵایەتی‌و سایكۆلۆجی بون تا ئەو ئاستەی كە هیچ جۆرە رەوشت‌و رێزێكی مرۆڤپەروەری‌و هیچ ترسێكی یەزدانییان لانەمێنێت.

- پێش ئەوەی بهێنرێنە هەیئە، مێشكیان باشتر دەشۆنەوە، پڕی دەكەن لە زانیياری هەڵە لەسەر كوردو زیندانییەكان.. بەخوێنی رێژو ئەنتی عەرەب‌و ئەو جۆرە دیاردانە مێشكیان ئاو ئەدەن.

- ئەگەر هەر زیندانییەك هەر جەللادو حەرەسێك بناسێ وا هەواڵ بۆ تێکدەران دەنێرێت بۆ تۆڵەسەندن لەخۆیو لەکەسو کاری.
- هەر دەرفەتێك بۆ هەر زیندانییەك هەڵبکەوێت، وا پەلاماری حەرەس دەداتو چەکەکەی لێ دەسەنێتو دەیکوژێت. بۆخۆ دەربازکردنیش کێی بەردەست بکەوێتو کێی بکەوێتە بەردەست دەیانکوژێت
- ئەگەر ئەوانە لەناوبرێن وا عیراقو حیزب شۆڕش لەهەڕەشەیەکی گەورەی ناوخۆ. لەپارچە پارچەبون، لەکوشتنو بڕین ڕزگار دەکرێن..

هەردەم ئەو پرسیارەشم لەخۆم دەکرد کە دەبێ بۆچی نەمبەنەوە شوێنی خۆم..؟ نا بڕوا ناکەم تازە تێکەڵ بە بەندەکانی هاوڕێم بکەنەوە، ئەی ڕەئیس نەیگوت ئەمە لێپرسراویانەو بەرپرسیارە لەهەمو تێکدانەکان.. نا تازە تا ماومو لەم هەیئەیەدابم تەنهایی بەشم دەبێت.

ئای کە زەحمەتە، لەناو ئەم قەسابخانەیەشدا ئەم بەڵایانەشم توش دەکەن، ئەشکەنجەو ئەم تەنهاییە کوشندەتر دەکەن. لەناو ئەو بیرانەدا بوم کە دەرگاکەیان کردەوە. بەڵام بۆچونە سەر ئاودەست بو.

سەردانی ئاودەستو دەستو دەمو چاو شوشتن هەروەك هەمان سستێمی دوو حەوشەکەی ترە. چومەوە ژوری تاریكو نوتەك. خواردنیان هێنا. بە پەلە خواردم، تا یارمەتییەکم بدا لەڕەواندنەوەی ئەو سەرمایەی بەرە بەرە کارم تێدەکات. ئەی باشە ئەم تاریکییە چۆن چارەدەکرێ؟ دەی گوێی مەدەرێو بیدەرە دەست قەدەر بزانە بەرەو کوێ دەتبات. بەتانییەکەم دابەسەر خۆمداو بە چیچکانەوە پاڵم دا بە دیوارەکەوە. سەرما، ئێش و ئازار، ئەسپێو خورووی لەشمو چرنوکەکانم لەگەڵ بیرە ئاڵۆزە تۆقێنەرەکان چواردەوریان داوم. تەواو هەست بە ئایندەیەکی تاریكو نوتەك دەکەم.. جارجارە تروسکاییەکی ئومێد دزە بۆ ناو ئەو تاریکستانە دەکاتو کەمە ئاواتێك دەبێتە میوانو بەخۆشم دەڵێم: ڕۆژانی زەحمەتیی بەرەو تەواوبونەو ڕۆژێك دێ کۆڵ بدەن. ئەی گوایە لەوە زیاتر چیم لێدەکەن بڕوام وایە لەوە گەیشتون کە لەشم بەرگەی ئەشکەنجەی تر ناگرێت، بۆیە زیاتر لەگەڵ ئەشکەنجەو تەنگ پێهەڵچنینی سایکۆلۆجی خەریك دەبن.

دوای ئەو هەموو مەینەتیە، تازە لەم ساردای کوێستانە گیریان کردوم، ئەی پرسیارە ترسناکەکان کە هەریەکەیان سزای سێدارەی بەدەمەوەیە، ئیتر تێگەیشتنیی چییو دوورکەوتنەوەی ئەشکەنجەی جەستەیی چیی! بڕوام وایە ئەمە سەرەتای ئەشکەنجە کوشندەکانەو دەبێت خۆمیان بۆ ئامادە بکەم!

دەی با لێدانیش بەردەوام بێت! من تازە لەشم خۆشە بووە، لێرەش بۆم دەرکەوتوە کە دوو ناکۆکیی تەواو دژ بەیەك لەمرۆڤدا کۆبونەتەوە:

یەکەم: بەهێزترین گیان لەبەری سەر ئەم ئەستێرەیەیە، بڕوام وایە ئەو لێدانو مامەڵەیە ئێستریش بەرگەی ناگرێت.

دووەم: لەهەمان کاتدا ئەو مرۆڤە لاوازترین گیانلەبەرە، چونکە تەنانەت لەبەردەم هەڕەشەیەکدا یان گیانلەبەرێکی یەك شانەییشدا دەڕوخێت! یان دەمرێت.

ئەو ململانێو بیرکردنەوەیە لەسبەینێ، ئەو هیلاکیو شەکەتییە وایان کرد کە خەو زاڵ ببێت بە سەرماو لەناو ئەو ساردوەدا خەوم لێبکەوێت. زۆری نەبرد سەرما رایچڵەکاندم. خەوی چیی. ژوری هەشت زۆر باشتر بو هیچ نەبێت ئەم سەرمایەی نەبو. ئیتر لەناو ئەو سەرمایەدا، لەژێر ئەو بەتانییە شڕەوە، لەسەر ئەو کۆنکرێتە، بڕواناکەم لەو شەوگارە دورو درێژەدا خەوو وەنەوزەکان لەسەعات تێپەڕییان کردبێت..

بۆ بەیانیی، دەرگاکردنەوەو لەدەرگا بدەو دەرگا داخستنەوە هوشیاریان کردمەوە. نەمدەزانیی ئەوە خەو بو یان تێکەڵەی خەیاڵو شەکەتییەکەیە. لەسوچێکەوە سەرنجم لەسەر تاقم تاقمی ئەم زیندانییە یەخسیرانە چڕکرد، لەشکرێك حەپسو یەك ئاودەستو هەمان ماوە بۆ هەر زیندانییەك، دیسان وەختێکی زۆری دەوێت. ئەوە خۆ تەواوبوونی بۆ نییە. زیاتر سەرنجم چڕکردە سەر یەکەیەکەی زیندانییەکان تا بزانم کەسیان تێدا دەناسمەوە. زۆر هەوڵمدا بێسوود بو. ڕەنگە هەر نەناسرێنەوە، هەمو وەك جڕوجانەوەری وەحشی دێنە پێش چاو. چی دیمەنێکە! ئەم بەعسە چی جانەوەرێکە! ئاخر بۆچی وا لەم مرۆڤە دەکەن! تۆ بڵێیت لەناو هیچ میللەتێکی تردا لەم توخمەی بەعس دروست بوبێت!؟ بڕواناکەم، ئەمانە لە بەرگی ئادەمیزاددا لە ڕێکەوتێکی مێژودا دزەیان بۆناو کۆمەڵگەی مرۆڤ کردوە، بڕواناکەم هیچ گیان لەبەرێکی کێوی، لە لوتکەی برسێتیدا بەمان بگەن. تۆ سەرنج بدە تەنانەت شێرو پڵنگی برسیو هار هەر بەشی خۆیان ڕاودەکەنو ئیتر بەلای لاوازترین گیان لەبەردا ناچن.

کاتێکم زانیی کەوتنە کێشکردنی سەمونو چایی. تەقەیەکم گوی لێبو سواڵەتێکو سەمونێك بەژێر دەرگاکەدا ڕەوانەی ژورەکە کرا هەروەك ژوری ژمارە هەشت.. سواڵەتەکە چایی بو، کە قومێکم لێدا لەنەوت دەچو زیاتر لەوەی کە بۆنو تامی چا بدات.. ناچارییەو دەبێت بیخۆمەوە.. هیچ نەبێت گەرمایییەکم پێدەگەیەنێت. دواییتر سواڵەتەکەم کرد بەژێر دەرگاکەدا.. بانگکردن دەستی پێکرد.. دەنگی گریانو هاوار هاوار بەزەحمەت دەگاتە ئێرە. لەپڕ دەرگا کرایەوە، چاوم بەسترایەوەو سۆندە درایەوە دەستمو ڕاکێشرام. دەبێ بەرەو مەڵبەندی ئەشکەنجە بێت؟

لەناو ئەشکەنجەدراوەکاندا وەستێنرام. بەڕاستیی ئەم ساتانە ترسناکەو نازانیت کەی دەکەونە گیانی تۆش. ئەو بیرە ڕایکێشامە ناو ئەو پرسیارەی کە دەبێ ئەمانە

چۆن بیر لە ئێمە بکەنەوە کە ئاوا بەو حەماسەتو خۆشییەوە ئەشکەنجەمان دەدەن. هەڵمەتبردنی لەپڕو سۆندەو قامچی وەشاندن بیرەکانیان بۆ هاوار هاوار گۆڕیی.. بەرگەم نەگرتو کەوتم بەزۆری شەق هەڵیانساندمەوە. دەنگی سۆندەو تێکەڵبونی بەدەاوارهاواری هاوڕێیانی زیندانەکە، بێڕەزاترین دیمەنی مرۆڤکوژییو ئاوازی ئەشکەنجەی بێکۆتایی دەخولقێنن. دیسان کەوتمەوەو هەڵسێنرامەوە..

دەی چاوەڕێی چیی دەکەیت بۆخۆت نابورێنیتەوە. بەرگە ناگریت، با لەوە زیاتر بەردەوام نەبن. کەفم لەدەمم هێناو پاش پرخە پرخێکی کەم جوڵەم لەخۆم خست. دەستبەردارم بونو بەجێیان هێشتم.

زۆری نەبرد، یەکێکیان خێرا خێرا بەقاچ دەمجوڵێنێ. دیسان جوڵەم بۆ نەکرد. هاوارهاواری دەوروپشتم نەڕە نەڕی ئیعتیراف بکە، ئیعتیراف بکە. ئەو ناوەی گرتبۆوە. کەوتنە ئاوپێداکردنی ئەشکەنجە دراوان، بەمنیشەوە. جاری واش هەبو چڕیان دەکردە سەر منو لەخوارەوە بۆ سەرەوەو بە پێچەوانەشەوە. بەرەبەرە دەنگەکان کەمو کەمتر دەبونەوە تا لەنرکە نرك زیاتر، تەنانەت دەنگو تەپەی پێی جەللادەکانیشم نەدەبیست..

لەماوەی بەجێهێشتنمدا ئەو پرسیارەم لەخۆم دوبارە دەکردەوە، تۆ بڵێیت سەرلەنوێ لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە دەست پێبکەنەوە؟ دەبێت دیسان خول بەخولو پلە بەپلە بەئامرازو پرسیاری نوێ لەسەر باسە هەستیارەکان بێت! کە هەستم بەبێدەنگیو کشو ماتی کرد، کەمێ خۆم جوڵان تا سڕیی هەندێ لەجومگەکانی لەشم دەربکەم، لەناکاو بەزۆری شەق ناچاریان کردم بەپێوە خۆم بگرم.. یەکێك گوتی: گوێ بگرە رەئیسی هەیئە قسەت بۆ دەکات، راستەوخۆ موقەددەم عامر دەستی بەقسەکردن کرد:

- وەزعت چۆنە..؟

< بەدەنگ نزمییەکی وەك سرپەو بەو جۆرەی کە ئاسان لەرستەکە نەگەن گوتم:

< خۆت دەمبینیت..! دەمویست ئەوە پیشان بدەم کە بەهیچ جۆرێك تاقەت و حەواسی قسەو وەڵامدانەوەم نەماوە.

- بۆچی وا لەخۆت دەکەیت؟ خۆم بێدەنگ کرد. دوای ساتێك چاوەڕووانی، بەسەرما نەڕاندیی:

- بۆ وەڵام نادەیتەوە؟

بەهەمان نوزەوە گوتم: چی بڵێم..؟ توانای قسەکردنم نەماوە! وەڵامی چیی بدەمەوە! من خۆم وا لەخۆم دەکەم یان ئێوە وام لێدەکەن!؟ ئێوە بڕوا بەقسەکانم ناکەن نازانم چیی بکەم تا بڕوام پێبکەن.. دەی باشە بۆ نامکوژن!؟

- گوتی تۆش بەقسەی ئێمە ناکەیت ئەگەر بەقسەی منت بکردایە، ئەم مەینەتییانەت بەسەر خۆتدا نەدەهێنا. کەمێ وەستاو ئینجا گوتی: لەگەڵ ئەوانەشدا جارێ لەکوێتە، بەڵام فرسەتیشت لەبەردەمدا ماوە.

باشە تۆ لەپێش بەیانی ئازاردا کادرێکی پێشکەوتوو ئەندامی لقی جەلالییەکان نەبویت..؟

< گوتم راستە.

- دەی ئەوانەی لەگەڵتابونو پێکەوە ئیشتان دەکرد کێ بون..؟

< خۆم بێدەنگ کرد..

- ها چیی بو.. ئەمەش بە ئیعتیراف دادەنێیت بۆیە خۆتت لێبێدەنگ کردووە؟

< نەخێر ئەمە ئیعتیراف نییە، بەڵام لەو سەردەمانەدا ئەو حیزبە هاوپەیمانتان بو. چالاکییەکانی ئاشکرابون. خۆتان هەمو شتێکتان لایە، من هیچم بەبیردا نایەتەوە. هەرچەند دەکەم ناوی کەسم نایەتەوە بیر. لەراستیدا ئێوە منتان بەدەردێك بردوە کە ناوی خۆشمم لەبیر بچێتەوە. من بۆخۆم چیمو چیی نیمو لەکوێم..

- نا نا تۆ ئەمەش، بەئیعتیراف دادەنێیت بۆیە خۆت مت کردووەو قسە ناکەیت. نازانم تۆ بۆچیی هێندە لە وشەی ئیعتیراف دەترسیت! ئیعتیراف یەعنی راستیی گوتن، ئەوەی راست بێت وا راستگۆش دەبێت، راستییەکان دەڵێت، هەمو راستگۆو راستبێژێکیش ئازایەو هەمو ئازایەکیش پاش راستیی گوتن سەرفراز دەبێت! ئا ئەوە مانای ئیعتیرافە نەك وەك تۆ تێی گەیشتویت! سەرەڕای ئەوانە ئێمە خۆمان هەمو ناوەکان دەزانین. ئەوە لیستەی هەموانە بەدەستمانەوە کە پرسیاریش لەتۆ دەکەین هەر بۆ تاقیکردنەوەیە. دەمانەوێت ئاستی راستگۆیی تۆ تاقیی بکەینەوە. ئەوە دەری دەخات کە تۆ زۆر شت دەزانیتو قسە ناکەیت. کاتت لەبەردەمدا ماوەو فریای خۆت بکەوە..

رەئیسی هەیئە ئەوەی گوتو گوێم لەدەنگی نەما.. زۆری نەبرد سۆندەکەم درایەوە دەستو کێشکرام. دواییتر گوتی چاوت بکەرەوە کە چاوم کردەوە هەمان حەمامەو کردیانەوە بەژورداو دەرگاکەم لەسەر داخرایەوە..

سەرۆکی لێکۆڵەرو جەللادان وا دەزانێت بە هەڵگێڕانەوەی وشەو رستەکان بۆ پێناسەکردنی ئیعتیرافکردنو رازاندنەوەیان بەو جۆرە، زیندانییەکان وا لە خشتە دەبات کە هەمو ببنە شەیدای ئیعتیرافکردن! ئەو لەوە خۆی گێل دەکات کە زیندانییە هوشیارەکان لەو راستییە گەیشتوون کە ئەو وشەیە مانای: رسوابوونە، پاشەکشەیە لەهەمو بەڵێنو وەفاو رەوشتو کارو ئەرکێکی نیشتمانیی، توشکردنی خەڵکی دڵسۆزو تێکۆشەرە بەزیندانیکردن یان بە لەسێدارەدان، ئەو جۆرە لەسێدارەدانو کوشتنەش کۆتایی هاتنێکی نائاسایی خۆشێتی.

هەندێك پرسيارى ئەم لێكۆڵەرانە سادەو بێ مانان، لێكدانەوەكەشيان هەر بەو جۆرەيە. جا يان خۆيان لەوانەدا سادەن يا ئێمە بەسادە دەزانن..

هەمو ناوبردنێك جۆرێك لەمەترسيى تێدايە.. نەك هەر بۆ ئەم جۆرە پرسيارە پڕ لەمەترسييانە، بەڵكو لەكاتى ئاساييشدا. بەناوى ئەوانەشەوە كە لەبەردەستيشيدا نين.. ئەگينا، وەك خۆيان دەڵێن ئەوە گێڕانەوەى مێژووە، بەتايبەتيى مێژوويەك كە خۆيان ئەرشيفێكى دەوڵەمەنديان بۆ رێك خستووە! ئەى لە سەردەمى خەباتى ئاشكرادا هەموو ناوەكانيان لە بەردەستدا نەبوون.. ئەى لە رۆژانى دواى هەرەسدا ناونووسيى سەرجەمى ئەندامانى رێكخراوو ليژنەى ناوچەو لقەكان و لێپرسراوانى پێشمەرگەيان بەهەموو عائيدون نەكرد..! بۆيە ئەگەر لەم زيندانەو لاى ئەمانو بۆ ئەم جۆرە حاڵەتانە نەبێت وا دەتوانرێت بەهەندێك ناو خۆ لەپرسيارەكە رزگار بكرێت.. بەتايبەتيى ناوى ئەوانەى كە لەبەردەستدا نين. بۆ ناوەكانى ئەو سەردەمە كەوا ئێستا لەمن داوا دەكەن: ئەوە خۆم لەبەردەستياندام.. نەوشيروان مستەفا لەشاخە، حەمە چاوشين لەسويدە.. ئەى بۆ ناوەكانى تر كە لەبەردەستدان! رەفعەتى مەلا كە دواى نەفيكردنى بۆ سەماوە، بۆ بەغدا نەقڵيان كردوەو ئێستا لەبەردەستياندايەو ئاسان دەگيرێت. سمكۆ فەتحوڵلا لە سلێمانييەو لەبەردەستياندايەو ئاسان دەكەوێتە ناو دەستيان. بەڵام دوور نييە هەر ناوێك لەزار بێتە دەرێ، يا لەبەر دەستيشدا نەبێ، يا تەنانەت لەسێدارەدراوو كۆچ كردووەكانيش بێت، ببێتە هۆى داواى ناوى تر، يان بيركردنەوە لە ئەزييەتدانى كەسو كار! ئەگينا چالاكيى ئەو سەردەمانە ئاشكرابون.. ئەو پرسيارو وەڵامانە ئەگەر لەو بارودۆخەى ئەو گرتوخانەيەدا نەبێت ئەوانە وەك خۆيان دەڵێن ئيعتيراف نييە، بەڵام بۆ ئێرە ئەگەر بێ زيانيش بێت وا هەر ناجاييزە، بۆيە خۆلادان لە وەڵام سەلامەتترينو باشترين وەڵامە، تەنانەت لەناوهێنانى خەڵكێ كە لەئارادا نەبن.

نان هێنرا.. وەك رۆژانى زۆرى ژمارە هەشت بوو، ئەوە نەبێت كە تەنها يەك سەمون بۆ هەمو رۆژەكەيە. ئەمەشيان يەكێكە لەديارەكانى سەرەوژووربوونى خەتى بەيانيىو بەردەواميى ئەشكەنجەى قورسو واز لێنەهێنان.

لەوە دەچێت هەر لێرەدا چارەنوسم دياربكرێت.

رەنگە ئيتر بەرە بەرە بكەونە جێبەجێكردنى هەڕەشەكان.

خۆ ئەگەر لەسەر ئەشكەنجەش بەردەوام نەبن وا مانەوە لەم ساردەوەو لەم زستانەدا كە جێگەى هەمو زيندانييەك نييە، جێگەى بەندێكى ئاسايى نييە، بەم تاكزيندانييەو لەم جۆرە مامەڵەو گوزەرانەدا بەسە بۆ فەوتاندن، چونكە، ئەوە خۆى لەخۆيدا قورسترين ئەشكەنجەى بەردەوامو بێ پشوودانە.

لەژیان‌و مامەڵەو لێکۆڵینەوەی ئەم هەیئەیەدا ئەوەی ناوی باشەیە تێیدا نییەو نایبینیت و نایبیستیت‌و هەستی پێ ناکەیت. لەدیاردەی سەرەنجامی ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەدا نەبێت کەمیتودە سەرەکییەکانی:

> < ئەشکەنجەو لێدان‌و تۆقاندن، ئیعدام کردن دوای ئەوەی زیندانیی لەژێر زەحمەتییەکانی ئەشکەنجەدا ئیعتیرافی پێ دەکەن‌و پەنجە مۆر دەکات، بێ ئەوەی گوێ بدەنە راستی‌و ناڕاستیی، تاوانبارو بێتاوان. یاساو مافی بەرگری لەخۆ بەهۆی پارێزەرەوە، لەوەشدا زۆر بێ بەزەییانە چیان لەدەست بێت بەئەشکەنجەی دەرونی‌و گیانیی‌و هەڕەشە لەماڵ‌و منداڵ‌و دایک‌و باوک‌و کەس‌و کار، بەخراپکردنی باری ژیان‌و گوزەرانی ناو زیندانەکە، بەسوکایەتی پێکردن‌و بێز لەخۆو لەژیان هاتنەوە، وەڕزبون لەژیان تا ئاستی ئامادەبون بۆ قوبوڵکردنی بڕیاری ئیعدام بۆ ئەوەی لەو ژیانە رزگاری بێت..! تا گومان‌و بەڵگە هەبێت ئەشکەنجە قورس‌و پڕ زەحمەت‌و پڕوکێنەر تر دەبێت، تا ئەو ئاستەی کە ئەگەر بەڵگەی بێگومان هەبێت‌و زیندانییەکە ئیعتیراف نەکات ئەوا جاری وا هەیە زیندانییەکە لەژێر ئەشکەنجەدا دەکوژن..

> < لێکۆڵینەوە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییە هەمە جۆرەکان لەچەند رێگەیەکەوەیەو بەچەند شێوەیەکە بۆ مەبەستی جۆراوجۆر، بەتایبەتیی: بونی بەڵگە یان شایەت، یان ئەو بەڵگانەی لەگەڵ زیندانییەکەدا دەیگرن یان دەیدۆزنەوە یان دەستیان دەکەوێت یان زیندانییەکە ناچار دەکەن کە بە راست‌و ناڕاست ئیعتیرافی لەسەر بکات.

ئەو زانیاریانەی لەدەزگای ئەمن‌و ئیستیخبارات‌و رێکخراوە حیزبییەکانەوە تۆمارکراون‌و هەیئە داوایان دەکات.

> < کۆکردنەوەی زانیاریی کۆن لەسەر زیندانییەکە.

> < ئەو زانیارییانەی بەهۆی سیخوڕەکانیانەوە لەناو خەڵکدا، لەناو زیندانەکەو ژورەکاندا دەستیان دەکەوێت.

> < قۆزتنەوەو گەیاندنی قسە لەدەمی دۆست‌و ناسیاوو خزم‌و کەسوکارو هی ناو رێکخستنەکان‌و بلاوکراوەکانیان، بەتایبەتی ئەگەر بزانن ئەو زیندانییە سەر بەچی رێکخستنێکە. کە لەوەشدا زیاتر سیخوڕیەکانیان بەکارەکە هەڵدەستن.

> < گەڕان بەدوای بچوکترین قسەو هەڵە کە دژ بە بەعس‌و رژێم‌و لێپرسراوانی کرابێت، یان لەناو زیندانیەکاندا بکرێت.

سەرەنجامی ددانانان بەتاوانێك یا چەند تاوانێك یان نکولیکردن لەوانە بەگشتیی، دەکەوێتە دەست زیندانییەکە خۆی، مانای لە کۆتایی لێکۆڵینەوەدا ئەگەر زیندانیی ددان بەو تاوانانەدا نەنێ کە لەسەری بارکراوەو ویستراوە بەسەریدا

بسەپێنن‌و ساغیان بکەنەوە.. واتە ئەگەر شایەتیشی بەسەرەوە بێت، لەزوربەی حاڵەتدا سەرفراز دەبێت.. جاری وا هەیە بە بەڵگەوە لێکۆڵینەوە لەسەر زیندانییەك دەکرێت‌و ددان بەهیچ تاوانێکدا نانێت، ئەوەی ویستراوە لەسەری بکەن بەماڵ مۆری نەکردوە، بۆیە ئەو کەسە سەرفراز بوە. واتە خۆگریی بەرامبەر ئەشکەنجەو شێوەی خۆ دەربازکردن لەو لێکۆڵینەوانە، دەستەبەری سەرفرازییە.. ئەگەر زانیاری‌و بەڵگەی بێ نکولیکردنیش لەسەر یەکێك هەبێت‌و بەردەوام بێت لەسەر ئیعتیراف نەکردن، وا لەهەندێ حاڵەتی تردا لەژێر ئەشکەنجەدا دەکوژرێت.. یان ئەگەر لەڕوی لاوازیی جەستەوە بەرگە نەگرێت وا ئەو زیندانییە لەژێر ئەشکەنجەدا دەمرێت، لەهەندێك حاڵەتی تردا لەژێر ئەشکەنجەدا دەکوژرێت.. لەهەندێك حاڵەتی تریشدا زیندانیی سەرفراز دەبێت. زیندانیی واش هەیە شتێکی ئەوتۆی نەکردوە، یان هەرهیچی نەکردووە، لەژێر ئەشکەنجەدا هێندەی "کارو تاوان"، بەزمانی لێکۆڵەران، لەسەر خۆی باردەکات یان باری دەکەن کە ناردنە دادگاکەو بڕیاری کوشتن مسۆگەر بکات..

ئەو نەریتەی ئەم زیندانە نەهێنی‌و سەربازییەی بەعس ئەوەی دەگەیاند کە هەرکەس تاوانێك لەسەر خۆی بار نەکات‌و پەنجەمۆری نەکات، کردبێتی یا نەیکردبێت، نادرێت بەدادگا سەربازییە تایبەتەکە، ئەو کەسە دادگا نابینێت‌و حوکم نادرێت، ئەگەر بەڵگەشی لەسەر بێت.

ئەو بەڵگەو شایەتیی لەسەربونەش، زیندانییەکە دەخاتە بەردەم دوو ئەلتەرنەتیڤ:

- ئیعتیرافکردن کە ئەوە ئیعدامکردن مسۆگەر دەکات..
- ئیعتیراف نەکردن کە لەم حاڵەتەشیاندا زیندانییەکە دەخاتە بەردەم دوو ڕێگا:

کوشتن لەژێر ئەشکەنجەدا لەبەر بەرگەنەگرتن یان بەبڕیارو ئەنقەست.

یاخود سەرفرازبوون..

بۆیە لەم دۆزەخەی ڕژێم‌و دادگاکەیدا هەر ئەو تەنها دیاردەیەیە کە بەرژەوەندیی زیندانیی تێدابێت، بەرژەوەندییەك کە زۆر پڕ ئەرك‌و ئەشکەنجەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە زۆر زۆر گرنگەو هەزاران کەس خۆیان پێ سەرفرازکردوە.

ئەم شێوەی تاککەسیە لە زیندانییەکەم لەناو ئەو وەحشیخانەیەدا زیندانیی زەلیل و دەلودەکات، خراپترین شێوەی ئەشکەنجەیە بۆ هاڕینی ورەو ئومێدو بۆ شڵەقاندن و شوشتنەوەی مێشك و داتەپانی دەرونی مرۆڤ، ئەوانەش ژیانی ناو ئەو دۆزەخە سەختترو بێ هیواتر دەکەن، چونکە زۆر خسڵەتی مرۆڤانە دەشێوێنێ، بگرە مێشك لە زوربەی بێ بەش دەکات و شوێنەواریان ناهێڵێت، لەوەش سەیرتر ئەوەیە

کە تا ئێستا نەمبیستووە هیچ زایندانییەك، بە بەردەوامبوون لەسەر ئەشکەنجەدان، ئەوەندە لەم تاکزیندانانەدا بهێڵرێتەوە. ئەگەر مرۆڤ هوشیارو لێزانانە لە مەسەلەکەی خۆیو لە دوژمنەکەی نەگەیشتبێت، لەناو خۆگریی و هیوادا رۆژان بەسەر نەبات، کۆڵ بە لێکۆڵەرو لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدەر و ئەشکەنجە و ناهەمواریی نەدات، وا دوچاری ئەو بەڵایانەش دەبێت.

خۆ ئەم زیندانییە یەککەسییە لەم شوێنەدا دو خەسڵەتی باشیشی بۆ من و گرفتی گورچیلەکەم هەیە:

یەکەم: بە ئارەزووی خۆم ئاوی پاکی دەم بەلوعەکە دەخۆمەوە و بیر لە تێکەڵبوونی پریشکی میزی ئەو هەمو زیندانییە ناکەمەوە.

دووەم: دەشتوانم بە ئارەزووی خۆم کەی ویستم میز بکەم. هەرچەندە هەڕەشەی توندو تیژم لێکراوە کە بیر لە کاری وا نەکەمەوە. ئەمانەش بۆ تاکە گورچیلەکەم و لایەنێکی تەندروستیی باشن. بەڵام دانیشتن لەکاتی زۆر بۆ هێناندا هەروەك خۆی دەمێنێتەوە..

جگە لەوانە لێرەدا خەمی ئەوەشم نابێت کە لە خەولێکەوتندا هەوکردنی عەمەلیاتی سەرکەلەکەم بەرپەل و لەقە هاویشتنی ئەم و ئەو بکەوێت.

ئیتر سەرەتای کاروانی ئەم تاریکستانی کوێستانەم بەم جۆرە قسەو خۆڕاهێنانە دەستپێکرد، تا لەڕوی جەستەو دەرونییەوە خۆم بۆ رۆژگارێکی سەختتر ئامادەبکەم.

شەوێکی ساردو پڕ لە هەڵلەرزینم بەسەر برد. سەرما زیاتر گیانمی ناسك دەکردەوەو زیاتر هەستم بە ئازار دەکرد، چونکە ئەو تەنها بە تانییە شڕە ئەو سەرما زۆرە ناگێڕێتەوە.. وا بەبیرمدا بێت کە ئەگەر چەند رۆژێکی تر لێرە بمێنمەوە وا کۆتایی ژیانی بە دوادادێت..

لە سەرەتای رۆژی سێیەمدا هەمان رۆتینی دوێنێ بۆ ئاودەست و دەم و چاو شوشتن تەواوکرا.

سواڵەتە چایان هێنا. دەستم بۆ پارچە سەمونەکە برد سەیر دەکەم لەگەڵم کراوە بەدو بەشەوە.. سەیرە من لەنێوان دیوارو بەلوعەکەدا بە بەرزییەوە هەڵم گرتوە، دەبێت چ جانەوەرێك دەمی گەیشتبێتێ؟ بەخوا ئەم جێگە دەمانە هەر لەهی مشك دەچێت! باشە ئەو مشکە چۆن و لە کوێوە زەفەری بەو شوێنەو بە نانەکەم بردووە.!؟ جا ئیتر چۆن ئەوەم پێدەخورێت و چۆن بێزم دێت بیخۆم!؟

بەهەرحاڵ دەستمکرد بە کڕاندنی شوێن دەمی مشکە. برسیمەو دەبێت پاشماوەی مشکیش بخۆم، بە پاشماوەی عەسکەر ڕازیی نین وامشکیشیان لەسەر زیاد کرد.

دەستم برد بۆ چاکە هەر لە دوورەوە بۆن و بەرامەی نەوت هەست پێدەکەم. ئەم چایەی بۆ من هێنراوە لە ناوو بۆن و تام و ڕەنگی چا بێبەرییە. ئەو دیاردانە منیان خستە سەر بیری:

- ململانێ لە سەر نان و کەوتنە جەنگ لەگەڵ ئەم دوژمنە نوێیە بەسزمانە. هیچ چارێکم نەبو ئەوە نەبێت کە بەو دەرپێ شڕەی بەجێماوە کونی لانەی مشکەکان بگرم. دەرپێ شڕەم هێناو کردم بەدو کەرتەوە، بچکۆلەکەیانم خنییە دەمی ئەو لولە بەرزبوەوەی ناو چیمەنتۆکە، چونکە مشکەکان لەوێوە هاتوچۆ دەکەن.. پارچەکەی ترم لولکردو خستمە ژێر دەرگاکەوە.. تا ڕێگە لە ئەگەری هاتنە ژوورەوەی مشك بگرێت و هاتنەژورەوەی هەوای سادریش کەم بکاتەوە..

- بیر لە نەخواردنەوەی "نەوتچا"کە بکەمەوە، چونکە دوور نییە کێشەی گەدەو قورحەو نەخۆشیی ترم بۆ دروست نەکات.

بۆ سەرماو خۆپاراستن لێی، ئەم بەتانییە دادم نادات، ئەم پەنجەرە بێ شوشەیە یەکێکە لە بەڵاکان، هەرچەند تەنها دەربازگەیە بۆ هاتنەناوەوەی روناکیی! باشە بۆ پەنجەرەکە چیی بکەم! ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ سەلمان بوو بەحەرەس. ئەم تاکە سوننە مەزەبە لەناو جەللادو حەرەسەکاندا، لەکاتی جەللادییەکەیدا قسور لەکەس ناکات. بەڵام لەکاتی حەرەسیەکەیدا وەك ئەوانی تر خراپ نییە. لەپەنجەرەکەوە کەوتمە سەرنجدان بزانم کەی لەدەرگاکەوە نزیك دەبێتەوە.. تا داوای پارچە جامانەیەك بکەم کە لەو حەوشەیەدا لەگەڵ جلوپێڵاوی زەوتکراو لەزیندانییەکان نیمچە گردۆڵکەیەکیان لێدروستکراوە.. هەرکە نزیك بوەوە، لەدەرگاکەمدا، گوتی:

- هههها.. چیت دەوێت؟ گوتم:

< حەرەس! خوا بتهێڵێت! زۆرم سەرمایە، بەڵکو جامانەیەکم بدەیتێ تا ئەم پەنجەرەیەی پێ بگرم.. سەلمان بەرەو گردۆڵکەکە بوەوەو بەدەم ڕێگەوە گوتی:

- "خوا لەتۆو لەحکومەت رزگارم بکات" جامانەکەی هەڵگرتو لەپەنجەرەکەوە فڕێی دایە ئەمدیوەوەو گوتیی ها بگرە! سەیرە عەسکەری ناو هەیئە وا بە حکومەتەکەی بڵێت.. چۆن دەوێرێت؟ بۆ وا دەڵێت؟ رەنگە ئەم وەك سوننەو وەك خەڵکی رەمادی، لەناو ئەو هەمو شیعانەدا بێزار بوبێت، یان گیانی بەزەیی بەرامبەر بەم هەموو هاومەزەبە گیراوانە جوڵابێت.. یان بۆی دەرکەوتووە کە ئەم هەموو خەڵکە بێ تاوان دەهێنرێنو بەم دەردە دەبرێن یان دەکوژرێن.

هەرچی چۆنێك بێت جامانەکەم کرد بەدو کەرتەوە.. یەکێکیان بۆ پەردەی پەنجەرەکە، ئەوی تریان بۆ سەمون هەڵگرتن، قەیدی چییە، هەرچەند زۆر پیسەو کەس نازانێت هی کێ بووەو چەند مانگە لەبەر هەتاوو باراندا ماوەتەوە.. دیسان

هەر لەدەمی مشکی ناو ئەو زێراب‌و جۆگەو پیس‌و پۆخڵییە باشترە. جگە لەوە، ئاوم لەبەردەستدایەو دەتوانم بیشۆم، هەرچەندە ئاوەکە ساردەو سابونیش نییە، بەڵام چار چییە، ئەی پێشینان نەیانگوتوە: مردوش بەئاو پاك دەبێتەوە.

با تا سەلمان لێرەیە لەتە جامانەکە بکەم بە پەردەی پەنجەرەکە، نەوەك یەکێکی تریان بێت..

ئەم پەردەیە شتێك لەسەرما کەم دەکاتەوە، بەڵام بۆ ئەم تاریکستانە خراپە، خۆ ناشتوانم تازە لای بەرم.. دەی قیروسییا خۆ ئەوەش نەبێت راوە ئەسپێ هەر ناکرێت، زوربەی وەختەکە هەر تاریکە، ئەمەیان لەسەرماکە باشترە.. رەنگە واش باشتر بێت لەوانەشە بەرۆژ بتوانم لەسوچییەکییەوە سەیرێکی حەوشەکە بکەم‌و بزانم چیی روودەداو چیی دەکرێ‌و کێ دەبینم‌و کێ دەناسمەوە..، زیاتر لەوە بەرۆژ شتێك هەر دەبینم، هەرچەندە شەوەکەی تاریکستانێکە بۆخۆی.

رۆژ ژمێری خەتخەتێن:

لەناو ئەو وەزعەی خۆم‌وئەم سارداوە تاریك‌و نوتەکە، خەریکە رۆژو هەفتەم لێ تێکدەچێت، ئەگەر وا بڕوات سەرە دەگاتە سەرمانگ‌و ساڵیش. جا بۆ ئەوەی ناوی مانگ‌و رۆژەکانی هەفتەم لەبیر نەچێتەوە، دەبێت شتێك بکەم تا ئاگاداری حسابی مانگ‌و رۆژ ببم..

بەو حسابەی کە من لە ٨- ١٢وە بۆ ئێرە گوێزراوەمەتەوە، بەو پێیە سەرەتای رۆژمێرەکەم دیاریکرد. چونکە رۆژانی رابوردو لەژوری ژمارە یەك‌و هەشت ئاشکراو زانراو بوو. گرنگ ئەوەیە لەو مەودواو لێرەدا رۆژو مانگەکانم لێ تێکنەچێت.

ئیتر دەبێت لەژێر ژمارەی رۆژەکانی مانگەکەدا لەگەڵ نانخواردنی بەیانیی هەر رۆژێکی نوێدا خەتێك لەسەر دیوارەکە بکێشم.. باشە ئەی بەچیی خەتەکە بکشێم؟ خۆ لێرەدا تەنانەت بەردێکی بچکۆلەش دەست ناکەوێت! هەرچی چۆنێك بوو پارچە چیمەنتۆیەکی بچوکم کردە ئەو ئامڕازە، تا پارچە ئێسقانێك پەیدا دەبێت.

بەو جۆرە رۆژژمێرێکی ناو تاریکستانی ئەم کوێستانەی زیندانەکەم بۆخۆم سازکردو ناوی رۆژژمێری خەتخەتێنم لێنا.

لەهەیئەدا مشك دەبێت بەمار

لەم رۆژی سێیەمەدا دوای بانگکردن، دوو سەعاتێك ئەشکەنجەی ئاسایی درام و ئینجا بەهەڕەشە کۆنەکانەوە، هێنرامەوە شوێنەکەی خۆم. کات روەو شەو هەڵدەکشا. کونی لولەکەم چاکتر ئاخنیی. دەبو ژێر دەرگاکەش باشتر بگرم. نەك هەر لەبەر سەرما، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە مشك هاتوچۆی لێوە نەکات. چونکە دوای گرتنیشی، دیسان مشك هەر هاتوچۆی خۆی دەکرد.. ئیتر لەتێکی لەتە جامانەکەو

دەرپێ دڕاوەکەم پێکەوە لول کردو بەباشیی ژێردەرگاکەم پێ گرت، بەوەش خۆم دڵنیا کردو گوتم ئیتر مشك چی حەددی هەیە بێتۆ زەفەر بە پارچە سەمونەکەم بەرێت. بەتانییەکەم بەسەرخۆمداداو بەچیچکانەوە هەروەك دوو شەوی پێشوی ئەم لانەیەم، پاڵم بەدیوارەکەوەدا. بۆ ئەوەی سەرمای ئەو جێگەیە لەبیرخۆم ببەمەوە. مەلی بیروهۆشم بەرەو ئاسمانی خەیاڵی هەمە چەشنە لەشەقەی باڵیدا.. ئەو مەڵبەندە بێدەنگو خامۆشە، جگە لەدەنگی پۆستاڵی حەرەس کە پێ بە ئەرزە کۆنکرێتەکەدا دەکێشێ، هیچ دەنگێکی تر نابیسترێت. شەوگاری ئەو ساردەوە لەسەرخۆو بێباك رەوت دەکات، ئەوەی ناوی بەزەییە بەم مرۆڤە بەندو یەخسیرو پرۆکێنراوەی دەستی بەعس لە ئارادا نەماوە. منی شەکەتو کزۆڵەی ژێر ئەو بەتانییە کە گەرماییەکی ئەوتۆم پێ نابەخشێت، هەر لەروناکیی و گەرمیو خواردنو هەوای پاك بێبەش نیم بەڵکو تەنانەت لەزانینی گوزەرکردنی وەختیش بێبەشم.. هەرچەندە لەبەر سەرما، خەو ناوێرێ توخنی چاوانی من بکەوێت، دیسان خەیاڵو هیلاکیی ناو ئەو شەکەتییەم جار بەجار وەنەوزم پێ دەدەن. لەپڕ لەژوری ژمارە پێنجەوە کە دیوارێکی لەگەڵ ئەم حەمامەدا یەکەو دیواری باری درێژیشی لەگەڵ ژوری ژمارە یەکدا هاوبەشە. کە لەژوری ژمارە یەك بوم زۆر جار بۆ زانینی ژمارەی زیندانییەکانی ئەم دوو ژورە بەلێدانی دیوارەکە، بۆ هەر حەپسێك مستە کۆڵەیەك پرسیار لەیەك دەکراو ئاگاداری یەکتریيان دەکرد. دەرگای ئەم حەمامەو دەرگای ژوری ژمارە پێنج، بەسوچێکی نەوەت پلەیی زۆر لەیەك نزیك بونەتە دراوسێ، دەنگە دەنگ بەرزبووەو هاوار کرا: حەرەس حەرەس مارە مار، مار هاتۆتە ژورەوە. لەگەڵ غەڵبەغەڵبی ناو ژورەکە حەرەس بەهەڵەداوان نزیك دەرگاکە بوەو بە تورەیی‌و جنێوپێدانەوە گوتی: ئەوە چییە؟ هەمو هاواریان کرد مارە مار هاتۆتە ژورەکە. حەرەسەکە قیڕانی: بێدەنگ بن، ماری چیی؟ کوا مار بەم سەرمای زستانە هەیە! گوتیان بەخوا مارە. لەو ئاژاوەیەدا حەرەسەکە واقی وڕماوە، هەر ئەوەی لەدەست دێت کە بەنەڕەنەڕ هاواریان لێبکات: مار بەم زستانە نییە. رەنگە وابزانێت ئەمە بەشێکی ناو پیلانێکی راپەڕینی زیندانییەکانە! هەروەك ماوەیەك لەمەوبەر لەپلانێکی ئازایانەی چەند حەپسێکدا، گەلێکیان خۆیان دەرباز کرد کە ئەوەش باری ژیان و ئەشکەنجەو چاوەدێریی ئەم زیندانەی زۆر سەختتر کرد.. حەرەس نەیدەزانیی چی بکات. خێرا خێرا بەهەڕەشەوە دەیگوت: بێدەنگ نەبن دەتانکوژم، زۆری نەبرد چەند عەسکەرێك پەیدا بوون، بۆ بێدەنگکردنیان ئەوانیش کەوتنە هەڕەشەو گوڕەشە دەنگە دەنگو ژاوە ژاوی ژورەکە زیاتر لەدە دەقیقەیەك درێژەی کێشا. تومەس هەمو کێشەکە مشکێکەو بەهەڵە رێگەی کەوتە ناو زیندانەکانو ئەو

بەزمەی خولقاند. ئیتر نەمزانی مشکە یان لەژێرپێدا پلیشانەوە یان زەنەقیان بردو دەرپەڕییەوە دەرەوە! هەمو بەزمەکەش بەهۆی منی کەسیرە بوی ناو ئەم ساردوەوە خولقا، بۆچیی؟

گرتنی دەمی لولەکەو ژێردەرگاکە، لانەی لەمشکی نیشتەجێی ئەم بەشەی هەیئە تێکداوە. مشکی ماڵ لێتێکچو ڕێگەی گەڕانەوەی بەناو پیرەبۆریدا نەماوە، بەناچاریی بەرەو حەوشەی سێیەمو ڕووەو ژێر دەرگای ئاسنین خۆی دەکشێنێت کاتێك تەکان بەرەو بۆشایی ژێر قاپییەکەدەدا، نەخێر ئەو ڕێگەیەشی لێ گیراوە، بەو سەرلێشێواوییە لەگەڵ بەردەوامیی ڕاکردنەکەیدا خۆی کردووە بە کەلەبەری قاپیی ژوری پێنجدا، بۆناو زیاتر لەپەنجا زیندانیی ئەو ژورە بچکۆلەیە، بەو جۆرە ئەم میوانە بچکۆلە ناوەختە ئەو بەزمە دەخولقێنێت. منیش لەو ناهەموارییەمدا لەبەر خۆمەوە پێدەکەنیم. شانۆگەرییەکی وام بۆ دروست بوکە زۆر لەخۆم بکەم تا پێکەنینەکەم بوەستێتەوە، نەوەکا حەرەسەکە گوێی لێبێتو توشی فەلاکەتێکی زیادەم بکات، چونکە هەر من لەوردەکارییەکانی شانۆگەرییەکە دەگەم..

بۆ بەیانیی مشکی پلیشاوە لەگەڵ تەنەکەی میزدا هێنرایە دەری ژورەکەو فڕێ درا.

ئەمڕۆ دەی مانگی دێسەمبەر ٣٢ ساڵ لەمەبەر UN لائیحەی مافی مرۆڤی بڵاوکردەوە..

دەی باشە ئەو ڕێکخراوە جیهانییەو دنیای دەرەوە کە ناوی شارستانیەتیان لەخۆیان ناوە. بەم زوڵمانە نازانن؟ لەگوێی گادا نوستون ئاگادار ناکرێن! ئەی ئەو مافە زەوتکراوانە، ئەی ئەو هەمو کوشتنو بڕینە، ئەو هەمو دەست درێژییە بۆ سەر مرۆڤو بۆ سەر ئەو مافانە ناکەونە ناو زەوتکردنی مافی مرۆڤەوە؟؟ ئەوانە دەستدرێژیی نین ئەی بۆ دەنگێ سەنگێ، قسەیەك، لەسەرهەڵدانێك، پرۆتستۆیەك، ناڕەزاییەك، ویژدان جوڵاندنێك، بەزەییەك.. نابیسترێت. باشە وا خوا تۆڵەو سزادانو هەق لێسەندنەوەکەی بۆ ئەو دنیا هەڵگرتووە! ئەی بڕیاردەرانی سەر ئەرز، ئێوە ئەی نوێنەرانی میللەتانو داڕێژەرانی بەندەکانی مافی مرۆڤ! گەر فەرتان تێدایە بۆچی ناجوڵێنو دەنگێکتان لێوە نایەت!؟

بەرەبەیانی ڕۆژی چوارەم، لەسەرماو هەڵلەرزینی گیانم، دوای کورتە خەوێك ڕاپەڕیم، هەروەك خەو بە چارەنوسەکەمەوە ببینم، چونکە وا خاڵەکانی تاوانبارکردن گەیشتونەتە لوتکە، بڕیارەکان لەبەردەم جێبەجێکردندان، سەرەنجامەکانیش زۆر بوغرنج نین:

- بۆ ئەوان دوو ئەلتەرنەتیڤ و یەك سەرەنجامە.

- بۆ منیش یەك ئەلتەرنەتیڤ و دوو سەرەنجامە.

بۆ ئەوان یان گەیشتنە مەبەست و ئیعتیراف پێکردنە، یان بەردەوامبونە لەسەر ئەشکەنجە، کە سەرەنجامی هەردووکیان هەر کوشتنە. بۆ منیش، خۆگریو بەربەرەکانیو گوێ نەگرتن لەهیچ قسەو هەڕەشەو بەڵێنێکیانە، کە سەرەنجام یان سەرفرازبوونە، یان کوشتنە لەژێر ئەشکەنجەدا. یەکەمیان:

زۆر دورەو زۆر نزیکیشە، دورە چونکە ئەم شوێن و شێوەی ئەشکەنجەدانەو ئەو تاوانبارکردنانە هەر ئەوە دەگەیەنن.

- نزیکیشە چونکە هیچ بەڵگەو شایەتێکیان بەدەستەوە نییە، خۆشم وا کۆکردۆتەوە کە بەقەدەر کونە دەرزییەك بیانو نەدەم بەدەستەوە.

دووەمیشیان: هەمیشە لەبەردەمدایە.

دوای نان خواردن کەوتبومە ناو ئەو خەیاڵانەوە کە عەریف ئەحمەد دەرگای کردەوە و هێنامییەوە ناو دنیای بینینی چرچاوی ئەوو گوتی:

وەرە، چاوی بەستمەوە.. بەدوای خۆیدا بردمی.. کە گەیشتمە بەردەمی لێکۆڵەر تەنها لەناوەکەمی پرسیو گوتی بیبەن. بێ ئەوەی هیچی تر بڵێت.. دوای چەند ساتێك یەکێك گوتی: روتبەرەوە، ئینجا دانیشە. دەستیان کرد بە بەستنەوەی هەردوو پێیەکانم. زۆری نەبرد بەرزبونەوە، بەرزکرانەوە. نەخێر هەمو لەشمی پێوە دەجوڵێت و بەرزدەکرێتەوە. وەختێکم زانی هەمو لەشم سەرەو خوار بەئاسمانەوەیەو سەرم رێك لەئەرز دەکەوێت.. خێر ئەویش بەرزبووەوە.. کەوتنە سۆندەلێدان.. بەدەنگە ناخۆشەکەی ئەحە خێرا خێرا دەیگوت مردن هەڵدەبژێریت یان وەڵامی پرسیارەکان؟ منیش لەناو هاوار هاواردا کە بەزەحمەت دێنەدەرێ، گوتم:

< من هیچ نازانم.. هەروەڵامەکەم تەواو کرد، دەنگی رەئیسی هەیئە بەرزبووەوە: خۆ خەریککردن لەگەڵ ئەمەدا بێ سودە، بیبەن و بریارەکان جێبەجێ بکەن. کە دایان گرتمەوە. لەناو هاوار هاوارو گریان و زیرە زیرەکەدا دانرام، ماوەیەکی زۆری پێ نەچو کەمێ دوریان خستمەوە. لەدەنگی ئەشکەنجەدراوان زیاتر جوڵەی کەس لەدەورم نەما، دەنگ نەما. سەرما زۆری بۆ هێنام، وەك گەڵای بەردەم رەشەبا دەلەرزم، ئازار زیاتر دەبو، بەتایبەتیی شوێنی عەمەلیاتەکە.. دەبێ بەتەمای چیی بن؟ رەنگە کاتی بوتڵ هاتبێت! باشە دەبێت کامیان بەکاربهێنن؟ هەمویان وەك یەکن؟ گرنگ بۆ ئەوان ئەوەیە کە ئەو جۆرە ئازارە بکەنە هۆی روخاندن.. زۆری نەبرد یەکێکیان گوتی: ئێستا کاتی دەعوەتەکە هاتووە! بوتڵەکەش ئامادەیە، دەی دەڵێیت چیی دەست پێبکەین؟ هیچ وەڵامێکم نەدایەوە. باشە کامیان پێش بخەین!؟ جارێ یەکەم باشترە! ئا ئا لەدواوە باشترە، چونکە خۆشترە! رەنگە خۆشت هەر ئەوەت پێ

خۆش بێت؟ وانييه! نقەم لەخۆم بڕيى. جارێكى تريش دووبارەى كردەوە وانييە! ديسان دەنگم نەبوو. بەهەموو هێزى يەك شەقى لەپشتەوەم هەڵداو بەجنێوەوە گوتى: بۆ وەڵام نادەيتەوە! گوتم: ئێوە خۆتان بڕيارى خۆتان داوە، من هەرچييەك بڵێم و چۆنتان وەڵام بدەمەوە، بێ سودەو لەبڕيارەكەتان ناگۆڕێت. دەسەڵات، هێز، ئەشكەنجە، بڕيارى كوشتن، مردن و ژيان هەموى بەدەستى خۆتانە، ئێوە بوونەتە خواى سەر ئەرزو هەمو دەسەڵاتەكانتان لەدەستى خۆتاندا كۆكردۆتەوە. منيش يەخسيرێكى دەستى ئێوەم و لەجەنگدا گيراوم. چيى دەكەن كەيفى خۆتانە.. لەگەڵ بێدەنگييەكى كورت و لێكدانەوەيەكى لەپڕى ئەو قسانەمدا وا بيرم دەكردەوە كە ئەم هەڕەشانە لەخودى جێبەجێكردنەكان پڕ ئازارترو پڕوكێنەرترن، دەى با چيم لەدڵديە بەجنێوەوە بيڵێم و تا دەستى پێ بكەن، چييان دەوێت بيكەن و رزگارم بێت.

نا نا دوور نييە ئەمانە هەر شەڕى سايكۆلۆجيى بن، خۆ دەمێكە ئەمانە ئەو هەڕەشانە دەكەن. با هەر لەسەر پلانەكەى خۆم بەردەوام بم. كەوتمەوە قسە بۆيان: من هيچ قسە و دەسەڵات و وەڵام و پرسيارێكم نييە! من تەنها يەك پرسيارو يەك وەڵام دەزانم ئەوەش: نازانم بۆچيى وا بێ بەڵگەو شايەت ئاوا لە بێتاوانێكى وەك من دەكەن؟ من هيچ نازانم ئەوە نەبێت كە لەخۆڕايى و بۆ تۆڵە وا لەمن دەكەن. ئەگينا من نە هيچ دەزانم و نەوەڵامى ئەو پرسيارانەم لايە و نە ئامادەشم خەڵكى بێ گوناه راپێچى ئێرە بكەم. من نامەوێت وەك ئێوە زوڵم لەكەس بكەم، نامەوێت كەس بەر زوڵمى ئێرە بكەوێت. ئێوە دەبێت بۆ ئەوە بگەڕێن كە خەڵكى بێ تاوان ئازاد بكەن نەك خەڵكى تر گيرۆدەى ئەم نەهامەتييە بكەن! هەر لەقسەكانم بومەوە سۆندەيان بەسەرما داباران و يەكێكيان بەجنێوەوە گوتى: ئەوە خۆ خوتبەمان بۆ دەدات! كفر دەكات! قسەمان پێ دەڵێت! دەى بوتڵەكە بێنن. كاتى ئاهەنگەكە هات دەى جەماعەت بيهێنن با بيبينێو بزانێ چيى لێ دەكرێت!

لەناو ئەو ترس و لەرزەمدا بەخۆمم دەگوت: كامە بوتڵيان بێت! دەبێت لەو سێ جۆرەى بەكارهێنراوە، هى تريش هەبێت! دەى ڤيروسيا كاميان دەكەن بابيكەن، هەر ماڵو منداڵ نەهێنن ئيتر چييتر دەكەن بابيكەن! باشە ئەى تۆ بڵێيت منداڵەكانيان هێنابێت!؟ تۆ بڵێيت ئەوان لێرەبن و لەبەرچاوى ئەوان بوتڵ بەكاربهێنن!؟ تۆ بڵێيت گەلاوێژ بڕوخێ وقسە بكات! ئايى خەمەكانم خنكێنەرن و هەر لەزيادبونيشدان!

ماوەيەك خامۆشيى چواردەورى گرتم، هەروەك بچن جەماعەت بهێنن. سەعاتەوەختێك بەجێ هێڵرام. ئينجا دەنگێك بەرزبووەوە:

- رەئيس دەڵێت بيبنەوە شوێنى خۆى، رەئيس دەڵێت بيبنەوە ژورەكە، ئەوە بۆ سبەينێ دوابخەن! سبەينێ جێبەجێ دەكرێت!

که بردمیانەوە ساردواوەکە، هەناسەیەکی کەمێك بەهیوام هەڵکێشا، ئینجا بەخۆمم دەگوت رەنگە، ماڵو منداڵ نەگەیشتبن و چاوەڕوانی ئامادەبوونیان بکەن! ئەی کێ دەڵێت ئەمانە هەموی شەڕی دەرونیی نین! ئەی کە بەڵگەیان بەدەستەوە نەبێت و گومانی زۆریشیان هەبێت وادەبێت ئەم شێوازانەی ئەشکەنجەدان بگرنەبەر، هەمو شێوەیەك تاقیبکەنەوە تا بەمەرامی خۆیان دەگەن.

نانی نیوەڕۆیان هێنا، بەڵام ناوی نانە، ئەگەر برسێتی نەبێت، پیاو بێزی لێ دەکاتەوە.. بەهەرحاڵ خواردم و چاوەڕوانی قەدەری خۆم و منداڵەکان دەکەم. رەنگە بیانهێنن! جا کێ دەڵێت نەهێنراون! ئەمانە هەموو شتێکیان لەدەست دێت، ئەو پرسیارانەش هی ئەوە نین کە دەستبەردارم بن. کات روەو عەسرو هێنانە دەرەوە بۆ سەر ئاودەستەکە هەڵدەکشێت. دواکەسیش هەر منم. کە چومە سەرئاودەستەکە لەگۆلاوەکەدا کەوتمە هێڵنج و رشانەوە، دەی خوایە ئەی چۆن دابنشیم! چیی بکەم! ئەی قوری کوێ بەسەرخۆمدا بکەم! نا دانەنیشتنی چیی! نابێت بە دەستی خۆم گرفتی ئاڵۆزتر بۆخۆم بخولقێنم! بۆیە هەرچیی چۆنێك بو بەنیوەدانیشتنەوە خۆم نیمچە رایی کرد.

کە هاتمە دەرەوە حەرەسەکە گوتی : ئاودەستەکەت بینیی چۆنە؟ دەی پاکیی بکەرەوە..

ناو تەوالێت هەمویی میزو پیساوە. قولەپێی تێدا نقوم دەبێت. لە و ماوە کورتەدا من خۆم نەگرت و رشامەوە ئەی چۆن چۆنیی ئەمە پاك بکەمەوە!؟ چۆن بەرگەی ئەم بۆگەناوە دەگرم! سۆندەی ئاوەکەی دایە دەستم و دەستمکرد بەئاوپرژێنی ناو ئاودەستەکە. نەخێر کەڵکی نییە. خێر پیساوەکە لەدەرگاکەشەوە سەری کرد بۆ دەرەوە . ئەمە گیراوەو دەبێ بەربدرێت،. کە حەرەسەکە سەرنجی‌دا بەقێزو بێزلێکردنەوە ئاوەکەی پێدا دەکەم، وا پیساو حەوشەکەشی گرتەوە، هاتە پێشەوەو دەستی کرد بەجنێودان، سوکە قۆناغە کلاشینکۆفێکیشی پێدا کێشام وگوتی: تۆ چیکارەبویت؟ گوتم مامۆستای سانەوی، گوتی دەی زۆر باشە دەبێ ئاودەست پاککردنەوەت باش خوێندبێت! ئەوە تۆ ئاودەستەکە پاك دەکەیتەوە یان حەوشەکەش پیس دەکەیت؟ برۆ ژورەوە ، ئەو دارە هەڵبگرەو کونەگیراوەکە بەربدە، کونی ئاودەستەکە گیراوەو بەری بدە، ئەوە خۆتان گرتوتانەو دەشبێت خۆتان بەری بدەن! گوتم بەرنابێت و نازانم چۆن بەردەدرێت. هەتا توانیی یەك شەقی تێسرەواندم و کەوتم. بە وردە شەق ناچاریکردم هەڵبستمەوە. گوتی دەبێت ئێستا دەرسێکمان لەسەر ئاودەست پاککردنەوە بۆ بڵێیتەوە. ئینجا بەپاڵێك روەو ناو ئاودەستەکە رەوانەی کردم. دەستم دایە دار، دەی خوایە من خۆم بەپێوە ناگرم،

سەرما هێزی لێ بڕیوم، ئێستا ئەم کارە پڕ لەزەحمەتییە چۆن بە من دەکرێت! چۆن بەرگەی بۆنی ئەم گواوە دەگرم! خۆ تا داریشی تێوەردەیت زیاتر بۆنە پیسەکە بڵاودەبێتەوە. دەستم دایە دارو کەوتمە هەوڵدان بۆ بەردانی کونی ئاودەست. بۆ یەکەم جارە لەدوای ئەوەی هێناومیانەتە ئەم زیندانە تاککەسیە ئارەق بکەمەوە، هەرچی گیانم هەیە نیشتۆتە سەر ئارەق، پریشك هەر جلە چڵکنەکانم ناگرێتەوە، بەڵکو بەر هەمو گیانم دەکەوێت. بۆن جەرگ و دڵمی هێناوەتە دەرەوە. هەرچی لەسکمدا مابو ئەویشم هێنایەوە. هیچ کاتێکی ژیانم بەقەدەر ئێستە گیانی بەزەییم وا نەجوڵاوە! دەی خوایە گیان ئەشکەنجەکە لەمە باشترە! مردن زۆر لەمە باشترە!

دەی با پەلاماری چەکەکەی بدەم و بیکوژم، با بەو جۆرە کۆتایی بەم نەهامەتییانە بهێنم. جا چۆن دەرەقەتی ئەم یاساوڵە دێم هەر دەڵێی مالۆسە! چۆن چەکەکەم لەوە پێ دەسەندرێت! باشە ئەوا دەرەقەتی هاتم و چەکەکەشم لێسەندو خۆشیم کوشت، ئەی دوای ئەوە، چۆن رزگارم دەبێت، ئەی ماڵو منداڵەکەم چی لێدەکەن، بەخوا هەمویان دەدەنە بەر گوللە! باشە ئەی چۆن دەتوانم خەڵك بکوژم. خۆ من لەژیانمدا دەرزییەکیشم بەهیچ کەسێکدا نەکردووە! لەهەموو ژیانمدا رقم لەکاری کوشتن بۆتەوە، ئیتر چۆن دەتوانم ئێستاکە ببم بەپیاوکوژ.

کورە پیاوکوژی چیی، هەرچی ئەمانە بکوژێت هەردوو دەستی سەوز دەبێت. ئەوە کارێکی نیشتمانییو ئەرکێکی پیرۆزە. ئەمانە دێنەسەر نیشتمانی تۆ، داگیرت دەکەن. ئیتر بۆچی کوشتنی ئەو جانەوەرانە پیاوکوشتن بێت، نەخێر ئەوە دوژمنی نیشتمان و مرۆڤ وگیانلەبەر پاککردنەوەیە. نا نا ئەم بیرە جەهەننەمییانە لەخۆت دور بخەرەوە، چونکە هیچ سودێکی نابێت، ئەوە خۆکوژییەکی روتە.

هەرچی چۆنێك بو بەدەم ئەو مشتومڕە خۆیییو دەرونییە، پاش هیلاکیو زەحمەتییەکی زۆر ئاودەستەکەم پاککردەوە، چەندیشم توانیی خۆم لەبەر ئاوە ساردەکە پاککردەوە، حەرەسەکە سەیرێکی ئاودەستەکەی کردو گوتی: ئافەرین، دەرسێکی باش بو، دەی مەحمود! لەخۆت بپرسە ئیعتیراف بکەیت و خۆت لەم ژیانە رزگار بکەیت باشتر نییە!؟ گوتم: راست دەکەیت بۆچی باشتر نییە، وەڵلا سەت قات باشترە، بەڵام من هیچ گوناهێکم نییە! دەی ئیعتیراف لەسەر چیی بکەم؟ هەر لەگەڵ ئەو قسەیەم لەدەم هاتەدەرەوە، شەقێکی لەرەقەڵەی ئەژنۆم هەڵداو گوتی دەی بۆ ناو دۆزەخەکە، هەر رۆژێك من لەم حەوشەیە حەرەس بم، دەبێت ئەمە بەشت بێت، تا ئیعتیرافت پێدەکەم!

کات لە پێنجەم رۆژی ئەم کوێستانە عەسرێکی درەنگە. دەرگا کرایەوە و یەکێکیان کرد بەژوردا. دەی یەزدان! ئەمەیان چیبێت؟ قابیلە قالەیەکی ترم بۆ

دروست بکەن! کوڕێکی کورتە باڵای پتەوو نیمچە قەڵەو، هەر پەڵخێکە بۆخۆی. لەتەنیشتمەوە دوای ئەوەی بەتانییەکەی دەستی ڕاخست، پاڵیدا بەدیوارەکەوە بەخێرهاتنم کردو لێیم پرسیی:

< ناوت چییە؟

< ڕەحمان- م ناوەو خەڵك کفریم.

< دەمێکە لێرەیت..؟

< زۆر نییە. بەڵام لەکفری زۆریان هێشتمەوە. سەیرە دوو ڕەحمان ناو خەڵکی یەك شارو لەم هەیئەیە دەبنە میوانی من. بابزانم چییتر لەگەڵ ئەوی تردا یەکیان پێدەگرێتەوە. ئەویش ئەو پرسیارانەی لەمن کردو گوتی:

< سەرو ڕیشت زۆر هاتوە، گوتم دەزانم..

< باشە ڕەحمان! تۆ لەسەرچیی گیراویت..؟

< لەسەر یەکێتیی نیشتمانیی..

< بۆچیی؟

< کۆمەڵە بوم و لەدواییدا بوم بەجاشیش. خۆم بێدەنگکردو گوتم واچاکە لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆم. ئەم نەریتی دووسەریو دوولایەنیو جاش پێشمەرگەیەتییە زیاتر پارتی دەیکات، ئارام و دەیانی تر قوربانیی دەستی تەحسین شاوەیسی پارتییو بەعسین! پێم سەیرە وا لەناو کۆمەڵەشدا ئەو دیاردە پڕ لە زیانە بووبێت بەباوو سنورە ئاساییو نەخشە بۆکێشراوەکەی خۆی ببەزێنێت، کە بارودۆخی سیاسییو ململانێ نائاساییەکان هەندێك ڕێکخراو بۆ ئەو مەڵبەندە ڕادەکێشێت! بە تایبەتیی بۆ هەندێك دام دەزگای هەستیار کارێکی گرنگە. جا کێ دەڵێت ڕاست دەکات! لەوە دەچێت ئەمەش گۆبەنێکی تر بێت. لەلایەکی ترەوە هاتنی ئەم میوانەم زۆر پێخۆش بو، هەم هاودەنگێك پەیدا بوە ئەگەر بمێنێتەوە، گەلێك باسی لەگەڵ دەکەمەوەو کەمێك تارماییو قورسایی ئەم تاککەسییەی پێ سوك دەکەم. گەرمییش لەم ساردواوەدا زیاتر دەکات. بەتانییەکی تریش پەیدا بووە. ڕەنگە ئەمشەو بتوانم لێشی ڕاکشێم.. ئەگەر ڕاکەم قوبوڵ بکات. بەڵام جارێ کاتی ئەوە نەهاتوە. جگە لەوە جارێ بابزانم دەمێنێتەوە یاننە. کەلێم پرسیی:

< کاکە تۆ چیکارە بویت.. گوتی:

< من کرێکاری کورەی گەچ بوم. لە دواییدا بوم بەجاش.

< کۆمەڵەش بویت و جاشیش بویت.؟ گوتی بەڵێ. وا لەمانەشدا لەگەڵ ڕەحمانی یەکەم یەك دەگرنەوە.

< دەك خوا بتگرێ بۆ خۆت و گۆڵمەزێك بۆخۆتت دروستکردوە..

> بۆچی مامۆستا؟

< هیچ هەروا قسە دەکەم دەڵێم هەق نەبو ئەوانە بکەیت. هەق بو لەگەڵ کاسبییەکەی خۆت خەریك بویتایە. باشە تۆ چۆن گیرایت؟

> بەگرتنیان دام، ویستم کارێك بکەم ئیتر پێش دەستپێکردنی گیرام، ئەوەی لەگەڵم بوو دوو سەرەبوو..

< ئەی چییان لێکردیت؟

> لەکفری زۆریان لێدام و ناچار ئیعتیرافم کرد.

< لەسەر چیی؟ کە کۆمەڵەبوم. دیارە خەڵکی تریش توشکراوە..؟

دەی رەحمان! با لەم باسە خەفەتبارانە لابدەین و بچینە سەر کاسپیکە. دەمویست لەناو پرسیاری ناراستەوخۆوە لەجۆری گرتن و هێنانەکەی‌و مەبەستی قسەکانی حاڵی ببم..

< رەحمان دەزانیت ئێمەش کورەی گەچمان لەئاغجەلەرو کانی چنارو دەربەندیخان هەیە، گوتی:

> من ماوەیەك لەدەربەندیخان لەکورەی گەچدا کارم کرد.

< ئەی ژنت هێناوە؟ هەرکە ئەوەم لەزار هاتەدەرێ، کەوتە ناو پەژارەیەکی زۆرەوە. هەناسەیەکی دورودرێژی ساردی هەڵکێشا، کورد واتەنی دوکەڵی لێ هەڵدەستا، ئەوسا گوتی:

> بەڵی ژنم هەبو بەڵام مرد. هەناسەیەکی ساردی تری بەزەحمەت هەڵکێشاو گوتی:

> زۆر زوو ژنەکەم مرد..

< باشە! چۆن و بەچیی‌و دوای چەند مرد..؟

> ئەوە چیرۆکێکی دوردو درێژە! توخوا مامۆستا گیان پرسیاری ترم لێ مەکە با برینەکانم نەکولێنەوە!

< ئاخر چۆن مرد؟ حەز دەکەم گوێم لەچیرۆکەکەی بێت.. دە توخوا ئەگەر کورتەیەکم بۆ نەگێڕیتەوە.

خۆی باشتر لێ تەخت کردو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

> دایکم زۆری لێ دەکردم کە ژن بهێنم. من تاقانەی بوم، ئەویش بێوەژن. هەرچەندە خۆم زۆرم حەزدەکرد، بەڵام پارەم نەبو. دەمویست پارە کۆبکەمەوەو ئەوسا ژن بهێنم. تا بتوانم دایکیشم هەر لەگەڵ خۆمدا بمێنێتەوەو هەمو پێکەوە بژین.

دەمێ ساڵ بو باوکم وەفاتی کردبو. ئەو بە بێوەژنیی منی پێگەیاند، دەبوو منیش ئەجری دایکێتی بدەمەوە. کەوتمە گەڕان بەدوای کاردا، تا خۆمانی لەسەر بژییەنین و شتێکیشی لێ پاشەکەوت بکەم.

هەموو هیوایەکی دایکم هاتبووە سەر ئەوە کە من ژن بهێنم و منداڵەکەم بگرێتە باوەش.

خۆشم حەزم لە کچێك دەکردو ئەویش حەزی لە من کردبو، بڕیارم دابو کەلەو زیاتر کەسی تر بەژنم نەبێت.

کەمێ پارەم پێکەوەنا. دایکیشم هەر پەلەم لێ دەکات. لەراستیشدا خۆم لەو پەلەترم بوو. بەڵام دەست کورتیی سەری لێتێکدابوم.

سەرت نەیەشێنم شتێکم پێکەوەناو داوای کچەم کرد. شەکراومان خواردەوەو مارەم کرد. ڕۆژی گواستنەوەو شاییمان دیاریکرد.

بوك هێنرایەماڵەوە، دایکم هێندە دڵخۆش و شادبو هەروەك هەمو دنیا بوبێتە موڵکی خۆی..

نانی نیوەڕۆو دواییتر نانی ئێوارەش خورا، چایی خورایەوە، میوانەکان بەڕێ کران.

مایەوە سەر دوو سێ دراوسێ، دایك و بەربوك لەئێمە زیاتر مەشغوڵن، دیارە پەلەیانە بمانکەنە پەردەوە.

دیار بوو کە بەربوك دەیویست بچینە پەردەوە..

دوای ئەوەی قەیرێکی باش لەگەڵ بوکێدا چرپەچرپی کرد، ئەوسا دەستیان گرت و بەرەو ژوری رازاوە بردیان. زۆری نەبرد بەربوك هات و دوای چەند ئامۆژگارییەك لەمنیشی گەیاند کە بچمە ژورەوە.

منیش چاوەڕوانی ئەوسات و دەقیقەیەم دەکەم بە وەسڵی لەیلەکەم شادبیم، بۆیە بەپەلە خۆم گەیاندە نازدارەکەم. ئێمە لەژورەوە، بەربوك و دایکیشم لەگەڵ چەند دراوسێیەکمان، چاوەڕوانیی رووسوری دەکەن.. هەرچیی چۆنێك بوو پەڕۆی رووسووریم دایە دەستی بەربوك و لەگەڵ دایکمدا بەزەردەخەنەیەکی پڕ لەخۆشحاڵییەوە کەوتنە لێوردبونەوەی.

ئەوسا خواحافیزیم لێکرد، دراوسێکانیش ماڵئاواییان لێکردین..

من خواخوام بو کە زوتر ماڵەکە چۆڵ ببێت و کەسی تێدا نەمێنێت، تابچمە خەڵوەتی کیژپەرستییەوە، چونکە هێندەم خۆش دەویست، ئەگەر بڵێم بوبومە مەجنونێك بۆی وا هیچ درۆی تێدانییە..

ئیتر لەخۆشیدا پام ئەرزی نەدەگرت. دوای ئەوەی دایکیشم ئیسراحەتی خۆی وەرگرت، چومەوە پاڵ ژنەکەم.

چەندین ساڵ بو چاوەڕێی ئەو شەوەم دەکرد، ئەو کچەم ئەوەندە خۆش دەویست، جوانیی‌و بۆن خۆشیی‌و لەزەتی دنیام تەنها لەودا دەبینی. نەمدەزانی

خەو چییە! دەمویست لەتێکئالآنەوە بۆ سەیرکردن و لەسەیرکردنەوە بۆ تێکئالآن بێ کۆتایی بێت. هەر لەنینۆکی پەنجەکانی پێیەوە چاوم لێ نەدەتروکاند، سەرنجەکانم ورد ورد گیانیی بێ گەردی تەی دەکرد. گوزەریان بەلەشی نەرم و نیانیدا، بەیەکە یەکەی ئەندامانی جەستەیدا دەکرد، تا دەگەیشتە دەم و لێوی ئیتر تێر تێر دەممژین، لەبۆنی سینەو مەمانی تێر نەدەبوم، ئینجا قوولّ لەچاوو برۆ مەستەکانیم دەڕووانیی کە تاڵە خاوەکانی قژی بوبونە لاولاو و بەملاوئەولایدا پەخش بوبون.. سەرلەنوێو لەدیوەکەی ترییەوە بەهەمان شێوە نیگاکانم لێی بەرەو خوار دەبونەوە، هەر لەشان و ملەوە تا پاوو پوزی نەخشاو بەپاوانە.. ئیتر تا بەرەبەیان ئەوە کاری من بوو. تا جیهان کازیوەی پێوە دەرکەوت. جوانیی ئەو دیمەنانە هۆشمیان بۆلای خۆیان رادەکێشاو گیانیان رووەو دنیای خەوهەڵفڕان، دوای ئەوەی مەلی خەوی ئەو گەیشتبووە ئاسمان. دیمەنەکانی ناو ئەو خەوەی، جوان و رەنگینتریان کردبوو. هەر سەعاتە وەختێك بەسەر ئەو خەوەدا تێپەڕ بو کە بەخەبەر هاتم. وامدەزانیی وەك رۆژانی تر دایکم زوتر هەستاوەو چای بەیانیی ئامادە کردوە. بۆیە حەزم دەکرد تاوێ زیاتر لەئامێزی بوکەکەمدا بمێنمەوە.. دوای ئەوەی گوێم لەهیچ تەقەو رەقەو جوڵەیەکی دایکم نەبوو، سەرم هەڵبڕیو سەرنجی شوێنەکەییم دا، هەر لەجێگەکەی خۆیدا مابو. دیار بوو شەکەتی رۆژێکی بێ وێنەبوو. بۆیە لام نامۆ نەبو. نەشدەبوو بە خەبەری نەهێنم، چونکە لەکارەکەم دوادەکەوتم. بۆیە بانگێکم لێکرد تا نان و چاییەکەمان بۆ حازر بکات.. وەڵام نەبو. گوتم بە خوا خەوەکەی قوڵەو ماوێتیی تێر خەوبێت. چومە پێشەوە. یەکدو جاری تر بانگم لێکرد هەر وەڵام نەبو. کەمێك جولانمەوە، نەدەنگ هەبو نە جوڵە، کە دەستم برد بۆ دەستیو سەیرێکی روخساریم کرد نە گەرمایيو نەسورایی لەلەش و روخساریدا نەماون. دنیام لەبەرچاو تاریك بو، رەنگە بورابێتەوە، کەمێك ئاوم پژاندە روخساری، بێ ئەوەی ببزوێت.. ئەی قابیلە کۆچی کردبێت؟ بڕواناکەم، ئەی بۆ ناجوڵێت؟ ئەوە خۆ دایکم زایە ببووە.. مردووە.. ئەی کردگار ئەوە راستە..؟ ئیتر ژیانم لێ تاڵبو. ژنهێنانم لێبوە شین.

< باشە لەوەو پێش نەخۆش نەبو؟

> نانا نەخۆشی چیی، بەخوا لەمن ساغتر بو..

< بەڕاستی روداوێکی سەیرە!

> جا تۆ گوێبگرە، گوێ بگرە با هەمو چیرۆکەکەت بۆ بگێڕمەوە.

< ئادەی بزانم چیی تر رویداوە؟ گوتی:

>ماوەی تەعزییەو ماتەمینیی چەند ڕۆژە بەسەرچوو. ماوەیەك بەسەر ئەو نەگبەتییەمدا تێپەڕی کرد. وا بزانم هەر مانگێك دەبو، بەیانییەك بەراچڵەکاندن بەخەبەر هاتم، سەیرم کرد ڕۆژ درەنگەو لەکار دوادەکەوم. کەوتمە پەلەپرووزێ بۆ خۆئامادەکردن و چونە سەرئیش. ویستم خۆم چاکە لێ بنێم و نە شمیل هەڵنەستێنم، بەڵام فریا نەدەکەوتم دوای ئەوەی لەسەرخۆ یەکدوو جار بانگم لێکرد، ئەوسا چومە سەر تەوالێت کە هاتمەوە دەرەوە، دەڕوانم نەشمیل هەر لەجێگەدایە. بەدەم بانگکردنەوە لێی چومە پێشەوە، خێر دەنگ نییەو دیارە خەوەکەی زۆر قووڵە.. سەرم نزیك سەری کردەوە تا بەدەم نیگاو ئەملاوئەولا ماچکردنەوە خەبەری ببێتەوە، هەستم بەجوڵە نەکرد، دەستم دایەو بەتوندی راموەشاند، هیچ کەڵکی نییە، شڵەژام، حەپەسام و نەمدەزانی چیی بکەم، تۆ بڵێیت لەسەر خۆی چوبێت، دەستم بۆ بردەوەو گوێم نا بەدڵیەوە، هەرچی ناوی گەرمیو جوڵەو دڵ لێدانە لەبوکێدا نەماوە، کەوتمە هاوارهاوارو باوکەڕۆ تا دراوسێکان بەسەرمدا داباریت.. بەڵی راستەو ڕۆژەکەم لێئاوابوو.

ئەوە بەتەواوی ئەژنۆی شکاندم. بۆیە کفری- م بەجێهێشت و سەری خۆمم هەڵگرت. بۆ کرێکاریی ئەم شارو ئەو شار دەگەڕام. ماوەیەکیش هاتمە سلێمانیی..

بەبەزەیی پێداهاتنێکی زۆرەوە گوتم: دەی بۆ خۆت خۆش بیت. رەنگە هەر ئەو مەینەتییانەش سەری لێ تێکدابیت بۆیە خۆت فرێ داوەتە ناو ئەو دووکارە دژ بەیەکەوەو بەم جۆرەش لەهەیئە توند بکرێیت..

سەری داخست و گوتی: خۆش بونی چیی. والێرە منیش بای ئیعدامکردنی خۆم قسەم کردوە، هەر ئەوە ماوە پەنجەمۆرم پێ بکەن، خۆبەخوا حەزدەکەم ڕۆحیانەتی منیش بگاتە لای ئەوان. گوتم: نانا بێئومێد مەبە، ئینشاڵڵا ئیعدام ناکرێیت، دەی هەر خوا کەریمە..

روخسارو شێوەی قسەکانی رەحمان، وایان دەردەخست کە پاك و دڵسۆزە. لەسەرزەنشتکردنی بۆ ئەو دووکارە ناکۆك بەیەکەی کەبونەتە هۆی خولقاندنی ئەو نەهامەتییەو وا ئێستاش خۆی بە ئیعدامکردن دەدات، گیانی پڕ لەبەزەیی دەهەژاندو.. بەدڵ حەزم دەکرد قسەی بۆ بکەم. بەڵام بەشێوەیەك روخابو، کە هەڵسانەوەی موعجیزەی گەرەك بێت. بۆیە بیرکردنەوە لەدوو قسەی خێر، هەر ئاسنی سارد کوتانەو هیچ سودێکی لێ نابینرێت. جگە لەوە ، بێ مەترسیش نابێت، بەوەداو بەقسەکانیشدا بۆم دەرکەوت کە هەر ئەوەش هۆی هێنانێتی بۆ ئەم ژورە.

ئەم شەو بۆ من لەم تاریکستانی ساردادوەدا لەشەوانی تر زۆر جیاواز دەبێت، هەرچەندە هەردوو چیرۆکەکەی رەحمان گەڵ خەفەتی دامێ، دیسان ئەم مانەوەیەی

لەم ژورەدا بۆ من سودی چەند لایەنەی هەیە. لەگەڵ دەمەتەقێی لەو بابەتانە، تەنگمان بەشەوگار هەڵچنیو کاتی خەوتن هات، بەتایبەتیی ئەو کەوتە باوێشك دان، دیار بو کە گەرەکێتی بخەوێت.

رەحمان ، بەپێشنیارەکەی من رازیی بو، بەتانییەك بۆ هەردوکمان بکەین بەراخەر، ئەوی تریش بدەین بەسەرخۆماندا.

شەوێکی باشترم بەسەربرد. هەرچەندە سەرما لە لەشم هەر دەرنەدەچو. ئەویش بۆخۆی هەر باکیشی نەبو. ئەو سەرەی نایەوە یەکسەر گەیاندیە ئەو دنیایەی کە لەو خەمە بەئازارانە دوورە.. بەیانی، کاتی ئاودەست من خەبەرم کردەوە.. ئەو شەوە رەحمان، بەرەکەتی خوایی بو بۆمن، چونکە نوستنی چەند سەعاتێی بۆ ئەو شوێنەو ئەو وەزعەی من شوکرانەی رەحمانی دەویست.

رۆتینە ئاساییەکانی رۆژانی تر ئەنجام دەدران. لەو ماوانەدا رەحمان کەوتە پرسیارکردن، لەسەر رابوردی سیاسییم. کورت کورت وەڵامەکەم دەدایەوە. ئەوسا هاتە سەر گرتنەکە گەڵێ پرسیارو قسەی تری لەو بابەتانەی کرد..

کە پرسیاری ئەوەم لەخۆم دەکرد ئەبێ بۆچی ئەمەیان هێنابێتە لای من؟ هیچ وەڵامێکم پێ نەبوو ئەوە نەبێت کە: روخاوی لەم بابەتە بۆ دزەپێکردنی بەندوباوی: کەس نییە بێ ئیعتیراف لەدەست ئەمانە دەربچێت! بۆ ناو بیروهۆش بەکار دەهێنرێن. روخاویی ئەو جۆرە کەسانەو ئەو تۆقاوییەی بەرامبەر ئەشکەنجە دەینوێنن، ئەگەر هوشیاریی نەبێت، زوو خۆی دەخزێنێتە ناو دەروون و گیانی زیندانییەوە.. سەرەنجام رەحمان کاری پێسپێردراوی خۆی ئاشکراکردو گوتی:

- بەخوا ئەگەر ئیعتیراف نەکەیت وازت لێناهێنن. لەناو بەزەییو رق هەستاندا گوتم: رۆڵە من نەکۆمەڵە بومو نە جاش! ئیتر ئیعتیراف لەسەر چیی بکەم. کەوام گوت تورە بو. گوتم بۆ تووڕە دەبیت ئەوە قسەی خۆتە. بە قسەکەم خاو بووەوەو گوتی:

- ئەی تۆ بڵێیت وازم لێبێنن و لەوە زیاتر لێم نەدەن؟ سەیرە گەنجێکی تۆکمەی وا کەسەیرت دەکرد دەتگوت گوللە تۆپیش نایبڕێت. شوێنەواری لێدانی پێوە دیار نییە. یەك مانگ نانی نەدەنێ دەتوانێت لەسەر غەزوبەزی خۆی بژیی. کەچی هەرکە ناوو باسی ئەشکەنجە دێت خێرا لەرز دایدەگرێو وەك مشکی بەردەم گوربەهارەی لێدێت..

رەنگە ئەوان لەناو ئەزمونی خۆیاندا بزانن کە قسەی ناو ئەو جۆرە پەك کەوتوییەی ناو وەحشتەگەریی تاقی تەنهایی ناو ئەو جۆرە ئەشکەنجە پڕوکێنەرانە، زیاتر سودی لێوەر دەگیرێت.. یان بزانن تا چەند رێو شوێن بۆ ئەم جۆرە روخاوانە دادەنرێو بیکەنە بەڵگەی وازلێنەهێنان.. بەتایبەت ئەم جۆرە روخاوانە لەجەللادو جاسوسەکانی خۆیان زیاتر دەبنە هەڕەشە بۆسەر زیندانیی لاوازو کەم ورە..

ترسناكو پڕ مەترسییش دەبن بۆ ئەوانی تر.. گوتم: جا من لەکوێ بزانم کە ئەشکەنجە دەدرێیت یاننا!

هەرکە ئەو وەرامەم تەواو کرد، دەرگاکە کرایەوەو رەحمان بانگکرا..

دوای رۆیشتنی رەحمان بەنیو سەعاتێك، دەرگاکە کرایەوەو بانگکرام. چاو بەسترایەوەو چەند هەنگاوێکم نا. بێ ئەوەی هیچ بگوترێت بەجێیان هێشتم. زیاتر لەدە دەقیقەیەك چاوەڕوانیی، ئەوسا بەزەحمەت لەرستەی دەنگێك دەگەیشتمو دەیگوت:

- رەئیس دەیەوێت. هەروەك قسە بۆ یەکێکی تر بکات. بەدوایدا گوترا:
- شتەکانیش؟ ئەی بەهەمان شێوە؟ وەك وەڵامدانەوە:
- ئا ئا هەر بەهەمان شێوە!
- ئەوانیش؟ ئەی چۆن، ئەوانیش.. دوای ئەو چەند پرسیارو وەڵامە بۆ من ناڕونە، دەنگەکان نەمانو جارێکی تر خامۆشیی باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشا..

چەند دەقیقەیەك بەسەر ئەوەدا تێپەڕ بوو کە دەنگێکی نوێ پێی راگەیاندم کە خۆت ئامادە بکە ئەمە ئەو رۆژەیە کە لێی دەترسایت! نەسیحەت زۆر کرایت، گوێت لەکەس نەگرت، تازە هیچ شتێك فریات ناکەوێت.. چونکە ئێستا گوێ لەهیچ قسەیەکت ناگیرێت، ئەوەی دەمانەوێتو ئاگادارمان کردیت وا ئێستادەیکەین. ئێستا گوێ بۆ ئیعتیرافیش شل ناکەین.. گوێت لێبو؟ گوتم چیی؟ قسەکەی دوبارە کردەوە، منیش گوتم: من گوێم خراپ بووە کە بەئاسپایی قسە دەکرێت هیچی لێ نابیستم!

یەکێکیان گوتی ئەوا رەئیس هات. پاش کەمێك دەنگی هاتە گوێمو گوتی ئەوە چییە؟ یەکێکیان گوتی: سەیدی هەمو شتێك ئامادەیە. هەروەك خۆتان ئەمرتان کرد هەموی ئامادەیە. ئەویش گوتی جاکەی گوتومە بۆ ئەمڕۆیە.. بیبەنەوە تا خۆم پێتان دەڵێم.. چونکە وا دەزانم خۆی قسە دەکاتو پێویست بەمانە نەبێت. ئەوەی گوتو بەدەنگی پێیدا زانیم دووردەکەوێتەوە. سۆندەیان دایە دەستمو بۆ شوێنەکەم برامەوە.

رۆتینی بەیانیی حەوتەم رۆژ وەك جاران تێپەڕی. ئەوەی ئەمڕۆ زیاتر هۆشم بۆ لای خۆی رادەکێشێت، نادروستیی تەنمە. بەتایبەتیی ورتە ورتی سکم، وردە پێچو وردە ئازار بەرەو ناڕەحەتبونم دەبەن. نازانم قورحەیە، ئیلتیهابە، هی نەوت خواردنەوەکەیە، هی پیسیی مشكو ئاودەستە، هی ئەو هەمو پیسو پۆخڵییە کە شەوو رۆژ تێیدا دەژیم، هی ئەم سەرما ئارامبەرەیە، هی خواردنو بێ ڤیتامینییە، هی خەمو خەفەتو ئەو هەمو دڵەڕاوکێیەیە کە بەچاو تروکاندنیش بەجێم ناهێڵن..! هی ئەشکەنجەو ئازارەکانێتی، هی ئەم تاریکستانو بێ رۆژییەیە یان هی هەمویەتی؟ پەژارەو ئازارەکان زیادو زیاتر دەبن..

نزیک نیوەڕۆ هاتنەشوێنم.. بۆ لێکۆڵینەوەو پرسیار گەڕاندیانمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم. زۆری نەبرد جارێکی تر هاتنەوە بەدوامدا. بێ هیچ قسەو پرسیارێک، دوای دەپانزدە دەقیقەیەک بەهەمان شێوە بردیانمەوە. سەیرە ئەم بەزمەیان بۆچیی بێت! چاوەڕووانی باقیی رۆژەکە بێ بانگکردن بو. تاقی نیوەڕۆی رۆژی دوایی‌تر، لەدەرگام داو داوای عیادەی دوکتۆرم کرد.. ناومیان پرسییو گوتیان باشە.. سەیرە دەبێت راست بکەن.

هەردوای ئەوە بەنیو سەعاتێك هاتنەوە بەدوامدا، بەچاوبەستراویی بردمیان. کەوەستاندمیان. دەنگی لێکۆڵەرێك کە لەوەوبەر پێی ئاشنا نەبوم، بەهەڕەشەوە هاتە گوێم کە بۆچی تا ئێستا لەفرمان دەرچوموو قسەم نەکردووەو وەڵامی یەك پرسیار چییە نەمداوەتەوە.

> گوتم من قسەی خۆمم کردوە! بەدوای قسەکەی مندا خێرا هەڵی دایەو گوتی:

- کەی قسەت کردوە چیت گوتووە، ئیعتیرافت لەسەر چیت و چییت کردووە؟

> لەسەر بێ گوناهیو بێ تاوانیم قسەم کردەوە، راستییەکانم گوتووە کە ئێوە بەخۆڕاییو بێ گوناه وام لێدەکەن. ئەگەر بەگوناهی کۆن سزام دەدەن، وابەپێی یاسای خۆتان لەگەڵم بجوڵێنەوە.. ئەگەر موحاسەبەشم لەسەر کۆن ناکەن وا غەدرم لێدەکەن. من نەخۆشمو وەزعم زۆر خراپە. عەمەلییاتی گورچیلەم کردووەو ئیلتیهابی هەیە. قورحەی مەعیدەم توش بووە. دەمەوێ بمنێرنە لای دوکتۆر، ئەگەر فریام نەکەون دەمرمو ئێوە بەرپرسیار دەبن. بەپێکەنینێکی پڕ لەگاڵتە پێکردنەوە گوتی:

- لای کێ بەرپرسیار دەبین؟ لای جەلال تاڵەبانیی؟ دادگامان بۆ دادەنێت! وادەزانیت ئەو فریات دەکەوێت؟ ئێمە بەپێی یاسا دەجوڵێینەوەو لێکۆڵینەوە دەکەین. هەر بەو پێیەش تاوانباران سزا دەدەین. ئێمە لێپرسراوەتیو ئەرکی نیشتمانیی خۆمان جێبەجێ دەکەین. ئەوەی ناوی دژایەتیو بەربەرەکانی شۆڕشە بەئاگرو ئاسن خەفەیان دەکەین. دوای ئەوە لەسەر قسەکانی رۆیشتو گوتی:

- باشە وەعدم نەدایتێ کە دەتنێرم بۆ خەستەخانە.

> دەی باشە کوا؟ خۆ کەس قسەی لەگەڵ من نەکردووە! مەعیدەم تەواو پەرێشانی کردوم.

- باشە وەعدمان دەدەیتێ قسە بکەیتو وەڵامی پرسیارەکان بدەیتەوە؟

> من هەموو راستییەکم پێ گوتون..

لەگەڵ قسەکانمدا هەست دەکەم لەلاوازیدا گیانم دەلەرزێو خۆم پێ ناگیرێت.. ئازاریش زیاترو زیاتر دەبێ.. ئیتر گوێم لەدەنگی کەس نەما. منیش بێ دەنگ چاوەڕوانم. لەپڕ زریکەی زیندانیی بەرزبووەوە، واکەوتنەوە ئەشکەنجەدانی چەند

کەسێك.. هەڵواسینو لێدانو زرمەی قامچیو کێبڵ لەگەڵ هاوارو گریانو پاڕانەوە، یەك تابلۆی بەدیمەنی وەیشومەی دژ بە مرۆڤایەتییان سازدەکرد، یەکێك هاواری دەکرد دەستم شکا، باڵم دەرهات، ئەویتر مێشکم تەقی، یەکێکی تر گونم دەرهات، دەنگێکی تر: ئایی بیکەن بۆ ڕەزای خوا وام لێمەکەن. ئیتر هەریەکەو ئاوازێکی خەمناکی دەگەیاند..

### ئەشکە نجەی دەرونگیانیی

لەناو ئەو گۆڵمەزی ئەشکەنجانەدا یەکێکی تریان هێنا، لەناوەکەیان پرسیی، چەند پرسیارێکی تریان لێکرد، بێ ئەوەی وەك لێکۆڵەر دەیەوێت وەڵام بداتەوە. ئەوسا بەسەریدا قیژاندیان: دەی خۆت داکەنە! ئەویش دەستیکرد بەپاڕانەوەو گوتی:

- لەراهی خوا من لەوەدا نەماوم کە پێم دابکەنن.. وازم لێ بهێنن. من پیاوی خوداو بێ حورمەتیم پێ مەکەن.

تومەس مام ڕۆستەمی هەژار هەرچەندە عەرەبییەکەشی خراپ نەبو، واتێدەگەییشت کە بۆکاری خراپ جلی پێی دادەکەنن. دیاربو ئەوە یەکەم بانگکردنی بو بۆ لێکۆڵینەوە. خوا ئەو قسانەی بۆ جەللادەکان ناردو ئیتر کەوتنە پەلەپەل لێی بۆ خۆداکەندن. ئەویش دەپاڕێتەوەو دەلاڵێتەوەو هاوار لەخواو پێغەمبەرو مشایەخان دەکات کە بکەونە فریایو لەو کارەساتە رزگاری بکەن. بەلام هیچ سودی نییەو کەس بەدەنگییەوە نایەت! کە چەند سوێندەیەکی پێدا کێشراو پێی گوترا:

- دەی پێمان بڵێ خۆت دایدەکەنیت یان بەزۆر پێ ت دابکەنین. چەندی تر پاڕایەوەو لالایەوەو گریاو سوێندی ئەدان، سودی نەبو تا مام ڕۆستەمی بەسزمان لەژێر باری ناچاریدا گوتی:

< باوکم چیتان دەوێ دەیلێمو وازم لێ بهێنن. دوای ئەوە بردیان. دیارە دەبێت بۆ ژوری ئیعتیرافکردن بێت، چونکە دەنگی ئەو و هاوبەشانی ئەو شانۆگەرییە نامۆو نامرۆڤانەیەم نەبیستەوە.

تا دەنگی هاوار هاوارو زرمو کوتی ئەشکەنجە دەهات لەوێ هێشتیانمەوە.. دوای ئەوە بۆ ساردا وەکە کێشکرامەوە.

بۆ ڕۆژی ئاینده دوای نان خواردن، سەرلەنوێ داوای عیادەم کردەوە. چونکە تادەهات سەغڵەتتر دەبوم، حەرەسەکە گوتی: باشە، وا دیارە شانست هەیە، چونکە ئەمرۆ دوکتۆر دێتو هەمو نەخۆشەکان دەبینێت. قسەکەی راست دەرچو، چونکە

زۆری پێنەچوو کەوتنە بانگکردنی ناوی ئەوانەی عیادەیان بۆ کرابو. بەرەبەرە نەخۆشەکانیان بانگ دەکردو دەیانبردنە لای دوکتۆرەکە. دوای نیوەڕۆ دەرگاکەیان لەسەر منیش کردەوەو بەچاوبەستراوی بۆلای دوکتۆرەکەیان بردم.

هەر بەچاوبەستراویی‌و بێ نزیك بونەوەوە دەست لێدان‌و فەحسکردن. دوکتۆرەکە لێی پرسیم.

- چیتە؟

> نەخۆشم‌و مەعیدەم تەواو بێتاقەتی کردوم.

- باشە باشە تێیگەیشتم. ئیتر بێئەوەی باسی حەب‌و دەرمان بکات.. فرمانیدا: بیبەنەوە جێگەی خۆی.

یوقڵەمەی ئەم زیندانە هەردەبێت وابێت، ئەقڵی ئەلەکترۆنیی لای رژێمی بەعس دنیای شارستانێتیی بەزاندووە، هەر بەیەك پرسیار لەوردەکارییەکانی لەشم‌و نەخۆشییەکەو ئەو ئەشیعەو ئەنالیس‌و جۆری میکرۆبەکە حاڵی بو. دەرمان موزیرەو زیان بەزیندانیی دەگەیەنێت، لەوانەیە ساغیان بکاتەوە، لەش ساغیش بۆ ئەم دیلانە پەتایەکی ترسناکەو دەبێت لەوە بپارێزرێن، ئەی ئەگەر وا نەبێت ئەوە دوکتۆرو یۆقڵەمەو تەداوییە یان گاڵتەجاڕ!؟

شەوانە سەرماکە بێ ئارامییەکەی زیاتر دەکرد. ئەوە لەسەر خەویشم رەنگی دەدایەوە، دەبونە قورسترکردنی گوشاری دەرونیی، دیارە مەعیدەشمیان خراپتر دەکرد.

لەوەش بێئومێد بوم کە گەدەم لەخۆیەوە چاك ببێت.. بۆیە بڕیارمدا وازیان لێ نەهێنم، لەمە زیاتر چیم لێدەکەن؟ بەخۆمم گوت باشە کێ دەڵێت دوکتۆرەکە شتێکی بۆ نەنوسیوم! ئەی بۆچی ئەوە تاقیی نەکەمەوە! چیی تێدایە باداوای حەب بکەم، ئەی بۆچیی داوای نەکەم، قابیلە بخورێم.. بۆیە لەدەرگاکەم دا، حەرەسەکە هاواری کرد:

- هەاا چیت دەوێت؟

> دوکتۆر حەبی بۆم نوسییوە، بەڵکو دەنکێکم بدەیتێ. حەرەس گوتی:

- بابزانم. پاش چەند دەقیقەیەك دەنگی بەرزبووەوەو گوتی:

- جارێ نەگەیشتووە چاوەڕوان بە، گوتم:

> بۆ کەی؟ جنێوێکی عەسکەرانەی داو گوتی:

- دەمت داخەو بزانە چۆن قسە دەکەیت..!

ئەمڕۆ ١٢/١٧ یە رۆژێکی رەشە لەمێژووی نەتەوەکەماندا، سی‌و چوار ساڵ لەمەوبەر، لەبەر کۆمەڵێك هۆی خۆیی‌و نیونەتەوەیی‌و هەرێمیی‌و ناوخۆی ئێران‌و،

کۆماری مەهاباد روخێنراو جارێکی تر هیوای کوردیان سەربڕی، بەڵام بێ ئەوەی بتوانن بڕواو بڕیارو خواستی نەتەوەی کورد زیندە بەچاڵ بکەن.

لەم دۆزەخو رۆژە رەشەی مندا، ئەو یادە خەمی بەرهەمەکەم لەسەر ئەو ئەزمونە کە دوو جار بەر نەشتەری سەنسور کەوتو نەهێڵرا روناکیی ببینێت، لام وروژاند، جاری دووەمی سەنسور، ئیسماعیل رەسوڵ بوو کە بۆ ئەو جۆرە کارانە لەو جێگەیە دانرابو دڵگرانی نەکردم. چونکە ئەو سیخوڕە لەشیوعییە زۆر تۆخەکانی سەر بەقیادە مەرکەزیی عەزیز حاج بو. عەزیز حاجی ناسراویش بە پاڵەوانی سەردەمی پاشایەتی، هەر لەیەکەم ساتەکانی گرتنیدا، تۆقیو بێ ئەوەی یەك زللەی لێ بدەن روخاو بو بەسیخوڕو نۆکەری بەعس.

بەڵام گلەیی زۆرم لە سەنسوری یەکەم بو. کاتی خۆی رەئوف عارف یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتیی خوێندنی کوردی بو لەبەغدا، لە سەردانێکمدا بۆ دائیرەکەی داوای کرد کە بۆچی دەستنوسەکەی لەسەر مەهابادی نەدەمێ تا رەزامەندیی لەچاپدانی وەربگرێت، کە بەهۆی بەڕێوەبەرێتییەکەوە داوای دەکات (کۆتایی ١٩٧٠). لەهێنانەوەیدا چەند تێبینییەکی "خەبیرەکە"م پێڕاگەیاندرا:- هەڵوێست بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەت توندە، چونکە سۆڤیێت هۆی روخاندنی کۆمار نەبوە. لێکدانەوەکان لەسەر شیکردنەوەی چینایەتیی سەرکردایەتیی حدکاو کۆمار زۆر توندو چەپڕەوانەیە. جا داوای کردبو تا ئەوانە نەگۆڕێت رێگەی چاپکردنی نەدرێت. لەبەر ئەوەی برادەرەکەم زۆری پێناخۆش بوو گوتی: دەزانیت خەبیرەکە کێیە؟ گوتم لەکوێ بزانم. گوتی بێ ئەوەی لای کەس باسی بکەیت، هەژارە. بەپێکەنینەوە، گوتم: برالە بۆچی هەر لەسەرەتاوە پێت نەگوتم کە ئەو خەبیرە!؟ چونکە دەزانم ئەو هەر کە چاوی بەناوەکەی من و بە پێشەکیەکە کەوتوە کە ناوی گۆڤاری رزگاریی تێدا براوە، یەکسەر بڕیاری خۆی داوە. ئەو بەهۆی بڵاوکردنەوەی نوسینەکەی نەوشیروان مستەفا (هەژاری موکریانی شایەری دەرباری بارزانی) لەو گۆڤارەدا، هەرکەسێ لەو گۆڤارەدا وشەیەکیشی نوسیبێت یا ناوی "جەلالییەتی" پێوە بێت وا لای هەژار دەکەوێتە ناو خانەی دوژمنانییەوە کە بەدوژمنی شۆڕشو کوردیشی لەقەڵەم دەدا. یادی بەخێر هونەرمەند رەفیق چالاك لەو مشتومڕەدا لەوێ دانیشتبو، گوتی:

> ئەو زوڵمە بۆچیی! ئەگەر هەژار راست دەکات با رێگەی چاپکردنی نەگرێتو لەدواییدا خۆی لەسەری بنوسێتو رەخنەی لێبگرێت. ئەمە تاکە کتێبێکە کە نوسەرێکی کورد لەسەر ئەو روداوە مەزنەی کوردستانی نوسیبێت. دووەم کتێبیشە دوای بەرهەمەکەی ئیگلتن.

لەو دیاردەیەوە دەمگوت ئەگەر ئەو هەڵە مێژووییانە بەو جۆرانە جوانەمەرگ نەکرانایە.. ئەم نەهامەتییە پڕ لە کارەساتانەش یەخەی کوردیان نەدەگرت ئاوا

دوچاری داوی ئەم داگیرکەرانە نەدەبوین. یەکێك لەسەرەنجامە خراپەکانی روخانی کۆمار دەربەدەربونی گەلێ تێکۆشەری ناسراوبو، لەتاراوگە لەگەڵ هەندێکیان دۆستایەتیم پەیدا کرد. لە رۆژگاری رەشی ژێر سایەی بەعسدا لەدوای هەرەس بۆ رۆژئاوای فورات دورخرابومەوە بەسەدان ماڵی تێکۆشەرانی کوردستانی ئێران، هەرچەند پەناهەندەبون، کەچی بۆ ئەو ناوچانە دورخرابونەوە. شەوێك لە شەوانی بەهارێکی زووی ساڵی حەفتاو حەوت دەعوەتێکمان بۆ چەند دۆستێکمان کرد. بۆ هێمنی شاعیرو نیشتمانپەروەر، کەریم حەداد، شێخ رەسوڵی بابە شێخ، حەمەدەمینی سەراجی. ئەوەی کە لەیادم ناچێت هەستە ناسکە پڕ لەسۆزو خۆشەویستییەکەی هێمن بوو کە لە مشتومڕ لەسەر رەوایی‌و ناڕەوایی شۆڕشی دژ بە رژێمی بەعس دەکرا. حەمەدەمین شەڕی چەکداریی دژ بەرژێمی بەعسی لاناڕەوا بو نەك لەبەر هەڵەی ستراتیجی سیاسیی‌و شەڕی پێشمەرگانە، بەڵکو لەبەر ئەوە کە شەڕی دژ بە رژێمی بەعسی لا هەڵە بو، بە تاکرەوی نەتەوەیشیی دادەنا، چەند هەوڵماندا کە تێی بگەیەنێن نەخشەی بەعس هەڵتەکاندنی قەوارەی نەتەوەیی کوردە، ئەو ئەم شەڕەی بەسەر کورددا سەپاندووە، درندەیی‌و هەڵمەتە کاسەیی ئەو نەبوایە، دوای هەرەسی ئازاری حەفتاو پێنج، کورد وا ئاسان‌و بەپەلە دەستی نەدەدایەوە چەك، بەڵام قسەکانمان بۆ ئەو بێ سود بو. لەناو گەرمەی ئەو مشتومڕەدا بوو کە هێمن هەڵیدایەو گوتی: ئەرێ برا: حیزبی بەعس هەردووك دەستی ناوەتە بیناقاقای کوردی عیراق‌و دەیەوێت بیخنکێنێت، ئەرێ بۆچی ناڕەوابێت کە هەوڵی خۆ سەرفرازکردن بدات، وەڵا هێندە رەوایە هێندە رەوایە، بڕواناکەم کاری لەوە ڕەواتر لەئارادا بێت. لەناو قسەکانیدا هەمو هۆش‌وگۆشی ئێمە: سامی حسەین نازم، عوسمان دزەیی، کەمالی میرزا غەفور، فەوزی رەشید نامیق، مستەفا ساڵح کەریم، حەمە ساڵح حمە ئەمین‌و بەندەی بۆ لای خۆی راکێشاوەو زەق چاومان بڕیوەتە چاوەکانی‌و گوێمان شل کردووە تا هیچ وشەیەکمان لە کیس نەچێت. وشەکان هێندە بەنازکی‌و سۆزو پەرۆشەوە لەزار دەهاتەدەر کە هاوکات لەگەڵیان فرمێسك لەچاوەکانی دەباریی، هەروەك بیانەوێت هاوئاهەنگ بن لەگەڵ وشەکانی ناومێشك‌و ئاهو هەناسەی گەرمی ناو هەناو و رازی پەنگەوە خواردووی دڵ‌و مێشکی. ئەو هێمنە ناسکە سینە گەورەیە هیچ هێمنییەك لەهیچ ئەندامێکی لەشیدا نەمابو.. سەرەتای خۆشەویستی‌و دۆستایەتیی من بۆ ئەو کەڵە شاعیرو سەرکردە سیاسییە لەو ساتەوە دەستی پێکرد.

لەبەراوردی هێمن‌و هەژاردا، دڵ رەقیی هەژار لە کردەوەو نوسینەکانیدا زۆر زەق‌و وەك یەکبوون.. رۆژێك لەرۆژان رێککەوتیش من‌و هەژاری یەك نەخستبوو.

تا لەکۆتایی بەهاری ١٩٧٤دا ڕێگەم کەوتە ناوپردان. ڕۆژێك کە دوکتۆر کەمال خۆشناویشم لەگەڵ بو، عەلی عەبدوڵلا پێی گوتین حەزدەکەم سەردانێکی ".. ئیدریسو مەسعود بکەن" گوتم لەراستیدا ئێمە هیچ کارێکمان لەوێ نییە، ڕەنگە چونەکەش بەجۆرێکی تر لێکبدرێتەوە، بۆیە نەچونمان باشترە.. سەرەنجام لەبەردەم جەختو پێخۆشبوونو سووربونی ئەودا، کە ڕێزی لامان زۆر بوو، گوتمان باشە!

کە چوینە بارەگای بارزانیی، لەهۆڵێکی زۆر گەورەدا بەبازنەیەکی پڕاوپڕی هۆڵەکە، سیی چل کەسێك لەسەر کورسی دانیشتبون.. دوای سەلام کردنمان، دانیشتووان بەخێرهاتنیان کردین. لەلای ژووری هۆڵەکەشەوە کە دیار بوو جێگەی تایبەتیی هەردوو کوڕەکەی بارزانی بوو، لەپێزی کورسییە بەتاڵەکانی ئەوان: پیاوێك، هەژار، حەمەی عەزیز دانیشتبوون دیار بو چاوەڕوانی هاتنی ئیدریسو مەسعود دەکرا، کاتیش دەمەو ئێوارەیە، وەختی نان خواردنیش لەبەردەمدایە.. لە بەخێرهاتنەکەدا، دانیشتوانی ڕیزی کوڕانی بارزانیی دوای هەمو دانیشتووان بەخێرهاتنیان کردین، پیاوەکەو حەمەی عەزیز بەناوبردن ناوی هەردوکمانیان برد، لەوەشدا هەژار خۆی دواخست، کە کەس نەما ئەوسا ڕوی لەئێمە کردو بەناوبردنێکی زەقەوە گوتی دوکتۆر کەمال بەخێربێیت!

لەدڵی خۆمدا گوتم من تەنها یەك وشەشم لەسەر ئەم پیاوە نەنوسیوە. کاتی خۆشی ئەو ناحەزایەتییەی بەرامبەر "کۆماری میللی مەهاباد" کرد، ئەی ئەم کارەی ئێستا لەسەر بەرەی خۆیو لەبەرچاوی ئەم هەمو حەشاماتە بۆچیی!؟

کە ئیدریسو مەسعود هاتنو بەگەرمییو بەناوبردن بەخێرهاتنیان کردین. منو دوکتۆر کەمالیش بۆ چاکو چۆنیکردنو تەوقە لەنزیکەوە چوین بۆ لایانو یەکە یەکە کەوتینە تەوقەکردن. کە گەیشتمە سەر هەژار، سەیرێکم کردو ئینجا ڕوم لێ وەرگێڕاو ئەوسا بەرەو پیاوەکەی تەنیشتی هەنگاوم ناو تەوقەم لەگەڵ ئەویش کردو چوینەوە جێگەی خۆمان..

هەرچەند بۆخۆم پێم خۆش نەبوو کە لە دژەکرداردا ئەو کارە بکەم، بەڵام ئەو دوو هەڵوێستەی، لەخۆم و لەکتێبەکەمو لەم جێگەیەداو لەو مەڵبەندەی بارەگای بارزانیدا، بەلاوازییم دەزانی ئەگەر ئەوە نەکەم. بەتایبەتیی ئەگەر وام نەکردایە ڕەنگ بوو بە داشکانو جۆرە لارە مللییەك دابنرایە، چونکە بەخێرهاتنەکەی هەژار سەرنجی زوربەی دانیشوانی ڕاکێشابو، وام دەزانی لەهەڵسانەکەی ئێمەشدا هەمان سەرنج لەسەر من چڕ دەکەن.

زۆری نەبرد مێزەکانی هۆڵەکە بەگۆشتو جگەرو گونو گورچیلەی برژاوو تەماتەو سەوزەو خواردنی هەمەجۆری تر ڕازێنرایەوە، چەند هەوڵیاندا کە ئێمەش

بخۆین، سوپاسمان کردن‌و گوتمان نانمان خواردووە! لەژێر گوشاردا، سەرو دوو پل گۆشتمان خوارد. ئەوە دووەم جارو دواجار بوو ئیدریس و مەسعود بارزانی ببینم، جاری یەکەم لەهاوینی حەفتاو یەکدا بو. کە سەفەری حاجی هۆمەرانمان کرد بۆ هێنانەوەی نەوشیروان بۆ سلێمانی، پێکەوە لەگەڵ عەلی عەسکەری، حەمە چاوشین‌و چەند برادەرێکی تردا بوو.

لەو سەرگوزەشتەیەدا لەخۆمم دەپرسیی: ئەرێ دەبێت چی نەهێنییەك بێت ئەو مێشك‌و دڵەی هەژار، دڵ‌و دەروونی هێمنی شاعیرو عەبدولڕەحمان زەبیحی پێکەوە گرێ دابێت کەوا لە ناخۆشترین ڕۆژگارەکانی شەڕی ناوخۆو کوشتاری تێکۆشەرانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کاری نەکردە سەر دۆستایەتیی ئەوان. لەناوهێنانی هەژاردا زۆر جار دەمگوت: خۆزگە ئەو شاعیرو نوسەرو تێکۆشەرە گەورەیە ئەوەندە تۆڵەسێن‌و دڵڕەق نەبووایە!

لەبانگکردنی ڕۆژی دوایی، دەنگێکی نەبیستراوو نوێ بۆ من.. گوتی:

- تۆی محمود؟

< بەڵێ..

- تۆ بویت داوای دەرمانت کردبو؟

< بەڵی توشی قورحەبوم‌و وەزعم زۆر خراپە، هەر ئەوەندەیە جارێ خوێن ناهێنمەوە!

- باشە چۆن دەزانیت کە توشی قورحەی مەعیدە بویت؟

< بەنیشانەکانیدا..

- تۆ دوکتۆری..؟

< نەخێر دکتۆر نیم.

- باشە ئەی چۆن لەخۆتەوە ئەو بڕیارە دەدەیت..؟

< دەی کەوابو بمنێرن بۆ خەستەخانە تا فەحس‌و تەحلیلم بۆ بکەن..

- جا تۆ بەتەمایت دوکتۆر ئەو لەشە بۆگەنە فەحس بکات، بۆ کەس بێزی دێت دەستت لێوەبدات..!

< دوکتۆر! کە هێنامیان بۆ ئێرە وانەبوم، لێرە وایان لێکردووم.

- ئێوە دەرونتان لەوە پیسترەو موستەحەقی کوشتنن.

< من هیچ هەڵەیەکم نەکردوە، فەرمون بەڵگەیەکم بدەنە دەست‌و بڵێم هەقتانە.

- ئەی زوڵمت لێدەکەین.؟

< بەڵێ زوڵم‌و تۆڵەشە.

- بۆ تۆ وادەزانیت ناتناسین، وا دەزانیت بەو خۆگێلکردنە ئێمە لەخشتە دەبەیت؟ ئەگەر وادەزانیت ئێمە لەخۆت‌و لەقسەکانت ناگەین‌و نازانین چیت کردوە. واخۆت هەڵدەخەڵەتێنیت نەك ئێمە. تۆ ناتوانیت ئەو قسانە بەسەر ئێمەدا تێپەڕ بکەیت.

لەلێو جوڵاننندا بوم كە قسەیەك بكەم، یەكێكیان گوتی: بەسە بەس چەنەبازیی مەكە ئەوە دوكتۆرە، قسەی خۆت بكە.

سەیرە دوكتۆرەكەشیان بووە بە لێكۆڵەر، هەموو شتێك پۆخڵ دەكەن. هەمو شتێك گڵاو دەكەن..

گوتم: دوكتۆر مەعیدەم زۆر ئازاری هەیە، توشی قورحەی مەعیدە بوم. ئەگەر بۆ خەستەخانەم نانێریت بەڵكو حەبی "لیبراكسم" بۆ بنوسیت! بەكۆمەڵێك جنێوەوە گوتی:

- جا كە جەنابت دوكتۆریت ئەی بۆچی هاتویتە لای من!

< ئەی بۆ كوێ بچم دوكتۆر؟ منیان بۆ لای دوكتۆر هێناوە تا دەرمانم بۆ بنوسێت! من بۆ دەرمان هاتوم!

لەدڵی خۆشمدا دەمگوت جا ئەگەر دوكتۆرەكەی هەیئە بەو جۆرە بێت، ئیتر بۆچیی لۆمەی حەرەس‌و جەللادە نەخوێندەوارەكان بكرێت! هەر بەراست بۆچی پرسیار لەجەللادەكان نەكەم بەڵكو ئەوان فریام بكەون‌و ئەو دەرمانەم بۆ بكڕن! ئەی چارچییە ئەگەر ڕێگەیەك نەدۆزمەوە وا بەبێ ئەشكەنجە ئەم مەعیدەیە دەمكوژێت! هەر خۆشم بەخۆمم دەگوتەوە: كورە ئەوانە چۆن بێ پرسی لێكۆڵەرەكان گوێ لە ئێمە دەگرن. خۆ ڕەنگە ئەوەش بكەنە هۆیەك بۆ ئەشكەنجەی زیاتر. ئەگەر دوكتۆرەكە وا گاڵتەجاڕ بێت، بیگومانە كە جەللادەكان زۆر خراپترن.. نا نا لێرە جەللاد دوكتۆرە، دوكتۆریش لێكۆڵەرە، لێكۆڵەریش جەللاد، هیچ جیاوازییەكیان نییە، بەتایبەتیی من هیچیان نابینم. بۆیە هەمویان لای من وەك یەكن، خۆ بەكردەوەش هەر ئەوە سەلماوە!

دەی ئەگەر بۆ تاوێكیش بووە بادەرمان لەبیر خۆم بەرمەوە باشترە، با ئەم ئەشكەنجە دەرونییەش بەدەستی خۆم زیادنەكەم! لەپڕ دەنگی ڕەئیسی هەیئە هات‌و گوتی:

- ها!! ئەوە محمود مەلا عزەتە.. دەزانیت ئەو بڕیارانەی داومانە ئیتر جێبەجێی دەكەین.. ئەتشارینەوەو بڵاوی دەكەینەوە كە لەژێر ئەشكەنجەدا مردووە.. ئیتر برادەرەكانت دەكەونە نوسین‌و خۆمان نوسینەكەت دەخەینە بەردەست، ئەوسا چیی دەڵێیت..؟

< بەهەمو سزایەك ڕازیم.. ئینجا گوتی:

- دوای ئەوەش هەمو ئەو شتانەی تر كە پێمان گوتیت جێبەجێیان دەكەین!

هەروەك هەڕەشە لە من نەكات‌و گوێم لەهیچ نەبوبێت گوتم:

< زۆر نەخۆشم‌و مەعیدەم تەواو بەئازارەو پەكم كەوتووە. دوكتۆرەكە هیچی بۆ نەنوسیم.. ئەویش گوتی:

- بیبەنو نەیەڵن کەس بیبینێت. سۆندەیان دایە دەستمو رایانکێشام..

لەم جیهانەی بەعسدا لەناو پرۆسەی دژ بەیاسادا، جەللادو لێکۆڵەرو دوکتۆر لەیەك پرۆژەی دژ بە مرۆڤایەتیدا بۆ رژێمی بەعس کاردەکەن، تایەك مەبەست بهێننەدیی، ئەوەش شۆردنەوەی مێشکی ئادەمیزادە لەهەمو بیرو هەڵوێستو کارێکی ئازاد، شۆردنەوەی مێشکە لەویژدانو و لەکەسێتیی سەربەخۆ، تا مرۆڤی کۆیلەی سەردەم، کۆمەڵگەیەکی کۆیلەی نوێ بخولقێنن.. باشە ئەمجارە بۆ کوێ بێت..!؟ بۆ هەر شوێنێك بێ پێم خۆشە.. هەر شوێنێك بێت ئەم سەرما سەختەی ئەم ساردادەی نییە.. لەو خەیاڵانەدا بوم کە دەرگا کرایەوەو بەژوردا کرام.. ئەوە خۆ هەر حەمامە بۆرە.. باشە چۆن دەتوانن بمشارنەوە.. خۆ هەموو رۆژێك، بێ بردن بۆ لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە، دوجار دێمە دەرەوە بۆ سەرئاودەست، لەهەرسێ ژورەکەی سەر ئەم حەوشەیەوە لەژورەکانی سێو چوارو پێنجەوە دەبینرێم.. نا بڕوا ناکەم مەبەستی ئێرە بێت، دەبێت بمبەن بۆ شوێنێکی تر. رەنگە ببرێمەوە بۆ ژوری هەشت. دەی هەر باشە، هەرچەندە دەکەومەوە ناو مەڵبەندی ئەشکەنجە، بەڵام خۆ ئەم سەرمایەم لەکۆڵ دەبێتەوە.. یان ئەوانە شەڕی دەروونییەو لەسەری بەردەوامن. ئەوانە بۆیان دەرکەوتوە کەئەشکەنجەو سەرماو سۆڵەو ئەو ژیانەو نەخۆشییەکانیش شتێکیان لێبەئەنجام نەهاتووە. بۆیە دەبێت شان بەشانی ئەشکەنجەی گیانیی زیاتر بکەونە سەر چڕترکردنی شەڕو گوشاری سایکۆلۆجیی بەهەمو شێوەکانییەوە..

جا لەوە زیاتر چیی تریان پێماوە؟ شەڕی سایکۆلۆجی لەوە سەختو پڕ مەترسیو روخێنەر تر دەبێت چیی بێت!؟ لەناو ئەم تاکزیندانییەشدا!

رۆژی ئایندە، دیسان بیرم لەسەر ئەم شاردنەوەیەو بڕیارەکانی تریان چڕدەکرد.. زیاتر چاوەڕوان بوم کە بێنو بمبەن.. لەناو ئەم جۆرە کارانەدا هەوڵیش ئەدەن دوای بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵە، بەهۆی بەکرێگیراوو جاسوسەکانیان زانیاریی لەسەر ئەم قسانە کۆبکەنەوە. بەتایبەیتی ئەو جۆرە باسانە کەلەناو زیندانییەکاندا بڵاودەبێتەوە، لەکاتی ئازادبوونی هەندێکدا، هەر ئەمانیش دەبنە سەرچاوەی گەیاندنی بۆ دەرەوە، هەتا رادەیەك بڕواشیان پێدەکرێ. جا ئەگەر رێکخراوە سیاسییەکانیش هوشیاریو سەرچاوەی باوەڕپێکراوی خۆیان نەبێت بۆ جیاکردنەوەی راستو ناراست لەو جۆرە هەواڵانەدا، وا ئاسان دەکەونە هەڵەوە..

ناوبەناو ئازاری مەعیدەو سەرمای ئەو حەمامەی بۆم کراوەتە زیندانێکی کوشندە لەگەڵ بێ خەویی نایەڵن زیاتر بیر لەو هەڕەشەو گوڕەشانە بکەمەوە. لەلایەکی ترەوە سەرم لەخۆم سوڕدەمێنێت کە چۆن ئەم لەشو گیانەم بەرگەی گرتووەو تاکەی بەرگە دەگرێت! تا رادەیەکی زۆریش دەستم لەوە شتووە کە وازم لێ

بهێنن.. جارێ واباشترە خۆم بەشتی ترەوە مەشغوڵ بکەم. باداوای خەستەخانە بکەمەوە. بەڵکو بیگرێت..

دوای نانخواردنە ئاساییەکە کەنەوتاوو پارچە سەمونێکە. بڕیاریشم داوە کەئیتر ئەو نەوتاوە نەخۆمەوەو بیڕێژم.. چونکە بەمەزەنەی خۆم ئەوە هۆی سەرەکیی ئەو ئازارەی مەعیدەمە، نان و ئاوە کە لەهەموی سەلامەتترە. لەدەرگاکەمداو داوای چونە لای دوکتۆرم کرد.. عیادەیان بۆ کردم.

لەرۆژژمێری خەتخەتێندا ئەمڕۆ سیانزدەیەم رۆژی ئەم ساردا وەیە.. بڕواناکەم هیچ زیندانییەك هێندە لێرە مابێتەوە.

کە هاتن بەشوێنمدا، هەروەك جاران چاویان بەستەوەو بردام. نەخێر بردنەکە درێژی کێشا.. هەستم کرد بۆ دەرەوەی بیناکانە. تا سەرخرامە سەر ئۆتومبیلێك. کەوتینەڕێ دوای ماوەیەك پێیان گوتم کە پەرۆکەی سەرچاو لابەرم بێ ئەوەی سەیری ئەملاو ئەولا بکەم.. دوای دە دەقیقەیەك یان کەمتر ماشینەکە وەستا. دابەزێنرامو دایانمە پێش خۆیان. دیاربو کە خەستەخانەی عەسکەرییە. کردمیان بەژورێکدا. دو کەس دانیشتون. یەکێکیان لێیپرسیم چیتە؟ گوتم مەعیدەم زۆر دەیەشێت. رەنگە قورحە بێت، ئەگەر وا بێت من هەر حەبی (لیبراکس)م بەکارهێناوە. گوتی باشە بۆت دەنوسین. دەزانیت چۆن بەکاری دەهێنیت. گوتم بەڵێ لە سەریشی نوسراوە.. دوای ئەوە هێنایانمەوە بۆ هەیئەو بۆ جێگەکەی خۆم..

لەوە دەچێت ئەمجارەیان راستییەکی تێدابێت، کاری دوکتۆرەکانیش راست بێت بێ جنێوو و قسەی ناشیرین قسەکەیان وەرگرتم:

بە پێی یاسای هەیئە، حەبەکان نادەن بەخۆمان، دەبێت لای حەرەسەکان بیت، دەبو هاوکات لەگەڵ نانخواردندا، لە دەرگا بدرێو هەریەکە داوای حەبی خۆی بکات.. دەمەو ئێوارە پێش کاتی چونە سەر ئاودەست. لە دەرگاکەم دا، داوای حەبەکەم کرد، ناوی خۆمم پێگوت.. دوای ماوەیەك.. عەباسە رەش دەنکێك حەبی لەپەنجەرەکەوە دایەدەستم.. کە سەیری دەکەم، ئەوەکەی خۆم نییە. ئەمە ئەسپرینە. لەدەرگاکەم دایەوەو گوتم حەرەس ئەمە حەبی من نییە. گوتی: بیخۆ جیاوازی نییە، دەرمان هەر دەرمانە، بیخۆ چاك دەبیتەوە. گوتم ئەمە مەعیدەم خراپتر دەکات. دوو سێ جنێوی داو گوتی ئەوە دوکتۆر نوسیویەتی بیخۆ، فڕێی نەدەیت، نەیخۆیت سەرت پان دەکەمەوە.

ئەم بەزمەیان لەهەموی خۆشترە.. بەهەزار شەڕەشەقی چەندین حەفتە ئەو حەبەم بۆ نوسرا، ئێستا وا ئەم دکتۆر عەسکەرە بەو جۆرە لێم زەوت دەکاتو یاسای پزیشکیی خۆییم بەسەردا دەسەپێنێت. بەزۆری زۆردارەکیش حەبی ترم دەرخوارد دەدات کە تەواو دژ بەنەخۆشییەکەی منە.

دەی ناچارییە با هەوڵێکی تریشی لەگەڵ بدەم.. لەدەرگاکەم دایەوەو گوتم:

< حەرەس! حەبەکەی من سەوزە سەوز.

- باشە تۆ چۆن دەزانیت حەبەکە سەوزە؟ خۆ تۆ نەتبینیوە؟ دەی پێم بڵێو بزانم لەکوێوە ئەوەت زانی!

< ئەوە حەبی لیبراکسە، لەوەوبەر بەکارم هێناوە.

- ئەوە خۆ ناوەکەشی دەزانیت! پێم نەڵێیت چۆن ئەو حەبەت بینیوە وا هەر ئێستا هەر دوو گوێچکەت دەبڕم.

< خۆم بە دوکتۆرم گوت ئەوەم بۆ بنوسێت، بۆیە دەیناسمەوە،. بەجنێودانەوە:

< باشە تۆ بۆ دوکتۆرت نوسیی یان دوکتۆر بۆ تۆی نوسیی، وا دیارە خۆت کردوە بەدوکتۆری دوکتۆران، درۆمەکەو راستییەکەم پێ بڵێ!

< من خۆم داوام لەدوکتۆر کرد کە لەوەوبەر ئەو جۆرە حەبەم بەکارهێناوە، بەڵکو هەر ئەوەشم بۆ بنوسیت، ئەویش گوتی باشە! ئەوەش هەموو راستییەکەیە..

- درۆ مەکە، تەنانەت لەمەشدا درۆمان لەگەڵ دەکەیت؟

ئەم بەزمەیان خۆشە، وا دیارە گێچەڵێکی تریشم بۆ دروست بو. ئەوسا دەستم کرد بەسوێندخواردن کە ئەوە دوکتۆر نوسیویێتیو هیچی تر. بڕوام نییە ئەمە هەر کرداری خۆی بێت، ئەمە نەخشەو کاری هاوبەشیی هەموویانە بە دوکتۆرەکانیشەوە، ئەگینا چیی قورحەی مەعیدەو ئەسپرین یەکدەخات جگە لە یاسای ئەم زیندانەی بەعس نەبێت! دەی با ئەم جارەیان وابێت بابزانین سبەینێ چۆن دەبێت!

رۆژی ئایندە دوای نانی بەیانیی، سەرلەنوێ داوای حەبەکەم کردەوە.. باشە ئەم جارەیان عەباسە رەش لەوێ نییە. بەڵکو یەکێکی وابێت کە حەبەکەی خۆمم بۆ بهێنێت. ئەوە خۆ عەباسە سورە جا فەرقیان چییە. رەش لەوێ نییە سوری لەوێیە، رەشو سوری ئەم بەعسیانە وەك یەك وایە. دەی چیبکەین هەموی توخمێکەو پەروەردەی دەستی یەك حیزبە. چار ناچارەو دەبێ هەر داوای بکەم، بەڵکو لەدەستی دەربچێت،ئەی چی بکەم هەر دەبێت هەوڵ بدەم تا دەگەمە ئەنجامێ، هەر هیواو هەوڵ و ورەیە کە دەبنە سێ کوچکەی سەرفرازیی. لە دەرگاکەم دا دوای ئەوەی ههایەکی بۆ کرد، داوای حەبەکەم لێکرد. ناوەکەمی پرسیو بۆی هێنام. سەیرم کرد ئەمەیان نەوعێکی ترەو ناشزانم بۆ چییە. لەدەرگاکەم دایەوەو گوتم ئەمە حەبی من نییە.. ئەوەکەی من سەوزە.. هیچ وەڵامێکی نەبو، هاتمەلای پەنجەرەکەوەو لێم دوبارە کردەوە، بەرەو دەرگاکە هات، کردییەوەو بانگی کردم، کەنزیکی بومەوە هەتا توانیی بۆکسێکی ئاراستەی سەرم کردو بەجنێوی پیسەوە گوتی تۆ حەبی خۆت ناناسیتەوەو لە پەنجەرەکەشەوە سەیر دەکەیت! جارێکی تر

لەو پەنجەرەیەوە ببینرێت لەم حەوشەیەدا دەتکەم بەورچی یارینەکەر. لەگەڵ بۆکسەکە هەروەك چەحماخە بروسکەیەك لەقوڵایی سەرمەوە روەو گلێنەی چاوم کشا، هەستم بەئازارێکی زۆر کرد..

وا دیارە کێشەی ئەم حەبە دوچاری فەتارەتێکی ترم دەکات، با لەوەزیاتر دوای کڵاوی بابردو نەکەوم!

ئەم ئەقڵو سەلیقەیەی بەعس لەتێکەڵکردنی نالۆجیکانەی تەڕو وشك، لەکۆکردنەوەی رەشو سپیی، لەئاستە جیاجیاکانی ئەو حیزبەدا لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیانداو بۆ دامرکاندنەوەی حەزەکانی ئەقڵو بیری بەلەسەبویان لەدژی بەرامبەرەکانیان! لەهەموو سەردەمەکانی فرمانڕەوایەتییاندا هەبووە، بێ گوێدانە هیچ پێوانەیەکی سیاسیی‌و کۆمەلایەتی‌و ئاینی‌و یاساو رەوشت‌و داب‌و نەریتەکان..

بۆیە لە رێبازێکی گشتیشدا، لە مامەڵە لەگەڵ لایەکی تردا، هەرچەندە بەرژەوەندییە تێکەڵاوەکانی هەردو لا خولقێنەرو زامنیشی بن، بەلام لەبەر ئەو سروشتەی بەعسییەکان‌و بەهۆی جڵەوی دەسەلات، دیسان هەر ئەوان زیاتر سودی لێوەردەگرن‌و لەخزمەت رێبازەکەیاندا دەبێت.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حیزبە هەر کە دەرکی بەوە کرد کە دەتوانێت زیاتر سودت لێ وەربگرێت، وا دەکەوێتە داودانان‌و گوشارو پیلان، تا بەوەش شادبێت!

ساڵی شەست‌و نۆ لە هەڵبژاردنی یەکێتی مامۆستایاندا لە سلێمانی. لەبەرامبەر لیستەی بەرەی م. س لیستەیەکی تێکەڵە لە، بەناو، بێلایەن‌و لەراستیشدا گومانلێکراوو کۆنە شیوعییەکان‌و هەندێ کەسی سەربەخۆ قوتکرایەوە، کە ئەگەر دۆستی رژێمیش نەبوبن بەلیستەکەی ئێمە ناحەز بون تاك‌و تەراشیان تیا هەبو کە پاك و دڵسۆز بوون.

هەرچی نەخشەی بەعسییەکان بو کە پارێزگاری سلێمانی (شوکری صەبری الحدیثي) ئاراستەی دەکرد، ئەوە بو کە ئێمە لەگەڵ ئەو بەناو "بێلایەنانەدا" و ئەو شیوعیانەی لەحیزبی شیوعی دورکەوتبونەوە، یەك لیستە رێك بخرێت‌و دابەزێنرێت.

منیش وەك ئەندامی لق‌و یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردەی سلێمانی‌و ئەندامی سکرتاریەتی ی.م.ك. و نوێنەری مامۆستایانی لیستەکەمان، لەگفتوگۆدا بوم لەگەڵ نوێنەری حیزبی شیوعی تا لیستەیەکی هاوبەش پێکبهێنرێ. عومەر عارف رۆڵێکی دڵسۆزانەی دەبینیی. بەلام شوکری الحدیثي دەیویست بەڕاکەی خۆی رازیم بکات! کەزانی لەبەردەم یەکێکدا نییە کە مل بۆ قسەی چەورو خواستی

ئەو بلەقێنێت، ئەوسا کەوتە هەڕەشە کەوەك دەسەڵات پشتگیری لیستەی بەرامبەردەکات. منیش گوتم: ئەگەر یارمەتیی دۆستەکەتان نادەن باش وایە هەر بێلایەن بن، چونکە ئێمە بڕیاری خۆمان بەو جۆرە داوەو هەر لیستەکەی ئێمەش دەیباتەوە!

بیرەوەریی هەڵبژاردنی ئەو ساڵە، هەڵبژارنی دە ساڵ دوواتری هێنایەوە بیرم، کە گۆڕانی گەورەی لە ئەقڵی دیموکراسیی بەعسی نیشان دەدا! لەهەڵبژاردنی نەقابەی مامۆستایان لەساڵی حەفتاو نۆدا، هەرچەندە هەر لیستەی بەعس لەئارادا بو، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستکرا کە دەبێت هەمو مامۆستایان دەنگ بدەن، تۆمار بۆ دەنگدان دانرا تا بزانرێت کێ یاخیی دەبێت! دەورو ناوەوەی ساڵی هەڵبژاردنیش، هەموی عەسکەرو ئەمن بو، دەبو مامۆستایانی هەر قوتابخانەیەك پێکەوە بەریزە بچنە ساڵەکەوەو دەنگ بدەن، بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردەش حەمە پیرۆز لەسەر سنوقی دەنگدان وەستابو، یەکە یەکە کارتی هەر مامۆستایەکی وەردەگرت، سەیری دەکرد ئەوسا هەر خۆشی کارتەکەی دەخستە ناو سنوقەکەوە. منیش لەگەڵ چەند مامۆستایەك قسەم کردو گوتم لەو گاڵتەجارەدا هەق نییە دەنگ بدەین، یەکدووانێکیان گوتیان ئەوە ناکرێت چونکە ئەنجامەکەی خەتەرناکە بەتایبەتیی بۆ تۆ کە چەند مانگێکە هاتویتەوە سلێمانیی. گوتم من پێش دەکەوم. هەرکە گەیشتمە بەر سندوقەکە، هەرچەندە حەمە پیرۆزم دەناسیی‌و لەزانکۆ دوو دەورە دوای من بوو، کەچیی بەڕووزەردییەکەوە دەستی بۆ کارتەکەم درێژ کرد. منیش دەستم دورخستەوە، سپێتیی کارتەکەم نیشاندا، ئەوسا خستمە ناو سنوقەکەوە، زەردەخەنەیەکم بۆ کردوو ساڵەکەم بەجێهێشت. لەهاتنەدەرەوەیدا عومەر عارف گوتی: منیش دەنگم نەدا، بەڵام هەقنەبوو بەو جۆرە کارتەکەی نیشان بدەیت، چونکە ئەم سیخوڕانە ماری بێ ئامانن!

گیانی تۆڵەی ناڕەوا

لەناو گۆمی مەنگی ئەو خەیاڵانەی رابوردودا مەلەم دەکرد. جار جارە نەبێت جنێوی پیس بەحەپسەکان‌و لێدانیان سەرنجمی بۆ دەرەوە رادەکێشاو دەیخستمە سەر بیری چاوەڕوانیی بۆچونە سەر ئاودەست.

دەمەو ئێوارەی ئەو رۆژە وەك رۆژانی تر دواکەس هێنامییانە دەرەوە لەگەڕانەوەمدا بۆ وێرانەکە، حەرەسەکە وەستاندمی.. لەناوو کارو شوێنمی پرسی.. بەوەڵامدانەوەوە سەرم هەڵبڕی، عەسکەرێکی تازە بو بۆ من..

هەرکە ناوی سلێمانیشی گوێ لێبو، سەرنجدانەکانی گۆڕراو هەروەك پزیسکە ئاگر لەچاوی ببارێت ئاوا سەرنجی دەدامو دەستیکرد بەجنێودان بەخەڵکی سلێمانی، ئینجا گوتی:

- ئـەو شـارە لەعنەتییـە بـۆ وێرانكـردن باشـە. تەنانـەت مودەرِیسەكانیشـی پیاوكوژن.

< گوتم من لەژیانمدا چۆلەكەیەكیشم نەكوشتووە چی جای مرۆڤ! هەر كە ئەوەم لەدەم هاتە دەرەوە، بەهەرچی هێزی هەبو زللەیەكی بەبناگوێمدا كێشاو گوتی:

- ئەی باشە كێ براكەی منی كوشت! ئەگەر تۆش نەبوبیت وا باوكت بووە، ئەگەر ئەویش نەبوبێت وا براكەت بووە، ئێوە هـەموتان تاوانبـارن، هـەر بـۆ لەسـێدارەدان باشن‌و هیچی تر. دەی ملت بشكێنەو برِۆ ژورەوە لەعنەت لەهەرچی كورد هەیە.

هەركـە هـەنگاوم بـەرەو نـاو حەمامەكـە نـا، بەهـەرچی هـێزی هـەبو دانەیـەكی بەسـەرمدا كێشـاو گوتـی برِۆ لەعنـەتی خـواو پێغەمبـەر لـەباو و باپیریشـتان بێـت.. ئەوسا دەرگاكەی لەسـەرم داخسـت، منیش لێـی دانیشتم‌و كەوتمە بیركردنـەوە لـەو دیاردەیە.

غـەزەب لـەچاوبارینی ئـەو حەرەسـە، ئـەو گیـانی تۆڵـەی نارِەوایـەی نـاو ئـەو دژەكردارەی روداوی كوشتنێك، بو بەسەنتەری بیركردنەوەی ئەو ساتانەم، بیرم لەقین بوغزو گیانی تۆڵەسەندنی نارِەوای ئـەم جۆرە ئینسـانە نەخوێندەوارانە دەكردەوە، كە چۆن ئەم جۆرە دیاردانە بەهەل وەردەگرن‌و تۆوی دوژمنایەتییەكیان تێدا دەچێنن كە فەوتانی بـۆ نـەبێت. جا وەرە سەرحسـابی ئـەو دەیـان هـەزار خێزانانـە بكـە كـە لـەنزیك بـە بیسـت سـاڵی رابـوردودا خـەڵكیان لێكـوژراوە، خـۆ ئەگـەر دژەكـرداری هەمووان وەك ئەم عەسكەرە بێت كە پەروەردەی دەستی بەعسە، وا دوژمنایەتییـەكی وا قووڵ لـەنێوان دوو نەتـەوەی كـوردو عـەرەبدا دروسـت دەبـوو كـە رێـك ئامـانجی رژێمی بەعسی پێ بێتە دیی.

بەڵام ئەو لەدنیای كوشتن‌و برِیـن بـێ ئاگایـە، لـەدنیای كـێ تاوانبـارەو كـێ بـێ تاوانـە، لـەزاڵم‌و لـە زوڵـم لێكـراو، لەداگیركـەرو لـەداگیركراو، لـەو مەینەتییانـەی سـەرزەمینی كوردسـتان بێئاگایـەو هـەر ئـەوەندە دەزانێـت كـە براكـەی لەكوردسـتان‌و بەدەستی كوردی جەردەو پیاو كوژو دژ بەیاساو بەدەوڵەت كوژراوە..

لەناو ئەو بیركردنەوانەشدا ئـەو ترسـەم لێدەنیشـت كـە ئەگـەر بێـت‌و سوپای ئـەو جۆرە پەروەردەیـەی دەسـتی رژێمـی بـەعس بەتـەواوی دەسـتیان بگاتـە ئـەو كـوردە دەبێت چی ئاگرو ئاسنێكی بەسەردا ببارێنن..!

ئەم دژەكردارە پرِ لەرەشە قینـە، بـۆ هـەمو عـەرەب، گشـتیی نـەبوو، نزیـك بـە سـێ ساڵ‌و نیو لەگەڵ هەزاران كوردی هاوبەشی شۆرِش لەرەمادی‌و دەیـان هـەزاری تـر لـە پارێزگاكانی تری عیراقی عەرەبیدا گیرۆدە كرابوین. مـن بۆخـۆم‌و برادەركانیشـم هیـچ جۆرە دژە كردارێكی دوژمنانـەی لـەو جۆرانـە، یـان تەنانـەت ناحەزانـەی ئاشـكرامان

لەخەڵکی ڕەمادیی نەبینیی.. زۆر جاریش ڕێزگرتنیان پێوە دەردەکەوت.. خەڵکی پارێزگاکانی تری خوارووی عێراق باشترو میهرەبان تریشبوون.

شوێنەواری کولتوورو زمانی نامۆ

ئەمڕۆ بیستو حەوتی دیسەمبەرە یادی هونەرمەندی عەرەب فەرید ئەترەشی هێنایەوە بیر کە هەر لەم ڕۆژەی ساڵی ٧٤دا کۆچیی کرد. منیش لەو ڕۆژگارەدا دانیشتبوم‌و لەو گێچەڵانەی نەخوێندەوارانی لقی سلێمانی خۆم بەدورگرتبو، هەرچەندە بە لێپرسراوی ل. ناوچەی هەڵەبجە دانرابوم، کە ئەوەش وەك لەدواییدا دەرکەوت بۆ پیلانێکی دژ بە من کرا. بەڵام بڕیارمدا کە نەچم.
بۆیە زیاتر لەگەڵ خوێندنەوەو تەواوکردنی "کوردو ململانێی دیپلۆماسی" خەریکبوم.. ئەم بیرەوەرییەی ئەمڕۆ یادێکی سەیری ساڵی پەنجاو حەوتی هێنایەوە بیر. ئەو ساڵە لەپۆلی چواری ئامادەیی ئەدەبیی بوم. ئەوەش یادی یەکەم کۆبونەوەم بو لە ی.ق. ك- دا لەگەڵ ڕوشدی عەلی شەریف. ئەم لەباسی کوردپەروەری‌و نمونەکانیدا ئاماژەی بۆ گۆرانیی کردو گوتی گوێگرتن‌و خۆشیی قەتارو ئەڵلاوەیسییەکەی عەلی مەردان لەکوێ‌و یا عەوازیل فەلفیلوی فەرید ئەترەش لەکوێ؟
ئەو سەردەمانە سەرجەمی وانەکانی قوتابخانە لەیەکی ناوەندییەوە بە عەرەبی بون. بەهۆی زۆرلێکردنی باوکیشمەوە هاوینان دەچوم بۆ حوجرە، عەرەبییەکەم خراپ نەبو، تاڕادەیەکی کەم لە گۆرانییە عەرەبییەکان دەگەیشتم. بەهۆی کەمیی بەرنامەی رادیۆی کوردی لەبەغداو نەبونی ئیسگەیەکی تری کوردی‌و زۆریی ئیستگەعەرەبییەکان، زیاتر گوێمان لەسترانی عەرەبیی دەگرت. ئەو کاتانەش فەرید بوبو بەباو، لەراستیشدا دەنگی زۆر خۆش بو. بۆیە لەبۆچونەکەی ڕوشدی داگوتم: گۆرانی چیی دەورێك لەوەدا نابینێت، چونکە گۆرانییەکانی فەریدیش زۆر خۆشن. ئا بەو جۆرە زمان و کولتوری سەپێنراو میزاجی کوردەواری‌و نەوەکانی نەتەوەیان تێکدابو!

ئەوە بیست ڕۆژی ڕێکیشە ئەم ساردەوە بۆتە لانەم‌و وا پێدەچێت چارەنوسەکەم لێرەدا بڕیاری لەسەر دەدرێت یان وەك گوتم بڕیاری لەسەردراوە. ئەگەر وانەبێت، ئەی بۆچی هیچ گۆرانێك لەم دنیایەی مندا نابێت‌و روونادات!؟
کە برام بۆ دەرەوە، لەناو ئەشکەنجەدراوەکاندا بەجێ هێڵرام، ناو بەناو سۆندەیەك، شەقێك، لەقەیەك، بۆکسێك، جنێوێك، هەڕەشەی هەمە جۆر بۆ ئیعتیرافکردن، لەناو خەیاڵەکانمدا دەریان دەهێنامەوە.. برامەوە ژورەکە، زۆری نەبرد بۆ هەمان بەزم هێنرامەوە دەرەوەو سەرلەنوێ بۆ ژورەوە..

یەکێك لەو هۆیانەی کە هەندێك جار توشی سەریەشەو کێشەی دەکردم بێدەنگ نەبونم بـو لەسـەر کاروبـاری نائاسـاییو نـاڕەوا.، دەشمزانـی دووچـاری ململانـێو گرفتی تریش دەکرێم..

ڕۆژێك عیرفان کـە ئـەندازیاری (اعمـار الشمال) و ئـەندامی لیژنـەی شـەهیدان بـو. کـاری ئـەو لیژنەیـە فرۆشـتنی ئـەو خواردەمەنییانـە بـو کـە پ.د.ك لـەڕێکخراوە مرۆڤییەکان وەری دەگرت، لەبری دابەشکردنی دەفرۆشرا تا خانوی شـەهیدانی پـێ تـەواو بکرێت. منیـش وەك نوێنـەری لـق، پێش نوێ بونـەوەی شـەڕی بەعسیی، لـە لیژنەکە دانرام. کە لەشەوی ١١ ئازاری ٧٤دا لقی سلێمانی، شاری بەجێ هێشت، من ئاگادارییم لەماوەی پارەی لیژنەکە نـەما، کەوتینـە کۆتـایی بـەهار، ڕۆژێـك عیرفـان هاتو گوتی: تۆ ئاگادارییت لەپارەی شەهیدان هەیە؟ گوتم:

< نەخێر بۆچیی؟

> چەند مابوو ئەوە دوو مانگ زیاترە هەموی هێنراوەتە دەرەوە.

< باشە چۆن دەزانیتو دراوە بەکێ؟

> جا منیش بۆ ئەوە هاتوم کە پێت بڵێم، بەمـەرجێك بـەهیچ جۆرێك نـاوی مـن نەهێنیت.

< کە بەڵێنی ئەوەم پێدا. ئەوسا گوتی:

> (غەریب) ی مالیە سێ هەزارو پێنج سەد دینار (نزیکەی٤٥٠٠ دۆلار)ی داوەتـە دەست لێپرسراوی لق (عەبدولی سوران). لەپێش، هاتنە دەرەوەماندا حسـاباتی پـارە لای غەریب بو.

منیـش عـەلی عـەبدوڵڵام لـەوە ئاگـادارکرد، چونکـە پێـش هاتنـە دەرەوە سەرپەرشتیی ئەو کارەشی دەکردو لەژێر گوشارو داوای ئەودا ئەندامەتیی لیژنەکەم قوبـوڵ کـرد. بـێ ئاگـاداریی لـق لیژنەیـەکی لێکۆڵینـەوەی دانـاو منیشـی کـرد بـە لێپرسـراوی. ئیـتر لەسـەرخۆ کەوتمـە پرسـیار لـە یەکـە یەکـەی ئـەندامی لـق، بەلێپرسراویشـەوە، بێ ئـەوەی کـەس ئاگاداری ئـەو پارەیە بێـت، کـە لەعەبدولیشـم دەپرسیی، ئەویش بێ ئاگایی خۆی نیشان دەدا. ئەوسا لەکۆبونەوەی لقدا باسـەکەم کردەوە لەگەڵ بڕیاری دامەزراندنی لیژنەکە بۆ لێکۆڵینەوە.. ئەوسا عـەبدول هەسـتی کـرد کـە لـەناو داوەکـەدا گیراوە، ئەگـەر فریـای خـۆی نەکـەوێت حەیاشـی دەچێـت. بەتوڕەبونو نیمچە شەڕەوە گوتی:

> ئەو پارەیە بەئەمانەت لای منەو دەینێرم بۆ سەرەوە.

< گوتم باشە ئەوە نزیکـەی سـێ مانگـە هێنراوەتـە دەرێ، من بـەدوایدا دەگـەڕێمو لەهەموتان دەپرسم کەس نەبو بڵێ پارەکە لای منە، بۆچیی؟ لەناو هەمان ورووژاوییو

هەست بەشکان کردندا بەقیژەو تورەییەوە گوتی: تۆ من بەدز دادەنێیت؟ گوتم من باسی دزێتی تۆم نەکردووە، من دەڵێم پارەی شەهیدان هێنراوەتە دەرێو لای کێیە قسە بکات!

زۆری نەما ببێتە شەڕە تفەنگی نێوان پێشمەرگەکانی لای ئەو لەگەڵ یاسین‌و عەبەلالەو کاوەی عەبە زیرەك.. کە لەگەڵ خۆمدا پێشمەرگە بوون.

# کاروانی بێ کۆتاییو گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## (٧)

## سێیەم تاکزیندانی هەیئەی تەحقیقیی لە کەرکوك..

ڕۆژ ١٢/٢٨یە، تەنم نادروستە، سکم لەسەر حاڵی نائارامی خۆی ماوە، بگرە خراپتریش بووە. سێ هەفتەیە لەم ساردوادا هەڵدەلەرزم. تەواو لاوازو کەنەفت و بێ جوڵەو بێ حەوسەڵە بوم. سێ هەفتەیە لەناو نائارامیو ترس و ئازارو بێئومێدیدا دەژیم. بیست دانە شەوە نازانم خەوی ئاسایی چییە، دو مانگ و دە ڕۆژە لەناو کوێستانی ئەو قەسابخانە تاریکەدا لەگەڵ ئەشکەنجەو ژیانی ناو هاوارو گریانو پاڕانەوەو ئیعتیرافپێکردن شەوو ڕۆژم لێدەبێتەوە. گەرمایی بەلەشمدا نەهاتوە، تێر بونم لەبیر چۆتەوە، ڕیژیبون و شینبونەوەی بست بەبستی لەشم و نیوە ئیفلیجبونی قاچم بونەتە هۆی ئەوەی وەك مرۆڤی ئاسایی بەسەرپێوە خۆم نەگرم گورچیلەم زیاتر نائارامم دەکات. وەك ئینسانی دەوری بەرد سەروریشم یەکپارچە تووکەو ئەوە نزیکەی دوو مانگ و نیوە نازانن تاشین چییە، دوو مانگ و دە ڕۆژێکە هەمو گیانم وەك شارە مێرو ئەسپێی تێداوە، شتن و جلگۆڕین و ئاوی گەرم و سابون و دەم و ددان شتن نازانم چین، نینۆکی دەست و قاچم لەهی دڕندە دەچێ، لەدنیای دەرەوەو ناو هەیئەش بێئاگام و نازانم چیی تێدا ڕوودەدات و هاوڕێکانم چییان لێبەسەر هاتووە، بۆ ساتێکیش ئەشکەنجەی دەرونیی جێم ناهێڵێت. ئەوە نزیك بەیەك مانگی ڕەبەقە ئەشکەنجەم لەسەر چڕکراوەو خەتە بەیانییەکە هەر ڕووەو زەحمەتترو قورستر بەرەو ژور دەبێتەوە. هەڕەشەی بوتڵو ماڵو منداڵ هێنان مۆتەکەیە کە بۆ چاوتروکاندنێکیش بەجێم ناهێڵێت. ئەوەی کە لەبەندەکانی ترم بینیوەو بیستووە، چڕکردنی ئەشکەنجە چەند ڕۆژێکی خایاندوە. لەهەفتەیەك یا دە ڕۆژ تێپەڕی نەکردوە. گوایە من بەلێپرساویان لەقەڵەم دراوم!

باشه لێپرسراوى كێو هى چيى؟ من بۆ يەك رۆژ، بۆ يەك سەعات لەگەڵ كەسياندا كۆبونەوەم نەكردوە. راستە كۆن لەگەڵ گەلێكياندا لەيەك رێكخراودا بوين، بەلاّم لێرەدا زۆريانم بينيوە، لەرابوردوى سياسيى زۆريان بێئاگام. راستە هەموويان من دەناسن بەلاّم من زۆريان ناناسم. ديارە ئەوانە بۆ لێكۆڵەران گرنگ نين، گرنگ لاى ئەوان بۆ ئەوان ئەوەيە كە ئيعتيراف بكرێت، ددان بەو تاوانانەدا بنرێت كە ئەوان بۆيان ريزكردويت، با هيچيشت نەكردبێت، ئەوەش دەبێت لەسەر شێوەو بەپێى داواى خۆيان بێت، گرنگ ئەوەيە ئێستا تۆ ئەوەيت كە ئەوان دەڵێن.. جا ئايا دەتوانن ئەوە بەسەرتا بسەپێنن و بيسەلمێنن كە تۆ ئەوەيت كە ئەوان دەيڵێن؟ هەروەك خۆيان دەيانەوێت! بەلاّم ئايا دەتوانن ئەوە بكەن؟ ئەوەش ئايندە دەرى دەخات..

دەرگاكە كرايەوە، رەئيس عورەفا حەمەد سەيرێكى كردم و وتى تۆ مەحمود مەلا عززەتيت؟ گوتم بەڵێ: گوتى بەتانييەكەت هەڵبگرەو وەرە. پەلامارى بەتانييەكەم داو دواى كەوتم، ئازارەكانم لەبير چووەوە. ساتێكى خۆش و هەواڵێكى ئاسمانيى بو، دەبێ بۆچى بێت؟ بڕواناكەم بۆ ئازاد بون بێت.. نەخێر نەدوا ئيفادەم وەرگيراوەو نەپەنجەمۆرم پێكراوە.. جگە لەوە بەربون بەتانى هەڵگرتنى لەگەڵدا نابێت. ئەى بۆ كوێ بێت؟ دواى كەوتم و ورد ورد هەنگاوم دەنا بەرەو حەوشەكەى ناوەڕاست. بەرەو ژورى ژمارە يەك پێچى كردەوە. دڵم خۆشتر بوو. وا يەكێك لەئاواتە كاتييە گرنگەكانم هاتەدى‌و ئێستا هەندێ لەرەفيقەكانم دەبينمەوە. زۆر بەسەر ئەو خەيالاّنەدا تێنەپەڕى كە لەبەردەرگايەكى كراوە لەتەنيشت ژورى ژمارەيەك وەستاو گوتى بڕۆ ژورەوە. دو هەنگاوم ناو دەرگاكەى لەسەرم داخست. خۆ ئەمەش هەر حەمامە، هەروەك هەمان حەمامەكەى ئەوديوە، ديوارێكيان بەينەو يەك نەخشەى هەلاّوگێڕكراون، هەر لەم زيندانەشدايە! ئەى ئەم گواستنەوەيە بۆچيى؟

پانتۆڵى تازە، بۆينباخ، جوتێك پوتى تازەو كراسى قەدكراو لەتەنيشت جێگەيەكى بۆ ئەو دۆزەخە- رازاوە دانراون.. لەسەر بەتانييەكەى خۆم دانيشتمو پاڵمدا بە ديوارى بەرامبەر دەرگاكەوە. هەر لەوسەرەتايەدا كەوتمە بيركردنەوە لەم ديارده نامۆيەو لەخۆمم دەپرسيى: تۆ بڵێى ئەمە پلەيەكى نوێ بێت لەئەشكەنجەو جێبەجێكردنى هەڕەشەكان!؟ دەبێت ئەمە سيخوڕێكى نوێو زيرەكتربێت؟!

بەپاڵ ديوارەكەى بەرامبەرى ئەو جێگەو جلانە، لەريزى بەلوعەو ئاوەڕۆى حەمامەكە، دوو سنوقە كۆنەى بچوكى پرتەقاڵ دانراون، يەكێكيان چەند پۆستاڵێكى كۆنو هەڵقرچاوو رزيوى تێدايە، ئەوەكەى تريان نيوە گوێنييەكى سەربەستراوى

لەسەرەو دراوە بەپاڵ دیوارەکەوە، بەرامبەرم پەنجەرەیەکە بەقەبارەی هەمان پەنجەرەی ساردراوەکە بەڵام بەشوشەوە.

لەناو ئەو سەرنجانەشمدا بیرم لەم هەوارگە نوێیە دەکردەوەو لەخۆمم دەپرسیی ئاخۆ دەبێت هۆی گواستنەوەم چی بێت؟ ئاخۆ خاوەنی ئەم جێگەو جلانە چی زیندانییەکی خواپێداو بێت؟ باشە ئەم جلە تازانەو بەندی ناو هەیئە کوجا مەرحەبا! گلۆپ دەسوتێو ناوەوە روناکە. زۆر باشە روناکیی هەیەو ئەگەر لێرە بمێنمەوە وا دەکەومەوە راوە ئەسپێ.. ئەوانیش بۆمن مایەی نارەحەتیو ئەزیەتن. منیش دەسەلاتم بەسەر ئەواندا هەیەو دەبێت زۆریان لەکۆڵ خۆم بکەمەوە، نایەڵم لەوە زیاتر خوێنم بمژنو بەم جۆرەش هەراسانم بکەن. خۆ لەو تاریکستانەی ئەودیودا دەسەڵاتی راوکردنی ئەسپێشیان لێم زەوت کردبو، تا ئەڵقەیەکی زنجیرەی ئەشکەنجەکانیان کەم نەبێت.

کە دەمروانییە ئەو کەلوپەلە، قالەم دەهاتەوە بەرچاو! باشە تۆ بڵێیت رەئیسی هەیئەو لێکۆڵەران هێندە بێئەقڵ بنو تا ئێستاش وابزانن ئەو دەتوانێت لەسەر رۆڵە پێسپێردراوەکەی بەردەوام بێت؟ پاش نیو سەعاتێك لەهێنانم بۆ ئێرە، یەکێك کرا بەژوردا. کورێکی کەمێ پانکەلەی سپیی بەلای سورداگەراودا، قژی مەیلەو زەرد کانی خورمایەکی بچوك بە سەرو روومەتییەوەیە. درێژییەکەی لەسەدو شەستو پێنج سانتیمەر تێناپەرێت. سەیرێکی کردو ئەوسا بەخێرهاتنی کردم.. دانیشتو دەستی کرد بەپرسیار، هەر لەناوت چییەوە تا لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە، وەك هەمو زیندانییەکانی تر بە وشەو دوو وشە، یان بەنازانم وەڵامم دەدایەوە، چونکە ئەو دیمەنەی بینیم هەر ئەوەی دەگەیاند کە لەگەڵیان هاوکاربێ. رەنگە بۆ یەك یان چەند کارێك، کە لەوانەیە یەکێکیان خۆم بم، هێنابێتیان، منیش هەمان ئەو پرسیارە ئاساییانەم کرد کە هەمو بەندێك لەبینینی یەکێکی تازەدا دەیکات. ئەو لە وەڵامەکانیدا بەم جۆرە خۆی پێم ناساند:

- ناوم سەباحە، خەڵکی خانەقینم، کۆمەڵە بوم. ویستیان توشم بکەن، بەڵام نەیانتوانی. لە لێکۆڵینەوەشدا قسەکانیان بڕی نەکردو بەدرۆ کەوتنەوەو خۆیان توش بون. ئەفسەرێکی خزمم کە لەئەمنی خانەقین کار دەکات یارمەتییەکی زۆری دام، ئەو نەبوایە خراپ توش دەبوم. ئێستاش منیان بۆ شایەتیی هێناوە.. چەندیشم پێ بکرێت، یارمەتییان دەدەم. گوناهنو با لەئیعدام رزگاریان بێت.

ئەو قسانەی سەباح بۆچونەکەمی بەهێزتر کرد. ئیتر دەبێت زیاتر ئاگاداری خۆم بم، بەتایبەتیی بەقسەکانی خۆیدا دەردەکەوێت کە چەند سەرەیە.

کاتی نان خواردن هاتەپێشەوە. برنجیان هێناو مریشکی لەسەرە. کەمێ شلەیان بەسەردا کردوە. هەر لەدەرگا کردنەوەدا سەیری هێنەری خواردنەکە دەکەم، ئای ئەوە خۆ یەکێکە لەزیندانییەکانی هاوڕێم، ئەوە بەختیار حامیدە. ئەویش سەیرێکی منی کرد، جۆرێ لەسەرسوڕمانی پێوە دیار بو. رەنگە دەمێك بێت لەبەرچاوی ونبوبم، دەبێت لەحەوشەکەی ئەودیو، لەدوورەوە نەیناسیبمەوە! یان سەیری لێ بێت کە ئەم هەمو ئەمسەرو ئەو سەرو شوێن گۆڕکێیەم پێدەکەن. وەك لەساردەوەکەی ئەودیو بۆم دەرکەوت ئەم لەژوری چوار بو. رەنگە ریشی درێژو سەری دەروێشیم کە وەك دێوانەیان لێکردوم لەگەڵ پشتی نوشتاوە، وایان کردبێ کە نەمناسێتەوە! دەمێکە چاوم بەم نانەی هەیئە نەکەوتووە. بینینی خواردنەکە دڵخۆشی کردم. چونکە نیشانەیەکی نەمانی چڕکردنی ئەشکەنجەو هاتنەخوارەوەی خەتە بەیانییەکەیە، کەمێك یارمەتیی بوژانەوەو تەندروستیم دەدات، ئەگەر خوا بکات هەر بەم جۆرە بێتو هەر لەبەر خاتری ئەم پیاوەیان نەبێت.

رەنگە ئیتر بەرە بەرە گوشارم لەسەر کەم بکەنەوە. ئەی بۆ کەمی نەکەنەوە! چا چییان پێنەکردوم؟ ئەی باشە بەردەوامیی لەسەر ئەم تاکزیندانییە بۆچیی ئەگەر ئەوە راستە؟ نا نا ئەمەش پلەیەکی نوێی لێکۆڵینەوەیە، ئەمە پلەی چوارەمە لەم کاروانە بێ کۆتاییەی ناو هەیئە. خۆ لەهەموی سەختو پڕ لەزەحمەتیی تر تاکزیندانییەکەیە! تاکزیندانییەکە لە هەموی فەلاکەتترە، دەك نەفرەت لەم تەنهاییەی ناو ئەم قەسابخانەیە، خۆ ئەم هەمو سیخوڕە مەلعونە هەمەڕەنگانەش هێندەی تر ژیانی تاکزیندانییەکەم ئاڵۆزو پڕ ئەندێشەو سەختتر دەکەنو دەیکەنە دۆزەخی دۆزەخان.. دەی باواز لەم بیرە ئازاراوییانە بهێنمو نانەکەم بخۆم، نزیکەی مانگێکە لەم جۆرەم نەخواردووە.

یەکێ لەدیاردە گرنگەکانیش بۆ من ئەوەیە کە ئەم هەوارگە نوێیە لەگەرمیانی هەیئەی تەحقیقی دەچێت. بە بەراورد لەگەڵ ئەودیودا، وا دیارە رو لەرۆژهەڵاتە، هەروەك ژوری ژمارە هەشت، بۆیە دەبێت وەك ئەوەکەی تر سارد نەبێت! جا ئەگەر لێرە بمهێڵنەوە وا قیروسیا لەتەنهاییەکەو لەم نەفرەتلێکراوانەی لێم جیانابنەوەو وام لێدەکەن کە بەسانیەش بێ ئاگاداریی لەقسەکانم نەکەم. ئەوەش زیاتر پیاو هیلاك دەکات. خۆ ئەم رژێمە دژ بەمرۆڤە لەناو ئەزمونێکی زۆری ئەم جۆرە ئەشکەنجەو پڕوکاندنانەی مرۆڤدا، لەناو وەرگرتنی ئەزمونەکانی دنیای رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا هەمو کونو کەلەبەرێکی روخاندنو ئیعتیراف پێکردن فێربونو رۆژانە پەرەی پێدەدەنو پیادەی دەکەن.

بەتایبەتیی لەم قسابخانەیەدا، نرخی مرۆڤ لەدڕندانەترین ئاژەڵی بێزراو، کەمترە، بەڵکو لەبەردەستی ئەم توخمە گیانلەبەرەی ناوی مرۆڤی پێوە لکێنراوە. لەو دڕندەیە دڕندەترە، بەهەمو شێوەیەکی دژ بەهەستو گیانی مرۆڤو مرۆڤپەروەریی. ئازاری ئادەمیزادی کورد دەدەن، سوکایەتیی پێدەکەن، دەیانەوێت بیهێننە ریزی ئەو ئەسپێیانەی کەوتونەتە گیانیو لەگەڵ خوێن مژینیدا بونەتە دوەم دوژمنی ئەم ئادەمیزادانەی وا کەوتونەتە ناو داوی بەعسەوە..

دەی بابزانین لەم هەوارگە نوێیەدا قەدەر چ نهێنییەکی تری لێشاردوینەتەوەو لەم قوتابخانەیەی حیزبیی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکیدا وردە وردە هەندێکیان دەردەخات. دە جارێ با برنجە حەیاتەکە لەبەردەم نیعمەتی روناکیی دوولایەنە، روناکییی رۆژو روناکیی گڵۆپەکە، بخۆم کەبۆ ئەم ساتەی من خۆشترین خواردنەو لەگەورەترین دەعوەت زیاتر بایەخی هەیە..

بەدەم نانخواردنەوە سەباح لێی پرسیم:

- ئەرێ خانەقینت بینیوە؟

< بەڵی بینیومە شارێکی خنجیلەو خۆشە، ئەگەر وا مابێت!

- بۆ تۆ کەی بینیوتە..؟

< ساڵی پەنجاو نۆ.

- ئەو سەردەمە شیوعی بویت یان خزمەت لەوێ بو؟

< نە ئەمیانو نە ئەویان جا شیوعییەت چیی پەیوەندیی بەسەفەرو سەردانەوە هەیە؟

- ئەی بۆچی چویت.. لەدڵی خۆمدا گوتم چیی وەڵام بدەمەوە؟ قابیلە بچمە ناوڕاستییەکانی سەفەرەکەوە..!

< نا هەروا لەگەڵ یەك دوو برادەردا چوم. دەمویست زیاتر لەسەری نەڕوات.. سەیریش نییە کە ئەم جۆرە سیخوڕانە وافێر کرابنو دەرس دادرابن کە لەو جۆرە شوێنانەدا لە وردترین قسە بکۆڵنەوەو سودی لێوەربگرن.

ئەو سەردەمە نیوەی یەکەمی ساڵی پەنجاو نۆ، گەرمەی ناکۆکیی نێوان جەماعەتی هەمزە عەبدوڵڵاو باڵەکەی تری سەرکردایەتیی پدك کە مام جەلال سەرکردایەتیی دەکرد، بۆیە هەر ئەو ناوەش دەبەم چونکە بۆ ئێمە، لەسەر شانۆی چالاکییو ناسراوییی هەر ئەم رۆڵی یەکەمی دەبینیی، من یەکەم ساڵم بو لەزانکۆی بەغدا- زانستگای پەروەردە بەشی مێژوو، هەر لەم ساڵەشدا مام جەلال- م لەنزیکەوە ناسیی. ئەگیناو لە راستیدا م. برایم ئەحمەد و رابەری بەرەی دژ بە هەمزە عەبدوڵڵا بوو ئەو لێوەشاوەیەکی سیاسییو ئەدیبێکی ناسراو بوو، کە ئەسعەد خەیلانی

"شیرین بەهارە" و "دوا تیری کەوانی خۆت.."ی بۆ دەخوێندینەوە، لە دوورەوە، دەچووە دڵمانەوەو خۆشمان دەویست.. بەڵام من لەسەر رابردووی شتێکی وام نەدەزانیی.. ئەوە نەبێت کە بیستبوم وەك پارێزەر پشتی جوتیار و هەژاران دەگرێ و هەر لەسەر ئەوەش تەقەیان بە نیازی کوشتن لێکرد..

لەناو ئەو ناکۆکییەدا. دواییتر لە سێ کۆنگرەو سێ کۆنفرانس و کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی‌و سەردانی بۆ رێکخستنەکانی سلێمانی‌و لە کۆبوونەوەو ئاهەنگە نیشتمانی‌و سەردانەکانماندا لە رێگای هەڵبەست و چیرۆکەکانی‌یەوە ئاشنا بە بیرو رێباز و کەسێتیی ئەو بووم.

سەیرانێك رێکخرا، ئێمەش زۆربەی هەرە زۆری قوتابیانی زانکۆی بەغداو بەشەکانی تری کوردی بەغدا کە لەناو پارتیدا کوردستانیی بیرمان دەکردەوەو دژ بە تەیاری ناکوردستانیی جەماعەتەکەی هەمزەو لەگەڵ باڵەکە ئیبراهیم ئەحمەد- مام جەلال بوین، چونکە بوونی حیزبێکی مارکسیی- لینینی کوردستانیی بەڕەوا دەزانی، هەروەك لەناو پرۆگرامەکەی ئەو سەردەمەی پدك- یشدا ئەوە سەلمێنرابو.

بۆیە ئێمە بەگەرمییەوە لەگەڵ مام جەلال بوین‌و هاوبەشیی سەیرانەکەمان کرد.

لەوساتەدا سەباح ئەو پرسیارەی دەکرد، بەخێرایی بروسکە، ئەو یادگارە هاتەوە یادم‌و لەدڵی خۆمدا گوتم رەنگە ئەمە دیارییەکی باش بێت کە سەباح بیبیستێ‌و بیبات بۆ ئاغاکانی..

< گوتم هەروا لەگەڵ کوڕێکی خانەقینیدا سەفەرەکەم کرد.

- باشە ناوی چییە؟ رەنگە من بیناسم! گوتم:

< ئەوە بیست‌و یەك دانە ساڵ لەمەوبەر بو. رەنگە ئەو کاتە تۆ شیرەخۆرە بوبیت. ئەو کوڕەش هەرچەند هەفتەیەك دەوامی کردو ئیتر زانکۆی بەجێهێشت‌و وازی لەخوێندن هێنا، بۆیە ناوەکەیشم لەبیرنەماوە.

ئەی دەبێت هەر بەقسەیەکی واخۆم لەناوهێنان لابدەم، ئەگینا ئاگادار نەبون لەم جۆرە وردە دیاردانە، رەنگە ببنە مایەی زیان، بگرە جاری وا هەیە گەورەترین زیانی لێدەکەوێتەوە.. ئەی ناوبردنی برادەرێکی خۆشەویستی ئەو سەردەمە کە تا ئەو کاتەو تا ئێستاش پەیوەندیی برادەرایەتی‌و تارادەیەکیش سیاسیمان ماوەتەوە، دەبێ وا لێکبدرێتەوە کە دوور نییە نەبێتە هۆی راپێچکردنی، ئەوەش بەجۆرێك لە ئیعتیراف دەدرێتە قەڵەم، کە لە باشترین حاڵەتیشدا دوچاری ئەو ژیان‌و ئەشکەنجەیەی هەیئە دەکرێ..

لەدوای نانخواردن. لەو عەسرەو شەوەکەدا هەوڵمدا هیچ قسەیەك لەسەر سیاسەت‌و باسەکانی هەیئە نەکەم. پرسیاری لایەنەکانی قوتابخانەو خوێندن‌و خوێندەواریی لێ بپرسم.

بەڵام ئەو هەروەك هەستی پێکردبێت یان نەخشەیەکی بۆ دانراو ئەنجام بدات، لەهەر لایەکەوە خۆم دەدزییەوە ئەو لەکونێکی ترەوە باسەکەی دەکردەوە. ئاسانیش دەستبەرداری مەبەستەکانی نەدەبو. هەوڵیشی دەدا لەمنی بگەیەنێت کە هیچ مەبەستێکی تایبەتیی لەو باسانە نییە کە دەیهێنێتە ئاراوە.

ئەو لەنزیك دەرگاکەوە جێگەکەی خۆی سازکردبو.؟ دوو سێ بەتانیی کرابون بەدۆشەك، یەکێکی تر بەسەرین‌و دوانیش بەلێفە. لەلایەکیشییەوە جلەکانی‌و پوتەکەی دانراون. ئەو جێگەیە لەچاو بەتانییە شڕەکەی مندا رازاوە بو. منیش لەپاڵ دیوارەکەدا لایەکی بەتانییەکەم راخست تا لاکەی تری بدەم بەخۆمدا.. بەنیوەڕاکشان‌و کەمێك جیاواز لە نوستنی نائاسایی، بەلاق نوشتاننەوە، خۆمم لێ مات کرد. زۆری نەبرد لەناو دەریای خەیاڵی جۆراو جۆرەوە دەربارەی ئەم سەباحەی بەم جۆرە لەم شوێنەدا خۆی دەبینێتەوە، ون بوم.

ئەم گۆڕانە بچوکەی ئەم شوێنە بە بەراورد لەگەڵ شەکەتیی ئەشکەنجەو سەرماو نەخەوتنی سێ هەفتەی ناو ساردەوەکە، رایکێشامە ناو ئۆقیانوسی خەوەوە.

یەکێ لەخسڵەتە باشەکانی شێوەی خەوتنی من ئەوەیە کەتا هەست بەخەواڵوێتی نەکەم پاڵناکەوم. کە پاڵکەوتم، ئەگەر شتێك، بیرێك نەبێتە رێگر، وەك ساردییەکەی ئەو دیویان خەمو پەژارەو هەڕەشەی ترسناك، وا زۆر نابات خەوم لێدەکەوێت.

بەرەبەیانی رۆژی ئایندە لەدەرگاکە دراو هاوارێك بەرزبوەوە "ئاوەکە بکەرەوە" راپەڕیم‌و لەدڵی خۆمدا گوتم: دەبێت لەگەڵ کێی بێت؟ باشە ئاوی چیی؟ تۆ بڵێیت لەگەڵ منی بێت!؟ جارێکی تر هاوارەکە بەرزبووەوە. بێ ئەوەی بجوڵێم. لەپڕ دەرگاکە کرایەوە. عەبدولئەئیممەی نیمچە کەرکەدەن بەجنێوە پیسەکانیەوە دەستی بەباسکردنی رێورەسمی ئاوکردنەوەو ئاوداخستن کردو دەرگاکەی داخستەوە. بەوەش (سەباح) خەبەری نەبووەوە.

سۆندەیەك بۆ ناو حەمامەکە درێژکراوە.. هەر لەگەڵ گوتی ئاوەکە بکەرەوە، وادەبێت سۆندەکە بە بەلوعەکەوە چەسپ بکرێت‌و ئاوەکە بکرێتەوە. تومەس ئەمە هەمان پیرە سۆندەی حەوشەی ناوەڕاستە کەزیندانییەکان دوای ئاودەست دەست‌و پل‌و دەموچاویانی لێدەشۆن..

وا دیارە، ئەگەر لێرە بمێنمەوە، وا لەسەر ئەم ئیشەش بەمیراوی حەوشەی ناوەڕاست دادەنرێم، کە دەبێ هەموو بەیانییی‌و نیوەڕۆو دەمەو ئێوارانێك لەگەڵ دەستپێکردنی رێوڕەسمی چونە سەرئاودەستی زیندانییەکانی ئەم حەوشەیە، لەکاتی حاجەت شتنی دوانانخواردن‌و کاتی پڕکردنی تەنەکەی ئاوی خواردنەوەی

ژورەکانی سەرئەم حەوشەیە بەو کارە هەستم. دەشبێت بەپێی فەرمانی پاسەوانەکە ئاگاداری کەمو زۆریی ئاوەکە ببم. جاری وا هەیە عەسکەرەکە ئەمر دەکات کە بەلوعەکە هەموی بکرێتەوە تا زیندانییەکان زۆر سودی لێ نەبینن. چونکە بەجۆرێك ئاوەکە بەگورو تەوژم فیچقە دەکاتە دەرێ کە هەردەستت بدەیتە بەری وا لەپێشدا هەمو گیانت تەڕدەکات. ئەوەش بەو زستانە دەبووە مایەی درەنگ وشك بونەوەو سەرما بونی زیاتر. جگە لەوەی ئەو دەست نەشتنە یان کەم شتنەش بۆخۆی ئەشکەنجەیەکی ترە.

نانو چای ئەم بەیانییە لەوەی دوێنێ ناکات، لەدڵی خۆمدا گوتم ئەمەش گۆڕانێکی ترە، دیارە دەبێت لەنەوت خواردنەوەش رزگارم بوبێت. دوای نان خواردن سەرنجم چڕکردە سەر سنوقو پۆستاڵو ئەو گوێنییە.. سەیرم کرد لەناو پۆستاڵەکانەوە مشکێك هاتە دەرەوە..

بەدەر لەخسڵەتی سرکیی مشك، جوڵانەوەکانی خێراو بەگوڕ نییە. نەخێر هەر وەستاوەو سەیر دەکات.. رەنگە بیر لەم میوانە نوێیە بکاتەوە! یان لەگەڵ مرۆڤی ناو ئەم مەڵبەندە ئاشنایەتی پەیداکردووە بۆیە وا ناوی سڵەمینەوە نازانێت چییە! رەنگە خاڵی هاوبەش لەو گیانلەبەرەو ئێمەی ئادەمیزادی ناو هەیئە بۆ دروستبوونی ئەو ئاشنایەتییە ئەوە بێت کە هەردوو لامان گیرۆدەی دەستی هەیئەی رژێمی بەعسین! من وەك هەمو کوردێکی ئاسایی، زۆرم بێز لەمشك دێتەوە، لەبەر ئەو هۆیانەی کە پەیوەندییان بەشێوەی ژیانیانەوە هەیە، لەپیسو پۆخڵیی ناو ئاودەستو زێرابو ئاوەڕۆگەو ئەو جۆرە شوێنانە، ئینجا بونە شەریکی خواردنی ماڵو پیسکردنیشیان، ئەو هۆیانە دیمەنەکەشیان وا ناشیرین کردووە کە پیاو هەم بێزی لێی بێتەوەو هەم رقیشی لێی بێت.. بۆیە راوکردنی مشك بە پشیلەو بەتەڵە شتێکی ئاسایی خانووە کۆنەکانی گەڕەکە شەعبییەکانو لادێکان بووە. زیاتر لەوە، دیسان من، وەك هەمو کوردێ، دیمەنی مشکم لەهی مار لا رەزاگرانترە.

کە بیرم لەوانە دەکردەوە، بەخۆمم دەگوت دەی گوێی مەدەرێ کێ دەڵێت لەگەڵیا رانایەمو نابێتە هاوڕێی دانیشتوانی ئەم لانە نوێیە. دوای یەکدوو رۆژی تر دەرکەوت کە هەر ئەو دانەیە نییەو هی تریش دانیشتوی ناو ئەو پۆستاڵە رزیوانەن.

رەنگە رۆژانی ئایندە گەلێ چیرۆکی بەزمو رەزمی ئەو مشکانەیان تیا بخولقێ. لێرە تەنەکەیەکی بچوك بۆ میز دانراوە.. دەبێت پێڕەوی یاسای میزکردنو میز رشتن وەك ژورەکانی تر بکرێت.

ماوەیەك بەسەر خواردنی بەیانیدا گوزەریکرد. چەند بەندێکی نوێ هێنرانە حەوشەکەو دانیشێنران (سەباح)یش لەپەنجەرە بچوکەکەوە هەر سەرەتاتکێیەتیو ئارامی لەبەر پڕاوە. هەروەك ماخۆلانی بێت ژورەکە نەیدەگرتە خۆی! لێم پرسی

ئەرێ ئەوە چییە؟ گوتی ئەو بەندانەن کە من دەکەن بەشایەت، ئەوانەن کە باسەکەم بۆ کردیت. گوتم:

< ئاخر شایەتی چیی‌و لەسەر چیی، خۆمن یەك رستەش لەو باسەی تۆ نەگەیشتووم؟

- گوتی مامۆستا ئەم چیرۆکە زۆر ئاڵۆزە، وا ئاسان باس ناکرێت..

ئەوەی من لێی تێدەگەیشتم رەنگە لەو سنورەدا بێت کە ئەم ئەوانی بەگرتن دابێت‌و ئێستا شایەتیشیان لەسەر دەدات. دور نییە خەتی مائیل بوبێت. دوای ئەوەی ئەوان لەوێ نەمان، ئەم بانگکرا. سەعاتە وەختێکی نەبرد کە هێنایانەوە.. زۆر شپرزە بو. کە دانیشت کەوتە دالْغەیەکی قوڵەوە. ئینجا لەخۆیەوە کەوتە قسەکردن. هەر هەموی ئاڵۆزو تێکەڵو پێکەڵ، وشەو رستە بزرکاو بون.. وای بۆ دەچوم کە ویژدانی مردارەوەبوی کەمێ بزوابێت، رەنگە تروسکەیەکی روناکیی خۆی خزاندبێتە ناو مێشکییەوە، گەورەیی تاوانەکەی نیشان بداتو بیهەژێنێ‌و ئازاری بدات. من هیچی لێ حاڵیی نەدەبوم. وام بە باش زانی کە نەچمە ناو باسەکانیەوەو پرسیاری لێنەکەم باچی دەڵێت بیڵێت و منیش هەر سەری بۆ بلەقێنم..

لەدووەم رۆژی هەوارگەی نوێوە، وردە وردە هەست بەجۆرێ لەحەوانەوە دەکەم، بەڵام لەش خوراندن زیاتر دەبێت‌و هێنامییە سەر بیری دەسکردنەوە بە ئەسپێ دۆزین.. دیار بو کە ساردیی‌و تاریکیی تاکزیندانەکەی تر لەگەڵ زەحمەتیی ئەشکەنجەو شەکەتیی‌و پەککەوتویی وایان لێکردبوم کە هەراسانیی‌و خوروی لەشکری ئەسپێم لەبیر بچێتەوە..

هەرچەندە روناکیی ئەم گڵۆپە ئەوەندە نییە وەك پێویست راوی لەبەردا بکرێت.. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت لەم شارە ئەسپێیە کەم بکرێتەوە، ئیتر کەمتر خوێنم بمژرێ‌و خوروی گیانم لەوە زیاتر نەبێت‌و، زۆرتر ئەزییەتم نەدەن‌و کەمتر نینۆکەکانم لە پێستم گیربن و نەبنە برینی قووڵ لە لەشمدا، بەتایبەتیی برین لەم شوێنەدا دەبێتە هەڕەشەیەکی گەورە لەسەر تەنم.

کە کەوتمە قژی سەر تەکاندن، بە دەیان دەکەونە خوارەوە، کە سەری پەنجەو نینۆکەکانم، شانە ئاسایی، بەناو ریشمدا دەهێنم، دیسان بەدەیان دەکەونە سەر زەویی.. کە برۆکانیشم دەخورێنم، ئەویش لەو بەڵایە بێبەش نەبون.. ئای داخۆ لە تاریکستانی ساردوەکەی ئەودیودا رۆژانە چەند دانە تێکەڵ بەنانەکەم بووبن، بێگومان لەژورەکانی تریش ئەوە دوبارە بونەتەوە. چەندم توانیی لەناو ئەو بیجامە شڕو چڵکنەشدا راوم دەکردن. بێزم لەخۆم دەکردەوەو بەزەییشم بەخۆمدا

دەهاتەوەو دەمگوت: راوچییو ئەسپێ کوژەی دەوری بەرد لەم وڵاتەی بەعسیدا زیندو بونەتەوە، بەڵام جیاوازیی ئەو سەردەمە و ئێرە، ئەوەیە کە ئەوان سەربەستیی راوکردنیان هەبو، بەڵام لەژێر سایەی رژێمی ئەم حیزبە نەتەوەییەی عەرەبدا، بوارو رێگەی ئەوەشیان نەهێنتشۆتەوە.. من وام بیردەکردەوە کە ئەمە پیس و پۆخڵیو ژیانی دژ بەخاوێنی و پاكو تەمیزییە، ئەم بەسوك زانینەی مرۆڤ، ئەم هەمو ئەشکەنجە بێ کۆتاییانە، ئەم ژیانەی ناو ئەسپێو مشكو عەسکەرە بەعسییانە.. بەشێکن لەئەقڵی دەوری بەرد کە تا ئێستاش، دوای نزیکەی دەیان سەدە، دەوامی هەیەو، لەم کۆتایی سەدەی بیستەمەیشدا، ئا بەم جۆرە مرۆڤ دەکەن بەنامۆترین کۆیلە کە تا ئێستا مێژوش شتی وای بەخۆوە نەبینیوە.

جارێکی تر سەباح بانگکرایەوە.. لەجاری پێشو کەمتری پێچو. کە گێڕایانەوە.. ئەمجارەیان پەژارەکەی کەمتر بوبووەوە... کەوتەوە قسەکردن. زیاتر لەسەر بانگکردنەکەی بوو.. دەیگوت:

- زۆر هەوڵمداوە کە ئەو تاوانانەی لەسەرییان بارکراوە بەدرۆی بخەمەوە.. هۆیەکەشی، لەراستیدا ئەوەیە کە ئێمە پێکەوە بوین، لەیەك رێکخستندا بوین. هەمومان کۆمەڵە بوین.. هەرچەندە لێکۆڵەرەکە دەناسم. چونکە خەڵکی خانەقینە، بەڵام زۆر لێم تورە بو، لەقسەکانم رازیی نەبو.. ئەی توخوا مامۆستا باشم نەکردووە؟ بەبێ وەڵامدانەوە، من بەردەوامم لەسەر زەق سەیرکردنی چاوەکانیو ئەویش خێرا خێرا دەڵێت:

- ئەی توخوا مامۆستا گیان خراپم کردووە؟ دە توخوا ئەگەر حاکم بیت چیی دەڵێیت.. ئەوە بۆ قسەیەك ناکەیت مامۆستا گیان؟

< گوتم: کوڕم تۆ چیرۆکێك باس دەکەیت کە کەمو زۆر من لێی حاڵی نابم و نازانم کێشەکەتان چییە، وا تۆ دەمکەیت بەشایەتو بەدادوەر! دوای ئەوە تۆ سەرنجی حاڵی من نادەیت؟ من ئاگام لەخۆم نەماوە چی جای گوێگرتن لەم گرفتە ئاڵۆزەی تۆو خەڵکی تر. بەڵام دەبێت هەمو کەس ئەوە بزانێت کە:

لەنێوان باشو خراپدا هیچ پلەیەکی تر نییە.. یان باش یان خراپ... ئەگەر هەردوکیشی لەیەك کەسدا کۆببێتەوە، وا سەرئەنجام هەر بەلایەکیاندا دەکەوێت.. ئەوەی لەم ژیانەشدا بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە هەر چاکەو یارمەتیو خزمەتی خەڵکە. تۆ بزانە مرۆڤ لەدوای مردن هیچ شتێك دادی دەدات، فریای دەکەوێت، جگە لە کاری باشەو پیاوەتیو خزمەتی خەڵك..

ئەم بەرگی کۆمەڵە لەبەرکردنو بۆیەی یەکێتیی لەخۆدانە، ئەو هەموو پێچو پەناو ئەمسەرو ئەوسەر کردن و قسەو پرسیاری پێچراوە بە مین، ئەو چاووڕاو کردنە، هیچیان دادی لێکۆڵەرو سیخوڕەکان نادەن، چونکە ئەو خورمایەی ئەوان

خواردوویانە دەنکەکەی وا لەگیرفانی مندا لەبەر ئەوانە پێکەنینم بە وانو بەو میتۆدانەیان دێت. هێندە هەیە دەبێت زیاتر لەپێویست ئاگاداری خۆمو قسەکانم بم. بەتایبەتیی ئەگەر رۆژگارەکە بەم جۆرە بڕواتو ئیتر دەستیان لێم هەڵگرتبێت وا باشتر دەتوانم کۆنترۆڵی هەمو وشەو رستەکان بکەم.

رۆژی سێیەم: دیسان سەباح بانگکرایەوە.. هەواڵی ئەمڕۆی:

- سەگبابانە لەبری چاکە هێندەی نەمابو منیش توش بکەن ئاقڵییو هوشیاریی خۆم نەبایە دەکەوتمە داویانەوە.. بەخوا ئەفسەرە لێکۆڵەرە ناسیاوەکەشم یارمەتیی باشی دام.

کەمو زۆر پرسیارم لێنەکردو قسەکانیم پشتگوێ خست، هەروەك قسەی بۆ من نەکردبێت..

ئێستەش کاتی هێنانە دەرەوەی زیندانییەکانە.. بۆ سەر ئاودەست، فرماندرا تا بەلوعە بکرێتەوە..

ئازارەکانی لەشم بەرەو کەمیی دەڕۆن، بەڵام شینبونەوەو خوێن تێزانو رێڕێبونی پێستم جوان دیارن.. لەو سەرمایە سەرفراز بوم، هەرچەندە شەوی ئێرەش هەریەك بەتانیم هەیە، هەم بۆ ژێر ڕاخەرو هەم بۆ پێخەف، کە بەشی ئەوەی نەدەکرد کە لەشم لەسەرمای شەوانەی زستانی کەرکوك لەو حەمامە سەرتاپا کۆنکرێتەدا بپارێزرێم، وشکە سەرمای ئەم شارەش بەناوبانگە. بەڵام بەهۆی ئەوە کە حەمامەکە رووبەڕوی رۆژهەڵاتەو بەهۆی بونی ئەم زەلامەشەوە، کەمێ لەنسرمیی حەمامەکەیان کەم کردۆتەوە، ئەوەش شوکرانەی دەوێت..

لەیەکەم سەعاتی گواستنەوەم بۆ ئەم لانەیە، بیرم لەسەر سەیرکردنی زیندانییەکان چڕکردووە، لەکاتی هێنانە دەرەوەیاندا بۆ تەوالێت. وادێت بەخەیاڵمدا کە ئەم عەسرە لەگەڵ ئەوە خەریك بیم بەڵکو رێکەوتی بینینیی هەندێ لەبرادەرەکانم بکەم. باشە چۆن بوێرم قسەیان لەگەڵ بکەم، چۆن بوێرن وەڵامم بدەنەوە، بەخوا هەر بەسوسەش ئاوڕ بدرێتەوە ئەو کەسە حەسیرمەیانێکی زۆر خەست دەکرێت. رەنگە بۆ منیش ئەشکەنجە قورسەکە دەستپێبکەنەوە، بەتایبەتیی ئەگەر دیاردەیەکی وا ببینن رەنگە ئەو بۆچونەیان زیاتر لا بسەلمێت کە پەیوەندیمان هەبووەو من لێپرسراویانم.. باشە ئەی ئەگەر ئەم بەڵایەی ئێرە پێی بزانێت!.. بەخوا یەکسەر دەیگەیەنێت..

کە چوار چوارو پێنج پێنج هێنرانە دەرێ تەواو بەپاڵ دیواری حەمامەکەوە بەرەو ئاودەستەکە هەنگاو دەنێن، سەروملی مرۆڤیی باڵا ئاسایی رێك لەگەڵ بەرزایی

پەنجەرەكەدا بو. لە كەنارەوەبەوردیی سەرنجم دەدان.. هەرزوو سەباح هەستاو هاتە نزیكمەوەو گوتی:

- مامۆستا ئەوە چیدەكەیت؟ بەسرپەیەك پێمگوت:

< بێدەنگ بە، هەروا سەیریان دەكەم. لەماوەی سەرنجی منو ئەو قسەكردنەدا كەسی ناسیاوم نەدەهاتە بەرچاو، هەرچەندە زۆر بەزەحمەت دەمبینین، چونكە نەمدەتوانی لەوە زیاتر خۆم راستبكەمەوە تا حەرەسە كە نەمبینێت.. كەسم لەو چەند تاقمەی تێپەڕ دەبون یان دەستو پلییان دەشتو دەگەڕانەوە نەبینی، خۆ ناشتوانم وەك دەمەوێت سەیر بكەمو لێیان وردببمەوە.. من دەمویست كەمال یان شێخ عەبدول یا حسەین رەزا ببینم تا سرپەیەك بكەم بەگوێی یەكێكیاندا.. ئەو ئێوارەیە ئەو هەلەم دەست نەكەوت.

- لە ئێوارەی رۆژی ئایندەدا، شێخ عەبدولم وەگیر هێناو دوای هەولێكی بێهودەو چەندین جار هەولی سەرنجراكێشانیمدا، دڵنیا نەبونم لەوەی كەگوێی لێمە، دوای وردە سەر لەقاندنێكی شێخ عەبدول، یەك دو وشەم بەگوێدا دا كە من باشم و سەركەوتووم، بێ ئەوەی لەوە دڵنیابم كە لێم حاڵیی بووە.

نەمدەهێشت سەباح گوێی لێبێت، بەلام هەستی دەكرد كە شتێك دەڵێم.. پرسیی ئەوە تۆ چیی دەڵێیت؟ گوتم هیچ ناڵێم هەر لەبەر خۆمەوە بۆخۆم قسەم دەكرد. ئەی گوایا چیی بڵێم، بۆ كێ قسە بكەم، كێ دەوێرێ گوێ بگرێ یان سەربجوڵێنێت. ئەی بۆچیی قسەبكەمو بڵێم چیی..؟ گوایا چیم هەیە پێیان بڵێم! ویستم بەچڕكردنی ئەو پرسیارانە ئەو بیرەی لەمێشكدا بڕەوێنمەوە.. بۆیە گوتی دەی باشە مامۆستا گیان، نەمزانی، وام هەست دەكرد كە قسە بۆ یەكێك دەكەیت، خۆ ئەگەر قسەش بكەیت هیچ زیانێكی نییەو من هەقم چییە بەسەرەوە، من كەسیان ناناسم تا قسەی بۆ بكەم.

ئەمڕۆ چوار شەممەیە ٣١- ١٢- ١٩٨٠ حەفتاو پێنج رۆژی رەبەقە یەخسیرو گیرۆدەی دەستی پیاوكوژەكانم لەم هەیئەیەی بەعسدا، سییو دوو دانە رۆژە لەسێ تاكزیندانییدا مێشكم دەشۆرریتەوەو بەدنیای دەرەوە نامۆم دەكەن!

چوارەم رۆژی ئەم هەوارە نوێیەیە. دوا رۆژی یەكەم ساڵی هەشتاكانە شەوەكەی لەسەرتاسەری جیهاندا خواحافیزیی لەو ساڵە دەكرێو جەژنی پێشوازیكردنی ساڵێكی نوێ دەگێڕدرێ. لەجیهانی مەسیحیو زۆر وڵاتی تریشدا شەوێكی پڕ لەبەزمو خۆشییو ئاهەنگ دەبرێتە سەر. سەری ساڵی حەفتاو یەك كە پەڕەوازەی بەغدا بوبوین، گەلێك برادەر (عەلی عەسكەری، حەمە چاوشین، تەیب برواری، كەمال محییەدین، سمكۆ فەتحولا، جەمال ئاغا، نەوشیروان مستەفا و بەندە) تا بەرەبەیان شەوێكی خۆشمان لەسەر شەقامی گەڕەكە مەسیحییەكان بەسەر برد.

هەر لەو شەوەی ساڵی حەفتاو سێدا زانکۆی سلێمانیی ئاهەنگێکی قەشەنگو پڕ لەگۆرانیو هەڵپەرکێو بەرنامەی خۆشی لەئوتێل ئاشتیی سازکردو شەوێکی شیاو بەجەژنی ساڵی نوێمان بەسەر برد.

وا ئێستاش هەر لەم ڕۆژەدا وا لەم وێرانەیەی بەعسدا لەمەینەتییو مەرگ زیاتر تروسکایی هیوا بۆ ساتێکیش نابێتە میوانمان، جەژنی سەری ساڵی نوێ بۆ ئێمە بۆتە ماتەمینیو چاوەڕوانیی مردنی ژێر ئەشکەنجە..

لەدەریای بیرکردنەوەدا لەم ڕۆژی چوار شەممەیەو لەناو خەمو پەژارەو نوقومبون لەپەستییو بێئومێدیدا، جارو باریش بیر دەچێتە ناو ناخی مێژووەوەو روداوە دێرینەکانی سەردەمە جیاجیاکان بەسەر دەکاتەوە.. بۆیە لەناو هێنانی چوار شەممەدا بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیم هاتەوە یاد:

ئەم ڕۆژی چوار شەممەیە لای خەڵکی سلێمانی ڕۆژێکی تایبەتیی بەهاران بو. هەر لەنیوەڕۆی ڕۆژەکەوە، سەرکارێزی دایکی پاشا دەبوە ڕێگوزەری هەزاران کیژو ژنو لاوو پیرو منداڵ رووەو جادەی سەرەکیی بەرەو کانیبا لەسەر ڕێی (جادەی کۆنی هەڵەبجە) کە بەسەیواندا بەنێوان گردی (شێخ قادری سەرنەگیراو "سەربەرەلا") و گردی (عافوان "کاسەو کەوچك")دا تێدەپەڕیی.

لەشەقامی بابانەوە ڕوەو کارێزی وەستا شەریف لەدامێنی گردی مامەیارە.

لەو بەهارە ڕەنگینەدا ئادەمیزادی ئەو سەرزەمینە بەجلی هەمە ڕەنگو ئاڵاو والاوە ژیانێکی زیندوی تریان دەخستە سەر ئەو دەشتو دەرە سەوزو ئەلوەنە. دەنگی گۆرانیی گرامەفۆنی ئەم چایخانەو ئەو چایخانە خۆشییەکی پڕ لەخەندەو پێکەنینی بەرێبوارانی ئەو دوو ڕێگەیە دەبەخشیی. لەناو هێنانی گردی مامە یارەشدا، نەورۆزەکانی پیرەمێردم هاتەوەیاد. ئەم لەنەورۆزی هەمو ساڵێکدا جەژنی میللی لەکارێزی وەستا شەریف سازدەکرد. وەك لەبیرمەو لەو منداڵییەمدا، بەهۆی نزیکیی کارێزی وەستا شەریف لەگەڕەكو ماڵەکەمان، بە بەراورد لەگەڵ گەڕەکەکانی تر، دوو سێ جار هاوبەشیی ئەو شادیەی جەژنی نەورۆزم کرد، حاجی تۆفیق خۆی یا پیراخو شەربەتیی سازدەکردو کورو کاڵ بۆیان دەگەیاندە مەلبەندی گێڕانی ئاهەنگەکە، کە بەسەدان لاوو پیرو منداڵو ژنو کیژ کۆدەبوونەوەو هاوبەشیی ئەو جەژنەیان بەهەڵپەرکێو دەهۆڵو زوڕناو گۆرانی دەکرد، کێ بیویستایە هاوبەشیی خواردنو خواردنەوەی شەربەتیشیان دەکرد.

لەراستیدا بە ئاهەنگگێڕان بۆ زیندوکردنەوەی ئەو جەژنە نەتەوەییە، شان بەشانی ڕۆژنامەگەریو نوسینو شیعرە نیشتمانییەکانی، بە زیندوکردنەوەی یادەوەریی دوانزە سوارەی مەریوانو یادی مامە یارەی قارەمانو چیرۆکە زیندوەکەی سەردەمی میرێتیی مەحمود پاشای بابان، کە لەخۆگریو نەبەزیدا

لەسەختترین ساتەکانی شکاندندا ملی بۆ خواستی داگیرکەر دانەنەواند، بەوانە پیرەمێرد بوو بەو مانگە هەمیشە روناکەی ئاسمانی کوردەواری.
سەرەنجام خۆشی لەسەر وەسیەتی خۆی بوو بەهاورێی نەمری مامەیارە بەناشتنی لەسەر لوتکەی گردەکەی مامەیارە..
خۆشەویستیی پیرەمێردو شانازیمان بەو رۆڵە مەزنو درەوشاوەیەوە، بۆ ئەو چاپخانەیەی کە مەگەر هەر خۆیو دۆستە نزیکەکانی بیانزانیایە چۆن پێکییەوە ناو رۆژنامەی ژینی پێ چاپ دەکرد، لەدوای خۆشی جەمیل سائیب بوو بە بەڕێوەبەریو دواکەس ئەحمەد زرنگ لەسەری بەردەوام بوو، بەڵام دەستی رەشی بەعس لەیەکەم حوکمڕانییاندا ( (١٩٦٣) گەیشتە ئەو تاقانە رۆژنامەیەی کوردو دایخست، بۆ ئەوەی ئەو چاپخانەیە هەروا بێناز نەبێت، ئێمەی لقی سلێمانی بەرەی مەکتەبی سیاسیی، بۆ گۆڤاری رزگاری- مان کڕیو لەچاپخانەکەدا دامانمەزراند (١٩٦٩) هەرچەندە لەدوای یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکەی پ.د.ک بەشە سەرەکییەکانی چاپخانەکە بەسەرپەرشتیی عومەر دەبابە، گوێزرایەوە بۆ چاپخانەی پارتی لەناوچەی حاجی هۆمەران، بەڵام ئەو بەشەی چاپخانەی ژین لای بەختیار مستەفا شاردرایەوە. لەنوێبونەوەی شەڕی بەعس لەدژی کورد (١٩٧٤)دا رۆژێك لەپێنجوێن بەختیار باسەکەی هێنایە ئاراوە گوتم باجارێ بمێنێتو بابزانین چۆن دەبێت. سەرەنجام لەنوێبوونەوەی شۆڕشدا بەختیار ناردنییە دەرەوە بۆ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان.
لەدوای ساتەکانی نانی بەیانی، چەند زیندانییەکی هەولێری هێنرانە دەرێ.. مامەڵەو قسەکردن لەگەڵیاندا لەرێورەسمی ئازادبونیان دەچو. سەباح گوتی:
- خۆزگەم بەخۆیان شەوی سەری ساڵیان بەنسیب دەبێت..
< جا خەمی چیتەو پەلەت چییە! ئەمە نا ئەوەکەی ساڵی ئاییندە! سەیرێکی کردو ئەوسا گوتی:
- گاڵتەم پێدەکەیت؟
< بۆ کەس لەوەدا ماوە گاڵتە بەیەکێکی تر بکات، ئێمە هەمو بوینەتە ئەکتەری سیرکوسیکی گەورە کە رۆژانە گاڵتەو سوکایەتیی بە نزیکەی چوار سەد کەس دەکرێت!
- مەبەستت چییە..؟
< مەبەستم ئەوەیە کە هەڵە تێگەیشتویت، تۆ لەلایەکی ترەوە گاڵتەت پێدەکرێ، کەچی سەرنج لەو قسەیەی من چڕ دەکەیت.
- ئەرێ مامۆستا بەهیوا هەیت کە لەم زیندانە سەرفراز ببیت؟
< بەڵێ بەهیوام، بەرێ وەڵڵا تەواو دڵنیام کە ئازاد دەبم، بەڵام لەگەڵ تۆدا نا!

- بڕواناکەم، چونکە ئەم ئەشکەنجە زۆرە ئەم تاکزیندانییەو ئەو ماوە دورو درێژە، هەروا بێ مەلامەت نییە!

< باشە سەباح ئەی تۆ؟

- من، من هەمو دەقیقەیەك چاوەڕوانی بەربون دەكەم. من هیچم لەسەر نییە!

< جا ئەگەر جەنابت کە دەڵێیت کۆمەڵە بوم، هیچت لێ نەکەن و بەربدرێیت، ئیتر چۆن من بەرنادرێم..

- باشە ئەگەر بەڵێنی بەربونت بدەنێ بەمەرجێك وەزیفەیەکی گەورەت بدەنێ دەیکەیت؟

نامۆ نییە ئەمانە بێ پێشەکی لەباسێکەوە بۆ باسێکی تر بازبدەن. ئەمە هەمان پرسیارە کۆنەکەیە بەڵام لەبارودۆخێکی کەمێك جیاوازدا کە ئەشکەنجەی گیانیی تیا کەم کراوەتەوە، و لەسیخوڕێکی نوێوەیە.

< گوتم نەخێر.

- بۆچی؟

< چونکە سیاسەت ناکەم.

- کەوا بو گوێ بەمردن نادەیت!

< چۆن! بۆ کەس هەیە لەمردن نەترسێت؟ لەمانە نەترسێت.؟ بەڵام نایەت بەبیرمدا کە لێرەدا بکوژرێم. ئەزانی بۆچیی؟

- نەخێر، بۆچی؟

< چونکە من هیچ گوناهێکم نییەو هیچیشم نەکردوە.. بۆیە ئەمڕۆش نەبێت سبەی هەر بەردەبم.. جگە لەوە، کەی ئەقڵ دەیگرێ لەسەر شتی وا کە یەکێك وەزیفەی گەورە وەرنەگرێت بکوژرێت..! بۆچی ئەمانە کورسێکانیان هێندە بەتاڵە تا بەدوای خەڵکدا بگەڕێن و لەسەریان دایانبنیشێنن! بۆچی ئەوەندە موحتاجی خەڵکن! تا ناو زیندانەکانی خۆیانی بۆ بگەڕێن! کوڕە بەسەدان و بەهەزاران کەسی کورسی و نازو نیعمەت پەرست بەدوایاندا رادەکەن تا شتێك بگرنەوە. وا دیارە تۆ ئاگاداری ئەو خەڵکەنیت، دەڵێی لەگوێی گادا نوستویت. رەنگە ئەم پەیامانەش بۆ رەئیسی هەیئە بەم مەقاشە نوێیەدا خراپ نەبێت!

شەوەکەی ئەو رۆژە ئارامی و بێدەنگیی باڵیان بەسەر دنیای ئەو زیندانەی من و ئەم زەلامەی تەنیشتمدا کێشابو.

رۆژی سەری ساڵی نوێی (١٩٨١) بێ دەنگی و کش و ماتیی بەردەوام بو.. سەیرە، تۆ بڵێیت لەویژدانی بەعسیدا شتێك هەبێت ناوی رێزو رێزگرتن بێت لەرۆژێکی واو

جەژنێكی جیهانیی وا گەورە..؟ بڕواناكەم. كەواتە دەبێت شتێك روی دابێت، یان چاوەڕێی شتێك بكەن!

دوای نیوەڕۆ حەڵوا هێنراو هەروەك جەژنەكانی تری ئیسلام دابەشكرا. حەڵوایەكی تا بڵێیت خۆش‌و بەلەزەت، بادامی سەریشی خۆشتری كردووە.

رۆژی دووەمی ساڵی نوێ، دوای نانخواردنی بەیانی، دەرگا كرایەوەو ناوی منیان بانگ كرد بە بەڵێ وەڵامم دایەوە.. چاویان بەستمەوە، سۆندە درایە دەست و راكێشرام، دەبێت سەرلەنوێ لێكۆڵینەوەو ئەشكەنجە دەستپێبكاتەوە؟ تۆ بڵێیی ئەم پشودانە بۆ هاتنەوە بەخۆدا بێت تا بەرگەی ئەشكەنجەی نوێ بگرم..؟ جا شوێن ماوە بەلەشمەوە كە شوێنەواری ئەشكەنجەی پێوە نەبێت.. بەڕێگەوە ئەو پرسیارانەم لەخۆم دەكرد. كە وەستێنرام.. بەدەنگێكی لەسەرخۆ لێیان پرسیم:

- ها ئێستا دەڵێیت چیی مەحمود؟ دیارە لەم ماوە دورو درێژەدا توانیوتە لەراستییەكان بگەیت! باشە ئێستا ئامادەیت قسەمان بۆ بكەیت، وەڵامی پرسیارەكانمان بدەیتەوە یان دەستپێبكەینەوە؟

بەدەنگێكی زۆر نزم هەروەك نوزە بەحاڵ تێداماوە:

< پرسیاری چیی؟

- چۆن پرسیاری چیی، ئەوەی وا دوو مانگو نیو زیاترە جەنابت میوانی ئێمەیت‌و دەیان جار لێكۆڵینەوەت لەگەڵ كراوە، چەند پرسیارێكمان لێت دوبارە كردۆتەوەو چاوەڕوانی وەڵامەكەی تۆ دەكەین، كەچی تازە جەنابت دەڵێیت پرسیاری چیی!؟

بەهەمان دەنگ نزمیی:

< بۆچی لەبەر لێدان‌و ئەشكەنجەی ئێوە، بۆخۆم دەزانم من لەكوێم!؟ دەزانم چی رۆژو چی مانگێكە..؟ بۆ ناوی خۆمم لەبیر ماوە..!؟

- ئەوە تۆ دەڵێی چیی..؟ دیارە خۆت واتەنی لەهیچ ناترسیت.. تەنانەت لەئێمەش..! دیارە تۆ پاڵەوانێكی موهیممی هەیئەی تەحقیقیت.. رەنگە دڵی خۆت بەوانە خۆش بكەیت..

< نەخێر قوربان من پاڵەوان نییم، من یەخسیرێكی بێدەسەڵات‌و پڕوكاوی ناو ئەشكەنجەی دەستی ئێوەم.. من گوتومە ناترسم چونكە هیچ تاوانێكم نییە. من گوتومە ناترسم چونكە بێ بەڵگەو دوور لەیاساو بێ دادگایەكی عادیلانە نابێ كەس بكوژرێت.. نەترساندنەكەم لەبەر ئەوانەیە، ئەگینا كێ هەیە لەئێوە نەترسێت. كێ هەیە لەبیركردنەوە لەئێوەو لەهەیئە مردنی لەبەرچاو نەبێت. خۆ من هەر لەسەرەتاوە گوتومە بمكوژن.. تكاتان لێدەكەم بمكوژن با لەم رەزالەت‌و مەینەتی‌و نەگبەتییە رزگارم ببێت.. با بەبێ تاوانیش بێت هەر حەز بە مردنەكە دەكەم! كە ئێوە خۆتان

باش دەزانن کە من تەنها دو تاوانم هەیە، ئەوانەش: من تا ساڵی ١٩٧٥ سیاسەتم کردووە. ئیتر دوای ڕێککەوتنەکەی نێوان ئێرانو عیراقو هەرەس، لەبری مانەوە لەئێران یان چونە ئەوروپا ئەمنستییەکەی ئێوەم هەڵبژارد. دووەمیش ئەوەیە کە من کوردم. باشە ئەی ئەمنستی مانای چیی؟ من بڕوام بەیاساو ئەمنستییەکەی ئێوە کرد بۆیە وام لێدەکەن!؟

ئەوە ئەو قسە حەللەقو مەللەقانە چییە تۆ دەیانکەیت! ئەرێ دەزانیت تۆ لەکوێیتو لەگەڵ کێ قسە دەکەیت؟ باشە بۆچی هەرچیی کوردبێت ئێمە وای لێدەکەین..؟ ئەی ئەو هەمو وەزیرو لێپرسراوە گەورانە کوردنین؟ ئەی تەها محێددینی جێگری سەرکۆمار کورد نییە؟ ئەی ئەو چوار پێنج وەزیرەتان کورد نین؟ ئێوە مافتان لەئێمە زیاترە، یەکەم حوکمی زاتیتان هەیە. دووەم لەهەموو دەزگاکانی دەوڵەتیشدا هاوبەشن! دەی پێم ناڵێیت لەوە زیاتر چیتان دەوێت؟ ئەو حوکمە زاتیە بەکەم دەزانن! ئەی دەوڵەتی کوردیتان دەوێت! لەتکردنی عێراقتان گەرەکە؟ دەتانەوێت هەر بەنۆکەری بژین!

< دەی باشە کە ئەو هەمو مافانەمان هەیە، ئەی بۆ وامان لێدەکەن؟ بۆچی وا لەمن دەکەن، باشە مافەکانی من کوا؟

- تۆ، ئێوە هەموو دژی شۆڕشو حیزبن، دەی مافی چیتان هەبێت! دە بزانم تۆ چی خێرێکت بۆ ئەم عیراقە، بۆ ئەم شۆڕشو حیزبە هەبووە تا مافت هەبێت؟

< باشە چۆن دەیسەلمێنن کە من سیاسەتم کردووەو ئەو دژایەتییەم کردووە.

- کوڕە دەیان بەڵگە خراوەتە بەردەستت. ئەی ئەو پرسیارانە هەمو بەڵگە نین؟ گوایا ئێمە لەخۆمانەوە ئەو پرسیارانە دەکەین! تەنانەت کاتێك تاقمەکەشتان لەگەڵ ئێمەدا هاوکار بون، تۆ وەك جەلالییەکیش لەدژی ئێمە بویت، لەگەڵ ئاشتبونەوەو تێکەڵبونەوە بویت لەگەڵ مەلا مستەفادا. بۆ تۆ وادەزانیت ئەو رابوردووە چەپەڵەت لای ئێمە سڕراوەتەوە! جگە لەوانە ئێمە دەزانین کە تۆ ئاگاداری هەمو کەینو بەینێکیت. هەمو گیانت نەهێنییە. زیاتر لەوە تۆ چیت بۆ ئەم نیشتمانە کردوە؟ چیت بۆ ئەم عیراقە کردوە کە بەئاوو هەواو نانی پەروەردە بویت؟ کوا خزمەتەکانت بۆ حیزبو شۆڕش..؟ کوا هەڵوێستە ئیجابییەکانت؟ بەپێچەوانەی ئەوانەوە، کارو کردەوەت لەسەر یەکخەت دژ بەحیزب بووە. دژی ئەوانە بویت کە دەبونە حیزبی.. بۆ وا دەزانیت پێمان نەگەیشتۆتەوە کە چۆن گاڵتەت بەوانە کردوە کە بونەتە جەیشی شەعبی یان بونەتە بەعسی، باشە تەنها یەك هەڵوێستی ئیجابی خۆتمان بەرامبەر بەشۆڕشو حیزب پێبڵێ تا هەر ئێستە بتنێرینەوە ماڵی خۆت، دەی دەبڵێ.

< من وەك مامۆستایەك چەندم توانیبێت خزمەتم کردووە، هەمو ساڵێك لەرازەی زۆریی قوتابیانی دەرچوو لە بەکەلۆریی سوپاسم وەرگرتووە.

بەیەك دەنگ قاقای پێکەنین لەگەروی چەند کەسێك دەرچو. حای حای لەم خزمەتە جوانەی ئەم قارەمانە! کورە ئێمە باسی حیزبو شۆڕشت لەگەڵ دەکەین، حیزبو شۆڕش. ئێمە ئەوەی کە لەگەڵمان بێت بەهاوولاتیی راستەقینەی دادەنێین، باقییەکەی مشەخۆرن، نانو پارەی دەوڵەت بەخۆڕایی دەخۆن! ئێوە هەر بۆ مردن باشن! ئێوە میللەتی مەجوسن ئێوە هەر لەسەرەتاوە نۆکەری ئیمپریالیزمو دەوڵەتە نۆکەرەکانیانن. تۆ بەپارەو مەعاشی دەوڵەت دەرست گوتۆتەوە نەك بۆ خزمەت! ئێستا قسە دەکەیت؟

< باشە ئەی گەڕانەوەم لەدوای ئازاری حەفتاو پێنج، متمانە پەیدا کردن بەخەڵك نەبووە! رەنگە بەهەزاران کەس لەگەڕانەوەی ئێمەدا، سامو ترسی گەڕانەوەیان شکابێتو ئەوسا بڕیاری هاتنەوەیان دابێت..

سەرلەنوێ بەپێکەنینێکی پڕ لەگاڵتەپێکردنەوە یەکێکیان گوتی:

- وا دەزانیت بەو قسانە ئێمە لەخشتە دەبەیت! وا دەزانیت ئێمە گوێ لەو قسە پڕوپووچ و بێ مانایانە دەگرین؟

کورە ئێوە بەڕوخاوی گەڕانەوە. سیاسەتی عەبقەریانەی سەرکردایەتیمان ئێوەی روخاندو ئیتر دەبو هەر بێنەوە بەردەستمان، ناچار بوون بێنەوە ریزی نیشتمانیی، باشە ئەی بۆچی پێش ئاشبەتاڵ نەگەڕانەوە؟ جگە لەوە ئێوە بۆ تێکدانو ئاژاوە گەڕاونەتەوە نەك بۆ خزمەت، خۆ ئەگەر بۆ خزمەت بوایە وا دەبو پێمان بزانیایەو بەرهەمەکانتان دیار بوایەو ئێستا لەم زیندانەدا نەبویتایە!

بێ ئەقڵیی ئەمانە سنوری کەرێتیشیان بەزاندووە. ئاخر گێلەپیاو! ئەی سەرۆکەکەی خۆتان نەبو بە بەرچاوی هەمو پاشاو سەرۆکەکانی وڵاتانی عەرەبەوە بەهەمو دنیای گەیاند کە بەناچاریی لەگەڵ ئێراندا رێککەوتوتەسلیم بەمەرجەکانی شاهەنشابوو! کە تەقەمەنی بەردەوامیی جەنگی نەمابوو، تەنها دوو گوللە تۆپی مابو، بۆیە ناچاری شەڕ راگرتن بو. ئیتر عەبقەرییەتی چیی!

بەلام بۆ گەڕانەوەمان، ئێمە دەبوو لەنێوان دوو دوژمنی پێکهاتوو یەککرتوداو لەژێر هەرەسی شۆڕشە روخاوەکەو سەرکردایەتییە راکردووەکەیدا بۆ ناو ئێران، لایەکیان هەڵبژێرین، گەڕانەوە بۆ ناو میللەتی خۆمان، بۆ بەردەوامیی خەبات، یان ئاوارەیی ناو ئێرانی شاو بەردەوامیی هاوکاریی لەگەڵ سەرکردایەتییە مەیدان چۆڵکردووەکەدا. من ژیانی ناو ئێرانو ئەو بندەستییەی ناو ئاوارەییم بەلاوە ملکەچیی بوو بۆ رژێمی شاو بۆ خیانەتەکەی‌و بۆ ئەو سەرکردایەتییە خۆ لەو سەرەتایەشدا باسی چونە دەرەوەی ئەوروپا لەئارادا نەبو، دەنا ئەوەیان باشترین ئەلتەرنەتیڤ بو.

< دیارە ئەوەی نەبێتە بەعسیی سەرەنجامی دەبێت بەم جۆرە بێت...!

هەر کە ئەو قسەیەم کرد بەسەرما نەڕاندی‌و گوتی بەسەبەس نامانەوێ جارێکی تر ئەم قسانەمان گوێ لێ بێت. حیزبمان هەمو کەس وەرناگرێت، خەڵکی وەك ئێوەمانان قابیلی ئەوە نین شەرەفی وەرگرتنتان لە حیزبی بەعسدا پێ رەوا ببینرێت. دیارە هیچ شتێك لەگەڵ ئەمەدا کەڵکی نییە، بیبەن‌و دوری بخەنەوە. نامەوێت جارێکی تر چاوم بەم لەعنەتییە بکەوێتەوە! بیبەن بۆ دۆزەخ، چونکە گوناهە ئەمە نانی ئێرەش بخوات! بیبەن با لەوە زیاتر هیلاکمان نەکات، ئەو وەختە جوانەمان بەفیڕۆ نەدات. دیارە تا ئێستا ئامادە نییە قسەیەکی راستمان لەگەڵ بکات. ئەوەی گوت‌و ئیتر دەنگ نەما.

پاش ماوەیەك بێدەنگیی‌و چاوەڕوانیی بۆ ئەنجامی ئەم هەڕەشانەو چڕکردنی بیرکردنەوەم لەوەی کە دەبێت ئاخۆ چی بکەن.. هێندەم زانیی سۆندەکە خرایەوە دەستم. گرتم‌و رایانکێشام. ئینجا وەستێنرام‌و گوتیان دەی پەنجەت بخەرە سەرزەوی. ئەوەم کرد. گوتی دەی بەدەوری پەنجەتدا بسوڕێرەوە. زۆر بەهێواشی لەناو بێ هێزی‌و بێ تواناییمدا دەستم پێکرد، بەدەوری بازنەیەکی وا بچوکدا جارێك دوو سێ‌و چوارو پێنج، نەخێر گێژ بوم‌و کەوتم. چەند هاواریان کرد نەمتوانیی دەست پێبکەمەوە. چەند سۆندەیەکیان تێسرەواندم‌و گوتیان بەرز بەرەوە.. زۆرم لەخۆم کردو هەستامەوە. دیسان فەرمانی خولانەوە درا.. دەی گوێ مەدەرێ خوای دەکرد تا سبەی هەر وایان دەکرد، هەر نەکەونەوە سەر باری هەڕەشەو ئەشکەنجە دوابڕاوەکان، ئیتر ڤیروسیا لەمانەو لەگێژبون‌و لەکەوتن.. دەی دیسان جارو دوو جارو سێجار کەوتن‌و هەستانەوە.. تا تەواو گێژو هیلاك بوم‌و کەوتم.. ئەوسا بەجێیان هێشتم.. دیسان کش‌و ماتییەکی تر ئەو ناوەی گرتەوە.. گوێم لەجۆرە قسەیەکە بەگوێمدا دەچرپێنرێت، هەموی جنێوی دەم عەسکەری بەعسە بەهەڕەشەو گوڕەشەوە.. دەیانگوت: بۆچی نازانیت کە ئێمە نهێنی وامان لایە کە بە ئیعدام کردنیش لێت رازی نابین. منیش ورتەم لەخۆم بڕیوەو بەخۆم دەڵێم ئەم دەعبایانە لە نامۆ نامۆ ترن، لوتکەی سزای گەورەترین تاوانبار کە خراپترین دڕایەتی یاسای کردبێت سێدارەیە. کەچی وا ئێستا ئەوە بەکەم دەزانن! رەنگە ئەگەر زیندو کردنەوەشیان بەدەست بوایە، رۆژی چەندین جار زیندانییان دەکوشت‌و زیندویان دەکردنەوە.. وا دیارە ئەمانە جێگەی "دادگاکانی پشکنین"ی سەدەکانی ناونجیی کەنیسەکانی ئەوروپایان گرتۆتەوە.. خۆ لە راستیشدا خۆیان بەکردار هەر ئەوە دەکەن.. ئەی ئەو لەسەر خۆچون‌و لەهۆشخۆچونانە مردن نین!؟ دەی جیاوازیی نێوان ئەو دوانە چییە..! خۆ مردنەکە سەت قات کەم ئازارترە، چونکە جارێکەو

دەبڕێتەوەو ئیتر ئەم مەینەتییە نابینێتەوە. بەڵام لەهۆشخۆچوون هەموو چەرمەسەرییەکانی تری بەدوادا دێت. جگە لەو چاوەڕوانییە پڕوکێنەرەی کە لەخودی ئەشکەنجەو بورانەوەو مردنەکەش ناخۆشترو سامناکترە.

ماوەیەکی دوورو درێژ لەناو ئەو بیرانەدا بووم. ئەوسا بردیانمەوە ژورەکە، زۆری نەبرد نانی ئێوارەیان هێنا..

بەدەم زۆر لەخۆکردن بۆ خواردنی شتێك، بیرم لەو قسانەی رەئیسی هەیئە دەکردەوە کە دەیگوت: کورد دوو مافی هەیە هەم ئۆتۆنۆمیو هەم ئەو هەمو وەزیرو نایب سەرەك کۆمارو ئەندامانەی کۆنگرەی نیشتمانیە. دەی ئاقڵینە ئەو قسانە لای یەکێك بکەن کە کورد نەبێو لێرەدا ئەم هەمو نەهامەتیو ئەشکەنجەو سوکایەتییەی بەسەردا نەبارێنرابێت! کە لە عیراقدا نەژیابێت، کە ئێوە نەناسێت، کە ئەو هەمو کوشتنو بڕینەی نەدیبێو نەبیستبێ.. ئەو هەمو تەهجیرو تەرحیلو تەعریبو تەبعیسە بەسەر میللەتەکەیدا نەسەپێنرابێت! ئەی باشە کە ئەو هەموو مافانەمان هەیە ئەی بۆچیی ئەم هەمو خەڵکەتان راپێچی دەری ناوچەی حوکمی زاتی کردووە! ئەی کوا لێکۆڵەرە کوردەکان، کوا دادگاکانتان کە کورد بەڕێوەیانبەرن.. ئەی ئێوە ئاگاداری ئەوەنین کە تەنانەت دەسەڵاتی ئەمنێکی سادەو پیادەی قورمساخ لە دەسەڵاتی نایبی سەرکۆمارو هەموو وەزیرەکانو هەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو جێبەجێکردنیش زیاترە، بگرە حوکمداری تەواو هەر خۆیەتی.. دەی ئەگەر ئێوە راست دەکەن تەنها ئەو دەسەلاتەی ئەمن بدەن بە کورد ئیتر هەمو ئەو مافانەی تر بەرنەوە بۆ خۆتان. ئێمە دوو مافمان ناوێت، ئێمە نامانەوێت مافمان لە عەرەب زیاتر بێت، نانا، ئێمە داوای وا ناماقوڵو نالۆجیکیی لە ئێوە ناکەین، داوای ئێمە زۆر سادەو بێ ئەرکو بێ مەسرەفە، داوای ئێمە هەر ئەوەیە کە دەست بەرداری ئەو کوشتنو بڕینە بن تا کورد وەك مرۆڤ بژی نەك وەك کۆیلەی ژێردەستی ئێوە..!

هەر لەیەکەم رۆژی ئەم شوێنە نوێیەمەوە، سەباح خوی داوەتە ئەو گوێنییەی ناو یەك لە سندوقەکانو دەیگوت من دەیکەمەوە تا بزانم چیی تێدایە.. ئیتر لەوە نەدەگەیشتم بۆچی لەو دوو رۆژەی کە لەپێش منەوە لەو حەمامەدا بو، ئەوەی نەکردبو! منیش حەزم دەکرد بەڵام بە ڕواڵەت پێم دەگوت مەیکەرەوە وازی لێ بهێنە. دیاربو کە پشتی قاییم بو.. بۆ نەبزگرتنی ئەم بۆچونەم پێم گوت: ئەگەر بیکەیتەوەو پێ بزانو پرسیار بکەن دەڵێم ئەم بو. چونکە من توانای ئەشکەنجەم نەماوەو بەرگە ناگرم.. زەردەخەنەیەك گرتیو گوتی: باشە بیڵێو گوێ مەدەرێ!

کە گوێنییەکەی کردەوە، سەیرمان کرد هەموی کەلو پەلی هەندێ بەندی وەکو ئێمەن. پڕیشە لەوێنەی خەڵك. لەناویاندا شانەیەکیش هەبوو. گوتی دەڵێی چیی

ئەمە دەربهێنم.؟ زۆرم پێخۆش بو چونکە ئامرازێکی زۆر گرنگ بو بۆ راوکردن. جا کێ لێرە ئەوەی دەست دەکەوێت! بۆیە گوتم کەیفی خۆتە. دەری هێنا. دەستیکرد بەسەرداهێنان. سەیرە بەم ژیانە پڕ لە زەحمەتییەشەوە پیاو نۆکەریی بکات، دوژمنی میللەتی خۆی بێت، ببێتە جاسوسی دڕندانەترین رژێمی کورد کوژە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ئەوا ئەوان دەزانن بۆچیی و بۆ کێی دەکەن ئەی دەبێت ئەم قوڕمساغانە لە پێناوی کێ و چیدا ئەوە بکەن! شانەکەم لێوەرگرت و گوتم باش وایە بیکەین بە دوو کەرتەوە. گوتی باشە. دەستم کرد بەشانەکردنی سەروڕیش و سمێڵ و برۆکانم. ئای شارە ئەسپێ وروژا، ئەوە خۆ بەسەدان ئەسپێ دەکەونە خوارەوە. ئەوەی باشە لێرەدا کوشتنی ناوێت چونکە یەکسەر دەیانخەمە ناو ئاوەڕۆگەی حەمامەکەوەو ئاوی بەسەردا دەکەم. ئیتر هەر ناوبەناوێك دەستم دەدایەوە شانەکەو دەکەوتمە راوە ئەسپێ.. هەرچەندە وردەکان بەرناکەون، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوێن مژە تێرنەبووەکان بەردەکەون. بۆ وردەکانیش چارنییەو دەبێت قەبوڵ بکرێن. ئەو لەتە شانەیە نیعمەتێکی خواییە، بەس نییە ئەم قوڕمساغە ئەم سودەشی هەبو.

لەگەڵ شانەکەدا قوتویەکی بەتاڵی نقوڵی دەرهێنا. کە سەرەکەی لابرد بریقەی دەهات. ئاوێنەیەك بۆ خۆی. ئەمەشیان شتێکی باشەو بۆ یەکەم جار لەم بەندییەدا روخساری خۆمان دەبینین. کە سەیری دەموچاوی خۆمم کرد، ئای ئەوە چیی دەبینمو چیم لێهاتووە!؟ خۆ وەك ئینسانی کۆنم لێ هاتووە. تەواو سەرم لەخۆم سوڕما، بەو سەروڕیش و سمێڵە درێژانەوە روخسارێکی تەواو مەجنونانەیە، بەنداوی بەزەییم درزی تێکەوت و چاوم فرمێسکی تێزا، گەلێك سەرزەنشتی خۆمم کردەوە کە بەدەستی خۆم خۆم خستە ناو داوی بەعسەوە یا لەناوداوی زیندانە گەورەکەی بەعس خۆم سەرفراز نەکرد.

ئەوکاتە بۆم دەرکەوت کە لەو زیندانییانەی یەکەم رۆژ بینیمانن، خراپترم لێهاتووە..

رۆژی ئایندە دوای شانەکردنێکی زۆری سەروڕیشم بەمەبەستی قەڵاچۆکردنی ئەسپێ لەپڕ دەرگاکەیان کردەوەو بانگیان کردمە دەرێ.. یەکسەر (عەبدولئەئیممە) پیاوێکی کەتەو بەهێزو یەکێك بو لە جەللادە بێبەزەییە وەحشییەکان، کە حەرەسی حەوشەکە بو، سەیرێکی کردمو گوتی: وەرە پێشەوە، کەلێی نزیك بومەوە، وتی:

- ئەوە شانەت لەکوێ بو؟ وتم:

> هەر لەحەمامەکەدا دانرابو. ورد ورد هاتە پێشەوەو لەقەیەکی بەئاسپایی لێدام، هەروەك بیەوێت ئازارم نەداتو وتی:

- ئەم جارە عەفوت دەکەم، بەڵام جارێکی تر ئەوە ببینم دەتکوژم. جارێکی تر بەکاری بهێنیتەوە دەتکوژم.

> باشه ئیتر بەکاری ناهێنم.

لەراستیشدا دەبو دوای شانەکردنی قژمو راوە ئەسپێ، جوان قژەکە تێکبدەم تا کەس نەیبینێت. بەڵام بانگکردنەکە هێندە لەناکاو بو کە نەپرژامە سەر بیرکردنەوە لەوە. کە هاتمەوە ژورەکە، سەباح دەستی بە پرسیارکردن کرد: ئەوە چیی بوو؟ بۆچی لێی دایت..؟ قسەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەوسا کەوتە پرسیارکردن لە لێکۆڵینەرەکانو پرسیارەکانیان. منیش وەکو خۆی بۆم دەگێڕایەوە، بەوەڵامەکانی خۆشمەوە..

ئەم دیاردەیەش بۆ من وەك هەواڵێکی خۆش بو، چونکە نەشانەکەی لێ سەندمو نە توندوتیژیشی بەکارهێنا، ئەمیان وا نەرمو نیان بوبێت، وا دەبێت گۆڕانێك بەرامبەرم کرابێت!

سەباح کەوتەوە پرسیارکردن! کورتو پوخت وتم: دەمێکە چەند پرسیارێکم لێدەکەن کە وەڵامەکانیان لای من نییە..

- ئێ باشە مامۆستا تۆ بۆچی وا لەخۆت دەکەیت، بۆ خۆت رزگار ناکەیت، هەموی بەدەست خۆتە..

> ئادەی بە قوربانە، دیارە تۆ شارەزای ئەو رێو شوێنانە هەیت، دەی چی بکەم باشە؟ خۆ تۆ خزمەکەت یارمەتیی داویتو زانیاریت لەو بارانەوە هەیە!

- گوتی: بڕوام وایە تۆ واز لەم جۆرە قسانە بهێنێیت باشەو بکەویتە سەربارێکیی تر، شتێکی نوێ. شتێکی وا کە دڵنییابن لەچونەدەرەوەتدا هەڵوێستی جارانت نابێت. وا بزانم هەر بەوە دەست لە ئەشکەنجە هەڵدەگرن.

سەباحو مامۆستاکەی هێندە گەمژەن وا دەزانن ئەو دڵنیاکردنە هێندە سادەو بێ مەترسییە کە ئاسان بەسەرمندا تێپەڕی بکەن، نازانن لەوە باش دەگەم کە ئەو قسە خراپە سەرەتایەکی ترسناکە.

- ئایا دەزانیت وازییان لە لێدانی هەمو رەفیقەکانت هێناوەو هەر تۆ ماویت! لام وایە ئەگەر فریای خۆت نەکەویت، لەدەستیان دەرناچیت.

> باشە تۆ چۆن دەزانیت وازیان لە لێدانی رەفیقەکانم هێناوە؟

هەرکە ئەوەم گوت، کەمێ شڵەژاو گوتی:

- وام گوێ لێبو.

> باشە کەی؟ لەکێ و لەکوێ؟

- دەی بێقەزابیت هێندە قوڵی مەکەرەوە! دەڵێیت لێکۆڵینەوەم لەگەڵ دەکەیت!

> خۆ ئەگەر ئەو قسەیەی تۆ راست بێت کەواز لە هەموویان هێنرابێت، وا دەبێت لەهەمو حاڵێکدا، ئەمڕۆو سبەینێ دەست لە منیش هەڵبگرن. خۆ لە راستیشدا من

پێم گوتون كه له حەفتاو پێنجەوه له سیاسەت دوركەوتومەتەوەو جارێكى تر توخنى ناكەومەوه..

تۆ دەزانیت من بڕوام بەو كەسانەش نییە كەوا گێڕ دەگۆڕنو ئەم سەنگەرو ئەو سەنگەری دژ بەیەك دەكەن.. خۆ هەقە ئەمان خۆیان بڕوا بەو كەسانە نەكەن، چۆن بە ئەقڵدا دەچێت یەكێك دوێنێ دژی حیزبی بەعس بوبێت و كورد- یش بێت ئەمڕۆ لە ترسانا گێڕبگۆڕێت و ببێت بە بەعسی! چۆن ئەو كەسە دەبێتە جێگەی بڕواو متمانە!؟ لام وایە ئەوانەی وا ئاسان ئەمبەرو ئەوبەر لەنێوان ئەو دوو سەنگەرەی كە هێڵێكی سوور لێكیان جیا دەكاتەوە، دەكەن هەر ئەو خەڵكە بێ كەڵكەن كە ڕەنگە بۆ بەعسیش ببنە بەڵا!

- نا نا مامۆستا وا نییە، ئەوان لەوە دەگەن، بەڵام خۆیان دەزانن چیدەكەن.. دەزانن چۆن ئەوەی مەبەستییان بێت رایدەكێشنە ناوەوەو دەبێتە جێگەی متمانەیان.. خۆ هەمو ئەوانەی دەچنە ناویانەوە لە عەرەبەكان دڵسۆزتر كاریان بۆ دەكەن.

نەمزانیی سەباح چۆن ئەم قسە ڕاستەی لەدەم دەرپەڕی. ڕەنگە بەوە نەزانیت كە ئەگەر ئاغاكەی لەو جۆرە قسانە ببیستێتەوە وا لێی ڕازیی نابێت.. بۆیە كەمو زۆر قسەم لەسەر نەكرد..

یاخوا بەخێربێن زیندانی ئازیز..

ڕۆژ ١١- جەنیوەرییە

چەند ڕۆژێك بو وازیان لێم هێنابو، بەڵام سەباح بەردەوام بو لە جێبەجێكردنی ئامۆژگارییەكانی لێكۆڵەران.. دە وەرە كورد بیتو لە ئۆپۆزسیۆنی دژ بە ڕژێمدا كارت كردبێت، و بەهەمان تاوان گیرابیت، لە زیندانێكی نهێنیو سەربازیی وادا، هی ئەم ڕژێمی بەعسەش، لەو شوێنە پڕ لە پیسیو بۆگەنیو میكرۆبە، بەو هەمو ئەشكەنجەو چەرمەسەرییەوە، لەم تەنها ژورانەی ئەم زیندانەدا، سەرباری ئەوانەش ئەم جۆرە بەڵایانەشت بخەنە تەك كە لە خەوتنیشدا چاودێریت بكەنو پرسیارت لێبكەن.. دەمەو عەسر بو كە لەپڕ دەرگا كرایەوە.. دوو كەسیان كردە ژورەوەو دەرگا داخرا..

سەلامیان كردو دانیشتن.. بەخێرهاتنمان كردن.. ماوەیەك بێ دەنگیی باڵی بەسەر هەموماندا كێشا..

من بۆخۆم كەوتمە ناو دەریای خەیاڵێكی قوڵو بیركردنەوە لە شێوەی پرسیارو وەڵامەكانی ئەم بەسزمانانە، لەبەردەم ئەم بەڵایەدا..

خۆمن ئەمانە ناناسمو نازانم چین، کەی هاتونو بۆچی کردیاننە لای ئێمە.. لەو بیرکردنەوانەدا بوم کە سەباح پرسیاری ناوەکانیانی کرد...

یەکەمیان: پیاوە پیرو تەواو ئیختییارو باریکەلەو درێژەکە، هاتە قسەو وتی:

من مام مەحمودم پێدەڵێن خەڵکی قەڵادزێم.. چوار مانگە لێرە لەسەر کوڕەکەم کە ئامر مەفرەزەی پێشمەرگەی یەکێتیە گیراوم.. چەکیشیان لەماڵەکەمدا گرتوە، بێئەوەی من ئاگاداربم.. ئیتر درام بەمەحکەمە. حاکمەکان گوتیان تۆش سزاکەت ئیعدامە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە زۆر پیریت عەفوت دەکەین.. من بۆخۆم نازانم تەمەنم چەندە.. بەڵام ئەوان کە لێیان پرسیم چەن رەمەزانت لەهاویندا گرتوە، گوتم سیانم بەڕونی لەبیرە.. بەوەدا مەزەنەی تەمەنییان کردم بە سەدو بیست ساڵ.. (دیارە هەر سیی‌و شەش ساڵ جارێك رەمەزان دەکەوێتە ناوەڕاستیی هاوینەوە، بەو حسابەی‌کە ساڵی کۆچیی دە رۆژی کەمترە لە ساڵی میلادیی) ئینجا درێژەی بەقسەکانی داو گوتی: کچێكو بوکەکەشم لەگەڵدایەو ئەوانیش ئیفراج کران، لە دواییشدا بیستمەوە ئەو عەسکەرە کوردەی چەکەکانی بردبووە ماڵی مام مەحمود ئیعتیرافی هەر لەسەر خۆی کردو مام مەحمودی رزگار کردو سەرەنجام پیاوانە لە سێدارە دراو ئەوانی تری سەرفراز کرد.

ئێستا بۆم دەردەکەوێت کە کاتێك لەژوری ژمارە هەشت بوم ئەو دوو کچەی بەلاواندنەوەکانیان زیاتر پەژارە دەبووم کچو بوکی مام مەحمودن.

دووەم: منیش ناوم ئەحمەدەو مقاویلمو خەڵکی سلێمانیم. پێشمەرگە بەزۆر پارەیان لێم سەند، کە حوکمەتیش پێیانزانی گرتمیانو سێ مانگێکە لێرەم، ئێستا مەحکەمە راستییەکەیان بۆ دەرکەوت. بۆیە منیش ئیفراج کرام..

ئینجا ئەحمەد روی کردە منو گوتی:

< مامۆستا من تۆ دەناسم، من خزمی حاجی قادری شەریکی باوکتم..

زۆرم پێخۆش بو کە ئەو قسەیەم بیست، چونکە یەکسەر ئەوەم لێکدایەوە کە ئیتر شایەتێکی تری چاوێنی دەچێتە ماڵەوەو شەرحی حاڵی منیان بۆ دەکات. دیارە دوای مەزەنەم بۆ بەربونی شێخ حەسەنو دلێری برای کە بێگومانەو دەبێت ئەو کارەیان کردبێت..

ئەوسا مام مەحمود هەڵیدایەو گوتی ئەی ئێوە: ناوتان چییەو خەڵکی کوێن بۆ گیراون...؟

لەو کاتەدا کە من دەستپێشخەریم کرد بە کورتەیەك خۆمم پێ ناساندن، زیاتر بیرم لەسەر سەباحو ئەم میوانە چڕبو، لەوە دەترسام کە دوای ئەوەی ئەویش پێناسەی خۆی، وەك دەیەوێت، دەکات، ئەمان بێ پەردە قسە بکەنو لێرەوە توشی

گێچەڵێکی تر بکرێن، بەتایبەتیی ئەحمەد ئەو ناسیاوییەی خۆی ئاشکرا کردو ئیتر هەر لەسەرەتای چاوپێکەوتنیشیانەوە، من جۆرێك لە متمانەو دڵنیایم لێیان لا خولقا، گومان نەدەهات بە مێشکمدا. زیاتر بیریشم لەوە دەکردەوە کە میوانەکان چۆن سەیری من دەکەن هەر بەو جۆرەش سەیری سەباحیش بکەنو بەئارەزوی خۆیان قسە بکەن..

ئیتر جۆری ئاماژەکردن بۆ ئاگاداربوون لە سەباح بوو بە سەنتەری بیرو خەیاڵم!

لە ترسی ئەوەش نەوەکا ئەم میوانە ئازیزانە لەپڕ بگوێزنەوە، کەوتمە هەوڵدان تا چەند قسەیەك بە ئەحمەد بڵێم و بیگەیەنێتە کەسو کار.

کە دەرفەتێکم بۆ رەخسا بەلایەکی چاوو چاو نوقاندن ئامارەی سەباح- م بۆ کرد.. نەمزانی سەباح لە کەمیندایەو ئاگای لەچاوداگرتنەکەم بوو. بە تورەبونەوە گوتی: مامۆستا من زۆر رێز لەتۆ دەگرمو خزمەتت دەکەم، بە شێلان، میز رشتن، ئەسپێ دۆزیین، کەچی لەبری ئەوە جەنابت من بە جاسوس دەزانیت وا چاو لە ئەحمەد دادەگریتو نایەڵیت قسە بکات..

منیش بەتورەییەکەوە گوتم:

> کورە بێ ئەقڵ بۆچی درۆ دەکەیت؟ چاوداگرتنی چییو جاسوسیی چیی! دیارە دەبێت تۆ لەخۆت بەگومان بیت بۆیە وا بیردەکەیتەوە! ئەحمەدیش هەڵی دایەو گوتی نا "سەباح" چاوداگرتنی چیی! جاچاو لەکێ دابگرێتو بۆچیی دایبگرێت!؟

پێدەچو سەباح قسەکانی وەرگرتبێتو دڵی هاتبێتەوە جێگەی خۆی.. بەڵام گرنگ ئەوە بو کە ئەوان شتێك لە مەبەستەکە حاڵی بون، باش بوو ئیتر ئەحمەد لە من زیاتر لێی دەسڵەمییەوە.. ئەی چۆن لەبەردەم ئەم درکی مەمو زینەدا نەسڵەمێتەوە کە لەم هەلەدا نایەڵێت دوو قسەش بەدڵی خۆمان بکەین. و رستەیەك بگەیەنمە دەرەوە..

روم کردە مام مەحمودو گوتم..

> بۆچی لاقت درێژ ناکەیتو ئیسراحەت بە خۆت بدەیت؟ ئینشاڵڵا سبەینێ دەگەنەوە ماڵی خۆتان. گوتی:

< قەیناکات لەگەڵ پاڵنەکەوتن راهاتوم، ئەوە چوار مانگی رەبەقە نازانم پاڵکەوتن چییە. ژورەکەمان ئەوەندە قەرەبارغ بو کەنیوە بەنیوەو بە چیچکانیشەوە دەخەوتین..

کەس لەبەشی خۆی رازی نییەو هەر یەکە جۆرێ لە شوێنەواری نامۆیی عەزابی گیانیو دەروونیی پێوەیە..

ئەم زیندانە بە بێ ئەشکەنجەو هەڕەشەی مردنو لێکۆڵینەوەو بێ هیچ ترسێکیش بێت، تەنانەت یەك زللەش لەکەس نەدەن، وا دیسان دەبێت جێگەی ئەوانە بێ کە بەسامناکترین کار تاوانبار دەکرێنو گەورەترین سزا دەدرێن! ژیانی ئەم هەیئەیە گەورەترین ئەشکەنجەیە بۆ مرۆڤ. بڕوام نییە لە هیچ زیندانێکی تری ئەم دنیایەدا وێنەی هەبێت، بۆیە هەر مرۆڤێك، کاری سیاسیی کردبێت یان نەیکردبێت، بێلایەن بێت یان بەلایەن، بەساغو سەلامەتیی لەم دۆزەخە دەربچێت، مانای وایە لە گەورەترین ئەزموونی ژیانی پڕ لە مەترسیو کەندو کۆسپدا سەرکەوتوو بووە..

وا دیارە ئەزموونەکانی هەیئە چەند بۆچوونێکی سەلمێنراو دەربارەی ئادەمیزاد جەخت لەسەر دەکەنو هەندێکی تر باشتر دەسەلمێنن. یەکێك لەوانە خسڵەتە گرنگەکانی خودی مرۆڤە کە لە گیانلەبەری تر جیایان دەکاتەوە، لەوانە: هێزی چارەنوسسازی ئیرادەی مرۆڤە..

هەر لەسەرەتادا مام مەحمود دوو پاکەت جگەرەی دەرهێنا، یەك جمهوریو یەك بەغداد.. سەیرم لێدەهات، جگەرەو زیندانییو ئەم هەیئەیە یەك بگرنەوە.. فەرموی لە ئێمە کرد، گوتم:

> مام مەحمود دەیەڵن جگەرە بکێشیت..؟

< گوتی بەڵێ، بۆیە ڕێگەیان پێداوم کە ئەم پاکەتانە بکڕمو لەگەڵ خۆم بیهێنمە ئێرە، ئەگینا چوار مانگە جگەرە بەر لێوم نەکەوتووە.. هەر ئەم شەویشم لێرە ماوەو خوا بکات سبەینێ دەڕۆمەوە بۆ شوێنی خۆم.. ئینجا جگەرەیەکی داگیرساند.. سەباح- یش بەدوایدا. مام مەحمود سەیرێکی منی کردو گوتی:

< ئەرێ تۆ جگەرە ناکێشیت؟

> نەخێر ناکێشم.

< هەر جگەرەکێش نەبویت؟

> بەڵێ جگەرەکێش بووم. بەڵام ئەوە نزیکەی سێ مانگە لەم زیندانەدامو جگەرەم نەبینیوە، چونکە بۆ خۆت دەزانیت قەدەغەیە. دەی وا ئەمشەویش چەند جگەرەیەکم کێشا ئەی دوای ئەوە چیبکەم.. نەوەڵلا مادامەکی ئەوەش هەر بۆ ئەمشەوە، وا هەر بیریشی لێ ناکەمەوە..

< دیارە دەبێت کەمت کێشابێتو زۆر هۆگری نەبوبیت.

> کەمی چیی زیاتر لە بیستساڵە، ڕۆژی یەك پاکەت یان کەمێ زیاترم جگەرەی ڕۆسمان یا دیمۆریەم دەکێشا. لای جگەرەکێش وازهێنان لێی بەکارێکی زۆر قورس دادەنرێت، بەڵام ئەگەر مرۆڤ ئیرادەی خۆی بخاتە کار وا ئەو زەحمەتییە لەئارادا نامێنێت...

ئەو شەوە بۆ من وەك نیمچە ئاهەنگێك وابو. دەتوانرا لەسەر زۆر لایەن قسەوباس بکرێتەوە. خۆ ئەگەر ئەم بەڵایە نەبوایە کراوەتر دەچوینە ناو باسی جۆراو جۆرەوە.. هەر لە دەرفەتێکیش دەگەڕام کە یەك دوو قسە تایبەتییەکە بە گوێی ئەحمەددا بچرپێنم.. بەڵام هیچ دەرفەتێك نەدەڕەخسا... ئەو ملۆزمە هەر چاوێکی لێکردبوین بە چوار.

لە مەشغوڵ بونی جگەرە وەرگرتن‌و پێکردنییەوە، چەند قسەیەکم بە پچرپچڕیی‌و بە پەلەپەل بە ئەحمەد گەیاند.. نەمدەتوانی ئەوەی دەمەوێت بە ڕوونی بیڵێم، چونکە نەمدەویست سەباح بوروژێتەوە. خۆ ئەم جارە هەر گومانێك بکات وا دەگاتەوە لێکۆڵەرەکان‌و ئەوسا خوا ئەیزانی بەچی بارێکی زۆر خراپتردا لێکیدەدەنەوە. لەوانەشە ئەم فەقیرەش گیرۆدە بکرێتەوە.. جا کێ دەڵێت ئەوەش ناگەیەنێت! بۆیە خۆم بۆ دەرفەتێکی لەبارتر ماتدا..

مەبەستەکەم لەو ڕاسپاردانەم ئەوە بو کە:

> یەکەم بۆ دڵنیایی ژن‌و منداڵ‌و کەس‌و کارو برادەرەکانم کە من لەژیاندام‌و لەهەموو ڕوویەکەوە سەلامەتم.

> دووەم: برادەرەکانم لە خۆیان‌و لەخۆشم دڵنیا دەکات..

> سێیەم: هیچ شایەت‌و بەڵگەیەکم لەسەر نییە.

> چوارەم: هیچیان لەسەرم بارنەکردوە‌و تا ئێستا لە ئەشکەنجە‌و لێکۆڵینەوە بە سەلامەتیی دەرچووم..

> پێنجەم: ئەوانەش بەدرۆخستنەوەی هەر قسەیەکە کە دزەیان پێ کردبێتە دەرەوە‌و ناوبرادەرانەوە، هەروەك سەرۆکی هەیئە هەڕەشەی پێدەکرد..

بۆیە لام گرنگ بو کە ئەو پەیامە بەم ناسیاوە ئەمینەدا بنێرم. ئەی ئەگەر ئەو هەلەم بۆ ڕێکنەکەوت! تۆ بڵێیت ئەم ناسیاوە بۆ خۆی هەواڵی بینینەکەی من‌و گوزەرانم نەگەیەنێتە کەس‌و کارم؟ خۆ لەوانەشە! ئەی خۆ ئەو بەدگومانی‌و بێ متمانەییەی کە هەرەسەکەی شۆڕشی ئەیلول خوڵقاندی دیاردەی ڕوخانی سایکۆلۆجیی نەگەیاندە ئەو ئاستەی کە خەڵك لە زۆر حاڵەتدا بڕوا بە براو کەس‌و کاری خۆشی نەکات! هەرچەندە شۆڕشە نوێیەکەی کوردستان تا ڕادەیەك ئەو تەمومژەی ڕەواندەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دیاردەیە هەر بەردەوامە‌و شوێنەوارەکەی لەنەوەکانی سەردەمەکە‌و دوایتریشدا هەر دەمێنێت! لەبەر ئەوە کێ دەڵێت لە ترسانا زاتی ئەوەی دەبێت کە ئەو سەردانە بکات‌و ئەم ڕاستییانەش بگەیەنێت!

بۆ سەر لەبەیانیی ڕۆژی ئایندە، لەگەڵ چونە دەرەوەی سەباح بۆ سەر ئاودەست، ڕاسپاردەکانی خۆمم بەڕونی بە ئەحمەد گوت‌و بەم جۆرەش کۆتاییم بە

قسەکانم هێنا: بە کاکە حەمەشم بڵێ: لەبەر ئەوەی من هیچم لەسەر نییەو هەر لەخۆڕایی گیراوم، دەتوانێ بە برادەرەکانم بگەیەنێت کە هەوڵی بەردان بدەن. ئیتر هەناسەیەکی پڕ بە سییەکانم هەڵکێشا. ئەویش بەڵێنی گەیاندنیداو گوتی بۆ خاتری خوا ئاگادار بە لەم بەڵایە. گوتم خەمت نەبێت، بەڵا لە ناو بەڵاکاندا حەشاردراون، لەوەش خراپترم توشکرابو.

زۆر بەسەر نانخواردنی بەیانیدا تێنەپەڕی کە مام مەحمودو ئەحمەدییان بانگکرد، خواحافیزیمان لێ کردن‌و ئیتر نەمبینینەوە.

رۆژێ دوای ئەوە، دوای هێنانەوەی سەباح لە دووەم جاری بانگکردنیدا، گوتی ماموستا رەنگە ئەمڕۆ بەریبم. گوتم خێری پێوەیەو زۆرم پێ خۆشەو نوخشەش لە ئێمە بێت. گوتی:

- ئەی هیچ داوایەك، راسپاردەیەکت نییە؟

< بۆ کێ؟ نەوەڵا راسپاردەی چیی!

- لەوانەیە خزمەکەم‌و رەئیسی هەیئە هەواڵی تۆم لێ بپرسن، چیی بڵێم؟

< کەیفی خۆتە!

- ئاخر چییان پێبڵێم؟ شەرتە چیم پێ بڵێیت هەر ئەوەیان پێ دەڵێم. گوتم:

< خۆت‌و ویژدانی خۆت چیی دەڵێیت ئارەزوی خۆتە، خۆمن ئاگادار نیم.

- باشە کەوابو پێیان دەڵێم پیاوێکی کوردپەروەرەو هەرگیز لە سیاسەت دورناکەوێتەوە.

< ئارەزوی خۆتە، چیی دەڵێیت بیڵێ‌و خوات لەگەڵ بێت..

- ئەی لەخراپە گوتنیشدا هەر ئارەزوی خۆمە..؟

ئەگەر پیاوێکی سەر راستیت وا چیت بینیوەو چیت بیستوە هەر ئەوە بڵێ نەزیادی پێوە بنێ‌و نەکەم.

- دەوەڵڵا قسەی باشت بۆ دەکەم.

< یەعنی دەڵێیت چیی؟ قسەی باشەکە چۆنەو چۆن دەیکەیت؟

- ئیتر خۆم دەزانم دەڵێم چیی. باشە ئەی بۆ کەس‌و کار هیچ شتێك، قسەیەك، راسپاردەیەکت نییە؟

< نا سوپاس هیچم نییە، تۆ خەڵکی خانەقین‌و من خەڵکی سلێمانیی.. زەحمەتە بۆ تۆ.

- نا نا زەحمەتیی چیی، نەوەڵڵا هیچ زەحمەت نییە.

< گوتم نابرا هیچم نییە، دەبێت من لەم زیندانەدا چ قسەیەکم بۆ کەس‌و کار هەبێت؟ نە کاکە نە، هیچ شتێکم نییەو خوات لەگەڵ.

- تۆ له شوێنێکدایت کەس پێی نازانێتو ئەم هەمو ماوەیەش تێپەڕ بووه کەچی دەڵێیت هیچ شتێکم نییە بۆ کەسو کار...

< دەباشە کاکە ئەگەر هەر حەز دەکەیت ئەم خزمەتەم بکەیت وا پێیان بڵێ مەحمودم بینیوە، سیحەتی باشە، هیچ ترستان نەبێت چونکه ئەو لەخۆڕایی گیراوە، مەترسن، خوا یاربێت هەر بەردەبێت.

- باشە بەسەرچاو دەیگەیەنم بەڵام مامۆستا تۆ ئەم هەمو بە ئومێدییە بێ سنورەت لە کوێوە هێناوە؟

< لە بێگوناهیمەوە، لەوەوە کە لە خۆڕایی گیراوم، ئەمانە تۆڵەی کۆنم لێدەکەنەوە، ئەو جۆرە تۆڵانەش، ئەم سزا قورسانە هەڵ ناگرن، ئەوەی بە منیان کردوە بە کەسی تریان نەکردووە. جا ئەو بە ئومێدییەم لەوانەوە هێناوە.

هەروەك کاتی دیدەنیی بۆ ئەو پرسیارو وەڵامانە دانرابێت، زۆر بەسەر ئەو مشتومڕەدا تێپەڕی نەکرد کە هاتن بە دوایداو پێیان گوت دەی جلەکانت هەڵبگرە،. ئیتر خواحافیزیی کردو جارێکی تر نەمبینییەوە.

هەناسەیەکی کەمێ حەسانەوەم هەڵکێشا، چونکە هەم هەواڵێکی ترم نارد بۆ رەئیسی هەیئە، و هەم ئەم بەڵایەشم لەکۆڵ بووەوە.

کە ڕەوتی بیرکردنەوەی ئاسایشی لێ تێکدابوم. جگە لەوە جێگەیەکی باشی بۆ بەجێهێشتوم کە ئیتر کەمێ بێ زەحمەتیتر دەخەوم، تەنها سودی ئەم نەگریسانە ئەوەیە لەپاش رۆیشتنیان جێگەی باشم بۆ بەجێ دەهێڵن.

من بۆ خۆشم دەمزانیی کە ئەو قسەی خۆی کردووەو لێبۆتەوە، ئەمەش دوا راپۆرتی دەبێت.. خۆ لە هەمو هەڵسو کەوتو وشەیەکدا ئەوەم لەبەرچاو بووە کە هەموو قسەکان وەك خۆیان بە رەئیسی هەیئە دەگەنەوە، بۆیە لەسەر ئەو نەخشەیەی بۆ خۆمم دانا لەگەڵ ئەمیشدا لەسەر ئەو نەخشەیە بەردەوام بوم. خۆ هەر کەسێکی تریش بێت وا هەر بەو جۆرەی لەگەڵ دەکەم.

لە تاووتوێی ئەو بیرانەدا لەخۆم دەپرسیی جا هی تر ماوە بیهێننو دەوری پێ ببینن!

دوای رۆیشتنی سەباح بەماوەیەك. دەنگێك بەرزبۆوە: قادر جەلال کە بە قادر کابان بەناوبانگە.. نە وەڵام و نە دەنگ-م گوێ لێ نەبوو، جارێکی تر ناوەکە گوترایەوە، نە دەنگ و نە رەنگ لە ئارادا نین بێ ئەوەی جارێکی تر گوێم لە هیچ بانگکردن و باس و خواسێکی ئەو هونەرمەندە دەنگ خۆشە نیشتمانپەروەرە ببێتەوە..

پەیکەی نەمریی بۆ پێشمەرگەی ونبوو!

ڕۆژێکی ساردو نائاسایی زستانی کەرکوك بوو. لە عەسرەکەیدا کوڕێکیان بەچاو بەستراویی هێنایە حەوشەکە، ڕوتوقوت کرابۆوە، لە پشتەوە کەلەپچە کرابو، دانیشێنرا پشتی لەژێر زەبری قامچیو سۆندەدا ڕیژیو خوێنی تێزابو. وام دەهاتە بەرچاو کە خوێن لە هەندێ شوێنی لەشی دیاربێت.

ڕۆژێ پێش ئەوە هەر لەم حەوشەیەدا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرد. چەند شایەتێکی بەسەرەوە بوو کە گوایا کۆبونەوەی بەو شایەتانە کردوە، پارەی لێوەرگرتون بۆ کۆمەڵەو لەکاری کوشتندا هاوبەشیی کردووە! دوای لێدانێکی ئاسایی بردیانەوە. وا ئەمڕۆ بەو جۆرە هێناویانەتەوەو بەو دەردەیان بردووە.

پرسیارەکان بە عەرەبیی بون بۆی دەکرا بە کوردیی. وا دەهاتە گوێم کە کوڕەکە ناوی (محەمەد)ەو خەڵکی شاری پێنجوێنە..

لاوێکی باریکەلەی پێست سپیی.. ئەشکەنجەیەکی زۆریان داوە نەچۆتە ژێر هیچ لەو تاوانانەی نرابونە پاڵی.

پێیان دەگوت تۆ چوار شایەتت بەسەرەوەیە کەچی ئێستاش ئیعتیراف ناکەیت.

ئەویش دەیگوت: ئەوانە هەمو درۆ دەکەن، دوژمنایەتییمان لە بەیندا هەیە، دەیانەوێت بەوە تۆڵەم لێبکەنەوە.

ئەو ڕۆژە کە بەو جۆرە لەو حەوشەیە دانرابو، چەند توانییان بەو وەزعەیەوە، هەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆریان لێکردو چەند خەریکبون بەڵام ئەو لەو قسانە زیاتری نەدەکردو دەیگوت:

> گوناهتان دەگات بە قسەی خەڵکێك دەکەن کە دوژمن بە منو دەیانەوێت تۆڵەم لێبکەنەوە.

کە لێیان دەپرسیی: باشە ئەگەر تۆ کۆمەڵە نەبویت، بۆچیی نەبویت بە بەعسیی؟

وەڵامەکەی: ئاخر من حەزم لە سیاسەت نییە، جگە لەوە، لەولا بیت ئەملا دەتکوژێت، لەملا بیت ئەولا دەتکوژێت! دەی سیاسەت ئەوەیەو من نامەوێت نە کەس بکوژمو نەکەس بمکوژێت..

ئەو لاوە پڕوکێنراوە، لەوەڵامەکانیدا دیاربو کە توانای قسەکردنیشی زۆر کەم مابو، بەڵام ئازایانە وەستاوەو وشەی لەدەم نایەتە دەرێ. لەسەیرکردنو گوێ گرتن لە وەڵامەکانی، دەمگوت دەك ڕەحمەت لە شیرت هەی پێشمەرگەی وناوو هەڵۆی کۆمەڵە، ئازایەتیو نیشتمانپەروەریی هەروا دەبێت! داخۆ چەندین ڕۆڵەی نەبەزی وەك ئەم محەممەدە بەو قارەمانێتییە بێ وێنەیە بە پێشمەرگەی وناو ماونەتەوە.. ئاخۆ دەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەینە مەڵبەندێکی ئارامی وا کەسەری ڕێزو پڕ لە

شانازیی بۆ پەیكەری ئاڵتونیی ئەم سەربەرزە فیداكارە هەمیشە زیندووانە دابنەوێنین؟

لەو ماوانەدا مشكەكان زوو زوو دەردەكەوتن.. هەركە برسییان دەبو لە پۆستاڵ دەهاتنە دەرەوە، ئەگەر بواری راكردنە دەرەوەیان نەبوایە وا هەڵوێستەیەكیان دەكردو دەگەڕانەوە. جاری واش هەبوو گوێیان نەدەدایەو تەكانیان بەرەو دەرەوە دەدا. فێربوبون شەو بەلولەی بەلوعەی ئاوەكەدا هەڵدەگەڕانو لە نانەكەی ئێمەش بەشی زیاتریان دەخواردو پاشماوە پیسەكەیان بەجێ دەهێشت، ناچار بوین كە دوای كڕانی نانەكە بەقێزو بێزەوە بیخۆین.. تا بارەكەمان دۆزییەوە. نەخشەكەی ئێمە: رێككەوتنێكی یەكلایەنەو عادیلانە بوو، بریتیی بوو لە دابەشكردنی سەمونەكە بەدوو بەشەوە، بەشەكەی ئەوانمان لە نزیك لایەكەیان دادەنا تا بەلای بەشەكەی ئێمەدا نەچن.. ئەوە باشترین ڕێكەوتن بو لەگەڵ مشكەكان، هەرچەندە گرفتەكە بنەبڕ چارە نەكرا، چونكە ئەوان ناو بەناو رێككەوتنەكەیان دەشكاند، سنوریان دەبەزاندو لەبەشەكەی ئێمەشیان دەخوارد..

ماوەیەك مشكەكان كەمتر دەردەكەوتن. دوای رۆیشتنی سەباح بە ماوەیەك.. سەرنجم دا مشكی بچوك بچوكیش سەر دەردەهێنن.

ئەوسا تێگەییشتم كە بێچویان بووە.. دەی وەرە بەشی ئەمانیش دابین بكە!

لەگەڵ زیاتر گەورە بونیاندا، ململانێ لە سەر نان توندتر دەبو. نەخێر لەشكری مشكیش چوە پاڵ لەشكری ئەسپێ، بەخۆم دەگوت: باشە وا رۆژانە راوی ئەسپێ دەكرێتو، بەو شانەیەش قڕ لە گەورەكان دەخەم، زۆریان لەبەردەستدانو زەفەریان پێدەبەم، باشە ئەی راوی ئەمانە چۆن دەكرێ. وەرە لەناو ئەم مەینەتیو پەتپەتێنانەدا، مشكیشت لێبكەن بە بەڵا.

بەڵی دەبێت لەگەڵ ئەم زۆرانبازییەشدا خۆم بگونجێنم. چونكە دەزانم كە بەشێكی گرنگە لە ئەشكەنجەی دەرونیی ئەم دەزگا تۆقێنەرانە.

رۆژێك لە دەرگاكەم داو بە (رەئیس عورەفا حەمەد)م گوت:

< مشك خواردومیو چارەێكم ناكەن..؟ هەروەك ئەوان ئاگاداریش نەبن!

- پێكەنیو گوتی رابوێرە لەگەڵیان..

< ئاخر خواردنەكەم بەش ناكات.

- گوتی جا خراپە؟ یەعنی دەتەوێت ئەو قوربەسەرانە لە خواردن مەحروم بكەیت.. ئا ئەوەیە بێ ویژدانیی توخمی گڵاوی ئێوەی كورد، لێرەش دەتانەوێت لەسەر خراپەكردن، تەنانەت بەرامبەر بەم گیانلەبەرە هەژارەش بەردەوام بن..

ئەو قسانەی حەمەد فڕێیان دامە ناو بیرکردنەوەیەکی ئازاراوی لە "کۆمەڵانی بەزەیی بەحەیوان" کە چۆن بێ ئاگان لەم ئەندامە دڵسۆزانەیان لەم قوژبنە لە بیرچووەی جیهانی مرۆڤایەتی، لەم زیندانەی هەیئەدا کە ئەم خەباتە سەختە بۆ بەردەوام بونیی ژیانی مشك دەکەن لەدژی دوژمنێکی گەورەو سەرسەختیان کە مرۆڤێکی کوردە.. سەیرە وا ئاسان جێگەگۆڕکێ لەنێوان بەنرخترین گیانلەبەری ئاقڵ لەگەڵ ئەم جۆرە زیندەوەرانەدا دەکرێت کە شێوەی ژیانی پڕ لە پیس‌و پۆخڵییان، کردونی بە جانەوەرێکی نائاسایی وا کە مرۆڤ بێزو رقییان لێیان ببێتەوەو ببنە یەکێك لە دوژمنە گەورەکانی مرۆڤی ئەو سەرزەمینانە، بەڕادەیەك کە وەیشومەیەکی وەك بەعس، لەبەر ئەوەی لە ئێمە زیاتر رکیان لەو جانەوەرانە دەبێتو تا ئەو ئاستەی کە بیانکەن بە ئامرازی ئەشکەنجەی دەرونیی مرۆڤ، ئەمانە هەمو ساتێك‌و هەمو دیاردەیەکی ئەم هەیئەیە بۆ ئەشکەنجە تەرخان دەکەن، بۆ بوارنەدان بە مرۆڤ کە لە خەویشدا ئارام نەبێت..

منێ کە قێزو بێزێکی بێ سنورم لە مشك دەهاتەوە، بەخۆم دەگوت ئەگەر "دەنگی (کەر) بە بێزراوترین دەنگ" دانراوە، وا دەبو مشکیش بە ناشیرینترین مەخلوق دابنرایە، بەڵام لێرەدا ناچارم کە خۆم رابهێنم. بەتایبەتی کە دەکەوتنە یاریی.. جیهانی مشك دیاردەیەکی تایبەتیی وای دەخستە پێش چاو کە ئەم جێگەیە ببێتە جۆرێك لەهەل‌و مەرجی رەخساو بۆ لێکۆڵینەوە لەم بەشە بێزراوەی ژیانی زیندەوەر..

بەڵام تا دەهات زۆر بونیان‌و شەڕی نان‌و ئیزعاجییەکەیان زیاتر دەبێ. چونکە ئەو گیانلەبەرانە شەو و رۆژ لە هاتوچۆیەکی بەردەوامدان. لە چونە دەرەوەو هاتنەوە ناکەون، بە تایبەتیی کاتێك دنیا مات‌و خامۆش دەبو کە لە دەنگی رۆیشتنی حەرەسەکان زیاتر هیچ دەنگ‌و سەنگێکی تر نەدەبیسترا، ئەو کاتانە بزێوتر دەبوون. جاری وا هەیە لە پڕ دێنە ژورەوەو دوان دوان دەپەڕینە ژێر بەتانییەکەوەو رادەپەڕم.. ناو بەناو هەمو لێوم دەبنە زیپکە.. یان جاری وا هەیە دەکەونە کڕانەوەی پەنجەی پێیەکانم ئیتر لە وردە گاز یا ختوکەی کڕانەوە رادەپەڕم..

بۆیە چەند جارێکی تر، دادو بێدادی خۆمم لەمشك دەردەبڕیی. هەرچەندە ئەوەشم لێکدەدایەوە کە چەند زیاتر تەنگم پێ هەڵبچنرێت، لەوە زیاتر ئەوان بەسەرەنجامی باشەی نەخشەکەیان دەگەن.

رۆژێك (حەمەد) تەڵەمشکێکی دایە دەستم‌و گوتی:

- ها دەی دەست بکە بە راوکردنییان. بەخۆشییەوە لەدەستم وەرگرت‌و بەخۆمم گوت: بەخوا شتێکی باشە، هیچ نەبێت لێیان کەم دەبێتەوە. کە باش سەیری تەڵەکەم کرد، بۆم دەرکەوت کە ئەوە نییە راوی پێ بکرێت، بەڵکو هەر ناوی تەڵەیە،

لەگەڵی خەریك بوم تا هێنامە سەر ئەو بارەی کە ئومێدی باشبونی لێ بکرێت. ئیتر کەوتمە راوکردن، یەکەم شەو دانەیەکی گرت، بۆ بەیانی لەگەڵ هاتنە دەرەوە بۆ ئاودەست ئاگاداری حەرەسەکەم کرد کە عەباسە رەش بو، گوتی جارێ وەختی ئەوە نییە، جارێکی تریش باسم کردەوە، جنێوێکی داو گوتی: بیخۆ! بۆ شەو دانەیەکی تر راوکرا. بەیانی عەباسە سور حەرەس بو، ئاگادارم کرد، گوتی جارێ لای خۆت هەڵیان بگرە.. دەی خوایە ئەوە خۆ وام لێدەکەن بە زیندووەکان شوکور بم. بۆ رۆژی سێیەم (جەعفەر) حەرەس بو، ئەمیش لە جەللادە دڵڕەقەکان بو. لە زوربەی ئەشکەنجەدانی مندا ئەم هاوبەش بو. بۆیە وام هەست دەکرد کە تاڕادەیەك لەوەگەیشتوە کە لەخۆڕاییی گیراوم‌و ئەشکەنجە دەدرێم. هەروەها (عەبدولئەئیممە)و (ئەمیر)یش. ئەوەشم بەوەدا مەزەنە دەکرد کە دوای ماوەیەك لە هاتنم بۆ ئەم شوێنە نوێیە، هەستم دەکرد لە هێنانەدەرەوەمدا بۆ ئاودەست وەك جاران ئەزیەتیان نەدەدام‌و کەمتریش جنێویان دەدا.

جاری واش هەبو دەرگاکەیان دەکردەوەو رەچەتەی دوکتوریان پێدەخوێندمەوە، داوایان دەکرد کە تێیان بگەیەنم چۆن دەرمانەکە بەکاردەهێنرێ. جارێکیان جەعفەر هات‌و دەرگاکەی کردەوەو رەچەتەیەکی دایە دەستم تا ناوەرۆکەکەی پێ بڵێم. دوای تەواوکردنی، بڕیارمدا داوا لەمیش بکەم بۆ فڕێدانی مشکەکان. ئەم رازیی بوو، گوتی:

- بەڵام جارێکی تر ئەو بەسزمانانە مەکوژە.

< مشکەکان بەسزمانن؟

- ئەی کێ!

< ئەی مرۆڤ؟

- بە چاو بزکردنەوەیەکەوە سیخورمەیەکی بێ ئازاری لێدام‌و گوتی مشك لە ئێوە باشترە!

دیارە لای ئەوان، بەسزمان کە قابیلی رێزگرتن بێت هەر مشك‌و مارو ئەو جۆرە گیانلەبەرانەیە، چونکە ناکەونە بەرەی ئۆپۆزسیۆن. کاری راستبێت، چونکە تێیگەیاندم کە راونەکردنەکە باشترە. ئیتر دەستبەرداری راوکردن بوم.

رۆژێکی تر بانگیان کردمە دەرەوە چاویان بەستم، بەڕێ‌و رۆیشتنەکەدا زانیم روەو شوێنی ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەیە. لە شوێنێکدا رایان وەستانم. دوای ماوەیەك، ئەشکەنجەو هاوار هاوار دەستیپێکرد. سەعاتێکی نەبرد کە بردمیان دوای دە پانزدە هەنگاوێك رایانگرتم..

یەکێك لێیپرسیم:

=لەگەڵ ڕەفیقە ژیانی مشکاندا لەچیدایت..؟

< چۆن بم.. زۆر خراپم!

دەمویست لە سنور بەدەر موبالەغە بەو جۆرە دیاردانەوە بکەم کە وەك ئەشکەنجە قورسەکان مەترسیی نەبون لەسەر ژیانم..

- ئەگەر قسە نەکەیت وا جرجو ماریشت بۆ دەکەینە ژورەوە..

گوتم من یەخسیری ئێوەم چی دەکەن هیچم دەسەلات نییەو کەیفی خۆتانە. پاش ماوەیەك بێدەنگیی، سۆندەیان دایە دەستمو ڕوەو شوێنەکەم بردیانمەوە. هەر لەبەر خۆشمەوە بەخۆمم دەگوت: باشە من لەم ململانێ نابەرابەرەدا لەگەڵ مشك ئاوا زەلالەتمە، ئینجا وەرە جرجو ماریشیان بێتە پاڵ. بەخوا ئیتر نە نانم بەش دەکاتو نەدەیەڵن بخەوم! لەخۆشمم دەپرسیی جا تۆ بڵێیت ئەگەر مار بهێنن کوشندە نەبێ یان هەروەك خۆی بێ دەرهێنانی ددانی بێت! خۆ ئەگەر وابێت ئیتر دەبێت بەردەوام حەرەس بم.

من بۆ خۆم لەوە گەیشتبووم کە ئەشکەنجەی ئەم ماوەیە لەو جۆرە بەرنامانەدا خۆی دەبینێتەوە. وام لێکدەدایەوە کە خەتە بەیانییەکەی ئەشکەنجەی گیانیی ڕو بەرەوخوارە، زیاتر لەگەڵ ئەشکەنجەی دەرونیی خەریك دەبن، گریمانی کوشتن کەم بۆتەوە، ئەگەر ڕوداوێکی تر بارەکە وەرنەچەرخێنێت.

لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا خەوو خۆراكو گوزەرانم بە بەراورد لەگەڵ تاریکستانی ئەو دیودا، کەمێ گۆڕانیان تێدایە، خواخوای ئەوەمە کە نەمبەنەوە ئەوێ.

### خەمی ناو خەمان

ڕۆژێك دوای نانخواردنی ئێوارە بە سەعاتە وەختێك دەرگاکەیان لێکردمەوەو گوتیان وەرە.. بێ چاوبەستن دوایان کەوتم.. بەرەو حەوشەی یەکەم ئینجا ڕووەو ژوری ژمارە هەشت، دەرگاکەیان کردەوە کردیانمە ژورەکەوە. ئای ئەوە خۆ خەڵکی زۆری لێیە! سەلامم کردو چومە سوچی سەرەوەی ژورەکەو دانیشتم، بەخێرهاتنیان کرد. کە ژمارەی دانیشتوانم کرد بە منەوە بون بە دە زیندانیی. کە سیانم لێ نەدەناسین.. لە پرسیارو وەڵامدا لە یەکێکییان گەییشتم کە ناوی (سوارە)یەو لەگەڵ (عەلیاغای مەنگوڕی)و جەماعەتەکەیدا گیرابو، وا بزانم برازای بو. دەیگوت هەموان ئیعتیرافیان کردوە "قادر" نەبێت، من زۆر لەگەڵ ئەو زانیاریانەو ئەم زیندانییانە خەریك نەبوم چونکە زۆر بەسەر دانیشتنەکەمدا تێپەڕ نەبوبو کە باسی قالەی حەمەی مەلا نادر هاتە پێشەوە، یەکێك گوتیی بەرەڵاکراو بۆ خۆی ڕزگاریی بو.

یەکێکی تریان گوتی ئەمڕۆ دوای نانی نیوەڕۆ ئازادکرا. هیچ تەعلیقێکم نەدا.. دوایی یەکێکی تریان هەڵی دایەو گوتی بەرەڵای چیی ئەو خۆی جاسوسی ئەمانە.

پەژارەیەکی زۆر دایگرتم.. یەکسەر بیرم لەوە کردەوە کە ئەم بەرەڵاکردنە بەشێك دەبێت لە لێکۆڵینەوەکەیان.. لەراستیدا هەر لەژوری ژمارە یەکەوە، یەکێك لەو خاڵانەی بیرم لێدەکردەوەو حسابم بۆ دەکرد ئەوە بو کە لە قسەکانمدا شتێك نەگوترێ کە ئەو لە ئاییندەدا، لەو کارەی ناوی بەرەڵاکردنی لێدەنرێت‌و بەشێکی گرنگی تر لە لێکۆڵینەوەکە ئەنجام دەدات، سودی لێوەربگرێت! زۆر لەوە دەترسام کە پەیوەندیی بە کەس‌و کارەوە بکات، ناوی نەوشیروان بەرێ‌و بێتە سەرەداوێك کە (گەلاوێژ) شتێ بدرکێنێت‌و ئەویشی پێوە راپێچی ئێرە بکەن‌و هەڕەشەو مەترسییەکە گەورەتر بێت، نەك هەر لەسەر خۆم بەڵکو لەسەر برادەرەکانیشم کە ناو بەناو دەهاتنە لام.

ئەو بیرە باڵی بەسەر مێشك‌و هەست‌و نەستمدا کێشا، بەتایبەتیی کە بیریشم دەکردەوە لەهۆی هێنانم بۆ ئەم ژورە. من وای بۆ دەچوم کە تەنها بۆ بیستنی ئەم هەواڵەیەو هیچی تر، زیاتر نائارام بوم. هەواڵێکی خەمناك‌و شڵەژێنەرو روخێنەرە. بۆیە کەوتمە ناو گۆمی پەژارەی بیرکردنەوە. بەتایبەتیی دوای چەند سەعاتێك لە بەناو- بەرەڵاکردنی قالە، یەکسەر منیان هێناوە بۆ ئەم ژورە، هی واشی تێدایە کە راستەوخۆو بێئەوەی من بناسێت، بڵێ قالە پیاوی خۆیانە. تۆ بڵێیت هەر بۆ زانینی ئەم هەواڵە من هێنرابمە ئەم ژورە؟ دەی با جارێ چاوەڕوان بم. بەڵام ئەوەی کە لای من رونە، تەواوبونی کاری قالەیە لە هەیئە. ئیتر دەبێت بەشی دووەم لە ئەرکی سیخورییەکەی لەدەرەوە بێت. بەتایبەتی لەچونەدەرەوەیدا. رەنگە زۆر کەس بەم دەورە نەزانن‌و ئاسان قسەی لابکەن.. نا نا بڕوا ناکەم، بەتایبەتیی ئەو زیندانییانەی ئازاد دەبن قسە هەر دەکەن، ئەی قابیلە شێخ حەسەن‌و دلێری برای ئەو باسەیان نەگەیاندبێت، هەر هیچ نەبێت بەماڵەوەیان نەگەیاندبێت! ئەی قابیلە چیرۆکی ئەکرەمی حەپسە بڵاونەبوبێتەوە. لەو ساتەدا دەیان پرسیاری لەو بابەتە لە مێشکمدا کەڵەکە دەبون بەبێ ئەوەی وەڵامی یەکێکیانم لابێت. جارجارەش بۆ دڵی خۆخۆشکردن دەمگوت جا قابیلە گەلاوێژ هێندە سادەبێت قسە بدرکێنێت.. لەناو ئەو ئازارانەدا نەمزانی چۆن رۆژم لێبووەوە.

لەو زستانەدا ئەم ژورە یەقی دابۆوە. دڵۆپەی دەکرد، هەڵمی ژورەکە لە سەقفە کۆنکرێتەکەی دەداو دەبوە تنۆکە ئاو و پێوەی دەمایەوە، تا پاش ماوەیەك لەبەر گەورەبون‌و قورسبونی دڵۆپەکان، تنۆك تنۆك دەکەوتنە خوارەوەو دانیشتوانی ژورەکەی زیاتر هەراسان دەکرد..

بۆ بەیانی راستەوخۆ دوای نانخواردن. بردیانمەوە جێگەکەی خۆم.

لەخۆم دەپرسیی: باشە بۆچی منیان بردو بۆچی هێنامیانەوە؟ ئەم گەڕانەوەیەم بۆ جێگە کۆنەکە، زیاتر ئەو بڕوایەمی بەهێز دەکرد کە لەو بۆچونەم زیاتر هیچ هۆیەکی تر بۆ ئەو شەو گوێزانەوەیە لەئارادا نەبێ. ئەو رۆژەش تەواو بە لێکدانەوەو بە بەرەڵاکردنی قالەوەخەریك بوم، تەواو ناڕەحەت بومو توشی جۆرێك لەوڕو گێژیی بووم. بیرم لەدیوی خراپی ئەنجامەکان دەکردەوە، چونەوەی قالە بۆ سلێمانیو قسەکردنو ئەنجامەکەی وەك روونیی ئاو لە ناو بیرەکانەوە دیارو لەبەرچاو بو.

ئەمڕۆ سییو یەکی جەنیوەرییە. دوو ساڵی رێك لەمەوبەر لەم رۆژەدا (ئارام) سکرتێری کۆمەڵەی مارکسیی لینینی کوردستان (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) لەناوچەی قەرەداغ کەوتە ناو داوی کۆمەڵێك جاشی بەعسییەوە کە تەحسین شاوەیسی پارتیی لێپرسراویان بوو. ئەم جۆرە جاش پێشمەرگایەتییەی پارتیی لەوکاتە ناسکانەدا کە کورد پێویستی بە یەك پێشمەرگەو بەیەك تفەنگیش هەبو، بۆ بیناکردنەوەی بڕواو متمانەی روخاویی ناو هەرەسی سەرکردایەتیی پارتیو شۆڕشی ئەیلولی. هەر بۆ ئەوە بو کە هەرەس بێ کۆتایی بێت.

دوای روداوەکەی برایم عەزو، هەر بەهەمان ئەو شێوەیە، رژێمی بەعس بە پارەو چەكو یارمەتیی عەسکەریی، هەمەجۆرە هەڵو مەرجێکی بۆ ئەو تاقمەی تەحسین شاوەیس سازان، بۆیە بە هەردوولا بەردەوام زیانی زۆری تریان لەتێکۆشەرانی ناو شۆڕشە نوێیەکەدا: حەمەی غەفورو تاقمێك پێشمەرگە لە شیرینی خەودا لە ناوچەی ئاغجەلەر لەلایەن هەمان گروپی جاش پێشمەرگەی پارتی تیرۆرکران.

دیسان لە ٣- ٩- ١٩٧٧دا مەفرەزەیەکی پێشمەرگە: شوان عەلی سەعید (شامیل) لێپرسراوی سیاسیی، مەلا ئەحمەد حەمە ئەمین گەرمیانی لێپرسراوی سەربازیی، سمکۆ، جوامێر، عەبدوڵڵا، حەمە غەریب، عەزیز، ئاشتیی، لەدێی قازانقایە لە قەرەداغ، کاتێ لەگەڵ جل شتن خەریك دەبن، هەمان گروپی جاش بەسەریاندا دەدەن، هەرچەندە تا دوا فیشەك شەڕ دەکەن بەڵام سەرەنجام هەموویان لەناو ئەو نەبەردییەدا دڵە گەورەکانیان بە دەسترێژ لە لێدان دەخرێنو عەزیز بەدیل دەگیرێو لە سێدارە دەدرێت، بەڵام بەکری شێخ نوریی (ئاشتی) بەردەستیان ناکەوێتو رزگاری دەبێت، هەرچەندە ئەو رزگاربونە کاتیی دەبێت. چونکە ماوەیەکی کورت دوای ئەو روداوە، ئەمیش بەرپەلی ئەو جاشانە دەکەوێتو دەگاتە کاروانی هاوڕێیانی.. گەلێك تاوانی تر بەدەستی رەشی تەحسین شاوەیسو جاشەکانی هاوڕێگای کران.. ئارام- یش دەبێتە قوربانیی دەستی ئەو جاشانە.

نەبونی نەخشەو بەرنامەو ئامانجی لێکۆڵراوە، لە هەرکارو جوڵانێکدا بە سەرەنجامی زیان بەخش کۆتایی دێت. روداوەکەی ئارام یەکێکە لەوانە.. لەنیوەی

دووەمی دێسەمبەری ١٩٧٧دا کاتێ بە مۆڵەت لە سلێمانی بوم بە جەمال تایەرم گوت:

قەرەداغ ناوچەیەکی ئاڵۆزو پڕ لە مەترسییو هەڕەشەیە، شوێنی پێشمەرگەی خاوەن ئەزمون و وریاو شارەزاو جەربەزەیە، من سەیرم لێ دێت کە یەکێکی وەك ئارام، بێ لە لێپرسراوەتییەکەی، وەك سکرتێری کۆمەڵە لەناوچەیەکی دابڕاوی وادا بێت، کە بەوە هەم لە ناو هەڕەشەدا دەژییو هەم خۆشی گۆشەگیر دەکات! جگە لەوە ئەو تەنانەت بەبێ عەینەك ناتوانێت هاتو چۆش بکات، بەو وەزعەشییەوە کە هەمومان دەزانین، چۆن دەبێت هەر لەبەر هەندێك ناکۆکیو ململانێی ناوخۆ، خۆی هەرۆڵی ئەو ناوچەیە بکاتو ئاوا بەو جۆرەش بێ دەنگ بن لێی.. بۆیە باش وایە بەزووترین کات ئەو ناوچەیە بەجێبهێڵێتو بپەڕێتەوە بەری شارباژێڕ.

جەمال یش گوتیی: زۆر راستەو برادەران بڕیاریان داوە، بۆیە هەر لەم ماوەیەدا دەپەڕێتەوەو قەرەداغ بەجێ دەهێڵێت..

### پەیامی ناو خەیاڵو خەو:

لەناو ئەو بیرە تاساوە زیاتر هیلاککەرانەوە رۆژم بەرەو شەو بردو درەنگانێکی ئەو شەوەش خەوم لێ کەوت. بەرەبەیان لەهاواری حەرەسەکە خەبەرم بووەوە: ئاوەکە بکەرەوە.

بەشڵەژاویەوە راپەڕیمو خۆم لە زیندانەکەدا بینییەوە، هەستم بەجۆرێك لە ئارامیی دەکرد. لەبیر چڕکردنە سەر هۆیەکەی، خەوی ناو ئەو شەوگارەم بەبیرهاتەوە:

لەگەڵ (گەلاوێژ)ی هاوسەرم پیاسەم دەکرد، بە تێکەڵ لەگەڵ هەمان ترسو لەرزی ناو بیرەکانم، باسی چیرۆکی قالەی سیخوڕو بەربونەکەی لێکدانەوەکانی خۆمو ترسو لەرزو خەمە گەورەکەم بۆ دەکرد.

ئەویش لە قسەکانیدا زۆر لەسەرخۆو بەبڕوا بەخۆوە گوتی:

ئینجا چۆن من هەڵەی وا دەکەم. ئەرێ وەڵڵا، لەگەڵ بەربونیدا خۆی خەبەری نارد کە لە هەیئە بوەو دەنگو باسی تۆی پێیە. بەهۆی خزمێکمانەوە پەیوەندیی کرد. هەر لەگەڵ ئەودا چومو قادرم بینی. ئەو دۆستانە باسەکانی تۆی دەگێڕایەوە، قسەی زۆری کرد کە ددانت بەبونی پەیوەندییت لەگەڵ نەوشیرواندا ناوە. منیش پێم گوت کە ئەوانەیان بۆ هەڵبەستووە، مەحمود بێ خەتا گیراوە، هیچی نەکردوە، بۆیە خەفەتی بۆ دەخۆم، بمزانیایە کە شتێکی کردوە، وا هیچ خەفەتم بۆ نەدەخوارد، هەرچەندە ئەو ئەمسەرو ئەو سەرێکی زۆری بە دەنگوباسەکانی زیندانەکە دەکردو دەیویست شتێك بدرێت بەدەستەوە، بەڵام من لەوانە زیاتر بەلای هیچ قسەیەکی تردا

نەدەچوم. ئەو خۆی سەقەتو ئیفلیج کردبو، دەیگوت لەژێر ئەشکەنجەی هەیئەدا وای لێهاتووە. کاری شێخ حەسەن راست بێت، هەرکە ئازاد کراو هاتەوە سلێمانیی، هاتو دەنگو باسەکەی ئەوی بۆ باسکردین، ئەگینا کەس بڕوای نەدەکرد کە ئەو پیاوی رژێم بێت. چونکە تەواو خۆی شەلو گێڕ کردبو، مرۆڤ گریانی بۆی دەهات.

دەڵێن لە خنکاننا پیاو هانا بۆ پوشیش دەبات

ئەو خەوە تا رادەیەك تەسکینیی پێدابوم.. بەڵام ئەو ئارامییەم زۆری نەخایاند کە پێچەوانە بووەوە.

من کردبووم بە پیشە بۆ زانینی ژمارەی بەندەکان لەهەر ژورێکدا، لەکاتی دابەشکردنی سەموندا، بە وردیی گوێم دەگرت، بەپێی ژمارەی زیندانییەکانی هەر ژورە سەمونیان دابەشدەکرد. ئەو رۆژە باشتر گوێم بۆ ژمارەی ژوری حەوت هەڵخست کە ژوری ژنان بو، گوێم گرتو زانیم کە دانەیەك زیادی کردوە.. ئەوە پەژارەکەمی خەست کرد، بەهەمو بۆچونو هەڵسەنگاندنێکم وام لێکدەدایەوە ئەوە گەلاوێژی هاوسەرم بێت.

لەماوەی چەند رۆژێکدا تا لەناو ئەو بیرە ترسناکەدا راهاتم، تەواو نائارام بوبوم هەرچی هۆش و گۆش هەیە بۆ ئەو لایەنە راکێشرابو، گرتنو چارەنوسیی خۆمم دەهاتە پێش چاوو هەمو بیرەکان ئاراستەی ئەو لایەنە دەبوو. کە هیچ شتێکی نوێ روی نەدا، زانیم کە ئەو نییەو داخۆ چی هەش بەسەرێکی ترە.. تا نزیکەی دو حەفتەش بەسەر ئەو بەربونەی قالەدا تێپەڕ نەبو، ئەو خەموپەژارەیەم لەکۆڵ نەبوەوە..

مردنی بێناز.. پێشمەرگەی ونبو.. شەهیدی ونناو

دوای نانخواردن تابوتێکیان لە تەنیشت دیواری حەمامەکەوە دانا. تابوتەکە لەجۆری سەفەرییەکان بو. عەسکەرەکان لە قسەکردنو چاوەڕوانیدا بون کە فرمانیان بۆ بێت.

یەکێك هاتو بەمجۆرە کۆتایی بەو دیمەنە خەمناکە هێنا: بیبەنو بیخەنە چاڵەوە...

گوێ قولاغ بومو تاتوانیم هەستو هۆشم لەسەر دەنگو سەنگی دەرەوە چڕکرد.

پاشان تێیگەیشتم ئەوە (مام رۆستەم)ە، هەڕەشەو ئەشکەنجە لەباوەڕی ئەو پیرە مێردە هەولێرییەی نەگۆڕی، دیاربو قسەکانیش بەشێك بوون لە تەکتیکێکی ژیرانەی خۆی بۆ خۆقوتارکردن لە ئەشکەنجەی قورسو زیاتر، بەڵام سەرەنجام لەژێر ئەشکەنجەدا دوا هەناسە دەداتو هەمو نهێنییەکانیش لەناو شورەی کەللە سەریدا مانەوە، سەربەرزییو ئاسودەیی بۆ خۆیو هاوڕێو کەسو کارەکانی و بۆ هەولێری قەڵای دێرینی کورد بەجێ هێشت.

نامۆیە رۆڵەیەکی وا، پێشمەرگەیەکی ونبوی نزیك بە حەفتا ساڵ، بەو جۆرە بێ رازو نیاز لەژێر قامچییدا سەر بنێتەوەو بەو بێنازییەش لە چاڵی بنێن‌و ببێتە شەهیدی ونناو.. داخۆ چەندین رۆڵەی تری وەك مام رۆستەم لەژێر زەبری لێداندا بەو جۆرە شەهید کرابن‌و بەو بێ نازییە لەچاڵ نرابن..؟ وا ئاسانیش، دور لە دایك‌و باوك‌و ژن‌و منداڵ‌و کەس‌و کار، بێ رێ‌و رەسمی تەرم ناشتن، بەدزییەوە بینێنە چاڵەوەو شوێنەواری ونبکەن.. پەیکەری نەمریی‌و نازناوی قارەمان هەر لایەق بەم ونناوە نەمرانەن..

ئەو هەل‌و مەرجی ژیانە هەر تەنها بێ تاقەت‌و نائومێدو نائارامیان نەکردوم، بەڵکو توانای بەربەرەکانیی نەخۆشیشیان کەم کردۆتەوە. جگە لەوە هەر رۆژەو کێشەیەك زیاد دەکات. دوای نیوەڕۆیەك، دەنگە دەنگێك لە حەوشەکە هاتە گوێم، کە لەسوچێکی پەنجەرەکەوە سەرنجمدا، ئایی ئەوە چیی دەبینم!

کورێك لەنێوان چەند حەرەسێکدا، بەرەو ژوری ژمارە دوو دەبرا. کە سەرنج دەدەم بڕوام بەخۆم نەدەکرد کە چاوم باش دەبینێت! رەنگە چاوم رێشکەو پێشکە بکات! قابیلە چاوم وای لێهاتبێت هەڵەی گەورەی وای بەسەردا تێپەڕبێت؟ ئەوە کێیە؟ ئەوە خۆ ئەوە! ئەوە خۆ خەسرەو خاڵە. ئای ئەم بۆچی گیراوە؟ دەبێت شتێك رویدابێت! دەبێت یەکێك گیرابێت‌و ئیعتیرافی کردبێت، یان نامە گیرابێت، خۆ ناکرێت ئەو بەتەنهاو بەشوبهە گیرابێت. ئەی دەبێت چۆن‌و کەی‌و لە کوێ و بۆچیی گیرابێت..؟ ئەوانە کۆمەڵێ پرسیاری بێوەرام بون. مەترسیی ئەوەم دەکەوتە پێش چاو کە ئەو خەتەی کۆمەڵە کە زۆر نەبو سەرپەرشتیم دەکرد، دوای ئەوەی نەوشیروان لەنامەیەکیدا نوسیبوی: ئیتر کاتی ئەوە هاتوە بجوڵێیت وسەرپەرشتیی ئەو خەتەی رێکخستنی کۆمەڵە بکەیت.. هەرچەندە لەوەوبەر بەکردار هەروا بو. چونکە هەر پێش ئەوە لەگەڵ د. خەسرەو و عومەر فەتاح ئەو کارانەم دەکرد، هەر لەسەرەتاشەوە لەگەڵ حەمەچاوشین کە لێپرسراوی رێکخستنەکانی ناوەوە بو چی پێویست بوایە دەمکرد  لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە بڕیارم دابو لەسنوری ئەو جۆرە کارانە زیاتر خۆم نەخەمە ناوداوی لێپرسراوێتیی. پێش‌و دوای ئەویش لەگەڵ جەمال تایەریش بەهەمان شێوە دیسان لەگەڵ شازاد سائیب کە لە هەموو سەردەمەکاندا یاقوتی خەباتی بێ هاشەو هوشە بوو... هەرچەندە ئەو حسابەشم کردبو کە کارێکی وا لەبارودۆخێکی وا نەهێنیشدا ئەو لێپرسراوەتییە نییە، کە بڕیاری نەکردنیم لەسەردا بو. جگە لەوەی کە جۆرێ ئاسودەیی بە ویژدانیش دەدا.

خەسرەو خاڵ ئەڵقەی پەیوەندی راستەوخۆبو بۆ خواروتر، بۆیە گومانم لە گەلێك شت دەکرد، بێ ئەوەی گرتنەکەییم لەسەر روداوێك بۆ ساغ ببێتەوە. ئەی دەبێت

کێی تر گیرابێت؟ ئەم چۆن تێوە گلێنرابێت؟ زۆری تر لەو پرسیارانە تەواو بێ ئارامیان دەکردم. لەبەرامبەر ئەوانەشدا دەمگوت: تازە ئەوەی روی دابێت بووەو لێبۆتەوە، نابێت زیاد لە پێویست لێکدانەوەکان ئاڵۆز بکرێن. دەی چیی دەبێت باببێت، مردن یەك مردنەو بۆ یەك جارە، کەی هات بابێتو بەخێربێت، خۆ تازە هێندە قاڵی ئەشکەنجە بوم کەوا دیارە لێکۆڵەرەکانیش بەوەیان زانیبێت بۆیە وا چرپیان خستۆتە سەر ئەشکەنجەی دەرونیی.. ناشبێت پیاو رێگە بدات ئەو باسانە لە مێشکیدا دوبارە یان چەندبارە ببنەوەو رۆژانە مردن لەبەر لوتیدا بێت. خۆ ئەگەر ئەو رێکخستنەش کەوتبێتە بەرشاڵاوی دەزگا جاسوسییەکان، وا چار ناچارەو بەو خەمو پەژارەیەی من هیچ لە بارودۆخو گرتنەکە ناگۆرێت. دەبێت خۆشم بۆ رووبەڕووبونێکی تری ئاڵۆزتر ئامادە بکەم. جارجارێك دڵی خۆشم بەوە خۆش دەکرد کە دەمگوت: بەڵام کێ دەڵێت ئەو ئەشکەنجەی وا قورس دەدرێت؟ باشە کێ دەڵێت ئیعتیراف دەکات؟ یان کێ دەڵێت ئەوە خەسرەو خاڵە؟ خۆ من هەر لە پشتەوە بینیومە، تەنها بە سەرو قژو پشتو ملو باڵادا دەڵێم ئەو بوو. کێ دەڵێت یەکێکی تر نییە، دەی باوردتر چاوەدێریی بکەمو سەرنج بدەمە قاپیی ژوری دوو. بەتایبەتیی کاتی هاتنە دەرەوە بۆ سەرئاو. بۆیە کەوتمە چاوە ڕوانییو سەیرکردن.

ئەم جۆرە چاوەڕوانیانە نارەحەتن، خۆ کات هەر ناڕوات، دەڵێی رۆژ لە جێگەی خۆی وەستاوە! ئیتر وەختم لەبەر نەدەڕۆیشت، ئەم جۆرە خەمانەش لە قوڵ بیرلێکردنەوەدا گەورەو گەورەتر دەبن، بۆیە کە لە خۆمم دەپرسیی تۆ بڵێی هەر ئەم بێت، بەوە شوکور دەبوم لەبەر خاتری سەلامەتیی ئەوانیترو کەمتر بونەوەی مەترسیی ئیعتیراف زۆر بون، ئەگەر ئەوە روی دابێت، هەر ئەم بێتو بەس.. کاتی هاتنە دەرەوە هات، وردو ورد سەیری دەرگاکەم دەکرد، یەکە یەکە سەرنج لە زیندانییەکان دەدەم، هەر چاوێکم کردبوو بەچوار، تا هەمان بەندم هاتە بەرچاو. لەگەڵ بینینیدا ئاهێکم بە بەرداهاتەوە، ئەوە خۆ شوکور ئەو نییە.. ئیتر هەناسەیەکی حەساوەم هەڵکێشاو دانیشتمو پاڵم لێدایەوەو گوتم خوا ڕەحمی کرد هەم ئەوان سەلامەتنو هەم هەڕەشەی خەمێکی نوێم لەکۆڵبووەوە. بە تایبەتیی هەندێ جاریش حسابی ئەوەشم دەکرد کە ئەمیش لەسەر گومانلێکردنو لەسەر ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵو بەردەوامەی نێوانمان گیرابێت، خۆ ئێمەش سڵەمینەوەمان لەبیر چوبووەوە.

زۆر بەسەر ئەو روداوو پەژارەیەمدا تێپەڕ نەبو کە هەستم کرد لەشم ناسازە، رەنگە ئەو مەشغوڵبونە لەگەڵ دوکتۆر خەسرەو ئەو ناساغییەی لە بیر بردبمەوەو وا ئێستا بەم جۆرە هەستی پێدەکەم.. لە سوکەتایەکەوە بەرەو زیادبون دەچێت،

بەدواشیدا لەرز بەسەریەشەو ئازاری قورگەوە دەستیانپێکرد. خێرایی دەرکەوتنی ئەو نیشانانە بۆیان سەلماندم کە بزانم ئەو پەتا سەختو عاسییە دەبێت هەر ئینفلەوەنزە بێت؟ دەی لەناو ئەو هەمو دەردەسەری‌و ناڕەحەتییانەدا توشی ئەم پەتایەش ببم. دور نییە بۆ ئێرە ببێتە پەتایەکی کوشندە، چونکە من خۆم کە ئەم پەتایە دەگرم وا بە قورسی‌و گران دەیگرم کە دوو هەفتەیەك پەرێشانم دەکاتو دوای ئەوەش ماوەیەکیی دورو درێژ شوێنەواری هەر دەمێنێ‌و ئازارم دەدات.. نەخێر پیرە پەتا بەخێرایی لێم پیس دەکات تا لە ئەرزەکەدا ییخی دام. هەرچەند هاوارم لە حەرەسەکان دەکرد کە زۆر نەخۆشم، کەڵکی نەبو. نەمزانی ئەو شەوەم چۆن لێ رۆی. رۆژی ئایندە، پەتاکە سەختتر بو، وام لێهات کە دوو شەو و دوو رۆژ نەتوانم هیچ بخۆم، دیارە سەردانی تەوالێتیشم پێنەدەکرا. وردە هاوارو ناڵەو ئای ئایی نیمچە بێهۆشییم گوێی لێ نەدەگیرا، بگرە جاری واش هەبو کە ئەگەر حەرەسێك گوێی لێ ببوایە، بەجنێوو هەڕەشە وەڵام دەدرایەوە، دوای ئەو ماوەیە، بێئەوەی چاوەڕوان بم هەستم بە تەندروستی دەکرد. گەرمایی لەشم ئاساییە، مۆتەکەی پەتا قورسەکە بەسەرمەوە سوك بووە، سەیرم لێ دەهات چۆن ئەو پەتا سەختە، لەم شوێنەشدا، دوای دو رۆژ وا ئاسان، بێ دوکتۆرو بێ دەرمان‌و بێ پشوی ئاسایی لە کۆڵم بۆتەوە! بەڵام هێندە بێحەواسم توانای هەستانم نەماوە. کە هەڵدەستمە سەرپێ دەکەومەوە بە ئەرزا. دەزانم زەختی خوێنم زۆر هاتۆتە خوارەوە. من بۆ خۆم کەمێك زەختی خوارەوەم هەیە. کە ئەم جۆرە پەتایانەش دەگرم زۆرتر دێتە خوارەوە. دەستم کردەوە بەداواکردنی خەستەخانە. کە لەوە بێئومێدبوم، هەوڵم دا نەختێ خوێنم بدەنێ. چونکە لەبێ خەستەخانەییدا، دەرمانێکی باشە بۆ کەمێ بەرزکردنەوەی زەختەکە. وا بیرم دەکردەوە کە ئاسانیش دەستم دەکەوێت. لە رۆژی سێیەمی نەخۆشییەکەمدا دەرگاکەم لێکرایەوە بۆچونە ئاودەست، بە رەئیس عورەفا حەمەدم گوت:

> ئەگەر نامنێرن بۆ خەستەخانە وا نەختێك خوێنم بدەنێ.. زەردەخەنەیەك گرتی‌و گوتی:

- بۆ چیتە؟

> بۆ نەخۆشییەکەمە.

- باشە سەبر بگرە بۆت دەهێنم. من وامدەزانی سەبر بگرە کە واتە کەمێکی تر. بۆیە کەمێ دڵم خۆشبوو. چونکە ئەم لێپرسراوی لایەنی ئازوقەو سەرپەرشتیی حەرەسەکان‌و ئەو جۆرە شتانەی زیندانەکەیە. ئەم هاوبەشیی راستەوخۆی ئەشکەنجەی نەدەکرد. بۆیە لە چاو ناشیرینی‌و جرج روخساریەکەیدا، وەك جەللادەکان رەزای نەفرەت لێکراو نەبو، یان وا دەهاتە بەرچاوی من. بۆیە متمانەم

بە قسەکەی کرد. ئەو ڕۆژە نەبو، بۆ سبەینێ داواکەم دوبارە کردەوە، دیسان گوتی باشە سەبر بگرە. خولاسە دوای چەند جارێ گوتی: من مۆڵەتم وەرگرتووە. بابگەڕێمەوە خوێکەت دەدەمێ.. پەلە مەکە دو هەفتەی تر دێمەوە. ئەویش بەشی خۆی بەو قسانە ڕایبووارد.

ناوبەناویش بەخۆمم دەگوت: جا خۆ لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە دیاردانەی زەخت زۆر جار درێژخایەنە، وا ئەو کاتەش هەر سودێکی دەبێت، خۆ تا ئەو کاتەش بەهۆی خوێی ناونانونیسکێنەو چێشتەوە لەش کەمە ئاهێکیشی پێدا دێتەوە.

کە لە مۆڵەتەکەی گەڕایەوە بەگوێ لێبونی دەنگەکەی دڵم کرایەوەو لە نزیکترین هەلدا داواکەم لێ کردەوە. گوتی باشە ڕۆیشت کە هاتەوە. هەر بەقەدەر سەرە کەوچکێکی چای خستبووە سەر پارچەیەك کاغەزو گوتی ها بگرە ئاگاداری بەو بە خەساری نەدەیت. لە دڵی خۆما گوتم هەریەکەیان بە جۆرێك ئاڵچاغەو جۆرێك لە ئامرازە بۆ ئەشکەنجە. ئەی بۆ وا نەبێت! ئەی هەمویان پەروەردەکراوی ئەم قوتابخانە بەرزەی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیی عیراق نین..

لێکۆڵەران لەو ڕۆژگارانەدا زیاتر درێژەیان دەدا بە ئەشکەنجەی دەرونییو هەرەشە وەك میتودی سەرەکیی، شان بەشانی هێشتنەوە لە تاکزیندانییەکەدا، کە نامۆو ناخۆشو سەختترین شێوەی ئەشکەنجەی دەرونیی زیندانییە لە گەڵیشیدا دانانی ئەم سیخوڕە هەمە ڕەنگانە بارو گوزەرانەکەم ئاڵۆزتر دەکەن. زۆر جاریش ڕاگرتنم لەناو ئەشکەنجە دراوەکاندا بە سیخورمەو چەپۆكو لەقەو بۆکسو جنێوە بێلەزەتەکانیانەوە ماوەکانیان پێدەبردمە سەر لەگەڵ ئەوانەشدا، جگە لەو زیندانە تاککەسییە وەحشتناکە، شێوەکانی زیندانییەکەم کە لەنێوان تەنها دو چارەنوسدا حسابم بۆ کردبو کە سێهەمییان لای من لە ئارادا نەبو، لەوە گەییشتبومو دەمزانیی چۆن لەبەریا خۆم بگرم، تا ڕادەیەکیش وای بۆ دەچووم کە لە ژمارەی خەتی بەیانیدا زەحمەتیی ئەشکەنجەی گیانیی بەرەو کەمبونەوەو هاتنە خوارەوە دەچێت، ئەم بیرەش ئەو تیشکە سەوزەی پیشان دەدام کە کوشتن لەژێر ئەشکەنجەدا دور کەوتۆتەوە. ڕەنگە هیوای لێکۆڵەران لەوەدا خۆی بنوێنێت کە لەگەڵ ئەم میتودو هەلو مەرجانەدا کە لەم تاکزیندانییەدا بەسەر مندا سەپاندوییانە ورەم بڕوخێو بە مەبەستی خۆیان بگەن. یان سیخوڕەکانیان شتێکیان دەست بکەوێو بیکەن بە بەڵگە. بۆیە لەم ماوانەدا پشوییەکم پێدا هاتەوە.

لەپەنجەرە بچوکەکەوە کەوتمە سەرنجدانو سەیرکردنی ئاسمان. هەندێ شەو مانگ لە ئاسمانا خۆی نیشان دەداو تیشکە زێڕینەکەی لە پەنجەرە بچوکەکەوە دەناردە ژورەوە. لەناو شیعرەکەی (بێکەس)ەوە (ئەی مانگ منو تۆ هەردوك هاو دەردین هەردوك گرفتار یەك ئاه سەردین) دەکەوتمە گلەیی لە بەختی خۆمو لەو

ژیانە پڕ لە زەحمەتییەی لەژێر سایەو سێبەری ئەم رژێمە داگیرکەرەی کوردستاندا بردومەتە سەر.. مانگ بەبێ ویستو ئیرادەی خۆی لە ئاسمان راگیراوەو دور لە ئارەزوی خۆی تەوقی دوو جۆر جوڵەی ئەزەلییە. هێزی موگناتیزی زەوی هەروەك کۆتو زنجیرە بۆی.. کە ئەوانەم لەگەڵ زۆرداریی مرۆڤدا بەراورد دەکرد جیاوازییەکان بەدووراییی نێوانی هەردوك لامان دەهاتە بەرچاو. جگە لەوە، ئەو لەو یەخسیرییە هەمیشەییەدا تیشکە زێڕینە قەرزکراوەکەی، دەکەوێتە خزمەت دانیشتوانی ئەم ئەستێرەیەو روناکی دەکاتەوە، ژیانی گیانلەبەرێکی وەك منی پێ گەشو پڕ ماناتر دەکات. بەو جۆرەش کەمە خۆشییەك بۆ دڵی ئەم زیندانییە دەهێنێتو دەبێتە تروسکاییەکی هیواو دزە بۆ ناو مێشك دەکات. ئەوە بۆ یەکەم جار بو کە لەناو پەژارەیی ئەو هەیئەیەدا بۆ ماوەیەك بکەومە ناو خەیاڵو بیرێکی رۆمانسیانەی وا کە کەمێك، هۆشم لەم دنیایە بەرێتە دەرەوە بۆ ناو ئەم جۆرە دیاردانە. ئەوانە لەو ساتانەدا بو کە مانگی نوێ هەمو شەو زیادی دەکردو دەگەشایەوە، تا لە ناوەڕاستی مانگدا لە ساتەکانی بەرەو خەوتندا دەبووە میوان..

لەو ماوانەدا ئیتر حسابی رۆژمێرم لێ تێکچوبو. روداوەکان هێندە زۆرو چڕ بوبون کە نەیاندەهێشت لەوە زیاتر بیر لەسەر هی زیاتر چڕ بکرێو لەزەیندا تۆمار بکرێن، بەڵام زۆر جار لەزاری حەرەسەکانەوە دەمزانی چیی رۆژو چی مانگێکە.

بۆ سبەینێ، عەسرێکی درەنگ وەختێکم زانی دەرگا کرایەوەو یەکێکیان کرد بەژوردا. سەرنجم لێدا وەستا کەمال بو.. چاکو چۆنیم لەگەڵ کرد، گەلێك پرسیارم لێکردو هەندێك زانیاریم دەربارەی پلەکانی ئەشکەنجە بۆ باسکرد.

## نمونەی باوکی بەوەفا بۆ نیشتمان

کاتێ لەژوری ژمارە یەك بوم وەستا کەمالیان هێنایە ئەوێ. هەر لەوێوە چیرۆکی گرتنەکەییم لەزاری خۆیەوە بیستبو..

ئەم بە قسەی خۆی تەمەنی لە هەژدە ساڵ کەمترە، کەچی بەریشو سمێڵدا لە بیست هەڵکشاوتر دەبێت. بۆی گێڕاینەوە کە ئەم لەبەری قەرەداغ پێشمەرگە بووە، شێخ جەعفەر قەرەداغی کە لێپرسراوێکی بەزەبری پێشمەرگەی کۆمەڵە بو لەو ناوچەیە (برای شێخ حەسەنو شێخ دلێر)ی هاوڕێی ئەم زیندانە، دەینێرێت بۆ کارێك. پێش ئەوەی کارەکە بکات دەگیرێت. کارەکە چیی بو؟ چۆن دەگیرێت؟ روون نەبو چونکە وێنەیەکی وای نەدەدا بەدەستەوە کە روی روداوەکە دەربخاتو لەزەیندا بچەسپێت. رەنگە هەر بە هوشیارییەوە ئەوەی کردبێت، ئەوەی لێی حاڵی بوم بۆ کوشتنی بەعسییەك بو.. چۆنو لەکوێ گیرا، هیچ روناکییەکی نەدەخستە سەر.

ئیستیخباراتی سلێمانی ئەشکەنجەی دەدەنو ئیعتیراف دەکات. لەوەش خراپتر دەمانچەکەی لە ماڵێك دادەنێتو ئیعتیراف لەسەر خاوەن ماڵەکەش دەکاتو ئیتر (مام مەحمود) کە چوار کوڕیشی پێشمەرگە دەبێت راپێچی ئیستیخبارات دەکرێت. ئەشکەنجەیەکی خەستی ئەویش دەدرێت بەڵام بێ ئەوەی ئەم ئیعتیراف بکات. دیارە بۆ مەبەستی ئیعتیرافکردنیش بە مام مەحمود، هەردوکیان بۆ هەیئە دەنێردرێن.

> ئەرێ کەمال لێکۆڵینەوەکەتان بەچی گەیشت؟

< هەر بۆ ئەوە منیان هێناوەتە دەرەوە، سبەینێ لەگەڵ مام مەحمود روبەڕوم دەکەنەوە. تا ئەویش ددان بەکارەکەدا بنێت.

> ئەی بۆچیی بۆ ئێرەیان هێناویت؟

< نازانم، خۆشیان هیچ قسەیەکیان نەکردووە. لەو وەڵامە سەرم سوردەما کە دەبێت بۆچی بۆ ئێرەیان هێنابێت!؟

> دیارە مام مەحمود تا ئێستا خۆی راگرتووە.

- بەڵی تا هاتیشە ئێرە ددانی بەهیچدا نەنابوو، دوای ئەوە ئاگاداری نیم.

> دیارە لێرەش هیچی نەگوتووە، ئەگینا زوو بانگ دەکرا. بەراستیی پیاوە..

- سەیرێکی کردمو گوتیی مانای من ناپیاوم..

> ئەوە قسەی خۆتە، ئەگینا ئەو پیاوە بەسزمانە تەمەنی لە پەنجا بەرەو ژورەو ئەشکەنجەیان داوەو خۆی راگرتوە، ئەی ناکرێ تۆ وازی لێبهێنیت تا ئیعدام نەکرێت! ئەو لەبەردەم دو چارەنوسدایە: یان رزگاربون یان ئیعدام. لەبەر ئەوەی کە دەمانچەکەش نەگیراوە، رزگارکردنی ئاسانە. دیارە بەوە ملی خۆشت لەپەتی سێدارە سەرفراز دەکەیت.

- ئاخر دەمکوژن، تۆ نازانیت چییان لێ کردوم!

> ناتکوژن بڕوا بکە لەیەك دو جاری تر زیاتر ئەشکەنجە نادرێیت.. بەرگە بگرەو ژیان بۆ ئەو پیاوە پیرە بکڕەرەوە. خۆشت رزگار دەکەیتو پیاوەتیش بۆخۆت دەکڕیتەوە.. تۆ لەم حاڵەی ئێستادا سێدارەت مسۆگەر کردووە.

کەمێك راماو چووە ناو دەریای خەیاڵەوە.. ناوبەناو سەیرێکی منی دەکرد. لەپڕ هەروەك پەیامێکی یەزدانیی پێ گەیەنرابێت گوتی:

> باشە بەقسەت دەکەم هەروا دەکەم.

بەهەمان چرپیی سەیرم کردو گوتم:

> بەڵام کەمال کە پرسیاریان دەربارەی من کرد، قسە نەکەیت!

< نا مامۆستا گیان چۆن قسە دەکەم.

> کەوابو ئەو بەڵێنەی تریش هەروەك ئەمە وایە.

< بەڵێ بەڵێنی پیاوەتییە. پاش ماوەیەك لەو مشتومڕە بێ دەنگییەکی نائاسایی باڵی بەسەر ژورەکەدا کێشا، هەروەك بەڵێنەکەی ئەوو قسەکانی من پرۆسەیەکی سامناك بخولقێننو بومەلەرزەیەك بۆ هەرسێکمان دەرەنجام بێت! ئەو کشوماتییە خەولێکەوتنی هەردوکمانی بەدوی خۆیدا هێنا..

لام وایە ئەگەر هەموو کوردێك وەك ئەم دوو مام مەحمودەی بە دیدارو بەناو بوونە میوانی ئەم "مەحمود"، دڵسۆزو بەوەفا بونایە بۆ نەتەوەو نیشتمان، وا رۆژگارمان بەم رۆژە نەدەگەیشت..

بۆ سبەینێ دوای نانو چاخواردنەوە گوێمان لە هاواری حەرەسێك بوو کە مام مەحمودی لە ژوری ژمارە دووەوە بانگکرد.

کەمال بەرزەپێ بووەوە لە سوچی پەنجەرەکەوە سەیرێکی کرد. لەژوری ژمارە دوو هێنایانە دەرێ. کەمال گوتی:

< مامۆستا ئەوەتا ئەوە مام مەحمودە.. سەرنجم لێدا پیاوێکی تۆکمەی باڵاکورتی سەروریش ماشو برنج کە سپێتیەکەی زیاتر زاڵ بو. بێ چاو بەستنەوە کەوتە دوای حەرەس. هەروەك لەسەر دەنگو ئاوازی مۆسیقای سوپایی بڕوات ئا بەو جۆرە دەستی رادەوەشانو هەنگاوی دەنا.

سەیرە پیاوێکی وا لەناو کێشەیەکی وا گەورەداو لەم هەیئەیەدا لەبەردەم جەللادەکاندا ئاوا سەربەرزانە هەنگاو بنێ، هەروەك بەو مل قیتیو بەو هەنگاوانەیدا بە دەوروپشتەکەی بگەیەنێت:

زیندانییەکان! مردن ئەوە نییە مرۆڤ هێندەی لێ بترسێت، پیاو دەبێت هەر بەم جۆرە رووبەڕووی ببیتو سەری نەتەوەکەی پێ بەرزبکاتەوە.. لەو سەرنجانەمدا روی قسەم لە کەمال کردو گوتم: سەرنج بدە لەو پڵنگەو ئەو شانازیی بەخۆکردنە...!

بەخۆشمم دەگوت، جا بۆ شانازیی نەکات، چوار کوڕی بە کولەمەرگی بۆ کورد پێ گەیاندووەو ئێستا لەکۆڕی خەباتو لەریزی تێکۆشەرانی (کۆرەك)دان کە لەناو تاریکستانی هەرەسی شۆڕشی ئەیلولەوە، لەبێ هیواترین سەردەمی روخاندندا، بە کەرەسەیەکی وا سادەو ساکارەوە کە هەر بۆ راوێکی ئاسایی دەشیا نەك بۆ شۆڕش، بزوتنەوەی چەکداریی لەدژی رژێمی بەعس، کە لە لوتکەی خۆبایی بونو گەشەی سەرکەوتنیدا بو بەلام سەرکەوتنێکی پڕ لە داشکانو خۆ بەدەستەوەدان بە دوژمنەکەی، شۆڕش دەستپێبکرێتەوە، جا ئەوە ترۆپکی سەربەرزییەو دەشێت هەمیشە شانازیی پێوە بکرێت. زۆری نەبرد کەمالیشیان بانگکرد.

ئەو براو منيش كەوتمە تاووتوێ كردنى ئەم كارە نائاساييەم. ئاخر لەم داوى تاكزيندانييەدا چۆن متمانە بەڕوخاوێك دەكەيت!

لەو بيركردنەوانەدا بوم، دەنگى هاوارو گريان بەرز بووەوە. كە گوێم هەڵخست وا ديار بو كەوتبونە بەردەم ئەشكەنجە. لەناو گريانو هاوار هاوارى ئەوانەوە، بەخۆمم دەگوت تۆ بڵێيت بەرگە نەگرێو ئەو بەسزمانە بە كوشتن بدات.. تۆ بڵێيت لە ئەشكەنجەداندا پرسيارى منيشى لێبكەنو قسەكانى منيش بگێڕێتەوە؟ دور نييە بەڵێنێكى درۆى پێ بدەنو قسەكان باس نەكات. ئەى ئادەميزادى وا كە حساب بۆ پاشەڕۆژى ژيانو ناوبانگى خۆى نەكات، ئيتر لەچيى دەسڵەمێتەوە! ئەو پياوێكى وەكو مامە مەحمودى قوڕبەسەر توش بكات كە پياوەتيى لەگەڵ كردوە وا خەريكيشە بە لەسێدارەدانى دەدات! باشيش دەزانێت كە ئەو بڕيارەى بەسەردا دەدرێت، و خۆشى پەتەكەى لەمل دەكرێت. ئيتر بۆچى لەدەم چەوركردنێكى وادا ئەوەى لەمنى بيستووە نەيگێڕێتەوە! نا نا بڕوا ناكەم. لە روخسارى وەستا كەمالدا شتى وا نەدەخوێنرايەوە. لەوە دەچوو ئەو دەستپێشخەرييەى منيش لەجۆرێك لە دڵنياييەوە هەڵقوڵابێ. دەى ئەگەر ئەوەشى كرد بابيكات. ئەو كاتە دەڵێم درۆ دەكات. رەنگە ئەمەش دەرى بخات كە هەموقسەكانى تريشى بەرامبەر بە مام مەحمود هەر درۆ بنو لەترسى ئەشكەنجەو بەناچاريى قسەى كردبێت. ئەگەر ئەوە روبدات منيش رێكو راست پێيان دەڵێم كە لەلاى من گوتويەتى لەترسى ئەشكەنجە ئەو ئيعتيرافەم لەسەر مام مەحمود كردووە، رەنگە لەهەردو حاڵەتدا سودى مام مەحمودى تێدا بێتو سەرفراز بكرێت. بەتايبەتيى مام مەحمود لاى من بو بە نمونەى باوكێكى بەوەفا بۆ نيشتمانەكەى.

رۆژەكانى مانگى شوبات يەك لەدواى يەك گوزەر دەكەن.. ئەمڕۆ هەشتى مانگەو يادى كودەتا خوێناوييەكەى بەعسە لە شەستو سێدا. هەرچەند بۆ شۆڕش ئاشتييەكى كاتيى لەگەڵ خۆى هێنا بەڵام پڕ لە زيانو خوێنو وێرانكردن بوو. تاتوانرا بێبەزەييانە قەڵاچۆى شيوعييەكانيش كرا.

منيش كە بۆ لێپرسراوێتيى ليژنەى ناوچەى هەڵەبجە گوێزرابومەوە، دەستم بەكار كردبوو، بۆ يەكەم جار كەوتمە ناو خەباتو چالاكيى لە ناوچەيەكى نوێو نامۆ بەژيانيى كۆمەڵايەتىو سياسييم..

شوێنەوارى ئەنفلەوەنزا، ئازارى گەدە، مەگەر هەر خوا بزانێت چەندين نەخۆشى تريشم توشبووە، ئەوانە خستميانە سەر كەڵكەڵەى بير لە دوكتۆرو تەداوى كردنەوە، مەزەنەى ئەوەم دەكرد كە ئێستاكە دەرفەتى ئەوە هەيە. بۆيە داواى عيادەم كرد. بۆيان كردمو بردميانەوە بۆ خەستەخانە. دوو دوكتۆر كەوتنە پرسيار كردن، سەرەنجام يەكێكيان گوتى: دەرزيت بۆ دەنوسين، رۆژى دوو جار لەخۆتى دەدەيت. كە گەڕاندميانەوە بۆ هەيئە، پێش ئەوەى بمبەنەوە شوێنەكەم بە رەئيس عورەفا

حەمەدم گوت: کەی دەست دەکرێت بە لێدانی دەرزییەکان؟ سەرنجێکی زەردە خەناوی لێدامو گوتی: جا لێرە کەسمان نییە دەرزی لێبدات! ئەی چارە؟ چارەی چیی، گوایە بەتەمایت، موززەمیدت بۆ بێنین بۆ ئێرە تا دەرزی لە جەنابت بدات! بڕۆ ژورەوەو دەرزی لەبیر خۆت بەرەوە!

ئەمڕۆ ١٢ فیبریوەرییە. پیش قاوەڵتی دەرگایان کردەوەو یەکێکیان کرد بەژورداو دەرگا داخرایەوە.. سەلامی کردو وەڵامم دایەوە.. بێدەنگ دانیشتو پاڵیدا بە دیواری ریزی دەرگاکەوە.. بەجلو بەرگو روخساردا لەخەڵکی شارە گەورەکانی نەدەکرد.. پاش ماوەیەك لەناوو هۆی گرتنەکەییم پرسیی. لەوەڵامدا گوتی:

- ناوم محەمەد مەحمودە، خەڵکی قەڵادزێمو بە شوبهە گیراوم. لەسەر کوڕێك گیراوم کە پێشمەرگەیەو هەمان ناوی هەیە بەڵام ناوی باپیرمان جیایە. باپیری من ناوی ئیبراهیمەو هی ئەو ناوی حەلییە (عەلی) هەروەك خەڵكی ئەو ناوچانە پیتی (ح)و (ع) لە جێگەی یەکتری بەکاردەهێنن.. ئەو ئامر مەفرەزەی پێشمەرگەی یەکێتییەو من کاسب. گوتم:

< دەی کەوابو هێندە نابات بەردەبیت. چونکە چەند رۆژێك لەمەوبەر مام مەحمود ناوێك کە قەڵادزەییە، لەسەر کوڕەکەی کە هەر محەممەدی ناوە گیرابو لە دادگادا ئازادکرا، بۆیە ئێستا دەزانن کە ئەو کێیەو تۆ کێیت..

قسەکەم رونکردنەوەیەك بو بۆ هۆی گرتنەکە کە یەکسەر سەرنجی راکێشام. ئەگەر ئەو ریوایەتەی ئەم راست بوایە وادەبو لەگەڵ مام مەحمودا بەرەو رویان بکردنایەتەوە تا راستییەکەیان بۆ دەربکەوتایەو بیانزانییایە ئایا ئەو مام مەحمودە باوکی ئەم محەممەدە گیراوەیە یان ئەو محەممەدەی کە ئامر مەفرەزەی پێشمەرگەی یەکێتییە. هەرچەندە من ئەوەم لانەدرکاند کە ئەو لەسەر چەك گرتن لە ماڵیدا گیرابوو.

جگە لەوە دەبێت بۆچیی بۆ تاوانێکی وا لەم هەیئەیەی توند بکەن. دەبوو ئەو لێکۆڵینەوەیەو گەیشتنە ئەنجام لە قەڵادزە یان لە سلێمانی ئەنجام بدرایە نەك لە کەرکوك. بۆیە یەکسەر قسەکەییم بەراست وەرنەگرت. ئیتر بڕیارمدا کە وردتر سەرنجی لێبدەم.

ئەویش بەشی خۆی پرسیاری کرد، وەڵامەکانم هەر لەسنوری وەڵامی زەلامەکانی پێشودا بون. سەیریش ئەوە بو ئەم دەیگوت من هیچ خوێندەوارییم نییە..

لەهەردوو حاڵەتەکەدا هەر حسابی ئەوەم دەکرد کە چەند رۆژێك دەمێنێتەوەو دەیبەن. بۆیە دەمویست لە پرسیارکردنی لایەنە سیاسییەکان دووری بخەمەوەو لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەو ناوچەیەی لێوەی هاتوە قسە بکەم، تا بشزانم ژیانی

ناو ئوردوگاکان چۆنە، کاسبیو فەلاحەت تا چەند ماوە، ئەو پرۆسانە تا چی ئاستێك ژیانی هەمەلایەنەی خەڵکی کوردی تێکداوە..

هەر لەسەر گرتنەکەمو هۆکەیو رابوردوی سیاسیم گەلێ پرسیاری کرد. وەڵامەکانی منیش هەر بەو جۆرە بون کە وەڵامی رەئیسی هەیئە دەدەمەوە. بەڵام ئەو لە سوچێکی ترو بە بارێکی تردا دەهاتەوە ناو مەبەستەکانی خۆی، بەجۆرێك کە ئەو بڕوایەی لا دروست کردم کە لەمەشدا درۆ دەکات نەخوێندەوار نییە.

محەممەد جار جارو لەسەرخۆو ورد باسی خراپەی حکومەتی دەکرد. گەلێ نمونەی دەهێنایەوە. کەمو زۆر من قسەم لەسەر نەدەکرد. لەباسی ئۆپۆزسیۆنو کارەکانیاندا، جارێکیان کە باری دەرونیم خراپو زۆر نارەحەت بوم چونکە پەژارەو پەستییەکی زۆر دایگرتبوم، لەسەر هەمان باسی خراپەی حکومەت لە پڕ هاتە سەر تەقاندنەوەکەی ناو (زانکۆی موستەنسرییە لە بەغدا)و گوتی: بەخوا ئازایەتییەکی بێ وێنە بو. وام نیشاندا کە گوێم لە هیچ نەبوەو خۆمم لێ بێدەنگ کرد.

تەمەنی معەممەد هەر بیستو پێنج ساڵێك دەبو. پێست گەنم رەنگێکی کراوە، باریکەلەو هەرسەدو حەفتا سانتیمەتر دەبو. جلی کوردی بێ کڵاوو مشکی لەبەردا بو. کە نەریتو خوی خەڵکی دەری شارو شارۆچکە گەورەکان نەبو.

لە پاش چەند رۆژێك دوو سێ جار بۆ ماوەی کورت کورت بانگ دەکراو بێ ئارەق دەیانهێنایەوە، ئەوەش گومانەکەی منی زیاتر بەهێز دەکرد. کە لێم دەپرسیی چیان گوت. چییان پرسیی؟ قسەی وای نەدەدا بەدەستەوە، لە بازنەی گومان لە تێکەڵبونی دوناوی خۆیو باوکو باپیری لەگەڵ ناوی ئامر مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی ی.ن.ك- دەرنەدەچو.

بۆ لادانی معەممەد لە پرسیارکردن، دەچومە ناو باسو خواسی واوە کە خۆشی زۆری پێخۆش بێت. بۆیە لەناویاندا غەرق دەبو، بەجۆرێك کە لە باسێکەوە بۆ باسێکی تر دەمخستە ناو گۆمێکی ترەوە. چونکە یەکێك لە خەسڵەتە رەگداکوتاوەکانی سروشتی مرۆڤ، بەتایبەتیی مرۆڤی ئەم جۆرە کۆمەڵانەی رۆژهەلات، گێڕانەوەی رازو نیازەکانیانە، باسکردنی روداوە خۆشو ناخۆشەکانە، کە لەهەر یەکەیاندا جۆرە لەزەتو خۆشییەك وەردەگرێ. منیش پرسیارەکانم زیاتر لەسەر ئەم باسانە چڕ دەکرد: ژیانی ناو ئۆردوگاکان: کاسبیو جۆرو ئاستی دەرامەتی خەڵك، جۆری ژیانی خەڵك، لایەنی کۆمەڵایەتی، خواردنەوەو رابواردن، ژیانی ژنانو رەوشتەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، سۆزانییو خۆفرۆشتن، خوێندەوارییو قوتابخانەو خەستەخانەو خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی، یاریکردنو قومار لەو شوێنانەدا. دیاردەی رەدو کەوتنو ژیانو جێگەی کۆمەڵایەتیی ئەو

حەمەدم گوت: كەی دەست دەكرێت بە لێدانی دەرزییەكان؟ سەرنجێكی زەردە خەناوی لێداموو گوتی: جا لێرە كەسمان نییە دەرزی لێبدات! ئەی چارە؟ چارەی چیی، گوایە بەتەمایت، موززەمیدت بۆ بێنین بۆ ئێرە تا دەرزی لە جەنابت بدات! بڕۆ ژورەوەو دەرزی لەبیر خۆت بەرەوە!

ئەمڕۆ ١٢ فیبریوەرییە. پیش قاوەڵتی دەرگایان كردەوەو یەكێكیان كرد بەژورداو دەرگا داخرایەوە.. سەلامی كردو وەڵامم دایەوە.. بێدەنگ دانیشتو پاڵیدا بە دیواری ریزی دەرگاكەوە.. بەجلو بەرگو روخساردا لەخەڵكی شارە گەورەكانی نەدەكرد.. پاش ماوەیەك لەناوو هۆی گرتنەكەییم پرسیی. لەوەڵامدا گوتی:

- ناوم محەمەد مەحمودە، خەڵكی قەڵادزێمو بە شوبهە گیراوم. لەسەر كوڕێك گیراوم كە پێشمەرگەیەو هەمان ناوی هەیە بەڵام ناوی باپیرمان جیایە. باپیری من ناوی ئیبراهیمەو هی ئەو ناوی حەلییە (عەلی) هەروەك خەڵكی ئەو ناوچانە پیتی (ح)و (ع) لە جێگەی یەكتری بەكاردەهێنن.. ئەو ئامر مەفرەزەی پێشمەرگەی یەكێتییەو من كاسب. گوتم:

< دەی كەوابو هێندە نابات بەردەبیت. چونكە چەند رۆژێك لەمەوبەر مام مەحمود ناوێك كە قەڵادزەییە، لەسەر كوڕەكەی كە هەر محەممەدی ناوە گیرابو لە دادگادا ئازادكرا، بۆیە ئێستا دەزانن كە ئەو كێیەو تۆ كێیت..

قسەكەم رونكردنەوەیەك بو بۆ هۆی گرتنەكە كە یەكسەر سەرنجی راكێشام. ئەگەر ئەو ریوایەتەی ئەم راست بوایە وادەبو لەگەڵ مام مەحموددا بەرەو رویان بكردنایەتەوە تا راستییەكەیان بۆ دەربكەوتایەو بیانزانییایە ئایا ئەو مام مەحمودە باوكی ئەم محەممەدە گیراوەیە یان ئەو محەممەدەی كە ئامر مەفرەزەی پێشمەرگەی یەكێتییە. هەرچەندە من ئەوەم لانەدركاند كە ئەو لەسەر چەك گرتن لە ماڵیدا گیرابوو.

جگە لەوە دەبێت بۆچیی بۆ تاوانێكی وا لەم هەیئەیەی توند بكەن. دەبوو ئەو لێكۆڵینەوەیەو گەیشتنە ئەنجام لە قەڵادزە یان لە سلێمانی ئەنجام بدرایە نەك لە كەركوك. بۆیە یەكسەر قسەكەییم بەراست وەرنەگرت. ئیتر بڕیارمدا كە وردتر سەرنجی لێبدەم.

ئەویش بەشی خۆی پرسیاری كرد، وەڵامەكانم هەر لەسنوری وەڵامی زەلامەكانی پێشودا بون. سەیریش ئەوە بو ئەم دەیگوت من هیچ خوێندەوارییم نییە..

لەهەردوو حاڵەتەكەدا هەر حسابی ئەوەم دەكرد كە چەند رۆژێك دەمێنێتەوەو دەیبەن. بۆیە دەمویست لە پرسیاركردنی لایەنە سیاسییەكان دووری بخەمەوەو لەناو ژیانی كۆمەڵایەتیی ئەو ناوچەیەی لێوەی هاتوە قسە بكەم، تا بشزانم ژیانی

ناو ئۆردوگاكان چۆنە، كاسبیو فەلاحەت تا چەند ماوە، ئەو پرۆسانە تا چی ئاستێك ژیانی هەمەلایەنەی خەڵكی كوردی تێكداوە..

هەر لەسەر گرتنەكەمو هۆكەیو رابوردوی سیاسیم گەلێ پرسیاری كرد. وەڵامەكانی منیش هەر بەو جۆرە بون كە وەڵامی رەئیسی هەیئە دەدەمەوە. بەڵام ئەو لە سوچێكی ترو بە بارێكی تردا دەهاتەوە ناو مەبەستەكانی خۆی، بەجۆرێك كە ئەو بڕوایەی لا دروست كردم كە لەمەشدا درۆ دەكات نەخوێندەوار نییە.

محەممەد جار جارو لەسەرخۆو ورد باسی خراپەی حكومەتی دەكرد. گەلێ نمونەی دەهێنایەوە. كەمو زۆر من قسەم لەسەر نەدەكرد. لەباسی ئۆپۆزسیۆنو كارەكانیاندا، جارێكیان كە باری دەرونیم خراپو زۆر نارەحەت بوم چونكە پەژارەو پەستییەكی زۆر دایگرتبوم، لەسەر هەمان باسی خراپەی حكومەت لە پڕ هاتە سەر تەقاندنەوەكەی ناو (زانكۆی موستەنسرییە لە بەغدا)و گوتی: بەخوا ئازایەتییەكی بێ وێنە بو. وام نیشاندا كە گوێم لە هیچ نەبوەو خۆمم لێ بێدەنگ كرد.

تەمەنی معەممەد هەر بیستو پێنج ساڵێك دەبو. پێست گەنم رەنگێكی كراوە، باریكەلەو هەرسەدو حەفتا سانتیمەتر دەبو. جلی كوردی بێ كڵاوو مشكی لەبەردا بو. كە نەریتو خوی خەڵكی دەری شارو شارۆچكە گەورەكان نەبو.

لە پاش چەند رۆژێك دوو سێ جار بۆ ماوەی كورت كورت بانگ دەكراو بێ ئارەق دەیانهێنایەوە، ئەوەش گومانەكەی منی زیاتر بەهێز دەكرد. كە لێم دەپرسیی چیان گوت. چییان پرسیی؟ قسەی وای نەدەدا بەدەستەوە، لە بازنەی گومان لە تێكەڵبونی دوناوی خۆیو باوكو باپیری لەگەڵ ناوی ئامر مەفرەزەیەكی پێشمەرگەی ی.ن.ك- دەرنەدەچو.

بۆ لادانی معەممەد لە پرسیاركردن، دەچومە ناو باسو خواسی واوە كە خۆشی زۆری پێخۆش بێت. بۆیە لەناویاندا غەرق دەبو، بەجۆرێك كە لە باسێكەوە بۆ باسێكی تر دەمخستە ناو گۆمێكی ترەوە. چونكە یەكێك لە خسڵەتە رەگداكوتاوەكانی سروشتی مرۆڤ، بەتایبەتیی مرۆڤی ئەم جۆرە كۆمەڵانەی رۆژهەلات، گێڕانەوەی رازو نیازەكانیانە، باسكردنی روداوە خۆشو ناخۆشەكانە، كە لەهەر یەكەیاندا جۆرە لەزەتو خۆشییەك وەردەگرێ. منیش پرسیارەكانم زیاتر لەسەر ئەم باسانە چڕ دەكرد: ژیانی ناو ئۆردوگاكان: كاسبیو جۆرو ئاستی دەرامەتی خەڵك، جۆری ژیانی خەڵك، لایەنی كۆمەڵایەتی، خواردنەوەو رابواردن، ژیانی ژنانو رەوشتەكانی كۆمەڵگەی كوردەواری، سۆزانییو خۆفرۆشتن، خوێندەوارییو قوتابخانەو خەستەخانەو خزمەتگوزاریی كۆمەڵایەتی، یاریكردنو قومار لەو شوێنانەدا. دیاردەی رەدو كەوتنو ژیانو جێگەی كۆمەڵایەتیی ئەو

ژنانەی کە ڕەدو دەکەون.. ئەوانەی لای من گرنگ بوون‌و دەمویست شتێکیان لەسەر بزانم.

ئەویش زۆرتر باسی خواردنەوەو ژن‌و رابواردن‌و لەزەتی ژیانی خۆی دەکرد، کە چۆن کیژێکی هەبووە، هەر کە کەس‌وکاری لەوێ نەبونایە، بە بیرەوە دەچوە لای، لەگەڵ بیرە خواردنەوە رای دەبوارد، بەدرێژی باسی هێنانی سۆزانی دەکرد لە موسڵەوە کە چۆن خانوی تایبەتی بۆ ئەو بازرگانییە تەرخان کرابو. باسی رۆڵی ئەمن‌و عەسکەری عەرەبی دەکرد کە چۆن دەست بەرەڵا بون لە بەدەستهێنانی هەمو ئارەزووەکانیانداو سەندنی سەرانە.

ئەوەی لە هەمو شتێك زیاتر سەرنجی راکێشابو وردەکارییەکانی دیاردەی (ڕەدوکەوتن) بو لەو ناوچانەدا کە هەرچەندە سروشتی خێڵەکی، ئیسلامەتیی‌و نەخوێندەواریی تیا بڵاوبو. ئەو دیاردەیە لەناو عەشایەری گەلێ ناوچەی هاوسنورە دروستکراوەکەی کوردستان (رۆژهەڵاتی کوردستان) هەبووە، بەتایبەتیی ئەو خێڵ‌و تیرانەی کە ئەو سنورە دابەشی کردبوون. لەگەڵ ئەوەشدا سەرجەم دانیشتوانی ناوچەکانی دەوری ئەومەڵبەندە دژ بە دیاردەی ڕەدوکەوتن بون. تەنانەت لەسەردەمی جەمهورییەتی کوردستاندا یاسای تایبەتیی دژ بە دیاردەی ڕەدوکەوتن دانراو سزای قورسی پیاوی دەدا.

ڕەدوکەوتن هێندە باو بو کە ئەگەر کچێك یان ژنێك ڕەدونەکەوتبایە، تانوتیان لێدەداو پێیان دەگوت: ئەگەر جوان یان باش بویتایە یان خێرت تێدا بوایە وا هەڵیان دەگرتیت، یان ڕەدو دەکەوتیت. جاری واش بووە یەك ژن چەندین جار لەنێوان دوو کەسدا هەڵگیراوە. ژنەکە ڕەدوی ئەم یان ئەو یان کەوتوە، بێ ئەوەی کارەکە نەبۆ ژنەکەو نەبۆ پیاوەکان نامۆو غەریب بن، بگرە هەردو پیاوەکە بە شانازی‌و لەخۆڕازیبوونەوە باسی هێنانەوەی چەند جارەی ژنەکە دەکات، هەروەك ئازایەتی‌و لێزانین‌و قۆزی‌و توانای رازیکردنی ژنەکە بۆ گەڕانەوە بۆ لایی‌و بەجێهێشتنی پیاوەکەی تر سەر گوزەشتەکان باس دەکرێن.. چارەسەرکردنی کێشەی هەڵگرتن لەو شوێنانەدا ئاسان دەکرا، بەکارێك کە بە (خوێن)دان ناو دەبرێت. ئەم دابو نەریتە خێڵەکی‌و تایبەتییەش لە سنوری ژن پێدان‌و لەبری ژنی هەڵگیراو، یان بەپارە، تفەنگ، موڵك‌و ماڵ دەکرا. کەچی لەناوچەکانی دەوری ئەو مەڵبەندە، ئەم کارە نەك هەر ناشیرین بوە. بەڵکو کچ‌و پیاوەکەیان لەسەر دەکوشتن.. بەدرێژایی مێژووی ئەو ناوچانە دەیان روداوی کوشتنی ژن هەڵگیراو یان ڕەدوکەوتو، پیاوی ژنهەڵگرتوو یان ژن ڕەدوکەوتویان بەخۆوە بینیوە. جاری وا بووە دەیان ساڵ بەسەر ئەو ڕەدوکەوتنەدا تێپەڕ بووە ئەوسا تۆڵەیان لێ سەندراوە،

یەکێکیان یان هەردوکیان کوژراون. جاری تری واش هەبو کە ناحەزو دوژمنایەتیو خوێنڕێژیی نێوان دوو هۆز یان دوو تیرە یان دوو بەرەبابی لێ دەکەوتەوە.

سەیرە کە لەو کۆمەڵگە دواکەوتووە ئیسلامەدا، بەو جۆرە بەشێکی وەك کۆمەڵگەیەکی کراوەی ئەوروپایی، بەئاساییو بێ شەرمو شکۆ، ئەو دیاردەیە رەگی داکوتابێت! کەچی لەناوچەکانی تردا دژایەتیی ئەو دیاردەیە تەواو باڵی بەسەر کۆمەڵدا کێشاوە. یەکێك لەهۆیە هەرە گرنگەکانی دەرکەوتنو مانو بەردەوامیی دیاردەکە سستیمی باوك سالارییە کە هیچ سەربەستییەکی بۆ کچو ژن نەهێشتبۆوە، بەخواستی باوك بەشوودراون، بێئەوەی گوێ بدرێتە قسەو راو خواستی مێینە، کە جاری وا بووە کیژێکی جوانی پانزە ساڵیی بەپیرێکی ناشیرینی حەفتا هەشتا ساڵی دراوە، دەی لە کۆمەڵگەیەکدا کە نیوەی کۆمەڵی بەو جۆرە مامەڵە کردبێت، وا هاسان یاخیبوونی ئاشکرا یا نەهێنیی دەخولقێو رەوتی ئاسایی ژیانی کۆمەڵایەتییو رەوشتی ئیندڤید نائاسایی دەکەن..

لەوانەش نامۆتر: لەو ناوچانەی دیاردەی ڕەدوکەوتنیان تیادا باوە، هەروەك چۆن باسی مێرد دەکرێت، هەر بەو جۆرە باسی دۆست دەکرێت، دیارە (دۆستی ڕابواردنو سێکس لەناو خۆشەویستیدا) لەهەمو ئەو پرنسیپانەی کە یاسا کۆمەڵایەتییەکانی ئایینی ئیسلامو ئاینە ئاسمانییەکانی تریشدا نائاساییو دژی رەوشتی کۆمەڵایەتییو پرنسیپەکانی ئایینەکانن.. ئیتر چۆن لەو بەشانەی کۆمەڵگەی کوردەواریدا ئەوانە خوڵقاون، یان راستتر ماونو بەردەوام بون، ئیسلامەتیی کۆمەڵگەکەش نەیتوانییوە لەناویان بەرێ، ئەوانە چەند باسێکی زۆر گرنگن کە بەداخەوە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکراوە..

ئەو ڕۆژەی کە وەستا کەمال- یان بردو ئیتر نەمبینییەوە، بردیانمە دەری ژورەکە، دوای چاو بەستنەوەو کەوتنەدوای حەرەسەکە.. لە شوێنێکدا راگیریان کردم. گوتیان دەست هەڵبڕە بۆ ئاسمان، ئەوەمکرد، ئینجا یەکێك هاتە پێشەوەو گوتی:

- ئەمشەو چیت بە کەمال گوت؟ گوتم:

< کەمال کێیە؟ هەتا توانیی یەك شەقی لە ئەژنۆم هەڵدا. زریکاندمو کەوتمە هاوار هاوار. دەستیکرد بە جنێودانو گوتی:

- ئەمەش بە ئیعتیراف دادەنێیت.

< گوتم ئاخر کەمال ناو ناناسم من بەتەنها مشك میوانمە.

- ئەمشەو کێیان هێنایە ژورەکەت؟

< کورێك بو ناوەکەی گوت بەڵام لەبیرم نەماوە، چونکە لام مەبەست نەبوە کە ناوی چییەو ناوی چیی نییە..

- یەعنی نازانیت لەسەر چیی گیراوە.. وتم ئاخر من چۆن بزانم، ئەو نەدیو و نەناسیاو بو بۆ من، جگە لەوە ئەو منداڵێکە بۆنی شیری خاو لەدەمی دێت، ئیتر منو ئەو کوجا مەرحەبا. خێرا خێرا دەهات بە مێشکمداو دەمگوت تۆ بڵێیت شتیان لێپرسیبێتو قسەیەکی درکاندبێت. هەر خۆم بە خۆم دەگوتەوە: نا نا بڕوا ناکەم، چونکە قسەیەکی لەو بابەتەی بکردایە، ئاوا مامەڵەیان نەدەکردمو دەکەوتنەوە ئەشکەنجە قورسەکان. کێ دەڵێت وایە، ئەو جۆرە روخاوانە جێگەی متمانە نینو پیاو دەبێت هەمو کارێکی نائاساییان لێ پێشبینی بکات. بە تایبەتی ئەو کاتانەی ئەشکەنجەیان لەسەر لانەبراوە. ئەی لەو چەند مانگەدا چەند نمونەیەکی وەك هەردو رەحمانو سەباحو قالە لەبەرچاو نین، دەبێت ئەوە ببێتە پرنسیپو یاسا کە: (ئیعتیرافکەر) مانای روخاوەو بەدەرە لە متمانەو نابێت پیاو خۆی بخاتە بەردەم هەڕەشەی ئەوانە. نەخێر کارەکە ئیجگار وا ئاڵۆزنییە. خۆ پیاو دەبێت لە شتێکی وادا قسەیەکی خێر بکات. نەخێر کارێکی زۆر باشم کردووە. رەنگە لێکۆڵەر هەروەك بەشێك لە گوشارو مانۆڤری لێکۆڵینەوە ئەو قسەیە بکات.

سەرو ریشو سمێڵم تەواو زۆر بووە، وا نزیك بە چوار مانگ دەبێت کە گوێزان بەر ریشمو مقەست لە قژم نەکەوتوون. هەرچەندە رۆژانەش راوی ئەسپێ دەکەم. شانەکەم کاریگەرترین چەکە بۆ ئەوە، بەڵام لەناو لەشو جلدا هەر زۆرن، لەسەر ئەزییەتدان بەردەوامن، خۆ لێرەدا باسی پیسیو هەڕەشەی ئەو دیاردانە بۆ نەخۆشیو پەتا، لەئارادا نەماوە، چونکە سادەترین کاری بەربەرەکانی یان خۆپاراستن لەوانە لەئارادا نین. رۆژێکیان بڕیارمدا کە ژمارەی ئەسپێی گیراو بکەمو بزانم رۆژانە چەند لەناو دەبرێت. هەر جارەش چەند دەکوژم. ژمارەی تاقی بەیانی گەیشتە سەدو بیست. لەتاقی ئێوارانیشدا ئەوەندەی تر. بەگشتیی رۆژی دوو سەدو چل ئەسپێ دەکوژرا. دیارە جگە لەو رۆژانەی کە ئەشکەنجە سەخت دەبو ئیتر بواری ئەو ڕاوکردنە نەدەما. کە سەیری سەری قوتوەکەشم دەکرد هێندەی تر سەرو ریشەکەم غەمگینی دەکردمو ماتەمینیی دایدەگرتم، زیاتر خۆمم بەکەساس دەهاتە بەرچاو. بەوەش دژەکردار خۆی دەردەخستەوە، هێندەی تر پیرۆزیی خەباتی نەتەوەکەم لایاسایيو ڕەواتر دەبو.

رۆژانەو بەبێ وەستان هەر لەتاریکو روونی بەیانیانەوە تا تەواو تاریکبونی دنیا دەنگی فڕینی فڕۆکەی سەربازیيو داگرتن سازکردنەوەی ماشینە زۆر بەکارهێنراوەکان بووە بەشێك لەژیانی بیستن لە ژورەکانی هەیئەدا کە تاڕادەیەکی

زۆر بێزارکەر بوون، نەك هەر لەبەر دەنگەکانیانو بەس، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە هەڵفڕینەکان بۆ سەر پێشمەرگە یان بۆسەر ئێران بون کە لە مەشیاندا زوربەی شوێنەکان هەر کوردستانی دەگرتەوە. زیاتر لەوە کە ڕژێمی سەددام جەنگێکی تەواو نارەوای بەسەر کۆماری ئیسلامیی ئێراندا سەپاندبو، فڕۆکەکانیش لە سۆڤییەت کڕابوونو هێندەی تر بێئومێدییان دەخستە سەر ڕۆڵی یەکێتی سۆڤییەت کە بەقەڵای گەلان دادەنرێت!

## نێونەتەوەیی بوونی کێشەی کورد
## یان بەکارهێنانی کارتی کوردی!؟

ئەو فڕۆکە بەدفەسالانەی یەکێتی سۆڤییەت، کە ڕۆژانە دەنگیان بەگوێمان ئاشنابووە لەخوێنو وێرانکردن زیاتر هیچ پێشبینییەکی باشەی نەدەهێنایە بەرچاو، سیاسەتی ئۆپۆرتیونیستانەی هەموو سەردەمەکانی سۆڤیەتی دەهێنایەوە بیر کە ئەگەر بەو جۆرە نەبایەو گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندیی ڕاستەقینەی میللەتانو مامەڵەی ڕژێمەکان بوایە، وا دوور نەبو ئەم نەهامەتییانە بەسەر ناوچەکەو گەلانیدا نەهاتایە، کە حیزبە شیوعییەکانی سەربەخۆشی تیا پەرِوباڵ کران.

لەسەردەمی زەعیم عەبدولکەریم قاسمدا هەمو پێویستییەکی چەك و ڕێنمایی سەربازییو تەکنیكو شارەزایانی هەمەجۆرەی بۆ ڕژێمەکە دابین دەکرد، کەچی لەهەمان کاتداو لەژێر پەردەوە، دەستی بۆ شۆڕشی کورد درێژ کردبو، ئەوەش بو بەیەکێك لەهۆیە گرنگەکانی روخاندنی دەسەڵاتی عەبدولکەریم.

لە بەهارێکی درەنگی ساڵی شەستو دودا، چوارەمو دووا ساڵی زانکۆم بەسەر دەبرد، لە گەرمەی چالاکیی سیاسییو بوژانەوەی ڕێکخستنو کارکردن بۆ شۆڕشدا، ڕۆژێك سەید عەزیز شەمزینی، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پ.د.ك و لێپرسراوی یەکەمی کاروباری پارتیو شۆڕش لە بەغدا، گوتی کارێکی زۆر بەپەلەم هەیە، بەڵکو ئەم نامەیەم بۆ تایپ بکەیت، بێ ئەوەی کەس بیبینێت، نە ئێستاو نە لەدوا ڕۆژیشدا، نابێت تەنانەت لای ئەندامانی مەکتەبی سیاسیش ئەم نهێنییە بدرکێنرێت. گوتم باشە بەڵام ئێستا دەبێت بڕۆمەوە بۆ زانستگە، عەسر دێمەوە جێبەجێی دەکەم.

نوسراوەکە نامەیەك بو بەناوی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان-وە بۆ مەکتەبی سیاسیی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت، دوای ئەوەی باسی بارودۆخی شۆڕشی کوردستانو سەرکەوتنو گەشەکردنەکان دەکات، ئەوسا دێتە سەر پێویستییەکان:

زۆرتر بوونی پێشمەرگەو خەرجی شۆڕشو ناردنی بەشێکی زۆری ئەو یارمەتییەی وەردەگیرێت بۆ مەلا مستەفا، ئینجا داوای زیادکردنی یارمەتییەکە دەکات کە وەك لەزەینمدا مابێت تا ئەو کاتە (چل هەزار دۆلار) بوو. زانینی نهێنییەکی وا، یەکێتیی سۆڤیەت یارمەتیی شۆڕشی کورد بدات، ئەوە گەورەترین گۆڕانو سەرکەوتنە بۆ کورد، مانای وایە کورد دۆستی ستراتیجی خۆی دۆزیوەتەوەو ئیتر ئاسۆی پاشەڕۆژی کێشەی نەتەوایەتیی کورد روناکە.

ئەو دیاردەیە بۆ من تا سەردەمێکی دورو درێژ، خاڵی وەرچەرخاندنی بیرو هەڵوێستو نوسین بو، زیاتریش لە نوسینو رێبازی کوردایەتیو هەڵوێست وەرگرتن لەهەردوو بلۆکی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، چونکە لەهەموو سەرەنجامی لێکدانەوەکاندا، ئەم جۆرە یارمەتییانە، شتی ئاسایی نین، ئەوە لە مەڵبەندی بیروباوەڕو رۆڵی سۆڤیەتەوەیە، ئەوە لەتێگەیشتنو تەبەننیکردنی کێشەی نەتەوایەتیی کوردەوەیە! بەتایبەتیی کاتێك دیاردەی رۆڵی ئەمریکاو بریتانیا لە دابەشکردنی کوردستان، لە روخاندنی مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمودی حەفیدو کۆماری مەهابادو شۆڕشەکانی ترم لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا بەراورد دەکرد. وا جیاوازییەکان بەو زەقییە دەکەوتنە پیش چاو. ئیتر نێو نەتەوەیی کردنی کێشەی سیاسییو نەتەوەیی کوردم لەو مەڵبەندەوە دەبینیی، بەهیچ جۆرێك لێکدانەوەکانی ئەو سەردەمانەم بەلای ئەوەدا نەدەچوون کە ئەوە پەیوەندی بە کاری ئایدیۆلۆجییو بەرژەوەندیی میللەتانەوە نییە، نەدەزانرا ئەوە بەکارهێنانی کارتی کوردییە لەناو بازنەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان، بۆ سەردەمێكو تا ئەو کاتەی مەبەستەکان بەدەست دەهێنرێن..

سەرەتای مانگی ئازارە، چوار دانە مانگو نیوە سەرو ریشو سمێڵم لەزیادبوندایە، کە رۆژانە سەیری ئاوێنەکەی هەیئە دەکەم، دێوانەیەکی تەواوم لێ دەرچووە، بڕواناکەم کەس بزانێت ئەم مرۆڤە مەحمودەکەی جارانە، چونکە هیچ شتێکم وەکو خۆی نەماوە، تەنانەت بەباڵاشدا ناناسرێمەوە، چونکە تەواو نوشتاومەتەوەو هەروەك کامەی گۆچانم لێهاتووە. کەچی بەو حاڵەشەوە کە وەك پیرەمێردم لێهاتووە، رەئیسی هەیئە پێیدەگوتم تۆ درۆ دەکەیت، تەنانەت تەمەنەکەی خۆشت بەراستی ناڵێیت، تۆ چۆن چلو دوو ساڵیت، تۆ زۆر لەوە گەنج تریت..

رۆژێك کە نەمزانی بۆچی هێنرابومە دەرێ، بەبێ چاوبەستنەوەش، هەرچەندە بۆ ئێمەی یەخسیرو مەشق دادراوی جۆری هەڵسوکەوت لەناو ئەو مردنخانەیەدا، وای راهێنابوین کە چاوبەستنەوەو نەبەستنەوە وەك یەك وابن، چونکە بچوکترین سەرنجدان حەسیرمەیانو جەزرەبەیەکی توند سزای بو. بۆیە هەمیشە سەر رووەو ئەرزو روانین بۆ بەرپێ پیشەی هەموو زیندانییەکان بو. جگە لەوانەی کە خواردنیان

بۆ ژورەکان دەهێناو دەبرد. بەڵام من لەوە حاڵی نەدەبووم کە چۆن ئەو کەسانەیان هەڵدەبژارد تا بەو کارە هەڵبستن.

لەپڕ عەریف ئەحمەد گرتمیو گوتی: وەرە.

لێی چومە پێشەوە. دوو سێ هەنگاوی تر دوری خستمەوەو بردمییە نزیک دیواری تەوالێتیی تەنیشت حەمامەکە. ئینجا مقەستێکی دەرهێناو دەستی کرد بەهەڵپاچینی سەرو ریشم. قژێکی زۆری لێکردەوە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت: بەس نییە ئەم خێرو بەرەکەتەشییان لەدەست بووەوە. رەئیسی جەللادەکان بەدەم قژ هەڵپاچینەوە بەم جۆرە پرسیارە ئاساییە کەوتە پەیڤین:

- ئەوە تۆ تا ئێستا قسەت نەکردوە؟

< قسەی چیی؟

- ئەزانیت تۆ پیاوێکی زۆر شەیتانو مەلعونیت.

< (ئەعوزوبیللا).

- لەکێ؟

< لەبەلای ناگەهان.

- من بڕواناکەم ئەم خۆگێلکردنەت بۆ بچێتە سەر.

< بۆچی گێلم خۆ من تەمسیل ناکەم، کێ دەتوانێت لەناو ئەم قەسابخانەیەدا ببێتە ئەکتەرو تەمسیل بکات!

- ئەوە گوتت چیی؟ ئێرە بە قەسابخانە ناودەبەیت؟

< ئێ باشە خۆتان وا ناوی نابەن. کەمێك بێدەنگ بو. ئینجا گوتی:

- دەزانیت بۆچی دەڵێم تۆشەیتانیت؟

< نەخێر بۆچیی؟

- رەئیسو لێکۆڵەران لەو بڕوایەدان کە تۆ شتیتو شتیش زۆر دەزانیت، هەمو ئەوانەی گوتوتن درۆن. ئەوان تۆ زۆر باش دەناسن. رابوردوت لەبەردەستیاندایە. بەڵام بەڵگەیەکی نوێیان بەدەستەوە نییە ئەوان بەدوای شتێکی وادا وێڵن. لام وایە ئەمڕۆ بێت یا سبەی هەر دەیدۆزنەوە بۆیە خۆت قسە بکەیت باشترە!

ئەم قسە خۆشانە کە لێکدانەوەی بەرامبەرەکەم بۆ روناكو ئاشکرا دەکات، تا ئێستا لەوێنەیانم نەبیستبو. ئەوەش رایکێشام بۆ دو رستەی کورتو چڕی ناو ئەو ئاسودەییە لەپڕە:

< تا ساڵی حەفتاو پێنج چیی بڵێن راستەو سیاسەتم کردوەو هیچی تر. ئیتر دوای ئەوە بڕوابکە دوربوم لەهەمو سیاسەتێك.

- جا ئەوە سیاسەتی پێدەڵێن یان یاخیبونو خیانەت! جا بزانە تۆ قسەکانت باش دەری دەخەن کە تۆ ئینسانێکی ئاسایی نیت!

< دەی باشە ئەی حیزبی بەعس خۆی گفتوگۆی لەگەڵ کورد نەکردو حوکمی زاتی نەدایەو ئاهەنگی بۆ نەگێڕا، سەرەك کۆمار خۆی نەچو بۆ لای مەلا مستەفا..؟

خێرا هەڵی دایەوە:

- ئی ئەوە ڕاستە.

ئەی دوای ئەوە بۆچیی لەگەڵی نەبون؟

ئەی بۆ چونە شاخو لەدژی حوکمەزاتییەکەی خۆتان وەستان!؟

ئەی بۆ دوای مەلای نۆکەر کەوتن؟

ئەی بۆ ئێستا لایەنی حکومەتی نیشتمانییو حوکمەزاتییەکەتان ناگرن!؟ بۆچی لەگەڵی نینو خزمەتی ناکەن؟ ئەی ئەوە هەر هەمان حوکمی زاتیی نییە؟

- باشە تۆ مودەریسی چیی بویت؟

< مێژوو.

- ئەی سەفەری ئەوروپات کردووە؟

< بەڵێ.

- بۆ کوێ؟

< بۆ بەرلینی ڕۆژهەڵات..

دەبێت زۆر خۆش بێت؟

< زۆر.

- وەك چیی؟

< شوێنی وەك ئێرەی تێدا نییە!

- یەکسەر هەڵوێستەیەکی کردو گوتی ئەوە دەڵێیت چیی؟

< هیچی خراپم گوتوە؟

- ئەی لەوە زیاتر چی بڵێیت.

< وەڵلا ئەو قسەیە هیچ درۆیەکی تیا نیە..

- با تیایەتی، هەموی درۆیە، ئەی قابیلە حەپسخانە لەوێ نەبێت!

< بەڵێ چۆن نییە، بەڵام ئەم جۆرە حەپسخانانە لەوێ نییە.

- با چۆن نییە، ئەی ئەوانەی خیانەت لە وڵاتەکەیان دەکەن، لەکوێ دایان دەنێن، قابیلە لە قەسری ڕازاوەدا بەخێویان بکەن.

< باشە خۆ من خیانەتم لە میللەتی خۆم نەکردوە.

قسەیەکی راستیشی کرد، خۆ ئەمان گەلێك لەم میتودانەی ئێرەیان لەو جۆرە وڵاتانەوە وەرگرتوە. بەدەم ئەو پرسیارو وەڵامە کورتانەوە دەلاکییەکەی خۆی تەواو کردو گوتی:

- ئاخرییەکەی دێیتە سەر قسەی ئێمەو ئیعتیراف دەکەیت. دە برۆ..

بەدڵ خۆشییەکی دولایەنەوە هەنگاوم بەرەو ژورەکەم نا. کە چومە ژورەوە سەیرێکی سەرقاپی قوتووەکەم کرد، چیی ببینم.. لە ئینسان نەبێت لەهەمو شتێکی تر دەچوم. دێوو درنجم نەبینیبو، گوتم دەبێت ئەمانە رەفیقی دێوو درنج بن بۆیە ئەم مرۆڤە بەنرخە والێدەکەن. سەروریش‌و سمێڵم وا ڕیڕێ کراون کە وەك جادەو شەقامی سەر نەخشەی لێکراوە، پیاو بێزی لەخۆشی دەهاتەوە، وەك تاوانبارێکی گەورەی دەست بەخوێن سوربو دەهاتمە بەرچاو. دیمەنی یەکەم جار هەر ئەو وێنەیەی خستە پێش چاوم.. دیارە تەنها مەبەستیی ئەمانەش هەر ئەوەیە. بۆیە وا دەکەن.. تا نرخی مرۆڤ لە نزمترین بەهاشدا نەهێڵن. تەنانەت لەبەر چاوی خودی مرۆڤەکە خۆشی. کە لەژوری ژمارە یەك بووم، زیندانییە کۆنەکان دەیانگوت بۆیە وا لەپیاو دەکەن تا دیمەنی هێندە دڕندە دەربکەوێت کە کار بکاتە سەر حاکمەکان‌و سزای قورستر بدەن بەسەر زیندانییەکاندا!

خێرا دیوی روانگەکەم بۆ ئەو کارو دیمەنە گۆڕی بۆ ئەو مەبەستانەی رژێم‌و ئەم داموو دەزگایەی بۆ سوکایەتی کردن بە مرۆڤ‌و مرۆڤایەتیی، بەتایبەتی بە کورد، بەناشیرینکردنی رەوشت‌و کرداری ئاسایی بۆ نائاساییەکی ئەوتۆ کە لای خۆشی نامۆ بێتە بەرچاو.. بەڵام ئەو بۆچونە لەم ساتانەدا پێچەوانە دەبێتەوە..

هەرچی چۆنێك بێت ئەم دیمەنە سامناکە دوو قازانجی باشیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا:

یەکەم: بۆم دەرکەوت لێکۆڵەران هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییەو دەزانن من نە لەکاردام‌و نە لێکۆڵینەوەی دەرەوەشیان، بە قالەشەوە، ئەنجامێکی هەبووە. زیاتریش لەوانە، ئەو مشتومڕەی ساتەکانی قژ هەڵپاچینەکەو بێدەنگیی سەرۆکی جەللادەکان لەو قسە نائاساییانەی من لە "ڕووی" سەرۆکی جەللادەکاندا دەمکرد، بێئەوەی دژەکرداری توندوتیژی لێدەربکەوێت، خۆی لەخۆیدا دیاردەیەکی زۆر دڵخۆشکەرە.

دووەم: لەکۆڵبونەوەی ئەو هەموو قژەی سەرو ریشە زۆرە کە مەڵبەندی ئەسپێ‌و پیسیی بون، ئیتر لەشکری ئەسپێ بەو جۆرە نامێنێت، لە راستیشدا ئەو سەرو ڕیش زۆرییەی من لەهەیئەدا دەگمەن بو، کەس نەبو ئەوەندە زۆرو درێژ بوبێت. بوبوومە مەجنونێکی زیندەوەبوی ناو هەیئەی تەحقیقی.

لە ژوری رەقەم یەكدا حەمە سەعیدی حاجی فەقێشمان لەگەڵ مابووەوە. ئەم توشی دڵ دەبێت. ماوەیەك لەخەستەخانە دەیخەن. كە دەیهێننەوە، دەیبەنە ژوری ژمارە دوو. بەرزانی كوڕیشی لەجیاكردنەوەكەدا بردیانە ژوری دوو. تا لەژوری یەك بوم رۆژانە پاككردنەوەی ئاودەستەكەیان بەو دەسپارد، دەبو رۆژی دوو جار ئەو گۆلاوە پاك بكاتەوە. باوكیشی خەفەتێكی زۆری پێدەخوارد. خێرا خێرا بە ئێمەی دەگوت دەوەرە كوڕ بەو حاڵە پێبگەیەنە، ئەم سەگبابانەش ئاوای لێبكەن. زۆریان رق لێیدەبووەوە. بەنوسین لەسەر دیوارو لەسەر كێلی گۆڕەكانی سەیوان تاوانبار كرابو. دەست و خەتێكی زۆر خۆشی هەبوو. ئەویش كەم و زۆر ئەو تاوانەی نەدەسەلماند. چەندیان ئەشكەنجەدا بێ سوودبوو. بۆیە بەو جۆرە تۆڵەیان لێدەكردەوە.

رۆژێكیان ئاو بڕابو، بەچەند زیندانییەك تەنەكەی ئاویان دەهێنا. دوكەس لەناوەڕاستی حەوشەكەدا ئاویان بەدەستی یەكتردا دەكرد. رێككەوتێكی سەیر بو كە منو حەمە سەعید بەر یەكتری بكەوین. بڕیاردرابو كە بەردەوام من دوا زیندانیی ژورەكانی ئەو حەوشەیە بم كە بۆسەر ئاو بهێنرێمە دەرەوە. لەگەڵ حەمە سەعیددا كەوتمە چرپە چرپ. من دەنگو باسی خۆمم پێگەیاند كە زۆر باشمو خەمێكتان نەبێت. ئینجا گوتم:

< داوا بكە لەبەر دڵت بتهێننە حەمامەكە.

> گوتی نایكەنو قسە مەكە گوێیان لێبێت دەمانكوژن.

< گوێیان لێمان نییە.. ئەو ماوە كورتە هەر بەوەوە خەریك بوم وەك لە دەموچاو شوشتن.. دەمگوت بەڵكو هاودەنگێكی ئەمینم بۆ پەیدا ببێت. هەرچەندە خۆشم دەمزانیی كە كاری وا ناكەن، بەڵام ئەوە لەهەوڵە بێهودەكان بو كە لە ناچارییدا پیاو پەنای بۆ دەبرد.

مانگی ئازار گەرمیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.. لەگەڵیشیدا ئازاری ئازارەكان سەدویەك بیرەوەریی خۆشو ناخۆش دەهێنێو خەیاڵو بیرەكان بۆ لای گەلێكیان راكێشرا:

٣- ٣- ١٩٢٣ بۆمبارانی سلێمانی لەلایەن فڕۆكە جەنگییەكانی ئینگلیزەوە بە مەبەستی روخاندنی مەلیكایەتییەكەی شێخ مەحمود.

١١- ٣- ١٩٧٠ و ١٩٧٤، ئازار، شەڕبونەوە لەگەڵ رژێمدا..

٦- ٣- ١٩٧٥ رێكەوتنە شومەكەی جەزائیرو روخانی شۆڕشی ئەیلول

٢١- ٣ رۆژی نەورۆز، جەژنی نەتەوەییو ساڵی نوێ..

٣١- ٣- ١٩٤٧ لە سێدارەدانی قازی محەممەدو هاوڕێكانی.

١٢تا ٣٠- ٣- ١٩٢١ کۆنگرەی قاهیرە کە تێیدا دوو ڕێبازو هەڵوێست بەرامبەر بە کورد ئاشکرا بو.

٣١- ٣- ١٩٣٤ دا حیزبی شیوعی عیراق لەدایك بوو کە لەو سەرەتایەدا بەناوی "لجنة مكافحة الاستعمار والاستثمار" و سکرتێرە گشتییەکەشی (عاسم فلیح) بو. ئەوەش سەرەتایەکی باش بو بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد. بەڵام زۆری نەبرد دروشمی "داننان بەمافی بڕیاردانی چارەنوسی خۆ بۆ کورد" تور درا، ئیتر سەردەمێکی دوورو درێژ لە ناکۆکیو ململانێی پڕ لە زیان دەستیپێکرد، کە سەرەنجام زیانی گەورەیان لە بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردو خۆشیاندا.

ئازاری ١٩١٧ گرتنی بەغدا لەلایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە.. کە سەردەمێکی نوێی پەیوەندیی نێوان کورد ئینگلیزی بەدواداهات.

(٨)ی ئازار ڕۆژی ژنانی جیهان... تۆ بڵێیت ڕێکخراوەکانی مافی ژنان بێئاگابن لەم هەموو مەینەتییەی دوچاری ژنی کورد کراوەو دەکرێت!؟

یەکەم هەفتەی مانگی نیسان ئاسایی تێدەپەڕێ. یەکێك لە بیرەوەرییەکان کە لاپەڕەیەکی تری گەشی مێژووی ئەو بەشەی کوردستانی نەخشاندووە ڕۆژی پێنجی ئەو مانگەی ساڵی ١٩٣١ ە کە سەرئەنجامێکی ڕاپەڕینەکەی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ بوو.

لەو ڕاپەڕینە خوێناویەدا کە بە شەڕی بەردەرکی سەرا یان شەشی ڕەشی ئەیلول ناوبانگی دەرکرد. جەماوەری سلێمانیی، وەك ئەڵقەیەکی زنجیرەی خەباتی ڕزگاریخوازو بەهیوای زیندوکردنەوەی مەلیکایەتیەکەی کوردستانی باشورو لەدژی داگیرکردنی نیشتمانو پەیمانەکەی ١٩٣٠ بەخوێنی گەشی ڕۆڵەکانی ئەو شارە پەیامی بەردەوامیی خەباتی دژ بە داگیرکەری ڕاگەیاند. وەك سەرەنجامو هۆیەکی ڕاستەوخۆی ئەو ڕوداوە، شێخ مەحمود لانەی ئاوارەیی لە ڕۆژهەڵات بەجێ هێشتو ڕوی کردەوە باشور، تا لەدوا بەرگریدا تۆڵەی ئەو خوێنە بکاتەوە کە لە باخەکەی سەرادا ڕژێنراو سەرلەنوێ پەیامی ڕزگاریی لەشەڕی (ئاوباریك)دا ڕابگەیەنێتەوە. هەڵبژاردنی زەمینو زەمانی ئەو شەڕە، یەکێکە لەو نهێنیانەی تا ئێستا بەدوایدا وێڵم.. هەر لەو حەوشەیەی سەراشدا دوا گوللەکانی دوژمن تەرمە پیرۆزەکەی شێخ مەحمودی نەمری پێکا، هەروەك ماڵئاوایی بەو جۆرە لەخەڵکی شارەکە بکاتو پێیان ڕابگەیەنێت کە ئەم نەبوو لە شانۆی خەبات دوور کەوتبۆوە. بەڵکو ئەوە کورت نەفەسییو لاوازیی هۆشو هەستی نەتەوەیی خەڵکی کورد بوو کە ئەو دیاردەیەیان خوڵقاند.

لەم رۆژگارەدا پیس‌و پۆخلّی‌و ئەرتەشی ئەسپێی هەمەڕەنگی ناو ئەو زیندانە، مشك‌و جانەوەری نەخۆشبەر لەسنور دەرچووە. نەخۆشی پێست بڵاوبوەوە. زۆر کەس توشی بووە. لە کۆتایی مانگی مارسدا ئەو دەردە زیاتر تەشەنەی کرد. ناوبەناوێکیش زیندانیی دیار نەدەماو گوێم لێبو دەگوترا براوە بۆ هەیئە تازەکە. ئەو ناوە لە من بوبو بەمەتەڵ. دەبێت ئەم هەیئە تازەیە چیبێت؟ بۆچیی زیندانیی بۆ دەگوێزنەوە؟ تۆ بڵێیت پەیوەندیی بە بەردان یان دادگایی کردنەوە هەبێت؟ حەسەن حسەین کە لەسەر چێشت دابەشکردن بۆ ژورەکان دایاننابو، لەو کەسانە بو کە دیار نەماو گوێزرایەوە. ئەو نەخۆشییە وایکرد کە لەسەرەتای نیسانەوە، بڕیار بدرێت زیندانییەکان خۆیان بەئاوی گەرم‌و سابون بشۆن. تا ئەو کاتە ناوی ئاوی گەرمم هەر لەبیر چوبووەوە. بۆ سابونیش، هەرچەندە چەند جارێك بینیبوم کە لەتەنیشت سۆندەی ئاوەکەوە دادەنرا. بەڵام کەس نەیدەتوانی دەستی بۆ بەرێت. هەرکەس دەستی بۆ درێژ بکردایە، خێرا هەڕەشەی لێدەکرا یان تێیدەسرەوێنرا. بۆیە دەستم بەر سابونیش نەکەوتبو. یەك حەمامیش تەرخانکرابو بۆ ئەو خۆشتنە. جا دەبوو نزیکەی چوار سەد زیندانیی لە یەك حەمامدا خۆیان بشۆن..

رۆژ ١٢ی ئەپریلە، سەرە گەییشتە سەر من. کە بەرەو حەمامی سەر حەوشەی سێیەم بردیانم، لەبەر ئەوەی خەڵکی تری تێدابو، بۆیە دەبێت چاوەڕوان بم. حەرەسەکە گوتی دانیشە؟ بە چیچکانەوە لێیدانیشتم تا ئەو زیندانییە دێتە دەرەوەو سەرەی من دێت.. هەتاوێکی زۆر خۆش بوو دەمێك بو ئەو تیشك‌و گەرمی‌و روناکییەم نەبینیبو. لەسەرەتادا بەهۆی بەهێزیی تیشکی رۆژەکەوە هەروەك بەشەوارە کەوتبم ئاوام لێهات! هەلێکی باشیش بو کە هیچ نەبێت لەو ماوە کورتەدا ئیسقانەکانم کەمێك لەو تیشکە وەربگرن. کە چاوەڕوانییەکە کەمێك درێژەی کێشا ئەوەشم بەهەل وەرگرت بۆ راوە ئەسپێ، چونکە ئاسان دەبینران. بۆیە وەك تاکە هەلی رەخساو بۆ راوی ئەوانەی لەچەکی شانەکە رزگاریان بووەو خوێنی لەشم دەمژن، هێندەم کوشت کە سەری هەردوو نینۆکی پەنجە گەورەکانم لەخوێندا سوربن. کە (کازم)ی حەرەس سەیری کردم لەناو درزی هەردو ددانی پێشەوەی فیچقەی بەتفی ناودەمی بەرەو ئەرزەکە کرد، ئینجا بە چرچاوێکی گرژی پڕ لە قێزوبێزێکی زۆرەوە روی وەرگێڕاو پشتی لە من کرد. لەدڵی خۆمدا گوتم: دەی زەمانەی ژێرسایەی ئەم رژێمی بەعسە رەش بێت کە دەبێت کارەکان وا پێچەوانەوە بکاتەوە. خوا دەزانێت ئەم عەسکەرە پێ پەتییە خەڵکی چی کوێرە دێیەکی پیس‌و پۆخڵە، وا لەناو باوەشی بەعسدا بەم درندەییە گۆشکراوەو بۆتە ئەم جەللادە ویژدان مردووە.

سەرەم هاتە سەرو کرامە حەمامەکەوە. هەڕەشەی یەکەمیان بۆ پەلەکردنو زوو هاتنە دەرەوە بو. هەر دەستم بۆ سابون برد یەکێکی تریان کردە ژورەوە. ئەوە خۆ سەرداری حەسەن بەگە. هەڕەشەی دووەم بە دەنگێکی بەرز پێمان گەیەنرا کە قسەو سرپە سرپ قەدەغەیە. لەگەڵ خۆدانە بەرئاوە گەرمەکە، کە لە راستیدا شلەتێن بوو نەك گەرم. وەزعی خۆمم بۆ باسکرد. ئەویش هەواڵی باشەی ئەوانەی لەگەڵیدا بون پێیگەیاندم. گوتی:

دەزانین کە لەژێر ئەشکەنجەیەکی زۆر قورسدایت. ئەم تەنھاییە زۆر زەحمەتە، ئێمە هەموو خەممانەو دەڵێین تا تۆ لە تەنهایی رزگار نەبیت پەنجەمۆرمان پێناکەن. ماوەیەك دەگوترا لەژێر تەعزیبدا کوژراویت. گوتم دەی خوا کەریمە زۆرمان هێناوەو کەممان ماوە. ئەرێ سەردار دەڵێن بەهۆی قسەخۆشەکانتەوە حەرەسەکان زۆر جار بانگت دەکەنە دەرەوەو دەتجولێنن. گوتی تۆ بەتەنهایت چۆن ئەمەت زانیی؟ گوتم ناوبەناو بۆ شەوو دوو شەو نەفەرم دەهێننە لاو هەندێ هەواڵ دەزانم. یەکدو جاریش گوێم لەجەللادەکان بووە کەباسیان کردویت.

سەردار بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی ئائا ئەو سەگبابانە وا دەزانن بە من رادەبوێرن. نازانن من سەریشیان لێتێکدەدەمو پێشیان رادەبوێرم.. من بەلێکۆڵەرەکانم وا راگەیاندوە کە لەسەر راپۆرتی ئەمنێکی عەرەب منیان گرتووە، ئەویش لەبەر دوو هۆ منی بەگرتن داوە:

یەکەم: پارەم داوەتێ بەقەرز، کە داوام لێ کردەوە، لێم تورە بووە، هەڕەشەشی لێ کردم کە ئەگەر جارێکی تر داوای قەرزەکەم بکەمەوە وا بەگرتنم دەدات.

دووەم: حەزی لە کوڕێکی گەڕەکەکە کردبوو، کە بۆ پایسکل مشتەریی من بو، دەیویست بەزۆری زۆردارەکی ئەو کوڕە خراپ بکاتو سواری بێت. کوڕەکە ملی بۆ نەدەدا. کەچی ئەمنەکە بەوەشەوە نەوەستا، هەڕەشەی لە من دەکرد کە ئەگەر من کوڕەکەی بۆ رازیی نەکەم، وا بەگرتنم دەدات..

- ئەی توخوا کاك مەحمود چاك ناکەم؟

< ئینجا بۆ ئێرە لەوە باشتر دەبێت چی بێت.

سەیر بو حەرەسەکە هیچ دەنگی نەدەکرد، ئەوەندە نەبێت کە هەر گوێی لە سرپەیەکی ئێمە ببوایە هاواری دەکرد قسە مەکەن دەتانکوژم..

لەگەڵ خۆشتنو لەناو قسەکردنیشدا بیرم لەم خۆشتنە مێژووییەو ئەم دەرفەتە گرنگە دەکردەوە کە دوای نزیك لە شەش مانگ ئاوی گەرمو سابونم بەربکەوێو خۆمیان پێ بشۆم. ئەمە نیعمەتێکی ئاسمانییە، هەر لفکەی کەمە. بۆیە تا دەمتوانی دەستم لە لەشم دەخستو نینۆکەکانیشم بەکار دەهێنا. ئێستاکە دەتوانم بۆ ئەم

مەبەستانە بەکاریان بهێنم. چونکە لەدرێژیدا بوبونە دوژمنی خۆم. بۆ لەشم لەچرنوکی پشیلە گەلێك خراپتریان لێ هاتبو. هێندە لەشی خۆمم بەخوراندن بریندار کردبو کە ئەسپێکان زیاتر دەوربیینن لە کزانەوەی شوێنە روشاوەکانو هێنانە خوروی لەشم. بۆیە بە ددانەکانم کەوتمە گازلێگرتنیان تا کەمێ تەنکم دەکردن، ئەوسا لەسەرخۆ دەکەوتمە نوشتانەوەو ئەملاو ئەولاپێکردن تا لە یەکەیەکەی نینۆکی پەنجەکانم ئەو زیادانەم قرتاند.. ئیتر بەو جۆرە لە چرنوکەکانم سەرفراز بوم.

بۆیە لەم خۆشتنەدا دەوری خۆیان بینی لەچڵك لێکردنەوەی ئەو شوێنانەی دەستم دەیگەیشتێ.. ئێمە دەمانویست تابتوانین زیاتر خۆمان پاك بکەینەوە، بەتایبەتیی بێ لفکە زەحمەت بو ئەو چڵکە زۆرەی لەو ماوە دورو درێژەدا کۆبوبوەو قەتماغەی بەستبو، بەدەست لێخستنی ئاسایی لە لەش بکرێتەوەو لەش خاوێن ببێتەوە. کە حەرەس هاواری کرد: پەلەبکەن وەرنە دەرێ، ئێمەش خۆمان لەبەرکردەوەو بەرەو شوێنەکەم بردیانمەوە.

بۆ خۆدزینەوە لە دنیای هەیئە هەریەکە لە زیندانییەکان بەشتێکەوە خۆی خەریك دەکرد. هەبو بە ناوە سەمون تاقمە شەترنجی وای دروست دەکرد پیاو حەزی دەکرد سەیری بکات.. دیسان بۆ دامە دروستکردن بەهەمان شێوە.. تانەبوبومە تەنها زیندانیی، وەك هەندێك لە زیندانییەکانی تر من گوێم نەدەدایە ئەو جۆرە شتانە. خۆ لەدوو تاکزیندانەکەی تر بواری بیرکردنەوە لەم جۆرە شتانە هەر نەبوو. بەڵام کە کەوتمە ئەم تاك زیندانە، ئەو سەرەتایانە وا دەردەخەن کە بوارێکی ئەو شتانەم هەبێت. دەشبو خۆم بەشتێکەوە خەریك بکەم.

باشترین شتێك کە بەبیرمدا هات دروستکردنی تەزبیحە، هەروەك لەوەوبەر لە زیندانییەکانی ترەوە فێر بوبووم.

دروستکردنی ئەو جۆرە تەزبیحانە ئاسانە، لەڕایەڵی بەتانییە دڕاوەکە چەند داوێکی درێژم دەرهێناو کەوتمە هۆنینەوەیان، ئینجا بەڕێكو پێکیو بەیەك قەبارەو یەك ماوەی نێوان دوو دەنك. کەوتمە گرێ دروستکردن، هەر گرێیەك یەك دەنکی تەزبیحەکەیە. ئیتر بەو جۆرە تەزبیحێکی سەدو یەك دەنکیم دروستکردو کەوتمە (لائیلاهە ئیلللەڵلا) دەیان هەزار تەزبیحم تەواوکرد.

لەدڵی خۆشمدا دەمگوت خۆزگا باوکم لە کونێکەوە چاوی لێم دەبو، ئایی کە دڵی پێی دەگەشایەوە، چونکە یەکێك لە ئاواتەکانی باوکم ئەوەیە کە دەست بکەم بەنوێژو رۆژوو خواپەرستیی بەکردار، بەتایبەتیی، هەر لە منداڵیمەوە تا پۆلی شەشی سەرەتایی، نوێژم دەکردو رۆژوم دەگرت، تەنانەت هەمو بەیانییەك، بەهاوینو زستان، بۆ نوێژی بەجەماعەت، لەتەکیدا بۆ مزگەوت دەچوم.

ئەم تەزبیحاتە، دیمەنی زیکرو تەهلیلەی دەروێشەکانی دەهێنامەوە یاد، بە تایبەت لە منداڵیمدا، ئەو سەردەمەی کە ئێوارانی هەینیی دەروێشەکانی شێخ عەبدولکەریمی کرپچنە، دوای بانگی خەوتنان لە مزگەوتی تەکیەی سەرکارێز کۆدەبونەوەو دەکەوتنە زیکرو تەهلیلە، ئێمەش دەچوینە سەیرکردن. ئەوەی سەرنجی منی زۆر رادەکێشا: شان بەشانی دەروێشەکان کە بەزیکرکردنەوە شوشەی بلوری چراو گلۆپیان دەشکاندو دەیانکرۆشتو قوتیان دەدا، وەك دیاردەی موعجیزەی شێخەکەیان، لاوی تازە پێگەیشتوی گەرەکیش دوای عەرەق خواردنەوە، بەسەرخۆشی دەچونە ناو کۆڕی زیکرەکەوە، وەك ئەوان ئەو شوشانەیان دەخستە دەمیانەوەو دەیانکرماند، ورد ورد دەیانهاڕیی‌و ئینجا قوتیان دەدا. نەمدەزانی چۆن ئەو پارچە شوشانە لەناو دەم و قوڕگیان نەدەچەقین و پڕ نەدەبو لەخوێن‌و چۆن دەیانوێرا ئەو وردە شوشانە قوت بدەن..!

## لەگەڵ ژن رانەبواردن‌و نوێژ نەکردن واتە خۆ بێبەریکردن لە دنیاو قیامەت!

رۆژێکیان لەناکاو دەرگاکەیان کردەوە، حەرەسەکە تەزبیحەکەی بینی.. بە پەنجە ئاماژەی چونە دەرەوەمی کردو گوتی:

- ئەوەت لە کوێ بو؟

منیش جۆری دروستکردنەکەم بۆ باسکرد.

- تۆ نوێژ دەکەیت؟

< نەخێر.

- ئەی قەت لە ژیانتدا نوێژت نەکردووە؟

< بەڵێ کردومە.

- ئەی ئێستا بۆ نایکەیت؟

< کە هاتومەتە ئێرە نوێژم نەکردووە، ئیتر بۆچی لێرەدا بیکەم. جگە لەوە نوێژ لێرەدا قبوڵ نییە..

- بۆچی قبوڵ نییە.

< لەبەر پیس و پۆخڵی، شتی ئێرە نوێژیی نییە.

عەسکەر وەك بەرازی بەلەسەبوی لێهاتو تا توانیی یەك لەقەی لە ورگم داو دەستی کرد بە جنێودان‌و گوتی:

- ئەی ئەم هەمو حەپسانە بۆ نوێژ دەکەن؟ تۆش دەست پێنەکەیت هەر دوچاوت دەردەهێنم. ئەو هەر بەشەڕ فرۆشتن ئەو قسانەی دەکرد ئەگینا خۆیان زۆر دوور بون لە نوێژکردنەوە..

عەسری ڕۆژی ئاینده، بۆ ئاودەست هێنرامە دەرەوە.. دوای جێبەجێکردنی پێویستو هاتنە دەرەوەو دەستو پل شتن. هەمان عەسکەر کە عەباسە سور بو، لێم هاتە پێشەوە، هەروەك بەردەوامیی و تەواوکردنی پرسیارەکانی دوێنێ گوتی:

- ئەی تۆ سەفەری ئەورووپات کردووە؟

< بەڵێ.

- بۆ چ وڵاتێك؟

< بۆ بەرلینی ڕۆژهەڵات لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات..

- کەیو بۆچی چویت؟

< لە هاوینی ١٩٧٣دا بۆ میهرەجانی لاوانو قوتابیان چوم.

هەندێ پرسیاری تری کردو دواییەکەیانی بەوە هێنایەوە:

- باشە لەگەڵ چەند ئافرەتدا ڕاتبوارد؟

< هیچ.

- درۆ دەکەیت!

< سوێندم بۆ خوارد کە بەڕاستیمە بەڵام ئەو ئەو ڕاستییەی بە ئەقڵدا نەدەچو. ناهەقیشی نەبو، چونکە زوربەی هەرە زۆری لاوو تازە پێگەیشتوەکان هەرکە باسی ئەوروپا بکرێت، یەکسەر ڕابواردن لەگەڵ ئافرەتو سێکسو ئەو جۆرە شتانە دێتە بیریان. خۆ زوربەی هەرە زۆری کوردەکانی هاوبەش لەو میهرەجانە، جگە لە، منو هەندێکی ترو بێگومان خوشکانو بایز تاڵەبانیو میرزا سدیق- کە لێپرسراوی یەکێتی لاوانی سلێمانی بوو، خۆشی پیاوێکی خواپەرست بوو لەگەڵ یەکدوانێکیتر ئیتر هەمویان ڕۆژانە هەرکە بەرنامەی ڤیستیڤاڵ تەواو دەبو، ئەوەی کچی دەست نەکەوتبو، وەك پەپولەی وێڵی ڕووناکیی، بەدوای کیژاندا دەگەڕا.

ڕۆژی بەجێهێشتنی بەرلینو گەڕانەوەمان بۆ وڵات، لەبەر خانووەکانماندا چاوەڕوانیی پاس- مان دەکرد تا بمانگەیەننە فڕۆکەخانە. کیژی هەندێ لە ئەندامانی وەفدەکەمان هاتبون بۆ خواحافیزییان. سەرنجمدا ژنو مێردێكو کچە عازەبەکەیان لەگەڵ چەند کەسێکدا وەستابون. کچە لەگەڵ یەکێکدا خەریکی ماچو موچ بون. هێندەی نەبرد یەکێکی تریان دەستی لە ملی ژنە کردو کەمێك خۆیان دوورخستەوەو کەوتنە لێوو ناودەم مژینی، ئەم وایدەزانیی مێردە ئاگاداری ئەو کەینو بەینە نییە، منیش لە سەرنجەکانیدا دەمزانی کە هۆشی لای ئەوانە.

ئەو دیمەنە نامۆیە پەستی کردمو بانگی برادەرەکەم کردەلاوەو گوتم:

< ئەرێ تۆ عەیب ناکەیت ئەوە مێردی هەیەو لەگەڵیشیدایەو بە بەرچاویشیەوە تۆ وا دەکەیت! زۆر زۆر ناشیرینە وا دەکەیت! دە هیچ نەبێت بیبەرە لاوە..!

بە پێکەنینەوە گوتی:

< دە مەحموی مەلا عززەت لێرەش وازمان لێناهێنیت، دەی حەیا قەترەیەکە کە تکا دەتکێو ئیتر هیچی تیا نامێنێت! هینەکەی من لێرە تکاوەو وازم لێ بهێنە... بەڵام باش بوو کە چووەوە لای ئافرەتەکە کارەکەی لەبەرچاوی پیاوەکە دووبارە نەکردەوە.

کە زیاتر سوربونم بۆ هاورێی عەسکەر نیشانداو بڕوای بە قسەکەم پەیدا کرد، ئەوسا هاتە پێشەوەو یەك بۆکسی کێشا بەتەوقی سەرمداو بەجنێوی پیسەوە گوتی:

- تۆ نوێژ ناکەیتو دەشچیتە ئەوروپا کەچی لەگەڵ کچاندا رانابوێریت!

دیارە لە خواردنەوەش دووریت! یانی لە هەمو لەزەتی ئەم دنیایە خۆت بێبەریی کردووە! ئەی باشە پێم ناڵێیت تۆ بەکەڵکی چیی دێیتو بۆچیی باشیت!

تۆ لەدنیاو لە قیامەت خۆت بێبەریی کردووە، بۆیە تۆ هەر بۆ ئێرە باشیت. رەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت وا لێرەدا خۆت دەبینیتەوە!

هەر لەو سەفەرەدا کە بەهۆی توشبونی دیزەنتیریی جۆری (ئەمیبا) رێگەم کەوتە خەستەخانە، سەرۆکی وەفدی پارتیی هات بۆ لام، ئەویش قسەیەکی لەو بابەتەی کردو بەپێکەنینەوە گوتی:

< ئەوە رەفیقەکانت هەر یەکە دوو کچیان لە باخەڵدایە، کەچی تۆ خۆت توشی ئەم خەستەخانەیە کردوە؟

لەناو ژانی بۆکسەکەوە گوتم من ژنو منداڵم هەیە.. بە پەنجە ئیشارەتێکی بۆ کردم کە بچمەوە ژورێو گوتی:

- مادام تۆ خۆت لە دنیاو لە قیامەتیش بێبەریی کردوە دیارە حەزت لەم جۆرە شوێنانەیە، بۆیە دەبێت لێرەشدا سەربنێیتەوە.

کە چومە سەر جێگەکەمو لێی درێژ بوم، شوێنی بۆکسەکە ورو بێ ئارامی کردم.. هەوڵمدا لەناو بیرەوەرییەکانی ئەو ڤیستیڤاڵەو دیمەنە جۆراوجۆرەکانی تر خۆم خەریك بکەم تا ئەو ئازارەو ئەو پرسیارو وەڵامە ئازار دەرانە لەبیر خۆم ببەمەوە..

## مزگێنی فریشتەی سەوز
## یان پەیامی دایکێتی:

ئەو کەمە خاوێنییەی دوای شەش مانگ جۆرە ئارامییەکی بەمێشکم پەیدا کرد، لەگەڵیشیدا بیجامەی تازەیان بۆ هێناینو لەبەرمان کرد، بەڵام سەرچاوەی شارە ئەسپێ لە بەتانییەکەوە بوو، جلە چڵکنو پڵکنەکانیان سوتاند، کەچی بەتانییەکان هێڵرانەوە، واتە سەرچاوەی بەڵاکە هەر لەجێگەی خۆی بوو. بەهەر حاڵ، ماوەیەك، با کورتیش بێت، ئەم حەوانەوەیەم بە نسیب بووە.

بۆ شەوەکەی نەمزانی چۆن خەوم لێکەوت. خەو بینینی ناو ئەو شوێنە دەگمەن بو. ئەو شەوە بۆ من سێیەم دیاردەی لەو بابەتەی بە چاوەوە بو:

وا دەهاتە بەرچاوم کە ئەو ساتە ئازاد بومو خۆم لەسەر شەقامی نالی دەبینییەوە. سەرم لەخۆم سورمابوو کە چۆن ئەو کاتە ئازاد کراومو وا زوو نزیك ماڵەوە بوومەتەوە.

دنیا تاریکەو لەسەر خۆ بە شەقامەکەدا هەنگاو بەرەو ماڵەوە دەنێم. بەهۆی روناکیی گڵۆپەکانی سەرشەقامەکە هەر لە دورەوە (ئاسکۆڵی) دایکمم بەدی کرد. لەسەر شۆستەی بەر دوکانەکانی خانوەکەمان کە کەوتۆتە سەر سوچی شەقامی نالی - بابان لەسەر کارێزی دایکی پاشا، بە چیچکاننەوە پاڵی بە یەکێك لەدەرابەی دوکانەکانەوە داوە.

کە نزیکی بومەوە سەرنجم دا بەماتو مەلولییەکی روخسار غەمگینەوە بیجامەیەکی تازەی سەوزی بە دەستەوەیە، گوتم:

< دایە گیان ئەوە بۆچی بەم ئێوارە درەنگ وەختەو بەم تاریکییە لێرەدا دانیشتویت؟

زۆر لەسەر خۆو بەهێمنییە خۆ ئاساییەکەیەوە، لەناو خەمو پەژارەیەکی لە وێنە نەبوی پڕ لە سۆزی دایکێتییەوە گوتی:

< ئەوە بە قوربانت بم بۆچی وا دواکەوتیت خۆ دەبو زۆر زوتر بهاتیتایەوە..؟ من دەمێکە لێرەدا دانیشتومو چاوەڕوانی هاتنەوەی تۆ دەکەم.

< ئەی ئەو بیجامەیە چییە؟

< ئەوە بۆ تۆم کڕیوە، تۆ بەبێ جلوبەرگ فڕێنرایتو گوتم ئێستا جلی بە بەرەوە نەماوە..

< ئەی بۆچیی سەوزت هەڵبژاردووە؟

< ئەی کوڕەکم نازانیت ئێمە سەیدزادە و نەوەی شێخانی بەرزنجەین! ئەی ڕەنگی سەوزیش مانای ژیانو زیندویی نییە؟

خەمو ماتییەکەی وا ئاشکراو هەستپێکراو بو، هەر دەتگوت سەرپۆشێکەو روخساری داپۆشیوە، تەنانەت هاتنەوەو بینینەکەی منیش لە تەمومژی ئەو پەژارەیەی ناو ئەو دیدارەی کەم نەکردەوە.

ئینجا هەڵسایە سەرپێو دەستم درێژ کرد تا تێر لەناو بۆنی سمڵو مێخەکی ملی ئەملاو ئەولای ماچ بکەمو پڕ بە سییەکانم خۆم مەستی ئەو بۆنو بەرامە تێکەڵبووە بەسۆزی خۆشەویستیی دایکێتیی بکەمو لەناو هەستی تازە گەشاوەی بەردەم ئەو ساتانە کە، وام دەزانیی دەیان ساڵە لێی دورخراومەتەوەو لەو بینینەوەیەدا تاسەی ئەو دورییە دەشکێنمو خونچەی تازە گەشبوەوەی ئەو دیدارە بە فرمێسکی گەرمی چاوانمو هەناسەی پڕ لە حەسرەتی دووریی ئاو دەدەم.

بەڵام وەك هەمو بەیانییەك زرمەی شەق لە دەرگاکەو فەرمانی "ئاوەکە بکەرەوە" رایپەڕاندمو لەو ئاواتەی ناو ئەو خەوەش بێبەشیان کردم. لەبەر خۆشمەوە دەمگوت: دەك خوا غەزەبتان لێبگرێت هەی دڕندەکانی ناو ئەشکەوتی هەیئە، ئاخر نەدەکرا کەمێکی تر بووەستانایە تا ئەو دیدەنییە بەهەشتییە کەمێك درێژەی بکێشایەو، ترپەو خورپەی دڵە بچوکبوەوەکەی دایکم، کە تەنها جێگەی وێنەی منی تیا ماوەتەوە، ئارام ببوایەتەوە، منیش بمزانییایە ئەو فریشتەیە لەناو ئەو سۆزی دایکێتییەوە چی مزگێنییەکی سەوزو چیی پەیامێکی دایکێتیی تری پێیە..!

هەرچەندە ئەو خەوە تروسکایی ئاواتی لێوە دەردەکەوتو لەدڵو دەرونی مندا دەیچەسپاند، بەڵام ئەو دیمەنە پڕ لە پەستییو خەمناکەی دایکم، پەژارەیەکی زۆری لەناو سینەمدا جێگیر کرد. ترسیی ئەوەشم لێدەنیشت کە بەو نائومێدییەوە سەر بنێتەوەو جارێکی تر نەیبینمەوە. بەتایبەتیی ئەو لە ژیانیدا بۆ منو بەهۆی منەوە ئیسراحەتی نەبینی. شەیدای ئەو رۆژە بو کە ببیستێ من وازم لە سیاسەت هێناوەو ئیتر لەگەڵ ماڵو منداڵمدا هەمیشە لەبەرچاوی دەبمو جارێکی تر لەچاو ون نابمەوە. ئەو نەیدەویست لەمن تێبگات کە: تازە بۆ منو بۆ هیچ کوردێکی هوشیارو ناهوشیار، خەباتو سیاسیەت نەکردن مانای سەلامەتیی نییە، سیاسەت بکرێ یان نەکرێ وەك یەك وایە، چونکە دوژمنەکە ناگۆڕێ، بیرو ئەقڵ ئامانجو تێگەیشتەو

کولتوری هەروەك خۆیان بەبێ گۆڕران ماونەتەوەو هەر بەو پێیەش مامەڵەی مرۆڤی کورد دەکەن..

**نابینابیەکی قەڵادزێ پاڵەوانێکی تری بەردەم ئەشکەنجەیە**

ڕۆژێك کوڕێکیان هێنا بۆ حەوشەی ناوەڕاست، دیارە بەچاو بەستراویی، پشتاو پشت هەردو دەستیان بەدەوری عەمودەکەی بەرامبەر ژورەکەم بەستەوە، لەگەڵ هەڕەشەو سۆندەو جنێو دابارین بەسەریدا، دەستیان کرد بەپرسیارکردن، لە زرمەی لێدانەکانو ئەو پرسیارانەی لێیان دەکرد، حەمە قەڵادزێی ڕاپەڕییە سەرپێو لە سوچی پەنجەرەکەوە دەستی کرد بە سەرەتاتکێو سەیرکردن، ئینجا هاتەوە لای من گوتی:

- مامۆستا وەرە سەیرێکی ئەو کوڕە بکە.

< کوڕی چیی؟ کێیە؟

- ئەو کوڕە قەڵادزێییە، کوێرە، کوڕێکی زۆر باشە، تێکۆشەرێکی خۆگرە.. ئیتر گەلێ قسەی لەو بابەتانەی کرد. گوتم:

باشە ئەگەر کوێرە چۆن چاوی دەبەستنەوە، تۆ چۆن دەزانیت ئەوە کوێرەو باشو تێکۆشەریشە؟ تۆ چۆن دەزانیت ئەوە خۆگرە..؟ دیارە دەیناسیت؟ بەڵێ بەڵێ، دەیناسم بۆیە وا دەڵێم. باشە چۆن دەیناسیت؟ دەیناسم. بەچی بۆنەیەکەوە؟ ئەوە حیکایەتێکی دورو درێژە.

تا توانییان بەسۆندە لێیاندا، داوایان لێدەکرد کە ئیعتیراف بکە. دیاربو پەکیان خستبو. ماوەیەك لەگەڵی خەریك بون سودی نەبو. دوای لێدانو ئاوپیاکردنی چوار پێنج سەعاتیی، یەك وشەی لەدەم نەهاتەدەرێ، ئاخو ئۆفێکیشی بۆ نەکرد کردیانەوە و بردیان بۆ شوێنی ئەشکەنجەو هەڵواسین. دوای ئەوە دەنگو باسی ئەو زیندانییەم نەبیستەوە.. من گومانم لەوە هەبو بتوانن قسەی لێ وەربگرن.. چونکە ئەو نابینایە لەناو ئەو هەمو لێدانو ئاو پیاکردنو هەڕەشەو گوڕەشەیەدا ئاهێکیشم لێ نەبیست، ئەوە زیاتر جەللادەکانی تورە کردبو، ئارەقی شینو مۆریان دەکردەوە، هیلاك دەبون، ئەو کوڕە وەك کێوە ڕەش لەبەردەمیاندا نەدەچەمایەوە، تا نەیانکردەوەو نەیانبرد، وامدەزانیی لەسەرخۆی چووە..

من بێگومان بوم لەوە کە قسەکانی حەمە گەلێ نهێنیی تێدا حەشاردراوە. لەوەش نەدەگەیشتم بۆچی هێنایانە بەر لوتی ئێمەو ئەشکەنجەیان دەدا! ناسینەوەکەشی مەتەڵێك بو بۆمن حەل نەدەکرا. سەرە داوێکیشی نەدا بەدەستەوە..

خۆزگە بمزانیبایە چارەنوسیی بەچیی دەگات!

ویستم لەناو ئەو باس‌و خواسانەی خۆی پێی خۆشەو حەزی پێدەکات، زۆر تر قسە بکات تا بگەڕێمەوە سەر ئەو نابینایە. لە معەممەدم پرسیی:

< ئەرێ تۆ چەند جار لەگەڵ کیژانی ڕەدو کەوتودا ژیاویت؟

- من کچی خۆمم هەبو، خۆشم دەویست، پێویستم بە ڕەدوکەوتنی کچی‌تر نەبو..

< خۆشەویستەکەت لە ئۆردوگا بو؟

- بەڵێ لە ئۆردوگادا بو.

< دەی چۆن لەو شوێنەدا کە دەرگا بەدەرگاوەو ڕوبەڕووەوەیە، دەتتوانیی بچیتە لای‌و بیرەش بخۆیتەوەو راببوێریت..؟

- مامۆستا ئەوە تۆ دەڵێیت چیی! کێ بەکێ بو، کەس ئاگاداری کەس نەبو. تەنانەت لەناو خێزانیشدا.

< کوڕە وا مەڵێ، چۆن یەکجار دنیاکە وا شێواوە..

- خۆ ناڵێم هەر هەموو وابون.. نا نا بەڵام زۆر هەبون کە بەو جۆرە لەگەڵ ژیان‌و نان پەیداکردن خەریك بون.

< دیارە کە فەلاحەت‌و ئەرزو ئاوو کاسبیی نەما، ئیتر نان بەچیی‌و لەکوێ پەیدا دەکرێت!؟

< ئەرێ ئەو نابینا قەڵادزەییە خزمتە؟

- نەوەڵڵا خزمی چیی..

< ئەی هاوڕێت بووە؟

- نا هەر دوور بە دوور دەیناسم.

< ئەی چۆن ئەو هەموو زانیارییەت لەسەری هەیە؟

- ئەوە چیرۆکێکی دوورو درێژە، ئێرە جێگەی باسکردنی نییە! ئەگەر زەمانە لە دەری هەیئە یەکی پێگرتینەوە، ئەودەمە درێژەکەیت بۆ باسدەکەم.

**ئامرازی دەوری بەرد روخساری شارستانێتی بەعسە:**

پیس‌و پۆخڵی‌و جل نەشتن‌و لێدان‌و ئەشکەنجە، جلی زۆر لە زیندانییەکانی رزیوو دادڕاو کردبو.. یەکێك لەو ئامرازانەی لەوێدا پێویستیی خوڵقاندبوی، بۆ پینەو پەڕۆکردنی جلی دڕاو یان راستتر درونەوەیان.. لە ئێسقان دەرزی دروستکردن بو. هەڵبژاردنی ئێسقانی گونجاوی ناو شلەی بەسەر برنج کراودا هەڵدەگیرا تا ئامرازێکی درونەوەی لێ دروست بکەن. ئەوەش بە سونەوەی ئێسقانەکە لەسەر کۆنکرێتی ئەرزی ژورەکە، تا وای لێدەهات وەك نیمچە سوژن یان درەوشێکی لێدەکرا. لەگەڵ تاڵە بەنەکانی بەتانییە شڕەکان کارەکەیان پێ مەیسەر دەکردو ئیتر دەلاقە گەورەکانی جلە شڕەکانیان پێکەوە دەنوساند.

بەو جۆرە پێویستیی لەناو ئەو زیندانەدا، ئامرازە کۆنەکانی بەرگ درونی بوژاندەوە. ئەو شەوەی بردمیان بۆ ژوری ژمارە هەشت، دانەیەکیان لەو درەوشە لە ئێسقان دروستکراوە دامێ. بەهۆی ئەوەوە توانیم جۆرێ لە پینەوپەڕۆی ئەو جلە شڕانەی بەرم کە تا پێش ئەم حەمام و بیجامە نوێیانە لە بەرمدا مابوو، بکەم کە لە راستیدا هەر ناویان جل بو ئەگینا هەر لەجل نەدەچون.. ئیتر زیندانییەکان سودێکی باشیان لە ئەزمونەکانی دەوری بەرد وەرگرت کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا لە زیندانەکانی بەعسیدا پێویستیی‌و ناچاریی دەیانژییەنێتەوە..

ئەو پیس‌و پۆخڵی‌و گوزەرانە نامۆیە بەژیانی مرۆڤ، نەخۆشیەکەی پێستی زیاتر دەکرد.. سودی حەمامە گەرمەکەش هەرچەند رۆژێك، دەوامی کرد، چونکە بەتەنهاو بێ کاری تەواوکەری تر دەورێکی بەسنورو کورت خایەنی دەبینی، چونکە مەڵبەندو هەلومەرجی زۆربونیان وەك خۆیان مانەوە..

دوای نیوەڕۆی رۆژی ٢٠- ٤ بو کە لەناکاو ناوی دوو سێ کەس لە تاقمەکەی ئێمە خوێندرایەوە، ناوەکان لەسەر هەمان زنجیرەی گرتن‌و رەوانە کردنمان بۆ هەیئەو سەرەتای لێکۆڵینەوە مان لەژوری ژمارە یەك بو، کە کەس دەنگی لێ بەرز نەبووەوە، ئەوسا یەکێکیان هاواری کرد: لەژوری سێ‌و چوارن. ماوەیەکی باش گوێم هەڵخست هیچ دەنگێکی ئەشکەنجەو هاوار بەرز نەبووەوە. من لەوە نەدەگەییشتم.

بۆ سبەینێ بەردەوام دوو دوو سێ سێ بانگ دەکران. بۆ نیوەڕۆ کە خواردنیان هێنا یەکێك قاپە چێشتەکەی دایە دەستم، پەنجە گەورەی نیشاندام. ئیتر زانیم کە ئیفادە وەرگرتن‌و پەنجەمۆرکردنی کۆمەڵەکەی ئێمە دەستی پێکردوە، ئەوەشم زانی کە باز بەسەر ناوەکەی مندا دراوە. ناوبەناو لەژوری یەکیشەوە برادەرەکانم بانگ دەکران. دوای دو رۆژ چاوەڕوانی‌و تاووتوێکردنی بیرە کۆنەکان لە مەڕ جیاکردنەوەی من لەوانی تر، گریمانی جیاکردنەوەو مانەوەم، پەژارەیەکی زۆر تریان لاخوڵقاندم. نائومێدیی باڵی بەسەرما کێشا. نەمدەزانیی کاتەکان چۆن تێدەپەڕین.

نزیك دوای نیوەڕۆی سێیەم رۆژی لێکۆڵینەوەی گروپەکەمان، دەرگاکە کرایەوە، حەرەسەکە سەیرێکی کردم، ناوەکەمی پرسیی، وەڵامم دایەوە. کەمێ راوەستاو ئینجا دەرگاکەی داخستەوەو لێیدا رۆیشت. ئەوە کەمەکێ دڵمی خۆش کرد، چونکە سوچێکی مەترسییەکەمی لەجیاکردنەوە رەواندەوەو خۆم بۆ بانگکردن ئامادە کرد. ئەو رۆژە تا درەنگانێکیش چاوەڕوان بوم بێسود بو.

بۆ بەیانی دوای نان خواردن کەوتمەوە چاوەڕوانیی. وا دیاربو لە کۆمەڵەکەی ئێمە کەس نەماوەو هەمو بانگکراون‌و پەنجەمۆریشیان پێکرابێت، چونکە هیچ شتێکی نوێ نابیستم.

نانی نیوەڕۆ خورا دەنگ نییە. نەخێر بێئومێد مامەوەو کەوتمەوە سەر بۆچونەکانمو بەخۆم دەگوت: مەزەنەکانم بەرەو راستیی دەچن، ئەی ئەو هەموو لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجانە، ئەو هەمو تاوان دانە پاڵو خوێندنەوەی رابوردووانە، ئەم تاك زیندانییە تاقەت بەرەی بووە بە شەش مانگو یەك هەفتە، ئەو هەموو سیخوڕ هێنانە، ئەو ئەشکەنجە دەرونیانەو هەڕەشەی بوتڵو کوشتنو ماڵو منداڵ هێنان.. ئەوانە بێ نەخشەو لەخۆوە نەبوون! بۆیە ئێستا هەمو گریمانێکی خراپتر لەبەردەمدایەو دەبێت چاوەڕوانی بکەم.

ئەوە چوار دانە رۆژە من لەناو ئەم چاوەڕوانییە کوشندەیەی ناو ئەم بانگکردنەدا دەژیم. هەر ساتێکی دەقیقەیەكو هەر دەقیقەیەکی سەعاتێكو هەر سەعاتەی وەك رۆژێك لێم دەڕۆن. لە بەردەم ئەو نائومێدییەداو لەناو ئەو رەشبینییەدا کەوتمە سەرنجدانو گوێگرتن لەهەمو قسەو جوڵەیەك تا بزانم کەی هاوڕێکانم دەبەن..

لە رۆژی چوارەمی دەستکردن بە لێکۆڵینەوە لە گروپەکەی ئێمە بۆ پەنجەمۆرکردن، دوای نانی بەیانی بە ماوەیەك دەرگاکەیان کردەوە. بانگیان کردمو چاویان بەستمەوەو بەدوای حەرەسەکەدا کێشکرام، تا وەستاندمیان. هەروەك یەکەم جاری یەکەم لێکۆڵینەوە، لێکۆڵەر کەوتە قسەو گوتی:

- ئەزانی تۆمان بۆچی بانگکردووە؟

< نەخێر نازانم.

- ئەوە ماوەیەکی زۆرە بووارمان داویت تا بیربکەیتەوەو ئەوسا وەڵامی پرسیارەکانمان بدەیتەوە. دیارە دەزانیت چیمان لەتۆ دەوێت؟

< بەڵێ دەزانمو منیش وەڵامی هەمو پرسیارەکانم داوەتەوەو گوتومە ئاگاداری هیچ شتێك نیمو لەوەز زیاتر غەدرم لێ مەکەن.

- تۆ بێتاوان نەگەیشتویتە ئێرە، بێتاوان نەهێنراویتە هەیئە، ئەو قسانەی تا ئێستا کردوتن لای ئێمە بەیەك پولی قەڵب ناکڕێن؟

< بەڵێ بێتاوان گیراومو غەدرێکی زۆر گەورەشم لێکراوە.

- گوایا تۆ بێتاوانیتو بەغەدر تۆمان بۆ ئێرە هێناوە؟

< باشە ئەگەر بەڵگەیەکتان لەسەر من هەیە فەرمون چیم لێدەکەن بیکەن، فەرمون بمکوژن. ئیتر گوناهتان دەگات وا دەکەن، گوناهتان دەگات لەماڵو منداڵی خۆمتان کردوم. کێ بەرپرسیارە لە پێنج منداڵی ورد کە بەو جۆرە بێ باوکیان بکەن. لەو قسانە تەواو بوم، ئیتر گوێم لە هیچ دەنگو سەنگێك نەما. تا دەنگی رەئیسی هەیئە ماتییەکەی نەهێشت. هەروەك ئاگاداری هیچ نەبوبێت گوتی:

- ئەوە مەحمود مەلا عززەتە.. لەوە دەچێت تا ئێستا هیچیی نەگوتبێت؟ دەنگەکە زیاتر هاتە پێشێ‌و بەردەوام بو:

با ئەمجارە لەشوێنێکی ترو لە پرسیاری ترەوە دەست پێ بکەینەوە:

- تۆ ماوەیەکی زۆر کادیری پێشکەوتو بویت؟ لە قوتابیان‌و مامۆستایانیشدا دەوری لێپرسراوەتیت هەبووە، ئەوانە کێ بون کە لەگەڵتا لە سکرتاریەت کاریان دەکرد؟ گوتم بڕوا بکەن هیچم بیر نەماوە. گوتی ئەمەش هەر بە ئیعتیرافکردن دادەنێیت؟ قسە نەکەیت دەستبەردارت نابین، تۆ لەو هەمو رێکخراوانەدا کارت کردووە قابیلە چەند ناوێکیشت لەبیر نەما بێت؟ ئەگەر هێندە زەین کوێر بیت ئەی چۆن دەرسی مێژوو دەڵێیتەوە. باشە:

- لە حەفتاو چواردا کێ لێپرسراوی کوشتن بو؟

< نایزانم‌و من ئاگاداری ئەو جۆرە کارانە نەبوم. لەگەڵ هەڵرشتنی جنێوی بێلەزەت گوتی:

- کەڵکی نییە، ئەو ئەم پرسیارانەی کە خۆمان وەڵامەکانی زۆر باش دەزانین‌و لای کەسیش شارراوە نین، ئێستاش هیچ سودێکیان نەماوە، کەچی خۆشی لەقەرەی وەڵامەکانیان نادات. تەنانەت باسکردنی ئەوانەش بە ئیعتیراف دادەنێت. باشە لێپرسراوی پاراستن کە نەخشەی کوشتن‌و کاری تێکدەرانەی دادەناو ئەنجامی دەدا، لە لقدا نەبوو؟ ئیتر چۆن دەڵێیت نازانم.

< راستە لێپرسراوی پاراستن ئەندامی لق بو، تۆ دەڵێیت لێپرسراوی کوشتن؟ ئێمە وەك ئەندامی لق‌و وەك هەموو ئەندامەکانی تر یەکترمان ناسیوە، وەك کارو ئەرکەکانی لق ئاگاداری یەکتریی بوین، ئەندامانی لق هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بە کاروباری پاراستن‌و پێشمەرگەو ئەو جۆرە دەزگایانەی ترەوە نەبووە.

- ئەی کێ بەو کارانە هەڵدەستا.

< نازانم ئاگاداری ئەو کارانە نەبوم، لە کۆبونەوەشدا ئەو جۆرە باسانە نەدەکران. ئەو دەزگایە وا نهێنی کرابوو کە هەر لە سنوری خۆیدا کارەکانی ئەنجام دەدا بێ ئەوەی کەسی تر ئاگاداری بێت..

- ئەی خۆت چی جۆرە پەیوەندیەکت لەگەڵ پاراستندا هەبوو؟

< هیچ جۆرە پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەو رێکخستنەدا نەبوو، ئەگەر سادەترین پەیوەندییم هەبوایە، وا کاتی خۆی بیرم لە گەڕانەوە بۆ عێراق نەدەکردەوە، چونکە بۆ خۆم دەمزانیی کە ئێوە چەند دژ بەو دەزگایە بوون، من خۆم ئەو جۆرە دەزگا جاسوسییانەم خۆش ناوێت!

- ئەوە دەڵێیت چیی؟

< هیچم نەگوتووە، ئەی خۆشتان بەوپەڕی تواناتانەوە لەدژی پاراستن نەبوون؟ بەهۆی ئەندامی لقەوە، نزیکی حەمە رەحیم لە من، بڕواو متمانەی بە من تا ئەو ئاستە بوو کە لای من قسەی بە بارزانیش دەگوت و دەیوت: قابیلە نەزانین دوای سەرەك خێڵێك بکەوین، ئێمە بۆ ئەم پلەیە ئەو بە سەرۆك دادەنێین، لای حەمە شوناسنامەی خۆی وەك کاژێك دەرخستبو.. بۆیە کە لە لێپرسراوەتی پاراستنی سلێمانی لایان برد، دەیگوت یەکێك لە هۆیەکان تۆبویت، بە تایبەتی دەزگا تۆیان خۆش ناوێت.

ئەم پرسیارو هەڕەشانە بۆ پەنجەمۆر کردن نییە، خۆ برادەرەکانم لەو پەنجەمۆرکردنانەدا، بەم جۆرەیان لەگەڵدا نەکراوە؟

لە قاموسی بەعسدا بۆ کورد خەوبینینیش قەدەغەیە!

- ئەی بۆ لەگەڵ جەماعەتی بارزانیدا نەمایت؟

< من لە سیاسەت دوورکەوتمەوەو پەیوەندیم لەگەڵ هیچ کەسو لایەکدا نەما.

- لەگەڵ جەلال تاڵەبانیش پەیوەندیت نەما؟

< زۆر پێش ئەو سەردەمە.

- دیسان کەوتیتەوە درۆکردن، پەیام و ئیلهامی ئاسمانیشت بەدەستەوە بێت بڕوا بەو قسانەت ناکەین..

< ئیتر من هیچ گوناهێکم نییە کە ئێوە پێشەکیی بڕیارتان دابێت کە گوێ لە من نەگرن! بێ بەڵگە من تاوانبار بکەن!

- باشە تۆ پێم ناڵێیت (جەلال تاڵەبانی) چی دەوێت؟ کوردستانی سەربەخۆو دامەزراندنی دەوڵەت؟ بەکۆمەڵێ جنێوی پیسەوە لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو: ئەوانە خەون خەو، ئێمە خەوو بیرو رێکخستنەکەشی لە ریشە هەڵدەکێشینو نایەڵین ئەو پەتایە لە شیمالی عەزیزماندا بە خەویش رەگ دابکوتێت.. دەتانپرۆکێنینو نایەڵین دەرفەتی ئەوەشتان هەبێت کە بەخەویش ببینن! ئێستا ئێوە بونەتە کۆسپو سەریەشەو کێشەی کوشندە، بۆیە دەبێت لەرەگو ریشە هەڵتانبتەکێنین، نایەڵین خەویش بەدەوڵەتی کوردییەوە ببینن.

< گوتم ئەوە لەگەڵ خۆیدا باس بکەنو لەخۆی بپرسن! باشتر وایە ئەو مشتومڕو پرسیارانە هەر لەگەڵ خۆیدا بکەن! لە راستیشدا ئەوەندەی من لێی تێگەیشتبم، تا ئەو کاتەی پەیوەندییم پێوەی هەبوو، ئەو لە دژی جیابونەوەیە لە عێراق، دامەزراندنی دەوڵەتی کورد کەم و زۆر لە پرۆگرامیدا نییە، ئەو لەهەمو کەس زیاتر بۆ برایەتی کوردو عەرەب کاری دەکرد..

ئینجا ڕەئیسی هەیئە خوتبە دوو سێ دەقیقەییەکەی بەو جۆرە قسانەو بە توڕەبونێکی زۆرەوە تەواو کردو گوتی:

- ئاگاتان لێیە چیی دەڵێت؟ دەڵێت بچن لەگەڵ جەلالدا قسەبکەن! چاوتان لێیە چۆن قسە بۆ ئەو یاخیبووە دەکات، کە یاسای لێبوردنیش نایگرێتەوە ئەی ئیتر چۆن دەڵێیت من ئاگاداری هیچ نیم؟

< خۆ من وەڵامی قسەی خۆتانم داوەتەوە کە دەڵێن جەلال تاڵەبانی دەیەوێت دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنێت. منیش دەڵێم من لەوە بێ ئاگام ئەوە لەخۆی بپرسن، ئەوەش لە بەرنامەی ئەودا نییە!

- ئەمە خۆی بەڵگەیەکی چاوێنییە، ئەم دەڵێت بچنو وتووێژ لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا بکەن، ئیتر چیی بەڵگەیەك لەمە ڕوونو ئاشکراتر دەبێت؟ ئەمە دەری دەخات کە لێپرسراوەتییەکی خەتەرناکیشی هەیە! ئیتر ئێمە پێویستمان بەهیچ بەڵگەیەکی تر نییە!

دە بیبەن، ئەم شەیتانە نەعلەتییە بەرنو تەمێی بکەن، تا جارێکی تر دەمی گۆ نەکات، تا جارێکی تر گوێم لەم قسانەی نەبێتەوە.

کەمێ دوریان خستمەوەو فڕێیان دامە سەر زەوی هەردوو لاقمیان هەڵواسیو زرمو کوت دەستی پێکرد. پێیەکانم هێندە ناسك بونەتەوە کە زەبری لێدانەکان ژانیان دەگەیاندە ناو قوڵایی ئێسقانەکانو مۆخەکانیشیان دەهەژان. وام هەست دەکرد کە پێستەکە دەقڵیشێتەوەو دەگوررێت. هاوار هاوار سودی نەبوو.. هەستم دەکرد لەگەڵ لێدانەکاندا دەنگی هاوارەکانم بەرەو خەفەکردن دەچون تا وای لێدەهات کە خۆشم گوێم لەدەنگی خۆم نەبێت.. ئیتر هیچ وشیارییەکم لەسەر خۆم نەما.. تا وەختێك بەئاگاهاتم کارەبا دوابڕاوەکەیان بە قورگو مل و شوێنە هەستیارەکانی تردا دەهێنا. هەستم کرد دەجوڵێمەوە، توانای ئەوەم نەمابو کە بتوانم خۆم بگرمو جوڵە لەخۆم ببڕم.. بۆیە یەکێکیان بەسەرما نەڕاندیی: هەستە... کە گوێی خۆمم لێ کەڕ کرد، ئینجا کەوتنە لەقە هاویشتن.. یەکێکیان لە سەرمی سرەواند، هەر ئەوەندە ئاگاداربوم کە شەقەکە هاویژرا..

### دیسان ڕوداوەکەی زانکۆی موستەنسیرییە

کاتێك بەئاگاهاتم لەسەر جێگەکەم کەوتوم، ئازارو هیلاکیی ئەشکەنجەو تینوێتیو ئارەق ڕشتنی شەکەتبون وریایان کردمەوەو کەوتمە جوڵە، کە سەرنجی دەوروپشتی خۆمم دا محەممەد بەدیارمەوەیە! گوتی:

- چۆنیت؟ ئەرێ ئەم بێویژدانانە بۆچی وا دەکەن! ئەمانە کافرن دەك دەستی ئەوانە خۆشبێت کە لێیان دەکوژن، ئاخر مامۆستا کە من دەڵێم دەستی ئەوە خۆش بێت کە تەقاندنەوەکەی موستەنسرییەی ئەنجامدا، تۆ دەڵێیت نا.

ئەمجارەش خۆمم نەکرد بەخاوەنی وەڵام. لەدڵی خۆشمدا دەمگوت:

دەی هێشتا ئەوان باشترن لە نۆکەرێکی سوکو سەلیمی وەك تۆ. وا ئەوان دەزانن بۆچ لێرەدانو بۆچی بونەتە جەللاد، بەڵام تۆ لە پێناوی چیدا ترنجاویتە ئەم کونە ئەسپێیەو بویتە هاورێی مشكو پیسیو نەگبەتیی؟ دەتەوێت ئەم وەزعەم بەهەل وەربگریتو ڕەوانەی لای ئەو خێزانەم بکەیت، کە لەبەر ئەوەی کوڕێکیان بەو کارە تاوانبارکرد بەبێ لێپرسینەوەو دادگا، خێزانە سیانزدە کەسییەکە بەدایكو باوكو منداڵی وردیشەوە تەفرو توناکران! زۆر بێ شەرمانەش بەمانشێتی گەورەو وێنەوە، ئەو تاوانە لە ڕۆژنامەکەیاندا (الثورة) بڵاوکرایەوە.

ئەم تا ئێستا زللەیەکیشی لێ نەدراوە. ئەو جارانەی کە بانگیش دەکرا ماوەیەکی کورت دەیانهێشتەوەو بەساغیی دەیانهێنایەوە.. لە هەیئەش چەند ڕۆژێك بۆ ئەو جۆرە کەسو تاوانو لێکۆڵینەوەیە سەرو زیادی بوو.

زۆر جار ئەفسەرە لێکۆڵەرەکان زۆر گێلانە بەسەر ئەو شتانەدا تێدەپەڕین، چونکە ئەقڵو سەلیقەو زانستی لێکۆڵینەوەی ئەوان زیاتر لەناو ئەشکەنجەو زەبری لێدانو ئەو بارودۆخە پڕ لەهەلو مەرجە دژ بە ژیانەدایە. ئەوان هەر ئەوەیان دەوێت کە ئیعتیراف بە زیندانییەکان بکەن. چییان گەرەك بێت بەسەریاندا ساغ بکەنەوەو پەنجەمۆریان پێ بکەن.. بەتایبەتی هەر کەسێك بخرێتە بەردەستی ئەوانە، بە تاوانبارو بێ تاوانەوە، بە پێشمەرگەو تێکۆشەرو بەخەڵکی ئاساییو دوریش لە سیاسەتەوە، مۆری پیاو کوژو تاوانبارو دژ بە دەوڵەت و حوکمی بەعسی پێوە دەنێن! بۆ ئەوان ناوی کورد بەسە بۆ تاوانبارکردن، چونکە خۆیان تاوانەکانی تریان لا ئامادەیە، چۆنیان بوێت هەروا بەزیندادنییەکانەوە دەیانلکێنن.

مانەوەی ئەم سیخوڕە نەخوێندەوارە زۆری خایاند، دیارە کاریان پێی ماوە. پێدەچێت تاوانبارکردنی قەبە بۆ حوکمی لە سێدارەدان، گەیشتۆتە ڕێگەیەکی داخراو. بۆیە دەیانەوێت، هیچ نەبێت شتێکی بچوك بدۆزنەوە تا بیخەنە قاڵبی یاساکەی خۆیانەوەو هیچ نەبێت چەند ساڵێك زیندانیم بکەن.

هەر لەبەر ئەوەشە پاش ئەو هەموو ماوەیە لەسەر ئەشکەنجە بەردەوامنو درێژەش بەکارەکەی محەممەد دەدەن.

پەنجە مۆرنەکردن نیشانەیەکی ئەوەن، ئەگینا برادەرەکانم هەموو پەنجە مۆریان پێکراوەو چاوەڕووانی ئازادبوون دەکەن، لەوە دەچێت هەر من مابم، بڕواشم وایە مەحمود قەراخیش لەدەستیان دەرناچێت، کێ دەڵێت ئەوانەی بەر ئەشکەنجەی قورس کەوتون سەرفراز دەبن! ئەی عامر نەیدەگوت ئەو مەحمود قەرەداخییەش دەکوژین!

باشە تۆ بڵێیت ئەمانە هەر بۆ تۆڵەسەندن بن، وا تا ئێستاش لەسەر ئەشکەنجەدانم بەردەوامن!؟ باشە ئەوە بۆ پەنجەمۆرکردنە!؟ ئەگەر ئەم بانگکردنانەم بۆ ئەوەش بێت، بۆچیی بۆ من دەبێت وابێت؟ بڕوام نییە ئەشکەنجەی کەسێکی تری کۆمەڵەکەی ئێمەیان دابێت جگە لە مەحمود قەراخیو حەمە سەعیدی فەقێورەحمان، کە بە بانگکردنیانو هاواری ژێر ئەشکەنجەدا وای بۆ دەچوم کە ئەوان بنو ئەشکەنجە دەدرێن. خۆ بیرەکانیشم هێندە ئاڵۆز بوون کە بەتەواوی نەمدەزانیی کێ بەر ئەشکەنجەی پەنجەمۆرکردن کەوتووەو کێ بەرنەکەوتووە، کێ بانگکراوەو کێ بانگنەکراوە. بەتایبەتیی ئاگاداری بانگکردنی زۆریان نەبووم!

ئەگەر دۆخەکەش وا گوزەر بکات وا دەبێت من جیاکرابمەوەو ئیتر لەگەڵ ئەواندا نەمابم. ئەوان بەرەو ئازادکردنو منیش تازە دوای شەش مانگ پێدا دەچنەوە! وایان لێکردووم کە تەنانەت بۆ سەر ئاودەستیش نەچومەتە دەرەوە.. بە پێوە خۆم ناگرم.. لەشم هەموی کزەکزی لێوە دێت، بنی پێیەکانیشم وا شینو مۆر هەڵگەڕاون هەروەك وردیلە بۆرییەکانی خوێن هەموی تەقی بن.

جارێکی تر هاتنەوە بەدوامدا، جار جارە دڵم بەم بانگکردنانە خۆش دەبێت! چونکە وای لێکدەدەمەوە کە لەوانەیە بۆ ئیفادەو پەنجەمۆر کردن بێت. لەناو زیڕو هوڕو هاوار هاواری ئەشکەنجە دراوەکاندا دانرام. بەدەنگو لێدانەکاندا ئەوان لەناو شەکەتبونی زەبری ئەشکەنجەدا، هەروەك نیمچە پساوو ئاگا لە خۆ نەمانیان لێهاتوە. ئەوسا بێدەنگیو خامۆشیی باڵیان بەسەر ناوچەکەدا کێشا. پاش ماوەیەك دەنگێك بەرز بووەوەو گوتی:

- قسە دەکەیت یان تا مردن هەڵبواسرێیت؟ ئێستا کاتی دوابڕیارو دوا قسەو دوا ئیفادەتە، ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە کە چارەنوسی تۆی تێدا بڕیار دەدرێت!

< من قسەی خۆمم کردووە، دیارە ئێوە بەهیچ شتێك بڕواتان نییە، بۆیە گوێ لەکەس ناگرن.. دەی باشە بۆ نامکوژن.. یەکێکیان گوتی:

- دە باشە ناوی ئەندامانی لقی جەلالییەکانمان پێ بڵێ تا وازت لێ بهێنین. ئەوەش بزانە ئەوە لیستەی ناوەکانە، حەزدەکەیت ئێمە بۆت دەخوێنینەوە. گوتم:

< باشە لقی جەلالیی کەی لەئارادا ماوە؟ کەواتە راست دەکەم کە ئێوە تۆڵە لە من دەکەنەوە، ئەگەر خۆتان لیستەکەتان لا هەیە ئیتر قسەو باسی منتان بۆ چییەو بۆچی ئەم نەهامەتییە بەسەر مندا دەهێنن! دە باشە ناوەکانم بۆ بخوێننەوە تا بزانم کەسیان دەناسمەوە!

هەر کە ئەوەم لەدەم هاتە دەرەوە بەسۆندە کەوتنەوە گیانم، تا توانییان لێیاندام، ئەوسا زۆریان لێکردم کە هەستمە سەرپێ.. هەوڵمدا بەڵام بێسود بو. راستەوخۆ

دوای ئەوە دەنگی رەئیسی هەیئە هاتە گوێمو گوتی: وازی لێبێنن با بە دانیشتنەوە پرسیارەکانی لێبکەینەوە:

- باشە من بەشەرەفت سوێندت دەدەم، لە کەیەوە ئاگاداری نەوشیروان نیتو نامەی بۆ نەناردویت یان نامەت بۆ نەناردوە؟

< من هەرچییەکم گوتووەو هەرچییەك بڵێم چۆن تا ئێستا بڕواتان بەقسەکانی من نەکردووە، تەنها یەك وشەشتان لێوەرنەگرتوم، دەی ئێستاش هەرچییەك بڵێم هەر بڕوام پێ ناکەن..

- نا نا وانییە تۆ بەچیت بڕوایە سوێندت بۆ دەخۆین ئەگەر راستییەکەمان پێ بڵێیت، ئێمە بەبێ وەستان راستەوخۆ ئازادت دەکەینو سبەینێ ئەم کاتانە لەماڵی خۆتدا لەناو ماڵو منداڵتدا دەبیت.

لەناو پشوییەکی کورت بۆ قسەکردن، بەخۆمم دەگوت: ئەم جۆرە پرسیارو بەڵێنانە لەنائومێدییانەوە هەڵدەقوڵێت. ئەوە بەشێکە لەبێ ئەقڵییان، ئەگینا ئەوە شەش مانگو یەك هەفتەیە ئەشکەنجەو ئازارو خوێنو فرمێسك بونەتە هاورێم، جا ئەگەر تا ئێستا قسەم نەکردبێت، ئەی تازە چۆن بەدوو قسەی نائاسایی، و لەم کۆتاییەشدا کە ناوبەناو تیشکی سەوز دەردەکەوێت، قسەم پێ دەکەن..

< لەوەتەی ئێوە لێکۆڵینەوەم بە ئەشکەنجەوە لەگەڵ دەکەن، یەك قسەی منتان گوێ لێ نەگرتووە، ئەوەی ناوی رەحمو بەزەیی بێت بەرامبەر بە من نەتانبووە، وەك مودەریسێك رێزی پیرۆزیی یاسای قوتابخانەو زانستو زانیاریو خزمەتی دەیان نەوەی رۆڵەکانی ئەم میللەتە نەگیراوەو گوێتان لە من نەگرتووە، بۆیە هەرچییەك بڵێم لای ئێوە درۆیە. بڕوام وایە ئێستاکە خۆشتان باش دەزانن کە بەبێ تاوان گیراومو بێ هۆ واتان لە من کردووە.

کشو ماتییەکی لەپڕ ئەو ناوەی گرتەوە. سەیرە تەنانەت دەنگی هاتوچۆش نابیستم. لە چاوەڕوانییەکی تاقەتبەردام. وا دیارە چۆلەکە بەکوژیش لەو ناوە نەماوە.. ئەم پەردەیەیان دەبێت چیی بێتو چیی بەدوادا بێت!!

تەپە تەپی پێو هاتوچۆ دەستی پێکردەوە.. سەرومڵو پشتم تەواو چەماونەتەوە. زۆر بەنەرمیو لەسەرخۆ رەئیسی هەیئە گوتی:

- باشە ئوستاز مەحمود تۆ دەڵێیت پەیوەندیم بە جەلال تاڵەبانییەوە نییە، پەیوەندیت بە نەوشیروانەوە نییە، نە کۆمەڵەیتو نەیەکێتی، لەکوێو لە تازە ناوی تەنها یەك کەسیشت نەداوینەتێ کە کارت لەگەڵ کردون، تەنانەت هی ماوەیەك کە هاوکاریتان لەگەڵ ئێمەدا کردووەو هەمو ناوەکان بۆ ئێمەو لای ئێمە شارراوەنینو دەیانناسین، لەگەڵ ئەوانەشدا تەنانەت گوێمان لەناوی مردوویەکیش نەبوو!

ئیعتیراف لەسەر مردووەکانیش بەخەتەر دادەنێیت! باشە ئیتر چۆن بڕوا بەقسەکانت دەکرێت! تۆ وا دەردەخەیت کە ئاگاداری رووداوەکانی سلێمانی نیت. باشە کەس هەیە تۆ بناسێت، نەك هەر ئێمە، بڕوا بەم درۆو دەلەسانەی تۆ بکات؟ بڕواناکەم هێندە غەشیم بیت یان خۆت غەشیم بکەیت کەوا بزانیت ئێمەی پێ هەڵدەخەڵەتێنیت!؟

< باشە دەی ئیتر من قسەی چی بکەم، من دەزانم کە ئێوە بڕواتان بە من نییە، باشە بۆچی دەبێت هەمو ئەو کەسانەی راپێچیی ئێرە دەکرێن شتێکیان بەسەردا ساغ بکرێتەوە، خوا هەڵناگرێت، بڕواتان بێت خەڵکی وا ئیعدام کراوەو ئیعدام دەکەن کە ئاگاداری هیچ شتێك نەبووە. ئێوە وا دەزانن ئەم زەبرو زۆرەو خەڵك کوشتنە کارێکی باشە! بڕوا بکەن گەورەترین زیان لەخۆشتان دەدات..

یەکێك لە لێکۆڵەرەکان هەڵیدایەو گوتی:

- بەڕێز سەرۆك بزانە ئەمە چی دەڵێت، تەنانەت ئەو تاوانبارانەش کە حوکمی یاساو گەلیان بەسەردا دراوەو بەچارەنوسی رەشی خۆیان گەیەنراون، تەنانەت ئەوانەش بەبێ تاوان دادەنێت. تۆ وازی لێ بهێنە بابزانین چیتر هەڵدەڕێژێتو چۆن ئامۆژگاریمان دەکات.

< بڕوا بکەن من قسەی هەق دەکەم، دوورن لەدرۆ. هەق نییە لەوەش زیاتر زوڵمم لێبکەن. گوناهتان دەگات. یەکێکیان هەڵیدایە:

- هیچ شتێك لەگەڵ ئەمەدا کەڵکی نییە، بزانن لە کەیەکەوە ئەزییەتمان دەدات، ئەو وەختە جوانانەمان لەگەڵ ئەم بەفیڕۆ داوە، من هەر لەسەرەتاوە گوتومە قسەو لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەمەدا بێسودەو با هەر لێرە بڕیاری گەلی بەسەردا جێبەجێ بکەینو دادگاشی پێوە مەشغوڵ نەکەینو حەواڵەی دۆزەخی بکەین.

دوای ئەو قسەیە ئەوەی ناوی دەنگو سەنگو جوڵە بێت نەما.. هەروەك کەسم لەدەور نەمابێت. تەواو شەکەتی قسەو لێکدانەوەکان بوم زیاتر لە بیرکردنەوە لەئازارو شوێنی ئەشکەنجە. مەزەنەی ئەوەشم بۆ نەدەکرا کە بۆچی ئەم چڕکردنی پرسیارانە نوێ کراوەتەوە! لام وایە هۆیەکەی هەر لەوەدا خۆی ببینێت کە، بەڵکو بگەنە ئەنجامێك، ئەوسا دێنە سەر ئەمانەی کە مەبەستی ئەسڵییانە، ئێستا لەو مەبەستەیان نائومێد بون، بۆیە لەم ماوە هەستییارەدا ئەوانە دەهێننەوە ئارا، چونکە ئەوەشیان لێکداوەتەوە کە پێزانینم بە پەنجەمۆرکردنی برادەرەکانمو مانەوەی من بەتەنهاو لەم تاکزیندانییەدا، لەگەڵ سەرلەنوێ ئەم چڕکردنەوەیەی لێکۆڵینەوەو ئەو پرسیارو ئەشکەنجەدانە، رەنگە ببنە جۆرێکی تر لە گوشاری دەرونیی بۆ قسەکردنو ورە بەردان. ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە بەجێیان هێشتم. تا لەدواییدا

بێدەنگ سۆندەکەیان دایە دەستم، منیش وەك جاران گرتمو بردیانمەوە جێگەکەی خۆم..

ئەو هەمو پرسیارانەو چڕکردنیان لەسەر مەسەلە هەستیارەکان دوای ئەو هەمو ماوە درێژەو ئەو هەمو مەینەتییانە هۆش‌و گۆشمیان تەواو داگیرکردووە، بۆیە لە ئەشکەنجەو گوزەرانە جەهەننەمییەکە زیاتر ماندوو شەکەتیان کردوم، بەخۆشم دەگوت: جا ئەمانە ئەو هەمو گومانانەیان هەبێت ئیتر چۆن ئازادم دەکەن، دیارە هەر لەبەر ئەوانەشە کە بەو جۆرە مامەڵەم دەکەن. ڕەنگە ئێستا ئەوانەی لەکۆمەڵەکەمان بەساغیی ماونەتەوە، ئازادکرابن.. سەرجەمی شەوەکە، ئەو بیرانە یەخەمی بەر نەدەداو نەیاندەهێشت خەو بەلای چاومدا بچێت. تا پێش بەرەبەیان بەماوەیەکی کەم خەو بو بەمیوانم و ئاگام لەخۆم نەما. بەیانیی زوو تەقەی دەرگاو هاواری ڕۆتینیی بەیانیان رایان چڵەکاندم. لەگەڵ ئاوازی ئاوەکە بکەرەوەدا، دەستم بۆ سۆندەکە درێژ کردو بەدەمی بەلوعەکەوە چەسپم کرد..

ڕاستەوخۆ دوای نان خواردن دەرگایان کردەوەو بە چاوبەستراوی بەرەو شوێنی ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە کێشیان کردم.. کەلەپچەیان کردە هەردوو دەستمو بەجێیان هێشتم..

دوای نیو سەعاتێك ئەشکەنجەی چەند زیندانییەك دەستیپێکرد. هاوار هاوار بەرزبووەوە.. هەزاران لەعنەتیم بۆ ئەم توخمی مرۆڤەو ئەو حیزبەیانو ئەو بیروباوەڕە ژەهراوییانە دەنارد.. ڕقم ئەستور دەبو، بەڵام دەمزانیی کە ئەو شێوازی مامەڵەو ئەشکەنجەو جنێوو سوکایەتی پێکردنە بەشێکە لەمیتودی ئەشکەنجەو ڕێگەی ورە پێبەردانو ئیعتیراف پێکردن کە دەبێت زیندانیی چۆن خۆی لەبەردەم لێدانو ئەشکەنجە سەختەکاندا دەگرێت دیسان دەبێت بۆ ئەوانەش وا قاییمو ڕەق‌و خۆگر بێت.

لەناو گەمەی تاووتوێکردنی ئەو بیرانەدا بوم کەلەپچەکەیان لەدەستم کردەوە بۆ بەردەم ڕەئیسی هەیئە بران.. سەرەتای قسەی ئاراستەکراو لە دەنگێکی نەناسراوەوە بو، کە بریتیی بون لەهەڕەشەو قسەی ناشیرین‌و جنێودان کە بۆچیی: هیلاکم کردون، ئەزییەتم داون، وەختی بەنرخیانم بەفیڕۆداوە، کەچی تا ئێستاش ئیعتیرافم نەکردوە، بۆیە ئەمە دوا بانگکردن دەبێت‌و ئێستا کە بڕیار لەسەر چارەنوسی خۆم دەدەم دەنگی ڕەئیسی هەیئە بەرز بووەوەو بەم جۆرە کەوتە قسەکردن:

- ئایا ئێستا ئامادەیت وەڵامی پرسیارەکانمان بدەیتەوە؟

> بەڵێ، بەڵام من لەو وەڵامانە زیاتر هیچی ترم لا نیە.

- بەتوڕەبونەوە: من پرسیار دەکەم تۆ وەڵام بدەرەوە، چیی دەزانیت ئەوە بڵێ.

< ئاخر من قسەی خۆم کردووە. وەڵامی ئەو پرسیارانەی ئێوە وەك دەتانەوێت، لای من نییە! راستیی وەڵامەکانی خۆمم پێ گوتون..

- بەسە بەس، لەوە زیاتر چەنەبازیی مەکە! ئەمە لێکۆڵینەوەیە لێکۆڵینەوە. ئێمە لەسەرەتاوەو سەرلەنوێ پرسیار دەکەینو تۆ وەڵام بدەرەوە.

دەی هەش بەسەر، ئەوخۆ تازە بەتازە دەڵێت لەسەرەتاوە دەست پێدەکەینەوە! ئیتر پەنجە مۆرکردنی چییو سەرفرازبوونی چیی!

< ئاخر من هیچم نییە تاوەڵامی بدەمەوە، لەو وەڵامانەی گوتومەو ئیتر هیچی ترم نییە زیادی بکەم!

- کوڕە تۆ جوان گوێ بگرە، ئەمە لێکۆڵینەوەو ئیفادە وەرگرتنە. روخساری جەختکردنەکە لەسەر پرسیارو وەڵام بۆ منیش زۆر نادییار نەبو، بەڵام ئەو بەردەوامیی ئەشکەنجەیە دیمەنی ئیفادە وەرگرتنی لام تەماوی کردبو. خۆ ئەم جۆرە پێداگرتنەی منیش لەسەر ئەم حاڵی نەبونە، بێسود نییە.

< ئەی باشە تا ئێستا ئەو هەمو پرسیارو وەڵامانە چیی بوون؟

- یەکێك شەقێکی هاویشت و رەئیسیش بەسەرما قیژاندیو گوتی چیی پرسیارێکم لێ کردیت تۆ وەڵامەکەی بڵێ:

- ناوت چییە؟

< مەحمود.

- ناوی باوکو باپیرت؟

< مەلا عززەت مەحمود.

- کارت چیی بو؟

< مودەڕیس..

- لەکوێ؟

< لە سانەوی ئەزمڕ لە سلێمانیی.

لەگەڵ ئەوانەدا زانیاریی تەواویان لەسەر ژنو یەکەیەکەی منداڵەکان وەرگرت، هەروەك لێکۆڵینەوەکەی یەکەم رۆژ لە ئەمنی سلێمانی، چییان ویست پرسییانو وەڵامەکان نوسران..

لەناو ئەو پرسیارو وەڵامانەمدا جۆرێ لەهەناسەی ماندوبونم دایەوەو وا حاڵی بوم کە ئەوە بۆ سەرەتای ئیفادەیە بۆ پەنجەمۆرکردن. چونکە ئەوەی دەمگوت رەئیسی هەیئە بە یەکێکی تری دەگوتەوە بە جۆرێك کە فریای نوسینیان بکەوێت. بۆیە هەوڵمدا بیرم لەسەر خۆو ئاسایی بکەم، تا خۆم بۆ پرسیارە چارەنوسسازەکان

ئامادە تر بکەم. کەوتمە ناو هەوای بینینی جۆرێك لە هیوا. یەکێك لەو دیاردانەی بە بیرم هاتەوە ئەوە بو کە دەبێت وەڵامەکانم لە سنوری بەڵێو نەخێر، لە چەند وشەو رستەی کورت کورت تێنەپەڕن.

رەئیسی هەیئە کەوتە پێداچونەوەی زۆر لە پرسیارە کۆنەکان، بەڵام بەفۆرمەلە کراوییەوە، وا دیار بوو نوسرابونەوەو ئەو دەیخوێندەوە.

منیش هەر هەمان ئەو وەڵامانەی لەوەوبەرم بۆ دووبارە دەکردنەوە، بەبێ ئەوەی درێژە بە قسەکردن بدەم. ئەویش هەمان وەڵامەکانی منی بە یەکێك دەگوتەوە، بە کەمێك ئاڵوگۆڕ لە وشەو داڕشتندا، بەڵام زۆر بە وردی گوێ قوڵاغ بوم تا بزانم: لە ناوەرۆکی قسەکانم دەگۆڕێت! هیچیان لەسەر زیاد دەکات! من هەست بەهیچ جۆرە گۆڕانێك ناکەم، وەڵامەکان هەموی، بێ گۆڕانن. ئەوانە تەواو دڵ خۆشیان کردم. ئەوەی بۆ من زۆر سەرنج راکێشەربو، هەندێ پرسیاری نوێی تری کرد کە دەری دەخست جۆرە زانیارییەکیان گەیشتبێتە دەست، گەلێك لە پرسیارە ترسناکەکان، کە لەکاتی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەداندا بە چرو پڕیی روناکییان دەخستە سەرو جەختیان لەسەر دەکرد، دووبارە کرانەوە. بە بەڵێ، نەخێر، نازانم، ئاگادارنیم... وەڵامم دەدایەوە.

بەو جۆرە پرۆسەی پرسیارو وەڵام، بە پێچەوانەی سەعاتو رۆژو هەفتەو مانگەکانی پێشوەوە، بەبێ جنێوو نەڕەنەڕ، بێ گرێوگۆڵ دەچوون بەڕێوە. من هەرچییەکم بگوتایە لەلایەن رەئیسی هەیئەوە دەگوترایەوەو یەکێکی تر دەینوسیی. لەگەڵیشیاندا خۆشنودیو ئارامیم زیادو زیاتر دەبن. هەست بەجۆرێك لەسەرکەوتن دەکەم..

دوای وەستانو پشوویەکی کەمێك درێژ، دەنگی بەرزکردەوەو داوای کرد کە دەستم درێژ بکەم.. دەستم درێژ کردو پەنجە گەورەی دەستی چەپیانگرتو بەقوماشی مەرەکەباویدا هێنراو کاغەزییان پێ مۆر دەکرد، یەك، دوو، سێ... لەو کاتەدا جۆرێك لە پەژارە تێکەڵ بەشادییو گەشەی ئەم پەنجەمۆرکردنە بوو، چونکە نەخوێندنەوەی ئیفادەکە بۆم، خستبومییە سەر کەڵکەڵەی داوای خوێندنەوەی ئیفادەکەم بکەم، پێش پەنجەمۆرکردن..! لەو ساتانەشدا هەر خۆشم بەخۆم دەگوت:

جا ئەوەی بۆ چییە خۆ ئەوان خۆیان چییان بوێت دەیکەن بەبێ پرسو بێ پەنجەمۆرکردنو بێ دادگا! جگە لەوە، ئەوەی من وەڵامم دەدایەوە وەك خۆیان دەنوسران، بێ ئەوەی شتێك بنوسرێت کە پێچەوانەی وەڵامەکانی من بێت، ئیتر بۆچیی کێشە بۆ خۆم دروست بکەم، لەبەر ئەوانە ئاگادارییم لای ئەوە نەما کە چەند نوسخەم پێ پەنجەمۆر دەکەن.

دوای ساتێك لە پەنجەمۆر کردن، کەوتەوە پرسیار کردن:

- ئەگەر ئازاد کرایت چی دەکەیت؟ بێ بیرکردنەوەو لەسەر هەمان نەخشەی تەکتیکەکانی وەڵامدانەوەم:

< خۆم نەقلی بەغدا دەکەم.

- چیی دەکەیت؟

< مامۆستایی.

- ئەی ئەگەر دانەمەزرایتەوە..؟

< کاسپی دەکەم.

- کاسبی چیی؟

< هەر شتێك بێت.

- بەڵام تۆ بەرنابیت.

< ئەگەر بەپێی یاسا لەگەڵمدا بجوڵێنەوە وا چۆن بێ بەڵگە هێنرام، بەو جۆرەش بەردەبم. بەیاساش نەیکەن ئەوە خۆتان دەزانن چیی دەکەن.

- بەڵام تۆ هێندە ناحەزایەتیی ئێمەت کردوە کە بیری ئازادکردنت لەئارادا نەهێشتووە.

< ئەوە کەیفی خۆتانە هەرچییەك بڕیار بدەن. گرنگ ئەوەیە کە من بێ هیچ هۆو بەڵگەو بڕیارێکی یاسایی گیراوم.

وام مەزەنە دەکرد کە بەو وەڵامانە، بەشێوەیەکی سادەو ڕەوان جۆرێ لەدڵنیایی دەخوڵقێنم کە لەسەرفرازبونمدا بیرێکی تری دژ یا ناحەز بەوانم نییەو بیری ڕاکردنیشم نییە..

کە بردیانمەوە حەمامەکە.. ئازارەکانم لەبیرچووبوەوە. هەناسەیەکی زۆر قوڵی جۆرێ لە ئاسودە بونی ناو پڕوکاویی شەش مانگو یەك هەفتەی ژیانی ناو ئەو دۆزەخەم هەڵکێشا. چونکە لەڕوی تیۆرییەوە ئیتر لەبەردەم ئەشکەنجەی قورسدا نەمام، یان دەبێ ئیتر ئەشکەنجەم لەسەر هەڵبگیرێتو بۆ گۆڕەپانی لێکۆڵینەوەو دارکاریی نەبرێمەوە. مەگەر شتێکی نوێ بباریو لێکۆڵینەوەم لەسەر نوێ بکاتەوە..

ئاسودەییەکی ئاشکرا ئیسراحەت بەلەشو مێشکم دەدا، چونکە وا تێدەگەم کە لە ڕەفیقەکانم جیاناکرێمەوە. کاتی سەرفرازبونم نزیکە.

لەو ئیفادانەشدا کە کاتی نوسینیان گوێم لە رستە بە رستەیان بو، هیچ شتێکی وا نەنوسرا کە مەترسییەك بهێنێتە ئاراوە. وەڵامەکانم هیچ جۆرە نیشانەیەکی وایان لێوە دەرناکەوێ کە بۆنی ئەوەیان لێبێت بدرێم بە دادگا، یا لە دادگادا تاوانبارییەك یان سزایەکیان لێ هەڵبهێنجرێت. وەڵامی پرسیارەکان بەو جۆرەی کە خۆم دەمگوت

و بەو جۆرەش کە رەئیسی هەیئە دەیگوتەوە، هەر هەموی ئەو نکولییە سادەو بێگومانانە بون کە لەسەرفرازیی‌و ئازادبون زیاتر هیچی تریان بەدوادا نایەت، خۆ ئەوەشی کە بیستومەو سەرجەمی زیندانییەکانیش جەختیان لەسەر کردووە، ئەوەیە کە زیندانیی خۆی چیی بڵێت ئەوە دەنوسرێت‌و مۆری دەکات، ئەوەی خۆی نەیڵێت نانوسرێت. تەنانەت لەو دادگا عەسکەرییە جەنگەڵییەدا، ئەگەر حەپسێك نکوڵیی لەو ئیفادەیە بکات کە بۆی دەخوێنرێتەوە، وا ئەو کەسە بۆ لێکۆڵینەوە دەگێڕنەوە، ئەگەر قسەکان هی خۆشی بوبێت، چونکە لەم حاڵەتەیاندا دەتوانێت بڵێت بەزۆری لێدان‌و ئەشکەنجە ناچار کراوم ئەوە بڵێم.

لەناو قوڵایی ئەمسەرو ئەو سەر کردنی ئەو بیرانەدا پاڵکەوتم. وەڵامی هیچ پرسیارێکی محەممەدم نەدایەوەو گوتم وازم لێ بهێنە، هیلاکم، ئازارم زۆرەو دەمەوێت کەمێ بحەوێمەوە، با سەرخەوێك بشکێنم، ئیتر فریشتەی ئەو دڵشادییە بۆ ناو وەنەوزو ئینجا بەرەو جیهانی خەو هەڵیفڕاندم و ئاگام لەخۆم نەما..

لە قوڵایی خەوێکی ئارامدا بوم کە لە دەنگی حەمە خەبەرم بووەوە، دەیگوت مامۆستا هەستە نانەکەت بخۆ. چاوم هەڵهێنا ئەو بە چیچکانەوە ورد سەرنجی منی دەدا. منیش لەسەر خۆ هەستام، سەیرێکم کردو گوتم کوا نان؟ گوتی ئێستا دەیهێنن. زۆریشم برسیی بو، چونکە نائارامیی رۆژانی رابردوو سەرلەبەیانیی لە لێکدانەوەی بانگکردن‌و بانگنەکردن، سەرو دڵم تەواو گیرابو، هیچی وام بۆ نەدەخورا.

لەباسی نان هێناندا خۆشییەکی تر هات بەبیرمدا، هەر ئێستا یەکێك نانەکە دەهێنێت‌و پەنجەمی پێنیشان دەدەم، تا ئەویش خەبەرەکە بگەیەنێتە برادەرەکانی ترمان. بەتایبەتی وەك لەقسەکانی سەردار، لەناو حەمامەکەدا، بۆم دەرکەوت، ئەم هەواڵە بۆ دوو جۆر لە برادەرەکانم گرنگە. یەکەم: بۆ ئەوانەی کە زۆر مەراقی منیانە کە پاش ئەو ماوە دورو درێژە تازە بە ئەشکەنجەدانمدا بچنەوە. دووەم: ئەوانەی کە بەهۆی ئەو جۆرە زیندانی‌و ئەشکەنجەیەی منەوە ناڕەحەت بوون‌و وایان لێکدەدایەوە کە تا من لەو زیندانە تاککەسییەدا بمێنمەوە وا مەحاڵە بەربدرێین.

کاتێ دەرگاکە کرایەوە تا خواردنەکەمان بدەنێ. لەگەڵ دانانی قاپەکەدا بەختیار سەیرێکی منی کردو منیش یەکسەر پەنجەم بۆ هەڵبڕی‌و مۆرەکەی چاوپێکەوت.. زەردەخەنەیەك گرتی‌و رۆیشت‌و دەرگاکە پێوەدرا.. دەستمان کرد بەنان خواردن. ئەم جارە لەهەموو رۆژانی تر زیاتریان دانابوو. دو هێندی جارانیش مریشکی لەسەر بو. بۆ یەکەم جار لەژیانی ناو هەیئەدا هێندە زۆرم خواردبێ‌و هێندە لەزەتم لە خواردنی ئەوێ وەرگرتبێت. ئێستاش چێشتی پاشماوەی عەسکەر وا بە لەزەتەوە

دەیخۆم، خواردنەکان لە پاشماوەی عەسکەرەکانەوە بۆ ئێمەیان دەهێنا..! ئەو لەزەتە بۆ من زیاتر لە ئیفادە وەرگرتن‌و پەنجەمۆرکردنەکەوەیە، ئەگینا تەواو تەن نادروست‌و لەش بەئازارو لاوازو پێست زەردو ناسك بووەوە بوم کە رەنگە بەو حاڵە کەس نەمناسێتەوەو نەزانن من کێم.

دوای نان خواردن حەمە کەوتەوە پرسیار.. چیان پرسی‌و چییان نەپرسیی.. گوتم هەر پرسیارە کۆنەکان بو.. ئەی کە بۆ پەنجەمۆرکردن بانگیان کردییت بۆچی ئەشکەنجەیان دایت‌و ئاوایان لێ کردیت..؟ گوتم نازانم.. رەنگە هەر بۆ تۆڵە سەندنەکە بێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئیفادەم وەرگیراو پەنجەمۆرم کرد. گوتی وایە. بەڵام ئەوە واناگەیەنێت کە ئیتر لەهەمو شتێك رزگارت بوە..

< گوتم تۆ چۆن دەزانیت؟ ئەی باشە ئیفادە وەرگرتن‌و پەنجەمۆرکردن مانای چیی، ئەگەر کۆتایی هێنان بە لێکۆڵینەوە نەگەیەنێت!؟

- هەر مەرج نییە، ئەو کوێرەی کە ئەو رۆژە بینیت، دێتەوە یادت؟ گوتم ئا. ئەوە پەنجەشیان پێ مۆر کردبو، ئینجا بەو دەردەیان برد کە خۆت چاوت لە کەمێکی بو..

< باشە تۆ چۆن ئەوە دەزانیت..؟ دەمی تەتەڵەی کردو گوتی:

- ئەو رۆژە کە بانگیان کردم گوێم لێیان بوو کەوایان دەگوت..

ئیتر من لێی بێدەنگ بوم‌و بەخۆمم دەگوت: ئەم بێ ئەقڵە لغاوەکەی هەر لەدەمدایە، و لە لۆقەی خۆی ناکەوێت! ئەو رۆژە ئەویان بانگ نەکردە دەرەوە.. رۆژێك پێش بینینی ئەو دیمەنە ئەمیان بانگکردبو.

دوای ئەوەی چەند رۆژێك بەسەر وەرگرتنی ئیفادەو پەنجەمۆرکردندا گوزەری کرد، بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی تر ببیستین، ئیتر کەوتمە تاووتوێکردنی ئاییندەی دوا ئیفادەو پەنجەمۆرکردن. لەو هەڵسەنگاندنانەدا دوو جۆر بیرم دەهات بە مێشکدا:

یەکەم: بدرێین بە دادگا، کە ئەمە گریمانێکی زۆر نزیك نییە.

دووەم: سەرفرازمان بکەن.. لای من بیرێکی تر لە ئارادا نەبو، چونکە ئەگەر گریمانێکی تر چاوەڕوان بکرێت کە بەردەوامیی گومان‌و بڕیاری هێشتنەوەو دەست بەسەرداگرتن بێت، وا ئەمەش هەر سنورێکی خۆی هەیە. بێگومان لەحاڵەتی روداوی نوێشدا هەمو گریمانێکی خراپی تر لەبەردەمدایە.. چونکە دنیای ژێر سایەو سێبەری رژێمی بەعس لەناو زیندانە گەورەکەو ئەم زیندانە نەهێنییەدا، پڕن لە روداوو کارەسات‌و دیاردەی چاوەڕواننەکاو. بۆیە ئەو مەترسیانەی بەبیری مرۆڤی ناو ئەو مەڵبەندەدا دەهات‌و نەدەهات، هەمیشە لەبەردەمدان.

لەناو ئەو مەشغوڵییەی خۆمدا ورد سەرنجی روخساری حەمەشم دەداو دەمویست بزانم چیی دەکات هەڵسوکەوتی چۆنە.. وا دەهاتە پێش چاوم کە قسەی

پێیەو کاتی لەبار نادۆزێتەوە بۆ باسکردنی، یان هەر دەیەوێت چاوەڕوان بێت تا دەرفەت دەخولقێت، کە لێم دەپرسیی ئەوە بیر لەچیی دەکەیتەوە؟ وەلامێکی وای نەدەدا بەدەستەوە. منیش سەرلەنوێ قەوانەکەم دەخستەوە سەرباسی ئۆردوگاو کێشەکانی رابواردن‌و خواردنەوەو کیژەکەی‌و ڕەدوکەوتن.. هەر خۆم پێشم خۆش بو سەرلەنوێ قسەیان لەسەر بکاتەوە، نەک هەر بۆ خەریك کردنی ئەوو بۆ لەبیرچونەوەی ئەو نەخشەیەی بۆی دانراوە، چونکە دەبێت ئیتر ئەوە ڕۆلێکی ئەوتۆی نەمابێت، بەلکو ئەو باسانە بۆ ئەم کاتانە خۆش بون، دەمویست ئەوەی لەوەوبەر پرسیارم لەسەر نەکردبو یان سەرنجمی ڕانەکێشابو قسەیان لەسەر بکەمەوە، ئەوە بۆ من، زیاتر لەو مەبەستەم، دوو سودی تریشی هەبو: یەکەم دەمویست کۆمەلێك زانیاری لەسەر گوزەرانی خەلکی ڕاگوێزراو بۆ ئۆردوگا زۆرە ملییەکان وەربگرم، دووەمیش باسەکانی تر زاخاوێکی میشك بوون کە خۆم لەدنیای هەیئەش دور بخەمەوەو کات بەسەر بەرم. لەباسیی خواردنەوەو ویسکیدا، ناوی زۆر جۆری دەزانیی، ناوی هەندێ ویسکیی دەبرد کە من نەمبیستبو. پرسیم ناوی ئەو هەموو ویسکیانە لەکوێوە فێر بویت؟ گوتی دەی مامۆستا گیان ئەوانە هێندە گرنگ نین، کە ئاسان کەوتنە بەردەست ئیتر پیاو ئاسان هەم ناوەکان لەبەردەکات‌و هەم فێری خواردنەوەشیان دەبێ. گوتم ڕاست دەکەیت ئەوە پەیوەندیی بەحەزو خواستی مرۆڤەوە هەیە، بەتایبەتیی ئەگەر ئاسان کەوتە بەردەست وا ڕێگەی بەدەست گەیشتنیشی گرنگ نییە! کەئەو قسەیەم تەواو کرد، بەلایەکی تردا باسەکەی وەرگێڕاو گوتی: دەتوخوا مامۆستا کە بەربویت سەرێکی ئەو ناوچەیە بدە، گوتم کورە من سەری هیچ شوێنێکم نەداوە وا لێرە توند کراوم ئینجا وەرە سەری ئەو جۆرە ناوچانەش بدەم. ئەگەر بەربوین وا تۆ دەتوانیت بێیت بۆ سلێمانی.

سەیرە من دوعا دوعای ئەوەمە کە لێرەدا لەکۆلم بێتەوە، کەچی ئەو دەعوەتی دوا بەربونیشم دەکات، کورە خوا دەکات تۆ دەگەڕێیتەوە قەلادزێ‌و سەرفراز دەبم لێت وا حەوت بەردت بەدوادا هەلدەدەم.. ئەی مانای هەیە تەنانەت پیاو سڵ لە وڕێنەی خۆشی بکاتەوە، نەوەکا قسەیەك لەدەمی‌دەربچێت‌و خێرا ئەمیش بیگەیەنێتە ڕەئیسی هەیئەو بکەومە داوەکەیانەوە.

ڕۆژانی دوا بیست‌و چواری ئەپریل بیرم لەسەر ئەوە چڕ دەبو کە دەبێت بۆچی دوای ئیفادەو پەنجەمۆرکردن بمانهێلنەوە، دەبێت چاوەڕوانی چیبن‌و چی بڕیارێك بدەن..؟ بەتایبەتی لەو ڕۆژگارەدا ترسی بانگکردن‌و ئەشکەنجە چاوەڕنەکراوبو، حەرەسەکان وەك جاران توندو تیژ نەبون لە مامەلە کردنم، بەلام سیستێمی ژیانەکە

هەموی وەك خۆی بەردەوام بو، سەرلەنوێ لەشکری ئەسپێو خوروی لەش، بۆن و پیسو پۆخڵیو ئەو چڵکنییەی کە پیاو بێزی لەخۆشی بێتەوە سەریان هەڵدایەوە، سستمی چونە سەر ئاودەست، بۆگەناوو پۆخڵییەکەی، بێ خۆشتنو بێ ئاوی گەرمو بێ سابون، بێ خواردنی باشو کەم ڤیتامین، بێ خەستەخانەو بێ دەرمانو بێ دوکتۆر، قەتماغەی چڵك، قەبزیی زورەکە، بانگکردنو لێکۆڵینەوە لە زیندانییەکان لە ناردنی پۆل پۆل زیندانی بۆ مەحکەمەکەیان، هێنانی حەپسی تر، گوێ قولاغی لەسادەترین هەواڵێك کە لە دەمی هەر کەسێکەوە بێتە دەرێ، چونکە لە هەمو باسو خواسێکی هاوڕێکانمو هەیئەو دنیای دەرەوە دابڕێنراوم. خۆ ئەگەر زیندانییەکانی تر بەهۆی هاتنی زیندانیی نوێوە شتێکیان پێ دەگات وا من لەوەش بێبەریم، بگرە من لە قسەو باسی هەیئەکەش دابڕاوم، دنیای من بۆتە دنیای ئەم تاککەسە زیندانەو محەممەدو ئەم مشکانەو ئەو حەرەسەی کە رۆژی دو جار دەیبینم، دیارە ئەو بەترسو لەرز سەیرکردنەی سوچی پەنجەرەکەش لەبیر ناکەم، هەرچەندە لەخەمو خەفەتو ترس زیاتر هیچی تری لێ دەست نەدەکەوت.

ئەو ژیانە پڕ لەژانە باری لەشی تەواو تێکداوە، بێ تواناو بێ هێز بوم، هەستم دەکرد چوار ئێسقانی رەقو تەقم ماوەتەوە، گێژییو بێ حەواسیی، بیر چڕکردنە سەر ئاییندەی ئەم زیندانە وەحشەتناکە، ئینجا بیرکردنی ماڵو منداڵ کە ناوبەناو دەرگای گوشاری خەیاڵ و بیرکردنەوە لێیان دەشکێنراو دەکەوتمە هەواڵ پرسینیان، دەیان پرسیاری بێ وەڵامم لەخۆم دەکردو بێ ورەیان دەکردم..

رۆژەکانی دوا پەنجەمۆرکردن دوورو درێژن، بڕانەوەیان بۆ نییە. لەخۆم دەپرسیی تۆ بڵێیت هەموو برادەرەکانیشم لێرە مابن؟ تۆ بڵێیت رەوانە نەکرابن، بەتایبەتی کە رۆژێك بەختیار نانەکەی نەهێنایە ئیتر گومانی نەمانەوە یانم لا زیاتر دەبو. ئەم بوبو بە نیشانەی مانەوەیان. ئەم مانەوەو نەمانەوەیەش بۆ چارەنوسەکەی من گرنگ بو.

ئەم خەمە دوای پەنجەمۆرکردن، لەو ئاستەی جاراندا نەمابوو، بەڵام بێ شوێنەوار نەبوو. دووەم رۆژی دوای پەنجە مۆرکردنەکە دوای ئەوەی چونە سەر ئاودەستی هەمووان تەواو بوو، کە بۆ ئەو مەبەستە هێنرامەدەرێ، بۆ ئاودەستی حەوشەی سێیەم برام، بۆچی؟ بۆ خۆشم نەمدەزانی.. کە هاتمە دەرەوە، کازم حەرەس بوو لێم هاتە پێشەوەو سەرنجی لێدەدام و کەشکی دەماڵی بە سەرمداو دەیگوت، سەیرکە، چۆن کەرێکە، چۆن کەرێ، منیش بەخۆمم دەگوت دەی تو شەرەفی ئەوەی کە بڕوات پێیەتی خۆت و گەورەو سەرەك کۆمار کەرن یان من..!؟

شەڕی قادسییەی سەددام حەرەسو جەللادەکانی هەیئەی نائارام کردبو. رۆژانە چاوەڕوانی ئەوە بون کە یەکێك مژدەی تەواوبونی جەنگ و سەرکەوتنی عیراق

بێنێت تا ئەمانیش خەڵاتی بکەن. هەروەك خۆشیان دەرکیان بەوە کردبێت کە چارەنوسی رژێمەکەی بەعسو خۆیانی پێوە بەستراوە.. بەتایبەتی هەرکە فڕۆکەیەکی جەنگیی ئێران لەو ناوە نزیك بکەوتایەتەوە ئیتر باسەکە نوێ دەبووەوە.

دەنگی فڕۆکەی ئێران رۆژ لە دوای رۆژ کەم دەبێتەوە. ئەوە وای دەردەخست کە هێزی ئاسمانیی رژێم لەو ناوچە سەربازیو ئەو شارە پڕ لە بیرو کێڵگەی نەوتە بەهێزە، ئەوەش بۆ من هەواڵێکی خۆش نەبوو.

نامۆ نییە کە داگیرکردنو چەوساندنەوەو زوڵمو زۆر وای لە مرۆڤی کورد کردووە کە لەبێ هیواییدا درێژەپێدانی جەنگی وێرانکردنو خوێنو فرمێسکی لا ئاسایی بێت! تێکشکانی رژێمی بەغدای لا سەرکەوتن بێت، چونکە ئەوە سەرەنجامێکی زۆر ئاسایيو سادەو ساکاری کارو کردەوەکانی حیزبی بەعسە، ئەی کە میللەتێك لەبەرچاوی هەمو دنیاو لەبەردەم یاسای نێونەتەوەیيو رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ قەتڵوعام بکرێتو لەبەردەم هەڕەشەی لەناوبردنو وڵات کاولکردندا بێت، ئیتر لە بێدەسەڵاتیدا لەو هیواو ئاواتە زیاتر هیچی تری بۆ نامێنێتەوەو هیچی پێناکرێت، بۆیە خەوی سەرفرازبوون لەو کارەساتانەدا دەبینێت!

بەسەربردنی رۆژگاری پڕ لە چاوەڕوانییو ترسو لەرزی ئەم زیندانەو ئەم حەپسییە تاککەسییە، خۆ دزینەوە لە زۆر قسەو ئاگاداربون لەم زەلامە نامۆیەی کردویانە بە سێبەرم، زیندانییە تاقی تەنهاییەکەی زیاتر پڕوکێنەرو هەمیشە بێئارام تر کردووە. بۆ کەم کردنەوەی گوشاریی گەورەی ئەوانە لەسەر لایەنی دەرونیی، پێویست بو لەگەڵ هەندێ شت خۆم خەریك بکەم. یەکێك لەو شتانەی خۆمم پێوە خەریك دەکرد، گوێگرتن بو لە حەرەسەکان.. چونکە بەهۆی پەنجەرەکەوەو نزیکیی لەژوری حەرەسەکانەوە بەهۆی ئەوەشەوە کە خواردن دابەشکردنو زۆر کاری تر لەو حەوشەی ناوەڕاستەدا دەکران. بۆیە زۆر جار ئەگەر ترسی چاو لێبونی عەسکەرەکانم نەبوایە، سەیرم دەکردن یان گوێم لێدەگرتن. ئیتر پەنجەرەکە بۆ من بوبوبە بورجی چاو هەڵخستن. یەکێك لەو ڕوداوانە:

ئێوارە وەختەیەکی رۆژێکی کۆتایی ئەپریل بو، تابوتێك کە لەدو داری درێژو قوماشێکی ئەستوور دروست کرابو زەلامێکی لەسەر درێژکرابو.. دیار بو لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی لەدەستدابو لە نزیك دیواری حەمامەکەی منەوە دانرا.. حەرەسەکان کەوتنە هاتوچۆو قسە.. بەڵام زۆر لێیان حاڵی نەدەبوم.. ئەوە نەبێت کە یەکێك کە بەشێوەی قسەکانیدا لە کورد یان تورکمانی خەڵکی کەرکوك دەچوو، زیاتر لە لێکۆڵینەوەدا، تەرجەمەی قسەی زیندانییەکانی بۆ لێکۆڵەران دەکرد، جگە

لە هەندێ کاروباری ئازوقە کرینو هێنانی بۆ حەپسخانەکەو جار جارەش هاوبەشیکردن لە دابەشکردنی بەسەر ژورەکاندا. بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئەوە بەسزای هەقی خۆی گەیەندرا، هەر کەسێك سەرپێچی بکات، ئیعتیراف نەکات، ئەمە چارەنوسێتی.. ئەو دەنگە بەو بەرزییە، هەروەك ئاگادارییەك بو بۆ دانیشتووانی ژورەکانی سەر حەوشەی ناوەڕاست، تا زیندانییەکان باشتر گوێیان لێبێتو پەندو دەرسی لێوەربگرن! جارێکی تریش قسەکانی دووبارە کردەوە. لەکۆتایی قسەکاندا گوێم لە یەکێکیان بو گوتی:

- بیبەن بیخەنە ژێر خاكو بە جەهەننەمی بسپێرن. حەمە گوتی:

- ئاگات لێیە مامۆستا ئەمانە چیی لەم کوردە دەکەن!

< ئەی تۆ ئاگاداریت لەوانە؟ بۆچی تازە هەستی پێدەکەیت؟

- نا بەڵام یەکەم جارە بەم جۆرە دەکەن؟

< بۆ ئەمڕۆ یان ئەوەتەی تۆ لێرەیت؟

- تێناگەم مەبەستت چییە؟

< مەبەستم ئەوەیە کە لەمەش خراپتر بووەو خراپتریش هەیە.

- چۆن؟

< زۆر هەیە هیچیشی نەکردووە کەچی سەد شتیان لەسەر بارکردووە تا بۆ سێدارەیان ڕەوانە کردووە! ئەی من! خۆ من هیچم نەکردوە ، هەر هیچ بەڵگەیەکیشیان بەدەستەوە نییە.

ئەی تۆ؟ خۆ تۆ هیچ خراپەیەکت بەرامبەر بە دەوڵەت نەکردووە وا بەم جۆرە گیرۆدەی ئەم دۆزەخەیان کردویت؟ ڕاستەو پیاو هەق بڵێت کە تا ئێستا ئەشکەنجەیان نەداویت، بگرە زللەیەکیشت بەرنەکەوتووە، بەڵام ئەم ژیانە بۆخۆی هەموی ئەشکەنجەو چەرمەسەریو قوڕ بەسەرییە. بزانە تۆ لە کەیەوە هێنراویتە ئەم زیندانە، هەر تەنها لەبەر گومانێکی نابەجێ لەناوەکەت. باشە تۆ پێم ناڵێیت چییان لەتۆ دەوێتو بۆچیی هێڵراویتەوە؟ پرسیارەکانیان چین؟ دەی توخوا پێم ناڵێیت بۆچی لە تۆ ناپرسنەوە..؟

- چۆن ناپرسنەوە! ئەی ئاگادار نیت کە دوو سێ جار بانگیان کردوم.

< با بەڵام خۆ لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ نەکردیت!

- چۆن، کردیان.

< باشە چییان لێ پرسیت؟ وا دیارە گلەییەکت لە هێشتنەوەو جۆری لێکۆڵینەوەو مامەڵەیان نییە!؟

- هەر باسی گومان کردن لە ناوەکەم دەکەنو دەڵێن دەبێت ڕاستیی ناوەکەی خۆتمان پێ بڵێیت. چۆن گلەییم نییە، دەزانم زوڵمم لێدەکەن!

< کوڕە ڕاستیی‌و ناڕاستیی ناوی چیی، دەیانتوانی لەو ماوە دورو درێژەدا هەزاران ناوی لەیەکچوو لابەلا بکەن.

- ئەی گوایە بۆچیی وا دەهێڵرێمەوە؟

< نازانم ئەوە هەر لە عیلمی خۆیاندایە. هەر ئەوەندە دەزانم کە غەدرێکی گەورەش لەتۆ دەکەن!

لە هەندێك ڕووەوە توانیم سودێکی باش لە محەممەد وەربگرم.

لە باسی ئۆردوگاکاندا، دیمەنێکی زۆر ناشیرین‌و ترسناکی کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی دەخستە پێش چاو، دیاربو کە ڕژێمی بەعس تا ڕادەیەکی زۆر گەلێك لە مەبەستەکانی پێکابو. بێکارو کاسپیی‌و بەستنەوەی ئەو جەماوەرە بەرینەی لەوەوبەر بەرهەمهێنەرو ئێستاکە تاڕادەیەك مشەخۆر، خواردنەوەو قومار، پەیدابونی ماڵ کە سێکسی تیا بفرۆشرێت، تەمەڵی‌و نەمانی گیانی کارکردن‌و ماڵ‌و منداڵ ژیاندن. سیخوڕیی‌و نۆکەریی بۆ داگیرکەر، شەڕو ئاژاوە لەناو خێزان‌و گەنجەکاندا.. دەستڕۆیشتوویی‌و زاڵیی ئەمنی عەرەب بەسەر خەڵکەکەدا بەجۆرێ کە هەر ئەمنێك وەك ئەفسەرێکی لێپرسراو مامەڵە لەگەڵ خەڵکەکەدا دەکات، کەس نییە لەماڵ‌و کەرامەتی خۆی دڵنیا بێت، ئەوە خۆ ئەفسەرەکان چییان بوێت دەیکەن‌و کەسێك نییە دەست بهێنێتە ڕێگەیان.

ئەم جۆرە دیاردانە، خەڵکە باشەکەی هەراسان کردووە. ئەو کارەساتانە بوبونە هۆی ئەوە کە: ناوچە دێهاتییەکان نەهێڵرێن، ئابووریی کشتوکاڵ‌و ئاژەڵ‌و میوەهات هەڵبتەکێنرێت، دانیشتووان بکرێنە خەڵکێکی مشەخۆر، نەوەکان هەمووی نەخوێندەوار دەکرێن، داب‌و نەریت‌و خوڕەوشتە جوانەکان هەڵدەتەکێنرێن‌و پێچەوانەکانیان جێگەیان دەگرنەوە.. بە کوردیی پەتیی لەشکرێکی داگیرکەر هەروەك تازە تەپوتۆزیی جەنگی داگیرکردنەکەیان لێ نیشتبێت، خەڵکەکەو وڵاتەکەیان کەوتۆتە بەردەست‌و بە یاسای بیابان‌و جەنگەڵ حوکم دەکەن، بگرو بکوژ هەر خۆیانن.

دەمەو عەسری ڕۆژێك لە پڕ شایی‌و هەڵپەڕکێ‌و دەنگی گۆرانیی حەمە جەزا لە تەسجیلەوە بەرزبووەوە.. وا دەزانرا کە حەشاماتێکی زۆر کۆبۆتەوە.. کە لە پەنجەرەکەوە سەرەتاتکێیەکم بۆ کرد، هەر نایب زابتە کوردەکەو حەرەسێك‌و دوو زیندانیی حاجەت شۆربوون.

ئەو دەنگە خۆشەی حەمە جەزا، منیان بردەوە بۆ ناو دنیایەکی تر.

لە مێژ بو بە دەنگی ئەو هونەرمەندە نیشتمانپەروەرە ئاشنا بوم، لەو کاتانەوە کە ئەو پێشمەرگەی بارەگای گۆڤاری ڕزگاریی بو. لە هەندێك سەفەرمان بۆ ئەم ناوچە

یان ئەو ناوچەی سلێمانیی هەندێك جار ئەویشمان لەگەڵ دەبو.. یەکێك لەو سەفەرانە، بردنی وەفدێکی تەلەفزیۆنی ئیتالیایی بوو، بۆ هەڵەبجە، شەو و رۆژێکی پڕ لە گۆرانیو خۆشی برایە سەر (هاوینی ١٩٦٩).

دەمویست لەهۆی ئەو شاییو لۆغانە بگەمو بزانم ئەم بەزمو ڕەزمە بۆچییە! درکم بەهیچ شتێك نەدەکرد ئەوە نەبێت کە بیانەوێت لەوەشدا لەڕوی دەرونییەوە ئەشکەنجەی بەکۆمەڵ بدەنو هەریەکە دیمەنی ئەو رۆژگارانەی بێتەوە بەرچاوو لەگەڵ ئەم دۆزەخەدا بەراوردیی بکاتو ببێتە مایەی بێورەییو روخاندن.. ئەوەی کە بە کوردیی قسەی دەکرد نایب زابتەکە بو.

لای من ئەو دیمەنانە زیاتر گیانی خۆگری بەهێز دەکرد، رقو کینەو گیانی تۆڵەسەندنی پەرەپێدەسەند..

# كاروانى بێ كۆتاييو گۆشەيەكى ژياننامەى سياسيى

## ( ٨ )

## لە هەيئەى تەحقيقيى كۆنەوە بۆ هەيئەى تەحقيقيى تازە

**شەوێكى نائاسايى..**

**ئەمڕۆ دەى ئايارە**

زياتر لە دوو هەفتە بەسەر پەنجە مۆركردنمدا تێدەپەڕێ. بۆ ئەم حاڵەتەى ئێمە ئەوە ماوەيەكى دورو درێژە بۆ هێشتنەوەى زيندانيى لەدواى پەنجەمۆركردن، ژيانى ناو هەيئە لە رۆژێكى ئاسايى وەك رۆژانى تر زياتر نييە، بۆ منيش بەردەواميى ژيانى تەنهاييو پڕ لە بيركردنەوەى پاشەرۆژو ئەگەرەكانى ئايينديە. وەك هەمو رۆژانى تريش پڕ لە ئەشكەنجەو لێدانى هەندێك لە زيندانييەكانە.

دواى نيوەڕۆش هەر بەو جۆرە گوزەرى دەكرد. نانى ئێوارە خورا. بێدەنگييەكى نائاسايى باڵى بەسەر ئەو حەوشەيەو سەرجەمى هەيئەدا كێشاوە. كات لەوە تێپەڕيكرد كە خەڵك بانگ بكرێت بۆ لێكۆڵينەوەو ئەشكەنجە يان بۆ دادگابردن.

بۆيە سەرم نايەوە. لەناو دەيان بيرى جۆراو جۆردا وەنەوز دەيبردمەوە.. لەناو ئەو وەنەوزانەشدا جۆرێك لەسرپەو ورتە دەهاتە گوێم.

وا ديارە گوێم دەزرنگێتەوە. زۆرى نەخاياند بوو بە وردە دەنگو وردە تەپەى پێ. نەخێر گوێ زرنگانەوەى چيى، كشوماتييەكە هەروا نەما. دەنگ پەيدا بو، گوێقولاغ بوم. دەنگەكان بەرەو زيادبون دەڕۆن. هاتوچۆيەكى نائاسايى پەيدا بو، جۆرێك لەهەستى رودانى شتێكيان لێوە مەزەنە دەكرێ. تەپەى پۆستاڵى عەسكەر دۆخەكە ئاڵۆزتر دەهێننە بەرچاو. منيش لەناو ئەو گوێقولاغييەدا هەروەك موگناتيز سەرنجەكانم بۆ دەرەوە رادەكێشرێ!

لە ناكاو دەنگى زرەزرى قفڵو كردنەوەى زياتر لە دەرگايەك لەگەڵ زۆربونى تەپەى پۆستاڵو دەنگى عەسكەر بەشێوەيەكى نامۆ منيان رايەراند، يەكسەر

هەڵسام و بەچیچکانەوە کەوتمە چاوەڕوانی و باشتر چڕکردنی هۆش و گۆشم لەسەر دەنگەکانی حەوشەکە، تا بزانم چیی ڕوودەدات.

لە قسەکانیان حاڵی نابم. بەڵام دیارە کە شتێك ڕوودەدات، شتەکەش ئاسایی نییە. ئەم دوو دیاردەیە، ڕودانی شتێك و نائاساییش دەردەخەن بەتایبەتیی لەو درەنگ وەختەی هەیئەدا، زیاتر بۆنی هەواڵی شومیان لێوەدێت و پیاو چاوەڕوانی باشە ناکات! جاکێ دەڵێت هەواڵی شومە بۆ بە پێچەوانەوە نەبێت، خۆ ئەگەر ئەم دەرگاکردنەوانە بۆ ئێمە بێت وا ئیفادە وەرگیراوەو پەنجەمۆرمان پێکراوە، ئیتر بۆچیی هەواڵی خێر نەبێت!

ئەمە یەکەم جارە لەم ناوەختەدا دەرگای ژوری حەپسەکان بخرێنە سەر گازەرەی پشت، دەنگ بەرزبووەوە، بە نائاسایی دەستکرا بە ناوخوێندنەوە:

- عمر عزیز محمد، دەنگ نەبو. جارێکی تر ناوەکە گوترایەوە. دیسان وەڵام نییە. یەکێ هاواری کرد لە حەوشەی ئەودیوە.

ئاییی ئەوە خۆ کۆمەڵەکەی ئێمەیە! باشە بۆچیی بەم شەوە درەنگە؟ دیارە شتێکی بەدەمەوەیە! دووەم ناو بەدویدا هات:

- محمد رحیم عبدالرحمن احمد. دوای ئەوەی بەدەنگێکی بەرز بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، لە ژوری یەکەوە دەرپەڕییە دەرەوە. سێیەم ناو خوێندرایەوە:

- کمال علی محمود. ئەویش بەهەمان شێوە هاتە دەرەوە. بە محەمەدم گوت: تەواوە، هەر گروپەکەی ئێمەیە. ئەوە هەموو ناوەکانی تاقمەکەی ئێمەیە. دەی خودا دەبێت چیی بێت.. دەی دەبێت ناوەکەی منیشی تێدا بێت.. هەر دەتگوت لەسەر ئاگر دانیشتوم.. ئاوا گوێم بۆ ناو خوێندنەوەی ناوەکان شل کردووە.. نا نا منی تێدا نیم.. نا نا منی بەرناکەوم. چوارەم ناو خوێندرایەوە:

- محمد سعید صالح عبدالله. دەنگ نەبوو هاوار کرا: لە حەوشەکەی ترە. دنیا لە بەرچاوی من بۆتە ئەڵقەیەکی بچوك کە هەر بەو شانۆ بچوکە و ئەو تەنها چەند دەنگەی دەزانم و هیچی تر، دەری ئەوانە لەلای من بوونیان نەماوە. ئەو لیستە بەدەستەی ناوی زیندانیی بانگ دەکات، ئەم دوو مرۆڤە لەیەك جیایەی کە هەریەکە بەجۆرێك و بۆ مەبەستێك ئەوقی ئەم حەمامە کراون، ناوی ئەندامانی تاقمەکەی ئێمەیە. گوێیەکانم بوون بەهەزار تا بە ئاگابم لەهەمو قسەو جوڵەو سرپەیەك! دڵم لەسەر هەزار لێ دەدات، هەروەك دادوەر وەستابێت و چارەنوسم بەسەر زاری ئەوەوە بێت و هەر ئەوەی ماوە بیدات بەگوێی مندا! ئەم چەند سانییەیەو ئەم ناوەی دوا ئەو ناوانەی خوێندرانەوە بڕیار لەسەر چارەنوسی من دەدەن! چونکە بڕیاری جیاکردنەوەو مانەوە، یان پێچەوانەکەی، هەر ئێستا دیاریی دەکرێت. دەبێت

پێنجەم ناو من بم، بازدان بۆ ناوێکی تر هیواکان دەڕوخێنن، لە پڕ دەنگ بەرزبووەوە:

- محمود ملا عزت محمود. بەڵام کەس نەهات دەرگاکەم لێ بکاتەوە.

منیش چاوەڕوانی شتێکی لەو بابەتەم. بۆ هاوار نەکەم؟ خۆ من چاوەڕوانی دەنگ فریشتەیەکی لەو بابەتە بووم، دەبێت خۆشیی ناوبانگکردنەکە وا وریی کردبم!؟ خێر دەنگو وەڵام نییە! حەپەساووم! جارێکی تر ناوەکەم خوێندرایەوە، باشە هەروەك نەریتی ئەم شەش مانگو سێ هەفتەیە بۆچی هاوار نەکەمو نەڵێم بەڵێ؟

بۆ خۆشم نازانم بۆچیی قسە ناکەم! بۆ لە دەرگاکە نادەم! ڕەنگە نەزانن من لێرەم! وا شڵەژاوم نازانم چی بکەم!

یەکێك هاواری کرد ژوورەکانی حەوشەکەی ئەودیو بگەڕێن.

نا با لەدەرگاکە بدەم باشترە! با لەوە زیاتر چاوەڕووان نەبم! ئیتر لەسەرخۆ یەك دوو جار بەدەرگاکەمدا کێشا. ئەوسا یەکێکییان هاواری کرد دەرگای حەمامەکە بکەنەوە. دەرگا کرایەوەو هەنگاوم بەرەو دەرەوە نا، بێئەوەی خواحافیزیی لە محەممەد بکەم! سەیرم کرد بانگکراوان بە ڕیزو بەچیچکانەوە لەحەوشەکەدا دایاننیشاندون. گوێم لێبو لە حەوشەکەی تریشەوە دەنگی ناو بانگکردن بەردەوام بو. هێنانە دەرەوە، هیوایە، کاتەکەشی بەپێچەوانەوە!

چییەو بەرەو کوێمان دەبەنو بۆچیی؟

ڕەنگە ئازادمان بکەن!

ئەی باشە بۆچیی بەم شەوە؟

جارێ ئەوە هەر لە عیلمی خواو ڕەئیسی هەیئەدایە. ئێمەی خاوەن کێشەو مەبەست کەسمان هیچی لێنازانین..

هێندەم زانی عەسکەرێك قاچی خستە سەرشانمو نەرمە پاڵێکی پێوەنام. ئەوە وردە ئارامییو خۆشییەکەمی تێکەڵ بەگومانو نائومێدیی کرد. مەزەنەی باشەی ئەم هێنانە دەرەوەیەی ئاڵۆز کرد. ئەو لەقەیە هێندە ئازاری نەبو، بگرە بێئازاریش بوو، بەڵام ئەو بیرەی لادروست کردم کە بڵێم لەم پلە نوێیەی زیندانییەکەماندا ئەمە سەرەتای بەردەوامیی نیاز ناپاکییە بەرامبەرمان..

بانگکردن تەواو بو.

فرمان درا کە هەستینە سەرپیان، بەرەو حەوشەی ئەشکەنجە بردیانین، لەوێ وەستێنراین.. یەکەیەکە چاویان بەستینەوە. کەوتنە دوو دوو کەلەپچەکردنمان. کە ئەوەش تەواو بو، فەرمانی ڕۆیشتنمان پێدرایەوە.

دواى چەند هەنگاوێك هەستم كرد بە دەرگايەكدا دەمانبەنە دەرەوە بۆ ناو ئوتموبيلێك.

نەمدەزانى بۆ ناو يەك ماشينمان دەبەن يان چەند ماشينێك، هەروەك بەسەريەكدا درابين وابو. هەر تەواو پەسترابوينەوە، هيچ جۆرە دەرفەتێكى خۆجولاًنمان نەمابو. كەلەپچەكەش زياتر بەستراوەى كردبوين.. سوكو بچوكترين جوڵەى دەست كەلەپچە بچوكو بچوكتر دەبێتەوەو قايمتر مەچەك دەگوشێت، بۆيە دەبوو لەو جۆرە جولاًندنانە زۆر وشياربم.

ئەوە وەزعێكى دەرونيى خراپى لاى من خولقاندو هيچ ئومێدێكى باشەى لەمێشكدا نەهێشت..

دەى دەبێت بۆ كوێمان بەرن. بڕوا ناكەم بەرەو ئەو مەركەزەى پۆليس بێت كە دەڵێن ئەو كەسانەى بێتاوان لەو تۆمەتانەى دەدرێنە پاڵيان، دەرچن، وا سەرفراز دەبن‌و ئەوسا دەياننێرنە ئەوێ تا لەوێوە ڕەوانەى شوێنى خۆيانيان بكەنەوە.. ئەوە ڕێى تێناچێت‌و گريمانێكى زۆر دوورە.

چونكە ئەم جۆرە رەفتارە لەگەڵ مرۆڤێ كە بۆ ئەو شوێنە ببرێ و بۆ ئازادكردنى بێت يەك ناگرنەوە.

چاوبەستنەوەو دوو دوو كە لەپچەكردن‌و بەم جۆرى گواستنەوەيە، لەگەڵ ئازادكردندا لەيەك دوورن.

وا درابوين بەسەريەكدا هەروەك كۆمەڵە فەردەيەك بەسەر يەكدا فڕێ بدرێن ئاوا بو. تەنانەت دەستمان بۆ نەدەجولێنرايەوە..

ڕێگاكەش لەبەرچاوى من دوور دەكەوتەوە.. پڕ لە تاسەو هەڵبەزو دابەز بو. وا دەرنەدەكەوت كە ئەمە لەناو شارى كەركوكدا بێت! هەر بە وەختەكەدا، ئەگەرى گواستنەوە بۆ شوێنێكى ترى ناو كەركوكى دەخستە بەرچاو، بڕواناكەم بەم ناوەختە بۆ دەرەوەى كەركوك بگوێزرێينەوە..

لەناو ئەو پەژارەيەى ئێمەدا هەريەكە لەهاوڕێى كەلەپچەكراوى خۆى دەپرسێت: ئەرى دەزانيت بۆ كوێمان دەبەن؟

گوێمان لەو سرپانەيەو هەريەكە وەڵامێكى پێيە! هەريەكە شتێك دەڵێت: خوا دەيزانێت. بۆ مەركەزى پۆليسەو بۆ بەردانمانە. بۆ كوشتنە. بۆ ئەمنى سلێمانييە. بۆ حەپسخانەيەكى ترە..

با بڵێين چاوبەستنەوەكە زۆر نامۆ نييەو رەنگە لەبەر ئەوە بێت كە هيچ زيندانييەك پەى بەشوێنى زيندانەكەو ڕێگەكەى نەبات. ئەى ئەم دوو دوو كەلەپچە كردن‌و ئەم بەسەريەكدا تێكترشاندنە بۆچيى؟ ئەى بۆچى بەم شەوە؟

ئەو بیرانە هەمو هۆش‌و گۆشی منیان داگیر کردووە. ماشینەکەش لەگەڵ تاسەو وردە پاژەندنماندا ڕێگە تەی دەکات، ڕووەو مەڵبەندێکی نادیارو چارەنوسێکی نەزانراو.. لەگەرمەی ئەو بیرە کوڵوانەدا بوم کە ماشینەکە خاوی کردەوە وەستاو خامۆش کرا. داگیراینە خوارێ. خراینە جوڵەو ڕۆیشتن. پێپلیکانەیەو پێیدا سەردەکەوین. دوای سەرکەوتنەکەو چەند هەنگاوێك ئەوسا وەستێنراین. کەلەپچەکان کرانەوە. پەڕۆی سەرچاویان لادەبرد، کردیانینە ژورێك.

کاتێ هەریەکە سەری هەڵدەبڕی، هاوڕێ کۆنەکانی دەبینییەوە کە زیاتر لە شەش مانگ و سێ هەفتەیەکە لەیەك دایانبڕیوین.. لەخۆشیدا پێمان ئەرزی نەدەگرت. کەوتینە دەستکردنە مل‌و ئەملاو ئەو لای یەکتری ماچ کردن..

کە ئەوە تەواو بو، کەوتینە پرسیارکردن لەم شوێنە.. لەهۆی هێنانمان بۆ ئێرە.. زۆری پێنەچوو هەندێك وەڵاممان دەستگیر بو.

دوای بڵاوبونەوەی نەخۆشیی پێست، زیندانیی دەگوێزرایەوە ئەم زیندانە نوێیە، لە هاوڕێکانی منیشیان تێدا بوو، حەسەن حسەین یەکێکیان بو. ئیتر کەوتە باسکردنی ئەم بینایە: ئێرە هەیئەی تەحقیقی خاسەی تازەیە. ئەم قاعەیە شوێنی ئەو زیندانیانەن کە دەدرێن بە (المحكمة الخاصة) ی سەر بەهەیئەکە. ئینجا ئاماژەی بۆ ئەو دیوی دەرگایەك کردو گوتی: زیندانییەکان دەچنە ئەو دیوەوە، بەرامبەریان شوێنی تایبەتیی ئەفسەرانی دادگاکەیە. شوێنی ئەشکەنجە هەر بەتەنیشت ئەم ساڵەوەیە..

ئینجا کەوتینە تەتەڵەکردنی بیروڕاو گریمانەکان. هەڵسەنگاندنی پرسیارو تاووتوێ کردنی ئەو بۆچونەی کە ئایا دەبێت بدرێین بەدادگا بێ ئەوەی تاوانێکیان لەسەر بارکردبین. هیچ کەسێکشیمان وای دەرنەدەخست کە شتێکی وای گوتبێت کە پێویست بەدادگاییکردن بکات. ئەی ئەگەر تاوان نەبێت ئیتر دادگای چیی..؟

لەدواییدا هەر خۆم بەخۆمم دەگوت:

< ئینجا کێ دەڵێت هەمومان هەر بەو جۆرەین!؟ یان کێ دەڵێت هەر بۆ ئەوە نییە کە حوکممان بدەن‌و جۆرێك لە یاساییکردنی مانەوەکەمان بخولقێنن..! یان دادگاییکردنێکی روکەشانە بکرێین بۆ شێوەیەکی یاساییکردنی کارەکانیان‌و گرتنەکەی ئێمە.. خێرا روخساری بێڕەزای بەعس خۆی نیشان دەدایەوە. دیسان بەخۆمم دەگوت: جا کەی ئەم رژێمە حسابی بۆ یاساو بۆ رای خەڵك کردووە تا ئێستا بۆ ئێمە ئاوا خۆی بەیاساوە ببەستێتەوە!

حەسەن‌و جەلال ئومێدی باشەیان رەچاو دەکرد، شارەزاییان لەم هەیئە نوێیەو لە هەندێ رێو رەسمی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەو دادگا پەیدا کردبو، بۆیە قسەکانی

ئەوانمان لا گرنگ بو. ئیتر شەوێکی کەمێ ئازادمان بەسەر برد.. کەم کەسمان ئەو شەوە خەوی لێکەوت.. دوو دوو و سێ سێ سەرمان دەنا بەسەری یەکەوەو هەریەکە کورتەی چیرۆکی خۆی دەگێڕایەوە، ئەو شەوە گەلێك دەنگو باسی نوێم دەربارەی خۆم لە زیندانییەکانەوە وەرگرت، بەتایبەتیی لەبەرپرسییاری من لەوان لەسەر بارودۆخەکەی سلێمانیو لەو هەڕەشەیەی کە هەمیشە لەخۆمیان دەکرد.. هەریەکە لەوان دەنگو باس و زانیارییەکی زۆری هەمە چەشنەی پێ بوو، من ئاگاداری هیچ نەبوم، بۆیە چیم بەبیردا بهاتایە پرسیارم لەسەر دەکرد.

نەمانزانی چۆن شەومان بەسەر بردوو رۆژمان لێ بووەوە.

ئێمە هەمومان بێ ئارامیمان پێوە دیارە، چونکە وا دەزانین کە ١١ی ئایار چارەنوسی ئێمەی تیا بڕیار دەدرێت. چارەنوسیی ئێمەی تیا ئاشکرا دەبێت.

بۆ سەرلەبەیانیی ئەو رۆژەی مانگی مەی، لەگەڵ چونە سەر ئاودەستو دەمو چاو شتن، کە ئاسایی بوو، حەرەسەکە بۆی دەرخستین کە ئێمە غەدرمان دەرهەق کراوە. ئەوانەی ئێمەیان وا بێ گوناه بەگرتن داوە، لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێتو سزای خۆیان وەردەگرن. بۆیە ئێمە هەر ئازاد دەکرێین! بەڵام کەی؟ ئەم پرسیارە بێ وەڵام بوو.

ئەوە یەکەم جاریش بو روخساری مرۆڤێکی ناو هەیئە وا بەئاشکرا ببینین، قسەی وا دڵخۆشکەرە بدات بە گوێماندا و ئەو مژدەیەمان بداتێ. یەکەم جارە مرۆڤێکی ناو ئەم دووهەیئەیە دۆستو ئاشنایانە قسەمان بۆ بکات.

لەوانەش سەیر تر، ئەم پاسەوانە، هەمان ئەو پاسەوانەیە کە لە یەکەم رۆژدا فرمانی بە حەرەسەکان دا کە چەند موحازەرەیەکمان دەربارەی جۆری پێڕەوکردنی یاسای هەیئەو هەڵسوکەوتەکان بۆ بدات! ئەوەی سەرنج راکێشەر بوو، دەری نەدەخست کە ئایا چۆنو کەیو لەکوێ بەردەدرێین!

کە ئەو پرسیارەشمان لێدەکرد: بەنازانم بەڵام رەنگە ماوەیەکی تر بمێننەوە، وەڵامیی دەدایەوە گوایا دوای ئەوە ئازاد دەکرێین! هەر بەو دڵخۆشییەوە، نانەکەمان خوارد. بەڵام ئەو شادیو خۆشییە زۆری نەخایاندو لەو شەوە تێپەڕی نەکرد، بەئاسانیی زەوتیان کردەوەو پێچەوانەش بووەوە..

## کاروانی بێ کۆتایی بەرەو چارەنوسی نادیار بەردەوامە

زۆر بەسەر نانخواردنەکەدا تێپەڕ نەبوو کە دەنگێکی گڕی ناسازی ترسناك "دەنگی مولازم سوبحی" بەرز بووەوە، دەستیکرد بەناو خوێندنەوە، هەمان زنجیرەی لیستەی ناوەکان بو.

هەرکە دەچوینە پێشەوە، دیسان چاومان دەبەسترایەوەو دوو کەلەپچە دەکرایە دەستمانو کێش دەکراینو دەخراینە ماشینەوە.. دیار بوو تا دوا کەسمان ئەوەی لەگەڵ کرا.. دواییتر ماشین یان ماشینەکان کەوتنە گەڕ بێ ئەوەی هیچ قسەیەك یا ئاماژەیەك بۆ بە ڕێکخستنی ئەم کاروانە بکرێ.

من هۆشم چڕ دەکردە سەر قسەکان تا شتێك حاڵی ببم بەڵام بێسود بو. بەرەو کوێیە؟ کەس نازانێ.. دوای نیو سەعاتێك لەسەرخستنمان بۆ سەر ماشینەکان، کاروان کەوتە جوڵە.

نەمدەزانی کێ لە گەڵما کەلەپچەکراوە.. بیرم لەوە کردەوە کە لەم هاوڕێی کەلەپچەیەم پرسیار بکەم، بەڵکو ئەو مەزەنەی بکات. ئانیشکێکم لە کەلەکەیەوە داو بە سرپەیەك:

< ئەرێ بەرەو کوێیە؟

- بە نازانم وەڵامەکەی دامەوە.

گەرما زۆری بۆ هێنابووم. لەشم کەوتە ئارەق رشتن. پێویستیی لەش بەتەڕایی‌و بۆ جێگرتنەوەی تەڕایی زایە بوی لەش، تینوێتی جوڵاندم. بەخەمڵان سەعاتێك دەبێت خراوینەتە رێگە.

ماشینەکان هەر دەنگو سەدای تەیکردنی رێگەی دێ. هیچ بۆچونێك، بیرێك، مەزەنە کردنێك خەیاڵێك پەی بەم نەهێنییانەی ئەم کاروانەش نابات.. بۆیە لای من بوو بە کاروانی بێئومێدیی. چونکە هیچ جۆرە نیازچاکییەك بە بیردا نایەت.. دوای حەوت دانە مانگ یەك هەفتە کەم لەو دۆزەخەی بەعسدا دەبێ بەرەو کوێ بمانبەن؟ چیمان لێبکەن؟ لەبەر ئەوەی ڕێڕەوی کاروانەکە درێژەی کێشاو هەر بەردەوامیشە، بۆیە بۆچونی بەردانو بەرەو مەرکەزی پۆلیس نەما. وا مەزەنەی بۆ سلێمانیی بردنەوەش لاواز دەبێت...

باشە ئەی حەرەسەکەی سەرلەبەیانیی، بێ بناغە ئەو قسانەی کردو بەبۆش دڵی خۆش کردین!؟ ئەی ئەو درۆیانەی لەچیی‌و بۆچیی؟

سەفەرەکەمان بوو بە سەفەری هاتو نەهات، کە مەزەنەی زیاتر لە دوو سەعات بۆ ئەم کاروانە هات بەمێشکمدا، ئەوسا وشەی بەغدا پەردەی گوێی لەراندەوە.

لە تاووتوێکردنی چارەنوسەکەدا جار جار بەغدا بەبیرمدا دەهات. لەوە زیاتر هیچ بۆچونێکی تر نەدەهات بەخەیاڵدا.. دەبێت هەر بۆ ئەوێ بێت.. بۆچی بۆ ئەوێ بێت؟ لەوێ چیمان لێدەکەن؟ بۆ سێدارەیە یان زیندەبەچاڵ کردن.. ئەو پرسیارانەو دەیانیی تر دەهاتن بە مێشکدا بێ چاوەڕوانیی وەڵام تێدەپەڕینو هی تر جێگەیانی دەگرتەوە.. بەتایبەتیی گەرماو تینویەتیی زۆریان بۆ هێنابووم تاقەتی ئەوەم

نەمابوو زۆرو قووڵ لەسەر لێکدانەوە بووەستمو زیاتر خۆمی پێوە هیلاك بکەم.. چونکە ئەوەندە هیلاك بوبوم ئیتر جێگە بۆ هیلاکبوونی لەبابەتێکی تر نەمابوو..

کاروانی سەر ئەم رێگەیە لە سێ سەعات تێپەڕی کردووە. بۆچونی ناردنە بەغدا بەهێز بووە. خێرایی ماشینەکە وەك لەمەوبەر نەما، هەستم دەکرد کە لە شارێکی قەرەباڵغ داین، جار جار سوكو سوکتر کردنەوە، وەستان سەرلەنوێ لێخوڕینەوە، ئەو بۆچونەیان زیاتر دەچەسپاند. وەختێکمان زانیی ماشین وەستا. لەسەرەتادا ماشینەکە بەردەوام لەکاردایە. ئەوە وای دەگەیاند کە ئەم وەستانە کاتییە. تینوێتییم زیاترو زیاتر دەبێتو زۆری بۆ هێناوم. باش بو دوای نان خواردنی بەیانیو بیرهاتنەوەی یەکەم رۆژی گرتنو گوشارەکەی بەرموسەلان لە ئەمنی سلێمانیدا، وای کرد کە بڕیار بدەم ئاو نەخۆمەوە.

گوێم لە هاتنو چونی پاسەوانەکانە. گەرماکە تا دەهات زیاتر دەبو توینێتیی نائارامتری دەکردم. بۆچی وەستێنراوین؟ نازانین. چاوەڕوانی چیدەکەن؟ نایزانین.. تا گوێم لە یەکێکیان بوو گوتی: دەوام تەواو بوە وەریاننناگرین.. سەیرە بۆچی ئەمانە بۆ قەلاچۆکردنی دوژمنەکانیان بۆ ئەم جۆرە کارە پیرۆزانەیان، دەزانن دەوامو ئیسراحەت و نارەحەتی چییە! بۆ ئێمە ئەمە چاوەڕوانییەکی کوشندەیە. چەند دوژمنێکی بەزمانو بێزمان لەناو ئەم ماشینەو لەم گەرمایەدا بەم برسێتی و تینوێتییەشەوە گەمارۆ دراونو ناشزانن چیان لێدەکرێت...!

وای بۆ دەچوم کە چەند بەڕێگەوە بوین نیو هێندەش بەمجۆرە هێشتیانینەوە، ئەوجا هێنانەخوارەوەمان دەستپێکرد.. کاتێ پێم کەوتە سەر زەوی هەروەك پێم خرابێتە سەر ژێلەمۆ ئاوا بو. لەوەش خراپتر دیسان وەستانو چاوەڕوانیی. ئایی (چاوەڕوانی) تۆ خۆت لەخۆتدا تاقەتبەریت، جا وەرە لەم وەزعەی ئێمەداو لەناو ئەم کاروانە بێ کۆتاییەداو لەسەر ئەم ژێلەمۆیە بەمجۆرەش بێت..

کارەکە هەر بەوەوە نەوەستا. وەختێکمان زانیی هەر زەلامەو دێتە پێشەوە. گوێم لێیانە دەڵێن: خوا داوێتیو ئەمشەو بەزممان لەگەڵ ئەم مەجوسانەدا خۆش دەبێت.. یەکێکی تر دەیگوت: یەکەیەکەی ئەم خومێنییانە.. دەتۆپێنین. وا دیارە بە نۆکەری ئێران یان فارسو ئەسیری قادسییەی سەدداممان تێدەگەن.. یەکێکی تر نزیك دەبێتەوەو شەقێك دەهاوێتو دەڵێت خۆت بگرە بۆ ئەمشەو.. ئەوی تر بۆکسێك دەهاوێتو دەڵێت: یاریی ئەمشەومان خۆش دەبێت.. ئیتر بەو گاڵتەجاڕییەوە زیاتر لە نیو سەعات لەسەر ئەم ژێلەمۆیە بەگیریان هێناوین. ئەوە شەش مانگو سێ هەفتەیە ئێمە گۆرەویشمان لەپێدا نییە، ئازارو شوێنەواری ئەشکەنجەیان پێوە دیارە، بێ هەتاویی، چڵکنیو خۆنەشتن، لێدانو ئەشکەنجە، بێ ڤیتامینیو

خواردنی نائاسایی‌و بێ دوکتۆرو خەستەخانە. تاد ئەوانە بوبونە هۆی ناسک بونەوەی هەمو ئەندامەکانی لەش. بۆیە ئەم وەستاندنەی سەر ئەم ئەرزە گەرمەو ئەو هەمو گاڵتەو سوکایەتی پێکردن‌و هەڕەشانە بەسەرەتای قۆناغێکی نوێی ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە دادەنێم. لەش بەگشتی‌و پێ بەتایبەتیی وا ناسک بونەتەوە کە بەرگەی هیچ جۆرە لێدانێك نەگرن. ئەم وەستان‌و چاوەڕوانییە لەسەر ئاگرو بەو تینوێتی‌و برسێتییە، هەرچیی دیمەنەکانی هەیئە بو بەشێوەی جیا جیاو پێشبینیی ئەشکەنجەی نوێ بەبەرچاومدا تێدەپەڕین‌وخۆم بۆ پلەیەکی نوێ لە ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە ئامادە دەکرد. تا خستیانینە ڕێ.

لەو ڕۆیشتنەدا لەناو ئەو گەمارۆدان‌و گاڵتەپێکردن‌و هەڕەشانەدا، لەخۆمم دەپرسیی:

تۆ بڵێیت ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەی ئەم پلەی دووەمە لە هەیئە زەحمەتترو قورستر بێت!

ئاخۆ دەبێت ئەشکەنجەی ئێرە چۆن بێت‌و چیی بەکار بهێنن!؟

باشە بۆ ئەمنی عاممەیە یان دیسان بۆ زیندانێکی سەربازییە یان بۆ شوێنێکی ترە! نا بڕوا ناکەم لە هەیئە خراپترمان لێ بکەن. ئەی خاوەن ئەزمونەکان نەیاندەگوت جیاوازیی نێوانی ئەم هەیئەیەو زیندانەکانی تر زۆرە. خۆ ئەگەر بۆ ئەمنی عاممە بێت وا باشتر، چونکە دەگوترا لەوێ کاتی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە تێکەڵ بە ژیانی ڕۆژانەی زیندانەکە نەدەکرا. لێدان‌و ئەزییەت و زەحمەتیی‌و ئەم پیس‌و پۆخڵییەی هەیئە لەوێ نییە، تەنانەت شت کڕین، بە جلیشەوە ڕێگە پێ دەدرێت.. لەگەڵ گەلێ شتی تردا.. دەی خوا کەریمە با بزانین نسیبمان بۆ ئەوێیە یان بۆ زیندانێکی ترە..

لەشکری زیندانییان، بیست‌و شەش بێچارەی کوردە. بۆ کوێ..؟ ئەوە هەر خۆیان دەزانن! هەر ئەوەندە دەزانم جەللاد بەدەورمانەوەن‌و هەڕەشە دەکەن. شەق دەهاون، جنێوی پیس و ناشیرین لە دەمیان دەبارێت.. تومەس ئەم کولتوری جنێوە پڕ لە بێ ڕەوشتییە، گشتییە.. ئەم ڕق‌وکینە نائاسایی‌و نایاسایی‌و ویژدان مردووییە لەناو ناخییاندا ڕەگیان داکوتاوە.. فرمان دراو خراینە ڕێ..

هەر دەڕۆین‌و ئەو کارانە بەردەوامە. بە پێپلیکانەدا سەردەخرێین، دیسان ئەوانە بەردەوامن.. سەرلەنوێ کەوتنەوە ڕێ. تا کراین بەژورێکداو ئینجا فرمانمان پێدرا کەبووەستین..

# کاروانی بێ کۆتاییو گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## (٩)

## کاروانی بێنومێدیی

ئێمەی نابینا، منی نابینا، ئەبڵەقو واق ورماوین، نازانین لەکوێین، کێمان بەدەورەوەیە، چیمان لێدەکەن، سەرەتای دوا ئەم ئەبڵەقییە چیی روودەدات، ساتێکی بێدەنگ هەروەك گۆمی بێ سرپەو ورشەو پرشەیە. دەبێت ئەم پەردە نوێیەی ئەم شانۆگەرییەی سەر ئەم شانۆ نوێیە چیی بێت! لەپر دەنگێك بەرزبووەوەو مەنگیی ژورەکەی شڵەقاند، بەئاوازێکی نوێ گوتی:

- دەی ئێستا دابنیشن، هەریەکە لە جێگەی خۆی دابنیشێت! من لە شوێنەکەی خۆم بەچوار مەشقیی لێی دانیشتم، ئینجا هەمان دەنگ:

- چاوتان بکەنەوە. جارێکی تر دووبارەی کردەوە، دەستم برد پەڕۆکەی سەرچاوم لابرد. بە تیلەیەکیچاو بێ سەر جوڵان چاوێکی بروسکە ئاساییم گێڕا.. باشە هەر هەمومان پێکەوەین.

دەی سەرتان هەڵبڕن.. جارو دوو جارو سێ جار ئەو قسەیە کرایەوە، تومەس کەس ئەو فرمانە جێبەجێ ناکات.. چۆن کاری وابکەین، ئەوە راستەوخۆ لەدژی پەروەردەی ناو هەیئەیە کە لەناو تەمەنێکی دوورو درێژی پڕ لە ئەشکەنجەی چەندین مانگیدا جێگەی خۆی گرتووە! کە تێیدا سەرهەڵبڕین توندترین سزای هەبو، بۆ ئێمە ئێرەو هەیئە وەك یەك وان، نابێت هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا هەبێت.

ئێمە وامان لێهاتووە کە جگە لە ژورەکەی زیندانەکەمان، بەهەمو قسەو شتێکی تر نامۆ بین، هەمو شتێکیش بە ئێمە نامۆ بێت!

بۆیە بۆ ئێمە زەحمەت بو وا ئاسان بڕوا بەو گۆڕانە گەورەو لە پڕە بکەین. چونکە خۆیان لەو ماوە دوورو درێژەدا لە تەقەلای بەردەوامدابون بۆ سڕینەوەی ناوی سەربەرزیی. کەچی ئێستا دەیانەوێت بەیەك فەرمانی دوو وشەیی ئەو شوێنەوارە

بسڕنەوە.. بۆ ئێمە لێکدانەوەکەمان نائاسایی نەبو، بۆ ئەوانیش سەرەنجامی بەشێکی نەخشەکەیان بوو. وا بەچاوی خۆشیان دەبینن‌و تێدەگەن کە کۆرسە دورو درێژەکەیان بێ بەرهەم نەبووە! کوشندە بووەو بەرنامەکەیان ئەنجامی کاریگەری خۆی هەبووە. بۆیە دەبێت بەرنامەیەکی نوێ‌و سەردەمی بۆ ئەم پلە نوێیە دابنێن..

دوای سێیەم جار هەرکەسە لە جێگەی خۆیەوە سەری هەڵبڕی، سەیرێکی یەکترمان کردو لەهەمان کاتدا رومان دەکردە ئەو لێپرسراوە شەریفانە! دیارە هەریەکەمان لەدڵی خۆماندا ئەوەمان لێکدەدایەوە کە دەبێت ئەمە راست بێت؟ ئەی بۆچیی وا دەکەن؟ ئەی دەبێت مەبەستیان لەمە چیی بێت، دەبێت ئاسمانی ئێرەو کەرکوك و سلێمانی دوو سێ رەنگ بێت! دەبێت بانێك بێ‌و دوو هەوا!؟

هۆڵێکی گەورە هەر بیست‌و شەش کەسەکەمان بەتەنیشت یەك‌و بەیەك بازنە دانیشتوین‌و پاڵمان بەدیوارەکانەوە داوەتەوە. لای دەرگای هۆڵەکەش چەند کەسێك وەستاون. یەکێکیان کەوتە قسە تا پێناسەی ئەو لێپرسراوانەمان بۆ بکات. یەکە یەکە روی تێکردن‌و بە ئاماژەوە:

- عەقید طارق العزاوی- معاونی مودیری ئەمنی عام بۆ کاروباری سیاسیی.

ئەبو نەصر- مودیری شوعبەی سێ. (ئەم بەشە تایبەتە بە کوردو شۆڕشی کوردستان).

- نەقیب خەڵەف- معاونی مودیری شوعبەی سێ.

چەند کەسێکی تر بەجلی سڤیلەوە لە پشتیانەوە وەستاون‌و بە ئێمەدا هەڵدەڕوانن.

ئێمە ورو گێژین! هەروەکو خۆڵ‌و دۆمان بەسەردا کرابێت وایە! جوڵە لە ژورەکەدا بڕاوە! ئێمە ئەوەندەمان لەسەرە کە گوێ بگرین‌و فرمان جێبەجێ بکەین! باشە ئەم پێناسین‌و پێشکەش کردنە، چییەو بۆچییە؟ خۆ هەرچەند دەقیقەیەك لەمەوبەر لەناو جنێوو شەق و سیخورمەو بۆکسی حەرەسەکاندا بۆ ئێرەیان کێش کردین. ئەی ئەم گۆڕانە چییە؟ ئەم کارە ناکۆك‌و دژ بەیەکانە لەیەك کاتداو لەیەك سەرچاوەو لەیەك شوێن‌و هی یەك داو‌و دەزگای یەك رژێم، هیچ لۆجیك‌و ئەقڵێك نایانگرێتەوەو پێکیانەوە نابەستنەوە..

ئێوە وا گیران کە بێ لێکۆڵینەوە و بێ دادگا بکوژرێن!

عەقید تاریق دەستی بەقسە کرد:

- ئێوە دەزانن چیتان لێدەکەین؟

وەك چاوەڕوانی وەڵام بێت، بەو جۆرە بێ دەنگ مایەوە.. باشە وەڵامی چیی بدەینەوەو بڵێین چیی!

- باشە چیتان لێ بکرێت؟ دەنگ لەکەسەوە نایەت. قسەکەی دووبارە کردەوە؟ هەر بە راستیی پیاو لەبەردەم ئەو پرسیارەو هەڵبژاردنی وەڵامەکەیدا واقی وڕدەمێنێت! خۆ خۆشمان هەر پێش ئەم پرسیارە وامان لێهاتووە! یانی ئێستا خۆمان دادگایی خۆمان بکەینو ببین بەحاکم بڕیارەکەش هەر ئێستا بدەین. نەمدەزانی لەچی کەلەبەرێکەوە قسە بکەم. وەختێکم زانی دەنگی حەمە سەعیدی حاجی فەقێ روی ئێمەی بۆلای خۆی راکێشاو بەعەرەبیی گوتی:

< وەڵا ئێمە هیچمان نەکردووە، ئێمە هەمو پیاوی شەریفینو لەخۆڕایی گیراوین، کەیفی خۆشتانە چیمان لێ دەکەن. دوای گوێ شل کردنی عەقید بۆ قسەکانی حەمە سەعید، گوتی:

- لە راستیدا ئێوە بۆ ئەوە نەگیران کە لێرەدا بتانبینینەوەو ئێستا لەژیاندا بن!! ئێوە وا گیران کە بێ لێکۆڵینەوەو بێ دادگا بکوژرێن.

دەی، بۆیە ئێمەیان کردبو بە قوربانیی ناو قەسابخانەکە. با بزانین ئێستا چۆن بڕیار لەسەر چارەنوسمان دراوەو چۆن پێمان رادەگەیەنن! وا پێدەچێت ئێستا باسی چارەنوسەکەمان بکەن. عەقید لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوامە:

- بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە کە ئەوە نەکرا. چونکە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان بۆمان دەرکەوت کە ئێوە هاووڵاتیی باشو بێ زیانن. بۆیە سەرکردایەتی حیزبو شۆڕش ئێوەی عەفو کردوە.

ئێوە ئێستا میوانی سەرکردایەتین. ماوەیەك لامان دەمێننەوەو ئازاد دەبن. ئێوە ئێستاکە ئازادن.

ئەو قسانە بۆ ئێمە شەماڵێکی فێنکی ناو پڕوکاویی ئەم کاروانی بێ کۆتاییە پڕ لە نائومێدیو هەستی ژاکاوو جەستەی شەکەتبوی ناو چارەنوسێکی نادیارو تاریکە کە راستەو خۆ دڵو گیانو دەروون دەحەوێنێتەوە..

لێپرسراوانی تری ئەمنی عامەش بەسەرنج دابەشکردنەوە بەسەر ئێمەدا گوێیان گرتووە. روخساریان نیشانەی هاوبەشیی خۆشییەکەی ئێمەی لێ دەبارێت.

بەڵام قسەکانی عەقید بەیەك ناکۆکن. هەر لە دوو سێ رستەی کورتدا دوو ناکۆکیی گەورە ئاشکرا دەبن..

ئەگەر لە لێکۆڵینەوەدا دەرکەوتبێت کە ئێمە مرۆڤی باشین، ئەی ئیتر عەفوکردن مانای چیی!

مرۆڤی باشو بێ تاوان پێویستی بە عەفوکردن نییە. عەفو هەر بۆ تاوانبارە، بۆ لێخۆشبونە لەتاوانی تاوانکار..

جا ناکرێت ئێمە، بێ تاوانو لەهەمان کاتیشدا تاوانباریش بین!

ئەو لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوامە:

- ئێوە دەڵێن چیی؟ سەرنجەکانی بەسەر یەکە بە یەکەماندا دەگواستەوە بێ ئەوەی کەس وەڵامی بداتەوە.

ئەی دەبێت چی قسەیەك لە ئێمەی مێشك شڵەقاو چاوەڕوان بکات. کەمێ وەستاو ئیتر چاوەڕوانی وەڵامی ئێمەی نەکردو گوتی:

- دیارە لە سەفەرێکی دورو درێژەوە هاتون، ئێستاکە برسیتانە، چیی دەخۆن؟ سەیری هەمومانی دەکردو چاوەڕوانی وەڵام بو. دەنگ لەکەسەوە نەهات. ئەی گوایە بڵێین چیی؟ چۆن بڕوا بەم قسانە بکەین! تا دوێنێ ئێمە کۆیلەی دەستی عەسکەرە جەللادەکان بوین کە بە ئارەزوی خۆیانو لێکۆڵەران لەو دۆزەخەدا ئەشکەنجەیان دەداینو هەمیشە لە بەردەم هەڕەشەی کوشتندا بوین. کەچیی وا ئەمڕۆ دووەم لێپرسراوی بەدەسەڵاتی ڕەزاگرانترین دەزگای داپڵۆسێنەری عیراق کە لەناوچەکەماندا مەرگ دەچێنن‌و گیانلەبەر نییە تاڵاوی ئەمانەی بەقوڕگدا نەکرابێت، وەستاوەو پرسیار لە ئێمە دەکات کە حەزمان لەچی خواردنێکە. پرسیارەکەی دووبارە کردەوە. دیسان وەڵام نەبو. ئەوسا ڕوی کردە منو گوتی:

- چیی دەخۆن‌و حەزتان لە چییە؟

< ئێمە زۆرمان تینوو برسییە، هەرچییەك بێت دەیخۆین، هەر وەك خواردنی حەپسەکانی تر باشە!

- بەڵام ئێوە حەپس نین، خواردنی تر بڵێن. من بڕوام نەدەکرد لە خواردنی زیندانییەکانی تر زیاتر بهێنن، سەرلەنوێ گوتم:

< هەر خواردنێك بێت باشەو دەیخۆین، خواردنی حەپسەکانی تر باشەو دەیخۆین، یان کەیفی خۆتانە.

سەیرێکی کردمەوەو بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- ئاخر ئێوە حەپس نین ئێوە میوانن حەزتان لە چییە قسە بکەن تا بۆتان بهێنن.

ئیتر یەك دوانێك دەنگیان بەرز کردەوەو گوتیان:

< مامۆستا مەحمود بڵێ مریشك، بڵێ مریشك دەخۆین. عەقید تاریق ڕوی کردەوە من:

- ئەوە دەڵێن چیی؟

< بە دەڵێن مریشك دەخۆین، وەڵامم دایەوە. ئیتر عەقید ئاوڕی لە یەکێکیان دایەوەو گوتی بنێرن بۆ مریشك بۆیان..

تا مریشك هێنرا گەلێ قسەی دڵدانەوەی لەو بابەتەی سەرەتای کرد. کە نانەکەمان بۆ هات بەجێیان هێشتین. هەریەکە نیو مریشکی ڕازاوە بە سەوزەو تەماتەی بۆ هێنرا. ئەوە خۆ بەڕاستیانە! ئەوە مریشکیان بۆ هەمومان هێنا.

ئێمەش دەستمان کرد بەخواردنی مریشکی برژاو.. دوو سەدو پێنج دانە ڕۆژە نازانین خواردنی لەو بابەتانە چییە! ئێستا وا ئاسان کەوتۆتە بەردەستمان. ئاسمان کۆڵەکەی دەوێت..

لەگەڵ تاساویی بەردەم ئەم شانۆگەرییەی کەمێکی لێ تێدەگەین، ئێمەی ژەمبوردە، خۆمان لە مامری برژاو مڕ کرد..

پێش تەواوبونمان لێپرسراوانی ئەمنی عامە هاتنەوە شوێنی خۆیان. بە سەرنجی روخسار گەشەوە سەیریان دەکردین.

کە لە خواردنەکە بوینەوە.. دیسان عەقید تاریق گوتی:

- چا دەخۆنەوە..؟

< چەند دەنگێك پێکەوە گوتیان بەڵێ.. دەی چایان بۆ بێنن. زۆری نەبرد لە پیاڵەی زەرلیدا چا بۆ ئەم میوانە ئازیزانە هێنراو دابەشکرا! سواڵەتە چای نەوتاوی لەکوێو ئەم دیمەنە ئاوابوە لەکوێ! ئەو تێربونو چا خواردنەوەیە لەناو بیرکردنەوە لە قسەکانی موعاوینی مودیری ئەمنی عام بۆ کاروباری سیاسی، هێندە بەلەزەتو خۆش بون کە ڕەنگە دەگمەنێکی تری ئەو جۆرە دیاردانە لە وێنەی نەخوڵقابێت.

کێ چای تری حەز لێبوو بۆی هێنرایەوە.. ئەو روداوانە وا بەگوڕ تێپەڕ دەبون کە نەماندەزانیی وەخت گەیشتۆتە کوێ.

دوای چاخواردنەوە عەقید تاریق هەندێ قسەی کردو لەگەڵ ئەبو نەسردا ڕۆیشتن. ئیتر شانۆکەی بۆ نەقیب خەلەف بەجێهێشت.

قسەکانی نەقیب هەروەك روخساری گرژومۆنی بو، وەك ئەوانەی عەقید گەرمو گوڕ نەبون. لەناو قسە خۆشەکانیدا لەسەر جگەرە گوتی:

دیارە یاسای هەیئە ڕێگە بەجگەرە کێشان نادات. ڕەنگە تاکە قازانجێك کە لەو زیندانییەی هەیئەدا دەستتان کەوتبێت!! هەر ئەوەبێت کە لەو ماوەیەدا جگەرەتان نەکێشاوە. جا ئەوەی دەیەوێت جگەرە بکێشێت قسە بکات. جگەرەکێشەکان دەنگیان لێ بەرزبووەوە. جگەرەی بەغداو سۆمەریان هێنا. دەستکرا بەجگەرەکێشان. دوای ماوەیەك نەقیب خەلەف ڕوی کردە منو گوتی:

- ئوستاز محمود جگەرە ناکێشیت..؟ سەیرە لەکۆیلەیەکی یەخسیری پروکێنراوی سوکایەتی پێکراوەوە بووەوە بە ئوستاز! چی گۆڕانێكو چی ویژدانێكو چی ڕەوشتێکە ئە ئاوا بێ شەرمو شکۆ جێگەگۆڕکێ بەخانەی ژیانو ڕێزی مرۆڤی بەردەستیان دەکەن!

< نەخێر ناکێشم.. بەسەرسوڕمانێکەوە گوتی:

- چۆن هەر نەتکێشاوە؟

< بەڵێ کێشاومە.. بەڵام ئێستا ناکێشم.

- دەزانم تۆ جگەرەت دەکێشا، دیارە بەهۆی ئەو ماوەیەی هەیئەوە تەرکت کردوەو دەتەوێت نەگەڕێیتەوە سەری؟

< راستە هەیئە جگەرەی لەبیر بردوینەوە بەڵام نەکێشانەکەی ئێستاش هەر ناچارییە.

- مانای چیی؟

< راستییەکەی من ئەو جگەرانە ناکێشم..

- ئەی حەزت لەچیی جۆرێکە؟

< دیمۆری یان گریڤن یان رۆسمان.

ئەویش رویکردە یەکێك لەوانەی لە پشتیانەوە وەستابون، فرمانی پێدا کە لە هەر یەکە لەوانە گلۆزێك بهێنێت.

دیمۆری نەبو، بۆیە رۆسمانو گریڤن هێنران.

ئیتر دەستم کردەوە بەجگەرەی رۆسمان. دیارە زۆر لەجگەرە کێشەکانیش بون بە شەریك.

چۆن نەقیب خەڵەف دەیزانی جگەرەکێشم؟ لە دوو بۆنەدا من ئەم نەقیب خەڵەفەم ناسیو ئەویش منی ناسیی.

یەکەمیان: دوای هەرەسەکەی شۆڕشی ئەیلول لە ئازاری ١٩٧٥ کە گەڕاینەوە دوای بینینەکەی "عامری فەرعی شیمال" پێیان راگەیاندم کە بەبێ ئاگاداریی ئەمن بۆم نییە سلێمانی بەجێ بهێڵمو دەبێت هەمو رۆژێك بچم لەوێ ئیمزا بکەم. بەو جۆرە بێ یاساو بێ دادگا حوکمی زۆرەملێی ئیمزای رۆژانەم بەسەردا سەپێنرا.

ئەم سەپاندنی ئیمزاکردنە لەگەڵ بیستنی هەواڵی حوکمی غیابیم بەمردن لەلایەن المحکمە الخاصەکەی هەیئەی تەحقیقی لەهاوینی حەفتاو چواردا، ئەو ئیمزای رۆژانەیە، گەورەترین کێشەو ململانێی دەرونیی مانەوەو نەمانەوەیان بۆ خوڵقاندم.

بەهەر حاڵ دەبوو رۆژانە بچمە لای یاریدەدەری بەڕێوەبەری ئەمنی پارێزگای سلێمانی بۆ ئەو ئیمزاکردنە، کە تا نەفیکردنم بۆ ئەلجزیرەی رەمادیی درێژەی کێشا. یاریدەدەریش لەو کاتەدا نەقیب خەڵەف بو.

ئەم خەڵقی رەمادی بو. منیش بۆ جزیرەی پارێزگای رەمادی دوور خرامەوە. دواییتر بۆ قوتابخانەی (موغیرە بن شوعبە) لەناو شارەکەدا گوێزرامەوە.

دووەمیان: کە نەقیب خەڵەف بەمۆڵەت دەهاتەوە شارەکەی خۆی "رەمادی"، جاروبارو بەرێکەوت لەسەر جادەکان یەکترمان دەبینیی و چاكو چۆنیمان دەکرد. جا لەو دوو بۆنەیەدا خەڵەف دەیزانی کەجگەرەکێشم.

شەو درەنگ بو، وا پێدەچێت جەماعەت زۆریان پێ خۆش بێت لە خزمەتماندا بن. بۆیە گوێ نادەنە کات، دەبێت ئاگایان لە ئێمەی ماندوی کاروانێکی دوورو درێژی ناو هەیئە، شەکەتو مێشك شڵەقاوی ئەو هەموو گۆڕانە هەژێنەرانەی پانزدە بیست سەعاتی رابوردوو نەبێت!؟ لەو ساتانەدا کە ئەوە بەخەیاڵدا دەهات یەکێکیان گوتی:

- ئیتر شەو درەنگەو بابڕۆین، ئەمانیش هیلاکن و با بخەون. ئەوان لێیانداو رۆیشتن.

- ئێمەش بەسەرسوڕمانەوە لەسەر ئەم دۆخە نوێیەی خۆمان دەدوێین، ئەمشەوو دوێنێ شەوو پێری شەو بێ سنوور لەیەك جودان، مەگەر هەر خواو رژێمەکەو ئێمەیان یەك بێت.

تۆ بڵێیت هەیئەو ئەمنی عاممە، ئەوەندە لەیەك جوادابن؟ لە راستیدا شانۆگەرییەکی زۆر خۆشە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە قارەمانی سەرەکیی سەرشانۆکەین، کەچی بەزەحمەت لە کەمێکی دەگەین.

باشە ئەگەر ئێمە وا ساڵح دەرچووین ئەی بۆچی ئیزنمان نادەن!؟ ئەم میواندارییە بۆچیی؟ باشە ئەگەر هەر چاکبونەوەی برینو رەنگ هاتنەوە سەرخۆو مێشك شۆردنەوە بێت، ئەی بۆچی هەر لەکەرکوك لە حەپسخانەیەکی ئاسایی لەشوێنێکی تری خۆیان لەوێ یان لە سلێمانی ئەم میوانداررییەیان نەکردین! من بۆ خۆم لەگەڵ لێکدانەوەی ئەو روداوو قسانەو شیکردنەوەیان گەیشتمە جۆرێك لە دڵنیایی، ئەگەر روداوێکی خراپ نەخولقێت، وا ئەم میوانداررییەیان بۆ سڕینەوەی شوێنەواری ژیانی ئەشکەنجەی دەرونیو گیانییە، بۆ ئاسایی کردنەوەی رەفتارو بیرو هەڵوێستەی هەریەکێکمانە، بۆ سازو سارێژبونەوەی شوێنەواری ئەشکەنجەیە. دەبێ ئەوان زۆریان لا مەبەست بێت کە ئەو پرۆسەیە بەسەر چەند کەسێکماندا ئەنجام بدرێت. بۆ ئەوەش دەبێت خۆیان نەخشەیەکیان بۆ ماوەو شێوەو مەزەنەی سەرەنجامی ئەو پرۆسەیە هەبێت تا بڕیاری رۆژی ئازاد کردنەکە بدەن. دەی جارێ شتی ترمان لەبەردەمدایە کە بۆچونەکان بەلایەکدا دەخەن.

کە لێپرسراوان رۆیشتنو هەر خۆمان ماینەوە، ئەوانەی کە دەیانویست شتێك لەدیمەنەکان حاڵی بن، خۆیان دەکوتایە ناو ئەم کۆڕو ئەو کۆڕ، تا گوێ هەڵبخەنو زیاتر لەم مەتەڵە بگەن. برادەری واشمان هەبو کە کەوتبووە حەلەو لاو چرپە لەگەڵ ئەمو ئەودا، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە هیچ قسەیەکی وا نەکرێت کە بەزییان بێت، نەوەکا میکرۆفۆنو ئامرازی تۆمارو ئەو جۆرە شتانەیان بۆ دانابین..

**دیاردەی نامۆتر..**

دوای رۆیشتنیان بەماوەیەکی کورت، دیاردەیەکی تری سەیر سەری هەڵدا. یەکێك هاتو حەسەن حسەینی بانگکرد. ئەویش چووە دەرەوە. هەمو سەرمان سوڕما. هەبو یەکسەر بیری بۆ لێکۆڵینەوە دەچو. دەگوترا رەنگە لێرە بەجۆرێکی تر دەست پێبکاتەوە. رەنگە بەهێمنیو بەمشتو مڕ بێت. یان رەنگە لە سەرەتادا وابێت. ئیتر هێندە بەدگومان بوین لە بەعسو ئەو رژێمە تا ئەو ئاستەی کە بڕوا بە قسە راستەکانیشیان نەکەین. پاش دە دەقیقەیەك حەسەن هاتەوە. هەموان سەرنجیان لێدەداو چاوەڕوان بون بزانن چیی دەڵێ: زوو هاتە قسەو گوتی:

> پێیان گوتم کە دەتوانم تەلەفون بۆماڵەوە بکەم. منیش قسەم لەگەڵدا کردن. هەرچەندە من بەدایکمم گوت کە ئاگاداری هەموو ئەوانە بکات کە تەلەفونیان هەیە دیسان مەجال هەیە یەك دوو کەسی تر تەلەفون بۆ ماڵەوە بکەن.

دیاردەی نامۆ هەروا دەبێت: لەو بارو دۆخەی هەیئەوە بۆ ئەمنی عاممە، گەیشتنمان بەو جۆرە، و ا لەم نیوە شەوەدا، هەر تەواو چەند دەقیقەیەکی بۆ نیوەشەو ماوە، رێگەمان دەدەن تەلەفون بۆ ماڵ و منداڵ بکەین! دیاردەیەکەو بوو بە رووداوو دەبێت دوای بکەوین، ئێمە هیچ دەسەڵاتێکو هەڵبژاردەیەکمان بە دەست نییە، لەوە زیاتر کە بەدوای رووداوەکاندا رابکەینو هەوڵ بدەین شتێکی لێ تێبگەین.

هەرکە حەسەن ئەو قسەیەی لەزار هاتە دەرێ، هەریەکە لە جێگەی خۆی بەرز دەبووەوەو دەیگوت من دەیکەم. لەسەر ئەوە رێکنەدەکەوتن. خۆ ئەگەر پیاو ئاستو باری دەرونیی ئەم زیندانییانە لێکبداتەوە، وا دەبێت بگوترێت ناهەقیان نییە! رویانکردە منو گوتیان ئەی مامۆستا تۆ دەڵێیت چیی؟ گوتم کەیفی خۆتانە، بەڵام با مەحمود قەرەداخی بچێت، ئەویش گوتی: وەڵا خۆ حەزم دەکرد، بەڵام تەلەفونی دراوسێکەمان کەمێك دوورەو زەحمەتیشە بەخەبەر بن!

قسەکەم تەواو نەکرد بو کە یەکێکی تریان گوتی: بەخوا باشترە کە مامۆستا مەحمود تەلەفون بکات. چونکە ئەگەر کەسوکارمان بەوە بزانن کە ئەم ماوەو هیچی لێ نەهاتووە.. ئیتر هەموان لە مانو رزگاربونی هەموان دڵنیا دەبن.. هەمو بەوە رازیبون. بۆیە هەستام و چومە ژورەکەی بەرامبەر هۆڵەکە. نەقیب خەڵەف دانیشتبو. بە وردی بە روخسارمدا هەڵیدەڕوانیو گوتی:

- حەز دەکەیت قسە لەگەڵ ماڵەوەدا بکەیت..؟

> گوتم بەڵێ ئەی بۆخۆتان نەتانگوتووە؟

- گوتی با با، پرسیارەکەم هەر ئاسایی بو. پێش ئەوەی ژمارەی تەلەفونەکە لێبدات بیرم لەو پرسیارە لۆجیكو ئاساییانە دەکردەوە کە راستەخۆ روبەڕوم دەبن و دەبێ وەڵام بدەمەوە، گوتم:

< ئەگەر لێیان پرسیم لەکوێیتو کەی ئازاد دەبن بڵێم چیی..؟ ئەویش رێنماییەکانی خۆی پێدام.

وا هەشت نۆ دەقیقەیەك لە دوانزدەی شەو لایداوە.. ژمارەی تەلەفونەکەی ماڵەوەم پێگوت. ئەویش دەستی کرد بەبادانی ژمارەکان.

دوای پێنجەم ژمارە هەروەك پاسەوانی تەلەفونەکە بێو دڵیان خەبەری دابێت کە تەلەفون دەکەم، دوای تەنها یەك جەرەس راستەوخۆ تەلەفون هەڵگیرا. خەڵەف بەعەرەبی پرسیی:

- ماڵی ئوستاز مەحمودە؟ دیاربو کە بە بەڵێ وەڵام درایەوە، چونکە یەکسەر چاكو چۆنیی لەگەڵ تەلەفون بەدەست کردو ئەوسا گوتی:

- ئوستاز مەحمود لەوێیە؟

< دەنگی تەلەفون بەدەست لەماڵەوە بە مەزەنە: نەخێر لێرە نییە، جەنابت کێیە؟ بۆ چیتە؟

- دەمەوێت قسەی لەگەڵدا بکەم، ئەی لەکوێیە؟

< سەفەری کردووە!

- بۆ کوێ؟

< بۆ بەغدا! ئەوسا خەڵەف بەنەرمە پێکەنینێکەوە گوتی:

- دەی ئەوە ئوستاز مەحمودە، فەرمو قسەی لەگەڵدا بکە.

تەلەفونەکەم لێوەرگرت، هەلاوم کرد (گەلاوێژ) وەڵامی دامەوە.

> گەلاوێژ شەوباش چۆنی باشیت؟ من مەحمودم.

< تو خووا تۆ مەحمودیت؟

< بەڵێ من مەحمودم، ئەی دەنگم ناناسیتەوە؟

> لەگەڵ هاڕەی گریاندا: نەوەڵا، کوا ئەوە دەنگی مەحمود نییە! توخووا تۆ مەحمودیت؟

< دە تۆ مەگریی، لەبری ئەوەی پێبکەنیتو خۆشیت بێت، کەچیی شین دەکەیت! دەی ئێستا وەختی پێکەنینو خۆشییە نەك شینو گریان.. بەخوا من مەحمودم، ئەی تو خوا منداڵەکان چۆنن: ڤیان، ژیلوان، ئاریان، مەریوان، ژوان. توخوا هەمو باشن، سەلامەتن؟

> شوکور هەمو باشن.

< ئەی توخوا دایکمو باوکم چۆنن؟ خۆ نەخۆش نین؟ ئەی کەسو کار شکور هەموو باشن؟

ئەو لەناو قوڵپی گریانو هەناسەی نائاسایی ناو ئەم دیمەنە سەیرو چاوەڕوان نەکراوەوە، بەغەمباریو نادڵنیاییو ترسو لەرزێکی ئاشکرای ناو لەرزینی دانانان بە وشەکاندا، وەڵامی دەدایەوە، لەگەڵ هەر وەڵامێکدا دەیگوت: توخوا تۆ مەحمودیت؟

لە هەنسکەی ناو گریانەکەیدا خەفەتو ئازاری ئەو شەش مانگو سێ هەفتەیەی خۆیو منداڵەکانی دەبیستراو هەست پێدەکرا. ئەو گریانە بەکوڵو هەستە ژاکاوە لەناو ئەو هەموو گومانو نادڵنیاییو سوربونە لەسەر گەیشتنە راستیی خاوەنی ئەم دەنگە، هێندەی تر کاریان دەکردە سەر ناخم. لەو ساتانەدا، هەستم دەکرد کە دیمەنی بێ باوکییو بێ نازییو تارمایی کوشتنی باوکی هەمو جگەرگۆشەکانم لە روخسارمدا رەنگ پێبدەنەوە، بۆیە رەوتی قسەکردنمان تێکداو بەجۆرێکم لێهات کە ئەو پیاوە روخسارو مێشك پڕ لە نهێنییە دڵ رەقە لەو دیمەنانەی بەرچاوی، بەزەیی لەدەموچاویدا دەربکەوێت.

لەبەردەم ئەو دیمەنو تابلۆیانەدا، گوشارم دەخستە سەر خۆم تا سۆزی بەزەییو شەیدای بینینەوەی خۆشەویستانمو ئەم دیمەنە هەست ژاکێنەرانەو ئەم مشتومڕەی نێوان دوو هاوسەری ناو دوو دنیای جیاو نامۆو دوور لەیەك، نەبنە هۆی رمانی بەنداوی فرمێسکە قەتیسکراوەکان.. بەڵام سۆزو پەرۆشی دڵی ناسکی من بەهێزتر بون، بۆیە هەرەسییان بە بەنداوی ئەسرینی پەنگەوە خواردو هێنا، ئیتر دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکەکان ورد ورد بەسەر رومەتمدا دەهاتنە خوارێو رێگەیان بەرەو چەناگەو ملو سنگ خۆش دەکرد تا رێگەش بۆ هەڵڕشتنی قوڵپی گریانی قەتیس بوی ناو قورگو سینە خۆش بکەن. ئەوە لای خۆشم نامۆ نییە، ئەی گۆشتو خوێنو کۆمەڵێك لە هەستی باوکێتیو ئەڤینو خۆشەویستیی نیم، پڕوکێنراوی دەستی زاڵمان نیم! جلەو لەدەستی خۆمو لەدەسەڵاتی خۆمدا نەماوە، یەکەم جارە لەو ماوە دوورو درێژەدا ئەشکی ناو سۆزی ناسکی دڵی پڕ لە ئازارم، لەبەردەم ساتەکانی خۆشییو ناخۆشیدا کۆڕی گەرمی شینی خۆشەویستان بەو جۆرە ساز بکەن..

زۆر هەوڵم دا کە بڕوام پێبکات من مەحمودەکەی هاوسەریمو ئێستا لەبەغدا لە "کۆشکێکدا" "میوانین"و ماوەیەکی تر "ئازاد" دەبین! ئەو بڕوای نەدەکرد، جەختیلەسەر ئەوە دەکرد کە دەنگم گۆڕاوە، هەستم دەکرد کە کرژییو نادڵنیایی لای ئەو سەقامگیر بوون. ئەی ماوەیەکی دوورو درێژە فڕێنراوم، هەر کەس نازانێت لە کوێم! ماوم یا لەژێر خاکدام! وا ئێستا لەپڕو لەم نیوەشەوەدا یەکێك لەسەر تەل

قسە دەکاتو دەڵێت من مەحمودم! هەواڵی ساغیی خۆیو، بونە میوان لە کۆشکێکی بەغدا، دەگەیەنێت! ئینجا دەڵێت گوایا چەند رۆژێکی تر ئازاد دەکرێم! جا کێ هەیە لەژێر سایەی وەیشومەی بەعسدا بڕوا بەو دیمەنو قسانەی سەر ئەم شانۆگەرییە بکات!؟ هەقیێتی بڕوا نەکات. ناهەقیێتی بڕوا بکات، ناهەقی نییە گومان لەوە بکات کە منی مەحمود ناو، مەحمودەکەی هاوسەری ئەوم، منی مەحمود ناو هاوسەرەکەی ئەونیم! ئەی ئەوەتا خۆم لەناو سەرجەم روداوەکاندا ژیاوم، کەچی هەمو شتێکم لا نامۆیە، هەر هەموو روداوەکان نامۆنو لە ئەقڵ یاخین. ئەی چۆن یاخی نەبن ئەگەر ئەمشەو و دوێنێ شەو و پێرێ شەو، بۆ ئێمە، سێ دنیای لەیەك جوداو سێ شانۆو شانۆگەریی سێ جیهانی بەیەك ناکۆك بن!

من دەمزانیی ئەو هیچ جۆرە پرسیارێك ناکات لەهەوڵی دڵنیابون لە ناسینەوەی من زیاتر، وەك وەڵامی هەندێك پرسیار گوتم:

< ئێمە بیستو شەش کەسینو پێکەوەین، هەموو ساغو سەلامەتین. چەند کەس دەناسیت تەلەفونییان بۆ بکەو هەواڵی لەش ساغیو باشەی هەمومانیان پێبگەیەنە. ئەو گریانەکەی هێندە بەکوڵە کە بە زەحمەت قسەکانم وەردەگرێ.

< دەی ئێستاش دڵنیا نەبویت کە من مەحمودم؟ لەباتی ئەوەی تۆ پێبکەنیتو خۆشحاڵ بیت، کەچی هەر دەگریت؟ ئێمە هەر هەمووومان پێکەوەینو زۆر باشین. ماوەیەك لەبەغدا بە "میوانی" دەمێنینەوە. ئێستا لە "کۆشکێکدا" دەژین. ئیتر دڵنیابن لەوە کە هەمو باشینو ماوەیەکی تر "ئازاد" مان دەکەن. بیرت نەچێت ئەم قسانەم بەیەکەی یەکەی خێزانو کەسو کاری گیراوەکان بگەیەنیت. ئیتر خەمت نەبێت، ماوەیەکی تر "ئازاد" دەکرێین.

لەناو ئەو ساتانەدا هەستم بەوە دەکرد کە هەر دڵنیا نییە، بەگومانە لەخاوەنی ئەم دەنگە، لە قسەکانی ئەم مەحمودەی لەم نیوەشەوەدا خۆی خستۆتە جێگەی مەحمودەکەی ناو دڵی ئەو. زۆریش هەوڵمدا تا لە بەردەمی خەڵەفدا، وشەو رستەی وا بدۆزمەوە کە بەتەواویی گەلاوێژیان لەخۆم پێ دڵنیا بکەم، تا دڵنیای بکەم کە من هاوسەرەکەی ئەوم، بەڵام بێسود بوو!

ئیتر بێ ئومێد لەو خواستە سادەیە، خوا حافیزیم لێکرد. لەدوای سوپاسکردن شەوباشیشم لەخەڵەف کرد.

ئەو شەوە لەناو ئەو دیمەنو دیاردانەی کە هەرسییان بۆ هەموومان ئاسان نەبو، لەناو خەوو خەیاڵی ئەم شانۆگەرییەو ئاستی راستو راستگۆیی ئەو لێپرسراوانەو قسەکانییان، تیاماندا هەبوو لەناو دنیای خۆیو بۆچونەکانی خۆیدا دەژیاو لێی پاڵ دەکەوتو دەخەوت.

هەبوو دوو دوو سێ سێ لەناو لێکدانەوەی گریمانەکاندا لەسەر قسە بەردەوام بون تا لەوە هیلاك تر دەبونو ئەوانیش تەسلیم بەخەو دەبون.

یەکەم بەیانیمان لە ئەمنی عاممە.. لەڕێو رەسمێکی جیادا چونە سەر تەوالێتو دەستو پلو دەمو چاو شتن ئازادانەو بە سابونو ئاوی گەرم بەڕێوە برا. بۆ یەکەم جار نانێکی خۆشمان خواردو کەوتینە چاوەڕووانیی دەرکەوتنی سوچێکی قەدەرەکەمان. دوای کەمە حەوانەوەیەکی نان خواردنەکە، یەکێك هاتو گوتی:

ئێوە سەرو ریشتان زۆر هاتوە، سەرتاشێکی تایبەتیتان بۆ هێنراوە، دەی با ئێستا یەکێکتان بێت. یەکێکمان رۆیشتو دوای ماوەیەکی کەم بەسەرو ریش تاشراوی هاتەوە. لەو دیمەنەدا دەردەکەوێت کە پێستەکەمان چۆن زەردو چرچ هەڵگەڕاو بووە. بەو جۆرە سەرو ریشی دەروێشانەی هەموومان تاشرا، روکەشیی دیمەنو روخساری مەجنونانەی هەیئەمان لێ کرایەوە..

لە دووەم شەودا نەقیب خەلەف لە قسەکانیدا ئەوەی دەرخست کە هەرچەندە یەك دووانێك شتیان لەسەر بوەو ددانیشییان پێدا نا. ئەگەر ئەوانە بدرانایە بە دادگا وا یەکی پێنج شەش ساڵێك حوکم دەدران. بەڵام لەبەر خاتری هەمووان کە دەرکەوت لەخۆڕایی گیراونو هەموو مرۆڤی باشن، ئەوانیش عەفو کران.

کەوتمە بیرکردنەوە لەوە، ئایا دەبێت ئەوانە کێبن. بۆیە کە لە قسەکردن وەستا، روم تێکردو باسەکەم وا دەستپێکرد:

> بەڵام گرتنەکان بەو جۆرە راست نەبون. بۆ نمونەو بەنیسبەت منەوە تۆ بۆخۆت لەهەموو کەس باشتر دەزانیت کە بێ بەڵگەو لەخۆڕایی من گیراوم، خۆ هەموتان دەزانن ئەگەر من سیاسەتم بکردایە نەدەگەڕامەوە عێراقو دەچوم بۆ ئەورووپا.. ئیتر بۆچی رێگەتان دا کە بەو جۆرە بگیرێم؟ ئەو بە جۆرێك لەناڕەحەتبوون لە پرسیارەکە گوتی:

- لە راستیدا لە سلێمانیدا ئاژاوە هەیە، خەڵك دەکوژرێت، تەنانەت مامۆستای زانکۆ دەکوژرێت، نازانین ئەوانە کێن.. رابوردوی تۆش لای ئێمە دیارە، هەڵوێستی باشەشت بەرامبەر حیزبو شۆڕش نەبووە، نیشانەی پرسیارت لەسەر بووە، بۆیە گومان بەلای تۆدا دەچێت. جگە لەوە تیاتاندا هەیە کە شتی لەسەر سەلماوەو ددانیشیان پێدا ناوە!

> وەك کێ؟

- ئەوە بەختیار حامید کە فەردە ئاردی داوە بەخێزانی (تێکدەران).

ئەوە ئەحمەد پیتاکی داونەتێو ماشینی دەوڵەتی بۆ گواستنەوەی ئەوان بەکارهێناوە.

ئـەوە شـوان کـە پـەیوەندییان پێـوە کـردووە تـا بچێتـە دەرەوەو بـە ئێمـەی نەگەیاندووە!

بـەڵام لەبـەر خـاتری ئێـوە هیچمـان لێنـەکردنو عـەفوش کـرانو لەگەڵیشـتاندا بەردەبن.

< کەواتە کە بەردراین وا باشترە هەوڵبدەین لە سلێمانی دانەنیشین، بۆ نمونە من خۆم نەقڵی بەغدا بکەم.

بەجۆرێك لە قاڵسبوون لەقسەکەم خێرا هەڵی دایەو گوتی:

- دەی گرنگ ئەوەیە کە دەرکەوت بەناهەق گیراویت بۆیە ئازاد کرایت. با واز لـەم قسانەش بهێنین، ئەوانە بەسەرچوون. گرنگ ئەوەیە دەرکەوت ئێوە هیچتان لەسـەر نییە، ئێوە هاووڵاتیی ساڵحنو ماوەیەکی تر ئازاد دەبنو دەچنەوە ناو ماڵو منداڵـی خۆتان. سلێمانیش شاری خۆتانەو دەتوانن بە ئەمینی تێیدا دابنیشـن. بێ ئـەوەی کەس بتوانێت دەستتان بۆ درێژ بکات.

**زیندانی ناو زیندانی ناو زیندان:**

**ڤێللایەك لە ناو ئەمنی عامەدا**

ڕۆژی سـێیەمی زیندانیمـان لـە ئـەمنی عامـە لـە بـەغدا، ئاگـادارکراین کـە خانوییەکی تایبەتیمان بۆ دانراوە، دوای نیـوەڕۆ دەچینە ئـەوێ. ڤێللایـەکی گـەورەو پڕ لە باخ و باخاتە.

سەیرم لێدەهات، لە لایەك باسـی میوانـداریو بـەربون دەکـەن، کـەچی تـازە باسـی خانو دەکەن. دەی ئەمە چی مەتەڵێکە!

دوای نیوەڕۆ نەقیب خەڵەف هاتو گوتی ئێستا دەچن بۆ ئەو ڤێللایـەی بۆ ئێوە تەرخان کراوە.

هەریەکە شتی خـۆی هـەڵبگرێتو هـەموومانیان ریـز کـردو خسـتیانینە ڕێ، بـێ ئـەوەی چاومـان ببەسـتنەوە. لـەقاتی دووەم هێنراینـە خـوارەوە. ئینجـا بـۆ دەری بیناکـە، بەسـەر شـەقامێکی ئاسـاییدا گوزەرمـان دەکـرد، ئەمـە شـارێکە بۆخـۆی بەهاتوچۆو بەقـەرەباڵغیو بـەزۆریی ئۆتمۆبیلـدا، پیـاو وا دەزانێـت لـە گرتوخانەکـە هاتۆتـە دەرەوە. هـەرگیز بڕوا ناکرێت ئـەم گەڕەکـە خۆشـەی ئـەم بەغدایـەو لـەم نـاو جەرگەی پایتەختدا کرابێتـە ئـەم دەزگاو زیندانـە گـەورەیـەی ئـەمنی عامـەی عیراق. گەیشتینە بەر قاپیی، پێشەوەی خانووەکە کە بە گوڵی هەمە چەشن ڕازاوەتـەوە. کە چووینە ناوەوە ڤێلایەکی گەورە هاتە پێش چاو.

دوو ژورو هۆڵەكەی بۆ نوستنمان تەرخان كران. ژورێكی تر كە هەر لەو سەرەتایەوە سەرنجی راكێشابوین داخراوە. بەشێك لەخانووەكە دوو قاتەو لە دوو ژوور پێكهاتووە. لەدواییدا دەركەوت كە لە ژورێكیاندا كچێكو لە ژورەكەی بەرامبەریشی كورێكیان تێدایە. پشتەوەی خانووەكە حەوشەیەكی گەورەی پڕ لە چیمەنە كە گوڵو درەختی خورماو مۆزو زەیتون چوار دەوری داوە.

بۆ عەسرەكەی، لەناو چیمەنەكەدا تەلەفزیۆنێكیان لەسەر مێزێك داناو كورسییەكی زۆریشیان بۆ دانیشتنی كاتی فێنكیی ئێوارەو شەوان بۆ دانایین.

كاتێ فێنكی كرد، عەقید تاریق هات.. هەمومانی گرد كردەوەو كەوتە قسە:

- ئێوە میوانی سەركردایەتین.

ئەم ڤیللایە بۆ ئێوە تەرخان كراوە، تێیدا میوان دەبن ماوەیەك دەمێننەوەو ئیتر ئازاد دەكرێن. چەند كەسێك بۆ شت هێنانو ئەنجامدانی پێویستییەكانتان لاتان دەبن، ئەوانە هەر بۆ یارمەتیدانتانە نەك وەك حەرەس. بۆیە چیتان ویستو حەزتان لەچیی كرد پێیان بڵێن بۆتان دەهێنن. بە پێكەنینیشەوە درێژەی بەقسەداو گوتی:

ئەوەش دەورو پشتی خانوەكە، چۆڵە، هەر كەسێك بیەوێت رابكات لەهەر دیوارێ لەو دیوارە نزمانەوە بازبدات، رزگاری دەبێت. بۆ خواردنیش گوتی:

- حەزتان لەهەر خواردنێك كرد داوای بكەن. چیتان لا خۆش بو قسە بكەن. هەموو رۆژێك بەو شێوەیەی رۆژانی رابوردوو جگەرەتان بۆ دەهێنن. لەو ماوەیەدا كە میوانی ئێمە دەبن بەرنامەیەكی خۆشتان بۆ رێكخراوە، كە ئەو بەرنامەیە كۆتایی هات هەموتان دەگەڕێنەوە ناو ماڵو منداڵی خۆتان.

لە مەزەنەی لێكدانەوەی قسەكانی معاونی مودیری ئەمنی عام بۆ كاروباری سیاسیی، ئەوەم لێ هەڵهێنجا كە ئەو ماوەیەی دەمانهێڵنەوە هەر بۆ دڵدانەوەو شوشتنی مێشكە، بۆ پاكژكردنەوەیەتی لە خڵتەو شوێنەواری هەیئەو ئەشكەنجەكانیان، بۆ سارێژبونی برینو ئاسایی بونەوەی رەنگو بۆمانە.. سەرجەمی قسەو كردەوەكانیشیان هەر جەختیان لەسەر ئەوە دەكرد..

**ئەمرۆ چواردەی ئایارە:**

رۆژی دووەممانە لەم خانووەدا. بۆ عەسرەكەی دیسان عەقید هاتەوە بۆ لامان. لە حەوشەكەدا، وەك دوێنێ لەسەر كورسییەكان دانیشتین.. گەلێك دڵنەواییو قسەی خۆشی بۆ كردین. لەناو باسكردنی رۆڵی بەعس لە بەرزكردنەوەی ناوی عیراقو عەرەبو ئیسلام بە درێژیی باسی ئەزمونی سەفەری وەفدێكیانی كرد بۆ كۆریای باكور كە ئەم خۆی سەرۆكی بو. بەتایبەتی باسی رۆژێكی سەردانەكەیانی كرد كە

چۆن لێپرسراوێکی بەرزی کۆریا لە قسەکانیدا جۆرێ لە سوکایەتیکردن بە ئیسلامی تیا دەرکەوت. ئیتر چۆن ئەم تورە بووەو ئەو شوێنەی بەجێهێشتووەو ئاگاداری کردون کە بەزووترین کات دەگەڕێنەوە بۆ عێراق. لەدواییدا چۆن هاتون‌و داوای لێبوردنیان لێکردووەو چەند هەوڵیان‌دا تا دڵمان بهێننەوە جێگەی خۆیان‌و ئاشتمان بکەنەوە.

سەرلەنوێ باسی ئازادکردنی ئێمەی کردەوەو گوتی کە بەرنامەیەکیان داناوە بۆ گەڕان‌و سەردانی هەندێ شوێنی گرنگ لەگەڵ سینەماو ئاهەنگ، کەی ئەو بەرنامەیە تەواو بو وا دەگەڕێینەوە ناو ماڵ‌و منداڵی خۆمان.

لەو دوو رۆژەدا پێخەف‌و دۆشەکی نوێ، تاقمی ریشتاشین، دەرمان‌و فڵچەی ددانیان بۆ هێناین. یەکێکی تر هات دەستی کرد بە پێوانە بۆ جل درون‌و پێڵاوکڕین بۆمان.

دوای چەند رۆژێك ئەو ژورەی کە داخرابو، سەرنجی هەندێکمانی راکێشابو، کردیانەوەو لەناوەوە کاریان تێدا دەکرد. برادەرێکمان هات‌و گوتی:

< ئەزانیت ئەو ژورە بۆ ئەشکەنجەیە! گوتم:

> باشە چۆن دەزانیت؟ گوتی:

< کەرەستەی ئەشکەنجەی تیایە وەك قولاپی هەڵواسین.. لەوەش سەرنجڕاکێشەر تر ئەوەیە کە دوو کەس لەگەڵ سازکردنی دیوارەکانی ناوەوەی بەمەتریاڵی دابڕکردنی دەنگ خەریکن. ئیتر زۆر لە برادەرەکانمان کەوتنە گومان لەقسەکانی لێپرسراوەکان‌و زیاتر کەوتنە سەر بیرکردنەوە لە دەستپێکردنی پلەیەکی نوێ لە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدانمان.. من لام وابو کە ئەوە ئەگەرێکی دورە، هەرچەندە لە کردەوەی رژێم نامۆ نییە.

ئیتر هی وامان تیا بو کە بە تەواوی کەوتە ترسەوەو هەر قسەیەك دەکرا ئەو بەهوشیاری‌و سرپەو گومانەوە وەری دەگرت. وای بۆ دەچوو کە دور نییە تەنانەت لە پێڵاوەکاندا میکرۆفۆنی دەنگ وەرگر دانەنرابێت. زۆرمان هەوڵدا کە ئەو برادەرە هێور بکەینەوەو تێبگات کە ئەگەر ئەوەش راست بێت وا هیچ لەدەستی ئێمەدا نییەو دەبێت خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، لەهەموو حاڵەتێکیشدا لەهەیئە پڕ لە زەحمەت‌و ئەشکەنجەی زیاتر نابێت.

حەفتەیەك بە سەر بونمان لەو خانووەدا تێپەڕی کردو وەك پیشەی زۆربەی عەسری دەمەو ئێواران عەقید تاریق هات‌و کەوتەوە قسە:

ئەمجارە لەسەر هەموو حیزبە کوردی‌و کوردستانیەکان‌و حشع - جگە لە ی.ن.ك، قسەی کرد، جنێوی بەهەموان دەداو زۆر توند لەسەر عەزیز محەممەد قسەی

کرد، هەر لە تاوانبارکردنی بەنۆکەرو جاسوس بۆ روسەکان تا کێشەکانی ناوخۆیان، تەنانەت لایەنی رەوشتو تێکەڵیی نێوان نێرومێ، زۆر قسەی ناشیرینی بەناهیده الرماح دەگوت، کەئەو دەمە لە دیمەشق بون، بێ روپامایی بە دەویتی عەزیز محەممەد تاوانباری دەکرد. من لەوە نەدەگەییشتم کە بۆچی جنێو بە هەمووان دەدات بە یەکێتی نەبێت! لەکاتێکدا دوژمنی سەرسەختیی یەکێتین! بۆچی ئەم قسە ناشیرینو بێ مانایانە بە حشع دەڵێت؟ لەکاتێکدا تا دوێنێ هاوپەیمانو هاوسەنگەر بوون!؟ تەنها ئەو بۆچونە نەبێت کە رەنگە هەموومان بە یەکێتیو سەربە یەکێتی دابنێنو نایانەوێ زیاتر لەوەی کردویانە هەستمان بریندار بکەن، هیچ هۆیەکی تر بەخەیاڵمدا نەدەهات.

ئەی مەبەستی ئەم مانەوەیەمان بۆ دەماخ شوشتنو سارێژ بونەوەی برینو جێگەی دارو کێبڵو سۆندەو هەڵواسینو رەنگی پێستو هاتنەوە سەرخۆ نییە! هەندێکمان هەر تەواو لاوازو بێ هەناوو بێ هێز بوین. دیارە لایەنی سایکۆلۆجیی زۆر گرنگترە، چونکە ئەگەر ئەشکەنجەکاری خۆی لەسەر چەند کەسێکمان کردبێت وا باش بوونەوەو ئاسایی کردنەوەمان زەحمەت نییە. بەڵام شوێنەواری خراپ لەسەر لایەنی دەرونییە کە هەمووماني گرتۆتەوەو ئاسان چارەسەر ناکرێت. بەتایبەتیی شوێنەواری خراپی ئەم لایەنە لە یەکە یەکەماندا قووڵ رەگی داکوتاوە، بۆیە پێویستیی بەو جۆرە پلانانە هەیە.

دووریش نییە هەندێ لایەنی نێگەتیڤی ئەم زیندانییە نەبێتە دیاردەی هاوژیانو رەوتی ئاسایی تێك نەدات، هاوژیانمان نەبێتو مۆرکی خۆی لەسەر هەڵسو کەوتو کردەوەکانمان بەجێ نەهێڵێت، بۆیە دەبێت بەشێك لەبەرنامەکەیان رەچاو کردنی ئەم لایەنە هەستییارە بێت..

لەو قسانە بووەو هاتە سەر باسی بەرنامەکەو گوتی:

- ئیتر لەم یەك دوو رۆژەدا دێن بە شوێنتاندا بۆ سەردانی هەندێك شوێن کە دیارە پێتان خۆش دەبێت!

## ناو بەناو دەبرێین بۆ سینەما..

لێرەش بیری جیاکردنەوەو هێشتنەوەی چەند کەسێکمان، یان رەنگە دوای بەردانمان بە گواستنەوەی کارەکەمان بۆ بەغدا، بەجێی نەدەهێشتم، ئەو جۆرە بۆچونانە ئەشکەنجەیەکی دەرونین، تا بەردەوام بێت ئازارت زیاتر دەدات، چاك وایە توڕی بدەمو جارێکی تر نەچمەوە بەلایدا..

هەروەك ئەو نەخشەیەی بۆ خۆم دانابو، قسەکانم لەسەر ئەو لایەنانە چڕ دەکەم کە ئەو لێپرسراوانە وا دڵنییا بکەم کە بیرییان بەلای ئەوەدا نەچێت کە لە بەربونمدا گریمانی راکردنم هەبێت. بۆیە لەو رۆژانەدا کە نەقیب خەڵەف هات، باسی باری تەندروستیی خۆمو دەرهێنانی گورچیلەکەم بۆ دەکرد.

رۆژێك پێم گوت: دەترسم ئەو تاکە گورچیلەیەشم بەردی هەبێت، پێویستم بە خەستەخانەو ئەشیعە هەیە. هەرچەندە دوکتۆرێکی تایبەتییان بۆ دانابوینو ئەوەی بیویستایە فەحس دەکرا، ئەو یەکسەر گوتی باشە سبەینێ دەتنێرین بۆ خەستەخانە. بێگومان من هەستم بەهیچ کێشەیەکی گورچیلە نەدەکرد. هەرچەندە سەر عەمەلیاتەکەم ئازاری هەر مابو کە زەحمەتیی ژیانو ئەشکەنجەی هەیئە بواری پەرژاندنە سەر ئەم لایەنەی نەدەدا..

بۆ سبەینێ شۆفێرێكو یەکێکی تر هاتن بەدوامداو سواری ماشینیان کردم بۆ خەستەخانەی (الرشید) کە خەستەخانەیەکی سەربازیی گەورەیە لەناو (معسکر الرشید)دا ئەشیعەی تاکە گورچیلەکەم گیراو گوتیان بۆ وەرگرتنەوەی ئەشیعەکەو سەیرکردنی دوکتۆر، دەبێت سبەینێ بێنەوە.

بۆ سبەینێ هەر هەمان نایب زابتو شوفێرەکە بردیانمەوە بۆ خەستەخانەکە. کە ئەشیعەکانیان وەرگرت پێیان گوتین ئەو دوکتۆرەی سەیری دەکات لێرە نییەو سبەینێ دەوام دەکاتەوە. کە لەژورەکە هاتینە دەرەوە بەنیازی گەڕانەوە. لیوا کەمال حسین هاتەوە بیرم.

ئەمە دەرفەتێکی باشە کە ئەو من ببینێو هەواڵەکە بگەیەنێتەوەماڵەوە. بۆیە روم کردە نائیب زاپتەکەو گوتم:

< دەکرێت بمبەن بۆ لای دوکتورێکی تر.

- نەخێر ناکرێت.

< باشە ئەی ئەگەر خۆم دوکتۆری ناسیاوم هەبێت؟

- کێیە؟

< لیوا کەمال حسەین.

- لیوا کەمال دەناسیت؟

< بەڵێ دەیناسم.. بەڵام نازانم لەچیی ژورێکدایە.

- گوتی زۆر باشە.. ئیتر رووەو ژورەکەی دوکتۆر کەمال کەوتینە هەنگاونان.

کە گەییشتینە بەردەم ژورەکەی، و سەرنجم لەدەرگاکەیدا، گڵۆپی سور داگیرساوە. وەستاین. دوعا دوعاو خواخوامە کە زوو ئەو زەلامەی لایەتی بێتە دەرەوە نەوەکا پاسەوانەکانم بێ تاقەت بێنو رابگۆڕنو پەشیمان ببنەوەو بڵێن

بابڕۆین، و باشتر وایه سبەینێ بێینەوه. هەروەك لەسەر ژیلەمۆ وەستابم بەو جۆره ئەرزەکە نەیدەگرتمه خۆی. لەناو ئەو نائارامییەی منداو دوای چوار پێنج دەقیقەیەك دەرگا کرایەوه. ئەفسەرێك هاتە دەرەوه..

ئایی ئەوه کێ دەبینم! بڕوا بەخۆم ناکەم کە چاوم لەگەڵما راستگۆبێت! ئەوه خۆ راسته، چۆن ئەم هاتنه ئەم رێکەوتەشی بەدەمەوەیه!

ئای خۆ ئەوه (هم)ە لەو ساتەدا واهات بەبیرمدا کە قسه نەکەم تا ئیحراج نەبێتو بە بەرچاوی ئەم ئەمنانەوه قسەم لەگەڵ نەکات. بەڵام ئەو هەر کە چاوی بە من کەوت، لەبڕوانەکردندا ئەبڵەق بو. بێ ئەوەی گوێ بداته ئەو دوو پاسەوانەی لەگەڵم بون عەقید هم پەلاماری دامو بە باوەش بەرزی کردمەوه، کەوتە ماچکردنو دەموچاو لستنەوەم بەدەنگێکی بەرز گوتی:

ئەوه تۆ لەکوێیت ئێمه ژێر ئەرزت بۆ دەگەڕێین وا تۆ لەسەر ئەرز دەردەکەویت! ئینجا هەر بەو حاڵەتەوه روی کردە هەردو پاسەوانەکە کە لە ساتەکانی چاوبەچاو کەوتندا نەمزانی چۆن کەوتمه جوڵەو قسەکردنێك کە لەوان ئاگاداربێ. گوتی:

هەر یەکەم رۆژی گرتنت چومه ئیستخباراتی سلێمانیو پێم گوتن ئەوه سەری من بۆ ئێوەو مەحمود بەربدەن چونکه ئەو هیچی نەکردووەو بێتاوانه.. ئەوانیش گوتیان: ئەلحەمدولیللا کەوایەو ئەوەندە نابات ئازاد دەبێت..

من لە ئازایەتیی هم سەرم سوڕمابو، چونکه یەکەم: ئەفسەری سوپای عێراق، دووەم: کورد، سێیەم: خەڵکی سلێمانیی، چوارەم: بەعسی نییه، پێنجەم، کەس نازانێت پرۆسەی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجه بەچیی ئەنجامێك گەیشتووه. شەشەم ئەم یاساوڵانەی تەکم.. حەوتەمیش: کە لەهەمویان گرنگتربو: یەك شەو پێش گرتنەکەم ئەو میوانم بو، چونکه بەهۆی خانو دروستکردنەوه هاتبۆوه بۆ سلێمانیی، هەمو ئەو رۆژنامەو بڵاوکراوانەی سەر مێزی نوسینەکەم لەژوری میوان، لەگەڵ بیره خواردنەوەدا سەرنجی لێدەداو چەندی توانی لێیانی خوێندەوه، لە سەر زۆر روداوو گۆڕانەکان قسەمان کرد.

نەمدەزانی چی بکەمو چۆن دوری بخەمەوه تا لەوه زیاتر قسه نەکات، چونکه لەجیهانی ژێر سایەو سێبەری ئەو وەیشومەدا، لەهەر ئانو ساتێکدا هەزارو یەك شت رودەدا. نەشم دەزانی چۆن زوتر خۆمی لێدەرباز بکەم. چونکه دەمزانیی ئەم زۆر جار قسەی خۆی دەکات بێ ئەوەی بترسێت یان بیر لە ئەنجامەکەی بکاتەوه. زیاتر لەوه، من لەو ساتانەدا بیرم لەدوای سەرفرازبونمو چونه شاخ دەکردەوه، کەچی ئەنجامێکی خراپی بۆ ئەم دەبێت.

دوای ئەو دیمەنە. کەوتە کورتە پرسیار لەهۆی هاتنم بۆ ئەو خەستەخانەیە؟ باسی گورچیلەم بۆ کرد ئاماژەم بۆ ئەشیعەکان کردو. بەدەم ئەو قسانەوە سەیری دەرگاکەم دەکردو خۆم دەجولاند تا تێیبگەیەنم کە دەمەوێت بچمە ژورەوە. ئەوسا ئەو دەستی بردو دەرگاکەی کردەوەو بە پێکەنینێکی خۆی ئاساییەوە بەدوکتۆر کەمالی گوت:

< کاک کەمال ئەوە کاک مەحمودم بۆ هێنایتە سەر ئەرز تا چاکی بکەیتەوە من پەلەمەو دەبێت بڕۆم. ئەوا بەتۆم سپارد. ئەوسا خواحافیزی لەهەردوکمان کرد، بەدەم چونە دەرەوەشەوە گوتی:

هەر ئێستا دەچم تەلەفون بۆ گەلاوێژ خان دەکەمو ئەم هەواڵە خۆشەی پێدەگەیەنم.

لە ڕۆیشتنم بەرەو ژورەکە فەرموم لەدوو حەرەسەکە کرد تا لەگەڵم بێنە ژورەوە، بەشەرمەوە گوتیان پێویست ناکات.

بەبینینم دوکتۆر کەمال زۆر دڵشاد بو. هات بەپیرمەوە. دوای دەست لە ملکردنو چاکو چۆنییەکی گەرم، باسی هەوڵەکانی بۆ کردم لەگەڵ سەرۆکی (مەنزومەی ئیستخباراتی ناوچەی شیمال)دا بۆ بەربونم.

لەباری لەش ساغیشمەوە لێی پرسیمو گوتم: ئەوە حاڵەکەمە. بە شەرمەوە باسی گورچیلە دەرهێنانەکەم بۆ کرد، کە چۆن برادەرەکانم دوکتۆر ئەحمەد کەمال شاڵیو دوکتۆر سەروەر کە لەناو کاری سیاسییو ئەندامەتیی سکرتارییەتی ی.ق. کوردستاندا بوبوینە هاوڕێو برادەری نزیک، ڕۆڵیان لەدەستنیشانکردنی بەردی گورچیلەکەمدا بینی.

بەهۆی ئەوەوە کە نەوزادی ساڵح ڕەفعەت لە سلێمانی زیاتر ئاگاداری باری لەشو کێشەکانم بو، بۆ لای دوکتۆر (مکی الواعظ)ی ناردم. ئەم پسپۆڕی گورچیلە بو، لە باشترین خەستەخانە تایبەتییەکانی پایتەختیشدا (مستشفی الرازی) کە بەشێکی خۆشی تێدابو، پێش لابردنی عززەت مستەفا، وەزیری تەندروستیش خاوەنێکی تری خەستەخانەکە بوو، کاری دەکرد، بەکورتی گوتم:

ئەگەر بەربوم دوایی دێمەوە بۆ لات. ئینجا سەیری ئەشیعەکانی کردو گوتی گورچیلەکەت ئاساییەو نۆرماڵ کاردەکاتو مەترسە.

دوای سوپاس کردنی خوا حافیزیم لێکرد. ئەوسا گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان. لەو سەردانەی خەستەخانەدا، لەناو قەرەباڵغیی ڕارەوەکاندا، سەرنجمدا ئەمنەکان بە ئەنقەست خۆیان دوادەخەن، هەستم کرد ئەوە جۆرێ لە تاقیکردنەوەیە تا بزانن ئەگەر فرسەتم دەستبکەوێت خۆم ون دەکەمو هەڵدێم یاننە..!

یەکێك لەو بەرنامانەی بۆیان دانابوین سەردانی مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانییو مەتحەفی چەك بو. ئەو رۆژە بەماشێن هەندێ ناوچەی بەغدایان گێڕاین.. سەردانی مزگەوتەکەمان کردو ئەوەی ویستیی نوێژێکی تێدا کرد کە یەکێکیان خۆم بوم، هەر بەدڵ حەزم کرد نوێژێ بکەم بەڵام نەمدەویست حەرەسەکان ئاگادار ببن. هەرچەندە بەناو حەرەس بون، ئەگینا هەر کەسێك بیویستایە ئاسان خۆی ون دەکرد. ئینجا بەرەو مۆزەخانەی چەك.

مەتحەفی چەك لە باخچەیەکی کراوەدا بو. هەمو ئەو چەکانەی کە لە "قادسییەی سەددام"دا لە ئێرانیان گرتبو رێکخرابون. پڕ بو لە تانكو تۆپی قورسو چەکی تری هەمەجۆر. ئەوە زیاتر پێشانگایەك بوو تا ورەی خەڵکی پێ بەرزبکەنەوەو توانای سوپای عێراقی پێ دەربخەن.

ئەم سەردانانە جۆرێك لەدڵنیایی زیاتری لای هەموان دروست دەکرد.. بەتایبەتیی ئەوان گوێیان بەوە نەدەدا کە خەڵکی ناسیاو دەمان بینن. بەڵکو دوو جار دووسێیەکمان کەناسیاوی خۆیان دەبینی، بواری ئەوەیان دەدایین کە بووەستینو قسەیان لەگەڵ بکرێت.. هەرکەسێکیش بیویستایە دەیتوانی رابکات و خۆی بشارێتەوە..!

ئەم ئەمنی عاممەیە شارۆچکەیەکە بۆخۆی.. هەندێ ئێوارە فلیمی میسریی خۆشیان پیشان دەداین دەمێك بو فلیمی لەو بابەتانەم نەبینیبو، تەواو ئارەزوە ماتدراوەکانییان دەوروژاندو پیاوی دەبردەوە ناو لەزەتی دنیایەکی رۆمانسیی، ئەو دنیایەی کە تەواو نامۆیە بەم ژیانە پڕ لە مەینەتیو یەخسیرییەی ئێمە. هەرچەندە ئەم رۆژگارە لەناو ماوەی بەندکردنماندا، لوتکەی ئومێدو خۆشییە بۆ ئێمە. شتێکی ئاسایی نییە کە لەناو دۆزەخی هەیئەوە بگەینە ئەم دۆخەو بینینی ئەم جۆرە فلیمانە لەم شارۆچکەیەدا. بە خەویش لەناوژیانی هەیئەدا ئەوەمان ببینیایە گاڵتەمان پێ دەهات. بۆ ژیانی زیندانیی ژێر سایەو سێبەری ئەم رژێمە شتێکی لە دەگمەنترەو بە ئەقڵی کەسدا ناچێت..! بۆخۆشمان ئەو نائاسایيو نامۆییە لەباشترین لێکدانەوەو شیکردنەوەکانماندا، هەر بەو جۆرەن، ئەی لە گرتن بۆ کوشتن، لە هەڕەشەی رۆژانە بۆ کوشتن، لەناو ئەو ژیانەی هەیئە، بەراوردیی ئەوانەو ئەم حاڵەتەی ئێستا، چیی یەکیان پێ دەگرێتەوە لە بەعس زیاتر!

عەقید تاریق لە قسەکردنو دڵدانەوەدا کەوتبوە هەندێ باسو نوکتەی وا کە دەیهێنایە پێکەنین. دیار بو لەو لێکۆڵینەوانەی لەهەیئە کرابوون، دەنگو باسەکانی سەرداری حەسەن بەگیان باسکردبو. بۆیە ناوبەناو قسەی لێدەپرسیو دەیکردە

نوکته. رۆژێکیان ڕوی دەمی کردە ئەوو ویستی دەنگو باسەکانی سەردار لەهەیئەدا بە جۆرێکی تر باس بکات، کە بەحساب هەر خۆیو سەردار لەیەك دەگەن، پێیگوت:
- باشە بۆچی ژن ناهێنیت، هەر ئێستا، ئەگەر بڵێیت باشە، وا کچێکی جوانت لێ مارە دەکەین، هەروەك ئەو دوانەی سەرەوە (ئاماژەی بۆ دوو ژورەکەی قاتی دووەم کرد کە یەکێکیان کچێکو ئەوەکەی تر کوڕێکیان تێدایە، هەروەك بۆ (شهر العسل تەرتیب کرابن) سەرداریش بەسوێندو بەڵێنەوە دەیگوت: بڕیارم داوە ژن بهێنم، هەرکە بەربوم یەکسەر ژن دەهێنم. ئەویش لێیدەپرسیی وەعد.؟ وەڵامی بەسوێند دەدایەوە: وەعد بێ دەیهێنم. وا دەردەکەوت کە سەردار قسەکانی بەجیدی وەردەگرتو لەوە دەترسا کە عەقید راستی لەگەڵدا بکاتو یەکێکی نەدیدەی لەهەرامەکانی خۆیانی توش بکەن..! بۆیە بەگەرمییەوە سوێندەکانی دووبارە دەکردەوە کە لەئازادبووندا یەکسەر ژن دەهێنێت!
لەو ماوانەدا تا رادەیەك حەوابوینەوە، ناو بەناو تەلەفونمان بۆ کەسو کاردەکرد، چونك تەلەفونێکی تایبەتییان بۆ دانابوین. رۆژی ئازادیمان بەنزیك دەزانیی. عەسران، هەرکە دنیا فێنکی دەکرد، لەسەر چیمەنەکە دوو دوو سێ سێ دەکەوتینە پیاسە، رازی قسەو رۆژانی رابوردوو ئەگەرەکانی ئاییندەمان بەسەر دەکردەوە. جارجارەش فەرەجی نەریمان خەوی شەوی رابوردووی بۆ ئەمو ئەو لێکدەدایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ناوبەناو وردە گۆرانیی بۆ هەندێکمان دەگوت، هەروەك دەنگو گۆرانییەکانی حەمە ساڵح دیلان گوێی دەزرنگانەوە، کەم کەس لەیەکیان جیادەکاتەوە.
منیش حەمە ساڵحم خۆش دەویستو شەیدای دەنگە خۆشەکەشی بوم، بەتایبەتی سرودە نیشتمانییەکانی، هەر لەسەردەمی قوتابێتیم لەزانکۆ سەرنجی راکێشابوم. لەنیوەی دووەمی شەستەکانیشەوە یەکترمان ناسیی.
من تەنها یەك جار دڵم لەدیلان رەنجابو. ئازاری حەفتاو پێنج ئەو ساڵەی بۆ کورد ساڵێکی رەشو کارەساتێکی زۆر گەورەی سیاسیی بو، ساڵی روخاندنی هیواو تێکشکانی سایکۆلۆجیی کورد بو، بەتایبەتیی لە کوردستانی عیراقدا، نەك هەروەك کەسێتیی سیاسی ئیندیڤیدی کورد، بەڵکو وەك نەتەوەش. هەندێك رۆشنبیریش ناوی ئاشبەتاڵیان لە هەرەسەکە نا (وا بزانم یەکەم کەس کە لە نوسینی بەکاری هێنا (موکەڕەم تاڵەبانی) بو. هەرچەند من بۆ خۆم بەکارهێنانی ئەو زاراوەیەم لا ئاسایی نەبوو.
دیلان هەڵبەستێکی لەسەر ئەو بەهارە دانابوو.. ئەو سەردەمە من لەتاراوگەی رەمادی بوم. کاتێ خۆی کەمالی میرزا غەفور، کە بەردەوام تێکۆشەرێکی کۆنو زۆر

دڵسۆزو بە وەفایە، بەهۆی کاری پارتایەتیو ئەندامەتیشمان لە سکرتارییەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستاندا بوبوینە دۆستو برادەر.

دوای هەرەسیش لەگەڵمان نەفیی رەمادی کرا. لەگەڵ گەلێ برای دڵسۆزی تری وەك: سامی حسەین نازم کە تا ئازاری حەفتاو چوار بەرێوەبەری پەروەردەی سلێمانی بو، ئەم سیاسەتی نەدەکرد، بەلام لەگەڵ میللەتی خۆیدا بوو، ئەم نەفیکردنەشی خۆگریی‌و جوامێریی ئەوی دەرخست لەکاتێکدا بەسەدان لە لێپرسراوانی پاراستنو پارتیی‌و پێشمەرگە ملی زەلیلییان بۆ رژێم شۆڕ دەکردو هەندێکیشیان دەبونە سیخوڕ بەسەر برادەرە کۆنەکانیانەوە، بە تەنیش جنێویان بۆ پارتیو بارزانی دەنارد، عەبدولقادر زەهاوی- پارێزەرو زاوای حسەین جەمیل، هێندە قسەخۆش بو کە پیاو لێی بێ تاقەت نەدەبو، مستەفا ساڵح کەریمی نوسەرو رۆژنامەوان و چیرۆکنوس کە لە نوکتەو سەرگوزشتە گێڕانەوەدا کەم کەس شان لەشانی دەدا، جەمالی میرزا عەزیز، حەسەن کانەبیی لەیەك خانودا پێکەوە دەژیایین. لەگەڵ گەلێ برادەری خۆشەویستی تر کە لەگەڵ ماڵو منداڵیاندا دەژیان، بەتایبەتیی: فەوزی رەشید نامیق، چیرۆکنوس حەمە ساڵح محەممەد ئەمین، عوسمان دزەیی، عومەر دەبابە لەپێش چونە شاخ، شێخ عەلی خاڵو گەلێکی تر کە هەمویان سەربەرزو خۆگرانە ساڵانی نەفیکردنیان بەسەر برد. سەرەتا لە دوو کیلۆمەتریی رۆژئاوای شاری رەمادی لەسەر ئاوی فورات دەژییاین، دوایی پارێزگاری رەمادی بەدەرکردنی داینو ئیتر لەناو شاردا خانومان گرت.

سەردەمێکی ساڵانی نیوەی دووەمی شەستەکان، کەمالی میرزا غەفور زۆر بەوە دڵتەنگ دەبو کە من بەرگرییم لەدیلان دەکرد، بەهۆی یەك دوو هەڵوێستی کۆنییەوە.

هەرکە شیعرەکەی لە (هاوکاری)دا بینیی بەپەلەپرۆزێ رۆژنامەکەی هێناو خستیە بەردەمو گوتی: دە فەرمو مەحمود ئەمە حەمە ساڵح دیلانەکەیە کە تۆ خۆشت دەویستو بەرگریت لێدەکرد!

من لەوە سەرم سوڕماو پرسیم مەسەلە چییە؟ گوتی دەتۆ ئەو شیعرە بخوێنەرەوە!

کە شیعرەکەم خوێندەوە:

## شەپۆل

شەپۆل شەپۆل لەگەڵ دەریای ژیانا
هاتین.. ڕۆیین بەدوو تۆیی ئاسمانا
هەندێ خەیاڵ، هەندێ ڕاستیو دروستی
گێژاومان کرد.. بست بە بستی دەریای هەستی

کە بێینە سەر ڕابوردوی پڕ ئەشکەنجە
گرێی دڵە وەك برینی شێر پەنجە
گرێی چاوە تاکەتاکەی نیگاری
ئارام بەرە تاسەی وەکو بزماری

کام تاسەیان یادێکی بەهەوایە
ژان هێنەرە وەك خۆی بۆ برین وایە
گوێزانێکە بۆ قەتماغەی زمانمان
دڕکی تیژە بۆسەر هەتا دامانمام

لەبەهارا هەر کوێ ئەچووی زستان بوو
لەهاوینا چزە لەپێست هەستان بوو
کووچە نەما تێ یا نەگەڕێین پەتیارە
شەقام نەما نەی پشکنین بێ چارە

کونتە پەپوو ئاواز خوێنی شەوگار بوو
فیڕنە گولە بولبولی مێرغوزار بوو
قەلە ڕەشکە دەنگ نووساو بوو لەراستمان
هەرتوانج بوو وەڵامی هەستو خواستمان

دەردو دوو بوو بەروو بومی بێستانمان
هەر شەرا بوو شنەی شەنگی کوێستانمان
هێرۆ زەرد بوو زۆر زەردتر بوو لەپایز
سێ بەڕۆی بوو مام باپیرو مام بایز

ئەوا ئێستا وەرز رووەو بەهارە
چووزی مێرگی گەشاوەیە دیارە
بنارەکان سەوز رووناك ئەنوێنن
چنارەکان زەرکەفت هەڵ ئەوەرێنن

ئەوا دیسان تەمەن لەنوێ نووسراوە
شەوی بەرات لە ئیمڕۆوە بەسراوە
مێرگ ئەگەڕێن لە نیسانا بێ خورپە
کوێستان ئەکەین لەچلەدا بی گورپە
دار ئەنێژین گوڵ ئەنێژین گوڵاڵە
کام ئەچێژین کامی هەنگوین هەڵاڵە

نەمدەزانیی چۆن ئەو هەڵوێستە شیعرییەی دیلان لێکبدەمەوە. هەر بەراستیی بەهاری روخانو زەلیلیی کوردی پێچەوانە کردبۆوە. لەهۆی ئەو گۆڕانە گەورەیە نەدەگەییشتم، زۆریشی دڵگران کردم چونکە هەر لە سەردەمەکەدا، لەسالآنی ٧٢-٧٤ ئەندامی دەستەی نوسەرانی حەفتەنامەی "برایەتی" بوو لە سلێمانی. رۆژێکی بەهارێکی درەنگی سالّی حەفتاو دوو یەکترمان بینیو گوتی دەزانی ئەو نوسینەی بۆ برایەتیی نێردرابوو، وەك شاردنەوە، خرابووە قوژبنێکەوە، من دەرم هێناو گوتم: حەیف نییە ئەم نوسینانە بلآو ناکرێتەوە، ئەم ژمارەیە یەکێکیان بلآو دەکرێتەوە. گوتم: خۆ یان داوا دەکەنو جەخت لەسەر ناردنی نوسین دەکەن، ئەوەش کردارییانە. لەدواییدا هەردوو نوسینەکە بلآوکرانەوە. مەبەستم لەوە دەرخستنی دۆستایەتیو هاوکاریی دیلان بو لەگەڵ پارتیدا.

ئەو رەنجاندنە وای لێکردم کە نوسینێکی شێوە پەخشانی بۆ بنوسم تابۆی بنێرم. لەدوایدا بڕیارم دا کە خۆم لە مۆڵەتێكو گەڕانەوەمدا بۆ سلێمانی دەیدەمێو کەمێ مشتو مڕیشی لەگەڵ دەکەم.

لە یەکێ لەو سەفەرانەی بەمۆڵەت دەهاتمەوە سلێمانی لە کتێبخانەی سلێمانی کە مەڵبەندی دانیشتنم بـو. چونکـە لای خاوەنەکـەی: عومـەر عـەبدولرەحمان دادەنیشتم، لە هەموو شوێنێك زیاتر دڵم دەحەوایەوە. ئەم جگە لە هەڵوێستی سیاسیی دروستو رابوردوی گەشی، لەدڵسۆزیو وەفای برادەرایەتییدا، بەشی کەسی نەداوە، هێندە قسەی خۆشو نوکتەزانە کە هەموو هەوادارانی کتێبخانەکە نەك هەر بەندە، لای دەحەوانیەوە، لەناو قسە خۆشو پڕ ماناکانیدا هەرچی ناوی

خەمو خەفەتە لەبیرم دەچووەوە. جگە لەوەی وەك سیاسییەكی خاوەن ئەزمونو هەڵوێست بۆ باری سیاسیو كێشەو نەهامەتییەكان، بۆچونو ڕای تایبەتیی خۆی هەیە.

بە ڕێكەوت لەوێ، وەك هەندێك جاری تر، دیلانم بینی كە باسەكەم لەگەڵ كردەوە، گوتی:

< زۆر باشە دادەنیشین. بەڵام حەز دەكەم پێشەكی ئەوە بزانیت كە من ئەوەم لە قەناعەتو لەبیرو باوەڕەوە گوتووە! منیش گوتم:

< جا ئەگەر وابێت دەی كەوابو دانیشتن پێویست ناكات. ئیتر لە تورەییمدا نوسینەكەشم نەدایە.

ماوەیەك دیلانم نەبینییەوە تا لەهاوینی ساڵی حەفتاو حەوتدا، بۆ كاروباری دروستكردنی خانووەكەم لەسەر گردەكەی سەرچنار چوم بۆ ئیدارە محەللی. سەرم كرد بەژورەكەی ئەو برادەرەی بۆ لای دەچوم (عوسمانی شێخ كەریم) كە برادەری قوتابخانەی سەرەتاییو منداڵی گەڕەكیش بوین. ئەو لەوێ نەبو.

بەرامبەر بە جێگەكەی ئەو حەمە ساڵح دیلان دانیشتبو خەریكی نوسین بو. كە چاوی پێم كەوت، سەلامێكم لێكردو هەواڵی عوسمانم لێپرسیی، هەستایە سەرپێو فەرموی لێ كردم گوتی تا چایەك دەخۆیتەوە ئەویش دێتەوە. وتم نا سوپاس دەڕۆم، بەڵام دەگەڕێمەوە. ئیتر خواحافیزیم كردو ڕۆیشتم.

بەدوامدا هات و بەزۆر ڕایكێشامە ژورەوەو گوتی دانیشەو چایەك بخۆرەوە. جەختم لەسەر ئەوە كرد كە كارم هەیەو دەبێت بڕۆم. لە ڕاستیشدا حەزم نەدەكرد لای دابنیشم، لە هەمان كاتدا پێشم خۆش نەبوو دڵی بشكێنم، زۆری لێم كردو وتی:

- وەرە دانیشە با پارچە هەڵبەستێكی نوێت بۆ بخوێنمەوە، دەزانم زۆر بەدڵت دەبێت.

ئەوە دڵمی زیاتر نەرم كردو چومە ژورەوەو دانیشتم. چای بانگكردو دەرگای پێوەداو پارچە هەڵبەستەكەی دەرهێناو دەستیكرد بەخوێندنەوەی:

**بەستەی بێدەرەتان**

نە چڵ دیارە..
نە بێخێ
دەستی بەرمێ !
لەتینوانا
ئەخنكێ

چاوی چارە..
ئەخنکێ..
سووك ئەتاسێ
قوڕگی "گینگڵ"..
لە ڕۆخ
دەریا.. کە گێژاو
لای ئەدا (لەش)
بەکۆمەڵ
"شەو"
لە "ترسانا"
ئەنووقێ..
مۆر
دائەگیرسێ
پێستی شەوگار..
وەك ئەو ڕۆژە
کە تیا کوژرا
"بڵێسە"
وەك ئەو ڕۆژەی
کە ئاسمان
هەڵپڕوکا !
وەك ئەو.. ئێوارەیەی
هەتا زریکە
لە کۆڵنجی..
سروشتی
پڕ
لە بێزوو..
بەلاشەی
کۆمەڵی
"داستانی"
مێژوو..
لە ڕۆژێکا..

که "دڵ"

زێڕو زەبەر بوو..

لەکاتێکا..

هەتا

سەرپشتی

ماسی

ڕمی

بێ دەرفەتیم

نابوو..

بەناخا..

لەتینوانا..

ئەوی ووتراو..

ئەووترێ

هەموویم

جوو

تفیشم کردەوە ئەوسا

لەداخا !

که تەواوی کرد گوتم:

< چاوەکەم ئائەمە حەمە ساڵح دیلانەکەی خۆمانە، هەر ئەوەندەم لە زار هاتە دەرەوەو دڵم نەهات رستەکە تەواو بکەم. خۆ کەسیش نییە لە هەڵە بێبەری بێت، گرنگیش ئەوەیە کە پیاو هەستی بەو هەڵەیە کرد ئیتر لابەلای بکات و پێیدا نەچێتەوە.. بە تایبەتیی بۆ یەکێکی وەك دیلان کە لەناو کاروانێکی دوورو درێژی خەبات و نیشتمانپەروەریو روناکبیریی‌و شاعیریی‌و هونەرمەندیی و سترانبێژیدا ژیاوە. ئەو کراوەیی‌و دڵفراوانی‌و بۆچونە، بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە، پێویستەو نابێت بە هەڵەیەك خەتێکی راست و چەپ بەسەر تەمەنێکی دوورو درێژی ژیانی سیاسییاندا بهێنرێت.

هەڵبەستە نوێیەکە شوێنەواری هەڵبەستی بەهارە بێزراوەکەی سڕییەوە. هەر تەواو پێی گەشامەوە. بە پێچەوانەی سەرەتا زۆر بە گەرمییەوە خواحافیزیم لێکرد..

لە راستییدا زوربەی زۆری کوردی هونەرمەندو شاعیرو چیرۆکنووس و ئەکتەرو گۆرانیبێژو نوسەر، بەتایبەتی لەم شارە زیندووەدا، کوڕی رۆژی تەنگانەو

لێقەومانن، دەنگ و سەنگ و پێنوسەکانیان بەتواناترین چەکی ئەو رۆژانەیە، ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیی‌و زانستییانەی رەوتی کارەساتەکان بکرێت و رۆڵی ئەو جوامێرانە بنرخێنرێت، وا دەسەلمێت کە ئەوان بۆخۆیان شۆرش بوون، پێنوسەکانیان چەکی کاریگەرو ئامرازی بەربەرەکانیی ناو سەنگەری نەبەزین و گەشەپێکردنی گیانی نیشتمانپەروەریی بوون.

رۆژانی دوای هەرەسپێهێنانی شۆرشی ئەیلول و راکردنی سەرکردایەتیی پارتی لە مەیدان و چۆڵکردنی وڵات، گەورەترین کارەساتی نەتەوەیی بو، تا ئەو سەردەمە گەورەترین تێکشکانی سایکۆلۆجیی بو کە ئەو دیاردەیە خولقاندی. ئەو کارەساتە باشترین ئەزمونیش بو بۆ ئەو بۆچونە کە ئەو رۆشنبیرانە سەرکەوتووانە تێیدا ژیان و رۆڵی پڕ لە شانازیی خۆیانیان بینی.

لەهەمان زەمین و زەماندا، ئەو هونەرمەندە دڵسۆزانە قوڵی مەردایەتییان لێهەڵکرد، بە شیعرو چیرۆك و لەسەر شانۆو لەناو شانۆگەرییەکانیاندا، رێبازێکی نوێیان بۆ نەوەکانی گەل و تێکۆشەرانی کۆڵنەدەر دەنەخشان و کۆڵەکەی ورەیان لە وشەو رستەی بەهێزو بەپێز سەقامگیر دەکرد..

"رەجەب و پیاو خۆران" نمونەیەکی شانۆگەرییەکانی سەرەتای ئەو شۆرشەی دوای ئاشبەتاڵی سەرکردایەتیی پارتی بوو. هەرچی هۆش و گۆش و هەستمە، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی لای وشەو نواندنەکانی سەر شانۆکە بوو. کە هەستام فرمێسکی قەتیس بوو نەیهێشت بەپیر ئەکتەرەکانەوە بچم، تا یەکە یەکە لەگەڵ ماچکردنیاندا ئافەرینی هۆش ویژدان و ئازایەتییان لێبکەم.. بۆیە هەر لەبەر خۆمەوە بەخۆمم دەگوت: ئافەرین رۆڵەکانی شێخ مەحمودو میرانی بابان، ئافەرین نەوەکانی نالی‌و سالم.. کورد رۆشنبیرو تێکۆشەری ونناوی وەك ئێوەی هەبێت، ئاگرو ئاسنی دوژمنانی داگیرکەرو سەد هەرەسی تر کۆڵ بەو کوردە نادەن.

چیرۆکنوس و نوسەرو شاعیرانی ترمان لەسەر هەمان رێبازی خەباتی دێرین تۆوی خۆڕاگری‌و تێکۆشانیان دەچاند، بە جۆرێك کە لە ساڵانی بێ بەهارو لە پایزە وەرزی نەهامەتییەکاندا، چەکەرەیان دەکردو سەوز دەبوون و نەوەیەکی نوێی راپەڕیویان دەخولقاندەوە، نەك هەر لە وڵات بەڵکو تەنانەت لە تاراوگەو ناوەڕاستی بیابانەکانیشدا کە لەسەر رێبازی هەڵتەکاندنی قەوارەی نەتەوەی کورد، دەویسترا چیاکانی بۆ بگوێزنەوەو سروشتی جوگرافی‌و دیموگرافیی ئەوێ‌و کوردستان پێچەوانە بکەنەوە، لەو گۆڕەپانەدا شێرکۆ بێکەس وەك پێشەنگی شیعری بەربەرەکانیی لە مەیدانا رۆڵی خۆی دەبینیی..

لەناو گیانی بەربەرەکانیی لە کوردستان و ئەو تاراوگەیەدا، ڕۆڵی ئەو، وەك شاعیرو وەك نیشتمانپەروەر دڵی خەڵکی دەهەژان و هێندەی تر خۆشەویست دەبوو. گیانی ورەو نەبەزینیی تێکۆشەرانی بەرزدەکردەوەو هی بێئاگاکانی رادەچڵەکاند.

لە تاراوگە ئەو لەگەڵ ئێمە نەبوو، بۆ "بەغدادییە" ی رەمادیی، لەسەر روباری فورات، نەفی کرابوو، زیاتر لە سەعات و نیوێك لە ئێمەوە دوور بوو، راپەڕینی شیعریی دژ بە هەرەس و لەدژی خۆ بەدەستەوەدان و سەرشۆڕیی، "پەریخان"ی تێدا بەوەڵەد بوو.

ئێوارەیەکی سەرەتای نەفیکردنمان، کە ئێمە لە دوو کیلۆمەتریی رۆژئاوای شاری رەمادیی گیرسابوینەوە، دووەم قاتی سەرگازینۆکەی باخچەی شارەوانیمان بەکرێ گرتبوو کە کەوتبووە گوێ روباری فورات، دانیشتنێك بۆ شێرکۆ سازکرا. دوای قسەکردن و حەوانەوەو پێش سەرگەرمیی، دەستی بردو "پەریخان"ی لەناو دڵی دەرهێنا، بە شێوەو ئاوازی خۆی کە گیان بە بەرهەڵبەستدا دەکات، کەوتە خوێندنەوەی پەریخان.

هەرچیی هەست و نەست و وشیاریی هەیە هەمووی بۆ خۆی راکێشا، هەمووی زەوتکرد، منیش بۆ خۆم بوم بە دەروێشی پەریخان، بە دابەشکردنی سەرنجەکانمدا لەوە حاڵیی بووم کە برادەرەکانیشم لە من باشتر لەناو وشەکاندا تواونەتەوەو ئەوەی ناوی ئاگادارییە لایان نەماوە. دەنگ و شەو جوڵەی یەکەیەکەی ئەندامانی لەش و ئاوازی گوتنەکەی، بووبونە پەرستگایەك بۆ میللەت پەرستن، تێیدا وشەو رستەکان لەناو مێشك و دڵ و دەرونی هەریەکەماندا تۆمار دەکراو پەیکەری پەریخان، هەرەسی شۆڕشە سەربڕاوەکەی ئەیلولیان لە دڵ و سینەدا دەخوڵقاند! فیلمێکی ڕەنگاوڕەنگی بەدەنگی هێنایە بەرچاو هەریەکە لە ئێمەی ژیاوی ناو شۆڕش و ناو ئەو فیلمە و دەربازبووی ژێر هەرەس و ئاوارە بووی بیابانەکان، وا سەرلەنوێ بە دوو جۆر خۆمان لەناو کارەساتەکانی هەرەس و ئەوقبووی پەریخاندا دەبینینەوە..

لەوەوبەر شێرکۆم دەناسیی، منداڵی یەك گەڕەك و دوو کۆڵانی دراوسێی یەکتر بوین. لەناوجەرگەی سەرکارێز، نیشتمانپەروەریی و گیانی بەربەرەکانیی ئەوم لە زوویەکەوە بۆ ئاشکرا بوو. بەڵام ڕۆڵی لەناو ڕوداوەکانی هەرەس و سەرلەنوێ بوژانەوەی گیانی بەربەرەکانیی لە دژی داگیرکەر، جیهانێکی نوێ بوو، ڕۆمان و داستانە شیعرییەکانی، هەڵبەست و وشە بروسکە ئاساییەکانی، رۆژێکی بێ ئاوابون بوو، تێیدا بوو بە دیوانەی نەتەوەکەیی‌و بە کەشکۆڵی شیعرە زیندووەکانی دەشت و کێوو شارو وڵات دەگەڕاو بەدوای پێناسەی نەتەوەکەیدا هەمیشە لەگەڵ چیاو بۆ چیا کۆڕی گەرم دەکرد.. ئا لەوانەوە ئەو لای من بوو بەو شا ئەستێرەیەی

که گیان و بەرزیی کەڵە شاعیرەکانی سەرجەم مێژووی کوردی تێدا دەربکەوێو لەهەر پەخشانێکیدا پەیکەری بەدەنگ و رەنگی یەکێکیان ببینرێ..

لەم زیندانەدا، فەرەجی نەریمان بۆ من دیوێکی دیلان بو، چونکە دەنگی هەم خۆش و هەم بەزەحمەت لە دەنگی ئەو جیادەکرایەوە، ئیتر دیلانی دووەم هەر خۆی بو.

دوای عەسران کە سێبەر چیمەنی حەوشەکەی دەگرتەوەو دنیا فێنکی دەکرد، خۆمان بە پیاسەو مشت و مڕ لەسەر رووداوو گریمانە جۆربەجۆرەکان خەریک دەکرد.

فەرەج پیاوێکی کۆمەڵایەتی و کراوەو قسەخۆش بو. زۆر خۆدەرخەر بوو، هەمیشە وای دەردەخست کە ئاگاداری هەموو رووداوەکانە. پێش ئەم گرتنە هەر ئەوەندە فەرەجم ناسیبو. هەر لەیەکەم رۆژی هەیئەدا دەهاتە لامەوەو خێرا باسی هۆی ئەم گرتنانەی بۆ ئەوە دەگێڕایەوە کە گوایا بەیانێکی زۆر بەناو سلێمانیدا بە شێوەیەکی فراوان بڵاوکراوەتەوە. خۆشی بەئاگادار نیشان دەدا، دەشی ویست وای نیشان بدات کە ئەو دەزانێت گوایە من ئاگادارییم لەوە هەیە! منیش بەبێ ئاگا وەڵامم دەدایەوەو کە ئەگەر قسەکەی فەرەج راستیش بێت وا من هەر بێئاگابوم لەوە. ئیتر ئەو قسەیەی لای چەند کەسێکی ترمان کردبۆوە بێ ئەوەی کەسمان بڕوای پێ بکەین. ئەو لەهەموو سەردەمەکاندا نیشتمانپەروەرو پیاوێکی دڵسۆز بو.

دوای دوو هەفتەیەک لەمانەوەمان لە (ئەمنی عاممە) جاربەجار لەسەرخۆ گۆرانیی بۆ دەگوتین. لە یەکێک لەو جارانەدا زۆر لەسەرخۆو بەهەمان ئاوازەکەی دیلان دەستی کرد بە مامەکوڕنو:

مامە کوڕنو راکشاوی گردەکەی سەیوانەکەم
سەر رەحەت، دڵ بێ گرێ، گوێ شلکە بۆ داستانەکەم

سەیرە، بەزمە، هەڵپەڕینە، پڕ لە قاقاو خەندەیە
نەعرەتەی گوێ کەڕ ئەکا، جۆش و کوڵی سەیرانەکەم

نەرخەوان سوورە، بەهارە، گوڵشەنە، رازاوەیە
دەشت و کۆ رەنگین و پڕ شۆیە وەنەوشەی یانەکەم

خەرمانی لالە لە کۆهساران و پێدەشت و نشێو
سورترە لەو خوێنە باریوەی کوڵی گریانەکەم

دولبەران سرك و بەنازو رەوتی نەرم و ئیستەکەی
سەد توانج ئەگرێتە ئاهووی دەشتەکەی شێروانەکەم

هەڵبڕە چاوی نومایش تێر سەرنجی وورد بدە
وەك بەجێت هێشت وا نەماوە شارەکەی جارانەکەم

ئەو بەهارەی تۆ بەجێت هێشت پڕ برینی تازەبوو
پڕ لە ئافاتی لەپڕ بوو بۆگوڵی ئینجانەکەم

ئەو گوڵەی ئاواتی کورد بوویێتە پشکووتن دەمێ
رای وەشێنێ بای شەماڵی نەرمی کوردستانەکەم

ئەو کەسەی دەستی ئەنایە بین و قورگی ئەم گوڵە
چنگی خوێناوی ئەنایە ناو دڵە پڕژانەکەم

ئێمە ئارەق رشتن و بازوو وەشاندن، بێ خەوی | ئەو گرو پشكۆی ئەخستە ژێر بنی خەرمانەكەم
ئێستە وا خۆی دائەنێ بۆتە فریشتەی ئاسمان | بۆتە دوكتۆرو برین پێچی برینی گیانەكەم
مامەكوڕنو چی بڵێم زیاتر لەوەی (خالس) ئەڵێ | (فێست و ڕێوی‌و مێژەرو مەیمونە سەیری بانەكەم)
وەك وتم سەیرە لەبانە یاوەكو نالی ئەڵێ | زیندەگیم تاڵە كە زەلكاو بێ تیمار خانەكەم !

كە ئەڵقەی گوێگران كەمێك فراوان دەبو، هی وامان تێدا بوو زۆر بێتاقەت دەبو، بۆیە دەكەوتە گلەیی‌و بۆڵە بۆڵ. ئەوەی لە هەمووان زیاتر بەوە تورە دەبوو عوسمان بو. هەندێكی تر بەهێمنی لایەنگریی ئەویان دەكرد، بەڵام زۆربە پێیان خۆش بو. یەكەم جار یەكێكی راسپارد. دووەم جار هاتە لام و گوتی: مامۆستا گیان بۆ خاتری خواو پێغەمبەر ئێمە لە كوێوە هاتوین و ئێستا لە كوێین! ئاخر ئەمانە لە شیعرەكان دەگەن، لەوانەیە میكرۆفۆنیان دانابێت، كێ دەڵێت لە پێڵاوەكانیشدا دایان نەناوە.

پێم گوت كە ئەمە كار ناكاتە سەر مەسەلەی بەربونمان. جگە لەوە، ئەوە گۆرانییەو كێ ئەڵێت بەدیوەكەی تریدا بۆمان لێكنادەنەوە! گوتی دیوی تری چیی؟ گوتم وەك دەردەكەوێت ئێمەیان بۆ دڵدانەوەو سڕینەوەی شوێنەواری هەیئە بۆ ئێرە هێناوە. جا دوور نییە ئەو گۆرانی گوتنەو وا لێك نەدرێتەوە كە وەزعی نەفسیمان باش بوبێت و ئیتر وردە وردە هەیئەمان لە بیر دەچێتەوە. ئەوەش یارمەتیدەربێت بۆ درێژ نەكردنەوەی ماوەی بەردانمان. گوتی:

دەباشە، ئەوە زۆر باشە، بەڵام با هەر گۆرانی بێت نەك ئەم شیعرە نەگبەتانە، ئاخر كەی ئەوە گۆرانییە ئەمە ماڵ وێرانكەرە، باوكم وەڵا ئەمە هیچ ئازایەتییەكی تێدا نییە..!

دوای مامە كوڕنو نۆرەی ئەژدەهاكە
وشەو ئاوازو دەنگ
لەناو زیندانی ئەژدەهاك دا

فەرەج هیچ گوێی بۆ بێزارانی گۆرانی گوتنەكەو ئەو قسانەی ئەو چەند برادەرە شل نەدەكرد، هەر كاتێك داوامان بكردایە، یان بیزانبایە وەختی گوتنی هاتووە، دەستی بە مامە كوڕنو دەكرد. دوای ئەوە سەرە هاتە سەرئەژدەهاك زیندانت قەڵا قەڵایە..

دیلان لە ساڵی ١٩٥٣دا هەڵبەستی "زیندانی ئەژدەهاك"ی دژ بە بتەكانی فاشیزم گوتوە. لە راستیشدا ئەم هەڵبەستەی دیلان هەر دەڵێی بۆ زیندانەكانی ئەم رژێمەی بەعس گوتراوە، نەك بۆ سەردەمی پاشایەتیی كە لەچاو ئەم رژێمەدا

بەهەزاران ئاو شۆردراونەتەوەو هەر جێگەی بەراورد نیین. لەلاوەو بۆ یەکەم جار هەر لەسەر هەمان نەزم و ئاوازەکەی حەمە سالْح خۆی دەستی پێکرد:

ئەژدەهاك! زیندانت قەلا.. قەلایە،
دیواری کۆنکرێت، دەرگای پۆلایە.
ئەژدەهاك! کونبڕە، سەختە زیندانت،
ناڕووشێ بە بڕبەن بەندی گرانت!
هێزی لەش مرێنە کۆت و زنجیرت،
کاری‌یە لە دەمار ناپاکیی بیرت.
دڵ رەقیت هەر تاوە چەشنە سزایە
بە بەندیی خاوەن هۆش ئەخاتە کایە.
هێند چەشن سەربڕو زیندانەوانت،
سەرخۆش بەخوێنی گشت بەندی‌یەکانت!
ئەژدەهاك ئەی دێوی (بیر) زراو چوو،
ئەی ناشتای مارانت بە مێشك کردوون!
ئەومێشك تازانەی زنجیرت کردوون.
لە لێو پێچاڵی مەرگا راتگرتوون،
چاوەڕێی فەرمانن بە رێی نەهاتا
ببرێنەبەر تەناف لە نۆرەو کاتا
مێشکیان ئامانجیان، هیواو تاسەیان
لە پەتا بتاسێ وەك هەناسەیان!
ئەمانە گشت ئەڕۆن ئەیانڕەوێنێ،
هیچ نەبێ لە بەندا ئەیانڕزێنێ،
بەڵام تۆ، ئەژدەهاك، لە هەڵپەی خۆراك
ناتوانی بکەوی بۆ ماری ناپاك!
هەر ئەگری، ئەکوژی، ئەدەی لە گەردن
مێشك دەرخوارد ئەدەی بەماری نەوسن
تا رۆژێك ئەو خوێنە بە ناحەق رشتت
ئەو بیرەی وات زانی ئێجگاری کوشتت،
تاو ئەدەن تەنووری دەماری کاوە،
ئەو چەکوش وەشێنەی رۆڵە کوژراوە
ئەخرۆشێ ئەجۆشێ‌و کۆمەڵ یەك ئەخا

هەر هەڵساو ئەبینێ زیندانت روخا!
ئەو حەلە هەر لاوێ لە زیندانتا مرد!
ئەبێتە مایەی بەخ بۆ نەتەوەی کورد
لە بنکەی پەیکەریا ئەنوسرێ ناوی
لەگەڵ گشت کردەوەی پەسنکراوی!

کە ئەڵقەی گوێ گرتن لە ئەژدەهاك، لە دووان و سیان تێپەڕی دەکرد، زوربە پێیان خۆش و هەندێك برادەریش تەواو لەوە تورەو بێزار دەبون... ئەوان ناهەقیشیان نەبوو، چونکە هەیئەو ئەمنی عاممەو مامە کورنو و ئەژدەهاك هەر ئەشکەنجەو نەهامەتییەکان وەبیردێننەوە.

لەناو ئەو زۆرداریی‌و وەیشومانەو ئەو وشانەدا، ئەمرۆ پێش دوا رۆژی مانگی ئایار تراجیدییەکەی کچە قدیسەی فەرەنساوی تەمەن نۆزدە ساڵ! (جان دارك)م هاتەوە یاد کە رێك (٥٥٠) ساڵ لەمەوبەرو لەم رۆژەدا ئالاّی ئازادیی نیشتمانەکەی لەدژی ئینگلیز بەرزکردەوەو لەو تەمەنەدا ئینگلیزەکان گرتیان و سوتاندیان.(١٤٣١).

وا حوزەیرانیش بە کۆمەڵێك بیرەوەریی کارەسات و مەینەتەییەوە، دەستی پێکردووە، بەتایبەتیی:

- ٩- ٦- ١٩٦٣ کارەساتی رەشبگیری‌و کوشتنە بە کۆمەڵکەی بەعس لە شاری سلێمانی‌و لەکۆیەو نوێبونەوەی شەڕی کوردو رژێم..
- دامەزراندنی کۆرەك (١- ٦- ١٩٧٠)و ی.ن.ك (١- ٦- ٧٥)
- بەرپابونی شۆڕشی نوێ (١- ٦- ١٩٧٦).
- شەڕی دەربەندی بازیان و بریندار بون و یەخسیرکردنی شێخ مەحمود (١٨- ٦- ١٩١٩)

لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەرەکەی کورد (١٩- ٦- ١٩٤٧)

هەر لەم رۆژو مانگەی ساڵی ١٩٥٠دا پیرەمێرد دوا کۆچی کرد. کورد بە گشتیی‌و دانیشتووانی شاری سلێمانی بە تایبەیتی، قەرزاری پیرەمێردین. ئەو رۆڵێکی زۆر گەورەی لە ژیانی سیاسیی‌و نیشتمانپەروەریی بێ رێکخستندا بینی، بە رۆژنامەگەریی‌و چاپخانەدانان و بوژانەوەو گێڕانی جەژنی نەورۆز وەگ بۆنەیەکی نەتەوەیی و سیاسیی‌و ئینجا بە شیعرە نیشتمانییەکانی کەهاندەری خەبات و هۆی قوڵکردنی هۆش و هەستی نەتەوایەتیی بوون.

گلەیی و رەخنەو تیرە شیعرییەکانی پیرەمێرد زەنگـی هوشیارکردنەوەو بـانگی ئازادیی بون بۆ هەمو نەوەکانی نەتەوە لە هەموو سەردەمەکاندا..

- لە ۲۱- ٦- ۱۹۳۰ لە پیلانێکی چەپەڵدا بەناوی گفتوگۆوە سمایل خانی سمکۆ تیرۆر کرا.

- لە سێدارەدانی شێخ سەعیدو هاورێکانی (۲۸- ٦- ۱۹۲٥).

- یەکێك لـە دەنگە رەسـەن و ئاوازە بەجۆشـەکانی مۆسیقاو گۆرانیی کوردی کە بەرزیی ئەو هونەرانەی لای چینە پارێزگارو کۆنپارێزەکانی کورد ئاشناو حەڵاڵ و بەسود کرد،و کە لەم مانگەدا کۆچی کرد (حەسەن زیرەك) بو (۲٦- ٦- ۱۹۷۲)

سێ هەفتەیەك بەسەر بونمان لە ئەمنی عاممە تێپەڕ بووە، عەسرێکی زوو، پێش کاتە ئاساییەکانی هاتنی عـەقید تاریق، خۆی کرد بـە ژورەکانمـاندا، لـە سـیمایدا هـەواڵێکی خـۆش نەخشـاوە، کـە لێـی گـرد بوینـەوە، بـە روویـەکی گەشـی پـڕ لـە زەردەخەنەوە گوتی: ئێوە سبەینێ ئازاد دەکرێن. ئەمشەو بەرنامەیەکی تایبـەتیتان بۆ دانراوە، سبەینێ بەیانی زوو لێرەوە دەڕۆن و دەچنەوە ماڵی خۆتان.

ئێمە بەو قسانە کەوتینـە هـەوای خۆمـان. هێنـدە دڵشـادو کـەیف خـۆش بویـن کـە پێمـان عـەرزی نـەدەگرت. وامـان دەزانـی عـەقید تـاریق لەبـەرگی فریشـتـەدایەو لـە ئاسمانەوە ئەو مژدەیـەی بۆ هێنـاوین. عـەقید لـە دڵـی زیندانییـەکاندا جێگـەی خـۆی کردۆتەوە، رۆژێك نەبینرایە لای زوربە بەدیاردەی شوم دادەنرا. لە سنور بەدەر خۆی بە دڵسۆز نیشان دەدا، هەر خۆی کردبوو بە خاوەنی کێشەکەی ئێمە. چەند رۆژێك لەوەو بەر ئاگاداری کردین کە لـە گەڕانەوەماندا بۆ سلێمانی، هـەر کەسێکمان هەر کارێك، پێویستییەك داوایـەکی هـەبوو یـان توشـی هـەر گرفتێك بـو ئاگـاداری ئـەو بکرێت، ئەوسا گوتی ئەمەش ژمارەی تەلەفونەکەمە. ئەوەی دەستتان بۆ بێنێت، یان کێشەتان بۆ دروست بکات چاوی دەردەهێنین!

من ئەوەم بە لوتکەی هەوڵدانیان بۆ هێمن و دڵنیاییکردن دادەنا تا هیچ کەسێك سڵکردنەوەی لە مێشکدا نەمێنێت. لەناو ترسەکانی هەیئـەوە بیر لـە کێشـەو گرفتی تر نەکاتەوە، بیری راکردن و چونە شاخی لە مێشکدا نەمێنێت.

دوای ئەوەی ئەو رۆیشت، دەستمان کرد بە لێکدانەوەی ئەم هەواڵە خۆشە کە لە دایکبونێکـی تـری پێوە دیـارە. رێگەشـییاندا چـەند کەسـێك تەلـەفونیش بکـەن بـۆ ئاگادارکردنی کەس و کار کە سبەینێ بـەیانیی زوو دەگەینـە کـەرکوك، من تەلـەفونم نەکرد، بۆچیی؟ بۆ خۆشم نایزانم!

ئێواره داهات نانمان خوارد و چاوەڕوانی ئاهەنگ دەکەین. دەبێت چی جۆره ئاهەنگێك بێت؟ ئێمە چاوەڕوان و کات لەسەرخۆ گوزەر دەکات، بەڵکو هەر راوەستاوه، هەروەك سەعاتەکان وەستێنرابن.

لەناو گەرمەی چاوەڕووانییدا یەکێك هات و گوتی: دەی خۆتان حازر بکەن ئێستا دەڕۆین بۆ جێگەی حەفلەکە.

ئێمه له مێژه ئامادەین. بۆیه کەوتینه رێ، دیاره هەر لەناو ئەمنی عاممەدا. سەرەنجام کردیانین به بینایەکی گەورەدا. کە چوینە ژورەوه بینای چیی! هۆڵێکی زۆر گەوره، یەك حەوزی گەورەی مەلەی تێدایه پیاو لەسەیرکردنی تێر نابێت. بەم لاو ئەولاو له پێشەوەی حەوزەکه کورسی روبەڕوی شانۆیەکی گەوره رێکخراوه. دیمەنیی گشتیی و رازاوەی ئەو ساڵه. وا دەردەخات که له بۆنه تایبەتییەکاندا بەکاردەهێنرێت، حەوزەکەش بۆ کاتی حەوانەوەو مەلەی گەوره لێپرسراوەکان تەرخانه.

ئێمه هەمموومان لەلای چەپ، روبەڕوی شانۆکه کە حەوزەکە دەکەوێتە پشتمانەوه. جێگەمان بۆ دانراوه. هەمومان دانیشتین. لای راستیش تاقمێکی تره. پێدەچێ ئەوانیش وەك ئێمه زیندانیی بن. بەسەرو سیماشیاندا لە شیعه دەچن. کورد و شیعه بۆ رژێم دوو دوژمنی گەورەن و دەبێت تۆویان لەو عیراقەی بەعسدا نەهێڵرێت و بوونیان له رەگ و ریشه هەڵبکەنرێت. بەدرێژایی مێژوش هەردوو لایان چەوساوەو زوڵملێکراو و لەبەردەم هەڕەشەدا بوون، چونکە بەردەوام کەمایەتیی عەرەبی سوننه مەزەب حوکمی کردون.

له ئاهەنگەکەدا کۆمەڵێك لە گۆرانی بێژو هونەرمەندی عەرەب هاوبەشبون. به تیپێکی مۆسیقای تەواوەوه. وەختێکمان زانی (مەی جەمال) هات و گەڵێ گۆرانیی خۆشی لەگەڵ گۆرانی بێژێکی تردا گوت. (احمد الخليل) کۆنە گۆرانی بێژی شیوعییەکان و هی ئێستای ئەمان و بەناوبانگ بەگۆرانی (هەر بژی، هەر بژی کوردو عەرەب رەمزولنیزال) هاتە پێشەوەو چەند گۆرانییەکی عەرەبی گوت، بەو گۆرانییەشەوه، ئینجا سەره هاتە سەر (یوسف عومەر) بە دەنگە خۆش و بەسۆزەکەی دەستی کرد به مەقام و بەسته. له کۆنەوه من حەزم لە دەنگی ئەم هونەرمەندەیه. چەند خۆشه که گوێم له گۆرانییەکانی دەبێت. ئەوه یەکەم جاریشه که رووبەڕوو ببینم. لەوەوبەر هەر له تەلەفزیۆندا بینیبوم. له هەمان کاتدا ناخۆشه که هونەرمەندێکی وا گەوره بکەوێتە ژێر فەرمانی ئەم جانەوەرانەو بۆ ئەم شوێنه کێشی بکەن. هەرچەنده لایەنە مرۆڤپەروەرییەکەی، مەبەستم گۆرانی گوتن بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی وەك ئێمه که شەکەتی دەستی ئەم دەعبایانەین، کارێکی گەورەی

هاوجوتی هونەرەکەیەتی کە لە خزمەت مرۆڤایەتییدا بێت، گرنگ ئەوەیە نەبوبێتە بەعسیی‌و ئەو خۆشەویستییەی خەڵك لەدەست بدات.

ئاهەنگێکی تا بڵێیت خۆش و قەشەنگ بو، نەك هەر لە دیدی ئێمەوە کە بە ئاهەنگی ئازادیمان دادەنرێت، بەڵکو هەر لە راستیدا ئاهەنگەکە بۆ خۆی ئاهەنگ بو.

دوای تەواوبونی، شەو درەنگ رووەو خانووەکە بردیانینەوە. لە خۆشیدا کەس بیر لەخەو ناکاتەوە. من جێگەکەی خۆمم چاککردو پاڵکەوتم. بەڵام کۆبونەوەو قسەکردن نەیاندەهێشت بیر لەخەو بکەمەوە. هەرچی چۆنێك بو خەوم لێکەوت. بۆ بەیانی زوو لە دەنگە دەنگ و هاتوچۆی برادەرەکانم بەخەبەر هاتم. نوێنیان کۆدەکردەوە، خۆیان بۆ سەفەری سەرفرازیی رووەو سلێمانی ئامادە دەکرد.

ئەم بەیانییە بۆ ئێمە دەگمەنە. شادیی‌و گەشیی‌و ئاسۆی ئەم بەیانە تابلۆیەکە، ئەلوەنگ و زیندوو پڕ لە هەموو هیواکانمانە.

بەڵام هەر ساتێکمان بە سەعاتێك لێ تێپەڕ دەبێت. یەکەم جارە لە ژیانمدا ئەو دیاردەیەم لا پێچەوانە ببێتەوە! هەست بەوە بکەم کە لەناو خۆشیدا ساتەکان وا لەسەرخۆ گوزەر بکەن.

هەمو هەست و نەست و هوشیارییەکمان لای دەرگای دەرەوەیە. بەڵام هیچ دیار نییە.

نانمان خوارد هەر چاوەڕوانین. رۆژ دەبێتەوە ئێمە هەر لە جێگەی خۆمانین.

نەخێر کەوتینە ناو گومان و بێئومێدیی لە بەڵێنەکەیان. نیوەڕۆش هات و قاوەڵتیمان کرد، هەر هیچ دیار نییە. ئیتر خۆمان دایەوە دەست قەدەر. خۆمان ئامادە کرد بۆ عەسر، بۆ هاتنی عەقید تاریق تا بزانین بۆچی بەڵێنەکە وای لێهات. ئیتر ئومێدی سەفەری سەرفرازیی پێچرایەوەو بوو بە هەواڵێکی بۆش و شوێنەواری لە مێشکماندا نەما. ئەو ئێوارەش وەك جاران نەبو، چونکە عەقیدیش نەهات. بۆچیی؟ تۆ بڵێیت کەین و بەینێکی لەژێر سەردابێت؟ یان پەشیمان بووبنەوە؟ یان ئەم سەرفرازییەیان دواخستبێت؟ ئەو پرسیارانە لای ئێمە بێ وەڵامن، مەگەر هەر خۆیان بۆمان روون بکەنەوە! لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە چۆن لەو دوا نیوە شەوو بەرە بەیانەی دوا ئاهەنگەکە ئەو بڕیاری هێشتنەوەیە دراوە؟ کێ‌و بۆچیی‌و کەی ئەو بڕیارە دراوەو تاکەی دەوامی دەبێت؟

لەناو ئەو نائومێدییەدا، ئێمە بەدەرکەوتنی روخسارە ترسناکەکەی نەقیب خەڵەفیش رازی بوین. چونکە مەراقمانە کە هۆی جێبەجێ نەکردنی بەڵێنەکەیان بزانین. نەخێر ئەم ئێوارەیە کەسیان دیار نین. پەژارەکەمان زیاتر بوو، وامان لێك دەدایەوە کە گۆڕانێك لە هەڵوێستیاندا هەیە.

بۆیە دەبێت چاوەڕوانی "خراپەش" هەروەك چاکە بکەین. هەرچەندە من جۆرێك لە دڵنییام لا پەیدا بووە کە هەر ئازادمان دەکەن و دواخستنەکە گریمانێکی ترسناکی لەدواوە بەدی ناکرێت.

ئەوەی سەرلەنوێ لە مێشکی مندا وروژایەوە، بیری پۆلێنکردن و گلدانەوەی چەند کەسێکمانە. بەدەر لەوە دیاردەی نیگەتیڤم لە پرۆسەی بەرداندا بەدیی نەدەکرد. جگە لە ئەگەری سەرهەڵدانی دیاردەیەکی تری وەك گرتن و ئیعتیرافکردن و شتی تری لەو بابەتانە، کەهەمیشە لەناو بیرکردنەوەو چاوەڕوانیدا بۆشایی خۆی داگیر کردووە.

بۆ رۆژی ئایندە لە عەسرەکەیدا خەڵەف دەرکەوت هەر لەهۆڵەکەدا لێی گرد بوینەوە.

پێش ئەوەی کەس پرسیاری لێبکات خۆی دەستیکرد بە باسکردنی هۆی بەرنەبونەکە. وای دەردەخست کە هۆی ئەوە تەواو نەبوونی بەرنامەکەیە، کەی بەرنامەکە تەواو بوو، کە ئەوەش ماوەیەکی کورتی ترە، ئەوسا ئێمە دەڕۆینەوە ناوماڵو منداڵی خۆمان.

لەباسی هۆی دیار نەبونی عەقید تاریق، دەریخست کە لە بە ئەنجام نەگەیاندنی بەڵێنەکەو هێشتنەوەی ئێمە عاجزە. چونکە خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت لەو بەڵێنەو لە جێبەجێ نەکردنەکەی. بۆیە حەز ناکات بەو جۆرە بتانبینێتەوە.

بەرنامەی، دوای بەڵێن جێبەجێ نەکردنەکە، ناو بەناو بردنمانە بۆ سینەما، ئیتر ژیانی رۆژانی لەوەو بەری ناو ئەم خانووە کە تێیدا میوان زیندانیین، چۆن بووە هەروا تێدەپەڕێت. ئەم (میوان زیندانییەی) ئێمە بۆتە دیاردەیەك کە ئەم دوو وشەیە هیچیان مانای راستەقینەی خۆیان نادەن بە دەستەوەیان راستتر هەردووکیان بەیەك و بەخۆشیان نامۆ بن.

بۆ هەمووان، ئەوەی لێکدانەوەکانی زیاتر ئاڵۆزو کەمێك بێئومێدیش دەکرد، هەر ئەنجام نەدانی بەڵێنی بەربونەکە نییە، بەڵکو ئاوابوونی عەقید تاریقیشە. ئەو نە دەنگی ماوەو نە سەنگ. دیارە ئەوەش بەستراوەیە بە دیاردەی مانەوەمان و بەڵێنەکە. بە قسەکەی خەڵەفیشدا، وا دەردەکەوێت کە تا ئەو دەرنەکەوێتەوە بیری سەرفراز بوون خۆیمان پیشان ناداتەوە. پێدەچێ مانەوەکەشمان هەر لەسەر بڕیاری خەڵەف و شوعبەی سێیە.

**کورەی ئەتۆمی رژێم و خەوی بونە ئیمپراتۆر:**

رۆژی ٧- ٦ لەناو کەش و ماتییەکەی ئەوسەر زەمینەی ئێمەدا، لەپڕ گرمەو زرم و هوڕی بۆمباران بەرزبووەوە. وەك دیاردەی ئاسایی بەردەوامیی جەنگەکەی عیراق

و ئێران، بیرمان لێدەکردەوە. وامان دەزانیی ئەوە فڕۆکە جەنگییەکانی ئێرانەو بۆمبارانی شوێنێك دەکات.

دوای نزیکەی دوو سەعاتێك لە رووداوەکە یەکێك لەئەمنە پاسەوانەکان هات و زۆر بە ئاسایی دەستیکرد بە جنێودان و گوتی کورە ئەتۆمییە (مەفاعیلی نەوەوی) کانیان بۆردومان کردین. دواییتر زانیمان کە ئەوە ئیسرائیل بووە نەك ئێران. پێخۆشحاڵییەکی زۆر لەدڵو دەرونمدا خۆیان دەنوواند. لەهەمان کاتدا لەو دیاردەیە سەرم سورمابو کە بۆچیی مرۆڤ بەو جۆرە وێرانکردنی ولاتی خۆی پێخۆش بێت. کە دەڵێم ولاتی خۆ. مەبەستم رووە یاساییو سیاسییو دۆخە جوگرافییە سەپێنراوەکەیە.

وەلامی راستەقینەی ئەو پرسیارەو سەرچاوەی ئەو حەزە لەو نهێنییەدا خۆی دەبینێتەوە کە لە راستیدا ئەم ولاتە ولاتی من نییە، من نامۆم بەو و ئەویش بە من نامۆیە.

نیشتمانەکەم بەزەبری ئاگرو ئاسن و دیپلۆماسییەتی ساختە بەو عێراقەوە بەستراوەتەوە.

کە لەوەبەر بەو پێکهاتەو سترەکتورو شێوەیە لەئارادا نەبووە. بۆ ئێمەو لە هەموو بارو رووییەکەوە نائاساییو نامۆو ناڕەواو نایاساییە.. بۆیە ئاوا بە کۆت و زنجیر ئەوقی ئەو کراوین و ئەویش بە ئاگرو ئاسن لە گەڵمان دەجولێتەوە. جگە لەوە لەهەمو مافێکی نەتەوایەتیو نیشتمانییو هاوولاتییو مرۆیی بێبەشکراوین.

ئەوەشی کە ناوی رەوشت و نەریت و کولتورو مێژوی کوردو کوردایەتییە بە زۆری هێز تارو ماری دەکەن.. بۆیە بونمان پێکەوە بە نائاساییو نایاساییو بەدژی خواست و ویستی خۆمان خولقاوەو بەردەوامیشیی هەر بەو جۆرە دژ بە یاسای سروشتکردو رەوشتی مرۆڤپەروەرییە..

ئەی ئەگەر لەم ولاتەدا من بە نامۆو ناحەزو کۆسپ و دوژمن دابنرێم و بەدرێژایی مێژوویی دامەزراندنی، زوڵم لێکراو بووبم، جا بۆچی پێم ناخۆش بێت کە دەزگا سەربازییەکەی تێکبشکێنن!؟ ئەگەر هەبێت ئەوەی پێناخۆش بێت وا لە گەوجێتیی زیاتر هیچ لێکدانەوەیەکی تری بۆ ناکرێت!

ئەی ئەو هەمو وێرانکارییەی نیشتمانی کورد بە دەستی ئەم رژێمانە بەچەکی وێرانکەری دەستی ئەمان نەبووە! بۆیە خواستێکی تەواو رەواو مرۆڤپەروەرانەو یاساییە کە حەز بکەم و حەز بکەین کە ئەو جۆرە چەکانەو سەرچاوەی دروستکردنیان خاپور بکرێن.

ئەی ئەگەر خۆمان ئەو تواناو دەسەلات و هێزەمان نەبێت بۆ لەناوبردنی ئەو هەڕەشە گەورەیەی رووبەڕوومان بووەو رۆژ لە دوای رۆژ پڕ مەترسیی و

ترسناکتریش دەبێت، ئەی بۆچیی پێمان ناخۆش بێت خەڵکێکی تر، بێ داواو بێ پاداشت و بێ منەت، ئەوە بکات. ئەو کارە بۆ ئێمە مانای دورخستنەوەی هەڕەشەو مەترسیی گەورەترە لەسەرمان، مانای وایە لەو بەڵایە پارێزراو دەبین.

لەوەشدا خەوی بونە ئیمپراتۆر لای سەددام حسەین لە چاڵ دەنرێت، چونکە ئەو خەوە بۆ بوونە خاوەنی چەکی ئەتۆم، کە لە پێناویدا ئەم کورەیە بەدەستی روسەکان دانراوە، لەسەر ئەم پرۆژانە بیناکراوە..

**کێشەی نامۆ:**

سەیریش ئەوەیە ئەم روداوە کێشەیەکی بێ ماناو نامۆی لەناو ئێمەدا خوڵقاند.. یەکێك لە برادەرەکان هات و گوتی:

< یەك دوو برادەر وایان لاباشە بروسکە بکەین بۆ دەربڕینی ناڕەزایی خۆمان لە بۆردومانی کورە ئەتۆمییەکە.

> کەمال هات و گوتی سەیری ئەم ناخێرانە کە توشی چییمان دەکەن! وا دیارە توشی کێشەیەکمان دەکەن.

> گوتم پەلە مەکەو چارێکی دەکەین.

دوو سێیەك لەو برادەرانە هاتن و باسەکەیان کردەوە. پێم گوتن:

> باشە ئێمە: یەکەم: بەناوی چییەوە ئەم بروسکەیە بکەین؟. دووەم: ئێمە لە خۆمانەوە ئەم کێشەیە بۆچی بۆخۆمان دروست بکەین، بەتایبەتیی ئەوان داوای شتی وایان لە ئێمە نەکردوە.. سێیەم: شتێکی خراپە کە ئێمە ئەو دەستپێشخەرییە بکەین، چونکە دەبێتە سەر دەرهێنانی گومان لێمان و تێکدانی بیری بەردانمان. زیاتر لەوانە زەحمەتە ئەوان بروسکەی زیندانیان بڵاوبکەنەوە. بۆیە ئەگەر ئەوانیش داوامان لێبکەن دەبێت ئێمە خۆمانی لێ لابدەین و بڵێین بۆخۆتان خراپە ناوی ئێمەی ونبوو لەکەس و کارو لەشارەکەمان لەپڕ لە کارێکی وادا بکەوێتە سەر لاپەڕەی رۆژنامەکان. جگە لەوانە، ئیمزای ئێمە لەو زیندانەدا، لە ململانێیەکی وا گەورەدا چیی رۆڵێك دەبینێت!

ئەی ئەم نامۆ بە توخمی مرۆڤانە، ئەو هەمو کارەسات و کوشت و بڕەی نەتەوەکەمان دەکەن و ئەوەش زیاتر لە حەوت مانگ و دوو هەفتەیە ئێمە بە دەستیانەوە گیرۆدەین.. ئێستا بێین و بەخواستی خۆمان بروسکەیان بۆ بکەین.. کورە خوای دەکرد دەهاتن هەرچی چەك و جبەخانەو هەموو ئەو ئامرازو کەل و پەلانەی یارمەتیدەری مانەوەی رژێمی بەغدان بە بەعس و غەیرە بەعسەوە.. دەیانتوانەوە.. ئەی کە ئێمە زەلیلی چەکی کلاسیکیی دەستی رژێم بین و نەتوانین خۆمانی لێ بپارێزین، ئەی بۆچیی پێمان ناخۆش بێت کە خەڵکی تر چەکە نوێ و

کۆمـەڵکوژەکانیان لـەناو ببات و ئێمـەی لێ بپارێزێت. ئـەوە بـۆ کـورد خـەڵاتێکی یەزدانییەو دەبێت سوپاس و شوکرانە بکەین.

لە راستیشدا ئەگەر ئەم دۆزەخەو ئەم کۆمەڵە کۆتو زنجیرە سیاسییە کە بە خوتو خۆڕایی بیرو ئارەزوو خواستی ئێمەی پێ بەستراونەتەوە، نەبونایە، وا دەبوو بیر لە ناردنی بروسکەی پیرۆزبایی بۆ ئەنجامدەری کارەکە لێ بدرایە نەك بە پێچەوانەوە، دەی لێرەشەوە با بروسکەی گیانییو ویژدانیی بنێرین بـۆ لای جێبەجێکـەر، نـەك پێچەوانەکەی کە داگیرکەرو چەوسێنەری ئێمەیە.

ئەو دیاردە، لەڕوو، زۆر دژبەیەك و زۆر نامۆ بەگیانی ئیسلامەتییو برایەتییـە، لەسەرچاوەیەکەوە هەڵقوڵاوە کە پێوەندی بە ناوەرۆکیی بنەچەی پەیوەندییەکان و ئاوەژوکردنیانەوە هەیە.

خاڵی ناکۆکیی و یەکانگیر، دژو ناحەز بەرامبەر ئەگەری خوڵقاندنی پێچەوانە، لـەناو ئـەو موعادەلەیـەی میللـەتانی ناوچەکـە دەیهێننـە ئـاراوە، پێچەوانـەی ئـەو هەڵوێست و بۆچونانـەن کە تا ئێستا کورد مامەڵـەی کردوون یان لـە ترسـاندا یـان بەزۆری هێز یان بەهۆی ئەو لێکدانەوە هەڵانەوە کراون.

تا ئێستا کورد وەك نەتەوە، کە مێژوو زمان و کولتورو داب و نەریت و خواستی تایبـەتیی خۆمان هەیە، لەلایـەن "میللـەتانی بـراوە" نـەك هـەروەك بـرای بچوکیـش قوبوڵ نـەکراوە، بگرە بـەزۆری هێز لـەناو دەبرێ، دەنگی داواکانیـان خەفە دەکـرێ. بەبرای بچکۆلەو بەشی بچکۆلـەو مافی کەمتریش قبوڵ نـەکراوین، بەنامۆو میوان و نەوەی جنۆکەو میللەتی مەجوس و تورکی شاخاوی دەماندەنە قەڵەم. هـەر بە زۆری زۆردارەکـی ناوی ئیسـرائیلی دووەممان پێوە دەلکێنن، بـێ ئـەوەی هەلومـەرجێکی ئەوە لە ئارادا بێت..

لەبەرامبەر ئەوە، میللەتی جولەکە هیچ دوژمنایەتییـەکی لەگـەڵ کورددا نەبووەو نییە، بگرە گـەلێك خاڵی هاوبەش لـە تـەکتیك و سـتراتیجدا دەمانخەنە یـەك بـەرەوە، رەنگـە تەنها سـتراتیجەکەی ئەمریکا لەگـەڵ ئـەو حاڵـەتی خـاڵی هاوبەشـەدا ناسـازو نەگونجاو بێت!

دەی ئەگـەر دەنگـی جوامێرانـەی عـەرەب بـەرز نەبێتـەوەو نـەڵێت: کـورد بـرای راستەقینەی ئێمەیە، بۆیە هەمو مافێکی سروشتکردی خۆی هەیە، بەجیا بونـەوەو دامـەزراندنی دەوڵـەتیی نەتـەوەیی خۆشـییەوە، ئیـتر بۆچیـی بەدەسـتی خۆمـان ناکۆکییو ئـاڵۆزییو ناحـەز، لەبـەر خـاتری ئـەوان کـە نـە پێـی دەزانـن و نـەبیر لـە سوپاس کردنێکی ئاساییش دەکەنەوە، بۆ خۆمان دروست بکەین.

خۆزگە ئەو کرداری خواییە، دوا فڕۆکەو تانك و زرێپۆش و راکێت و تۆپ و رەشاش و تفەنگ و مین و گوللەی ئەو عیراقە ناڕەسەنەی دەشکاندو لەهەمو جۆرە هەڕەشەیەکی ئەو رژێمە بەدفەسالو نەفرەت لێکراوە سەرفراز دەکراین..

ئەو کێشەی بروسکەیەو چارەکردنی بەشێوەیەك لە مەترسیی دورمانبخاتەوە، لای من هەستییار بوو، چونکە دوای ئەوەی نەقیب خەڵەف ئەو نەهێنییەی دەرخست کە دووسێ کەسمان قسەیان کردووە لەبەرخاتری ئێمە وازیان لێهێناون و نەیانداون بەدادگا، ئەوەی بەبیرمدا هێنابو کە هەروەك چۆن لە سەرەتای گرتنەکەماندا مەزەنەی ئەوەمان دەکرد کە دوور نییە یەکێکی خۆیان خستبێتە تەکمان، بۆ ئەمەش هەردوور نییە کە ئەوە کرابێتە هۆیەکی گرنگ و ئاسایی بۆ نەبزگرتنی ئەوانەی ئامادەن یان نەرمن بۆ هاوکاریکردن لەگەڵیاندا، یان ئەمە هەر کارێکی خۆیان بێت بۆ زانینی رادەو ئاستی رەقیی لە هەڵوێست و بیرکردنەوەماندا دوای ئەو تاقیکردنەوانەی ئەو هەشت مانگە. ئیتر لەم جۆرە ژیانەی ناو ئەم زیندانەی ئەم رژێمە، پیاو دەبێت سەر حسابی هەموو جۆرە دیاردەیەکی دژوار بکات. مەحمود قەراخیو حەمە سەعیدی حاجی فەقێو کەمال و شێخ عەول و بەندە لەسەر ئەو جۆرە باس و خواسانە یەکبیرو رأو هەڵوێست بوین و دەمانتوانیی ئەو جۆرە دیاردانە لابەلا بکەین. حسەین رەزاش بەهەمان شێوە بەڵام بە توندڕەوییەوە.

هەرچیی چۆنێك بو بیری بروسکە نەهێلراوو لەو باسە رزگارمان بوو.

ئەمڕۆ ٨ حوزەیرانە، بۆ من یەکێکە لە رۆژە گرنگەکانی ژیانی خێزانیم، ئەگەر لەناو ماڵو منداڵی خۆمدا بومایە وا دەبو یادی چواردەیەمین ساڵرۆژی لە دایکبوونی یەکەم منداڵم (ڤیان) بکەینەوە. هەروەك هەمو ساڵێك لەو بۆنەیەی هەریەکە لە جگەرگۆشەکانم ژیلوان (٢٠- ٨- ١٩٦٨) ئاریان (٥- ٨- ١٩٧٢)، مەریوان (١٣- ٨- ١٩٧٤) ژوان (٩- ٧- ١٩٧٦) ئەوەمان کردبو بە نەریت.

لای من خودی وشەکە (ڤیان) تەمەنی بیست ساڵ زیاترە. چونکە ئەودەمەی کە لە زانکۆی بەغدا بوم، بەهۆی برادەرانی ناوچەی بادینانەوە بەو ناوە ئاشنا بوم. ئیتر لەو کاتەوە بڕیارم دا کە یەکەم کچم بەو ناوەوە دەبێت.

ئەم یادە شادەماری سۆزی باوکێتیی هەژان، جڵەوی خۆشەویستەییە ماتدراوەکانی لەدەست خۆمدا نەهێشت و وا جارێکی تر لەم ماوانەی گرتنەکەمدا، ئەو سۆزو بەزەییو خۆشەویستیانە بەسەر لۆجیکی بونەکەم و ئەقڵی ریالانەدا زاڵ دەبێ، هەست و هۆش دەهەژێنێ، هەروەك بویسترێ وەك لافاو ئەو تواناو سۆزە ماتدراوو قەتیس و خنکێنراوانە،، هەمو رامالێت و تام و چێژی هەریەکەیان لە سینەو دڵو دەروندا رەنگ پێبدەنەوە..

ئەوەتەی لە ئەشکەنجەو هەڕەشەکانی هەیئە دورکەوتومەتەوەو ئازاد بوون بۆتە وێردی سەرزمانی هەمووەمان، ئەو دیاردەیە زاڵە.. منیش ئاسان خۆم داوەتە دەست

ئەو قەدەرەو هەروەك نەمامی بەردەم شەماڵی هاوین، تا لەناو مێرگ و مێرغوزارەوە، بۆن و بەرامەی دنیای پارچەکانی دڵم بە روخسارمدا بپرژێنن.

ئەم خەیاڵو بیرەوەرییەی (ڤیان) و ئەو سۆزە بێگەردەی باوکێتیی رایکێشام بۆ یادی (ئاڤان) دووەم کچ و سێیەم منداڵی ژیانی خێزانیم کە لە ئاوارەییم لە بەغدا لە ٢٠ جەنیوەریی ١٩٧١دا لە دایك بوو، زۆری نەبرد توشی نەخۆشیی ریخۆڵە بو، لاوازی کرد تا ئەو ئاستەی کە دوای نزیکەی هەشت مانگ لە سلێمانیی خوالێمانی وەرگرتەوەو بە سەیوان سپێردرا.

لەم ماوەیەدا دوو جار براین بۆ سینەما، دیسان فیلمەکان میسری بوون.

ئەمرۆ چواردەی مانگە، سەرلەبەیانیی میوانێك خۆی کرد بەماڵدا، تا نەهاتە ژورەکەوە، پێمان نەزانیی، بە روخسارێکی پڕ لە زەردەخەنەی پێچراوە بەرووە شەرمناوییە ئاساییەکەی خۆیەوە، کە جۆرێك لە تەریقیو شەرمەزاریشی پێوە دیار بوو. دوای سەلام کردن کەمال پشدەری لەسەر کورسییەك دانیشت. دوای هەواڵ پرسین، بەجۆرێك لە تەتەڵەکردنی زمان، کەوتە باسکردنی ناهەقیکردن لێمان بەو گرتن و هێشتنەوەو ئەزییەتانەی لەو ماوانەدا بینیومانە. کۆتایی دڵدانەوەکانی بەوەهێنایەوە کە گرنگ ئەوەیە رۆژانی ئازادکردنمان نزیکە. لەکاتی قسەکردنەکانیدا، چاوم بڕیبوە ناو چاوەکانیی تا شتێکی لێ حاڵیی ببم. ئاخر ئەم سەردانەو ئەم قسانە بۆچیی؟ دەبێت لە ئەمنی سلێمانییەوە ناردبێتیان؟ باشە بۆچیی و لەبەر چیی و ئەوە چیی رۆڵێك دەبینێت؟ لە راستیدا من بۆ خۆم لەهیچ شتێك لەوانە حاڵیی نەدەبووم.

رەنگە بە ئیشو کاری ئەمنی سلێمانیهاتبێت و پێشیان گوتبێت دەتوانیت سەرێکیی زیندانییەکانی شارەکەی خۆشت بدەیت، دەبێ ئەم سەردانە سەمەرەیە شتێك، باسێك، یا کێشەیەکی لێ نەبێتەوە؟ ئەگینا ئەم سەردانە بێمانایە ئەگەر بۆ دڵدانەوە نەبێت، وا هەر دەبێت بیر لە گومانێکی لەو بابەتانە بکرێتەوە. خۆ دووریش نییە جۆرێك لە رەفتاری پاکانەکردنی بێئاگایی بێت لە پرۆسەکە!

یەکێك لەو زیندانییانەی شوێنەواری ئەشکەنجەی پێوە دیار بو، مەحمود قەراخی بو. ئەم ئەشکە نجەیەکی زۆرو سەختییان دابو. هەندێ جار رەئیسی هەیئە ئەوەی لای من دەدرکاند و ئەیگوت، مەحمود قەراخیش لەگەڵ تۆدا بەرنابێت تا دڵمان پاك نەکەنەوە، ئێمە لەوە دڵنیاین کە ئەو پەیوەندیی هەیەو کار بۆ تێکدەران دەکات، دەیگوت: ئەم هەر لەکۆنەوە تێکدەرێکی خەتەرەو ئەم جارە لە دەستمان قوتاری نابێت..

ئەم دەستێکی هەڵبەسترا بوو چونکە لەژێر زەبری هەڵواسیندا لە ئیش کەوتبو، دیسان لە ئەمنی عاممەش هەر بەو جۆرە مابووەوە، بۆیە جێگەی سەرنجی عەقید تاریق بو، زۆر جار هەواڵی دەستی دەپرسی، و بە روخسارێکی پڕ لە گیانی

بەزەییەوە سەیری دەکردو نوقورچی لێدەگرت تا بزانێت هەستی تێهاتۆتەوە یاننە. ئەویش هیچ خۆی بۆ نەدەبزواندو هەمیشە نکولیی لەوە دەکرد کە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا هاتبێت و هیچ جۆرە هەستێکی تێدا پەیدا بوبێتەوە.

ئەم لە بەرگەگرتن و ئەشکەنجەی جارێکی تری گرتنی، شارەزاییەکی باشی لە شێوەی لێکۆڵینەوەو مامەڵەی لێکۆڵەران هەبوو.. ئەو سەرنج چڕکردنەی عەقید بۆ دەستی مەحمود قەراخیی، بوبووە جێگەی بیرکردنەوە. پێش ئاهەنگی ئازادیی‌و ئاوابوونی عەقید رۆژێك وەك زۆر جاری تر، کە دوو بەدوو بە پیاسەی سەرچیمەنەکە قسەمان لەسەر زۆر باس و هۆی ئەم هێشتنەوەیە دەکرد. روی باسەکەم گۆڕی‌و گوتم:

< ئەرێ ئەوە بەراستیتە باڵێکت وا لە ئیش کەوتووەو چاکیش نابێتەوە..؟

> سەیرێکی کردم بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

> بۆچی؟

< حەز دەکەم بزانم.

> بەڵام با هەر بەینی خۆمان بێ‌ت و با کەسی تر نەزانێت، نا لە راستیدا ئێستاکە باش بۆتەوەو هیچی نییە. ئەمە یەکێك لەو رێگەو شوێنانە بو کە پەنام بۆ دەبرد تا ئەشکەنجەم لەسەر کەم و سوك بکەنەوە، ئەگەر وام نەکردایە هەر بە راستیی لەکار دەکەوت.

< دەی باشە ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە ئاسایی بکەیتەوەو بیهێنیتە خوارەوە!؟

> بۆچی...؟

< خۆت دەزانیت و تا ئێستا هەر ئەوەش پەی پێ‌دەبرێت کە هێشتنەوەی ئێمە لێرە بۆ چەند مەبەستێکە، ئەوەی بۆ ئێمە روناکییەکی لەسەرە، ساڕێژ بونەوەی شوێنەواری ئەشکەنجەی هەیئەیەو ئاسایی بونەوەی لایەنی سایکۆلۆجییە. لام وایە تا شوێنەواری ئەشکەنجە بە رەفتارو لەشمانەوە دیاربێت، تا بزانن ئێمە لە ناو بیرکردنەوە لەترس و لەرزی بازنەی ئەشکەنجەکانی هەیئەدا دەژین، بەرمان نادەن. جا لە شوێنەواری بینراوی لەشدا ئەو دیاردەیە هەر لەتۆدا ماوەو دەبینرێت! بۆیە باش وایە وردە وردە دەستت بجوڵێنێت تا لە چەند رۆژێکدا ئاسایی بکەیتەوە..

ئیتر لەماوەی دوو سێ رۆژدا بەرە بەرە دەستی شۆڕکردەوەو ئاسایی کردەوەو دڵی عەقیدیشی پێ خۆش کرد..

**شوێنەواری گوشاری سایکۆلۆجیی**

رۆژانی تر بەسەر ئەنجامدانی ئەوەی کە ناویان لێنابو بەرنامە، تێپەڕ دەبوو.. ناوبەناو بردنمان بۆ سینەما هەر بەردەوام بو.. خواردن و جگەرە هێنان و مامەڵەمان وەك جاران گۆڕانی تێدا نەبو.. بەڵام ونبونی عەقید وەك دیاردەیەکی ناو ئەو بیرو

هەڵسەنگاندنانەمان، هەر شوێنی بیرکردنەوەو لێکدانەوەمان بو، بەتایبەتیی کەسی تر لە قسەکردن و دڵدانەوەدا جێگەی ئەوی نەگرتەوە، نەقیب خەڵەفیش وەك کەرەکتارو رەوشتی پۆلیسانەی خۆی، لەهاتن و قسەو روخسارو هەڵوێستیدا لە گومان زیاتر هیچی تری لێ مەزەنە نەدەکرا، هیچ ئومێدێکی لێوە بەدی نەدەکرا.

من ئەوەم بەدوور نەدەزانی کە ئەوان حسابیان واکردبێت کە ئەو ماوەیەی ماوینەتەوە کەم بێت بۆ هاتنەوە سەرخۆمان و کەمکردنەوەی شوێنەواری هەیئەو شۆردنەوەی دەماخ. چونکە هی وامان تێدا بو کە تەواو لاوازو وشکەوە بو ببو. زوربەی هەرە زۆرمان لەناو کێشەی سایکۆلۆجی و ئاڵۆزیدا تەنانەت لە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتریشدا نائاسایی‌و سەرنج راکێشەر بو..

رۆژێك حەسەن حسەین بەتورەبونێکی لەسنور بەدەر نائاساییەوە، هەروەك شێت راپەری‌و هەڵمەتی بۆ سەر شوان برد، دوای ئەوەی بەهەموو هێزی خۆی نەعلێکی تێگرت، ئەگەر ئەوانی تر نەکەوتنیاتە بەینییانەوە شەرێکی خراپ دەقەوماو خراپ لە یەکیان دەدا.. یەکێکیان هات و گوتی: فریاکەوە، کە چوم حەسەن وەك ئەسپی بەلەسەبوی لێهاتبو. دانەدەمرکایەوەو بە دوو سێ کەس بۆیان دابین نەدەکرا. پرسیم مەسەلە چییە؟ ئەو خۆی گوتی:

ئەم شوانە ناخێرە لەگەڵ ئەو کۆترە بەسزمانانە خەریکەو چەند جار نەعلیان تێدەگری‌و دەیەوێت بیانکوژێت، ئاخر توخوا چۆن پیاو ئەو کۆترە بەسزمانانە دەکوژێت! دەی تو خوا مامۆستا ناحەقمە ئەگەر لەسەر ئەوە ورگی هەڵبدرم.

هەست و بیرێکی تەواو مرۆڤ پەروەرانەو گیانلەبەر دۆستانەیە، بەلام سەیر ئەوەیە لە حەسەنەوە بێت. چونکە ئەم ئەو شتانەی لاپەشم بو، بۆیە لام سەیر بو ئەو شەرە بۆ ئەو مەبەستە بکات. هەرچەندە حەسەن کورد پەروەرێکی دڵسۆزبو، خۆشەویستیی نەتەوەو نیشتمانەکەی کردبوی بە پێشمەرگەیەکی رێبازی کوردایەتیی. رەنجێکی زۆری دابو. جگە لەم زیندانە لە ١٩٧٢یشدا لە (قەسر النهایە) ترسناکترین زیندانیی بەعس تا ئەو سەردەمە، چەند مانگێك ونکراو ئەشکەنجەیەکی زۆر درا. بەلام بۆ ئەم جۆرە هەست و باڵداپەروەرییە، من گومانم لەوە هەیە. چونکە بۆ خۆی گاڵتەی بەو شتانە و بەزۆر شتی تر دەهات.. رەنگە خۆی لەژیانی ئاساییدا سەدان کۆترو چۆلەکەی بەدارولاستیك کوشتبێت، وەك پێشمەرگەش، لەناو کارو ئەرکی خۆیی‌و فرمانی سەرکردایەتی شۆرشدا، لە عیلمی خۆی و خوادایە چەند گیانلەبەری ئاقڵیشی بێگیان کردبێت.

بۆیە من هۆیەکەییم هەر بۆ ئەو بۆچوونەی سەرەوە گێرایەوە، شوێنەواری نەخۆشیی سایکۆلۆجیی.

هەرچەندە لەوەوبەر تەنها مەرحەباى سەرجادەمان هەبو، بەڵام بەقسەى دەكردم و هـەرچى چۆنێك بـوو حەسـەن- مـان دامركـاندەوە، بـێ ئـەوەى بتوانـين ئاشـتيان بكەينەوە.

ئەو ژيانەى هەيئە، كاريـان كردۆتـە سـەر هـەمو ئۆرگانـەكانى لـەش و يەكەيەكـەى ئـەندامانى جەسـتەمان، لـە هـەموييان ترسـناك و شـارراوەتر، لايـەنى دەرونييـە، كـە نازانين چۆن و كەى‌و لەكوێ، لەسادەترين دژەكـرداردا بـەو جـۆرە دەردەكـەون كـە سەرەنجامى خراپ و هەندێك جار پڕ مەترسييان لێ دەكەوێتەوە.

ئەمڕۆ ١٧ى مانگى حوزەيرانە، رۆژەكە بۆ ئێمە ئاساييە، چونكە وەك رۆژانى تـر، بێ هيچ دەنگ و باسێكى دڵخۆشكەر گوزەر دەكات. ئەمڕۆ هەشت دانـە مـانگى رێكـە ئێمە فڕێنراوو حەپس كراوين، يەك مانگ و يەك هەفتەى خشتە لـەم ئـەمنى عاممەيـە ميوان زيندانيين..

كات رووەو عەسر تێدەپـەڕێت. لـەناكاو عـەقيد تـاريق خـۆى كرد بەخانووەكـەدا. يەك دووانێك هاواريان كرد عەقيد تاريق هات!

زانيمان كە دەبێـت هـەواڵێكى خۆشـى پـێ بێـت. ديـارە بـێ مژدەو بـێ هـەواڵێكى خۆش نەهاتووە!

لە دەورى كۆبوينەوە، هەر هەموو هۆش و گۆشمـان ئاراستەى دەم و چاوى ئەو كرا تا بزانين چيى دەڵێت! يەكەم رستەى:

ئێوە لەئێستاوە ئازادن..

بڕيار درا كە ئێوە ئازاد بكرێن.. ئەگـەر حـەز دەكـەن، دەتوانـن هـەر ئێسـتا بڕۆن.. دەنگى شـادمانيى بـەرز بـووە كـە باشـە هـەر ئێسـتا دەڕۆيـن! هـەموو كەوتينـە نـاو كەشێكى تەواو پڕ لە خۆشى‌و شادييەوە..

لەو ساتانەدا ئەوەم بەبيردا هات كە تازە كاتى سەفەر بۆ سلێمانى نەماوە، رەنگـە بۆ كەركويش هەر زەحمەت بێت. رەنگە ئەو قسەيەى هەر بۆ لابردنـى گومـانى ئێمـەو بـۆ دڵنياييبونمـان بێت لەئازاد كردنەكـەمان، بۆيـە منيـش روم تێكـردو لەسـەر خـۆ گوتم:

< تازە ئێستا درەنگە، باشتر وايە سبەينێ بەيانى زوو سەفەر بكەين.

عەقيد بەگەشاوەييەكى ديارى سەر روخسارييەوە بۆ وەڵامى قسەكەى من گوتى:

- زۆر باشە، وا بكـەن، بەتايبـەتيى ئەمشـەو بەرنامەيەكى تايبـەتيتان بۆ دانـراوە، دواى ئـەوە دوو پـاس بـە شـۆفێرەكانيانەوە لەبـەردەمى خانووەكـەتاندا لـەژێر دەستتاندا دەبێت، خۆتان چيى بەچاك دەزانن وا بكەن. دواى بەرنامەكە چۆنتـان پـێ خۆش بوو وا بكەن. ئينجا ئـەو بەبێ پرسياركردنى ئێمە كەوتـە باسـكردنى هـۆى ونبونەكەى.. كە هەر بەو جۆرە بو كە خەڵەف بۆى باسكردبوين.

ئەمشەو بەرنامەیەکی ترتان بۆ سازدەکەن، ئەوەش دەریخست، کە قسەکەی عەقید لەسەر ڕۆیشتنەوە، هەر بۆ دڵنییاکردن بوو نەك بۆ جێبەجێکردن.

بۆ دووەم جار پاش نیوەڕۆیەکی پڕ لە هیواو لێکدانەوەی سەفەری سبەینێ و چونەوە ناو ماڵو منداڵمان بەسەر دەبرد، ئەمەش هەر بێ کێشە نەبو. چونکە دوای بیستنی هەواڵەکە بەیەك دوو سەعات. لەنێو چەند برادەرێکدا بیری ئەوەیان باس دەکرد کە لە گەڕانەوەماندا پێشەکی سەر لە ئەمنی سلێمانی بدەین و سوپاسیان بکەین لەهەڵوێستیی باشەیان بۆ بەربونمان! چونکە لە قسەکردن لەسەر ئەو رزگاربونەمان نەقیب خەڵەف ئەوەی باسکرد کە بڕیاری بەردانمان زیاتر لە سەر ڕای ئەمنی سلێمانیش بوەو ئەگەر ئەوان رازیی نەبونایە بەرنەدەبوین، ڕەنگە هاتنەکەی کەماڵ پشدەریش بۆ مەبەستێکی لەو بابەتە بووبێت.

ئەوە بوو بە مشت و مڕێکی نائاسایی لەنێوان چەند برادەرێکاو لەدواییشدا ئێمەشی گرتەوە. بەشێکیان دەیانگوت بچین و ئەوانی تر دەیانگوت نەچین، چونکە وایان لێکدەدایەوە کە دوور نییە ئەوە نیمچە ئاراستەکردنێك بێت لە خەڵەفەوە کە سەری ئەمنی سلێمانی بدرێ..

منیش لام وابوو ئەوە شتێکی ئەوتۆ نییە کە خۆمانی پێوە مەشغوڵ بکەین. چونکە چون و نەچونمان هەروەك یەك وایە، تازە هیچ دەورێکی نەماوە لە بەردانماندا. یەکێکیان وتی ئاخر لەوانەیە والێکبدەنەوە کە ئەوە رق و کینەی ئێمە دژ بەوان دەربخات. دوور نییە کەماڵ پشدەری هەر بۆ ئەوە نەهاتبێت. بۆیە ئەگەر ئەو سەردانە نەکەین ئەوە وەك تەحەددایەکیشە. زیاتریش لەو بۆچونەی ئەو برادەرانە، من شکیشم لەوە هەبو کە دوور نییە ئەمەش، ئیتر راستەوخۆ بێت یان ناراستەوخۆ، هەر قسەی خەڵەف نەبێت!

بەهەرحاڵ لەم چەند سەعاتەی ژیانمان لە زیندانەکەی ئەمنی عاممە، پێویست بەوە ناکات کە کێشەی لابەلا بۆ خۆمان بخولقێنین. هەرچی چۆنێك بو ئەو برادەرانەی لەگەڵ چوونەکە بوون، پێمان گوتن کە شتێکی خراپ نییەو بابزانین چۆن دەبێت. ئەگەر بڕیاری چون درا، ئەوەی نەیویست وا ئازادە لە نەهاتن. ئەگەر لە گەڕانەوەشماندا ئەوەمان بۆ نەکرێت وا لەدەرفەتێکی تردا رێکی دەخەین. ئیتر توانیمان برادەرەکانی تر کە دژ بە چوون بون بەوە رازیی بکەین جگە لە حسەین ڕەزا نەبێت ئەم گوتی: نا ناچین و نابێت بیر لەوە بکەینەوەو دەبێت بە ئاشکراش بڵێین کە ناچین! حسەینم هێنایە لاوەو گوتم کاکی خۆم ئێمە لە شانەی حیزبیدا دانەنیشتوین، لەناوچەی رزگارکراودا نین، لە مشت و مڕێکی ئازاد و دیموکراسییانەدا نیین! لە بەندیخانەی بەعسداین. یەکەم. دووەم ئەم قسانە هەر بۆ ئەوەیە ئەم بەڵای قسەکردن و ئەم جۆرە بیرە بەم جۆرە هەڵوێستانە لابخرێت، ئەگینا ئێمە کە گەیشتینەوە سلێمانی. هەر کەس سەربەست دەبێت لەهەر شتێك خۆی بە

باشی بزانێ، ئەو بیرەش دەبێتە هەڵم. حسەین تێکۆشەرێکی لەسنور بەدەر دڵسۆزو ئازاو مەبدەئیی‌و کەللە رەقە.

بۆ شەو خۆمان ئامادەی بەرنامەکە کرد. بردیانین بۆ سینەما. فیلمێکی میسرییان پیشاندان، فیلمێك بوو هەمووی بزوێنەری سێکس بوو. کە فیلمەکە تەواو بوو. یەکێکیان گوتی:

لەبەر ئەوەی سبەینێ سەفەر دەکەن و دیارە پارەشتان پێ نییە، بۆیە بڕیار دراوە کە سەرو بڕێك پارە وەربگرن بۆ مەسرەفی رێگاتان.

کە لیستەی دابەشکردنی سەد دینار بۆ هەر یەکێك ئیمزا کرا. ئیتر بەرەو خانوەکە بردیانینەوە..

بۆ دووەم جار لەم ئەمنی عاممەیەدا، شەوێکی مێژویی تر لەژیانی ئەو زیندانەی کەوا دەردەکەوێت دوا شەوەکەی دەبەینە سەر. من جێگەکەی خۆمم لێ راخست و سەرم نایە سەر سەرین.

زۆر لە برادەران لە دنیای خۆیاندا دەژین و نایانەوێت ئەم شەوە خۆشە لەکیس بدەن و بخەون.. گوتیان ئێمە ناخەوین. لەوەوە مشت و مڕ لەسەر کەی بڕۆین و کەی بکەوینە رێ دەستی پێکرد، گەلێکیان دەیانگوت با ئێستا بڕۆین، هەندێکی تر دەیگوت تا سبەینێ بەیانی سەعات شەش. ئیتر بەو جۆرە نەدەگەیشتنە ئەنجام.. دواییتر لەسەر پێشنیارێك پێکهاتن کە سەعات سێ، بکەوینە رێ، کاتیش وا لەنیوە شەو تێپەڕیکرد، منیش بۆکۆتایی هێنان بەم قسانەو سەرخەو شکاندنێك، گوتم:

ئەوکاتە زۆر باشە، دەوری سەعات شەشیش دەگەینە کەرکوك نانی بەیانی لەوێ دەخۆین و ئەوسا رووەو سلێمانیی دەڕۆین..

من دەمویست سەرخەوێك بشکێنم، لەناو خەیاڵی ئەو ئازاد بوونەدا خەوم لێکەوت.

بەڵام ئەوە تەنها سەرخەو بوو، چونکە زۆری نەخایاند کە لەهاتوچۆو دەنگە دەنگ خەبەرم بووەوە.. زوربە خۆیان ئامادەکردووە. ئێمەش کەوتینە نوێن کۆکردنەوەو خۆئامادەکردن بۆ دوا کاروانی ناو ئەم زیندانانە کە، بێ ئەمڕۆ، هەشت دانە مانگی رەبەقی خایاندوە.

لەهەمان ساتی بیرکردنەوەم لەم کاروانی شادییەی کە بە رووالەت کۆتایی بەکاروانە بێ کۆتاییەکان دەهێنێت، خەیاڵ بۆ قۆناغێکی تری کاروانەکان باڵەفڕێ دەکات و بەخۆم دەڵێم:

ئەمەی بە دوا کاروان دەژمێردرێ جارێ نەکەوتۆتە رێ بەرەو کۆتایی، وا بیر لە دانانی پلانی سەرەتای کاروانێکی نوێ دەکەمەوە، کە سەرەنجام تەواوکەری ئەو کاروانانە دەبێت، و دەشبێتە سەرەتایەك بۆ بەردەوامیی کاروانە بێکۆتاییەکان.

# کاروانی بێ کۆتایی و گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## (١٠)

## کاروانی شادیی بەرەو سلێمانیی

کات نزیکەی دووی سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٨- ٦- ١٩٨١

بیست و شەش زیندانیی کەوتنە جموجووڵ و پێخەف کۆکردنەوە، هەر ئەوەندەیە باڵ لە یەکەیەکەمان پەیدا نابێت..

دوو پاس و شۆفێرەکانیان چاوەڕوانی بڕیاری ئێمەن. ئێمەی زیندانیی و یەخسیری هەشت دانە مانگی ڕەبەق لەم زیندانە نەهێنییانەدا، ئێستا وا ئازادین و بڕیاری بەجێهێشتنی ئەم دوا زیندانە کەوتۆتە دەست خۆمان.

بەسەر هەردوو پاسەکەدا دابەشبووین و کەوتنە ڕێ. بە پێچەوانەی ئەوسەر، دەست و چاو ئازادن، بێ هەڕەشەو گوڕەشەی کوشتنە، دەنگمان ئازادە. لەناو خۆشیی و هەستێکی بێ سنوری پڕ لە گەشەی سەرفرازبوون لە مردنێکی مسۆگەر، بەو سەربەرزیی و دەرون پڕ لە شانازیی بە خۆکردن لە دەربازبون لە چنگی دڕندانەترین ڕژێمی سەر ئەم زەمینە بەو جۆرەو لەناو ئەو مەینەتییانەدا، کە هەریەکە خۆی بە سەرکەوتو دەزانێ. لەناو ئەم کاروانی شادییەدا کەتەواو پێچەوانەی کاروانەکەی ڕۆژی هەژدەی هەشت دانە مانگ لەمەوبەرە، دەستمان کرد بەگۆرانیی و چەپڵە لێدان.. بەجۆرێك هەروەك زیندانیی و ئەشکەنجەو ئەو مەینەتییانە بەسەر ئێمەدا نەهاتبێت، هەروەك ڕێبواری ئەو کاروانە سەختانە نەبووبین.

سروشتی کوردی دڵساف و پاکی ئەو مەڵبەندە، خەم ڕەوێنە، لە بچوکترین دەرفەتدا پاڵ بە ناخۆشییەکانی دوا کارەساتەوە دەنێت و دەکەوێتەوە ناو ژیانی ئاسایی و شادیی..

بەتایبەتیی خەڵکی ئەو شارە کە هەر لە دروستکردنییەوە تا ئێستا، لەو تەمەنە کورتەیدا کەوا خۆی لەدوو سەد ساڵ نزیك دەکاتەوە (١٧٨٤) بە مرۆڤ و

زیندەوەری ترو سروشت و دارستان و شارو ڕێگەو بانەوە، توشی چەندین فەلاکەتی کارەساتی دەستی داگیرکەرو سروشتیش بووە. لەبەسەرچوونی هەریەکەشیاندا ئەوە بیرو کردارو ڕەفتارو نەریتی بووە.

ئەم خەسڵەتە باش و پڕ لە هیوای ژیانە، یەك دیاردەی زۆر خراپیشی لەگەڵدا خوڵقاوە.. ئەوەش لەبیرکردنی دوژمن و کارەساتەکانە.. ئەم دڵسافیو سادەییە وای لێکردووە کە دەیان نەهامەتیی بەسەریدا نوێ ببێتەوە، هەروەك لای کوردو بۆ کورد مێژووی خۆی دووبارە بکاتەوە!

تا هیلاك بوین و لەناو بەغدا دەرچوین ئەوە بەزممان بو. دوای ئەوەش هەردوان و سیانی تەنیشت و نزیك بە یەك کەوتنە قسەوباس گێڕانەوەی رازو نیاز. ماشینەکانیش لەناو دەنگ و ناڵەی مۆتۆرەکانیاندا جادەی قیرتاوو بیابانەکە تەی دەکەن..

لە پێشەوەی یەکەم پاس کەمال- م لە تەنیشتەوەیە، جارجار رابوردووە تاڵەکە بەسەر دەکەینەوە، لەپڕیش هەریەکەمان دەکەوینە ناو تاووتوێکردنی ئاییندەی نزیکەوە.

بیرە ئاڵۆزو هەندێك جار لەرزۆکەکانی منیش، لەناو رابوردی مەرگ چن و کاروانی ئاییندەیەکی نادیارو تەماویی ناو لێکدانەوەی ڕێگەو جۆری خۆ سەرفرازکردنیش لە زیندانە گەورەکە، بەگەلاوێژو پێنج منداڵی وردەوە.. ئەم ساتە پڕ لە خۆشییو کامەرانییەی رزگار بونەکەم جارێك بەولاو جارێك بەملادا رادەکێشێ.

ئەوەی بۆ من زۆر زەحمەت و قورس بو. منداڵەکانم بون، بەتایبەتیی بڕیاری نەگۆڕی خۆمم دابو کە ئەم ئاوارەییەم بێ ئەوان نابێت. دەشمزانی لە تەمەنێکی ناسکدان.

بەڵام چارم ناچارەو لەبەردەم گرتنیان و نەفیکردنیان بۆ زیندانەکانی بیابان، ئەو ئەلتەرنەتیڤە، هەڵبژاردەیەکی دروستەو ناکرێت ئەم ساوایانە لەبەردەم گورگە هاری بەعسیدا بەجێ بهێڵرێن..

دەوروبەری سەعات حەوت بو گەییشتینە کەرکوك. دابەزیین و کەوتینە تاووتوێ کردنی هەڵبژاردنی ئەو کەبابخانەیەی نانی لێبخۆین. ناسیاوێکی سلێمانی (تەها) لەسەر شەقامە سەرەکییەکە بو، هەرکە ئێمەی بینیی هات بەپیرمانەوەو خۆشحاڵیی خۆی دەربڕیو یەکسەر هەواڵی کوشتنی (قالەی حەمەی مەلا نادر)ی داینێ.. هەروەك بزانێت چی دەورێکی لە دڵمان بینیوە. ئەوسا من و کەمال و شێخ عەبدول و حەسەن و دوو سێ برادەری تری بۆ کەبابخانەیەك برد، سوێندی خوارد کە

میوانـی ئـەوین.. تـێرو پـڕ جگـەرو دڵ و گـون و گورچیلـەو گۆشـتمان بـە سـەوزەو تەماتـەو ماسـتاوی کوڵکنـەوە خـوارد. دوای چـا خواردنـەوەو سوپاسـی تـەهاو خواحافیزیی، هاتینەوە سەر شەقامەکە تا سواری پاسەکان ببینەوە.

لەو کاتەدا عومەر عەزیز بەرەو پاسەکە دەڕۆیشت، هاوارم لێکرد: لە ١٨- ١٠- ی ساڵی پاردا تەواو هەشت مانگ پێش ئێستا تۆ بۆنان کڕین هاتیتە دەرەوەو گیرایت. منداڵـەکانت تـا ئێسـتا چاوەڕوانی تـۆن، دەی ئێسـتا بچـۆ نانەکـەیان بـۆ بکـڕەو بیبەرەوەو بە منداڵەکانت بڵێ:

نانەواخانەکە زۆر قـەرەباڵغ بـوو، بۆیـە وا درەنـگ سـەرەم بەرکـەوت و ئێسـتا وا نانەکەم بۆ هێناونەتەوە، فەرمون بیخۆن!

یەکەیەکە سواری ماشێن بوینـەوە. ماشینـەکان رووەو سلێمانی کەوتنـەوە سـەر جادەی قیرتـاو تـەیکردن. هـەر لـە کـەرکوك دەرچوین دیمـەنی عەشایەری چـەکداری عەرەب و بڵاوبونەوەیان بەو ناوەدا سەرو دڵی هەمووماني گرت..

ئەم نەخشەی داگیرکردنە بە گۆڕینی باری دیموگرافیی کوردستان بە زۆری هێز، بەشێکە لەنەخشـەی جەهەننـەمیی ئەم رژێمە بۆ هەڵتـەکاندنی قـەوارەی نەتـەوەیی کورد کە بەناوچە پڕ لە کێڵگەو بیرە گرنگەکانی نەوتی کوردسـتان لـە کـەرکوك و خانەقین دەستی پێکراوە.

دوای هەرەسیش بەرفراونتر لەسەر ئەو نەخشەیە لە ناوچە ستراتیجیەکانی سـەر سنوریش بەردەوامە، پرۆسەی راگواسـتن و تـەبعیس و تـەعریب، بێ پشـودان شـەوو رۆژ کاریان لەسەر دەکرێت. ئەوەش سەرچاوەی ئەو ململانێ سەختە بێ کۆتاییەیە کە روبەڕوی کورد بووەو ناچاری دەکات کە لـە خـەباتێکی سـەختی چەکدارانـەی نابەرابەرو بەردەوامدا بێت دژ بەو نەخشەو سیاسەتەو بۆ پاراستنی خۆی.

### یادی نەمر و پەیکەری هەمیشە زیندوو

لـەناو شـۆڕبوونەوە بـۆ قوڵایـی ئـەنجامـەکانی ئـەم سیاسـەتەو زامـی پـڕ لـە ئـازاری جەستەی مرۆڤی ئەو مەڵبـەندە.. بەتاسـەو پەژارەیـەکی زۆری ئـەو لێکدانەوانـەوە کە سەرم هەڵبڕیی وا لە دەربەندە دێرینەکەی بازییان، یەکەم دەروازەی شاری سلێمانی و یەکەم قەڵای دێرین و پڕ لـە یادگـاری مێژویـی بەرگریکردن لـەو مەڵبـەندە، خۆمـان دەبینینەوە، لە تێپەڕبوون پێیدا کەوتمە سەرنجدان لـەلاپێی دەستە راستمان تا بـە بـەردە قارەمـانی سـوربوو بـەخوێنی گەشـی شـێخ مـەحمودی نـەمردا هـەڵبڕوانم و بەنیگای پڕ لە حەسرەتی رۆژانی دێرین زیارەتێکی بکەم..

بەتایبەتیی هەر ئەمڕۆ بۆخۆی رۆژیی بیرەوەریو زیارەتە..

چونکە لەم ڕۆژەی ئەم مانگەی ساڵی ١٩١٩دا بو کە شەڕی دەربەندی بازیان ڕویداو شێخ مەحمود لەپاڵ بەردە قارەماندا بریندارو یەخسیر کرا..

دوایی حوکمی بەمردن درا، ئینجا گۆڕرا بۆ دە ساڵ و بۆ دورگەی هەنداملن لە هندستان دوور خرایەوە.

لەچونە ناو قولایی ئەو سەربەرزییەی سەرکردەکەی کورد، بەخۆم دەگوت:

تۆ بڵێیت ڕۆژێك بێت دەستمان لە نیشتمانی خۆماندا ئازاد بێت و لەپاڵ ئەو بەردە قارەمانەی بو بە سەنگەر بۆ شێخی نەمر، یان دروستتر، لەپاڵ سەنگەری ئەو تاوێرە بەردەی کە شێخی نەمر کردی بەو بەردە قارەمانەی کە پشتاو پشت بەم شانازییەوە باس و زیارەت دەکرێ، پەیکەرێکی برۆنزیی سەربڵندی بۆ بکرێت، کە هاوشانی بەرزترین ترۆپکی دەربەند بێت، تا ببێتە ڕەمزی گەیاندنی پەیامیی هەمیشە زیندوبونی ئەو سەرکردەیەی کە ئاڵای ئازادیی کوردی بە شەکاوەیی بۆ نەوەکانی دوای خۆی بەجێ هێشت.. ئەو ئاڵایەی کە چەند میرێکی بابان و شاعیرە نەمرەکانی سەردەمەکە بەرزیان کردەوە، شێخ یەکەم کەسێك بو کە نەیهێشت بنەوێ‌و گەیاندییە دەست ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی تا لە دەستی نەوە دوای نەوەدا هەمیشە شەکاوە بێت و ببێتە یەکێك لە ئیلهامە بەرزەکانی بەردەوامیی خەبات و خۆشەویستیی نەتەوەو نیشتمان و ئەم دڵەی کوردستان..

ئەم ڕازو نیازە دەروونیە، ئەم زیندانییە ئازادبوانەی گەیاندە سەری لوتکەی تاسڵوجە کە بەسەر سلێمانیدا دەڕوانێت. لێرەشەوە کەوتمە چڕکردنی سەرنجم لە دیمەنەکانی شاری شاران و دڵی کوردایەتی‌و خوێنی گەش و گەرمی بزووتنەوەی نەتەوەیی‌و سەری ڕمی خەباتی نیشتمانیی دژ بە داگیرکردن و چەوساندنەوە، هەروەك چەندین ساڵ بێت لێی بێبەشکرابم و وا ئێستا بەم لەدایك بونە نوێیەوە لەناو چاوەڕوانیی پێشاد بونەوەدا، فرمێسکی شادیی ئەو بینینەوەیە، دڵۆپ دڵۆپ لەناو هەستی ناسکی ناو ناخی دەرون و خۆزگەی دیداری سەرلەنوێی خۆشەویستان و پارچەکانی جگەرەوە هەڵدەقوڵێن، ئەو خۆزگەو هەست و سۆزانە کە زۆر لەمێژە گوشاری ئەنقەست بۆ خۆ دور خستنەوەی هوشیارانە لە سۆزی بیری دوریی‌و پەژارەیی خەمی قوڵی گریمانی نەبینینەوەیان، قەتیسی کردون و مۆڵیان خواردووە، ئێستا کەوا لەو تابلۆیەدا ڕەنگ دەدەنەوەو هەروەك بورکان لە تەقینەوەدان.

ئەوەی لە ناسۆر ناسۆرترە و تەنانەت فرمێسکەکانیشی هەمەڕەنگ کردووە، پەژارەیی ئەو خەمە خنکاوەیە کە هێشتا بەشارەکەم و خۆشەویستان شاد نەبومەتەوە، شیوەنیی ئاوارە بونێکی ترو سەرەتای کاروانێکی نوێ دەکات.

خۆ ئەگەر دوێنێ بەزۆری کۆت و زنجیر دوریان خستبمەوە، وا ئەمڕۆ، لەبەردەم تارمایی هەڕەشەی نوێو ترسناکتردا، دەبێت خۆم بڕیارەکە بدەم، هەر خۆم بڕیارەکەم داوەو دەبێت جێبەجێیی بکەم! پرسیارە زەقەکەی ئێستاش ئەوەیە کە ئایا دەتوانم لە هەڵبژاردنێکی نیمچە ئارەزوومەندانەدا، ئاسان و بەپەلە ئەو بڕیارە سەختە بدەم..؟

ئەی هەر خۆم بەشێکی بەرپرسیاریی گرتنەکەم نەدەگێڕایەوە بۆخۆم! ئەی قابیلە جارێکی تر هەمان هەڵە بکەمەوەو بکەومە بەردەم لەعنەتی پەندەکەی پێشینان و "خواخۆم بگرێت".

ئەم بەستراوەییەی خەڵکی سلێمانی بەشارەکەیانەوە ئەو نهێنییەی ناو دەرونی ئەورەحمان پاشای بابانی هێنایەوە یاد کە کاتێ سوڵتانی عوسمانیی ویستی بیکاتە والی بەغدا. میر ئەو بەفراوەی مەڵبەندەکەی خۆی بەو والێتییە نەگۆڕییەوە.

ئەی نامە شیعرییەکەی نالیی کە لە ئاوارەوە بۆ سالمی دەنێرێو هەواڵی بارودۆخی شارو وڵاتەکەی لێ دەپرسێت تا بزانێت ئایا دەتوانێت پێیان شاد ببێتەوە.. سالم یش بەدەرخستنیی کارەکانی دەستی رەشی تورکانی داگیرکەر نائومێدی دەکات..

هەر ئەم دیاردەیەشە ئەو نەهێنییە دەدرکێنێت کە بۆچی ئەم شارە بۆتە پێشەنگی خەبات و سەر رمی دژ بە دوژمنان. ئەم نەریتەی خەڵکی ئەو سەرزەمینە، ئەو خۆشەویستیو خۆبەستنەوەیەی خەڵکەکە پێوەی، یەکێکە لە هۆیە گرنگەکانی مانەوەی ئەو ناوچەیە بەپاك و پوختی و بە پێشەنگی کوردایەتیی.

ماشین گەییشتە باخی بەختیاری، سەر پردەکەی قلیاسان، دووڕییانی سەرچنار، شەقامی سەربەستیی، ئەمنی سلێمانیی کە هەشت مانگی خشت لەمەوبەرو لەم مێژوەو لەم ساتانەدا لە شوناسنامەمان دەکۆڵرایەوە تا سەرەتای کاروانی بێ کۆتایی بەرەو زیندانەکانی هەیئە لە کەرکوك، دەست پێبکات.

لەپڕ و بێ قسەو بڕیار، لەبەردەمی بیناکەی حەسیب ساڵحدا هەردوو پاسەکە وەستان. یەکە یەکە دابەزین و کەوتینە خواحافیزیی لە یەکترو هەریەکە رووەو ماڵی خۆی.

لەسەر شۆستەی شەقامەکە لەبەردەم ئوتێلەکەی حەسیب ساڵح وەستاوم و کەمال لە تەنیشتمەوەیە، سەرنجی هاتوچۆی سەرشەقامەکەم دەداو چاوەڕوانی تەکسییەکی خاڵی بوم. لەپڕ قەمەرەیەك وەستاو خاوەنەکەی هاتە خوارەوەو بەخێرهاتنەوەیەکی گەرمی لێکردین و گوتی فەرمون بتانگەیەنم. بەسوپاسەوە سەرکەوتین. بەشەقامی مەولەویدا روەو شەقامی گۆران و لەسەرەوەی

سابونكەرانەوە بەرەو شەقامى بابان و بۆ سەركارێز. لە دووڕیانەكەی شەقامى نالى-بابان لەبەردەم ماڵەوەدا وەستا. من بەسوپاسكردنى ئەو برایەو خواحافیزى لێكردنییەوە خەریك بوم. كەمال گەیشتە بەردەرگاو گوتى:

> گەلاوێژ خان وەرە ئەوە كاك مەحمودم بۆ هێنایتەوە. ئەو رستانەی زارى كەمال تەواو نەبوبون كە یەكەم هەنگاوم بۆ ناو ماڵەكە نا. هەروەك لە هەواڵەكە واق ورماو بێت، لە هەڵوێستەیەكى شپرزانەدا دەیڕوانییە بەردەرگاكە تا بزانێت دیدارى ناو ئەم هەواڵە بەچیى دەگات! هەر ئەوەندە چاوى بە من كەوت، بە ڕاكردن و بەدەم گریان و بە قوربانت بم مەحمود گیانەوە سەركەوتە سەر هەیوانەكەو بە هەڵپەی خۆشەویستانەی بینینەوەی هاوسەرەكەی باوەشیى پیاكردم..

ئەو بینینەوەیە بۆ ئەو چاوەڕوان نەكراوو گەورەترین خورپە بوو، چونكە ئەم لەوە بێ ئومێد بوبو كە من بەربدەن. بەتایبەتى دواى بەڵێنى یەكەم جار كە هەندێ برادەریش تەلەفونیان بۆ سلێمانى كردبو كە سبەی دەگەڕێینەوە، ئیتر لەو ڕۆژەدا خەڵكێكى زۆر لەخزم و كەس و كارو دۆست و ناسیاوانى حەپسەكان ملى ڕێگەی كەركوكییان گرتبو بۆ بەپیرەوە هاتنمان.. هەندێكیشیان گەیشتبونە توزخورماتو. ئیتر تا درەنگانێك لەو ڕێگایانەدا چاوەڕوانییان كردبو، بێ ئەنجام و بە نائومێدییەوە دەگەڕێنەوە..

هەر ئەوەش هۆى ئەوە بوو كە لەجارى دووەمدا نەیەڵن تەلەفون بكەین.. چونكە ئەو بەپیرەوە هاتنەی جارى یەكەم بوبو بە شێوە خۆپیشاندانێك. بەڵام ئێمە نەماندەزانیى بۆچى ئەم جارى دووەمە ڕێگەی تەلەفون كردنیان نەدا. وا ئێستا هۆیەكەی دەردەكەوێت..

دواى خواحافیزى لە كەمال، هێندەی نەبرد كە كەس و كار و دۆست و برادەران لەهەموو كوچەیەكى شارەوە گەیشتنە لام..

پێش هەمو كەس هەواڵى دایكمم پرسیى، گوتیان لەو دیوە.. ئەودیو خانووە كۆنەكەمان بو كە پێش گرتنم باوكم تێكى داو خانویەكى نوێى لەسەر دروستكرد، ئەو ڕۆژەی گیرام دەبو باوكم و دایكم لەگەڵ ماڵى ڕەئوفى برامدا بگوێزنەوە ئەوێو خانوەكەی ئێستا بۆ من بمێنێتەوە. لەدەرگاى بەینى هەردوو خانووەكەوە چومە ئەودیو تا بەدیدارى دایكم و باوكم شادببمەوە، چاوم بە دایكم كەوت. نەیتوانى بەرزببێتەوە. دواى ماچ وموچ كردن و هەمان شێوە لەگەڵ باوكم. دایكمم باوەش كردو هێنامە ئەمدیو. بە سانییە چاوى لێنەدەتروكاندم. كە لەهۆى بەرز نەبونەوەییم پرسى، گوتیان شەوێك وەك هەموو شەوانى تر هاتۆتە لاى منداڵەكان و لەهەیوانەكەوە كەوتۆتە خوارەوەو حەوزى شكا. بردبویان بۆ خەستەخانەو

دکتۆرەکان پێیان گوتبو ئێمەش مەحمودین و چیت پێویست بێت بەسەر چاوو لیرەش عەمەلیاتت بۆ دەکەین، بەلام رازی نەبووەو وتبوی عەمەلییات ناکەم تا مەحمود بەرنەبێت. کە منیش بەربوم دوکتۆرەکان وتیان تازە وەختی بەسەرچووەو بەرگەی ئەو عەمەلییاتە ناگرێت.

ئەم رووداوەو ئەو پەککەوتنەی دایکم بووە هۆی ئازارێکی دەرونیی زۆر گەورەو هەردەم ویژدانم بەرپرسیارییەکەی بەرەو روی خۆم دەکردەوە، چونکە ئەو زۆر هۆگری منداڵەکانم بوو. دوای گرتنیشم ئەوەندەی تر چوبونە ناو دڵییەوە. بۆن و بەرامەی منیشی هەر بەوانەوە نابو. حەزی دەکرد هەمیشە چاوی لێیان بێت. هەمیشە بە گەلاوێژی دەگوت: توخوا ئەگەر زوو زوو نەیەیت و بۆ ساتێکیش بێت. با بەژنو باڵات و چاوی منداڵەکان ببینم چونکە بۆن و بەرامەی مەحمودتان پێوەیەو شێوەی ئەوتان تیا دەبینمەوە. دەی توسەری مەحمود، کە ئاوا لەبەردەستم فڕاندیان و نەمزانی بەرەو کوێ لێیان ئاوا کردم، ئەگەر لەخۆتان بێبەشم بکەیت.. بۆیە لەدوای بەربونم رۆژ نەبوو روم تێنەکات و نەڵێت: دە توخوا ئیتر بەسە کورم، دورکەوە لەم بەزم و رەزمەو ئیتر خۆت بۆ منداڵەکانت تەرخان بکە.. تۆ پێم ناڵێیت چیتان لەو هەمو مەینەتی و ئەزییەت و شەرەشەقە دەستکەوتووە، خۆ تۆ هەر بەدەست حوکمەتەوە توشی ئەم مەینەتییانە نەبویت، ئاخر تۆ کەمت کرد بۆ کورد، تۆ مەعاشێکت وەرنەگرت کە لەسەر مەلا مستەفا ئەمری گرتنت دەرکراو وازت لە وەزیفە هێنا، ئەویش چاکەی بەوە دایتەوە کە ساڵێك دوای ئەوە جارێك لە پێنجوێن حەپسی کردیت، دوای ئەوەش لە سلێمانی بەرگوللەیان دایت و هەر خوا نەیکوشتیت هەر لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ ئەودا ئیشت نەدەکرد، دەی ئەوە زەعیمەکەتان بو، ئیتر پێم ناڵێیت تۆ بۆ کێی دەکەیت..؟

منیش هەر بەوە دڵنیام دەکرد کە ئەم رژێمانە واز لە ئێمە ناهێنن، ئیش بکەین و نەیکەین لای ئەوان وەك یەك وایە.

هەر لەسەرەتای زیندانیمەوە.. بگرە لە یەکەم ساتەکانی یەکەم رۆژەوە، هۆی یەکەمی ئەو گرتنەم بۆخۆم و بۆ هەڵەی خۆم دەگێڕایەوە. هەمیشە سەرزەنشتی خۆمم دەکرد کە بۆچی لەبەردەستی بەعسدا مابومەوە.. راستە من باوەڕم بە هەندێ شت نەبو کە جارێکی تر خۆمیان پێوە ببەستمەوە. بەڵام لەنێوان ئەو دوو بیرو هەڵوێستەدا دەیان بڕیارو هەڵوێست و کاری تر هەبو. لەگەڵ ئەوانەشدا، ئەوەی راستیی بێت من بیرم لەژیانی ئاوارەیی‌و پەناهەندەیی نەکردبۆوە، بۆیە هیچم لێنەدەزانیی.

کە لە زیندان سەرفراز بوم، نەوشیروان نامەیەکی بۆ نوسیم، پیرۆزبایی ئازادبونەکەی لێکردبوم و نوسیبوی کەوا دەزانم سەرلەنوێ لەدایك بومەتەوە، دیسان

نوسیبوی کە ئەگەر هەست بە مەترسیی گرتنەوە دەکەم یان حەز بکەم، وا بچمە دەرەوە، ئەگەر هەر بۆ سەردانێکی ئەوروپاو حەسانەوەش بێت، ئەگەر پاسپۆرتیشم نەبێت بۆم تەرتیب دەکەن.. منیش وەڵامەکەم بۆ نوسیبووەوە کە بڕیاری هاتنە دەرەوەم داوە، دوای ئەوەی کاروبارەکانم ڕێك دەخەم.

هەر لەو ماوەیەشدا حەمە چاوشین و عەبە لالەی خوشکەزام لە سویدەوە هەواڵیان بۆ ناردم کە هەم بۆ چارەسەری نەخۆشیی و هەم بۆ ژیانی خێزان سوید گونجاوەو ئەگەر لام باش بێت هەوڵ بدەم خۆم بگەیەنمە ئەوێ.

ئیتر لەو کاتانەوە بیرم لەچونە دەرەوەی وڵات کردەوە. هەرچەندە پێش ئەوە بەدوانزدە سیازدە ساڵێك ئەسعەد خەیلانی کە لە شەست و حەوتەوە گەیشتبووە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرز، خستبومییە سەر کەڵکەڵەی سەفەرکردن بۆ ئەوێ، منیش خۆم زۆرم حەز بە تەواوکردنی خوێندن دەکرد. کە هاتمە سەر بڕیاردان، گەلاوێژ پێیداگرت کە یان دەبێت هەمومان سەفەر بکەین، کە ئەو دەمە ڤیان و ژیلوان- مان هەبوو، یا نابێت بەجیٚیان بهێڵم.. هەرچەند ویستم بەوە قایلی بکەم کە بەگەیشتنی من ئیتر سەفەری ئەوان ئاسان دەبێت، بە پێچەوانەوەی ئێستاوە کە هەم زەحمەتەو هەم پارەیەکی زۆریشی دەوێت.. بەڵام بێسود بو.

بڕیارەکەی خۆشم بۆ دەربازبوون لە ڕژێم و ترسی گرتنەوەم هۆی سەرەکی بو بۆ بەجێهێشتنی سلێمانیو چوونە دەرەوە. بەڵام بیرم لای منداڵەکانم بوو، چونکە نەمدەویست لەوە زیاتر پاشەڕۆژیان بەکاری سیاسیی خۆم و جێگەی خەباتمەوە ببەستمەوەو ئیتر سنورێك بۆ بەقۆچی قوربان کردنیان لە پێناوی خواستی سیاسیی خۆم و ئەو دنیا جەنجاڵەی ژێر سایەی ڕژێمی بەعس دابنێم. هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە من بەرپرسیارم لە هاتنەناو ژیانی سەر ئەم ئەستێرەیە، بەو پێیە لێپرسراوم لە ئاییندەیان، بۆیە دەربازکردن و گەیاندنیان بۆ شوێنێك کە بەشێك لەو مەبەستانەم بهێنێتە دی بو بە ئەرکێکی گرنگی سەرشانم. لەبەر ئەوەی زۆر دەنگ و باسیشم دەربارەی ژیانی پڕ لە کولەمەرگیو ڕوتوڕەجاڵییو مردنی ساواو پیری پەککەوتەی ماڵ و منداڵی گەلێ پێشمەرگەو تێکۆشەرم بیستبوو کە یان زیندانیی کرابون یان بۆ خواروی عێراق دورر خرابونەوە. بۆیە نەمدەویست ماڵ و منداڵ بخەمە ناو ئەزمونێکی واوە. بەتایبەتیی ئەو پرنسیپە لای من سەقامگیر بو کە ئەوەی نەتوانێت خزمەتی ماڵو منداڵی خۆی بکات و لەساتەکانی ئەو جۆرە بڕیارانەدا ئەو جۆرە پێشبینییانە مەزنە نەکات و کاریان لەسەر نەکات، وا مەحاڵە بتوانێت تا سەر خزمەتی خەڵکانێکی تر بکات کە نەدیوو نەناسراو بن.. دیارە ئەم

لێکدانەوەیە بەدەرە لەو حاڵەتانەی کە کوتوپڕ دێنە پێشەوەو هیچ ئیختیارێك لەدەست مرۆڤ خۆیدا نامێنێت ئەوە نەبێت کە بەسەریدا دەسەپێنرێت.

سەردان و بەسەرکردنەوەی دۆست و برادەرو خزم و ناسییاوان لە سنورێکی وا چاوەڕوان نەکراودا بو کە زیاتر دڵسۆزیی‌و خۆشەویستییانم بۆ دەربکەوێت و سەنگی خۆشم لای خۆم زیاتر هەستپێکراو بێت، زۆر لە ئێش و ئازارەکان لە بیر ببەنەوە. بەڵام ئەوەی منی توشی پەژارە کردبو، شێوەی وەڵامدانەوەی پرسیاری میوانەکانم بو. بەتایبەت هەموو ئەوانەی دەهاتن بۆ لام وایان دەزانی‌و لەوە دڵنیا بوون کە هەرچی سەرم دەدات باشن و جێگەی مەترسی نین بۆ قسەی کراوەو پرسیاری هەمە چەشنە، چاوەڕوان بون کە وەڵامەکانی منیش کراوەو بێ پێچ و پەنا بن.. بەڵام ئەو بۆچونە ئاسایی نەبو. من لە چەند لایەکەوە سەرنجیان راکێشابوم بۆ ئاگاداربون و وریایی لەوەڵامدانەوەی پرسیاری میوانەکان.

دووەم رۆژی ئازادبوون ناهیدەی شێخ سەلام هات، دوای دانیشتن و بەخێرهاتنەوەو هەندێك قسەی گشتیی، هەستم کرد قسەی تایبەتیی هەیەو دەیەوێ پێم بڵێت. لە رۆیشتنیدا ئەو دەرفەتە خوڵقاو لەگەڵیدا چومە دەرەوەو گوتی:

ئاگاداری خۆت بە چونکە چاوەدێریت لە سەرەو خەڵك دەنێرن تا بزانن چی دەڵێیت و چۆن قسە دەکەیت..

من لە ساڵی شەست و دووەوە دایکی رۆژم دەناسیی.. سەردەمێك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی پدك بو. هەر ئەم لە وەیشومەکەی نۆی حوزەیرانی شەست و سێدا (عەلی حەمدی) ئەندامی ك.ن. و لێپرسراوی لقی سلێمانیی لەگەڵ خۆیدا بۆ شاخ دەرباز کرد، بەهۆی زەعیم سدیقەوە، بەناوی ئەوەوە کە ئیشکەرێتی‌و لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ دێی دۆڵان. بەردەوام پەیوەندیم لەگەڵیدا دۆستانە بو. زۆر خزمەتی منیشی کردبو. تەنانەت لەساڵی ١٩٦٤دا کە چەکدارەکانی مەلایی بە دەستڕێژەوە دوای من و حەمە چاوشین و ئیسماعیل سەلیم کەوتن. تا بەشەڕە دەمانچە لەم گەڕەکەوە بۆ ئەو گەڕەك لە دەستیان رزگاربوین، من لەماڵی ناهیدە خۆم شاردبۆوە.. دەشمزانی ئەم پەیوەندیی لەگەڵ هەندێ لێپرسراوی حکومەت و باڵی مەلا مستەفادا هەیە.

رۆژێکی مانگی ئۆگەستی شەست و چوار کە من لەماڵیان خۆم شاردبۆوە، گوتی: هەستە بابڕۆین لە ماڵێك دەعوەتی کفتەین، جێب لەبەردەرگا وەستاوەو چاوەڕوانمان دەکات. بە زەردەخەنەیەکەوە گوتم: دایکی رۆژ نایەم و وازم لێ بێنەو بۆ کفتەیەك بە کوشتمان مەدە. بەجەخت و زۆرلێکردنەوە بەرەو جێبەکە بردمی‌و ماشێن کەوتەڕێ. وەختێکم زانی گەییشتینە بەردەرگای ماڵێك کە بە پێشمەرگەی

جامانە سور تەنراوە. هەڵوێستەیەکم کردو ویستم بگەڕێمەوە. بە پێکەنینەوە پەلی گرتم و پێشی خۆی دام و کردمی بەماڵی مەندانەی خوشکیدا.

ئەمیش بۆ من ئاشنای نزیك بوو، چونکە لە شەست و دوو و شەست و سێدا ماڵەکەیان کاری لقی سلێمانیی تێدا دەکرا. دوای ئیمزا نەکردنەکەو فرمانی گرتن دەرچون و خۆشاردنەوەم، لەگەڵ عەلی حەمدیدا لەوێو لەماڵی "عەبدوڵڵا" دەخەوتین، ئەم خۆشاردنەوەو شوێنی کارکردنە و بوونەم لەگەڵ عەلی حەمدیی چیرۆکێکی خۆش و ناخۆش و پڕ لە سەمەرەیان لێ بە ئەنجام هات کە سەرەنجامەکەی بە بەزۆر گواستنەوەم بۆ هەڵەبجە بەکاتیی، کۆتایی هات.

کە خۆمان کرد بەژورێکی ماڵەکەدا، سەیرم کرد عەگید کە لێپرسراوی رێکخستنەکەی مەلا مستەفاو نوێنەریشی بوو لە سلێمانی، دانیشتووەو ژوورەکە جمەی دێت. ئیتر جێگەی مشتومڕ و گەڕانەوە نەما، ناهیدە ڕووی کردە عەگیدو گوتی "ئەوە مەحمودی مەلا عززەتم بۆ هێنان بزانم دەتوانن بیگرن! ئەویش گوتی ئەستەغفیروڵا چۆن لە ئامادەبونی تۆدا دەتوانین شتی وا بکەین". ئیتر مشتومڕی گەرم و کفتەخواردن تێکەڵاو بون.

تەنانەت نوری شاوەیسی مێردیشی بەو جۆرە پەیوەندییە سێ لایەنییەی دایکی رۆژی دەزانیی. بەڵام بۆ راستبێژیی، ئەوەی من بیزانم و ئاگاداری بویم ئەگەر ئەو پەیوەندییانەی بۆ لایەنی باشە بەکار نەهێنایە، وا بۆ لایەنی دژ بە کوردو شۆڕشی بەکار نەدەهێنا. کە لەو ماوانەشدا مەلا مستەفا فرمانی بە چەکداری خۆیدا بۆ کوشتنیو بریندارکرا، نیشانەیەکی پرسیاری سەیری لەسەر دروستکرا!

رۆژی ٢٠ ئازاری ١٩٦٥ نزیك بە دوو هەفتە بوو بە مامۆستا لە سانەوی وەتەن دامەزرابومەوە. دوای نیوەڕۆی ئەو رۆژە لە رێکخستنەوە ئاگادار کرام کە فرمانی گرتنم لە ئەمنی سلێمانییەوە بۆ دەرچووە. بۆیە جلی کوردیم لەبەر کردو لەماڵ دەرچوم. لە بەراوردی ئەو شوێنانەی دەمتوانی بێ ئاگادارکردن بچم ماڵی دایکی رۆژ بوو، ئەوێشم بە گونجاو تر دەزانیی. کە چومە ژورەوەو چاوی بە من کەوت گوتی:

- ها ئەوە چییە دیسان بەرگی غەزەبت لەبەر کردووە!؟

< بەرگی غەزەبییان پێ لەبەر کردومەتەوە!

رێککەوتێکی سەیر بوو کە نوری شاوەیسی مێردی لەوێ بو، دیار بو بەمۆڵەت هاتبۆوە. کە لەوەڵامی پرسیارەکەی، هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە، بەرەو تەلەفونەکە رۆیشت و گوتی:

- راوەستە بۆچی لەخۆتەوە خۆت گورگە دەکەیت، هەر ئێستا لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەمن قسە دەکەم! من سەرم لەوە سوڕماو گوتم:

< دە جارێ بووەستەو بزانم چیی دەڵێیت، ئەوەکا سەرچاوەی هەواڵەکە بزانرێ!

- نا ناخۆم دەزانم چیی دەڵێم! ئەوەم لا بوغرنج بو، چونکە مێردەکەی کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی رێکخستنەکەمانە، بەوە دەزانێت و بەبەرچاویشیەوە ئەوە دەکات، ئیتر من حسابی ئەوەم کرد کە دەبێت بە راسپاردەو نەخشە ئەم پەیوەندییانەی هەبێت. لەگەڵ ژمارەی تەلەفون لێدان و کەمێك چاوەڕوانیی، کەوتە چاك و چۆنیی لەگەڵ زەلامی خواستراو. ئینجا راستەوخۆ چووە ناو باسەکەوە. سەرەنجام دەرکەوت کە هەواڵەکە راستەو پێوەندیی بە نەورۆزەوە هەیە.

ئێمە بۆ ئەو ساڵە هیچ جۆرە چالاکییەکمان بۆ ئەو بۆنەیە بڕیار نەدابو. چونکە بارودۆخەکەی کوردستان بەگشتییو سلێمانی بە تایبەتیی بەرەو کرژییو شەڕکردنەوە دەبرا؛ گرتن و تۆقاندن دەستی پێکردبو. لەو مانگەدا، هێرشی تۆقاندن و خەڵك کوشتن گەرمەی بو، لە چایخانەی حەمە ڕەق لەناو جەرگەی شاردا، لەسەر شەقامی نالیی، لە سەرکارێز و چەندین شوێنی تر بە ناهەق و بێ هیچ هۆیەك، عەسکەرو چەکداری عەشایەری عەرەب کە بۆ ناو شەڕهێنرابوون، دەستڕێژیان لە دەیان سڤیلی رێبوارو دانیشتوانی شارەکە دەکردو لەناو خوێنی خۆیاندا بێ گیان دەکران، سابیر رەسوڵی باوکی گەلاوێژی خێزانم و مستەفای خاڵە کەریم ی خاڵۆزای باوکم دوو قوربانیی ئەو رۆژگارەی ئازاری ئەو ساڵە بون..

دوای تەواوبونی تەلەفۆنەکە، دایکی رۆژ گوتی:

- ئێوە هیچ چالاکییەك بۆ نەورۆز دەکەن؟

< بۆچیی؟

- دەتۆ پێم بڵێ شت دەکرێت؟

< نا هیچی وا ناکرێت..

- دەی راپۆرتت لەسەر دراوە کە چالاکییەکانی نەورۆز تۆ سەرپەرشتیی دەکەیت.. کەواتە گوێی مەدەرێ. خۆ ئەگەر شتیش بکرێت هەر هیچ ناکەن، چونکە تێم گەیاند کە چەند رۆژێکە تۆ دامەزراویتەوەو لە سیاسەت دوور کەوتویتەوەو ئیتر لەکۆڵی ببنەوە.

لەناو میوانەکانمدا کەسانی واش دەنێردران کە لای من شارراوە نەبون، فرسەتی هاتوچۆشیان هەبو بەتایبەتی (م.پ). بێ لەوەش، بڕیارم دابوو کە لەو کاتانەدا، کەمو زۆر باسی وردەکارییەکانی ناو هەیئە نەکەم.. زیاتر باسی ئەمنی عاممە بکەم. ئەوانیش لە بەربونماندا جۆرێ لەو شێوەی قسەکردنانەیان خستبووە بەرچاومان. ئیتر هی وا هەبوو کە لەوەڵامی پرسیارەکەیدا باسی مامەڵەی ئەمنی عاممەم دەکرد.. بە پێکەنینەوە دەیگوت ئەی باسی هەیئەمان بۆ بۆ ناکەیت..؟ منیش ناچار دەبوم

هەر بە کورتیی بڵێم بۆیە باسی هەیئە ناکەم، چونکە لای هەمو کەس ناسراوە، هەموو لایەك شتێکی لە ئەشکەنجەی ناو ئەو زیندانە بیستووەو ئیتر پێویستی بە قسە لەسەر کردن نییە..

بۆ ئەوەی لەسەرخۆ ئیش و کارەکان رێك بخەم دەبو هەندێ هەنگاو بنێم. لەوانە: چارەکردنی کات بەسەرچونی پەساپۆرتەکەم، وەرگرتنی پەساپۆرت بۆ گەلاوێژو منداڵەکان، کرینی بیتاقەی سەفەریان بۆ وڵاتێك تا بتوانرێت پارە بەدۆلار بگۆردرێتەوە، خۆ ئەگەر کرا وا هەر لەوێشەوە سەفەر بکەن. دەشبو، ئەگەر خانووەکەم بۆ نەفرۆشرێ یان نەیدەمەوە بە کرێیەکی وا کە پێشەکیی لێ وەربگرم، پارە قەرز بکەم چونکە دەبو حسابی سەفەرێکی دوورو درێژی هەر حەوت کەسمان بکەم. خۆشم هەرچەند سەد دینارێکی ماوەی بەندکردنەکەم مابو. ئیتر دەبو لەسەرخۆ پارە قەرز بکەم، چونکە روم نەدەهات هەمووی لە باوکم وەربگرم، بەتایبەتی ئەو لە هەموو ژیانمدا گەورەترین یارمەتیدەرم بو، ئەرك و قورسایی زۆری ژیانی خۆم و منداڵەکانم هەر لەسەرەتاوە تاچونە دەرەوەم هەر لەسەر شانی ئەو بوو.. بۆیە دەبو تەلەفزیۆنە رەنگاو رەنگەکەو مەکینەی جل شتن کە تازە کڕرابون بیانفرۆشم.. تەنها وێنەی هەمو خێزانەکەو هی خۆم کە لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە کۆم کردبووەوەو زیاتر لە سێ هەزار دانەیەك دەبوون، و هەندێ نوسین و بەڵگەنامەکان حەشار بدەم.. دەبوو ئەوانە بکەم بێ ئەوەی بییەڵم دایکم هەستی پێبکات. دیسان نەیەڵم لە باوکم و کاکە حەمەم زیاتر لە بنەماڵەکەدا کەسی تر بزانێت، نەوەك هەواڵەکە بچێتە دەرەوە. لەبەر ئەوەش نەدەکرا بیر لە فرۆشتنی هیچ شتێکی تر بکەمەوە، جگە لە خانووەکەم، بڕیارم دابو کە هیچ برادەرێکیشم ئاگادار نەکەم تا لە مەترسیی لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەو گێچەڵ بەدور بن.

بەتایبەتیی بەپێی یاساکانی رژێم هەر کەسێك نهێنی لەم بابەتانە لە دەوڵەت بشارێتەوە وا چەندین ساڵ حوکم دەدرێت ئەگەر نەیکوژن.

رۆژێك مەحمود قەراخیم پێگەییشت دوای هەواڵ پرسین و چاك و چۆنیی. گوتی:

- دنیا چۆن دەبینیت؟ گوتم:

> لەچی روویەکەوە؟

- لەڕوی گوزەرانی خۆمان و ئاییندەو مەترسیی گرتنەوە؟

> تازە زۆر زەحمەتە ئێمەومانان بتوانین ئاسایی بژین و دەبێت چارێکی خۆمان بکەین.

هەر لەو رۆژانەشدا بو کە شێخ عەبدول هەمان پرسیاری لێکردم. ئەم تا ئەو کاتەش نەهاتبۆوە سەرخۆی، تەواو لاواز بوبو، هیچ بەخۆیدا نەهاتبۆوە. من بۆ خۆم

که بەربوم تەنها چل و پێنج کیلۆ بوم. کە لە هەیئەشەوە نێرراین بۆ ئەمنی عاممە بێگومانە کە لەوەش کەمتر بوم، چونکە خواردن و هیوای بەربون و دڵدانەوەمان لەو یەك مانگ و یەك هەفتەیەدا ئاهێکی بەبەردا هێنابومەوە. لەوەڵامی پرسیارەکەی ئەمیشدا گوتم:

< بە نیسبەت خۆمەوە تازە زەحمەتە بتوانم بژیم. چونکە ئەو کابوسەی هەیئەو تارمایی بیرکردنەوە لە گرتنەوەو ئەم دڕندەییەی بەعس، ژیانی تەواو تێکداوە، جگە لەوە نابێت جارێکی تر خۆمان بدەینەوە دەست قەدەری ئەم ڕژێمە بێزراوە. کە کەمال هەمان پرسیاری کرد، ئەویش بڕیاری خۆی دابو، چاوەڕوانی منی نەکرد و خۆی گەیاندە شاخ.

لەناو زیندانەکانی هەیئەدا گەیشتبومە ئەو باوەڕە کە مرۆڤی سیاسیی هوشیار نابێت خەباتی خۆی لەناو بازنەیەکی داخراودا قەتیس بکات. بەتایبەتیی لەململانێییەکی وا سەخت و لەبەردەم دوژمنێکی وادا. هەرچەند هەڵە زەقەکانی ناو سەرکردایەتیی شۆڕش لە زۆر ڕووەوە بێئومێدیان کردبوم. بۆ نمونە پرۆسەی وتووێژی سەرکردایەتی کورد- ڕژێم کە بە بەراوردی دەستکەوتەکان، هەرچەندە زۆر کەم و بە سنورو کاتیش بون، هەمیشە بە زیان بووە.. سەرجەمی گفتوگۆی کورد - ڕژێم بەهەڵەکراون بە زیانیش بۆ کورد خۆی گەڕاونەتەوە. ئەو ڕاستییە سەرجەمی وتووێژەکان دەگرێتەوە، کە بەپێی تەمەنی پانزدە ساڵەی شۆڕش زۆرو بۆرو بەم جۆرە بون:

- گفتوگۆی شۆڕش- ڕژێمی بەعس لە ٨ی شوبات تا ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣

- گفتوگۆی بارزانی- موشیر عەبدولسەلام عارف شوباتی ١٩٦٤ تا بەهاری ١٩٦٥

- گفتوگۆی باڵی مەکتەبی سیاسیی- عارفی دووەم سەرەتای ١٩٦٦ و ئینجا لەگەڵ دەسەڵاتە نوێیەکان و درێژپێدانی تا ئازاری ١٩٧٠

- گفتوگۆی بارزانی- عارفی دووەم و بەیانی حوزەیران ١٩٦٦، درێژەپێدانی ئەو پەیوەندییە بەشێوەو ئاستی جۆراوجۆر تا بەعسییەکان هاتنە سەر حوکم.

- پەیوەندیی و گفتوگۆی هەردو باڵەکە لەگەڵ ڕژێمی بەعس، بۆ بارزانیی تا لەوە بێئومێد بوو کە تاکە سواری مەیدانی ئەو پەیوەندییە نابێت، بۆ باڵەکەی مەکتەبی سیاسیش تا بەیانی ئازار، و ئینجا هەڵوەشانی ڕێکخستنەکە ١٩٦٨- ١٩٧٠.

- گفتوگۆی بارزانی- ڕژێمی بەعس و بەیانی ئازار- ١٩٧٠.

- هەرەسی شۆڕش و تەقەلای مەکتەبی سیاسی پدك بۆ گفتوگۆ، بێ ئەوەی بەعس گوێیان لێ بگرێت و بەسوکایەتیشەوە وەڵامی دایەوە.

- گفتوگۆی بزوتنەوەو ڕژێمی بەعس ١٩٧٨.

ئەگەر هەر سەرپێیش سەرنجێکی ئەو وتووێژانە بدرێت، بەدەستپێکردن و کۆتایی هاتن و سەرەنجامەکانیانەوە وا ئەم کەموکورتیو هەڵە زەقانە دەکەونە پێش چاو:

< شەڕی ناوخۆی کوردو شەڕی براکوژیی، پەنابردنە بەر دوژمن بۆ لابەلاکردنی ناکۆکییەکانی ناوخۆ، ئەوانە ئەنجام و بەرهەمی راستەوخۆی گفتوگۆو بەشێك لە میتودی رژێمەکان بوون بۆ تێکشکانی هێزو توانای پێشمەرگەییو سیاسیی کورد.

< لە زوربەی هەرە زۆریاندا دەستپێکردنی وتووێژ لەدەست رژێمدا بووەو، بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی کات و شوێنی هەڵبژاردووە.

< بۆیە دەست پێشخەریی وتووێژ، دەستپێکردن و تێکدانی، زیاتر لەدەست رژێمدا ماوەتەوە.

< لەروانگەی دووردا هەمیشە کورد لایەنی دۆڕاوو رژێمیش بە پێچەوانەوە بووە.

< بەردەوام زەمان و مەکانی وتووێژ لەو کاتانەدا بووە کە رژێم لەناو گرفتی گەورەو لاوازیدا بوەو بە بەغداوە بەسترابوونەوە.

< سەرکردایەتییەکانی کورد بەبێ نەخشەو پلانێکی لێکۆڵراوە، لە مەبەستەکانی رژێم، ئەگەرو سەرەنجامەکانی گفتوگۆ، لایەنی کەمو زۆر لە وەرگرتن و دان لە وتووێژەکەدا، مەودای کورت یا درێژخایەنیی وتووێژ، لێکدانەوەی شێوەی نوێبونەوەی شەڕو هێرش لەسەر نەکەوتنی گفتوگۆکەو میتودی رژێم لە جەنگەکەدا.. بەبێ ئەوانە خۆی فڕی داوەتە ناو وتووێژەوە.

< حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان، چەندیش لاواز بوبن، هەمیشە سودیان لە ناکۆکییەکانی ناو کورد وەرگرتووە.

< بە پێچەوانەشەوەو کورد نەك هەر سودیشی لە لاوازییو ناکۆکییەکانی ناو میریی وەرنەگرتووە، بەڵکو یارمەتیدەریش بووە کە بەرامبەرەکە سود لە ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان ریزەکانی کورد وەربگرێت.

< نەبونی لێکۆڵینەوەی وردو بابەتییانە لەسەر دوژمن؛ هێزو توانای سەربازیی، تەکنیکی، ستراتیجی سەربازییو میتۆدی شەڕو جۆری گۆڕانەکان لەنوێ بوونەوەی شەڕو دژەکردارەکان.

< یەکێك لەو سودە گرنگانەی رژێم لە وتووێژی وەرگرتووە، هەوڵدانی بووە بۆ کڕینی خەڵکی نەفس نزم و چاندنی بەکرێگیراوەکانی لەناو شۆڕش و رێکخستنەکانیدا..

< لایەنی کەم و زۆر لە داخوازییەکان، کۆنکرێت دانەڕێژرابون و نەکرانە ستراتیج. بۆیە هەمیشە ئەو داواو داخوازییانە، بەپێی خواستی کەس و دوو کەس دەستکاریی کراون و ئاڵوگۆڕیان تێدا کراوە. داشکان و سازشیان لەسەر کراوە.

< لە وتووێژەکاندا کورد بێ ستراتیجی سیاسی و نەتەوەیی بووە.. دروشم و مافە نەتەوەییە سەرەکییەکان نەکراونەتە ستراتیج و لەگەڵیشیدا، داخوازییە پلەییەکان لەناو تەکتیکی گونجاودا کاریان لەسەر نەکراوە..

< هەڵگرتن و فڕێدانی دروشمی گرنگ و ستراتیجیی، بۆ نمونە دروشمی روخاندنی رژێم لەهەموو سەردەمەکاندا لەئارادا بووە، کەچی گفتوگۆی لەگەڵ کراوە. کە ئەوە هەم پێچەوانەی دروشمەکەیەو هەم دژ بە عورفی گفتوگۆو لایەنە ئاسایی‌و سیاسییەکانێتی.

< هیچ کاتێك رژێم و حکومەتە جۆربەجۆرەکان بەرنامەیەکی کۆنکرێتی و رون و ئاشکرایان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کورد نەبوە.

-چونکە بە بیرو بە ئایدیۆلۆجیی، بە بەرنامەو بە نەخشە، بڕوایان بە مافەکان نەبوە، هەمیشە لەناو پیلان و نەخشەی دژ بە کورددا گفتوگۆیان کردوە. بەردەوام کێشەی کوردیان بەکارتی دەستی بێگانە داناوە.

< لەگەڵ ئاڵۆزییە هەمەجۆرو هەمە لایەنەکانی ناوچەکەدا، داگیرکەران توانیویانە سود لە کارتی کوردی وەربگرن، چەند کورد سودی لە ناکۆکییە هەرێمییەکان وەرگرتووە، کە تێکڕا کاتیش بوون، دە هێندەو سەدان قات داگیرکەران سودیان لە بەکارهێنانی کارتی کورد لەدژی نەیارو دوژمنەکانیان وەرگرتووە..

< لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتەکان لایەنی هەرە کەمی داواکانیان بەکورد رەوا نەبینیوە، ئەوەی داویانە لەناو تەکتیکی سیاسییاندا بووە، لەگەڵ نوێبوونەوەی شەڕیشدا زەوتیان کردونەتەوە.

< لەگەڵ ئەو وتوێژە زۆرو زەبەنگەو ئەو هەموو زیانانەیان، تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی وردو بابەتی‌و زانستیانەیان لەسەر نەکراوە. پرنسیپ و پێوانەیەك بۆ ئاستی لێزانین و پێکهاتەی وەفدی گفتوگۆ نەبوە. بیر لە دانانی پسپۆڕ و راوێژکار نەکراوەتەوە. حەزی خۆدەرخستن زاڵتربوە.

< هەروەك چۆن سەرەتای گفتوگۆ بە هەڵەکراوە، دیسان تێکدانەوەکەشی هەر بەو جۆرە بووە، بۆیە هەردوو لای: دەستپێکردن و کۆتایی پێهێنان بەهەڵەو، بە ئەنجامی هەڵەو ئینجا بەزیانی گەورە کۆتاییان هاتووە.

< بەناوی گفتوگۆوە پەنابردنە بەر رژێم بۆ لابەلاکردنی ناکۆکییەکانی ناوخۆ، دیاردەیەکی ترسناکیی لەناو بزوتنەوەی چەکداریدا خوڵقاند، کۆتاییەکەشی هەرەس بووە.

ئەگەر نمونەی ئەوانە لە باشترین سەرەنجامی وتووێژی کورد– رژێم، بە بەیانی ئازاری ١٩٧٠ دەستنیشان بکرێن، کە هەر بەو جۆرەشە، وا جگە لە لایەنە سیاسیی‌و،

یاساییەکەی، کە ددانانانی رژێم بو بەو مافەی کورددا.. وا دوای نوێ بوونەوەی شەڕ نەك هەر تەواوی مافەکان زەوت کرانەوە، بگرە ئەو دام و دەزگایەی ناوی ئۆتۆنۆمی لێنرابوو بە گەورەترین کۆسپ و بەکارترین چەك لەدژی کورد خۆی، خەریکیش بوو بە پیلانی رژێم بارزانی خۆی و چەند کورێکیشی تێدا بچێت.

**هەڕەشەی پێچراوە:**

رۆژانی سەرەتای مانگی ئۆگەستی ساڵەکە، مانگی رەمەزانیش بو.. عەسری رۆژێك حەسەین حسەین هات بۆ لام و گوتی: دوێنێ لە بەغدا هاتمەوە، نەقیب خەڵەفم بینیی، ئەو رایسپاردم تا ئاگادارت بکەم کە دەیەوێت بتانبینێت. (ئەمەش ژمارەی تەلەفونەکەیەتیی).

< باشە چۆن تۆ بینیت؟

- لە بەغدا بەهۆی برادەرێکمەوە ئاگاداری کردم و بینیم.

< نازانیت مەبەستیی لەو چاوپێکەوتنە چییە؟

- هەروا بۆ دیدەنییەکی ئاساییەو هیچی تر.

< بینینی ئاسایی یانی چیی! دەبێت شتێکیان لەژێر سەردا بێت؟

- نا نا هیچ ترسی تیانییە..

< ئەی چیی پێ گوتیت؟

- لە بینینەکەدا هەر هەواڵپرسین بو گوتی حەزیش دەکەم چاوم بە ئوستاز مەحمود بکەوێت.

لەدڵی خۆمدا گوتم ئەم حەزکردنەی ئەو بێ مەلامەت نییە! ئیتر کێچ کەوتە کەوڵم. دەبوو بڕیارێکی بەپەلە بدەم یان رابکەم، هەرچەندە تا ئێستا ئیشە سەرەکییەکانیشم جێبەجێ نەکردووە، بگرە پارەی سەفەریشم نییە یان بچم بۆ بەغداو بیبینم. باشە گونجاوە من خۆم بخەمە ناو داوی تاقیکردنەوەیەکی ئەنجام نادیار تا بزانم مەسەلە چییەو منی بۆچییە!؟

پاش لێکدانەوەیەکی زۆرو تاووتوێکردن، چەند گریمانێکم هات بەبیردا: یان بۆ گرتنە کە ئەمەم بە نزیك نەدەزانیی. هەرچەند بەعس هەندێك جار بۆ ئەو کەسانەی کە گومان و نیشانەی پرسیاری گەورەیان لەسەرە، دوای بەردان دەیانگرنەوە، لەزۆر حاڵەتیشدا نابینرێنەوە. یان بۆ زەهر دەرخواردانە کە ئەمەم زۆر بە دوور نەدەزانیی. یا بۆ باسی وەزیفە یان خەڵاتەکەیە کە لە ئەمنی عاممەدا بۆ بەردانمان باس دەکرا، رەنگە بۆ گواستنەوەی کارەکەشم بێت بەشێوەیەك لەو شێوانەی خۆیان دایدەنێن! تا مەڵبەندەکە وا دەستنیشان بکەن، کە جۆرێك دڵنیایی پەیدا بکەن.

خـۆڵادان لـەدووەم زەحمـەت نـەبو. چونکـە مـانگی رەمـەزان بـو. سـێیەمیش دەتوانرێت خۆی لێلابدرێت، ئەگەر هەر دەرفەتیش نەبو، وا دەتوانم راستەوخۆ دوای گەڕانەوەم بۆ سلێمانی بڕیاری چونە شاخ بدەم، بۆ گواستنەوەش، لابەلاکردنی ئاسانە، چونکە مانەوەکەم کاتییە.

کەوابو تا کارەکانم سازدەکەم ماوەیەکی ترم پێویستەو باش وایە بچم بزانم ئەم بینینە بۆچییە؟ لەگەڵ د. خەسرەویشدا باسەکەم کردبۆوە.

بۆیە هەر ئەو رۆژە بڕیارم دا کە سبەینێ سەفەر بۆ بەغدا بکەم. لەگەڵ حەمە نوری حاجی عەبدوڵڵا، ئەم نیشتمانپەروەرێکی راستگۆو دڵسۆز بو زۆر لەکۆنەوە جگە لە ئەندامەتیی لە رێکخستندا زۆر لە ئێمەوە نزیک بوو، ئاگاداری زۆر شتمان بو، زۆر جار لەگەڵ شازاد، دواییتر لەگەڵ جەمال تایەر، حەمە چاوشین و دوکتۆر خەسرەو خاڵ و عومەر فەتاح لەماوەی جیاجیادا لای ئەم دادەنیشتین، محەللەکەیو کارگەی شەکرەکەی، بارەگایەك بو بۆ ئێمە. لەکاتی بێ پارەییشدا نەك هەر بۆخۆم بەڵکو بۆ برادەرانی تریش بانکێکی بێ رۆتین و بێ قازانج بۆخۆی، و حازر بەدەست بوو بۆ ئێمە. لەگەڵ ئەودا سەفەرەکەمان رێکخست بۆ سبەینێ، بەیانی خۆیو ماشینەکەی هات و کەوتینە رێ.

حەمە نوری لێی پرسیم:

> ناترسیت بگیرێیت؟

< گوتم ترس هەموو کاتێك هەیە بەڵام لەم بانگکردنەدا بەدوری دەزانم، جگە لەوە رێگەی خۆمم داناوە کە چۆن قسە دەکەم و لە دواییدا بۆت دەگێڕمەوە، لای عەسر گەیشتینە بەغداو لە ئوتێلێکی نزیك ساحەی نەسر کە نزیك بە (کۆشکی سپیو ئەمنی عامە)یەو خاوەنەکەی کوردە دابەزین. چونکە لە هاتنیدا بۆ بەغدا حەمە نوری هەر لەم ئوتێلە دادەبەزێ.

دوای حەوانەوەو چا خواردنەوە تەلەفونم بۆ نەقیب خەڵەف کرد دوای چاك و چۆنی گوتم:

< ئەوەبۆ فەحسی گورچیلەکەم و ئەشیعەگرتن هاتوم. حەسەن حسەین ئاگاداری کردم کە ئەگەر رێم کەوتە بەغدا پەیوەندیتان پێوە بکەم، چونکە حەز دەکەن چاوتان بە من بکەوێت. بۆیە حەزم کرد لە هاتنەکەم ئاگادارتان بکەم.

من خۆم بەلای ئەوەدا نەبرد کە هەر بەتایبەتیی بۆ ئەم تەلەفۆن و بینینە هاتووم.. دوای بەخێرهاتن گوتی:

- باشە سبەینێ عەسرەکەی لەوێ دەبیت تا بێم و چاوم پێتان بکەوێت؟

> دەتوانم من خۆم بێم. دیارە ئێوە مەشغوڵن و رەنگە زەحمەت بێت بۆتان، حەزیش دەکەم سەرێکی عەقید تاریقیش بدەم!

- جا تۆ سبەینێ دێیت بۆ ئێرە...!؟ شێوەی پرسیارەکەی سەرسوڕمانێکی سەیری لێ هەڵدەهێنجرا.. جا بۆ وا نەبێت!؟ لای ئەو ئاسایی نەبو کە منی بەندو ئەشکەنجە دراوو پڕوکێنراوی دەستی ئەوان وا ئاسان بەپێی خۆم بچمەوە ناو زیندانەکە.

< بەڵێ، شوێنەکە دەزانم و هاتنەکەی منیش ئاسانە... بەبێ ئەوەی قسەیەکی وا بکەم! کە ئەو سەسوڕمانەی ئەوی تێدا دەربکەوێت.

- دەی زۆر باشە، سبەی سەعات نۆ هەر لەبەر کۆنترۆڵی بەردەرگای سەرەکی بڵێ بۆ لای نەقیب خەڵەف هاتووم. کەواتە سبەینێ سەعات نۆی سەرلەبەیانی لێرە یەکتر دەبینین.

< زۆر باشە.. ئیتر خواحافیزیمان لەیەك کرد.

ئەم پێشەکییە لەجۆری بینینەکە، هەرچەندە بەڕێکەوت وا هاتە پێشەوە، زەمینەیەکی باش بو بۆ رەواندنەوەی بەشێکی تر لەو گومانانەی کە ماوە، پێشەکییەکی گونجاویشە بۆ نەخشەی قسەکانی سبەینێم.

بە حەمە نوریم گوت: ئەمە یەکەم دڵنیاکردنیانە، کە ئەگەر شتێکیان لەژێر سەردا بێت وا لەوانەیە سەرنجی لێبدەنەوەو ئاڵوگۆڕێکی تێدا بکەن..

### حەشارگەی نهێنییەکان

بۆ بەیانی سەعات نۆ گەیشتمە بەردەرگای ئەمنی عاممە کە کۆنترۆڵی عەسکەری لێیە.

دوای ناو گوتن و هۆی هاتنەکەم و تەلەفون کردنیان، دەرگایان کردەوەو ئاماژەیان بۆ چونە ئیستعلامات کرد.

لەوێش هەمان قسەم دووبارە کردەوە.

ئەمانیش تەلەفونێکیان کردو دوای چەند دەقیقەیەك لە چاوەڕوانیی یەکێك هات و کەوتمە شوێنیی.

پاش ماوەیەك رۆیشتن، ئەو خانووەم ناسییەوە کە ماوەی میوان زیندانییەکەی ئەمنی عاممەمان تێیدا بەسەر برد.

دوای تێپەڕبون بەشەقامە سەرەکییەکەی ناو ئەو شارۆچکەیەی ناوی ئەمنی عاممەیە.. گەیشتینە بەردەم خانویەکی گەورەی دوو قات. بەرەو قاتی دووەم هەنگاومان دەنا. ئینجا گوزەر کردن بەڕاڕەوێکدا کە لە هێنانمان لە هەیئەوە دیبوم و دەمناسییەوە.

لە راستیشدا ئەمە سێیەم جارە ئەم راڕەو و بینایە دەبینم، یەکەم جار بۆ بانگکردنەکەی ٢٧- ١١- ١٩٧٧ بو لەسەر داوای فازیل بەڕاك، گوایا بۆ چاوپێکەوتن و دڵدانەوە!

ئینجا بۆ ژورێك، کە هەر هەمان ئەو ژورەیە کە لەیەکەم شەوی بوونماندا لە ئەمنی عاممە خەڵەفی لێ دادەنیشت و لەوێوە تەلەفونەکەم بۆ ماڵەوە کرد.. کە چومە ژورەوە خەڵەف خۆی دانیشتبو..

هەستاو هات بەپیرمەوە، پاش سەلام و تەوقەکردن و بەخێرهاتن و ماوەیەك بێ دەنگیی، گوتی:

- من بەڕۆژوم.

< منیش هەر بەڕۆژوم. دیارە لەڕەمەزاندا، دابی چاو قاوە پێشکەش کردن دەوەستێ!

ئەوسا کەوتە پرسیارکردن: لەوەزعی خۆم و لەبارودۆخی سلێمانی؟ گوتم بۆخۆتان لەهەموو کەس باشتری دەزانن. سلێمانی تاڕادەیەك ئارامە. بۆخۆشم خراپ نیم، گوزەرانێکی ئاسایی دەبەمە سەر، پارەی ئەو هەشت مانگەی حەپسییەکەم، ماڵەکەم پێ کۆك کردۆتەوە.

ئەوەم کردە پێشەکییەکی تر بۆ قسەکردن لەسەر مەبەستەکانی ترم. بەتایبەتیی ئەم لە بڕیاری بەربونەکەماندا سەرنجمانی بۆ ئەوە راکێشا کە ئاگاداری خۆمان بین چونکە لەوانەیە لەشاخەوە پەیوەندیمان پێوە بکرێ‌و بیانەوێت گرتنەکە بەهەل وەربگرن بۆ راکێشانمان بۆ دەرەوە!

ئینجا کەوتە پرسیارکردن لەسەر راوهەڵوێستی خەڵکی سلێمانی لەسەر گواستنەوەی زانکۆی سلێمانی بۆ هەولێر. منیش گوتم:

< خەڵك لەوە زۆر ناڕازییە، لای منیش وایە کە ئەوە کارێکی باش نەبو، چونکە زانکۆیەکی تەمەن دوانزدە ساڵ کە زەمینەی گەشەکردنی سازاوو گونجاوو جێگیر بووە ئاوای لێبکرێت!

- گوتی ئاخر خەڵکی سلێمانی دۆستانی ئێمە دەکوژن، تەنانەت مامۆستا دەکوژن، مامۆستای زانکۆ دەکوژن. کاتی خۆی تۆ بەڕێوەبەری ئامادەیی بازرگانی کچان و کوڕان بویت، باشە ئەو قوتابخانەیە بۆ خەڵکی سلێمانی بەسود نییە؟

< چۆن بەسود نییە؟

- دەی باشە بۆچی سالح عانیی بەڕێوەبەریان کوشت؟ ئەی ئەویش وەك تۆ خزمەتی خەڵکی شارەکەی نەدەکرد.

< بەڵام هەق نییە دژە کرداری ئەو جۆرە کارانە بەتۆڵەسەندنی گشتیی وەڵام بدرێتەوە. لەهەموو دنیادا ئەو جۆرە روداوانە هەیە. گرنگ ئەوەیە لە حاڵەتی کاردانەوەدا، خەڵکەکە ئەزییەت نەدرێن، باشە ئەی خۆتان نالێن تێکدەران ئەو کارە دەکەن و ئەوانەش تاقمێکی کەمن! ئەی ئیتر خەڵکی سلێمانی چیی بکەن؟ زیاتر لەوە ئەو جۆرە روداوانە ئەنجامی بارودۆخێکی نائاساییین، باشتر وایە چارەسەرەکان لەسەرچاوەوە بێت.

- بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی ئاخر خەڵکی سلێمانی هاوکاریمان ناکەن! سەرچاوەکەش گوێ لە بێگانە دەگرن.

< هەر کەسە لەگیانی خۆی دەترسێت. کاتی خۆی بەزاز وتەیەکی لۆجیکیی لەمەڕ ئەو بارە نائاساییە گوت، لام وایە بەردەوام ئەو قسەیە راستە!

- دەی کەوابو ئەوە سزایەکی باشە بۆ خەڵکی سلێمانی. بۆ ئەوەی کاری تێکدەرانە بەردەوام نەبێت، ناچارین ئێمەش ئەو جۆرە هەنگاوانە بنێین! هەستم کرد ئەوە جۆرە پەیامێکەو بۆنی ئەوەی لێوە دێت کە بە شاخ بگات. ئینجا گوتی دەی باشە ئەی خۆت نیازت چییە؟

لەدڵی خۆمدا گوتم باش بوو خۆی دەرگای قسەکانی کردەوە. گوتم:

< هەروەك لەکاتی بونمدا لێرە پرسیارم کرد کە ئەگەر دەزانن توشی کێشە دەبم و ئەگەر پێتان خۆش نییە من لە سلێمانی بم، وا بیر لە نەقل بونم بۆ بەغدا دەکەمەوە. چونکە بۆ خۆت دەزانیت خەڵکی تۆڵەسێن و هەڵمەتە کاسە هەن کە لە راپۆرت نوسین ناوەستن، جا بۆ ئەوەی هەم سەری خۆم رەحەت بکەم و هەم ئێوەش مەشغوڵی من نەبن و لە بەلای تر بەدوور بم، باشترە لە سلێمانی نەبم. بزانم ئەو نەبزگرتنە چیی لێ سەوز دەبێ!

لەگەڵ قسەکانمدا بێدەنگیی باڵی بەسەر حەشارگەی نهێنییەکاندا کێشا.

کە سەرنجم لە روخساری چڕکرد، هەرچەندە بە قسەکانم کەمێ کراوەتر بو، بەڵام یەك نیشانەی پرسیاری گەورەم تیا بەدیی دەکرد. بەڕاستیی پیاوو لێپرسراوی ئەمن هەروا دەبێت! تا بڵێیت بەسام و ترسناکە. هەرچیی نیشانەو ناوی گریمانی باشەیە لە چڕوچاویدا نابینرێت.

روخسارەکەی حەشارگەی نهێنییە ترسناکەکانە کە هەریەکەیان لەوی تر ترسناك و پڕ مەترسیی ترە!

وا هەست دەکەم کە شتێکی لە مێشکدایەو بیر لە شێوەی دەربڕینی دەکاتەوە. دوریش نییە هێشتنەوەو گرتن بێت. یا عەرزی کارێك یان لێپرسراوەتییەك یان شتێکی لەو بابەتانە بێت. بۆیە بەچاکم زانیی بە بەشەکانی تری نەخشەی قسەکانم

گۆمی ئەو بیرکردنەوەیەی بشڵەقێنم و بزانم ئەو نیشانەی پرسیارە چیی لێ بەسەردێت!

< وەك دەزانیت هەر تاکە گورچیلەیەکم هەیەو لە ئەشیعەدا دەرکەوتووە کە لمی تێدا پەیدا بوە. وا پێدەچێت کە عەمەلییاتێکی تر پێویست بێت، کە ئەوەش زۆر زەحمەت دەبێت. بۆیە دەبێت دوای جەژن بێمەوە بۆ بەغدا تا بڕیاری دوایی دوکتۆر وەربگرم.

بەڕووکراوەییەکەوە گوتی:

- کەی؟

< راستەوخۆ دوای جەژن. چونکە رەمەزانەو ناتوانم عەمەلییات بکەم، دوایی گوتم: خۆ ئەگەر دەرەوەشی پێویست بو، وەك کاتی خۆی کە لێرە بوم باسم کردو گوتم ئەگەر چارەسەری گورچیلەکەم دەرەوەی پێویست بوو، وا مەسرەفەکەشی دەکەوێتە سەر ئێوە، چونکە هۆی کێشەکە لە گرتنەکەی ئێوەوەیە! پێکەنیو گوتی:

- بەسەرچاو، ئەگەر دەتەوێت هەر ئێستا دەتنێرین چیت پێویستە بۆت جێبەجێ دەکەین.

< بابزانین دوای جەژن دوکتۆر چی دەڵێت و ئایا پێویست دەکات یاننا. پێش ئەوەی قسەی تر بێتە پێشەوە گوتم:

< حەز دەکەم سەرێکی عەقید تاریقیش بدەم و ئینجا دێمەوە لاتان بۆ خواحافیزی.

- زۆر باشە، جەرەسێکی لێدا، یەکێك هات و پێی گوت: بزانە عەقید تاریق لەوێیە. زەلامەکە رۆیشت. لەو کاتەدا سەیرێکی کردم و گوتی:

- دڵنیایت کە دوای جەژن دێیتەوە؟

< بەڵێ بەڵێ چونکە دەبێت فریای گورچیلەکەی ترم بکەوم، تەواو نائارامی کردووم.

ئەو قسانەم کردو کابرا هاتەوەو گوتی عەقید لەوێ نییە.

منیش یەکسەر هەڵم دایەو گوتم دە قەیناکە دوای جەژن دەیبینم..

بەوە خەڵەف روی زیاتر کرایەوەو گوتی:

- زۆر باشە، کە دوای جەژن هاتیتەوە ئەویش دەبینیت.

< گوتم هەروا دەکەین.

- چونکە منیش دەمەوێت و حەز دەکەم بتانبینمەوە. ئەم جەختکردنەی ئەو بۆ بینینەوە، سەرێکی داوەکە دەدات بەدەستەوە، بەڵام من خۆمی لێ بێئاگا دەکەم، ئەمەیانم لاباشترە وەك لەوەی پرسی هۆیەکەی لێبکەم!

بۆ دەرخستنی سەری تیشکێکی بیرکردنەوەکانی، باشترە جارێکی تر باسی نەقڵبونی بەغدای لەگەڵ بکەمەوە!

< ئەی بۆ مەسەلەی خۆ نەقڵکردنەکە چیی بەباش دەزانن؟

- با بێیتەوە باسێکی ئەوەش دەکەین! گرنگ ئەوەیە کە بزانیت سلێمانی شاری خۆتەو تا لە سیاسەت بەدوور بیت دەتوانیت تێیدا ئارام بیت!

پشت ئەم قسەیەی، گەلێك نهێنیی مەڵاسدراون، لەوە حاڵیی بوم کە یەکێك لە مەبەستەکانیان دورەپەرێز وەستانە لە سیاسەت و لەشاخ، بینینەوەکەش لە دوو ئەلتەرنەتیڤ بەولاوە هیچی تری تێدا شك نابەم: خەڵات و کارێك لەبەغدا، ئەگەر ئەوە نەبوو، وا گرتن زۆر نزیك دەبێت.. دەی گرنگ نییە، چونکە من لە ئێستاوە بڕیاری خۆمم داوە!

ئەوسا هەستام و خواحافیزیم لێکرد. یەکێکی لەتەکما نارد تا بمگەیەنێتە بەردەرگای دەرەوە.

کە چومە دەرەوە هەناسەیەکی پڕ لە هەست بەحەوانەوەیەکی زۆری پاش ماندوبونم هەڵکێشا...

یەکێك لەو گرفتانەی هاتبونە بەردەم رێکخستنی کاروباری راکردنم، فرۆشتنی خانووەکەم یان بەکرێدان و پێشەکی وەرگرتن بو. حاجی عەبدوڵلایەکی قیرسیچمەش کرێچی بو، پیاوێکی زۆر لاسار بو. بەبیانوی ئەوەی خانوی دەست ناکەوێت، نە چۆڵی دەکردو نە مەرجی عەقدەکەشی جێبەجێ دەکرد کە دەبو لە تەواوبونی ماوەکەیەوە، رۆژی دە دینار بدات تا چۆڵی دەکات. بەزۆر دەرکردنیشم لائاسایی نەبو. تا سلێمانیشم بەجێهێشت هەر تێیدا مایەوە. کە چۆڵیشی کردبو دوو سەدو پەنجا دینار (زیاتر لە ٧٥٠ دۆلار)ی کرد بەحوشتر. دواییتریش حکومەت خانوەکەم داگیر دەکات و موڵکایەتییەکەی دەخاتە سەر وەزارەتی مالییە.

دوای سەفەرەکەی بەغدا دەبو پەلە بکەم لە رێکخستنی ئەم سەفەرەی کە دەبێتە سەرەتای پلەیەکی نوێ لەکاروانێکی تری ناو ئەم کاروانە بێکۆتاییە. ئیتر مەوداو بوواری درێژەدان بەمانەوە لەئارادا نەماوە.

من ژیانی خۆم، لەجاران زۆر زیاتر، بە نائاسایی‌و مۆڵەقە دەهاتە بەرچاو. چونکە وا بیرم دەکردەوە کە سێ هۆی سەرەکی رۆڵیان لە ئازادبونمدا بینی:

- یەکەم: ئەشکەنجەی گیانی و دەروونیی سەخت و لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەو پێنج مانگ و دە رۆژ تاکزیندانی لەکۆی زیندانیی هەیئە کە شەش مانگ و سێ هەفتەو بەوەکەی ئەمنی عاممەوە هەشت دانە مانگی رەبەق، لەو ماوە دوورو درێژە دا هیچیان دەست بکەوێت..

- دووەم: هەوڵی دڵسۆزانەی زۆر لە دۆست و ناسیاو و بە تەنگەوە هاتوان بۆم کە شوێنی دیارو گرنگیان لە دەزگاکانی دەوڵەتی یان لای لێپرسراوانی بەعس و حکومەت هەبووە.

ئەو کارەش بۆ هەندێکیان زۆر و بۆ هەندێکی تر جۆرێك لە هەڕەشەو مەترسیشیان دەخستە سەر خۆیان. لەپێش هەموویانەوە:

*لیوا (کەمال میران) کە سەرۆکی دادگای تەمییزی عەسکەرییە لە بەغدا. بە یاداشت نوسین بۆ عەدنان خەیروڵا تولفاحی وەزیری دیفاع و خاڵۆزاو ژنبرای سەددام حسەین. لە یاداشتەکانیدا چەند ناوێکی تریشی تێهەڵکێش کردبو. ئەو تەنانەت مەلا ماتۆڕیشی خستبوە جوڵە. لیوا کەمال برادەرو دۆستی زۆر نزیك. شارەزاو پسپۆڕێکی سەربازی بەناوبانگی سوپای عێراق بوو، کاتێ لە ۱۹٦۲دا خۆی گەیاندە شۆڕش، لێپرسراوانی سوپا گوتبویان، سوپای عێراق بەتواناترین ئەفسەری لەکیس چوو.

*عەقید (هیوا موفتی) کە مامۆستای زانستگای عەسکەریە.

*لیوا د. کەمال حسەین لە (مستەشفا رەشید) کە لێپرسراوی مەنزومەی ئیستیخباراتی ناوچەی شیمالی دەناسییو پەنای بۆ بردبوو..

*هەندێ برادەری تریشم، کە خەڵکانی بەدەسەلاتی سەر بە رژێمیان دەناسی، کەوتبونە هەوڵدان بە تایبەتی عوسمان دزێی لە هەولێر لەگەڵ فەوزی رەشید نامیق. کاکە حەمەشم پێی عەرز نەدەکەوت لە پەیوەندیکردن و هاندانی برادەرەکانم بۆ واسیتە کردن و ئینجا بۆ دۆزینەوەی رێگەی بەرتیل..

دیسان لەوانەش کە دۆست و هاوکاری رژێم بوون: شێخ محەممەدی شێخ عەبدولکەریمی کرپچنە، وەك ناسیاوێکی کۆنی ناوەڕاستی شەستەکان هەوڵی بۆ دابوم، بە رێکەوت، خاڵە عەبدولی خاڵی گەلاوێژ لە تەکییەکەیدا دەبێت و بێ ئەوەی بیناسێت، ئەو هەوڵەی باس دەکات کە چۆن بە عززەت دوری گوتووەو ئەویش بەڵێنی ئازادکردنمی پێدابو. مەلا عەبدوڵلای مەشهور بە مەلا ماتۆڕ کە وەزیری دەوڵەتە بەهۆی راسپاردەی لیوا کەمال میرانەوە کە داوای بەردانمی لە مودیری ئەمنی عاممە کردبو.. شێخ جەعفەر بەرزنجی پارێزگاری سلێمانی هەر لە رێگەی رێکەوتەوە زانیم کە ئەمیش هەوڵی بەردانمی داوە. رۆژێك عومەر فەتاح کە ئەندازیاری ئیدارە محەللی دەبێت و بۆ کاری رەسمیی دەچێتە لای شێخ جەعفەر بە رێکەوت شێخ تەلەفونی لەگەڵ مودیری ئەمنی سلێمانی دەکردو پێی دەگوت مەحمود عەمەلییات کراوەو هیچی نەکردوە با ئەمیش وەك (موحەڕەم موحەممەد ئەمین)ی لێنەکرێت، بەری بدەن باشە. دیسان ئومێد مەدحەت موبارەك کە ئەودەم

دۆست بوین تەنانەت لە بریندارکردنیدا، داوای لە من کرد کە بزانم ئەوە کاری یەکێتییە یاننا! منیش نامەیەکم بۆ نەوشیروان نوسی.
لە ئەنجامدا هەواڵەکەم پێ گەیاندەوە کە یەکێتی ئاگادار نییە. لەسەر داوای سامی حسەین نازمی خاڵیشی کە زۆر ڕێزی لامان هەیە، هەوڵمدا کە لەو بەعسێتییە، لەو ڕێگە پڕ مەترسیو شورەییەی دور بکەوێتەوە، کە لە پێناو ئەو خۆفرۆشییەیداو بەناهەق بەڵام بەرێکەوت، کاوس تۆفیقی ژنبرای تێداچو، ئەم مامۆستای کیمیابو، لە ئامادەیی ئەزمڕ پێکەوە بوین، ماوەیەك پێش ئەو ڕوداوە داوای لێکرابو کە ببێتە بەڕێوەبەری ئامادەیی کوڕان، ئەمیش پێی خۆش نەبو، پێش گرتنەکەم بەچەند ڕۆژێك، باسەکەی کردەوە، لە کاوسم پرسیی: ئەرێ تۆ بۆچی لەو خزمەتە گەورەیەی شارەکەت ڕادەکەیت؟ باشە تۆ بیت لە بەعسییەك باشتر نییە! ئەویش گوتی: ئەوی ڕاستی بێت ناوێرم، لە قسەی خەڵك دەترسم، هەر قوبوڵی بکەم پێم دەڵێن حەبەکەی قوت داوەو بۆتە بەعسیی. گوتم کاکە تۆ خۆت پیاوێکی پاکیت، نابێت گوێ بدەیتە قسە، بڕۆ بیکەو لەکەس مەترسە. گوتی بەراست بیکەم ئەی دەرەوە پێیان ناخۆش نابێت؟ گوتم نا، بڕۆ لەسەر لێپرسراوەتی من بیکە. ئەوسا قوبوڵی کرد.
سێیەم ئینجا کەس و کارو برادەرانی ئەو ٢٨ و ئینجا ٢٦ کەسە کە لەهەوڵو پەیوەندیکرندا کەوتبونە یەك، زۆر کەسو شوێنیان هەراسان کردبوو.. بۆیە من خۆم بەربونەکەمم بەئاسایی نەدەزانی، هەروەك بەکاتیی بەردرابم وا دەهاتە بەرچاوم.. هەندێ لە برادەرەکانم ئامۆژگارییان دەکردم کە لەسەر جادەو بانیش ئاگاداری ماشین و کردن بەژێرەوە بم.. زیاتر لەوانە ئەو حسابەشم دەکرد کە بگیرێمەوە ڕزگاربونم مەحاڵ دەبێت.. بیری خەڵاتەکەش لە مێشکم دەرنەدەچو، هەمیشە ترسم لەوەش هەبوو کە ئەمڕۆنا سبەینێ ئەو گرفتەم بهێنرێتە ڕێ..
لەو ماوانەدا بۆ خۆئامادەکردن بۆ سەفەرێکی دوورو درێژ، یان گریمانی مانەوەم لەشاخ، کەوتبومە فەحسی خۆم.. تەحلیلەکانم هەر لای دوکتۆر ئەحمەد کەمال شاڵی دەکرد، لای خۆی بوایە یان لە خەستەخانە. تا زیاتر دڵنیابم لە گورچیلەکەم و مەعیدەم و تەندروستیم.
جەژنەکە برایە سەر، دەبو بەپەلە ئیشەکانم تەواو بکەم.. هەرکە تەلەفزیۆن و مەکینەی جل شتنەکە لەماڵ برانە دەرێ و دایکم پێیزانی ئیتر کەوتە پرسیارو سۆراغ و دڵکرمێ کردن و پاڕانەوەو جارجار گریان، بەجۆرێك کە کەوتمە ترس لەوەی ئەوانی تر پێیبزانن و دەنگەکە بچێتە دەری ماڵەکەو کارەکەم لێ تێك بچێت و توشی گرفتێکی گەورەش ببم..

ویستم بەوە ڕازیی بکەم کە تەلەفزیۆنەکە دەگۆڕمەوە بە تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ. گوتی:

> جا بۆ چی ئەوانە دەفرۆشیت؟ مەیانفرۆشە، چیت دەوێت باوکت بۆت دەکڕێت.

< گوتم ئاخر دوو تەلەفزیۆنمان بۆچییە، بۆچی پارەی زیادەش بە باوکم سەرف بکەین!

ئیتر بەو قسانەو بەتوڕەبونی خۆم و قسەی باوکم کە پێی دەگوت وازی لێبهێنە.. بێدەنگ دەبو.

بەڵام بەردەوام سەرنجی لە هەڵس و کەوتم چڕ کردبو. هەمیشە قسەی لەسەر زاربو بەڵام دەری نەدەبڕی...

دڵی خەبەری دابوو کە جێی دەهێڵم بۆیە بەردەوام بێئارام بو.. چاریشی نەبوو، چونکە بیست ساڵ بو ئەوە حاڵی بو بەدەست منەوەو بەهۆی ئەو هەڕەشەو چەرمەسەرییانەو ئەم بڕیاری بەجێهیشتنانەوە..

# کاروانی بێ کۆتایی‌و گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسیی

## (١١)

## سەرەتای کاروانی نوێ

## کاروانی ئاوارەبوون لە نیشتمان

**کاروانی نادیار بەرەو ئاوارەبوون لە نیشتمان..**

دوای جەژنی رەمەزان پێش ئەوەی فریای رێکخستنی کاروباری سەفەری ئاوارەبوون بکەوم سەرلەبەیانیی رۆژی ١٢- ٨- ١٩٨١ ناچار بووم دوا بڕیار بدەم کە سبەینێ پێش کازیوە سلێمانی بەجێ بهێڵین: بۆیە دەبوو بە پەلە پارە گۆڕینەوەو پێویستییەکانی تری سەفەری منداڵان تەواو بکەم.

بەیانییەکی پڕ لە سەرقاڵی‌و ئەمسەرو ئەو سەر بوو. لای عەسرەکەشی بەهەمان شێوە، بە باوکم و دایکمم گوت: لەگەڵ منداڵەکان دەچین بۆ هاوینەهەواری شەقڵاوەو ئیتر خواحافیزیم لێکردن..

هۆش و گۆش و دڵیشم لای دایکمەو ورد ورد سەرنجی دەدەم، هەر لە تەوقی سەرمەوە تا وردەکارییەکانی هەنگاوەکانم سەرنج چڕ دەکات، هەروەك بیەوێت بەو جۆرە ڕازو نیازو گلەیی‌و سەرزەنشتی پەنگاوە خواردووی ناو دڵە پڕ لە زامەکەی خواحافیز بوونە پڕ لە ئازارەکانیم پێ بگەیەنێت و ناڕاستەوخۆ بڵێت: ئاخر ناکرێ بەو جۆرە بەجێم بهێڵی کە ئاوا لەناو ئەسرینی خۆمدا ئارام و سرەوتم لا نامۆ بێت! ناکرێ ئازارو ئەندێشەکانی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژو بەرە ژانەکانی سەرەتاو ژانی ئەو تەمەنە درێژە وا بەتەنها بەسەر مندا بەجێبهێڵی.. خۆ دەزانم لێم ئاوارە دەبیت و ڕۆحم بەو رزگاربونەت ئارام دەکەیت و لە مردنەکانی ڕۆژانە سەرفرازم دەکەیت، بەڵام ئەمەش بۆ خۆی مردنێکە، وا خۆت و هەر پێنج وردیلەکەت و ژنەکەت، کە بەدرێژایی تەمەنی هەر یەکێکیان هۆگرو بەستراوەی ئەوانیش بووم، کەچی وا لەناو یەك تروسکەدا باڵەفڕێی لێدەکەن و ئیتر ناتانبینمەوە!

ئیتر وام هەست دەکرد کە ها ئێستا یا تاوێکی تر دنیا بەسەر دایکمدا دەڕوخێت.

سەفەری گەلاوێژو منداڵەکانم وا ڕێکخست کە بە ماشینەکەی خاڵە عەبدولی خاڵی گەلاوێژ، لەگەڵ خەدیجە خانی دایکیو نەسرینی حاجی حەمەدەمین کە ژنخوشکی کاکە حەمەو شارەزای ڕێگەوبانی قەڵادزێیەو بەو ڕێگەیەدا هەندێ جار کاری بۆ ڕێکخستن دەکرد. تا دوا دێ کە ئوتومبیلی بۆ دەچێت، پێکەوە بن و لەوەو دواش نەسرین لەگەڵیان بێت و ئەوانی تر بگەڕێنەوە. سەفەری ئەوانم بۆ سەر لەبەیانیی ڕۆژی ١٣- ٨ ڕێکخست. بۆیە دەبو گەلاوێژ و منداڵان شەو لەماڵی دایکی بمێننەوە. بەیانی زوو بەپێی ئەو پلانە بکەونەڕێ.

یەکێك لەو ڕێگەو بانانەی بۆ ئەم کاری چونە دەرەوەیە بۆ من لەهەمووی ئاسانترە، ڕێگەی هەنارانە. حەمەی فەرەج ڕێگەو شوێنی سەفەرەکەی ڕێکخست، من ئەمم لە هەڵەبجە ناسیبوو، ئەو سەردەمانەی لێپرسراوی (ل.ن.ه) بووم.

لەو سەردەمانەدا نەوشیروان فوئاد مەستیی، لاوو تازە ئەفسەری دڵسۆزو لێهاتوو کە تەنها یەك ساڵ بو دانیشگای سەربازیی تەواو کردبوو، سوپای عێراقی بەجێهێشتو خۆی گەیاندە شاخ، لێپرسراوی پێشمەرگە بو، منیش لێپرسراوی لیژنەی ناوچە. چیرۆکی زیندوی خەباتی پڕ لە چالاکیو هاوکاریی ئەو ڕۆژگارە بێ وێنەو دورو درێژە. کە لەگەڵ ناوبراودا یەکتری دەبینینەوە، بەشێك لە باسەکانمان یادو بیرەوەرییەکانی ئەو سەردەمە دەگرێتەوە.

بۆ ئێوارەکەشی سەردانی حەمەی فەرەجمان کرد. گوتی سەفەرەکە ڕێکخراوەو سبەینێ سەعات سێی سەرلەبەیان خۆم لەگەڵ برادەرێك و ماشینەکەیدا دێم.. ئیتر لەگەڵ ڕاسپاردەدا هەزار دیناریشی دامێ کە بیدەم بە مام جلال. ئەم لەگەڵ بزوتنەوەدا کاری دەکرد، بەڵام خۆی زیاتر لەگەڵ خەتی پاندا بوو. هەرچەندە بڕواو متمانەی زۆری بە ئێمەی سەر ڕێبازی خەباتی شەست و حەفتاکان لەناو یەکێتیدا، بەهێزتر بوو لەخۆ بەستنەوە بە ڕێکخراوەکان و ڕێبازی ئایدیۆلۆجییان لەناو یەکێتیو دەری یەکێتیشدا. هۆی ئەوەش زیاتر ئەو پەیوەندییە گیانیو نیشتمانپەروەرییو دڵسۆزیو وەفای برادەرایەتییە بووە کە لە ویژدانی هەر یەکێکمان لە تێکۆشەرانی ئەو سەردەمانەدا ڕەگیان داکوتابوو.

بۆ شەو سێ قۆڵیی من و عومەر فەتاح لەماڵی خەسرەو خاڵ لەگردەکەی سەرچنار، بە پێك هەڵدان و قسەی خۆش، ئەختەرخان و کافیەخان- یش بە وردە قسەی خۆیان و تەعلیق و پێکەنین، تەنگمان بەشەوەکە هەڵدەچنیی. لە سەرگەرمیشدا دانیشتەکە خاڵی نەبو لە ڕەخنەو گلەیی خەسرەو خاڵ. منیش بە

زەردەخەنەی بێ وەڵامدانەوە بۆ ئەوو سکالای ناو دەرون بەخۆمم دەگوت: گیان و هۆش و ویژدانم لەناو گەرمەی شینی دوا ساتەکانی ئاوابووندان، بێ ئەوەی بییەڵم خوشك و برایانی دانیشتوو هەستی پێبکەن، من تەنها جەستەیەکی بێ گیان بووم، لەناو ئەو شینەدا، هۆش و گۆش و سۆزی خۆشەویستیی، نائارامیی و نادڵنیایی خەیاڵەکانی من بۆ چەند شوێنێکی تر فڕیبون، لەهەر جێگەیەك کۆڕی شینێکی تایبەتییان بەستبوو.. کە بە لە دەرگادان کەوتنە ناو پەراوێزی دوا ماڵئاوایی و دوا ساتەکانی ناشتنی تەرمی جەستەی زیندوم، کە هەروەك ئیزرائیل ئاسایی دەنگەکان خۆیان دەنواندو دەهاتنە پێش چاوو کۆتاییەکەشی ماڵئاوایی گەرمم لەخوشکان، و ئەملاو ئەولا ماچکردنی برادەرەکانم و خواحافیزی کردن بوو..

سەرکەوتمە سەر پێشەوەی ماشێنەکە، کە سەرنجمدا شۆفێرەکەی مەحمودی حاجی محەممەدی کەڵەکنی‌یە کە دە ساڵی ڕێك لەمەوبەر کاتێك بەڕێوەبەری ناوەندیی کانێسکان بوم، ئەم قوتابییەکم بوو، خۆشی ئەندامی کۆمەڵە بوو، دوای چاك و چۆنیی گوتی دوێنێ ئاگادارکرام کە من دانراوم بۆ گەیاندنت بە هەناران، زۆرم پێخۆش بوو کە یەکێکی وەك ئێوە دەچنە شاخ و ڕۆڵی خۆتان دەبیننەوە.

ماشێن بۆ ئەو ڕێگەو بان و مەڵبەندەی بەرەو یەکەم دێ کە بۆم دیاریکراوە، لۆری بەردکێشە. ماشێنەکە بەوبەرە بەیانە بەناو سەرچنارداو ئینجا لەسەرخۆو سەر جادەی خۆڵو زیخ و بەردانیدا، بەلەنجەولار ڕەوتی بەرەو چەق چەق و کانی بەردینەو خێوەتە دەکرد. مەحمود گوتی: لەم ناوەدا جارو بارجەیش و جاش کەمین دادەنێن و ڕاوی خەڵکی دەکەن. هەندێ جاریش توشی بەرەنگاربون و تەقەکردن دەبن. ناوچەی پڕ لە گردۆڵکە زیاتر بەرزتر دەبێت، گوڕیی ماشینەکەش کەمتر دەبێتەوە. مەحمود بەدەم پرسیارو ماشێن هاژونەوە، منیش لەناو دەریای خەیاڵ کە چۆن بەناچاریی و زۆرە ملێ "سلێمانیی.. شاری جوان و پڕ لە یادو ئەوین و هیواو خەبات و خۆشەویستیم بێ ماڵئاوایی لە زوربەی هەرە زۆری خۆشەویستەکانم بەجێهێشت. کە هەر لە سەرەتاوە، لە بەرەبەیانی ناو تاریك و ڕونی ئەو سەرزەمینە دڵفرێنەی کوردستان و دیمەنی مات و خامۆشی پڕ لە تاسەی ناو سەرنجەکانم و شریتی فلیمی سەدان ڕوداوی ڕۆژانی دێرین. ئەوەیان دەدرکاند کە ئەم کۆچەیان جۆرێکی تری ئەندێشەی ئاوارەیی پێوەیەو بە ئازارتر تەلی سۆزی ناو دەربەدەریی دەلەرێنێتەوەو ئازاری بەسۆزی ئەم ئاوارەییەیان جوێ دەکاتەوە لەوانەی ساڵانی رابوردوو. بۆیە لەبەردەم گێژاوی ئەوساتانەدا هەر ئەوەم بۆ کرا کە لەناو ترپەی دڵ و شەبەنگی تیشکی شکاوەی سەر فرمێسکە قەتیسەکان سەرنجی نواپرینی دوا ئاوڕدانەوەی ڕێبازی ڕوەو چیا ماڵئاوایی لە هەموان بکەم و یادگارو نوسینەکانم..

بەشاری شاران بسپێرم و بە ئومێدی گەشی دڵنیاییەوە بەرەو چیاکان هەنگاوی لەسەرخۆ بنێم و لەنێوان ئاسۆی روناکی پاشەڕۆ تابلۆی ئاواتی شاد بونەوەم بەم مەڵبەندە پیرۆزە بنەخشێنم و پەیکەری زیندوی هیوای نیشتمانی ئازادی مرۆڤی ئەو سەرزەمینە ببینم.." و لەناو ئازاری زامی ئەم ئاوارەبوونەدا کورت و پوخت وەڵامەکانم دەدایەوە، ئەو بەزاری پڕ لە پرسیاری ئامادەکراوو لۆری هاژونەوەو منیش بەو کورتە وەڵام و خەیاڵانەوە گەیشتینە هەنارانی خوارو. لەبەردەم ئاواییدا دابەزین و کەمێ بەپێ رۆیشتن تاکەوتینە سەر سەربانێك. مەحمود چووە پێشەوەو خاوەن ماڵی خەبەرکردەوە، هەڵساو هات بۆ لامان. گوتم: هاتوم بۆ لای هەڤاڵ (دەوەن) دنیا تا ئەوکاتە هەر تاریك بو، بە روخسار ئاشنابون لە دورەوە زەحمەت بو. بۆیە خاوەن ماڵ زیاتر هاتە پێشەوە، وا دیار بو کە بە من ئاشنانییە، کە زیاتر چاوی خەوالوی هەڵگلۆفت وردتر سەرنجەکەی لەسەرم چڕکرد، ئەو سا هاتە پێشەوەو دەستی کردە ملم و گوتی: ئەوە مامۆستا گیان تۆیت، بێقەزابیت ناوی نهێنی بۆ چییە. لەگەڵ رێکخستنی سەفەرەکەدا حەمەی فەرەج ئاگاداری کردم کە دەچیتە لای کوێخا حسەینی هەناران.. بەڵام بەهۆی خەمو پەژارەی ئاوارەبون و خەمی منداڵەکان و هیلاکیی‌و نەخەوتن و ئەو تاریکاییەی کە تا ئەو ساتانە لێڵیی لە بینین و ناسینەوەدا دروست دەکرد، من نەمدەزانی ئەو پیاوە کێیە. تومەس کوێخا حسەینی هەناران خۆیەتی، ئەم پیاوە لە تێکۆشەرەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلولە، بەردەوام ماڵەکەشی لەبارەگاکان قەرەباڵغتر بو. من لە ساڵی ١٩٦٥ وە کوێخام دەناسیی. دوای سوپاسکردنێکی گەرم مەحمود خواحافیزیی کرد. پێشەکی کەمێ پاڵ کەوتم بەنیازی ئەوەی بەڵکە سەرخەوێك بشکێنم، خۆم مات کردو هەوڵم دا بیرەکانم لەسەریەك شت چڕ بکەم بەڵکو وەنەوز ببێتە میوان! خێر بێ سود بو، مەحاڵ بو وەنەوز بەسەر ئەو پەژارانەدا زاڵ ببێت. دواییتر جوڵەو هاتوچۆ کەوتەوە سەربانەکە. زانیم کە ئیتر کاتی هەستان و خۆکۆکردنەوەیە. بەتایبەتیی ئەو ناوچانەی نزیك سلێمانی زۆر جار دەکەوتنە بەر پەلاماری عەسکەرو جاش یان هێرشی ناکاوی هێلیکۆپتەر.

نانی بەیانیمان خوارد. کوێخا گوتی بۆ رێگەش تا ناوزەنگ (بورهان)ی کوڕم لەگەڵتا دەبێت. زۆری نەبرد بورهان ئامادە بو. سوپاسێکی زۆری ئاشنا دێرینەکەم کردو ئیتر وردە وردە لەو بەیانییە فێنکەی رۆژی ١٣ ئۆگەستی ١٩٨١ دا دەشتو دۆڵو گردەکانی ئەو مەڵبەندەمان بەدەم قسەوە دەبڕی. لە قسەو باس لەسەر رووداوەکان، سەرنجم دا بورهانی هاورێکەم لاوێکی گورج‌وگۆڵ و تازەپێگەیشتووە، لە قسەکانیدا هوشیاریی سیاسیی لێ دەردەکەوێ. لەناو رێکخستنی کۆمەڵەدا رۆڵی

خۆی دەبینیی. هەرچەند لەوەوبەر بەهۆی بەرد هێنانەوە بۆ خانووەکەی باوکم ناسیبوم. بەڵام هەر ناسینێکی ئاسایی بو. وا ئێستا بۆتە دەلیل و هاورێم. لەباسیی بون و نەبونی پێشمەرگەی هێزەکانی تر، لە بورهانم پرسیی هێزی چی لایەنێکی تری لێیە. گوتی شێرکۆی شێخ عەلی لەسەرگەڵووە. شێرکۆ لەگەڵ سۆسیالیستی جەماعەتی رەسوڵ مەمەندا بو. کاتی خۆی کە شێرکۆ بڕیاری چونە دەرەوەیدا بەهیچ لایەکەوە خۆی نەبەستبووەوە، رای منی وەرگرت، من ئەمم لەکۆتایی حەفتاو دوو و سەرەتای حەفتاو سێدا ناسیی، کاتێك سەرپەرشتیاری مەکتەبی کرێکاران و جوتیارانی سەر بە لقی سلێمانی بوم. کورێکی روح سوك و ئازاو بەخشندەو تابلێی دەست بڵاویش بو. کە بە لێپرسراوی یەکێتی جوتیارانی پارێزگای سلێمانی دانرا، زۆر لە من نزیك بۆوە، زۆری حەز بە خۆفێرکردن دەکرد بەڵام لە خوێندنەوەدا تەمەڵ بو. ئەوەندە لە من نزیك بوبووەوە تا ئەو رادەیە کە لە ململانێی ناو لق و لەکارەکاندا زیاتر گوێی لە من دەگرت. منیش زۆرم خۆش دەویست.

لە هەرەسدا ئەم لەگەڵ بارزانیو ئینجا لەگەڵ قیادە موئەقەتەدا مابۆوە. دوای ئەوە قیادە دەینێرنەوە بۆ سنوری سلێمانیی بۆ کارو چالاکیی، بەڵام لەپڕ دەگیرێو بۆ بەغدا رەوانە دەکرێت. ماوەی سێ هەفتەیەك بێ سەرو شوێن دەبێت، و ئینجا ئازاد دەکرێت. ئەم ئازادبونەی لای زۆر کەس نیشانەی پرسیاری لەسەر دروستکرا هاتە لام و سەرگوزەشتەی هاتنەوەو گیرانەکەی باسکرد. من بۆ خۆم گومانم لێینەدەکرد.

لەباسی هەوڵی بنەماڵەی بارزانی بۆ رێکخستنەوەی پارتیی، شێرکۆ قسەو هەڵسەنگاندنەکانی ئیدریس و مەسعود بارزانی پێگەیاندم، لەناو ئەوانەدا مەسەلەی کارکردنەوە لەگەڵ پارتیدا. شێرکۆ گوتی: جێگەیان لە قیادە مووەقەتەدا بۆ داناویت! مەسعود رای وابو کە لە گەڵیاندا کار ناکەیت. هەرچی ئیدریس بو ئەوەی بەدوور نەدەزانی، جا هەردوکیان منیان راسپاردووە کە لەوە ئاگادارت بکەم و وەڵامەکەشیان بۆ بنێرمەوە. گوتم:

- تازە ئەو رێکخستنە ئەوە نییە ئێمەومانان کاری تێدا بکەین، چونکە ئەگەر هەڵەکانی رابوردوو سروشتی سەرکردایەتییەکەش چاولێپۆشین وا هەرەس و سەرەنجامە ترسناکەکانی کۆتاییان بە رۆڵی ئەو سەرکردایەتیە هێنا. دەبێت خەڵکی رۆشنبیرو کادیری هوشیاری باش لەوە بگەن.

- ئێمە کاتی خۆی، سەرەڕای وتووێژی موشیر بارزانیی، کە سەرەتاو خوڵقێنەری شەڕی ناوخۆ بو، هاوکاریی رژێمی بەغدا لە شەست و شەشداو بەدەرکردنی بەیانی ٢٩ حوزەیرانی ١٩٦٦ کە مەلا مستەفای رەحمەتیی دەیویست

ئەو بەیانە پاوان بکات و باڵەکەی مەکتەبی سیاسیی نەك هەر لێی بێبەش بکات، بەڵکو بەهۆیەوە تەفرو توناشی بکات و سەرەنجام بووە هۆی قوڵبونەوەی شەڕی ناوخۆو هەوڵی دوولایەنە بۆ هاوکاریی لەگەڵ میریی.. ئەو هەموو پۆخڵەواتەی لەناو پارتیدا هەبو. لەگەڵ ئەوانەشداو لە پێناوی لابەلاکردنی شەڕی براکوژیو گەلێ هۆی تردا، ئێمە قوربانیمان بە رێکخستنەکەماندا و لەگەڵ پارتییەکەی بارزانیدا تێکەڵ کرایەوە. راستە بەوە شەڕی براکوژیی لابەلا بوو، کە لەوەدا کارێکی زۆر باشمان کرد، بەڵام بەهۆی هەرەسی ئەو سەرکردایەتییەوە، ئەنجامەکەی سەربڕینی شۆڕش و ئەو روخاندنە بوو کە ئێستاش شوێنەواری خراپیی بەردەوامە. لە راستیشدا سەرەڕای ئەو هەڵەو کەمو کورتییانە، من سەردەمەکەم بەسەردەمی بارزانی دادەنا چونکە کەس نەبوو جێگەی پێ لەق بکات، زوربە لە مەترسیی ئەو هەڵانە تێنەدەگەیشتن، لە سروشتی سەرکردایەتیی خێڵەکی و نەگونجانی لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوایەتیدا حاڵیی نەدەبون. جا پاش ئەو هەموو تاقیکردنەوانە گوناهو گێلێتییە، ئەگەر هەبێت بیەوێت جارێکی تر بەو ئەزمونە تاڵو روخێنەرو وێرانکەرانەدا بچێتەوە. دیارە لەوەدا من رێکخستنەکەی خۆمان بەبێ هەڵە لەقەڵەم نادەم، بەڵکو ئەو بارودۆخ و هەلو مەرجانە، باڵەکەی مەکتەبی سیاسیشی خستە هەڵەی قەبەوە، ئەوەش هۆیەکی گرنگی هەڵوەشانی بوو.

- لە هەموو ئەوانە گرنگتر سروشتی ئەو سەرکردایەتییەیە: سروشتیی خێڵەکی ئەو سەرکردایەتییە، لەگەڵ سەردەم و کەرەکتاری سەرکردایەتیی پارتییەك ناگونجێت کە رابەری بزوتنەوەیەکی نیشتمانیی یان نەتەوەیی بکات، بەپێی ناکۆکیو جودایی سەردەمە کۆمەڵایەتییەکان کە هەریەکەیان نوێنەری سەردەمێکی دیارە، پەیوەندییەکان لەسەر بنچینەی خوێن و ئەو سروشتە خێڵەکییە داڕێژراوە:

سەرۆکی خێڵو بنەماڵەکەی لەخانەی سەرەوە.

لێپرسراوی سەربازیی و کارمەندوو فەرمانبەرە بە دەسەڵاتەکان لەپلەی دووەمدا.

هێزی چەکدار لەپلەی سێیەمدا، رەعییەت لەپلەی چوارەمدایە. ئەوە پێکهاتەی ئەو سەرکردایەتیە و دابەشبونی میللەتە کە تەواو پێچەوانەی کۆمەڵگەیەکی سڤیل و شارستانییە.

ئەگەر لە سروشتی سیاسییو ئامانجەکانیشی وردببینەوە، وا بەرنامەکەی دژ بە کاری نەتەوەیی سەرجەمییە. ئاسان لەگەڵ دوژمن تێکەڵ دەبێت، ئاسان ناکۆکییەکانی ناو بەرەی گەل دەکاتە ناکۆکیی سەرەکیو بە پێچەوانەیشەوە. لەکارەسات و کەوتندا، لە نوشستیی و لەبەردەم هەرەشەدا، هەموو نەخشەو ئامانجەکان بۆ سەرفرازکردنی بنەماڵەو موڵك وماڵەکەی دەبێت، بەجێهێشتنی

گۆڕەپـانی خەباتـە، فرێدانـی دروشـم و داواو ئامانجەکانـە، داشـکان و سـازش و سازشکارییە. نمونەی ئەوانە لە ئەزمونەکانی پانزدە ساڵی رابوردودا زۆرن.

=ئیتر دیکتاتۆریەتی سەرەك خێڵ ئاسان و نەگونجاو دژە لەگەڵ: سەرکردایەتی بە کۆمەڵ، ژیانی دیموکراسیو فرە حیزبی، ئازادی نوسین و ڕادەربڕین، ڕەخنـەو گلەییو هەڵە دەرخستن، ستراتیجی سیاسیی نەتەوە لەسـەر ئاسـتی کوردسـتان و هـەموو پارتیو ڕێکخراوەکان. کە شـێرکۆ بڕیـاری چوونـە دەرەوەشـی دا ڕای منـی وەرگرت، منیش ئامۆژگاریم کرد کە بچێتە لای نەوشیروان، ماوەیـەك لـەوێ بێـت، ئەوسا بڕیاری خۆی بدات لەگەڵ کێ کاری سیاسی بکات. لە چوونەکەیدا ماوەیـەك لەوێ دەمێنێتەوە ئیتر ڕێگەی خۆی بە چوونە لای سۆسیالیستی جەماعەتی ڕەسول مەمـەند هـەڵدەبژێرێت، نامەیـەکی گلـەییو هـەندێ هەواڵیشـی بـۆ نوسـیبووم، لـە نامەکەدا باسی کۆنگرەی بزوتنەوەکەیان و قسەی سەرکردایەتیەکەیانی پێ گەیاندم کە شوێنیان لـە سـەرکردایەتیدا بـۆ دانـاوم و داوای چوونـە شـاخیان لێ کردبـووم. ڕەسوول مەمـەندیش پـێش چوونـە دەرەوە دوو ڕۆژ هاتـە لام، دوای مشـتو مڕێکـی دورو درێژ، ئەو داوایەی پێ گەیاندم قبوڵنەکردنی خۆم پێگـەیاند، ئەو بۆچوونانـەم بۆ ئەویش باسکرد.

لە ڕاستیشدا من بڕوام بەو فرە ڕێکخستن و فرە سـەرکردایەتیانە نـەبوو، هانیشم دەدان کە بۆ رونەدانەوەی شەڕی براکوژی، حەقە ئێمـە ڕۆڵـی دژ بـە شـەڕو ئـاژاوە ببینین و گوشار بخەینە سەر ئەو لایەنەی شەڕەنگێزەو نابەرپرسیار دەجوڵێتەوە.

بۆیـە بـە بورهـانم گـوت بـابچین بـۆ شـەدەڵە شـەو لـەوێ دەبـین و سـبەی دەکەوینەوەڕێ، ئەو ملی بۆ ئەوە نەدا. گوتم دوورنییە بەخۆیو هێزەکەیەوە لەگـەڵ خۆماندا نەیبەین بۆ ناوزەنگ. گوتی بڕوا ناکەم، چونکە کێشـەکان زۆر ئاڵۆز بوون، بە منیش گوتراوە بتانگەیەنمە ناوزەنگ..

ئیتر نەمویست زۆر لەسەر ئەوە بڕۆم، چونکە لە ڕاستیی روداوو گۆڕانەکانی ناو ڕێکخستنەکانی شۆڕش زۆر ئاگادار نەبوم. هەرچەندە بڕوام وابو کە تەئسیرم لەسەر شێرکۆ هەر ماوەو دەمزانی چەندی من خۆش دەوێت.. لەو ماوەی نزیك دوو ساڵەی لە لقی پارتیدا کارم کردوو هەرەس کۆتـایی بەو پلەیـەی خـەباتیی پارتایـەتیم هێنـا، هەرچەندە من لەدوای تێکەڵبونەوەی هەردوو ڕێکخسـتنەکە بەنزیکـەی دوو سـاڵو لەسەر داواو جەختیی هەندێ لە برادەرو ئینجا لقی سلێمانیی بوم بە ئەندامی لق.

چونکە ئێمە بڕیارمان دا لەو لیستەی تێکەڵبونەوەی ڕێکخستنەکەدا لێپرسراوەتیی ڕێکخستن قوبوڵ نەکـەین و هـەر لـە ڕێکخـراوە دیموکراتییـەکاندا کاربکـەین. بـەڵام لەسەرەتادا، تەنانـەت ڕێگـە نـەدرا کە لـەو کاتەشـدا کاربکـەم. هـەر وەك مـام جەلال

ئاگاداری کردم کە مەلا مستەفا رازیی نەبووە. جا لەو نزیك دوو ساڵەدا خەڵکانی تری دڵسۆزی وەك شێرکۆ و فایەق تۆفیق لە رێکخستنەکەو رێکخراوەکاندا لە منەوە نزیك بوبونەوە، هێندە متمانەیان بە من بوو کە شتی سەمەرەو دیاردەی سەیریشم لێ نەشارنەوەو بۆم باس بکەن..

منیش لای ئەوانەی جێگەی بڕوابوون قسەم دەکردو ئەوانیش رازونیازی دڵی خۆیان نەدەشاردەوە..

ئەپریلی حەفتاو چوار بو کە رێگەم کەوتە ناوپردان، رۆژێك لەسەر ئیستگەکە نوسینێك لەسەر تەها محێدین دەخوێنرایەوە کە لەراستیدا هەمووی هێرش بوو بۆ سەر رابوردی "جەلالی" بۆ سبەینێ لای دارا تۆفیق بوم، ساڵح یوسفی- ش لەوێ بو.. باسەکەم کردەوەو گوتم:

< زۆر ئاشکرایە کە ئەو جۆرە نوسین و قسانە هەر رژێم سودی لێ وەردەگرێت، بەزیان بۆ شۆرش و ئەم یەکێتییەش دەگەڕێتەوە کە یەکگرتنەوەکە خوڵقاندویەتی، ئیتر ئەم بەندوباوی جەلالییەت و ماویە تاکەی بەردەوام بێت!؟ دارا گوتیی:

< هەقیقەت وایە، بەڵام ئەوی راستی بێت و لەتۆی ناشارینەوە ئەوەیە کە هەرچەندە من ئەمینی گشتیم و راستەوخۆ لە رادیۆکەش بەرپرسیارم، ئەو نوسینەی هەژار یەکسەر لە پاراستنەوە نێرراوە بۆ ئێستگەکە! خۆ کەسیش ناتوانێت بڵێ ئەرێ چۆن وا دەبێت..!

ساڵح یوسفیش هەڵی دایەو گوتی: بەدەست پاراستنەوە پەرێشانین و چارەشی نییە!

دواجار کە لە بەغدا ساڵح یوسفیم بینییەوە لە حەفتاو حەوتدا، ئەوکاتە لە بەغدا دەژییا، عوسمان دزەییم لەگەڵدا بو کە چوینە سەردانی.. هەرچەند توشی هەڵامەت بوبو، بەڵام زۆری پێخۆش بوو دابنیشین، قسەکانی بۆ یەکێتیی ریزەکانی کوردو خۆلادان لە شەڕی ناوخۆو بە ئاشتیی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بوو، کە تا ئەوکاتانەش بڕوای پێیی هەبوو، رەنگە هەر ئەو هیوایەش پاڵپێوەنەری گەڕانەوەی بوبێت بۆ بەردەستی رژێمی بەعس.

هەر لەو رۆژانەدا لەگەڵ "نەوزاد" کە لە پاراستندا رۆڵێکی چاوێنی هەبوو، سەرێکی نوری شاوەیسم دا لە ژێر کەپری ئەمانەتەکەیدا. لەباسی نوسین و کاری رۆشنبیرکردن و نوسینی بیرەوەریدا، یەکێك لە دانیشتووان روی کردە نوری شاوەیس و گوتیی: ئەرێ بۆچیی تۆ ئەو بیرەوەریانە نانوسیتەوە تا ئەو دەیان نەوەیەی دوای خۆت دەرس و پەندی لێ وەربگرن.

لەگەڵ قاقای پێکەنینە تایبەتییەکەی خۆیدا گوتی:

> ئەوە تۆ دەڵێیت چیی، بیرەوەریی چیی‌و سود وەرگرتنی چیی، کورە ئەوا خۆمان بەدەست پاراستنەوە بوین بە بیرەوەری‌و گاڵتەجاڕ، ئیتر نوسینی چیی‌و نەوەی چیی‌و بیرەوەریی چیی!

سێ ڕۆژو دوو شەو بەپێ و بە وڵاخ ئەو کێوو دۆڵ و ناوچە سەختانەمان بڕی کە تارادەیەکی زۆر چۆڵ و وێرانە بوو تەنانەت دەستی وێرانکاریی و تارومارکردنی دێهاتەکان گەیشتبووە قووڵایی ناوچە سەختەکان. ئەو دیمەنانە بەڵگەی زیندووی بەربەرییەتی ئەو توخمەی حیزبی بەعسە. کە لە تێکدان و وێرانکردنی دێی سادەو ژیانی سروشتکردی جوتیاری هەژاری کورد دەستێکی باڵاو لە بیناکرندا ئیفلیج و سەقەتیان هەیە. ئەوەش مشت و مڕەکەی نێوان هارون الرشید و خالید بەرمەکی هێنایەوە یاد: دەڵێن هارون الرشید بە بەرمەکیی دەڵێت دەبێت ئەو تاقی کیسرایە تێك بدەن و تەختی بکەن چونکە سیمبۆلی مەجسوییەکانە. ئەویش پێی دەڵێت: قوربان ئەوە شوێنەوارو شتێکی جوانەو هیچ زەرەرێکی نەداوە، دیارە دیاردەی مەجوسیش لەو ناوەدا نەماوە، تەنانەت لە ئێرانیشدا شوێنەواری بەرەو نەمان دەچێ. مەبەستی ئەوان لەو زاراوەیە میللەتی فارس بو نەك مەجوسیەت. ئەویش دەڵێت دەمەوێت تەخت بکرێت و شوێنەواری نەمێنێت. دوای ئەوەی زۆری لەگەڵ خەریك دەبێت، بۆی رازی ناکرێت. ئینجا پێیدەڵێت: ئاخر گەورەم بۆمان تێك نادرێت، با دەستکاری نەکرێت ئەگینا دەستبکەین بە روخاندنی‌و ئیتر نەتوانین بەردەوام بین، پێمان دەڵێن ئەوانە تەنانەت لە وێرانکردنیشدا سەلیقەو ئەقڵیان نییە، ئەو قسانە بێسوود دەبێت و ئیتر دەست دەکەن بە روخاندن تا ئەو رادەیەی کە بەو شێوەیەی ئێستا دەبینرێت، لێی دەڕوخێنرێت، ئینجا بەو جۆرە بەجێی دەهێڵن. (ئەو تاقە شوێنەواری کۆشکێکی زۆر گەورە بوو، کاتی خۆی کیسرای دووەم لە سەلمان پاك، لەخوار بەغداوە، دروستی دەکات و دەیکاتە پێتەخت، دوای ئەوەی لەساڵی ٢٢٤دا ئەو ناوچەیەیان داگیر کرد.

لەگەڵ ئەو وێرانکارییەی بەعسییەکاندا، دەستی خۆشمان لە ڕێز نەگرتنی جوانیی نیشتمانەکەمان و سروشت و ئاوو هەواو دەوروبەر، بەناوچەکەوە دیارە. لەو ڕێڕەوەی ڕووەو توژەڵەو ناو زەنگ، ئەملاو ئەولای گردو چیاکانم دەبینیی کە چۆن ئابلۆقەی داگیرکەر لەسەر ناوچەکە، پێویستیی ژیان، دانیشتوانی ناچار کردووە کە دارو درەخت بڕنەوە. بەڵام زۆر بە نەزان و ڕێز نەگرتنەوە. چونکە سەرجەمی لق و چڵەکانیان بڕییوە، تەنانەت قەدەکەشیان تا زەوی بڕیوەتەوە.

لە مانەوەمدا لە ناوزەنگ، ئەو دیاردەیەم بە یەکێك لە برادەرەکانم گوت کە هەقە ئامۆژگاریی تایبەتیی پێشمەرگەو خەڵکەکەش بکەن بۆ جۆری داربڕینەوەو

لێکدانەوەی ئاییندەی دارستانەکانمان و تەنانەت ئاییندەی پێویستیی خۆشیان. گوتی:

> ئەی پێشمەرگەو ئەو خەڵکە بەچیی بژین؟

< من ناڵێم دار بەکار نەهێنرێت و درەخت نەبڕنەوە، بەڵام هیچ نەبێت لەهەر درەختێك لقێکیش بمێنێتەوە وا پاشەڕۆژی دارستانەکانمان هەر سەوز دەبێت.

> گوێ مەدەرێ کە سەرکەوتین هی باش و جۆراو جۆر و زۆرتریش دەڕوێنینەوە! دێیەکان جوانتر دروست دەکەینەوە!

**کاروان لەناو شەومەزەنگی سەر زنجیرەچیاو لە بەردەم هەڕەشەی سەنگەرەکانی دوژمندا..**

وەك بۆیان باسکردبووم من رێگەی منداڵەکانم بە کورت و ئاسان دەزانیی، کەچی سەفەرەکە بەو جۆرە نەبوو..

گەلاوێژ و منداڵەکانم لە یەکەم رۆژی سەفەرەکەدا بە ئاسانیی گەیشتبونە دورترین دێ کە ماشین بیگاتێ. لەوێوە دایکی گەلاوێژ و خاڵە عەبدول دەگەڕێنەوە. نەسرین لەگەڵیاندا دەمێنێتەوە. هەریەکە وڵاخێکیان بۆ بەکرێ دەگیرێت. بەو شەوە دەکەونە رێ. لەسەر لارێی تایبەت بە وڵاخی ناوشاخ و داخە سەخت و لوتکە هەزار بە هەزارەکانی ناوچەکە کەزۆریان بە سەنگەرو سەربازگەی سوپای عێراق گیرابون و بوبونە مایەی دەیان روداوی جگەربڕ لە توشبونی راکردووەکانی وەك ماڵ و منداڵەکەی من، کە بوبونە سەرگوزەشتەی سەرزاری خەڵك و دەماودەم دەیانگێڕایەوە. لەگەڵ چەندین روداوی هەڵدێرانی ئێستر کە چۆن هەپرون بە هەپرون بوبون. کاتێ مام قوربانیی، دەلیلی رێگەو خاوەن وڵاخەکان لە پێشەکیی سەفەرەکەدا لەناو ئامۆژگاریکردنەکانیدا بۆ جۆری رەفتار لەو سەفەرەی ناو ئەو تاریکستانەی بەردەم ئەو مەترسییانە، ئەو کورتە باسانە بۆ گەلاوێژ و نەسرین و منداڵەکان دەکات، ئیتر لەناو فەلاکەتی ترس و لەرزێکی لە وێنە نەبو لەو تاریکەشەوەدا، هەڕەشەی سەنگەرەکانی عەسکەر لەلایەکی تر، ترسی بەلەسەبونی وڵاخ لەلای سێهەم، خەمی خۆیو ترسی پێنج منداڵەکەی کە هەریەکەیان دوو دوو بەسەر ئەسپ یان ئێستر یان کەرێکەوە دەبن، لەسەر ئەو بزنە رێیانەو بەردەم ترس و لەرزی هەڵەنگوتن و هەڵدێرانی وڵاخ، لە کاروانی شەوێکی پڕ لە ئەندێشەی سەختدا دەبن، کە لە شوێنێکدا گەلاوێژ دەیەوێت بووەستن تا ئیسراحەتێك بکەن، مام قوربانیی سێوو خواردنیان پیشان دەدات کە لەسەر ئەرزەکە کەوتبوون و دەڵێت دوێنێکە ئا لێرەدا دەستڕێژ لە چوار کەس کراو کوژران و ئەوەش پاشماوەکەیانە.. لە شوێنێکی تر کە بە رەبییەیەك نزیك دەبن، وەك تارمایی لولەی تۆپی تانك دەبینن

کە ڕوی دەکرێتە ئەمان.. بەو جۆرە لە ڕێڕەوی شەوێکی سەختی دەوردراو بە هەڕەشەی جۆراوجۆری، ڕاستەوخۆ گەیشتبوونە ناوزەنگ.

لە ڕێگەمدا بۆ ناوزەنگ، دەبوو بە توژەڵەدا بڕۆم، وەختێکم زانیی نزیک بە بارەگاکەی مام جەلالم. مام ئەحمەدی دادی لەوێ بو، ئەم لەو تێکۆشەرە دێرینانە بو کە بە درێژایی تەمەنی ڕێبازی کوردایەتیی بەرنەداوەو دڵسۆزانە تەمەنی خۆی بۆ نیشتمانەکەی تەرخان کردووە. جگە لەوەی کەهاوڕێی کاکە حەمەم و هاوگەڕەك و دراوسێی مالیش بوین، لە شەست و شەش و شەست و حەوتیشدا، دوای هەڵبژاردنم بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی، بە لێپرسراوی لقی پێشمەرگە دانرام، ئەم ئەندامێکی ئەو لقە بوو. هات بەپیرمەوەو کورتە ئیسراحەتێکم لای کردو کەوتمەوە ڕێ.

کاتێ گەییشتمە ناوزەنگ، دوای ئەو هەموو هیلاکییە دەبو بەو شاخە قوچەی بەردەمیشدا هەڵبگەڕێم تا بگەمە بارەگای ناوەندی کۆمەڵە کە جێگەی کارو نیشتەجێی هەندێك لە برادەران و ماڵ و حاڵیشیان بو. کاتێ گەییشتمە تەختاییەکەی سەرەوەی، تەواو ماندو بوبوم قسەم بۆ نەدەکرا. بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕ کرام بەتایبەتیی لەلایەن نەوشیروان و شازادو فەرەیدون و برادەرانی تر کە لەوێ بون. پاڵم لێیدایەوەو حەوامەوە...

زۆر دەمێك بو ئارامیی و ئاسودەیی لەو بابەتەی ناو تێکۆشەرانی نەتەوەکەم هەست پێنەکردبو.

ئەو ڕۆژانەی بەکاتیی لە ناوزەنگ بوم بۆ سازکردن و ڕێکخستنی سەفەربەرەو ئێران و لەوێوە بەرەو سوید، گەلێ باس و خواسی کۆن و نوێ بەسەرکرایەوە.. هەر لە ڕۆژانی سەرەتادا جموجوڵ و خۆئامادە کردنێکی نائاسایی پێشمەرگە دەبینرا.. لابەلا بیستم کە شەڕی سوسیالیست دەکرێت. دوای چەند ڕۆژێك روداوە دڵتەزێنەکەی سەرگەڵوم بیستەوە کە دوو سەرکردەی پێگەیشتووی ناو شەڕی پارتیزانی (جەمالی عەلی باپیرو شێرکۆی شێخ عەلی) و گەلێ پێشمەرگەی هەردوولای تێداچوو.

لە یەکێك لەو ڕۆژانەی کە قسەو باسی ڕابوردومان لەگەڵ نەوشیرواندا بەسەر دەکردەوە، دەستەیەك نامەی دایە دەستم و گوتی ئەوە هەندێك لەو نامانەن کە بۆت نوسیبوم، یان وەڵامت دابومەوە، ئەوانەی تر لەگەڵ گەلێ نامە و نوسیندا لە دێیەك دەشارڕێتەوە، ئیتر بەهۆی بۆردومان و وێرانکردن و سوتاندنی دێیەکەوە، گەلێ نوسراو و نوسین، لەگەڵیشیاندا ئەو نامەو نوسراوانەشی تێدا دەچێت.

دوانزده نامەی سەردەمی پێش گرتنەکەم بو. ئای کە کارێکی بەسودە ئەگەر ناوبەناو پیاو بەسەرنامەو نوسینی رابوردویدا بچێتەوە. چونکە ئەرشیفکردنی نامەی لەو جۆرانە بە کارێکی زۆر زەحمەت و خەتەرناك دادەنرا..

لەگەڵ ئەو بۆنەی نامە هەڵگرتنە بیرەوەریی ساڵانیی دوای هەرەسم وەبیرهاتەوە، ئەو کاتانەی من لە رەمادی بوم. ئەو لەیەکێك لە نامەکانیدا باسی پرۆژەی نوسینی مێژوی کۆن و نوێی کوردی هێنابووە پێشەوە کە پێکەوە کاری لەسەر بکەین. منیش لام پەسەند بو. بەڵام نوێ بونەوەی شۆڕش ئەوی راکێشایەوە ناو خەباتی چەکدارییەوە.

پێش ئەوە من بیستبوم کە لە گەڵی خەریکن، بۆیە لەنامەیەکمدا رای خۆمم بۆ نوسیبو کە هەقەو باشتر وایە لەگەڵ تەواوکردنی دوکتۆراکەت خەریك ببێت. لەهەموو حاڵەتێکیشدا ئەم لایەنە فەرامۆش نەکات باشە. کە هەواڵی ئەو نامەیەم لێپرسیی، گوتی بەدەستم نەگەیشتووە!

لەقسەو باس لەسەر هاتنەدەرەوە، ماڵو منداڵم، نەوشیروان گوتی: باشە بۆ لەسوریە نیشتەجێیان ناکەیت؟ گوتم شتێکی باشە ئەگەر بژین، باشە لەوێ بەپارەی پەنابەریی دەژین؟ گوتی هەر بەشی کرێی خانو پارە دەدەن. گوتم: ئەی باقییەکەی لەکوێ بێنم؟ دوای مشتومڕێکی کورت بەڵێنم دا کە دوای جێگیرکردنی منداڵان خۆم بگەڕێمەوە..

لە راستیشدا من زۆر لەوە دوو دڵ بوم کە لەگەڕانەوەشمدا لەکاری لێپرسراوەتیی نزیك ببمەوە. بۆیە ئەو شەو و رۆژەش کە لای مام جەلال بوم لە توژەڵە. لەناو قسەو باسی هەمەجۆرو باس و خواسی هەمە لایەنە، باسی باری ئیشکردنی خۆی کرد. منیش گوتم ئەوەی راستی بێت من دەبێت منداڵەکان لە شوێنێك بحەوێنمەوە، ئەوکات دەگەڕێمەوە. بڕیاریشم داوە بیانگەیەنمە سوید. گوتی:

< دە زۆر باشە، هەرچیەکتان پێویستە قسە بکەن. ئیتر پەساپۆرتەکانی لێوەرگرتم بۆ ناردنیان بۆ تاران بۆ وەرگرتنی پسوڵەی بەجێهێشتنی ئێران بە فرۆکە. ئینجا گوتی:

< نامەشت دەدەمێ بۆ تاران تا لەوێ دۆستان یارمەتیت بدەن. خۆ بۆ دوکتۆر فوئادیش کە لە تارانە، نامە پێویست ناکات، هەرچییەکت پێویست بو پێی بڵێ تا یارمەتیت بدات. ئەگەر راپۆرتێکی دورو درێژ لەسەر هەیئە بنوسیت بۆ رێکخراوی ئەمنستی زۆر باشەو سودی زۆر لێدەبینرێت.. گوتم لە راستیدا من زۆر هیلاکم، ئێستاش لەناو تارمایی ئەشکەنجەکانی هەیئەدا دەژیم، ماوەیەکم دەوێ تا بحەوێمەوە با بگەڕێمەوە، ئەوساکە ئاسانە..

زۆر چاوەڕوان بوم کارەکەم نەدەجولا. دوای ئەوەی بڕیارم دا خۆم بچمە تاران، سەرێکی مام جەلالم دایەوە، پاسپۆرتەکان و نامەکانم وەرگرت. چەند نامەیەکی بۆ نوسیم بۆ یارمەتی و جێبەجێکردنی کارەکەم. ئەوسا روم کردە تاران. بۆ راپەڕاندنی کاری پاسپۆرت و چونە دەرەوە چەند کەسێك کە لەوەوبەر نەمدەناسین زۆر یارمەتییان دام، بەتایبەتی شێخ محەممەدی شێخ مەحمودی سەرگەڵو جگە لەو یارمەتیو بەپیرەوەهاتنە، گەلێ شوێنیشی گێڕاین. پیاوێکی بەوەفاو دەستکراوە، نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز هاتە پێش چاوم و لەدوارۆژیشدا بۆم دەرکەوت کە نرخاندنەکەم لەشوێنی خۆیدا بو، ئەوکاتە ئەم بزوتنەوەیەی ژمارە دوو بو، مەبەستم ئەوەکەی جەماعەتی مەحمود عەلی عوسمان و رەسوڵ مەمەندە، کە ئەمیش بوبو بە دوو بەشەوە. ئەم لەولایەنە بو کە دەیانویست دوکتۆر مەحمود بەلای خۆیاندا رابکێشن..

نامەی مام جەلالیشم برد بۆ حاجی عەباس کە لێپرسراوی جەماعەتی ئیسلامیەکانی کورد بو. کە بینیم بە روخساریدا وام مەزەنە کرد کە پیاوێکی راستگۆ نەبێت. لەدواییدا بۆم دەرکەوت کە بۆچونەکەم دروستە. ئەوان کارەکەیان بۆ نەکراو خەریك بوو پەساپۆرتەکەشمی تیابچێت. شالاوی عەلی عەسکەری کە ئەوکاتە لەگەڵ ئەو حاجی عەباسەدا کاری دەکرد هەوڵێکی زۆری داو زۆریشی خزمەت کردین، بەلام بۆ ئەو کارە هیچی پێنەکرا. ئیتر لە تاران گیرمام نە یەکێتیو نە سۆسیالیست و نەئیسلامی کارەکەیان بۆ سازنەدەکرا..

تا خوا "دڵشاد"ی بۆ ناردم. ئەم کوڕێکی خانەقینی بو، هەرچەندە لەوەوبەر نەمدەناسی، بەلام ئەو بەهۆی ئەوەوە کەلە ئامادەیی پیشەسازیی سلێمانی خوێندبوی، منی دەناسی. خۆشی پیاوانە دەسپێشخەریی کرد، سەردانی کردم و کەوتە یارمەتیدانم. وازی نەهێنا تا کارەکەمی تەواو کرد. رۆژانە بەمسەرو ئەو سەری دایەرەکانەوە بو. بە هەوڵی دڵسۆزانەی ئەو سەفەرکردنەم هاتە بەردەم..

نزیکەی چل رۆژێك لە تاران مامەوە، کە سێ هەفتەیەکی منداڵەکانیشم لەگەڵ بو، لە ئوتێل پارس دابەزیبوین.

لەو ئوتێلە دوکتۆر فارسیشی لێبو.. ئەویش دەیویست سەفەری شام بکات تا لەوێوە بچێتە مۆسکۆ بۆ چارەسەری نەخۆشیی شەکرە، برادەرێکی حیزبی شیوعی عیراقی لەگەڵ بو، ناوی عادل بو. من لەوەوبەر تەنها مەرحەبای سەرجادەم لەگەڵ دوکتۆردا هەبو. بەلام لە تاران زۆر دڵی بەمن دەکرایەوەو بو بەبرادەرێکی هێندە نزیك کە ئەگەر رۆژێك منی نەدیبایە، زویر دەبوو، دوکتۆر وەختی خۆی پارتی بوو، بەلام لەگەڵ تاقمی هەمزە عەبدوڵلا دابوو، ئەم یەکێك بو لەوانەی کە چووە ناو حشع

- وەو ئیتر بەردەوام لەگەڵیان بو. بەڵام لەو ماوەیەی تاراندا هەرچی دەردە دڵێکی خۆی هەیە بۆمی باس دەکرد، بەڵێنی لێ وەرگرتم کە ئەوانە نهێنییەك بن لای خۆم تا لە چارەسەر دەگەڕێتەوە، ئەوسا دەکەوێتە نوسینەوەیان بە مەبەستی چاپکردن و بڵاوکردنەوە. قسەوباسەکانی دوکتۆر نەك هەر لەسەر هەڵەکانی سەرکردایەتیی ئەو حیزبە بو، بەڵکو گەلێك نهێنیی شەخسیی گەلێك لە لێپرسراوەکانیشی دەگێڕایەوە. زۆر لە من دڵنیابو، من خۆشم لەوە نەدەگەیشتم چۆن وائاسان و بەو ماوە کورتە ئەو دڵنیایانەی لا دروست بو. برادەرەکەی هەستی پێکردبو، بۆیە چەندی بۆ بکرایە بواری نەدەدا بێتە لام. بەڵام دوکتۆر فارس گوێی پێ نەدەداو جاری واش هەبو لێی تورە دەبوو.

کە کارە رەسمیەکان تەواوبون کێشەی بڕینی بلیتی فڕۆکە هاتە پێشەوە. ئەو کاتانە رۆژانی نزیك حەج بو. فڕۆکە بۆ دیمەشق دەستنەدەکەوت. دەبو لە دیمەشقەوە رێگەی نایاسایی ئەو جۆرە سەفەرانە بگیرێتە بەر. دەگوترا دەبێت بلیتی خەتی فرانکفورت- دیمەشق ببڕین نرخەکەی ئەوەش تەواو سێ قاتی نرخی بلیتی تاران- دیمەشق بو. پارەشم ئەوەندە پێنەبو کە بەشی مانەوەیەکی زۆری دیمەشق و بلیت کڕینی دیمەشق- ستۆکهۆڵم بۆ حەوت کەس بکات.

ئەو ماوەیەی ژیانم لە ئوتێل پارس "مامۆستا موحسین" خانەقینیم ناسیو بوین بەدۆست، بۆیە زۆربەی کاتەکان، بەتایبەتی بەشەو، لە ژورەکەی ئەو کە کاروباری کۆمەڵەو پەیوەندییەکانیشی تێدا دەکردو یارمەتیدەری دوکتۆر فوئادیش بو، دادەنیشتم، زۆر دڵم بەقسەخۆشەکانی دەکرایەوە، جگە لەوە، ئاستی هوشیاریی سیاسییو روناکبیریی بەدڵم بو. لەگەڵ ئەوەشدا داوای قەرزم نە لەوو نە لە دوکتۆر فوئاد مەعسوم نەکرد. یەکەم جاریش بو دوکتۆر ببینم و هەرچەند مام جەلال گوتی هەر پێویستییەکت بەو هەبوو پێی بڵێ. بەڵام هەروەك سروشت و رەفتاری خۆم، نەمدەویست لەم ئاوارەیی رۆژی بێ پارەییەمدا راستەوخۆ پەنا بۆ کەس بەرم، بەتایبەتی بۆ ئەو برایانەی کە تازە بەتازە دەبونە دۆست و هاوڕێ. لە ناوزەنگ شازاد هەستی بە ژمارە زۆریی خێزانەکەم و دوریی سەفەرەکەو پێویستیی پارەیەکی زۆری کردبو، بۆیە چەند جارێك هەوڵیدا کە ئەگەر پێویستیم بە پارەبێت قسە بکەم، بەڵام بە پێویست نەبوون وەڵامم دەدایەوە. دوایی لە بەختیارم پرسیی کە ئەوانەی لەو ناوەن کامیان باشە تا قەرزێکی لێ بکەیت. گوتی دلێری سەید مەجید، من دلێرم لەوێ ناسی. بۆیە بە بەختیارم گوت کە سیو پێنج هەزار تمەنێك (ئەو رۆژگارە دۆلارێك بە ٢٤ تمەن بو واتە نزیکەی "١٤٩٠" دۆلارێکی ئەو سەردەم)ی لێ قەرز بکات، لەگەڕانەوەتدا بچۆ بۆ سلێمانی پارە لە باوکم وەربگرە بۆ ئەم قەرزە. ئەویش بێ چەندوچون پارەکەی دابویەو خۆشی هات وگوتی:

> چەندی ترت پێویستە بەسەرچاو. ئەو باس و خواس و دڵ و دەرون کراوەیی‌و قسەخۆشییەی لەویان دەگێڕایەوە بەکەمەوە بیستبوم، ئەم لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بەدڵسۆزو لەخۆبوردو ناوی دەرکردبو. منیش سوپاسم کردو گوتم هەر ئەوەندەم بەسە..

بۆ بلیت کڕین هاتوچۆی بیرۆیەکی سەفەرم دەکرد کە ئێرانی بوو. لەدواییدا ناچار بوم کە مل بدەم بۆ بڕینی بلیتی خەتی تاران- فرانکفۆرت- دیمەشق بەتایبەتی یەکێك لە زەحمەتییەکانمان ئەوەبو کە دەبوو لەو وەختە نائاساییەدا جێگەی هەر حەوتمان هەبێت. بۆ هەمومان دەیکردە (٦٥) هەزار تمەن. ئەو ڕۆژەی کە چوم بۆلای ئەو خانمەی کە ڕۆژانە سەرم دەدا، لەگەڵ بیتاقە بڕین بۆ خەڵکی تر خەریك بو. کە چاوی بەمن کەوت، گوتی چاوەڕوان بە بۆ دوو سبەی، پێدەچێت جێگە لەخەتی ڕاستەوخۆی دیمەشق بۆ هەمووتان هەبێت. ئەوە بۆ من هەواڵێکی دوو سەرە خۆش بوو. بۆ ئەو کاتەی داینابو چوم. مژدەی بونی جێگەی هەموومانی داپێم. بلیتەکەی بۆ بڕیم (دەوری ٢٤ هەزار تمەنێك) بو.

بەرەبەیانی ڕۆژی ١٠- ١٠- ١٩٨١ کە چوارەم ڕۆژی جەژنی قوربانە، شێخ محەممەدی سەرگەڵو دوا زەحمەتییەکانی ئەو سەفەرەمی گرتە ئەستۆو لەگەڵ بەختیاردا هاتن بۆ بەڕێکردنمان بۆ فڕۆکەخانە.

ئیتر دەشبوو بەختیار ئێمە بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە کوردستان، کە ساتەکانی جودابوونەوە دەهاتنە پێشەوە، لەسەرو سیمایدا هەرەسی دنیا بەسەر ئەودا دەبینرا. چونکە ئەم هەر لە منداڵییەوە لە باوك و برای زیاتر هۆگری خۆم و نوسینەکانم بوو، لەگەڵ هەر نوسینێکم، لاپەڕە دوای لاپەڕە لە دەستمی وەردەگرت و دەیخوێندەوە، زۆر لەو پەخشانە شێوە هەڵبەستە سادانەی دەبوونە ئاوێنەیەکی دەردە دڵەکانم، ئەم لەبەری دەکردن، حەزی دەکرد وەك سێبەر لێم جیانەبێتەوە، لەهەموو دەردەسەرییەکاندا، دەستەبەری گواستنەوەی منداڵان و ماڵ و حاڵم بووە، چی بەرەو عیراقی عەرەبی چی بۆ ناو چیاو ئەودیو سنورەکان.

سواری فڕۆکە بوین و لە ئاسمانەوە بەرەو شام کەوتینە ڕێ.

زۆر لە مێژبوو ناوی شامم بیستبوو، هەر لەمێژوی سەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە تا سەدەکانی ناوەڕاست، بەتایبەتی سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبی، ئینجا بۆ سەردەمی نوێ، جێگیربوونی گەلێك لەناودارانی کورد بەتایبەتیی مەولانا خالید.. ئینجا لە ڕۆژگارەکانی دوا پەنجاکان و شۆڕشی کورددا بەدەیان خەڵکانی سیاسیی پەڕەوازە بوو لە وڵات ئەوێ مەڵبەندیان بوو.. زۆرم لامەبەست بوو کە

رۆژێك لە رۆژان سەردانی ئەو شارە بکەم. بەڵام وا ئێستا لەکاتێکدا رێگەم تێی دەکەوێت کە هیلاك و ماندوو، خەمی منداڵەکان و ترسی زۆرمانەوە و بەش نەکردنی پارە، ترسی سەفەرو گێرانەوە.. تاد هەموو هۆش و هوشیارییەکیان بۆ لای خۆیان راکێشاوە.

لە ئوتێلێك دابەزین. دوو شەو لەوێ ماینەوە.. داروٚی شێخ نوری هات بۆ لامان و بەزۆر بردینی بۆ ماڵی خۆیان.. بە "نضال"ی کیژە فەیلی میوانیشمانەوە کە بەهۆی عەبدولرەزاق فەیلییەوە کەوتە تەکمان و ئیتر تا لەشام ماینەوە بو بە یەکێك لە ئەندامی خێزانەکە..

دوو شەویش لەوێ ماینەوە، دارۆ لەگەڵ نەرمین خانی هاوسەری، دڵسۆزو میهرەبانانە میواندارییان کردین و دوای ئەوەش بردیانین بۆ خانوەکەی یەکێتی.

لەماوەی مانەوەمان لە شام دارۆ ئەزییەتێکی زۆری پێوەکێشاین، بەتایبەتیی لە ئاسانکردنی کرینی بلیتی فرۆکەو سەفەرکردندا. ئازادی مستەفا خۆشناویش، هەرچەندە یەکەم جارم بوو بیبینم، دیسان دۆستانە لەگەڵمدا بوو بۆ دیدەنیی هەندێ لەو شوێنانەی کە لەمێژ بو خەوم پێیانەوە دەبینی. ئێمە تەنها یەك جانتای بچوکی دەستیمان پێ بوو. بۆیە ئەو جانتاکەی خۆشی دامێو زۆر سوپاسم کرد.

یەکێك لە ئاواتەکانی ژیانم لە بینینی شام دا جگە لە شوێنەوارە مێژوییەکانی سەردەمی ئەمەوی، بینینی گۆری سەلاحەددینی ئەیوبی بو. لەسەر بەردی گۆرەکەشی نکوڵی لە کوردبونی نەکراوە، هەرچەندە لەوەشدا جۆرێ لە نائاسایی بونی ناوبردنەکە ئاشکرایە. چونکە ناونوسکردنی بە ئەسڵ کورد، بۆ مەبەستی بە عەرەبکردن و عەرەب بونی خۆیەتی.

لە بینینی مەزارەکەیدا سەرجەمیی ئەو مێژوە پر لە قارەمانێتیو تێگەیشتوییو لێزانیینی هونەری جەنگیو لێبوردنی ئەو سەرکردە گەورەیەم دەهاتە بەرچاو. لەم جۆرە حاڵەتانەدا لەگەڵ تێگەیشتنی خەسڵەتەکانی سەردەمەکە، پیاو هەر ئاهێك هەڵدەکێشێت کە بۆچی دەسەڵاتەکەی نەگەیاندە کوردستان، رەنگە ئەو کاتە دەماری رەگەزایەتیی کوردەواریی بجوڵایەو مێژووەکەی ئەو نیشتمانەشی بەبارێکی تردا وەربچەرخاندایە..

بەڵام من لەگەڵ ئەوانەدا نیم کە نکوڵی لە کوردبونی سەلاحەدین دەکەن، لەبەر ئەوەی هیچی بۆ کورد نەکردووە! ئەوانە لەوە ناگەن کە خاسییەتە تایبەتمەندەکانی ئەو سەردەمە، ئەوی راپێچی ئەو مەڵبەندە کردبو. جگە لەوە، لەرووی پێناسەی

کورد، ناسینی ناوی کورد، خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی کە کەسێتییەکی وای تێدا خوڵقاوە، ناوبردنی بە کورد، ئەوانە بۆ خۆیان خزمەتێکی گەورەی کوردن، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ زیارەتی مەزاری حەزرەتی مەولانا خالیدیشم بە ئەرك زانی و چومە خزمەتی.

شام یەکێکە لە شارە جوانەکانی ئەو هەرێمە.. بەڵام شەقامەکانی بەهۆی دەنگی بەرزی گۆرانیی رادیۆو تەسجیلەوە لە گوزەرکردن پێیاندا پیاو تەواو بێزارو هیلاك دەبێت.. بلیتی فڕۆکەمان کڕیی.

رۆژی ٢٢- ١٠- ١٩٨١ بەیانی شەبەق خۆمان گەیاندە فڕۆکەخانەو بێ زەحمەتییەکی زۆر سواری فڕۆکە بوین روەوە ستۆکهۆڵم. یەکێك لە ناخۆشییەکانی رێگە، فڕۆکە وەستان بو لە ئەسیناو سەرخستنی نەفەرێك بو بێ ئەوەی جێگەی هەبێت، کە بووە هۆی شەڕ فرۆشتنی یەکێك لە تاقمی فڕۆکەکە، کە دەیویست جێگەکەی ژوان زەوت بکات بۆ ئەو زەلامە، هەر لەبەر ئەوەی کە تەمەنی پێنج ساڵان بو.. لە بەرلینی رۆژهەڵاتیش توشی گرفتی پاسپۆرت لێسەندن بوین و بە فەلاکەت دەستمان کەوتەوە. سەعات حەوت و چارەکی ئێوارە گەیشتینە سەر ئاسمانی ستۆکهۆڵم و فڕۆکە نیشتەوە.. زۆربە نائارامیی و ترسی گێڕانەوەوە چاوەڕوانی چونە بەردەمی پۆلیسی فڕۆکەخانەکەمان دەکرد.. دوای مانەوەو پرسیارو وەڵام کە شتێ زیاتر لە سەعاتێکی خایاند، لەناو مامەڵەیەکی نەرم و نیان و دەم بەخەندەو زەردەخەنەو پێکەنین کە ئێمەی ئاسودە دەکردەوە. چونکە لەو رۆژگارانەدا، ئەوانەی لە سوریاوە بهاتنایەو پاسپۆرتی عێراقییان پێ بووایە وەرنەدەگیران و یەکسەر دەیانگێڕانەوە. لەبەرئەوە، ئەو زانیاریانەیان وەرگرتبوو کە کورد لە سوریا وەك عێراقییەك ئاسان دەحەوێتەوە. یەکێك لەهۆیەکانی ئەو ئاسان وەرگرتنە، دەقی پرۆتۆکۆلی ئەو کۆبونەوەیەی کاربەدەست و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی رژێمی بەعس بو کە بڕیاری گرتنی ئێمەی تێدا درابو، حەمە سابیر کە لێپرسراوی لقی ئەوروپای یەکێتی‌یە. نوسخەیەك لەو پرۆتۆکۆلە بە تەرجەمەکردنی بە شە گرنگەکەی بۆ سویدی، دەدات بە پۆلیسی فڕۆکەخانە. لە قسەکردن لەگەڵ مندا نوسخەکەی بەردەستیانم بینیی کە ناوەکەی من خەتێکی سوری بەژێردا هێنرابو.

دوای مەرەخەسکردنمان، بێ ئەوەی جانتاو کەل و پەلەکانمان بگەڕێن چوینە دەرەوە کە حەمە سابیرو حەمەچاوشین و عەبە لالەی خوشکەزام چاوەڕوانیان دەکردین و گەیاندینیانە ئۆپسالا بۆ ماڵی حەمە چاوشین..

من چاوەڕوانی ئەوە نەبوم وا ئاسان دوای وردە پرسیاریی ئاسایی لە من و گەلاوێژ، مەرەخەسمان بکەن، چونکە ئەوانە لە دیمەشقەوە گەیشتبوونە

فڕۆکەخانەی سوید و گەڕاندویاننەوە، باسی مامەڵەی خراپی پۆلیسی سویدیان بۆ کردبوین تا ئەو ڕادەیەی کە یەکێکیان گوتی دەرزی بەنجیان لێداوم تا ئاسان سواری فڕۆکەم بکەنەوە. لە دواییدا زانیمان کە ئەو کەسە ئاسان خۆی نەداوە بەدەستەوە بۆیە پۆلیس ئەوەی لەگەڵدا کردووە.

لەناو ئەو مامەڵە مرۆڤدۆستانەیەدا، بۆ هەڵگرتنی جانتاو ڕێ پیشاندانیش، یارمەتییان داین تا گەیشتینە ساڵەی چاوەڕوانیی فڕۆکەخانەکە، ئەوسا چاومان بە: حەمە چاوشین، حەمە سابیرو عەبە لالە کەوت کە چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد.. هەمومان سواری ماشینەکەی حەمە چاوشین بوین و ڕووەو شاری ئۆپسالاو بۆ ماڵی خۆیان کەوتینەڕێ..

کاروانی بێ کۆتایی لێرەدا بەم ژین و زیندانامەیە کۆتایی نایەت. درێژەی گۆشەکانی ژیاننامەی سیاسیی، ئاوارەبون لە نیشتمان، ژیانی پەنابەریی لە سوید، کۆو درێژەی ژیاننامەی سیاسییو لایەنەکانی تری ژیان، کە تێیاندا زیاتر ڕوناکیی ڕەخنەگرانە دەکەوێتە سەر ڕوداوەکانی ناو کاروانی هەردوو شۆڕشی ئەیلول و نوێی کوردستان.. چەند ئەڵقەیەکی تری زنجیرەی کاروانە بێ کۆتاییەکانن، ئەگەر کۆسپ و تەگەرەی ژیان ڕەوتی پرۆژەکانم لێ تێکنەدات، وا لە دەرفەتێکی تردا ڕوناکیی دەبینێت.

## کاتێك دەوڵەت دەبێتە مافیای تیرۆر

چیرۆکی ڕووداوو سەرگوزەشتەکانی ناو ئەزمونی زیندانییو پوختەی هەندێ لایەنی ژیاننامەی سیاسیم، لەژێر سایەو سێبەری دەوڵەتێکدا کە بە ڕواڵەت و لە ناو بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ئەو ناوە سیاسییو جوگرافیی و یاساییەی لێنراوە، سەلمێنەری نائاساییو نایاسایی بوونی ئەو دەوڵەتەیە، ئەوانە بەڵگەی زیندوون بۆ دژایەتیی کردنی هەموو مافێکی سروشتیی مرۆڤ، بۆ دەرچوونی لەهەمو داب و پرنسیپی ژیانی سڤیل و شارستانێتیی، لەدژایەتیی و ڕووبەڕوو بوونی هەموو یاسایەکی نێونەتەوەیی. بۆیە بەهەق و بە بەڵگەو بەکارو کردەوە دەوڵەتێکی تیرۆریستە، تیرۆریستێکە کە بۆتە هەڕەشە بۆ تەفرو توناکردنی میللەتەکەی "خۆی" و گەلانی ناوچەکە. هەر بەوەشەوە نەوەستاوە کە سوپاو پۆلیس و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی دەوڵەت و حیزبەکەی کردووە بە ئامرازی سەرکوتکردن بۆ گەیشتنە مەبەستەکانی، بەڵکو لایەنە یاساییو پەیوەندییە نێو نەتەوەییو هەرێمییو ئابوورییەکانیشی خستۆتە خزمەت ئەو کاری تیرۆرو جینۆسایدەی نەتەوەی کوردو گروپە ئۆپۆزسیۆنەکان و هەموو ئەو مرۆڤانەی کە ڕەخنەی ئاساییو بێ زیانیش دەگرن..

پرۆتۆکۆڵی فڕاندنی بە کۆمەڵی خەڵکی سیڤیلی وەك ئێمە بەهێرشی لە پڕو لەناکاو، لەبەرەبەیانی ڕۆژێکی زۆر پیرۆزی حەجکردن و پێشوازیی کردنی جەژنی قورباندا، لەناو تاریکستانی شەودا، بەهێزیی تایبەتیی سەربازیی مەشق پێکراو بۆ ئەو جۆرە کارانە، تەنها یەك نمونەی ناو هەزاران کاری دڕندەی ئەو ڕژێمەیە. تا کاتی ئەو گرتنە، ئەوە نمونەیەکی گرنگی کاری فڕاندن و ونکردن و ئەشکەنجەدانی ناو شێوەی مامەڵە تیرۆریستانەکەی مافیای ڕژێمی بەعسە..

لە گەیشتنم بۆ سوید و کاتێك حەمە سابیر لێپرسراوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ئەوروپا (کۆتایی١٩٨١) ئەو دەقەی دایە دەستم و خوێندمەوە، ئەوسا فیلمی نهێنییەکانی هۆی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە سەختەکانم هاتەوە بەرچاو و قسەکەی معاونی مودیری ئەمنی عام بۆ کاروباری سیاسیی "عەقید تاریق ئەلعەزاوی" م هاتەوە بیر کە لە دەقیقەکانی سەرەتای گەیشتنمان بۆ ئەمنی عاممە لەسەرەتای یەکەم ڕستەکانیدا بۆ دڵدانەوە، ڕاستەوخۆو بێ پێچ و پەنا پێی گوتین:

"ئێوە بۆ ئەوە نەگیران کە لێرەدا بتانبینینەوەو ئێستا لە ژیاندابن!!

ئێوە وا گیران کە بێ لێکۆڵینەوەو بێ دادگا بکوژرێن...."

بڕیاری گرتنەکە لە کۆبونەوەیەکدا بووە کە لێپرسراوانی هەر هەشت دەزگا حیزبیی‌و سەربازیی‌و پۆلیسیی‌و ئەمنییە جۆر بەجۆرو سەرەکیە داپڵۆسێنەرەکانی بەعس لە سلێمانیدا ئامادەی بون، کە بە ئامۆژگاریی ڕاستەوخۆی سەددام حسەین بووە، لەو کۆبونەوەیەشدا کە لەگەڵ "عزت دوری" دا لە پارێزگاری کەرکوك لە ٢٠-١٠ دا، واتە ڕاستەوخۆ دوو ڕۆژ دوای گرتنەکەی ئێمە کرا، ڕەزامەندیی خۆی لەسەر کۆی ئەو بڕیارانە پیشانداوەو ئامۆژگاریی ئەویشی لەسەر وەرگیرا، هەروەك لە دەقی ئەم بەڵگەنامەیەدا ئامادەیان بۆ کراوە.

ئەو تاوانە بێ بەڵگانە کە لە بڕگەو بڕیارو هۆی گرتنەکەدا دەستنیشان کراون، دژ بەهەموو یاساو دابی دەوڵەتێکی شارستانییە. ئامڕازی گرتنەکە مافیای تیرۆری دەوڵەتێکی کۆلۆنیالیستە کە تەواو وەك پرۆسێسیی داگیرکردنی وڵاتێکە لەلایەن ڕژێمێکی فاشیستەوە!

شێوەی بڕیارو کۆکردنەوەی دەسەڵاتی گرتن و کوشتن و وێرانکردن لە دەستی دەزگا داپڵۆسێنەرەکاندا، نمونەی یاسای بیابان و بەربەرییە. ئەو پرۆتۆکۆلە بۆ خۆی بەڵگەنامەیەکی گرنگە بۆ کاری تیرۆریستانەو کردەوەکانی تری ڕژێم، تا سەردەمی فڕاندنەکەمان. خۆ هەر لەیەکەم ساتەکانی گرتنەکانیشماندا، دەسەڵاتەکانی ڕژێم، بەدایەرەی ئەمنیشەوە کە کارەکەی ئەنجامدابوو، نکولییان لەبوونی ئێمە، لەگرتنی ئێمە، لە ئاگاداریی لە ئێمە کردووە..

باس و سەرگوزەشتەو چیرۆکەکانی ناو هەیئە نمونەی پیادەکردنی کاری تۆقاندن و زەوتکردنی ئازادیی و مافی بەرگریی یاسایی‌و هەبوونی پارێزەرە. بەڵگەی سەپاندنیی ئیرادەی نایاسایی‌و دژ بە مرۆڤە بەسەر خەڵکی سڤیل و بێ تاوان و بێچەك و یەخسیر کراودا. ئەو بەڵگەنامەیەو رەفتارەکانی رژێم ئەوە دەسەلمێنن کە کاتێك دەوڵەت دەبێتە تیرۆریست، دەزگاکانی سوپاو پۆلیس و ئەمن، یاسا، لایەنی ئایدیۆلۆجی، سیاسیی، دیپلۆماسییەت و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەکاتە ئامرازی دەستی بۆ بە دەستهێنانی مەبەست و ئامانجەکانی، ئیتر ترسناکترین کاری تیرۆرستانەی لێدەوەشێتەوە، ژیانی کۆمەڵگەکە دەکرێت بە دۆزەخ، بۆیە کوردستان کراوەتە دۆزەخی راستەقینە بۆ کورد، کە رۆژانە دەیان جۆر کاری تیرۆرو فڕاندن و وێران کردن و تالانیی بە دڕندەترین شێوە لە دژی ئەنجام دەدرێن.

لەو بەڵگەنامەیەدا ناوی ٢٤ زیندانیی لیستکراوە، کە هەمومان لە بەرەبەیانی رۆژی ١٨- ١٠- ١٩٨٠دا گیراین و هەر ئەو رۆژە رەوانەی هەیئەی تەحقیقی خاسە لە کەرکوك کراین. بەڵام دوای یەك هەفتە چوار زیندانیی تریشیان هێنا:

١- مەحمود قەرەداخی.

٢- سەردار حەسەن بەگ.

٣- مەغدیدی کوێخا عەبدولڵا.

٤- سەرداری حاجیی قادر.

ئیتر کۆی هەموو زیندانییەکان، جگە لە شێخ حەسەن و دلێر، کە لە دوای پەنجاو دوو رۆژ لە گرتنەکە ئازاد کران، بیست و شەش کەس بوین و تادوا ساتەکانی زیندانیی‌و گەیشتنەوە سلێمانیی پێکەوە بوین.

ئەمەش وێنەی تایپکراوی:

پرۆتۆکۆلی کۆبونەوەی سەرۆك و لێپرسراوی دام و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی رژێمە لە پارێزگای سلێمانیی کە لە ٩- ١٠- ١٩٨٠ بڕیاری گرتنی بەندەو ئەو سڤیلانەی تری تێدا درا.. هەر بەو جۆرو دەقەی کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان - لقی ئەورویا- لە تەمموزی ١٩٨١ بڵاوی کردەوە لێرەدا دەیبینن. دەقی نوسخە ئەسڵییەکە هەموی دەستخەتەو (ی.ن.ك) بەم جۆرە تایپی کردووە.

سرى وشخصى

مديرية أمن محافظة السليمانية

الشؤون السياسية

العدد:ض ٣ب/٤٨٢٣٢

التأريخ:١٩٨٠/١٠/١٨

الى/ الهيئة التحقيقية في التأميم

م/ارسال موقوفين

بناءًا على المكالمة الهاتفية مع رئيس الهيئة التحقيقية قررت لجنة التنسيق الامنية للمحافظة القاء القبض على العناصر المشتبه بها والمتعاونة مع عناصر التخريب و المبينة أسماؤهم ادنا.. راجين استلامهم وسوف نزودكم بالمعلومات المتوفرة لدينا عنهم بكتاب لاحق..

واعلامنا الاستلام.. رجاء

مقدم الأمن

مدير امن محافظة السليمانية

نسخة منه الى/

مديرية امن منطقة الحكم الذاتى/ راجين التفضل بالاطلاع

القيود السرية/ للتاشير

الاسماء:

١- عمر عزيز محمد

٢- محمد رحيم عبدالرحمن احمد

٣- كمال على محمود

٤- محمد سعيد صالح عبدالله

٥- محمود ملا عزت محمود

٦- عثمان قادر محمد

٧- دلير مصطفى على

٨- نجاة باقر امين

٩- حسن شيخ مصطفى على

١٠- محمد سعيد عبدالرحمن عبدالله

١١- فرج نريمان كريم

١٢- برزان محمد سعيد عبدالرحمن

١٣- جميل على مارف

١٤- عبدالكريم صالح عبدالرحمن

١٥- شوان كريم قادر

١٦- جلال على مارف

١٧- كمال عثمان احمد

١٨- حسين رضا رضا

١٩- محمد حسين معروف الملقب (حمه موبيله)

٢٠- دارا كوخا عبدالله محمد امين

٢١- حكمت عبدالله باشا

٢٢- حسن حسين حمه سور

٢٣- بختيار حامد اسعد

٢٤- احمد حمه امين

محضر اجتماع

المحافظة بتاريخ ٩/١٠/١٩٨٠ فى مقر قوات المنصور

١- الحاضرون:

| | | |
|---|---|---|
| السيد وليد محمود الخشالى | محافظ السليمانية | رئيساً |
| السيد عم ق خ الركن نزار عبدالكريم | قائد قوات المنصور | عضواً |
| السيد عبدالرزاق منزل | امين سر الشعبة المدينة | عضواً |
| السيد فرحان حمادى | امين سر الشعبة العسكرية | عضواً |
| المقدم عبدالقادر صالح | مدير امن السليمانية | عضواً |
| المقدم ريكان عامر حسين | مدير شرطة السليمانية | عضواً |
| المقدم الركن برهان خليل ابراهيم | ض/ امن قوات المنصور | عضواً وامين السر |

١- عام:

اجتمعت اللجنة في مقر عمليات قيادة قوات المنصور بالساعة ١٨٠٠ ليوم ٩/١٠ ورحب السيد رئيس المؤتمر بالحاضرين و اوضح لهم الغرض من دعوتهم وابلغهم توجيهات السيد رئيس الجمهورية والقائد العام للقوات المسلحة المهيب صدام حسين بخصوص ضرورة توفير الامن والاستقرار داخل المحافظة و معالجة ظواهر التخريب بما ينسجم وتوجيهات القيادة السياسية.

٣- الغاية:

وضع خطة امنية مستعجلة لتحديد واجبات الاجهزة الامنية اتجاه نشاط المخربين داخل مركز المحافظة واسلوب التعامل مع المشتبه بهم وذوى المخربين.

٤- المواضيع المطروحة:

أ- اجراء جرد شامل بالمخربين يتناول مايلي:

اولا- العناصر القيادية من مستوى كادر وسطى فما فوق.

ثانيا- عوائل المخربين المتواجدة داخل السليمانية والتركيز على في اولا اعلاه.

ثالثا- الموظفين المتواجدين في دوائر الدولة ولديهم اقارب من المخربين وخاصة (الزوج الاخ- الاخت).

رابعا- العناصر المشتبهه بتعاونها مع المخربين سواء من العائدين للصف الوطني. او الذي لم يكشفوا رسميا لحد الآن.

خامسا- جرد باسماء المخربين الملحقين لفترات متفاوته مع تدقيق عناوين عوائلهم و ذويهم الاخرين.

ب- تحديد واجبات الجهات الامنية بما يضمن تحركها بالشكل السريع وتأمين رد الفعل الايجابي اتجاه تعرض المخربين.

ج- تحديد قواطع المسؤولية للاجهزة الامنية.

٥- واجبات الجهات الامنية:

أ- قوات المنصور. تقوم بفرز جزء عناصرها بواجب الكمائن الخارجية على طرق التسلل والمنافذ المؤدية الى داخل المركز ويخصص لهذا الواجب الدوريات الخاصة لمغاوير قوات المنصور واستخبارات المنصور.

ب- تفرز قوات المنصور الجزء المتبقى من العناصر الاستخبارات بواجب قوة الطواريء يتم تحريكها الى المواقع التي يصعب معالجتها من قبل الاجهزة الامنية (الامن- الشرطة).

ج- تقوم شرطة النجدة بتوزيع دوريتها الداخلية ضمن مركز المحافظة وفي الاماكن المحتملة لتواجد المخربين على ان تقوم بواجب الرصد والتصدى الفورى لكل تعرض تخريبى وضمن منطقة المسؤولية وان تحتفظ باحتياط سيار في قاطع المسؤولية من موجودها الاصلى لغرض اسناد هذه الدوريات عند تعرضها لنيران المخربين ومحاولة معالجة الموقف بنفس القوة الساندة.

د- تخصص مديرية امن السليمانية جزء من قوتها بواجب الدوريات الاتية من المناطق المهمة والمحتملة لتواجد المخربين وتقوم بواجب الرصد والتصدى لهم. على ان تحتفظ باحتياط مركزى سيار له القدرة على تعزيز الدوريات التي تعرضت لنيران المخربين ومعالجة الموقف بنفس القوة الساندة.

٦- قواطع المسؤولية:

لغرض فرض السيطرة على مركز المحافظة دون تداخل القوات فيما بينها قدر الامكان بالجهد المتيسر لدى الاجهزة الامنية تقرر أن يقسم المركز الى قواطع مسؤولية وكما يلي:

أ- مديرية امن السليمانية وشرطة السليمانية:

تكون مسؤولية القاطع المحدد بالمناطق التالية على امن السليمانية وشرطة السليمانية بضمنها النجدة وهي:

اولا- ابراهيم باشا.
ثانيا- شارع اورزدي
ثالثا- محلة توملك
رابعا- داروغا
خامسا- شهيدان
سادسا- آزادى
سابعا- مجيد بيك- كاريزة وشك
ثامناً- عقاري.
تاسعا- دور الامن.
عاشرا- ماموستايان (حى المعلمين).
احد عشر- كانيسكان.
اثنى عشر- ملكندى.
ثالث عشر- محلة السراي والمحافظة.
رابع عشر- صابونكران- الجهة اليسرى.

ب- قوات المنصور:

يكون قاطع المسؤولية لقوات المنصور في المناطق التالية:

اولا- معمل السكر.
ثانيا- حى البكر.
ثالثا- رزكارى.
رابعا- شيخ محى الدين.
خامسا- آبلاغ.
سادسا- جوارباغ.
سابعا- سرشقام.
ثامنا- جولكان (محلة اليهود).

تاسعا- حاجى اوة.

عاشرا- خەبات.

احد عشر- قره جاوى.

اثنى عشر- اصحاب اسبى.

ثلاثة عشر- سركاريز.

اربعة عشر- كويجة.

خمسة عشر- صابونكران- الجهة اليمنى.

ستة عشر- الكمائن على طرق المودية الى مركز المحافظة وحسب تنسب مقر قيادة المنصور.

ج- تعتبر الشوارع التالية كحد فاصل لحدود المسؤولية بين القوات الفقرة (أ،ب) الواردة في اعلاه.

اولا- الشارع العام المبتدء من فلكة سرجنار مرورا بفلكة المحافظة- اورزدى حتى دار الطلبة على اساس ان الجبهة اليمنى على امتداد الشارع من مسؤولية المنصور والجبهة اليسرى من مسؤولية القوات اعلاه.

ثانيا- تعتبر منطقة بكرةجو والشارع المؤدى اليها خارج حدود المسؤولية القوات في (أ) اعلاه.

ثالثا- تعتبر منطقة سرچنار والشارع المؤدى اليها خارج حدود المسؤوليه لقوات الفقرة (ب) اعلاه.

د- جرى ابعاد المناطق في ثانيا وثالثا اعلاه من مسؤولية قوات الطوارىء نظرا لتواجد الشرطة وجزء من القوات العسكرية في سرجنار وبكرةجو وطول المسافة بين مقر القوات والاماكن اعلاه وسعة الزمن المستغرقة.

٧- وصايا عامة لتنفيذ الخطة:

أ- تلتزم الجهات الامنية الواردة ذكرها في اعلاه بما مؤشر ازائها من واجبات.

ب- تعتبر حدود المسؤولية للقوات تحديد رئيسى لتنفيذ الواجب اليومى وتكون معالجة الاخلال بالامن او اطلاق النار الصادر عن المناطق المؤشرة من مسؤولية القوات نفسها وبجهدها الرئيسى.

ج- في حالة تعذر تنفيذ الواجب من قبل احدى الجهات المسؤولة عن معالجة حوادث التخريب يمكن الاستعانه بالقوة الاحتياطية من اى جهة كانت في حالة عدم اشتراكها بواجب اخر بنفس الوقت، لمحاصرة المخربين وتدميرهم وبامر من القوات.

د- تتحدد حركة الجيش الشعبي والمنظمات الحزبية والشرطة المحلية ليلا وعلى الطرق الفرعية وتكون مسؤوليتهم ضمن القواعد والمنشات المخصصة لهم فقط ولا يقبل تنقلهم بشكل مفرد اطلاقا وبصحبتهم سلاح نارى.

هـ- يحق للدوريات وقوات الطوارى اعتراض كل شخص مشتبه به في منطقة المسؤولية وتفتح النار على كل من لايتمثل لاوامرهم.

و- تعالج مصادر النيران في حالة اكتشافها بكل سرعة وحسم دون الرجوع الى المرجع الاعلى المسؤول عن القوة وتعتبر البناية او الجهة التي يصدر منها النار بحكم المخربين.

ز- تتم السيطرة على الافراد في المجموعات وقوة الطوارى من قبل أمرى الدوريات ولا يسمح لفتح النار الا بأمر وعلى هدف واضح.

ح- يحرم تنقل القوات الامنية او الجيش الشعبي او العناصر الرسمية على المحاور والطرف الخارجية المؤدية الى داخل المركز و لاى سبب كان الا بالتنسيق مع استخبارات المنصور ليلاً.

الموضوع/ الوضع الامنى لمدينة السليمانية في ظل الحرب

١- الجانب العسكري:

أ- لايخفى على السادة المسؤولين ان الجهد العسكرى المتيسر حاليا في قاطع مسؤلية قيادة قوات المنصور هو اقل بكثير مما ينبغى وجوده فعلا في القاطع عى ضوء متطلبات الحربى تجاه العدو الايرانى بالاضافة الى المسؤوليات الامنية للفرقة تجاه حركة التخريب لغرض الوقوف على حقيقية الجهد المتيسر لابد من التطرف الى توزيع القوات العسكرية سابقا وحاليا.

اولا:كانت مسؤولية قوات المنصور تتحدد من دربندخان- حلبجه جنوبا حتى ماوت شمالا و لجهة ١٣٦ كم تقريبا (شريط حدودي).

ثانيا: اصبحت مسؤولية الفرقة حاليا من دربندخان جنوبا حتى حاج عمران شمالا مرورا ببنجوين- قلعةدزه وبجبهة تزيد على ٢٥٠ كم (شريط حدودى) ناهيك عن العمق التعبوى من الحدود وحتى مراكز المحافظات سليمانية- كركوك (اربيل خارج).

ب- توزيع القوات الرئيسية قبل الحرب وبعد الحرب:

اولا:قبل الحرب.

(١)ل لمش ٣٨ قاطع حلبجه

(٢)ل لمش ٣٩ قاطع جوارتا- ماوت

(٣)ل لمش ١٩ قاطع سوسة- دوكان

(٤)ل لمش ١١١ قاطع نال باريز- بنجوين

(٥)قاطع قرەداغ مقر ل٩١+ف٢

(٦)فوج حامية دربندخان

(٧)فوج حامية دوكان
(٨)قوات مغاوير فق ٧ احتياط في السليمانية بقوة (١٠) سرايا.
ثانيا:بعد الحرب.
(١)ل لمش ٣٨ في بنجوين- على محور بنجوين- مەريوان الايرانيه
(٢)ل لمش ١٩ في قلعه دزه - سردشت الايرانيه
في قاطع حلبجه- سيدصادق وينحصر نشاطهم بالوقت الحاضرين في قاطع قلعه دزه- حاج عمران.
ثالثا: التنظيم السرى داخل مركز المحافظة:
من البديهات الواضحه لدينا من خلال متابعه نشاط المخربين وعلى مختلف الفترات الماضيه. نجد ان تواجدهم المسلح داخل المحافظة لا يعتمد على تسلل المفارز العاملة في خارج المركز فقط بل يبرز ويتعزز من خلال الاوكار التنظيمية الداخلية التي اصبحت في السنة الحالية محاطه بسياج وقائي ذاتى قد يصعب النفاذ له لعدة اسباب سنتطرق اليها فيما بعد تؤمن لهذا التواجد الغطاء اللازم للتحرك التخريبى في التوقيت والمكان ووفق خطة مرسومه.
رابعا:الاسباب التي تحدد الاجهزة من كشف التنظيم الداخلى:
(١)عدم تعاون المواطنين مع الاجهزة الامنية سواء من الاخبار او الدلالة او الامتناع عن مساعدة المخربين.
(٢)تعاون المواطنين مع المخربين طوعاً او خوفاً في تقديم المعلومات عن تحرك الاجهزة او المتعاونين معها والى درجة التضاد.
(٣)تعدد الاجهزة الامنية وتنوع مصادر المعلومات و مرورها بسلسلة روتينيه طويلة يؤدى الى ضياع المعلومات المفيدة التي تتطلب معالجة من احدى الجهات المسؤولة او المختصة فقط. بالاضافة الى احتمال ازدواجية الوكلاء او تفاهتهم او تنقلهم بين الاجهزة وتضليلها يؤدى الى استفادة تنظيمات المخربين من هذه الثغرة و توجيه الاجهزة وفق غايتهم.
(٤)صدور قرارات العفو واخرها قرار مجلس قيادة الثورة ٧٩/٨/١٦ كان له تأثير واضح على حركة التنظيم الداخلي في السليمانية بعد المحاولات الايجابية التي قامت بها الاجهزة خلال عام ١٩٧٩ للقضاء لمثل هذا التنظيم وتفتيته وقد عاد معظم الذين اطلق سراحهم بعد ٧٩/٨/١٦ الى ممارسة جرائمهم الدنيئة والتحقوا ثانية بالمفارز الخارجية للمخربين.
(٥)بطء الاجهزة الحزبية والادارية في ابداء الايجابية للاجهزة الامنية واعتمادهم على حركة تلك الاجهزة و رصد سلبياتها فقط.

(٦)على ضوء ما تقدم في (٤) اعلاه تمكن المخربين وقياداتهم الرئيسية من تشخيص اساليب اشتغال الاجهزة الامنية وافرادها واساليب التحقيق والوسائل المعتمدة في كشفهم مما اعطاهم درسا جيدا في كسب عناصرهم وتثقيفها على اساليب الكسب للمؤيدين واساليب الاعتراف في حالة وقوعهم بقبضة السلطة الوطنية.

(٧)تخوف المواطنين والمتعاونين مع السلطة من الاستمرار بالتعاون نتيجة كشف البعض منهم وتعرضهم للقتل و الاختطاف وخاصة للفترة التي تواجد فيها المجرمين المطلق سراحهم بعد قرار العفو ٩٧٩/٨/١٦ او الذين نفذت بهم احكام الاعدام واستطاعوا ان يسربوا المعلومات عن الاشخاص الذين اخبروا عنهم او شهدوا ضدهم او قدموا المعاونة للسلطة في كشفهم.

(٨)عجز قسم من الاجهزة لم يسكن معظمها عن تأمين الحماية للمتعاون والمؤتمن سواء بتنفيذ الوعود قبل واثناء اشتغاله او هجرة او اهماله بعد تحقيق الغرض منه. ادى الى جمودهم او هروبهم من المنطقة حفظا لحياتهم.

(٩)الحجب للمعلومات لدى قسم من الاجهزة او الاشخاص اما خوفا او عدم شعور بالمسؤولية يؤدى الى ضياع المعلومات و بالنتيجة يكون انتعاش نشاط المخربين.

ثالثا- التنسيق مع المخربين للحصول على موطىء قدم لحركة مقبلة:

ان دفع مفارز التخريب وخاصة جماعة (ق م) يعطينا موشر بان نوايا العدو الايرانى هو العمل للحصول على حالة من عدم التوازن في الجانب العراقي في الشريط الحدودى تهيء له الظرف المناسب لدفع قطعاته باتجاه احد المحاور وقد يكون سردشت- قلعه دزه. اوخانه- حاج عمران او في قطاع بنجوين تؤمن له سيطرة على جزء من الاراضي لغرض رفع معنوية قطعاته وامنائه بطريقة المساومة التي تؤمن له ماء الوجه الذي افتقده في الجبهة الشرقية من عراقنا. ولهذا نجده ان ضرباته الجوية تكثف بشكل مركز على قاطع حاج عمران- جومان و بالدرجة الثانيه قلعه دزة- و بنجوين.

رابعا- زعزعة ثقة المواطنين بالسلطة الوطنية وتجنيد وكسب الاكراد في السليمانية:

في بداية توسع رقعه الحرب مع العدو الايراني وقيام الطيران المعادى بقصف الاهداف المدنية داخل القطر العراقي ظهرت اشاعة مفادها ان (السليمانية سوف لن تقصف لان المجرم جلال الطالبانى قد اتفق مع الخمينى على ذلك) وهذا يقودنا الى اشكالين لهذه الاشاعة:

١- ان المجرم جلال يحاول كسب المواطنين الاكراد في السليمانية الى جانبه و بشعرهم بان الحرب هي لاتعني الشعب الكردي وانه ليس المقصود بها و كذلك

تعزيز القناعة لديهم بان حركة الاتحاد الوطني قادره على حمايته وتأمين عامل الامن والاستقرار.

٢- زعزعة الثقة لدى المواطنين تجاه السلطة التي اصبحت غير قادرة على حمايتهم ورده القصف المعادى عنهم. وقد يكون ذلك يعتمد من السلطة لقصف السليمانية او ان العدو يحاول ان يثبت لهم ان السلطة عاجزه عن الرد عليهم.

٣- دفع المواطنين علي دعم واسناد المخربين او الالتحاق بهم خلال هذه الفترة نتيجة ظهورهم او تواجدهم كقوة بارزة و مؤثرة تتحرك ضد السلطة وقد اتيحت لهم الفرصة للتغير عن وجودها و بالتالى فرض شروطها على الحكومة الوطنية في ايقاف حركتها والعمل لجانب الحكومة تجاه العدو الايراني.

٤- هناك احتمال اخر يظهر لنا تعبويا هو نتيجة ضعف الدفاع الجوي في القطاع ضمن حدود المحافظة جعل الجانب الايراني يستمر بقصفه للمحافظة وقصباتها على اعتبار ان خسائره ستكون اقل من خسائرنا لذا تدفع الى العمق العراقي.

٢- اجراءات التصدى لحالة التخريب:

أ- على ضوء الواقع الذي كانت تعيشه المحافظة (المركز) قبل بدء الحرب جرى اعداد خطة امنية شاملة تؤمن الاجراءات المناسة لمكافحة التخريب حول مركز المحافظة وداخلها. وقد رفعت تلك الخطة الى المراجع العليا للاطلاع عليها واقرارها. و من الامور التي تم تثبيتها في الخطة اعلاه هو درج بعض المستلزمات التي يتطلب تنفيذها لتسهيل مهمة الاجهزة الامنية في تنفيذ الخطة اعلاه. علما ان الخطة اعدت لمعالجة حالة التخريب في ظروف اشبه ماتكون بالاعتيادية و بكامل امكانيات الاجهزة العسكرية الامنية.

ب- على اثر نشوب الحرب بين العراق والعدو الايرانى وانفتاح قطعات قوات المنصور لواجبتها القتالية في قاطع المسؤولية ازداد نشاط المخربين وتعرضت مفارزهم الى حدود المحافظة وبعض الاحيان داخلها. تطلب الامر ان يعاد النظر في الخطة الموضوعة في (أ)اعلاه وتعد خطة استثنائية ينسجم محتواها مع طبيعة الظرف الذي تمر به المحافظة ضمن الظرف العام الذي يعيشه القطر. وبناء على ذلك تم اعداد خطة امنية استثنائية رفعت الى مجلس قيادة الثورة، لجنة شؤون الشمال بموجب كتابنا وقد تناولت هذه الخطة ظاهرة زيادة نشاط المخربين وكيفية معالجتهم.

ج- تم تقسيم اجراءات المعالجة الى صفحات اهلتها الضرورة الميدانية للتحرك على المخربين وضمن تطورات المسؤولين في المحافظة فقد تناولت مايلي:

اولا- الصفحة الاولى:

تم فيها تشخيص ورصد العناصر المخربة والمشتبه بها وتدقيق عناوينهم وتحركهم وتنظيم وجود شامل بهم. وقد تم ذلك فعلا وآشر لدى الجبهات الامنية.

ثالثا- الصفحة الثانية:

اعتقال الاشخاص المشتبهه بهم والذين لديهم تحرك مسبق وتوجد علامات واضحة على تحركهم المضاد بالوقت الحاضر وضمن تحديد معين (وقد كان العدد الملقى القبض عليه بحدود ٢٥ فرد)

ثالثا- الصفحة الثالثة:

اعتقال وحجز عوائل المخربين من الكادر القيادى والوسطى وتسفيرهم الى كركوك كوسيلة حفظ على المخربين. وبنفس الوقت الاستمرار بحجز عوائل كل من يقوم بالاعتداء على المواطنين او عناصر الاجهزة التنفيذية في المحافظة للتأثير على نفسية وسلوك المخرب.

رابعا- الصفحة الرابعة:

نقل او فصل او اعتقال اخوة وذريات واباء او ابناء المخربين العاملين في اجهزة الدولة لحرمان من الامداد المادى والمعنوى له ولعائلته. وقد جرى تشخيص هؤلاء من قبل الاجهزة المسؤولة.

د- تضمن اسلوب تنفيذ الخطة الاستثنائية المشار اليها. تقسيم المراكز اى قواطع مسؤولية وزعت على الاجهزة الامنية وكما مؤشر في المادة (٥) و (٦) من الخطة. يجرى على ضوئها اخراج المكائن والدوريات راكبة راجلة.

وهذه الاجراءات في قناعتنا هي اشبه ماتكون دفاعية (ووقائية) على ضوء المتيسر من الجسد البشرى لدينا.

٤- التوجيهات المطلوبة على ضوء مؤتمر السيد نائب رئيس مجلس قيادة الثورة ليوم ١٠/٢٠:

اثناء اللقاء الذي جرى مع السيد نائب رئيس مجلس قيادة الثورة الرفيق عزت الدورى في صباح يوم ١٠/٢٠ في محافظة كركوك جرى مناقشة الخطة الاستثنائية للجنة الامنية لمحافظة السليمانية وقد جرى توضيح اسلوب تنفيذ الصفحات المطلوبة في التصدى و مكافحة المخربين والاجراءات الوقائية لمنع التخريب داخل مركز المحافظة محورها العام عدم اعطاء خسائرهم وتحجيم حركة المخربين وقد توضح لدينا على ضوء التوجيهات المطروحة في اللقاء اعلاه الخط العام المطلوب السير عليه في اجراءات التصدى للتخريب والقضاء عليها. وهذا مما يتطلب تأمين واتخاذ بعض الاجراءات والمستلزمات التي تسهل حركة الاجهزة وتمكنها من الرد بقوة وايجابية وعلى هذا الاساس تبرز لدينا التساؤلات التالية:

أ- هل المطلوب الاستمرار على نفس التدريج في تقسيم صفحات العمل تجاه المخربين في الداخل ام تدمج جميعها في صفحة واحدة او صفحتين؟

ب- هل للارقام تاثير معين على تحرك الاجهزة وتنفيذ الخطة ام ان التحديد مرفوع مادامت الادلة او القناعة متوفرة ضد المشتبه بهم؟

ج- قد ينتج عن تنفيذ الاجراءات اعلاه والاندفاع فيها مضاعفات قد تؤثر على الوضع العام في المحافظة من حيث سعة التخريب وحجمه. وهذا يتطلب اجراء الحسابات الميدانية لمواجهة مثل هذه الحالة وعدم تحميل الاجهزة النتائج السلبية لتصرفها المشروع على ضوء التوجيهات اعلاه.

د- اذا كان المطلوب القضاء على حركة التخريب واستئصال جذورها من مركز المحافظة او القصبات المحيطة بها ستكون هنالك متطلبات وتبرز جوانب قد لايساعد الموقف العام على تأمينها او قبولها (كتوفير القوات- زيادة حجم المخربين- زيادة فعالية المخربين في المدن والقصبات وعلى خطوط المواصلات).

هـ- تم تنفيذ المطلوب في الصفحة الاولى والثانية من الخطة اعلاه وجرى اعتقال ٢٥ فرد مشتبه بهم جارى التحقيق معهم من قبل الهيئة التحقيقية الخاصة ولا زلنا بصدد تنفيذ الصفحات الاخرى.

٤- المطلوب توفره لمعالجة التخريب:

في حالة الاقرار بالعمل على ضوء ما ورد في التساؤلات التي وردت في المادة (٣) اعلاه يتطلب تأمين وملاحظة النقاط التي سيرد ذكرها ادناه.

أ- توفير القوات العسكرية المهيئة لواجبات الكمائن و الدوريات وبحجم لايقل ٦ سرايا مغاوير تستخدم لتنفيذ الكمائن على طرق التسلل المؤدية الى مركز المحافظة وتأمين طوق محكم حول منافذها بالاضافة الى القيام بالدوريات الراكبة والراجلة والنقاط الثابتة على المنشأت الحيوية.

ب- تعزيز اجهزة الشرطة والامن في المحافظة بما لايقل عن ١٠٠ فرد مع ٥ ضباط امن الى مديرية امن السليمانية و ١٠٠ شرطى مع ١٠ ضباط شرطة الى مديرية شرطة السليمانية ومن النوعية الجيدة والمشهود لها بالوفاء والاخلاص للحزب والثورة.

ج- اعطاء الحرية الكاملة في التصرف والقرار للجهة الامنية في المحافظة ولكافة الاجهزة التنفيذية المعنية بالخطة في كيفية التصدى للمخربين والقضاء عليهم بما فيها الاعتقال والحجز وحتى التصفية الجسدية والتعرض على الدور والبنايات التى تسهل تنفيذ اعتداءات المخربين تجاه المواطنين بالسلطة.

د- تخويل قوات المنصور والاجهزة الامنية بفتح النيران بما فيها (المدفعية والطائرات) تجاه القرى التي تفتح منها النيران او تقوم بالتستر او الاخفاء للمخربين ومساعدتهم او ايواء عوائلهم هروبا من تسليمهم للسلطة الوطنية او البحث عنهم.

هـ- تأمين المعدات الفنية التي تؤمن قابلية حركة وتصدى جيده وتشمل مايلي:

اولاً- سيارات ركوب وحمل مختلفة (بيك اب- صالون- حمل) يحدد عددها على ضوء الحاجة والقوات المستخدمة.

ثانياً- اجهزة اتصال متقدمة و يفضل تأمين اجهزة هوكى توكى نوع (SRA) المستخدم من قبل دوائر الامن العامة بحدود ٣٠ جهازاً مع كامل معداتها الفنية لاشتغالها بشبكة مستقلة او شبكة متنقلة على سيطرة الامن.

ثالثا- تأمين تجهيزات الوقاية الشخصية التي تستخدم من قبل الاجهزة الامنية في مكافحة الارهاب داخل المدن والقصبات.

رابعا- تعديل ملاكات التسليح وجعلها ملاكات وقتية لدى الاجهزة استخبارات قوات المنصور على ان تشمل تجهيزها بهاونات خفيفة- قاذفات- بنادق مسيلة للدموع- رشاشات خفيفة يحدد استخدامها وبالعدد الذى يحدد على ضوء الحاجة- مسدسات كاتمه.

ط. [illegible] السليمانية [illegible] المراقبة [illegible]
[illegible] داخل المنطقة [illegible] علاقة [illegible] المسؤولية المحددة في
اعلاه. وتعتبر مصادر رصد ومراقبة ودلالة سيارة يستفاد
منها في توجيه ودلالة قوات الاسناد من قوات الطوارئ المخصصة
لمعالجة المخربين في مختلف المناطق وتراجع المسؤولية المحددة.
ي. تعتبر الخطة الواردة في اعلاه خطة استثنائية لغرض معالجة حوادث
التخريب في الظروف الحربية الحالية

السيد [illegible] حمادي / أمين سر الشعبة العسكرية / عضواً
العميد الركن زاهد عبد الكريم [illegible] / قائد قوات المنصور / عضواً
السيد عبد الرزاق [illegible] / أمين سر الشعبة [illegible] / عضواً
السيد وليد محمود [illegible] / محافظ السليمانية / رئيساً

المقدم الركن [illegible] ابراهيم / [illegible] قوات المنصور
العقيد [illegible] / مدير شرطة السليمانية / عضواً
المقدم عبد القادر [illegible] / مدير أمن السليمانية / عضواً

---

ملاحظة:

تقرير عن الاجتماع الذي عقد بتأريخ ٨٠/١٠/٩

بين مسؤولي السلطة الحاكمة في محافظة السليمانية والذي رفعت الى الجبهات العليا في السلطة، والذي استطاع الاتحاد الوطني الكردستانى الحصول عليها (وبالنسخة الاصلية) ولكون التقرير المكتوب غير واضح لانها مكتوبة بخط اليد لذا اخذنا على عاتقنا طبعها بالآلة الكاتبة لتوضيحها للرأى العام.

الاتحاد الوطني الكوردستاني
-فرع اوروبا-
٩٨١/٧/٢٨

## پێش کۆتایی:
## هەندێ تێبینییو سەرنج

لە گێڕانەوەی روداوو چیرۆکەکانی ئەزمونی کاروانی بێ کۆتایی، چی لە زیندانەکانی رژێم لە سلێمانی و کەرکوك و لە بەغدا یان لە کورتە باسەکانی ناو ژیاننامەی سیاسیی:

- تا توانیومە، هەوڵم داوە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەو قسەو پرسیارو وەڵام و گێڕانەوەی روداوەکانی ناو زیندانەکان و هی ناو کاروانی رابوردو.. تاد چۆن بون و چۆن رویانداوە وەك خۆیان بیانگوێزمەوە سەر کاغەز بەڵام بەجۆرە داڕشتنێکەوە کە پرنسیپ و شێوەی ئەم جۆرە باسانەو رێکخستنیان لە دوو توێی بەرهەمێکدا دەیانخوازن..

- ئاوڕدانەوەکانم لە کورتەی گۆشەیەکی ژیاننامەی سیاسییم و لەو روداوانەی ناو کاروانی خەبات، لەسەردەمە جیاجیاکاندا، زیاتر بەستراوەی پرسیارەکانی رەئیسی هەیئەو لێکۆڵەرەکانن، گرێدراوی ئەو روداوانەن کە چەند ئەڵقەیەکی یەك زنجیرە باسن. بۆیە هەر لەو سنورەو بەکورت و پوختیی بەسەرکراونەتەوە. تەنها کورتەی نیمچە بیۆگرافییەکی گۆشەو لایەنێکی ژیانی سیاسییو هەندێ لە روداوی بەشێك لە کاروانی خەباتە تا رۆژی گرتنەکەم، بۆیە لە زۆر شوێندا کورت و چڕ کراونەتەوە، زۆری تر بەسەر نەکراونەتەوە.

ئەگەر رۆژگار مۆڵەت بدات وا لە دەرفەتێکی تردا درێژەی باسەکان لە ژیاننامەیەکی سەرجەمیدا روناکییان دەخەمە سەرو بە چاپیان دەگەیەنم.

- هەموو ئەو شەهیدو خوالێخۆشبوو ئەو برایانەی لەسەرگوزەشتەکانی ئەو ئەزمونەو ئەم ژیاننامەیەدا بەناوی ئاسایی خۆیانەوە ناوبراون، بۆ ئەوەیە:

> تا شەهیدو وەفاتکردووەکان وەك زیندووەکان بەسەر بکرێنەوەو لەخۆمانیان جیانەکەینەوە.

> تا بتوانرێت ئاسان و بێ جیاوازیی ناوەکان، سادەو رەوان بکەونە سەر زارو ناو رستەی باس و سەرگوزەشتەی روداوەکانەوە. ئەگینا ئەو برایانە مامۆستاو هاوڕێو برای بەوەفاو دڵسۆزن برایانی ئەو کاروانی مەرگەش هەرگیز لە یاد ناچن کە لە کاتە پێویستەکاندا لە قسەم دەرنەدەچون، ماوەی زیندانیی سەرەتاو کۆتایی، ئازاو دڵسۆزو نیشتمان پەروەرانە بەسەریان برد، ئەم چیرۆکانە، ئەزمونی هەر یەکێکیانە، ئەزمونی ئەو تێکۆشەرە ونبووانەن کە بڕوام وایە لە ئێمە زیاترو توندو تیژ تر مامەڵە کراون درندایەتییان بەرامبەر کراوە بۆیە نابێت بەونناو بمێننەوە..

> تا لەم جۆرە نوسین و باس و خواسانەدا ئەو جیاوازییانە لەناو بردن و ناوهێناندا نەهێلرێن، بەتایبەتیی ئەوانەی کە هۆکانیی دەگێردرێنەوە بۆ پلەوپایەی سیاسیی‌و کۆمەلایەتیی، دەستیاویی لە هەندێك لایەن و بواری نووسین و ژیاندا، چونکە هەندێ جار میزاجیی تایبەتیی نوسەر لەکاتی نوسین و ناوهاتنە پێشەوەدا، کە بەلانسیی لایەنە جۆربەجۆرەکانی لێ ئالۆز دەبێت، و لەناو وشەو رستەدا حەزەکانی خۆی، دروست بن یان نادروست، لە گێڕانەوەکاندا زاڵ دەکات. بێگومان ئەمەنیش هۆیەکی جۆری ناوبردنەکەیە کە ئەمییان لە دابی کوردەواریدا لەبارو گونجاوە، هەرچەندە لە جیهانی شارستانییەت و پێشکەوتوودا ئەمەش خراوەتە لاوە.

- قسەکردن لەسەر ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە لە هاوڕێیانی زیندانیم، بەپێی ئەو زانیاریانەن کە لە زەینمدا تۆمار کراون. تەنها ئەو ماوانەش دەگرێتەوە کە دەوروبەری دوو هەفتەی سەرەتا لە ژوری ژمارە یەکدا، هەمومان پێکەوە بوین، هەروەها بۆ ئەو هەشت نۆ کەسەی تر کە دوای جیاکردنەوە هەر لەو ژورەدا لەگەڵ زیندانیی تر پێکەوە ماینەوە، تا جیاکردنەوەم بۆ تاکزیندانیی کە نزیکەی یەك مانگی تری خایاند.. بێگومانە کە زۆر روداوی تریش دوور لە سەرنج و وشیاریی‌و ئاگاداریی من بوون، رەنگە ئاگاداری زۆر روداوی تر نەبوبم یان ژیانی پڕ لە زەحمەتیی و ئەشکەنجەی هەندێکیان بە ئالۆزی لە مێشکمدا تۆمار بوبن یان لەیادم نەمابن. بۆیە باس نەکردنی ئەو زیندانیانەی ناویان لێرەدا نەبراوە بەهیچ جۆرێك لە ئەشکەنجەی دەرونیی و ژیانی سەخت و بێزراوی ناو ئەو مەرگخانەیە کەم ناکەنەوە. وێڕای ئەوانە لەدوای جیابونەوەکان من ئاگاداری برادەرەکانم نەمام و نەمدەزانی تاچی ئاستێك لەسەر لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدانیان بەردەوام بون و چییان لێ بەسەر هاتووە.

- ئەگەر کرۆنۆلۆجیی ئەو باس و روداوانەی ناو چیرۆکەکان، چی ئەوانەی لەمەڕ خۆم و چی هی ئەو برادەرانەی باسیان کراوە، رۆژو کاتی روداوەکان کەمە جێگۆڕکێ و ئالوگۆڕیان تیا کرابێت، وا ئەوەش هەر بەهۆی دورو درێژیی ماوەکەو بەردەوامیی ئەشکەنجەو سەختیی بارودۆخەکەو بیرو خەیاڵە پەرش و بڵاوەکانەوەیە، کە هەندێك جار دەکەوتنە ناو تەمومژەوە. جاری وا هەبووە تەواو لەناو روداوەکەدا ژیاوم، ئیتر وردەکارییەکان تۆماربون. جاری تر هەبووە کەمتر، یان بە بیستن یان دوور بەدوور ئاگاداریان بوم و رەنگە لەناو گوزەرانەکەدا تێهەڵکێشییان تێدا دروست بوبێت.

- پرسیارو وەڵامەکان، لە ئەمنی سلێمانی، لە هەیئە لەبەردەم رەئیس و لێکۆڵەرو جەللادو حەرەسەکان، لە ئەمنی عاممە لەگەڵ لێپرسراوو کارمەندەکانی ئەو دەزگایە،

بەزمانی عەرەبی بون. بۆ ئەو کەسانەش کە عەرەبییان نەدەزانی یان نەیاندەتوانیی بە باشی قسەی پێ بکەن، وا وەرگێڕیان بۆ دادەنان، زیاتر نایب ئەفسەرێکی کورد کە وا دیار بو کەرکوکیی یان خەڵکی دەوروبەری کەرکوك بو ئەو دەورەی دەبینی.

- جار جار وابیرم دەکردەوە کە قسەی سیخوڕو روخاوەکان، میوانەکانی ناو تاکزیندانییەکان هەر بەو شێوەی خۆیان بن چی لە روی شێوەی ناوچەیی‌و دیالێکتیانەوەو چیی لەڕوی سادەیی لەزمانی قسەو ئاخاوتندا، ئەوەش رای دەکێشام بۆ ئەوە کە دەبێت قسەی لێکۆڵەرو حەرەس و جەللادەکانیش هەر بەو شێوەیە بن، لەمەشدا گرفتی دوو زمانیی و چەند شێوەی داڕشتن دەهاتە ئاراوە، ئەمەش دەبووە هۆی تێکدانی تام و چێژی شێوەی باسەکان لەڕوی ئەدەبییەوە.. بۆیە وام بە باشتر زانیی کە هەر پرنسیپیی نوسینیی ئاسایی لە داڕشتنی باس و روداوەکاندا پێڕەو بکەم.

- لەناو نوسکردنی دام و دەزگاو لێپرسراوانی رژێمدا زۆر جار هەر ناوە ڕەزا گرانە عەرەبییەکانم بەکارهێناوە، بۆ نمونە: هەیئە: دەزگا یان دامەزراو. هەیئەی تەحقیقیی خاسە: دەزگای لێکۆڵینەوەی تایبەتی. رەئیس: سەرەك یان سەرۆك. ئەمن: ئاسایش. نایب: جێگر. حەرەس: پاسەوان. عەسکەر: سەرباز. جەللاد: ئەشکەنجەدەر (بەپێی ماناو بەکارهێنانە گشتییەکەی). ئەمنی عاممە: ئاسایشی گشتیی، مودیر: بەڕێوەبەر. نەفی: دورخستنەوە. ئیعدام: سێدارە.. تاد

- جنێوەکانی جەللادو حەرەس و لێکۆڵەرەکان هێندە ناشیرین و بێزراو و نەبیستراو بون، کە وایان لێکردم خۆم لە نوسینیان لابدەم، جگە لە جنێوە سادە بیستراوەکان و ئەوانەی کە تێگەیشتەیەکی سیاسییان هەیە، یان جاروبار شێوەی گێڕانەوەی قسە و ئاراستەکردنی پرسیارەکان نوسینیان دەسەپێنێت..

نووسەر:

- لە ساڵی ١٩٣٩دا لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، هەر لەوێ قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی، وە لە زانکۆی بەغدا زانستگای پەروەردە- بەشی مێژوی تەواو کردوە و(BA) بەکالوریوسی وەرگرتووە. لە ساڵی ١٩٦٢ بووە بە مامۆستای مێژوو.
- لە سلێمانی و لە سەردەمە جیاجیاکانی نەفیکردنیدا بەهۆی چالاکی سیاسییەوە، لە: نەجەف، کەربەلا، عەمارە، بەغدا و رومادی، بابەتی مێژوویی و کۆمەڵناسی لە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەییەکان وتۆتەوە، یان بەڕێوەبەری ناوەندی یا ئامادەیی، یان یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردە و لێپرسراو لە کاروباری قوتابخانە سەرەتاییەکان بووە لە پارێزگای سلێمانی.
- لە گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤار و بڵاوکراوەی ئاشکراو نهێنیدا هاوبەشی کردووە.
- هەر لە سەرەتای لاوێتیەوە، لە کۆتایی پەنجاکانەوە، هاوبەشی بزووتنەوەی نیشتمانیی و خەباتی سیاسی و ڕێکخراوەیی، چالاکیی (یەکێتی قوتابیان و مامۆستایان) ی کوردستانی کردووە و لە ئاست و پلەی جۆربەجۆردا تا دەگاتە ئەندامێتی کۆمیتەی ناوەندیی، یا سکرتاریەتی ئەو دوو یەکێتیە. ئینجا لە چیاو ناوچەی رزگارکراو، لە نەفیگەو ئاوارەیی بە تێکۆشانی نهێنی و ژێرزەمینی لە ناو زیندانەکانی رژێمی داگیرکەر لە (الهيئة التحقيقية الخاصة) لە کەرکوك و ئەمنی عاممە لە بەغدا یان لە پەناهەندەیی و ژیانی دور لە نیشتمان درێژەی بە تێکۆشانی خۆی داوە. لە ململانێ و لە هەڵەو وەرچەرخاندنی سیاسی و دووبەرەکیدا بە پێی بەرژەوەندی بەرزی نەتەوەی کوردو سودی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، هەڵوێستی وەرگرتووە ئەگەر پێچەوانەی ڕاوبۆچوون و هەڵوێستی ڕێکخراوەکەی خۆشی بووبێت. هەر لەو مەڵبەندەشەوە بیروبۆچوون و هەڵوێستەکانی لە سەرجەمی نووسین و بەرهەمی بڵاوکراوەو چالاکیە جۆراوجۆرەکانی سەرچاوەیان هەڵگرتووە و ئیلهامیان وەرگرتووە.
- لە ساڵی ١٩٨٧ ەوە لە ئەرشیفی هەرێمی ئۆپسالا "Arkivassestent" بە Landsarkivet دامەزراوە.
- نووسەر ئەندامی یەکێتی نوسەرانی سویدە.

# لەبەرهەمە بڵاوکراوەکانی نوسەر

**١- نوسین و دانراو:**

- دیپلۆماسیێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی، سلێمانی ١٩٧٣
- کۆماری میللی مەهاباد:

*چاپی یەکەم؛ کوردستان ١٩٨٤ (یەکێتیی نوسەرانی کوردستان بەچاپیگەیاندو بڵاویکردەوە).

*چاپی دووەم؛ ستۆکهۆڵم ١٩٨٦.

- رەگ و ریشەی مێژوی تەقەلای بەعیراقیکردنی کوردو مەسەلەی کوردستان. سوید ١٩٨٧.
- کوردو ململانێو ستراتیجی ئاسایشی نەتەوە، کوردستان- ١٩٨٨ (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان چاپی کردو بڵاوی کردەوە).
- دەوڵەتی جمهوری کوردستان- نامەو دۆکومێنت- بەرگی یەکەم، ستۆکهۆڵم- ١٩٩٢
- دەوڵەتی جمهوری کوردستان- نامەو دۆکومێنت- بەرگی دووەم، ستۆکهۆڵم- ١٩٩٥
- دەوڵەتی جمهوری کوردستان- نامەو دۆکومێنت- بەرگی سێیەم، ستۆکهۆڵم- ١٩٩٧
- بازنەکانی ململانێو ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد، چاپی یەکەم، سلێمانی-١٩٩٨ بنکەی ئەدەبیو روناکبیری گەلاوێژ بە چاپی گەیاندو بڵاوی کردەوە.

چاپی دووەم، سلێمانیی- ١٩٩٩ (لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپکراوەو بڵاوکراوەتەوە.)

- کاروانی بێ کۆتایی، سلێمانی- ٢٠٠٠ .

**٢- وەرگێڕان:**

- دەروێشەکان بەدوای راستیدا ئەگەڕێن، شانۆگەرییەکی سیاسییە، نوسینی مستەفا حەللاج. لەگەڵ نوسینی پێشەکییەك بۆ دەقە کوردییەکە، ئۆپسالا- ١٩٨٣.
- جوڵانەوەی رزگاریخوازانەی کورد لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتیو سیاسیی، نوسینی: پرۆفیسۆر رادوڤان پاڤیچ، لەگەڵ نوسینی پێشەکییەك و رێکخستنی فەرهەنگیلەیەك بۆ دەقە کوردییەکە.

*چاپی یەکەم- ستۆکهۆڵم- ١٩٨٥

*چاپی دووەم- کوردستان- ١٩٨٦ (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان چاپی کردو بڵاوی کردەوە)

- کورتەی مێژوی فەلسەفە- بەرگی یەکەم- سوید- ١٩٨٨ لەگەڵ نوسینی پێشەکییەکی ٣٩ لاپەڕەیی لەژێر ناوی: "ئەم بەرهەمەو فەلسەفەو وشەیەك بۆ جولانەوەی نیشتمانیی کوردستان و نرخاندنی زانستیانە" و رێکخستنی فەرهەنگیلەیەك بۆ لێکدانەوەی زاراوە فەلسەفی‌و سیاسییەکان.

**٣- بەرهەمی تری نوسەر کە بە ناوێکی ترەوە بڵاوکراوەتەوە:**

خەباتی کرێکاران- سلێمانی ١٩٧٣، بەناوی یەکێتی نەقابەکانی پارێزگای سلێمانی-یە بڵاوکراوەتەوە.

٤- لەگەڵ دەیان دیدەنیی‌و لێکۆڵینەوەو باسی بڵاوکراوە لە گۆڤارو رۆژنامەدا، لەوانە: رۆژنامەی: خەبات، النور، برایەتی، التآخی، کوردستانی نوێ، الأتحاد، ئاڵای ئازادیی. گۆڤاری: رزگاری، گزینگ، مامۆستای کورد، رابوون، نوێ دەم، ئاران، پەیڤین، نڤار، رۆژنامەی: UPPSALA NYA TIDNING (بەزمانی سویدیی).